* ناوی کتێب: ئای لەڤیلیا لەڤیلیا..!!

* بابەت: ڕۆمان

نووسینی: کاروان عومەر کاکەسوور

* چاپی یەکەم، سلێمانی

تابلۆ سەر بەرگ: نەوال

* تیراژ: ٤٠٠ دانە

* ژمارەی سپاردن: ١٧١ ـــ ٢٠٠٠

* چاپ و ئۆفسێتی سەردەم

* بڵاوکردنەوەی لە سەر ئینتەرنێت کۆمەڵەی وەشانی "کۆچەر"

www.dengekurd.com



زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (٦١)

پێشکەشە بە ڕێبوار سیوەیلی و بەختیار عەلی
لەگەڵ خۆشەویستیی زۆرمدا

*دەکرێت دەیەها تێکست بنووسرێن و ناوی ئەنفالیشیان بخرێتە سەر، بەڵام لە ڕاستییدا هیچ یەك لەو تێکستانە لە پەیوەندییەکی ڕووکار و سادە لەگەڵ ئەنفالدا هیچی دیکەیان نەبێت، بەڵام دەکرێت تێکستێك بنووسرێت، بۆ ئەوەی باس لە ئەنفال بکات، توانای دەرخستنەوەی کاریگەری ئەنفالی هەبێت لەسەر ژیان جیهانبینییمان.*

«بەختیار عەلی» گۆڤاری ڕەهەند، ژمارە ٧ی ١٩٩٩

* * * *

*چۆن دەتوانین لەوە دڵنیا بین، کە ژیان خەون نییە..!!*

دیکارت

* * * *

**"چونکە لە سەردەمی پێش پەیدابوونی ڕەنگەکان لە دایك بووم، هەمیشە بێسەروبەرانە خەون دەبینم، بەڵام بۆئەوەی ماناکانیان نەشێوێن، دەبێت بەو سێ ڕەنگەی خۆم دامهێناون و ناوم ناون ڕەش و سپی و سوور، ڕەنگیان بکەم و بێسەروبەرانەتر بیانگێڕمەوە، هەتا ئەگەر بزانم قێزی خۆم و گوێگرەکانیشم دەکەنەوە".**

دەنگێ لە جیاتی نەوال

* * * *

**"جیاوازی لەنێوان ژیان و مردن، خەون و ڕاستی، خۆشەویستی و ڕقدا نیە، مادام ڕەنگەکان بەشی جوانکردنی گوڵێك ناکەن"**

دەنگێ لەجیاتی نەوال و شازە

* * * *

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

................................................ «مەهاباد»ی «نەخشە خان»

هەرچەند دەچێتە ئەو ژوورەی ئازووقە و لە بنمیچ و دیوارەکانی دەڕوانێت، ئێوارە تەمومژاویەکەی چەند ساڵ لەمەوبەری بیردەکەوێتەوە و دەچێتە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە، کە تیایدا «نەوال جابر»ی گۆرانیبێژ بە دزیی خەڵکەوە دوانە لەیەکچووەکەی بوو و دایکی بە پەڕۆی سپیی نەرمی وەکوو سەرتوێژی گامێش

پێچاینی.. ئەوسا «مەهاباد» دەستی ڕاستی خستبووە سەر دڵییەوە و بیری دەکردەوە: ئاخۆ لەم دووانە کامیان زیندەبەچاڵ دەکرێت و کامیان دەمێنێتەوە..؟! ئەمە تاکە یاسایەکی جێگیر بوو لەم وڵاتەدا و هیچ کەسێکی نەدەبوارد.. ئەوان دوای ئەو کارەساتە گەورە گەورانەی بە هۆی شەڕی درێژخایەنی نێوان لەشکری دوانە لەیەکچووەکەوە بەسەریان هاتبوو و بە زیانی زۆرەوە لێی دەرچووبوون، تێکڕا لەسەری ڕێککەوتبوون و لە هەموو شار و شارۆچکە و لادێ و ناو دەوار و شاخەکاندا جێبەجێ دەکرا.. ئەگەرچی «نەوال» خەڵکی ئەم وڵاتە نییە و هەمووی چەند ساڵێکە تیایدا نیشتەجێ بووە، بەڵام چار نییە و دەبێت بەیانی زوو زوو یەکێکیان بەرێت بۆ «بەشی بەخشین»ی «بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پۆلیس» و ئەویتریان بۆ «نفووس و سەرژمێری».. «نیهال فەهد»ی مێردیشی چەند مانگێ پێشتر لەپڕ گومببوو و کەس نەیزانی چی بەسەرهات، ئەگینا هەر باشتربوو و بەشێکی خەمەکەی هەڵدەگرت.. ئەم کاتی لەبارچوونی سکی یەکەمیشی مێردەکەی لێی دووربوو و بە تەنیا شانی دایە بەر ئەو بارە قورسەوە.. تووشی حاڵەتی قێزکردنەوە ببوو و ڕەنگی بە بەرەوە نەمابوو.. هەرچی دەخوارد تفیدەکردەوە و مردنی بە چاوی خۆی دەبینی.. یان بە زەحمەت قووتی دەدا و دوای تاوێک سووک و ئاسان دەیهێنایەوە.. هاوکات سیمای ڕاستەقینەی شتەکان لەبەر بیناییدا دەگۆڕان و قسەی هەلەقومەلەقی دەکرد.. ڕایدەکردە کۆڵان و هەر لە خۆیەوە بەگژ ئەم و ئەودا دەچوو.. کاتێکیش حاڵەتەکە بەریدەدا و تەواو هێمندەبووەوە، هەستی بە گوناه و تەریقبوونەوە دەکرد و لە داخا دەکەوتە کرۆژتنی پەنجەکانی خۆی.. دواجار لەو گۆڕەپانەی ئەوبەر، کە جارێکیان پیاوە سپیپۆشەکان ورچێکی ڕەشی سەماکەریان بە پارە پیشانی خەڵکدەدا و ئێواران قازە گۆشتنەکانی گۆمەکەی ئەولایان خۆیان لێ وشکدەکردەوە؛ لە شەڕێکیدا لەگەڵ «نازەنین خان»ی فەرمانبەری «نفووس و سەرژمێری»ی دراوسێیان کەوت بە دەما و مناڵەکەی لەبارچوو.. ئەم لەم شارە «نازەنین خان»ی لە هەر ژنێکی تر زیاتر خۆشدەویست و دڵی پێی دەکرایەوە، بۆیە کاتێ هاتەوە هۆش خۆی و بەشێنەیی بە ڕووداوەکەدا چووەوە، مناڵەکەی بیرچووەوە و هەستی کرد ناخی

دارِزاوە، ئەگەرچی ئەو لە دواوە پەلاماری دابوو و زۆر بێبەزەیییانەش خستبووی، بەڵام دەسپێشکەریەکە هی ئەم بوو و خەتاکەی بە هی خۆی دەزانی.. پەلەی بوو زوو هێز و توانای بێتەوە بەر و بچێت داوای لێبوردنی لێ بکات.. جا ئەم هەر لە منالییەوە ئەوە لە «ست سوعاد»ی دایکیەوە فێرببوو و زۆریشی بەلاوە جوان بوو، کە ئەوەی دڵی ئازیزێکی برەنجێنێت و دوایی بیەوێت ئاشتی بکاتەوە، دەبێت تا لە توانایدا هەیە خۆی برازێنێتەوە و دەست بە خۆیدا بهێنێت.. چەند بکرێت گیانی پاکبکاتەوە و جلی کەشخە و جوان لەبەرکات، بۆیە وای بە چاک زانی بە شێوەیەک بچێت بۆ ماڵی «نازەنین خان»ی دەستەخوشکی و بە جۆرێک خۆی پیشانبدات، بە جوانیەکەی سەرنجی ڕابکێشێت و هەر خێرا و بەبێ چەندوچوون باوەشی بۆ بکاتەوە.. شانەکانی توند توند بگرێت و بە هەموو هێز و توانایەکیەوە بیگوشێ بە خۆیەوە.. تێر تێر ڕوومەتەکانی ماچ و قژە ڕەشەکەی بۆن بکات.. قیروسیا لەوەی «فەریال»ی خوشکی بیردەکەوێتەوە و کۆمەڵێ ڕووداو بە جارێ بە ناو مێشکیدا گوزەردەکەن، کە هەر لە «نازەنین» دەچێت و زۆر جاریش وای پێ وتووە.. دڵی پڕبوو و تەزوو بە هەموو گیانیدا هات.. هەرچەند ویستی دان بە خۆیدا بگرێت و نەگریت، نەوەکا ماتەمینیی دایبگرێت و نەتوانێت خۆی بە جوانی و وەکوو پێویست برازێنێتەوە، کەچی لەپڕ سەری خستە سەر ئەژنۆکانی و دایە گریانێکی بەکوڵ.. کاتێ لە کانتۆرەکەش نزیککەوتەوە و دەرگا ڕەشەکەی کردەوە، بۆئەوەی پەشتەماڵە سپیەکەی تیادا دەربهێنێت و بچێت بۆ حەمامەکە، کراسە سپی و پانتۆڵە ڕەشەکەی «نیهال»ی بینی و بەکوڵتر گریا.. ئەو ڕۆژەش کە «نەخشە خان» لە هەیوانەکەدا ناوساجیی بۆ دەکرد و «مەهاباد»یش حەوشەکەی گسکدەدا، ئەم هەرچۆنێ بوو بە دیوارەکەوە هەستایەوە و لە پەنجەرەکەوە سەیری کردن.. ئەوە یەکەمجار بوو بزانێت ناوساجی چۆن دەکرێت و چۆن سووردەکرێتەوە، بۆیە زۆر بە دیقەت سەیری دەستەکانی «نەخشە خان»ی دەکرد و لێیان وردەبووەوە، کە بە تیرۆگە ڕەشەکە گونکە سپیەکانی لەسەر پنە ڕەشەکە دەکردەوە و دانە دانە دەیخستنە ناو تاوە دەسکسپیەکەوە.. هەر خێرا لەناو ئەو ڕۆنە داخبووەدا دەیانکرد بە قرچەقرچ و دوای تاوێکی کەم سوورهەڵدەگەڕان.. کراسە

سپیەکەی «نیهال»ی بیرکەوتەوە و دڵی کەوتە خورپە، کە دوای ئەوەی گوللەکە بەر قۆڵی کەوت و کوناوەدەری کرد، لە چاوترووکانێکدا سوورهەڵگەڕا و لەبەر تیشکی مانگەکەدا وەکوو پەڵەهەورێکی تەنکی دامێنی ئاسمان دەردەکەوت.. پەردە سپیەکەی دادایەوە و نەیویست ئەو ڕۆژە شوومەی بیربکەوێتەوە.. کاتێ دەیویست بێتەوە سەر جێگاکەی و لەسەر پشت پاڵکەوێت، سەرنجی کەوتە سەر کەمانجە سپیەکەی سەر مێزە ڕەش و شەقوشڕەکەوە و بە ئەسپایی لێی نزیککەوتەوە.. وەکوو منداڵ کردیە باوەشی و دەستی کرد بە گریان.. بیری لەوە دەکردەوە چۆن و بە چ شێوەیەک هەواڵی لەبارچوونی منداڵەکەی پێ بگەیەنێت و چۆن باسی پاڵە قایمەکەی «نازەنین خان» و کەوتن و بوورانەوەکەی خۆی بۆ بکات.. سەری هەڵبڕی و بە دیقەتتر لە جاران سەیری ئەو کاغەزە سپیەی کرد، کە «نیهال» بە قەڵەمێکی ڕەشی تۆخ تۆخ ڕۆژژمێرێکی لەسەر نەخشاندووە و بە قەڵەمێکی سووری ئێجگار گەشیش بازنەیەکی لە دەوری (چوار)ی (دوو)دا کێشاوە.. چەند بە پەلەی هاتنی ئەو ڕۆژە بوو و چۆن زۆربەی کات لە بەرامبەر ئەو ڕۆژژمێرەدا دەوەستا.. سەیری دەکرد و ڕۆژەکانی بە پەنجە دەبژارد.. کاتێ دەگەیشتە سەر بازنە سوورەکە و لەپڕ دەوەستا، ئینجا سەیرێکی «نەوال»ی دەکرد و پێی دەوت:

ـ کەی چواری دوو دێت..؟!

ئەو دەیپرسی و حەزیشی نەدەکرد ئەم وەڵامی بداتەوە، چونکە هەموو جارێ بە قسەیەک سەرودڵی دەگرت و وای لێدەکرد لەپاڵ هەست بە نائومێدیکردندا، کەمێکیش لە چارەنووسەکەی بترسێت.. بۆ ماوەیەک بێ تاقەت بێت و پیش بخواتەوە.. «نەوال» هەر لە بنەڕەتا لەگەڵ ئەوەدا نەبوو کاتی لەدایکبوونی منداڵ دیاری بکرێت و ڕۆژەکانی بۆ ببژێردرێت.. هەر بۆیەش پێی خۆشنەبوو مێردەکەی ئەو ڕۆژژمێرەی هەڵواسیبوو و هەرچەند سەیریشی دەکرد، خەفەتی دەخوارد و ماتەمینیی دایدەگرت.. ناوچەوانی گرژدەکرد و بە سەرسوڕمانەوە پێی دەوت:

ـ ئێستا هەمووی بە لایەک، ئەو دووی چوارەت لە کوێ هێناوە..؟!

ئەو کەمێ بیریدەکردەوە و بە بێزارییەوە دەیوت:

ـ بلێم چی..!! خۆشم نازانم..!!

کاتێ لە حەمامەکە جامە سپیەکەی هەڵگرت و خستیە ناو مەنجەڵە ڕەشەکەی سەر پرێمزە سپیەکەوە، تا چۆڕێ ئاو بکات بە قاچەکانیدا و بزانێت گەرم بووە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە خۆی وت: «باشتر لێرە گریام و لەوێ لەبەر چاوی مامۆستا هاواری مێردی ڕازیە خان.........» ئینجا «سەوسەن»ی هاوڕێی بیرکەوتەوە و قژە لوولەکەی هاتە بەر چاوی، کە هەموو جارێ دەستەکانی خۆی دەگرت بەملا و بەولای ڕوومەتەکانیەوە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەیوت:

ـ مرۆڤ ناتوانێت بۆ یەک شت دوو جار بگریت، بەڵام دەتوانێت یەک جار بۆ دوو شت بگریت.

ئەم هەر لە خۆیەوە و نازانێت بۆچی ئاوا شەرم لە «مامۆستا هاوار» دەکات و ناتوانێت چاو ببڕێتە چاوەکانیەوە، ئەگەرچی ئەو هەمیشە گاڵتەی لەگەڵدا دەکات و بە ڕوویەوە پێدەکەنێت.. تەنانەت هەست دەکات هەندێ جار ژنەکەی پێی ناخۆشە و لە دەموچاویدا تووڕەیی و بێزاریی دەبینێت.. جارێکیان کە لەگەڵ «نازەنین خان»دا سەروپێیان لە بازاڕ هێنابوو و لە مووبەقەکەی ئەواندا پاکیان دەکرد.. ئەم ورگە سپیەکەی لەملا و لەولاوە گرتبوو و ئەویش بە چەقۆیەکی ڕەشی دەسکسپی موولوولەکانی دەکڕاند.. دواییش بە تەشوویکی سپیی دەسسکرەش هەر دوو شەویلاگەی لە یەکتر جیاکردەوە و بە چەقۆ زمانەکەی لە بنڕا قرتاند.. «مامۆستا هاوار»یش لە ناوەڕاستی حەوشەکە و ڕێک لە ئاستی دەرگا سپیەکەی مووبەقەکەوە، بە دەستێ بیجامەی سپیەوە لەسەر کورسیە ڕەشەکەدا دانیشتبوو و بە مووکێشە سپیەکە تووکە زەردەکانی ڕوومەتی دەردەهێنا.. تاو نا تاوێکیش سەری هەڵدەبڕی و سەیری ئەوانی دەکرد.. کاتێ «نازەنین خان» زمانە ئێجگار سوورەکەی دایە دەست «نەوال»، تا بۆی بگرێت و ئەویش بە چەقۆکە پاکی بکات، ئەو ئاوێنە چوارچێوە سپیەکەی لە چاوە سەوزەکانی دوورخستەوە و بە گاڵتەوە بەمی وت:

ـ دیوتە نازەنین چەند لە زمانبڕین ئازایە..؟!

ئەم بە شەرمێکەوە پێکەنی و سەیرێکی «نازەنین خان»ی کرد، وایدەزانی ئێستا ئەویش بە قسەی مێردەکەی پێدەکەنێت و کۆمەڵێ گاڵتەشی لەگەڵدا دەکات، کەچی بە پێچەوانەوە لچێکی لێ هەڵقورتاند و پێی وت:

ـ هەر تۆشی مردووی زمانیت، ئەگینا من دەمی تێوە نادەم.

لەگەڵیا چەقۆکەی دەستی سەری کرد و سەری پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی «نەوال»ی بری.. هەر خێرا خوێن فیچقەی کرد و بۆ ناو لەپی جۆگەلەی بەست.. لە تاوا زمانەکەی بەرەڵلاکرد و بە دەستەکەی تری توند گرتی.. «مامۆستا هاوار» وا خۆی پیشان نەدا ئاگای لە برینی پەنجەی ئەم هەیە و بە «نازەنین خان»ی وت:

ـ ئەگەر تەنها لەبەر منە تۆ ئەو هەموو زەحمەتیە بە پاککردنی زمانەوە دەکێشیت، ئەوە وازی لێبێنە، چونکە ئیتر منیش نایخۆم.

ـ دەیخۆیت، نایخۆیت جەهەننەم.. خۆ بۆ منی ناخۆیت.

ئەمەی وت و هەر خێرا خستیە تەنەکەی خۆڵەکەوە.. ئەم چەند تەریقبووەوە و چۆن هەموو گیانی بە جارێ کەوتە لەرزین، کە «مامۆستا هاوار» بە هۆی ئەمەوە رووشکێنکرا و لەگەڵ ژنەکەی بوو بە ناخۆشییان.. سەری خۆی لەبەر نا و ئارەقی کردەوە.. کاتێ هاتەوە ماڵەوەش و لە بەرامبەر پەنجەرەکەدا وەستا، دەستەکانی لەملا و لەولاوە گرت بە قژیەوە و بەدەم ئاخ و هەناسەهەڵکێشانەوە سەیری ناو حەوشەکەیانی کرد.. جارێکیان لە خەونیدا سەری بە تەریبی خستبووە سەر سنگی «مامۆستا هاوار» و ئەویش پەنجەکانی خستبووە قژیەوە.. جار جار بە سووکی دەیچپاندە گوێچکەی چەپیەوە و پێی دەوت:

ـ دەڵێی چی ئەو قژە رەش و خاوەت بە فرمێسکەکانم بتوێنمەوە و لە شوێنیا بە خەونەکانم پەلکەزێرینەیەکت بۆ سازکەم..؟!

ئەمە قسەی ئەو کورە کوردە چاوسەوزە بوو و رێک لەسەر نەغمەی ئەویش دەیوتەوە، کە ماڵیان لەسەری کۆڵانەکەی خۆیان بوو و ئەو جارە لەسەر رێگای قوتابخانە وای پێ وت.. سەری هەڵبری و سەیری چاوەکانی «مامۆستا هاوار»ی کرد، رێک لە چاوە سەوزەکانی ئەو دەچوون و بە موو جیاوازییان نەبوو.. دەڵێن

زوو زوو بەر لە شەڕی نێوان دوانە لەیەکچووەکە، بێجگە لە ڕەنگی ڕەش و سپی و سوور، سەوز و زەردیش لەم وڵاتەدا هەبوون و زۆریشیان خۆشویستوون، بەڵام وردە وردە کەمبوونەتەوە و ڕوویان لە نەمان کردووە.. مەگەر جار جار، ئەویش زۆر زۆر بە دەگمەن، ئەمیان لە چاوی کەسێک و ئەویان لە قژی کەسێکی تردا دەرکەوێت.. «مامۆستا هاوار» هەر دووکیانی هەیە و هەرچی خەڵک هەن بە ناشیرین و دزێوی دەزانن.. ئەم تا بینینی ئەو خەونە بە لایەوە دوو چاوی زۆر ئاسایی بوون و هیچ سەرنجیان ڕانەکێشا بوو.. بەیانی کاتێ خەبەریبووەوە و بە خێرایی لەناو پێخەفەکەی هاتە دەرێ، حەزی دەکرد لە پێش هەموو شتێکەوە بیانبینێت و تێر تێر و بەکامی دڵ سەیری گلێنەکانیان بکات.. قاپە شووشە ڕەشەکەی گرت بە دەستیەوە و چووە پشت دەرگا سپیەکەی حەوشەوە.. درزێکی باریکی تێکرد و خۆی بۆ مەڵاس دا.. لەوەش دڵنیابوو ئەو ها ئێستا نا کەمێکی تر، وەکوو هەموو ڕۆژانی تر بە بەردەمی ماڵەکەی ئەواندا دەڕوات و دەچێت بۆ قوتابخانە....
هەرکە ئەو هات و تێپەڕی، ئەم قاچی خستە ئەودیو و بە قایم دەرگاکەی بە دوای خۆیا داخستەوە، بۆئەوەی ئەو گوێی لێبێت و ئاوڕی لێبداتەوە.. کە ئەو نەورووژا و لای نەکردەوە، ئەم بە هەنگاوی تیژ تیژ پێشی لێگرتەوە و بەیانیباشی لێی کرد.. بە پێچەوانەی جاران «مامۆستا هاوار» نەیدواند و تەنانەت بە گەرمییش وەڵامی نەدایەوە.. ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و دڵی پڕبوو.. وەکوو منداڵ لچی هەڵهێنایەوە و خەریکبوو دەست بکات بە گریان.. لە ئاستی ماڵی «نەخشە خان»دا قاچی لە بەردێکی سپیدا هەڵنووتا و خەریکبوو بە دەما بکەوێت.. لەولاتر خۆی گرتەوە و کۆڵێ تەریقبووەوە.. کەچی هێشتا چاوەڕێبوو ئەو دەنگ هەڵبڕێت و پێی بڵێت: «ئەوە چییت لێ قەوماوە..؟!»، یان: «ئەوە چاوت نابینێت نەوال..؟!»، بۆئەوەی ئەمیش جورئەت بێنێتە بەر خۆی و تێر تێر سەیری ئەو چاوە سەوزانەی بکات، کە هەموو ڕابردووی خۆی تیادا دەبینێت و دەتوانێت ورد ورد بە کون و کەلەبەرەکانیدا بچێتەوە.. دەیان جار لە نزیکەوە دیبوونی و گوێی پێ نەدابوون.. ئەو کاتەی گەیشتە لای «پوورە فاتم»ی ماستفرۆش و عانە و قاپەکەشی خستە ناو دەستیەوە، هیوایەکی هەبوو، سەیرێکی بکات، یان

گاڵتەیەکی لەگەڵدا بکات و هاوکات بزەیەک بخاتە سەر لێویەوە، ئیتر ئەم هەر خۆی دەیزانی لە ئاستیدا چۆن گیانی دەبێتە پەلکەزێڕینە و هەموو ڕەنگە بەسەرچوو و نەدۆزراوەکان بە خۆیەوە دەگرێت، وەلێ حەیف و مەخابن تێپەڕی، نە ئاوڕی دایەوە و نە بزەش گرتی.. کاتێ هاتیشەوە ناوچەوانی خستە سەر تاقی پەنجەرەکە و بەکوڵ گریا.. بەڵام بۆچی..؟! خۆیشی بە تەواوی لێی ڕوون نەبوو و هۆکەی نەدەزانی.. سەرەتا بیری لە نهێنیی ئەو شەرمە دەکردەوە و لە خەیاڵی خۆیدا دەیگێڕا، کە هەمیشە لە ئاستی «مامۆستا هاوار»دا هەستی پێدەکات و ناتوانێت بە ئاسایی لەگەڵیدا بدوێت، لە کاتێکدا لەگەڵ خەڵکی تردا وانییە و هاوڕێکانی هەمیشە ئێرەییان پێ دەبرد، کە وەکوو ئەوان شەرمی نەدەکرد و نازناوی کچە هارەکەیان پێ بەخشیبوو.. «فەریال»ی خوشکی دەنگی زۆر لە هی ئەم خۆشتر بوو و دەیان جاریش وای پێ وتبوو، بەڵام هەرگیز لە ڕووی نەدەهات لەبەر چاوی ئەم و ئەودا دەنگ هەڵبڕێت و گۆرانی بڵێت.. ئینجا بیرێکی ترسناک بە خەیاڵیدا تێپەڕی و دڵی کەوتە خورپەکردن.. وای بۆچوو خۆشیدەوێت و بە ڕاستیی حەزی لێکردووە.. ئەوساش لەناو ئەو هەموو کوڕە شەرمی لە «نیهال» دەکرد و بە پارێزەوە لەگەڵی دەدوا.. سەرەتا وایدەزانی لەبەرئەوەیە سەرۆکی تیپەکەیانە و هونەرمەندێکی بە توانایە، گۆرانیبێژێکی زۆر لێهاتووە و ناوبانگی بە هەموو وڵاتدا بڵاوبۆتەوە، دواتر بۆی دەرکەوت لەبەر ئەوە نییە و خۆشیدەوێت.. خۆشیدەوێت و شەرم لە خۆشەویستیەکەی دەکات.. هەرچۆنێ بوو ئەو هەستەی خۆی بە درۆخستەوە و ئۆباڵەکەی خستە ئەستۆی خەونەکەیەوە.. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە خۆی وت: «ئەمە تەنها شتێکی کاتییە و نامێنێت.. مامۆستا هاوار وەکوو برای گەورەم وایە و......»...

لەسەر تەختە سپیەکە دانیشت و بە جامە سپیەکە ئاوی دەکرد بەسەر خۆیا.. شامپۆکەی لەسەری دەدا و گۆرانیی دەوت.. ئەوە لە «مەهاباد» فێربوو هەرچەند دڵتەنگ و بێزاریش بێت، دەبێت تا تەواو دەبێت و جلەکانی لەبەردەکات، هەر گۆرانی بڵێت و بێ دەنگ نەبێت.. ئەم جارێکیان لەگەڵ «سەوسەن» بە جووتە چوون بۆ حەمامی دەرەوە و بەدەم خۆشتنەوە دەنگی لێ هەڵبڕی، ئەو سەرێکی لێ

بادا و پێی وت:

ـ گۆرانیبێژی ڕاستەقینە لە حەماما گۆرانی ناڵێت.

ئیتر لەمەوە وازی لەو عادەتە هێنا و بە لایدا نەدەچووەوە.. کەچی چەند مانگێ لەمەوبەر، کاتێ جلەکانی خستبووە سەر دەستی چەپی و خەریکبوو دەرگای حەمامەکەی دەکردەوە، لەپڕ «مەهاباد» بە گریانەوە لە دەرگای حەوشەوە پەیدابوو و بەرەو لای هات.. کلووەبەفرەکانیش ورد ورد دەبارین و پەیتا پەیتا حەوشەکەیان دادەپۆشی.. کاتێکیش با ساردەکە لەملا و لەولاوە لوولیدەکردن و دەینووساندن بە دەرگا ڕەشەکەی حەمامەوە، دەرگاکەی وەکوو کراسە ڕەشە گوڵسپییەکەی ئەوسای خۆی دەهاتە بەر چاو و لێی وردەبووەوە.. دایکی هەر جارێ بەو کراسەوە دەیبینی و سەرنجی لێ دەدا، ئاخی هەڵدەکێشا و دڵی تەنگدەبوو، سەری بادەدا و پێی دەوت:

ـ هەرچەند تۆ ئاوا بەم کراسەوە دەبینم تەختەڕەشی قوتابخانەم بە بیردێتەوە و ماتەمینیی دامدەگرێت.

کەچی بە پێچەوانەوە «نیهال» زۆر بە لایەوە جوان بوو و هەمیشەش وای پێ دەوت.. ئەو شەوەی کە جلەکانی دەئاخنیە جانتاکەیەوە و بیری دەکردەوە، ئاخۆ کامیان بەرێت و کامیان بەجێبهێڵێت، ئەویانی لە پێش هەموویانەوە لە کانتۆرەکەی دەرهێنا و تێیخست، بەڵام شەوی دواتر کاتێ لەناو کێڵگەی دارخورماکەدا بە دەستی ڕاستی زنجیرەکەی کردەوە و دەستی چەپی پیاکرد، بۆئەوەی جلێ دەربهێنێت و لە قۆڵی «نیهال»یەوە بپێچێت، لەناو هەموویاندا ئەمی بە دەستەوە هاتبوو و لە شپرزەییشدا هەستی پێنەکردبوو.. کاتێ دنیا ڕووناکبووەوە و لەناو کووخی پیرەمێردە ڕەشپۆشەکەی قەراغ کێڵگەکەدا سەیری کرد، خۆی و گوڵە سپیەکانیشی بە خوێن سووربووبوون و ئەگەر لەبەر یاخەکەی نەبووایە، کە چوار قۆپچەی کەمێ زلی پێوەبوو و «نازە»ی ژنی «خەسرۆ» بۆی پیاداگرتبوو، نەیدەناسیەوە.. ئیتر لە داخا دەستەکانی گرت بە چاویەوە و زۆر بەکوڵ گریا....

بەبێ ئەوەی پرسیار لە «مەهاباد» بکات، ئاخۆ چیبووە و بۆچی دەگری، دەستی

گرت و بردیە حەمامەکەوە.. لەوێش بەبێ ئەوەی بزانێت حەزدەکات لەگەڵ خۆبدا بیشوات، یان نا، پاڵتۆ سپیەکە و جلە ڕەشەکانی قوتابخانە و ئەوانەی ژێرەوەی داکەنی و خێرا خۆبشی ڕووتکردەوە.. هەر ئەوەندە بە دەستی چەپی جامێ ئاوی لە مەنجەڵەکە هەڵچنی و کردی بە سەریا، ئەو یەکسەر دەنگی هەڵبڕی و کەوتە گۆرانیوتن، ئیتر بە دەست خۆی نەبوو قاقایەکی بەرزی لێ دا و دەستی ڕاستی گرت بە دڵیەوە.. لە پێشدا بیری لە سنووری نێوان گریان و گۆرانی کردەوە و لە خەیاڵی خۆبدا گێڕای، کە تا ئەو کاتەش وایدەزانی دوو شتی پێچەوانە و دوور لە یەکترن و هیچ پەیوەندییەکی دۆستانەیان نییە، ئینجا یەک دوو جام ئاوی تری کرد بە سەریا و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ ئەوە تۆ چۆن دەتوانی لەم کاتەیا گۆرانی بڵێیت..؟!

بەڵام ئەو لەبەر دەنگی خۆی و گرەگرِی بەرزی پرێمزە نەوتیەکە گوێی لێنەبوو و ئەمیش نەیویست دووبارەی بکاتەوە، بەڵکوو ویستی هەر خۆی بە ئەقڵ لێکیبداتەوە و بە ئەنجامەکەی بگات.. ئەم هەمیشە باوەڕی وایە قسە و هەڵسوکەوتی مناڵ دەبێت لێکبدرێتەوە و خۆت لەگەڵیا پێدابچیت.. لەگەڵ «شێرۆ» و «دیدەم» و مناڵەکانی «فەریال»ی خوشکی و ئەوانی تریشدا هەر ئاوای دەکرد و هەموو جارێ «فەریال» پێی دەوت:

ـ تۆ تاقەتێکی زۆر سەیرت لەگەڵ مناڵدا هەیە، خۆزگە دەمبینی مناڵی خۆت چۆن پەروەردە دەکەیت..!!

کاتێ جلەکانی لەبەر «مەهاباد» کرد و ئەو کۆتایی بە گۆرانیوتن هێنا، بۆی دەرکەوت، کە «مەهاباد» وا دەزانێت مرۆڤ تەنها بە گۆرانی پاکدەبێتەوە و ئەوەندەی تر باوەڕی هێنا، کە ئەو مناڵە موعجیزەیەکی جیهانی هونەرە و دوارِۆژێکی سەیری هەیە.. لەمەوە حەزی دەکرد هەمیشە لەگەڵ «مەهاباد»دا بچێتە حەمامەوە و خۆی بشوات.. کەچی وا ئەم جارە چاوەڕێی ئەوی نەکرد و بە تەنیا چوو....

کراسە ڕەشوسپیەکەی لە کانتۆرە ڕەشەکەدا دەرهێنا و چەند جارێ تەکاندی.. لەبەر ئاوێنەکەدا وەستا و لەبەریکرد.. ئەو گۆرانیەی بیرکەوتەوە و دڵی لەگەڵیا

ڕاچەنی، کە لەسەر شانۆی «هۆڵی گەل» بە دووقۆڵی لەگەڵ «سەوسەن»دا وتیان و «نیهال»، ئاوازەکەی بۆ دانابوون.. هەر ئەویش حەزیکرد جلەکانیان وەکوو یەک بێت و لای دووکاندارێکی هاوڕێی خۆی بۆی کڕین.. ئەوسا «سەوسەن» بە حەپەساویەوە سەیری کرد و بە شێوەیەکی زۆر جوان پێی وت:

ـ کچێ مەیموون زۆرت لێهاتووە..!! ئەوە لەبەر منیشا ئاوا جوانە، یان تۆ خۆت جوانیت..؟!

دواییش نای بە سنگی خۆبەوە و پێی وت:

ـ من ئەمەی خۆم هەڵدەگرم، با تا ماوم وەکوو یادگاریەکی بەنرخ لام بمێنێت.

ـ منیش وەکوو تۆ، مەگەر بۆ ئاهەنگێ شتێ بێت، ئەگینا لەبەری ناکەم.

ئێستا کە لە ئاوێنەکە دەڕوانێ و بە دیقەت سەرنج لە سیمای خۆی دەدات، دەزانێت «سەوسەن» بە هەڵەدا نەچووبوو و ئەم لەبەریا زۆر جوانە، بەڵام بیری لە «نیهال» کردەوە و هێنایە بەر چاوی، کاتێ دێتەوە و لەپڕ هەواڵی لەبارچوونی مناڵەکە دەبیستێت، ئاخۆ چۆن پەشێوبی و ماتەمینیی دایدەگرێت و چ حاڵێکی دەبێت..!! خەریکبوو داییکەنێت و بیخاتەوە کانتۆرە ڕەشەکەوە.. بچێت لەسەر جێگاکەی بکەوێت و دەست بکات بە گریان، کەچی دانی بە خۆبدا گرت و بیری لەوە کردەوە، کە مێردەکەی هەرگیز باوەڕی وانییە مرۆڤ لەکاتی ناخۆشی و پەشێوییدا دەست لە خۆڕازاندنەوە هەڵگرێت و بەلاوەی بنێت.. ئەو جارەش هەر لەبەر ئەم ئاوێنەیەدا بە شانەیەکی سپی قژی بۆ داهێنا و پێی وت:

ـ تەمەنی مرۆڤ بەوە حیساب ناکرێت چەند ساڵ ژیاوە، بەڵکوو دەبێت ئەوە بزانین لەو چەند ساڵەی ژیاوە چەند هەستی بە جوانیی جەستە و ڕۆحی خۆی کردووە.

باوەڕیشی وایە گۆرانی چاکترین ڕێگایە بۆ هەستکردن بەو جوانیە و گەیشتن بە قوڵاییەکانی.. کە «سەوسەن» دایکی مرد و بڕیاری دا واز لە گۆرانی بێنێت، ئەو پەشیمانی کردەوە و پێی وت:

ـ مەحاڵە بتوانیت بیری ڕۆحێکی مردوو بکەیت، ئەگەر ڕۆحێکی جوان و زیندووت نەبێت.

به شانه ڕەشەکە قژە پڕەکەی جوان جوان شانە کرد و چاکتر لە خۆی ڕاما.. ژنە جووڵەکەکەی دەستەخوشکی دایکی بیرکەوتەوە و بزەیەکی خستە سەر لێوی، کە هەموو جارێ دەستەکانی دەگرت بە دڵیەوە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەیوت:

ـ لە تەوراتدا نووسراوە، کە خوا لەسەر شێوەی خۆی بنیادەمی خوڵقاندووە.

عەترە ڕەشەکەی لە چەکمەجەکە دەرهێنا و بەسەر گەردن و ڕوومەتەکانیدا پرژاند.. «نازەنین خان» بۆنی ئەم عەترەی زۆر پێخۆشە و هەر خۆیشی پێی ناساند.. بەڵێ، ئەمە ئەو جارە بوو، کە بە بۆنەی خەتەنەکردنی «بەختیار»ەوە بانگهێشتی ماڵی خۆیان کردن و لەبەر بەرۆچکە کەمێ گەرمەکەی حەوشە ماسییان دەرخوارددان.. تا ئەو ماسیەی دەستی «نازەنین خان»ی نەخوارد و ئەو هەموو لەزەتەی لێنەبینی، باوەڕی وابوو کەس نازانێت وەکوو دایکی ماسی ئامادە بکات و بەم شت و بەو شت بیڕازێنێتەوە.. ئێستاش بەکامی دڵ بیری لێدەکاتەوە و ئەو ڕۆژە دێنێتەوە بەر چاوی، کە هەر چواریان، ئەوان لەسەر دۆشەگە سپیەکە و ئەم و «نیهال»یش لە بەرامبەریان و لەسەر بەڕە ڕەشوسپیەکە دانیشتبوون و زۆر بە پەرۆشەوە دەیانخوارد.. «نیهال» دوای ئەوەی دەستەکانی لەبەر بەلووعەکەی پشت دەرگا سپیەکەی حەوشە شت و هاتەوە شوێنەکەی خۆی، سەرێکی بادا و وتی:

ـ چەند حەزم لە خواردنی ماسیە، ئەوەندەش ڕقم لە بۆنەکەیەتی.

«نازەنین خان» هەستا و چوو بۆ ژووری نووستنەکەیان.. شووشەیەکی سپیی درێژکۆڵەی هێنا و هەر خێرا سەرەکەی هەڵپچڕی.. دایە دەستیەوە و پێی وت:

ـ ئەم عەترە ڕەشە بەن لە دەستتان، بۆئەوەی بۆنی ماسیی پێوە نەمێنێت.

کاتێ «نیهال» لە لووتی خۆی نزیککردەوە و وتی:

ـ بۆنی زۆر خۆشە..!!

ئەو دەسەکانی دا بە یەکا و بە «نەوال»ی وت:

ـ ئەم دانەیە بۆ خۆت، بۆئەوەی لەسەری بکڕیتەوە.

«نەوال» زۆری بەلاوە سەیربوو و لێوی خوارەوەی خستە ژێر دانەکانی سەرەوەی، کە مێردەکەی بۆ یەکەمین جار بە بۆنی عەتر بڵێت خۆش و ئاوا

دەستەکانی پێ بڕشێنێت.. ئەو هەمیشە ڕقی لە عەتربوو و هەرکە بۆنەکەی دەهات بە لووتیا، ژانەسەر دەیگرت و دەستبەجێ دەیخست.. هەموو جارێ گلەیی لەم دەکرد و زۆر جاریش لێی تووڕە دەبوو، لەسەر ئەوەی زوو زوو عەتری لە خۆی دەدا و ئەوی سەغڵەت دەکرد.. هەر ئەو کاتەش ئەو ئێوارەیەی بیرکەوتەوە و ڕاچەنی، کە ئەمان لە هەیوانەکەی خۆبانەوە گوێیان لە دەنگی «نازەنین خان» بوو، لەودیو بە دەنگی کەمێ بەرز گۆرانیی بۆ «بەهار» و «بەختیار» دەوت.. «نیهال» گوێی بۆ قولاغ کردبوو و بیریدەکردەوە.. دواییش سەیرێکی ئەمی کرد و پێی وت:

ـ هەست ناکەیت دەنگی لە دەنگی سەوسەن دەچێت..؟!

ئەم خۆیشی نەیزانی بۆچی ئاوا بە ڕقەوە سەیری کرد و بە تووڕەیی وەڵامی دایەوە:

ـ نەخێر، دەنگی ئەم لە کوێ و هی سەوسەن لە کوێ..!!

ـ بەڵام نازەنینیش دەنگی خۆشە..!!

دواییش ویستی تیپێکی گۆرانی و مۆسیقا دابمەزرێنێت و یەکەم کەس داوای لەو کرد بەشداربێت، کەچی ئەو دەستی بە ڕوویەوە نا و پێی وت:

ـ جاران بوایە ئا، بەڵام ئێستا لەبەر مناڵ ناتوانم.. ئەوەتا دەبینی ماوەیەکە وازم لە تەمسیلیش هێناوە.

گۆرەویە سپیەکانی لە پێکرد و پێڵاوە ڕەشەکانی بە پەڕۆ سپیەکەی پشت دەرگا ڕەشەکەوە پاککردەوە.. هەرچەند پێڵاو لەپێدەکات و لێیان ورددەبێتەوە، ئەو ڕۆژانەی منالّیی بیردەکەوێتەوە و موچوڕکی پیادادێت، کە لە پێڵاو یاخی ببوو و بە هیچ شێوەیەک حەزی نەدەکرد قاچیان تێبخات.. دایک و باوکیشی بە هیچ شتێ شێت و هار نەدەبوون و ئەمەسەر و ئەوسەری دنیایان لێ نەدەهاتەوە یەک، بەوە نەبێت کچەکەیان بە پێی پەتی بەسەر شەقامەکاندا ڕابکات و ڕێبوارەکانیش خێسەی لێبکەن.. بۆ ئەوان جوان نەبوو یەکێ بوون لە دەوڵەمەندەکانی گەڕەکی «ڕەشید» و خەڵکیش تانەیان لێبدەن.. لەملا و لەولا باسیان بکەن و بڵێن: دڵیان نایە جووتێ پێڵاو بۆ کچەکەیان بکڕن.. سەرەتا بە خۆشیی ئامۆژگارییان دەکرد و پێڵاوی گرانبەها و هی سەیر سەیریان بۆ دەکڕی، بۆئەوەی سەرنجی

ڕابکێشن و حەزیان لێبکات، بەڵام کە ئەم جوان و ناشیرین، هەرزان و گرانی بە لاوە وەکوو یەک وابوو و لە پێی نەدەکردن، ئیتر ئەوانیش ئارامیان نەما و لێیان توندکرد.. بە شەق و بە زللە لێیان دەدا و ئەو قژە ڕەشەیان چەپک چەپک بۆ دەردەهێنا.. جا خۆ ئەمەش سوودی نەبوو و شتێکی لەو خووەی کەمنەکردەوە، هەر ئەوەندە دەرگای حەوشەی دەکردەوە و دەچووە دەرەوە، بۆبان دادەنەویەوە و سووک و ئاسان دایدەکەندن.. سەرەتا دەستەکانی تێهەڵدەکێشان و تا تینی تیابوو تووڕیهەڵدەدان، بەڵام دواتر بۆئەوەی سەرزەنشتی نەکەن و لێدان نەخوات، هەر دوو جەمسەری قەیتانەکانی لە یەکترەوە گرێدەدان و دەیکردنە ملیەوە.. کاتێ باڵەکانی لەملا و لەولاوە دەکردنەوە و بە پێخاوسی بەسەر ئەو شەقامە قیرتاوەدا ڕایدەکرد، کە ڕۆژی تەمووزی ئێجگار گەرمی «بەغا» تواندبوویەوە و بریقوباقی پێخستبوو، گەورە و بچووک چاوی خۆبان دەگرت و نەیاندەوێرا سەیری بکەن، کەچی ئەم لەزەتێک وەکوو قارچک لە گیانیدا هەڵدەتۆقی و مێروولەی دەکرد، کە لە هیچ کاتێکی تردا هەستی پێنەکردبوو و دیمەنی شتەکان لەبەر بینایییدا بە تەواوی دەگۆڕان.. یان لە ڕێگای قوتابخانە دایدەکەندن و وەکوو کتێب و دەفتەر و قەڵەم دەیخستنە جانتا سپیەکەیەوە.. وێنەی شێت بەناو ئاوی بارانی سەر ئەو شەقامانەدا ڕایدەکرد و گۆرانیی دەوت.. مناڵان گاڵتەیان پێدەکرد و مامۆستاکانی بە دار ناولەپیان دارزاند.. بە تف و جنێو ڕیسوایان کرد و ناردیان بە شوێن دایک و باوکیدا.. ئیتر ئەوان پیشانی دکتۆر و دەیان کەسی شارەزایان دا و هەر یەکەی بۆ خۆی قسەیەکی دەکرد:

«کاترینا»ی ژنی «جۆن» پێدەکەنی و دەیوت:

ـ چاوتان ڕۆشەن کچەکەتان دەبێت بە گۆرانیبێژێکی بەناوبانگ.

ئەوان لچیان هەڵدەقورتاند و دەیانوت:

ـ پێڵاولەپێنەکردن چ کاری بەسەر گۆرانیەوە هەیە..؟!

«ست غادە» ،ی بەڕێوەبەری «دواناوەندیی زەنوبیا»ش تەگبیری بۆ «ست سوعاد»ی دایکی کردبوو و پێی وتبوو:

ـ هەوڵدە مناڵانی گەڕەک بەوە ڕازیی بکەیت ماوەیەک ئەوانیش پێڵاو لە

پێنەکەن، ئیتر ئەم بە پێچەوانەی ئەوان لە پێی دەکات.

«سیامەند عومەر پیرداود»ی خاوەن «ستۆدیۆی ئەربیل» و هاوڕێی نزیکی باوکی و خۆشەویستترین کەسی خۆی، هەر زوو زوو سەری بادەدا و بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە دەیوت:

ـ هیوادارم بەو ئەنجامە نەگات، کە من بۆی دەچم.

هەرچەندیش داوایان لێ دەکرد و پێیان لێ دەکردە کەوشەوە، تا پێیان بڵێت و ئەو پێشبینییە چییە ئەو کردوویەتی، ئاخی قووڵتری هەڵدەکێشا و پێی دەوتن:

ـ تکایە لێم مەپرسن.

«میقداد شەکرچی»ی شەریکی باوکی ئەو جارە پەنجەکانی خۆی لە یەکتر هەڵکێشان و وتی:

ـ ئێوە بنی پێکانی داخبکەن، ئەگەر دوای ئەوە لە ژوورەوەش دایکەندن، بزانن من هیچ نازانم.

«خانزاد مامان»ی دایکی «دیجلە» و «فورات»، کە لە سەرتاپای شاردا بەوە ناسرابوو پێشبینیی داهاتوو دەکات و هەرچی ئەو بیلێت، درەنگ، یان زوو، دێتە دی، سەری بادەدا و دەیوت:

ـ من ئەو کاتەی ناوکیم بڕی، بە دایکیم وت: ئەم کچەی تۆ یان دەبێت بە گۆرانیبێژێکی قەحپە، یان دەبێت بە بلیمەت.. لە هەر دوو حاڵەتەکەشدا بۆ ئەو شوێنە سەر هەڵدەگرێت، کە منی لێ هاتووم و ناوبانگی بە هەموو دنیادا بڵاودەبێتەوە.

«حەسەن خوداداد»، پیاوە «فەیلی»یەکەی دووکانی لە تەنیشت دووکانی باوکییەوە بوو و وەکوو ناسراوترین بازرگانی شار حیسابی بۆ دەکرا، لە پێشبینیکردنی داهاتوودا، بەردەوام بەربەرەکانی «خانزاد»ی دەکرد و هەمیشە بە پێچەوانەی ئەو ڕملی لێ دەدا، دوای ئەوەی بە خەڵووز بنی پێکانی ڕەشکرد و خستنیە سەر کارتۆنێکی سپییەوە، ئینجا کارتۆنەکەی لە چاوەکانی نزیککردەوە و جوان جوان لە شوێنپێکانی سەری وردبووەوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ـ ئەم کچەی ئێوە سەری خۆی بۆ شوێنێ هەڵدەگرێت، کە خەڵکەکەی لە گیانی خۆیان و دار و بەردیان بێزارن.

«عەمار»ی کوڕیشی، کە خەڵک پێیان وابوو بەو منالّییەی خۆی لە خوێندنەوەی ناخی بنیادەم و پێشبینیکردنی ڕووداوەکانی داهاتووی دووردا بۆڕی باوکی و «خانزاد مامان»یشی داوەتەوە و هەمیشە هاواری ناخۆشی پێیە، سەیری پەنجەکانی قاچی دەکرد و بە ترسەوە پێی دەوتن:

ـ زۆر لە بەڕوو دەچن، ئاگاتان لێبێت..............!!

ـ بەڕوو چییە..؟!

ـ بەڕوو یانی بلوط.

ئەمە یەکەم وشەی کوردی بوو «نەوال» فێری بوو و بە ڕاستییش لێی ترسا.. بۆ نەگبەتییش شەوی یەکەم کە هاتن بۆ «سابوونکەران» و لە مالّی «مامۆستا هاوار»دا مانەوە، لە هەموو شتێ زیاتر گوێی لەم وشە ترسناکە دەبوو و لەگەڵیا موچورک بە سەرتاپای گیانیدا دەهات.. «مامۆستا هاوار» و «نازەنین خان» کە ڕووداوێکیان دەگێڕایەوە و سوێندیان دەخوارد، پەنجەی دۆشاوـمژەی دەستی چەپیان ڕادەشەقاند و دەیانوت:

ـ بە گۆڕی حەمە بەڕووی باپیرم.

ئیتر ئەم لە ترسا مووچورکی پیادا دەهات و هەموو گیانی هەڵدەلەرزی.. ئەو شەوە تا بەیانی لە ناو جێگاکەیدا خۆی گرمۆڵە کردبوو و بیری ترسناک ترسناکی دەکردەوە.. هەر ئەوساش زانی ئەوان هەر دووکیان ئامۆزای یەکترن و هەر لە خۆیەوەش پێی ناخۆشبوو.. دوای حەفتەیەک، کە «نازەنین خان» بانگی سەربانی خۆیانی کرد و لەبەر بەرۆچکەکەی ئەوێ بەسەرهاتی «حەمە بەڕوو»ی باپیری بۆ گێڕایەوە، ئەوەندەی تر ترسی لێ نیشت و هەستی بە بەدبەختیی خۆی کرد.. دوایی کە تەواو لەگەڵیان تێکەڵ بوو و چاکتر ناسیینی، ترسی شکا و بۆشی دەرکەوت ئەوان بەتایبەتی «نازەنین خان»، کە هەمیشە بە هەق و ناهەق سوێند بە سەری «حەمە بەڕوو»ی باپیریەوە دەخوات و هەر زوو زوو بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەوە نە بۆ ترساندنی ئەمیەتی و نە هیچ مەبەستێکی تری خراپی

هەیە، بەڵکوو شانازیی پێوە دەکات و خۆی پێوە بادەدات.. «نەوال» هەندێ جار پاڵەوانی ئەو چیرۆکانەی بیردەکەوتەوە و تارماییەکانی دەهاتنە بەر چاو، کە دایکی بۆ ئەم و خوشکەکەی دەهێنان و بە جووتە لە ژوورەکەی خۆباندا دەیانخوێندنەوە.. یان ئەوانەی هەمیشە لە هەقایەتەکانی «شازە» و «شانە»ی ئامۆژنیدا ناویان دەهات و ئەم حەزی لە گوێگرتنیان بوو.. خەڵکی تریش قسەیان بۆ کردووە و پێیان وتووە، کە «حەمە بەڕوو» ڕاستە ڕێگربووە و کەم جەللاد شانیان لە شانی داوە، بەڵام لە پیاوکوشتنندا خاوەنی ڕێبازی تایبەتیی خۆی بووە و فیزیشی بە ڕادەیەک زل بووە، لە هەموو ژیانیا نە پیاوی هەژار و لاتی ڕووتکردۆتەوە و نە دەستیشی چۆتە خوێنی هیچ بێدەستەڵاتێ.. هەر لەوانیشەوە زانی بۆچی ئەو نازناوەیان داوەتێ و تێر پێکەنی.. ژنە باڵابەرزەکەی سەر سووچی کۆڵانەکەی ئەولایانەوە، کە ناوێکی زۆر سەیری هەیە و ئەم هەرچەند دەکات بۆی لەبەرناکرێت، پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشابوون و بۆی گێڕایەوە، کە «حەمە بەڕوو» ڕێی لە هەر کەسێ گرتووە و ڕووتیکردۆتەوە، هاوکات بەڕووێکی کاڵی خستۆتە سەر زمانی و هەر خێرا لێی پرسیوە، ئاخۆ شوێنەکەیان بە سەربازەکان دەڵێت و ڕێنوێنییان دەکات.. ئەگەر وتبێتی «ئا» خێرا کوشتوویەتی و ئەگەر بە «نا»ش وەڵامی دابێتەوە بەڕەڵلایکردووە، چونکە ئەو پێی وابووە بنیادەم کاتێ شتێکی تاڵی لەسەر زمان بێت و ناخی لەگەڵیا بهەژێت، ناتوانێت درۆ بکات و بەبێ ویست ڕاستیی دەڵێت.. کەچی ئەم هیچ کاتێ ئەوەی لە بیرناچێت و هەمیشە لە یادیەتی، کە نابێت بەڕوو بگرێت بە دەستەوە و بیخوات.. ئەو جارەش «نازەنین خان» زەرفێکی سپیی بۆ پڕکردبوو لە بەڕووی ڕەش و بە دەستی «بەهار»دا بۆی نارد، هەر ئەوەندە «بەهار» پشتی لەم کرد و لە دەرگا ئاوابوو، ئەم بە پارێزەوە دەمی زەرفەکەی کردەوە و بە دیقەت، بەبێ ئەوەی دەستیان لێبدات سەیری کردن و لێیان وردبووەوە.. ئینجا بردینی بۆ لای تەنەکەی خۆڵەکە و قلّپی کردنە ناویەوە.. دەنگێکی سەیریان لێ بەرزبووەوە و ڕاچڵەکی.. دەستی ڕاستی گرت بە دڵیەوە و فیشەکی تفەنگەکەی «کاکەسوور» و پیاوەکانی بیرکەوتەوە، کە ئەو شەوە بەفریایان کەوتن و تا برینی قۆڵی «نیهال» سارێژبوو، لای خۆیان

داڵدەیان دان و خزمەتیان کردن.. دواتریش «کاکەسوور» دوو پیاوی خۆی لەگەڵدا ناردن و تا ناو «سلێمانی»یان هێنان.. ئەوەی باوەڕی نەدەکرد و بە ئەقڵیدا نەدەچوو، ئەوەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان بکەوێتە دەستی «کاکەسوور» و پیاوەکانیەوە و بە سەلامەت دەربچێت.... ئەو کاتەی «کاکەسوور» دەرکەوت و ناوبانگی لە هەموو شاردا بڵاوبووەوە، ئەم لە پۆلی پێنجی سەرەتایی بوو و لە تەنیشت «نێرگز»ی دراوسێیانەوە دادەنیشت.. ڕۆژێکیان «ست سامیە»ی بەڕێوەبەر وەکوو شێت هاتە پۆلەکەی ئەمانەوە و چوار پیاوی کەتە و زلیشی بە دواوەبوو.. دووانیان، کە جلی ڕەشی سادەیان لەبەردابوو و کڵاوی سپییان کردبووە سەریان، کتێبی «خوێندنەوەی بەسوود»ـەکانیان لێ وەردەگرتنەوە و دووانەکەی تریشیان، کە کراس و پانتۆڵی سپییان پۆشیبوو و جەزمەی ڕەشیان کردبووە پێیان، هی تازەیان بۆ دادەنان و هیچیشیان نەدەوت.. ئەمان ئەبڵەق و سەراسیمە سەیری کتێبەکانی بەردەمی خۆیان دەکرد و بە چپە لە یەکتریان دەپرسی: ئاخۆ جیاوازیی ئەمانە و ئەوانەی پێشوویان چی بێت و ئەو پیاوە شپرزانە بۆچی ئاوا بە پەلە دەیانگۆڕن..؟! بەرگیان هەمان شت و قەبارەیان ئەوەندەی یەکتر، بەڵام کاتێ گرتیان بە دەستەوە و لاپەڕەی یەکەمیان هەڵدایەوە، وێنەی ئەسپسوارێکیان بینی و ژیاننامەکەیان خوێندەوە، زانیان «کاکەسوور» کراوە بە بابەتی خوێندن و لە ترسا مەتەقیان لە خۆیان بڕی.. دواتر زەنگەکە لێدرا و لە گۆڕەپانە گەورەکەی قوتابخانەدا، زانیان کتێبی هەموو پۆلەکانی تریش وەکوو هی ئەمان گۆڕاون.. ئەو ڕۆژە هەر مناڵە و لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکەی خۆی کردبووەوە و لە وێنەکەی «کاکەسوور» ڕادەما.. پیاوێکی چوارشانەی بەسام.. سمێڵێکی سوور و زلی تێکەڵ بە ڕیشێکی سوورتر.. مرادخانیەکی ڕەش، لەسەرەوە تا خوارەوەی بە قۆپچەی سپی داخراو.. پشتێنێکی ڕەشی زل.. جووتێ کڵاشی ئێجگار سپی.. مشکیەکی ڕەشی گوڵسپیی لەسەر و ڕەشمەی ڕەشی ئەسپە سپیەکەی گرتووە بە دەستیەوە.. سەگە ڕەشەکەشی لە دوای ئەسپەکەیەوە زمانە ئێجگار سوورەکەی دەرهێناوە و ڕادەکات.. هەر مناڵە و بەو شێوەیە باسی سەرچڵیەکانی «کاکەسوور»ی دەکرد و تاوانەکانی دەگێڕایەوە، کە لە دایک و باوکیەوە

بیســـتبـووی و وەکـوو سـروود لەبەریکردبوو.. ئەم زۆر لەو منالآنەش زیاتری لە بارەیەوە بیستبوو و دەزانی، کە باوک و برایان بە دەستی ئەو کوژرابوون و تا ئەو ڕۆژە نەیانوێرابوو لە ترسی «ست سـامـیــە»ی بەڕێوەبەر باسی بکەن.. یەکێ لە کـاروانچیـەکـانی باوکی، کـە بە ڕێککەوتێکی زۆر سـەیر لە دەستی دەربازبووە و هەرچۆنێ بووە خـۆی گـەیاندۆتەوە شـار، چووە بۆ لای «جـابر»ی باوکی و بە وردی بۆی باسکردووە، کەوا «کاکەسوور» و پیاوەکانی دوای ئەوەی ڕێگایان لێگرتوون و دەستیـان بەسەر هەمـوو لۆری و بارەکانیـان داگرتووە، ئینجا ڕیزیان کـردوون و بە بەر گوللەیان داون.. ئەمیان بۆیە لەوانی تر جیاکردۆتەوە و نەیانکوشتووە، چونکە وێنەیەکی «ئیـمـامی عـەلی»یان لە گـیـرفـانـیـدا دۆزیوەتەوە و نووسـاندوویانە بە سنگی خۆیانەوە.. لەمەوە کاروانچیەکانی باوکی کاتێ خورمـا و پرتەقاڵیـان لە لۆریەکـان باردەکرد و بۆ ناو کوردەکـانیـان دەبرد، تا لەوسەر گـەنم و جۆ و گـوێز و بەڕوو بهێنن و بیـانخەنە گەنجینەکانەوە، وێنەی «ئیـمامی عەلی»یان لە جامی پێشـەوەی لۆریەکان دەدا و ئەملا و ئەولاشیـان بە وتەکانی ئەو دەڕازاندەوە، بەلاّم «کاکەسوور» جارێکی تریش ڕێی لە کاروانچیەکان گرتەوە و دەستی بەسەر هەموو بارەکـانیـاندا گـرت.. ئەو تـاقـە کـاروانـچـیـەی بە سـەلامـەت دەرچووبوو و مـەرگی هەمـوو هاوکارەکـانی بە چاوی خۆی بینیبـوو، پیاوێکی «فـەیلی» بووە و لە زۆر زووەوە خەریکی ئەو کـارە بووە.. بە قسـەی ئەو «کـاکەسوور» بە نووکی زۆر تیـژی خـەنجـەرە دەسکسـپـیـەکـەی خـۆی وێنەکـانی لـە لۆریەکـان کـردۆتەوە و لـە هەمـوو لایەکەوە هێڵی بەسەر وتەکاندا هێناوە.. ئـینجا ڕیزی کردوون و ناو گـوێچکەکانی پڕکـردوون لە گـولله.. ئەم دەسـتـەودامـێنیـان بووە و بە زمـانەکـەی خـۆیان لێـیـان پاڕاوەتەوە، کە نەیکوژن و ئـازادیان کردووە.. هەر ئەویش وتبـووی: «کـاکـەسـوور» تاکە ڕێگرێکە دەتوانێت لە دەشتێکی ئاوا کاکی بە کاکیدا ڕێ لە کـاروان بگرێت و گـوێ بەو سـەرباز و پۆلیســانە نەدات، کــە بۆ پاراسـتنی گــیـان و مــاڵی کـاروانچیـەکـان دانراون و چاکـترین مـانگانە وەردەگـرن.. سەربـاز و پۆلیـسـەکـان هەمیشـە دادوبێدادیان بوو لە دەست «کاکەسوور» و پیـاوەکانی و ڕۆژانە لاشەی بێشومـاریان دەگەیشـتەوە ناو شـار.. هەر ئەوانیش بوون هەواڵیان بۆ کەسوکـاریان

دەناردەوە و دەیانوت: «کاکەسوور جنۆکەیە.. لەپڕ پەیدا دەبێت و لەناکاو لە چاو ون دەبێت.. گوللەبەندی لەبەردایە و گووللە گیانی نابڕێت».. مەلاکان لە منارەی زۆر بەرزی مزگەوتەکاندا دەنگیان هەڵدەبڕی و دەیانوت: «جنۆکە نییە، بەڵکوو شەیتانە».. موختارەکان دەرگا بە دەرگا دەگەڕان و دانیشتوانی گەڕەکەکانی خۆبان ئاگادادەکردەوە، کە دیواری حەوشەکانیان بەرزبکەن و شەوان دەرگاکانیان بە قوفڵی گەورە دابخەن.....

«نەوال» دەیان جار بە خەیاڵی «کاکەسوور»ـەوە نووستووبوو و خەونی جۆراوجۆری پێوە بینیبوو.. هەموو جارێ بێداردەبووەوە و لە ترسا هەموو گیانی هەڵدەلەرزی.. پاڵی بە «فەریال»ی خوشکی دەدا و خۆی دەخزاندە باوەشیەوە.. هەندێ جار ئەویشی خەبەردەکردەوە و لە ژێر ئەو لێفە سپییەی تا سەر چاویان دەهێنا، خۆی گرمۆڵەدەکرد و بە چپە و بە زمانی تێکئالاوەوە پچڕ پچڕ خەونەکەی بۆ دەگێڕایەوە، ئیتر «فەریال» لە ترسا دەیزرووکاند و دایک و باوکیان لە ژوورەکەی خۆبانەوە بە چاوی خەواڵووەوە بە فریایان دەکەوتن.. دوایی دایکیان، بۆئەوەی نەترسن و شەو خەبەریان نەبێتەوە، لە ژوورەکەی خۆیاندا جێگای بۆ دادەخستن و گڵۆپێکی کەمێ کزیشی تا بەیانی دادەگیرساند.. لە ماڵی «سیامەند»دا کەمتر هەستی بە ترس دەکرد و زیاتر دەچوو بۆ ئەوێ.. لە نێوان ئەو و «سیستەر شازەمان»ی ژنیدا دەنووست و خۆی لە باوەشیاندا متدەکرد.. قاچەکانی دەخستە نێوان ڕانەکانی «سیامەند» و جووڵەی لێدەبڕین.. وەکوو سەردەمی مناڵیی ڕوومەتی لەسەر قۆڵی ڕووتی «شازە» دادەنا و دەستەکانیشی دەخستە سەر سنگیەوە.. «نەوال» لەو کاتەوە دەچووە سەر جێگا و تا خەویشی لێدەکەوت، بیری لە «کاکەسوور» دەکردەوە و لە خەیاڵی خۆبدا دەیهێنا و دەیبرد.. دەیبرد و دەیهێنایەوە، ئاخۆ کەی سەربازەکان دەیگرن و دەیهێنن لە ناوەڕاستی شار و لەبەر چاوی ئەو هەموو خەڵکە هەڵیدەواسن..؟!...

ڕۆژانی پێنجشەممە، کاتێ هەر شەش پۆلەکە، سێیان لەمبەر و سێیان لەوبەر، لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەی قوتابخانەدا بە ڕیکی دەوەستان و شانیان بە یەکەوە دەنووساند، بەڕێوەبەری قوتابخانە ترسی گیانی مناڵانی دەردەکرد و نوقڵی بەسەر

ئەوانەدا دابەشدەکرد، کە باوک و برایان بە دەستی «کاکەسوور» کوژرابوون و لە حەژمەتا ڕەنگیان بە بەرەوە نەمابوو.. «نەوال» چەند بەزەیی بەو منالآنەدا دەهاتەوە و چۆن فرمێسک لە چاوەکانیدا قەتیس دەمان، کە لەگەڵ قسەی بەڕێوەبەر دەستیان دەکرد بە گریان و بە چمکی کراسە ڕەشەکانیان سەری خۆیان دادەپۆشی..!! بەڕێوەبەر و مامۆستاکان ژێریاندەکردنەوە و هەمیشە بەوە دڵیان خۆشدەکردن، کە ڕۆژێ دێت سەرباز و پۆلیسەکان «کاکەسوور» دەسگیردەکەن و هەقی باوک و برای ئەوانی لێدەکەنەوە.. چاوە شەڕانیەکانی دەبەستن و لە ناوەڕاستی شاردا هەڵیدەواسن.. ئینجا داوایان لە «نەوال» دەکرد بێت لە ناوەڕاستی هەموویان و لەسەر سەکۆ سپیەکەدا بوەستێت و گۆرانییان بۆ بڵێت.. گۆرانییان بۆ بڵێت و ئەمانیش تێکڕا چەپڵەی بۆ لێبدەن.. زۆر جار لە ناوەڕاستی گۆرانییەکەدا هەنسکی گریان ئابڵووقەی قوڕگی دەدا و دەنگی تەواو دەگۆڕا.. هەرچەند دەیویست دان بە خۆیدا بگرێت و لەبەر چاوی مامۆستا و قوتابییەکان نەگری، بەڵام مەحاڵبوو و لەپڕ دەتەقیەوە.. دەگریا و گۆرانییەکەشی نەدەبڕی.. نەخێر، ئینجا بەسۆزتر، بەلەزەت و پڕنەشئەتر دەنگی لێ هەڵدەبڕی.. زۆر لە قوتابی و مامۆستاکانیش خۆیان بۆ نەدەگیرا و لەو بەکوڵتر دەستیان پێدەکرد...

جارێکیان هەواڵ بڵاوبووەوە و بە سەرتاپای وڵاتدا گەڕا، کەوا «کاکەسوور» گیراوە و هەرچی خەڵکی شار هەبوو لە گۆڕەپانی «معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان»دا کۆکرانەوە.. «نەوال» زۆر بە پەرۆشەوە لەگەڵ قوتابی و مامۆستاکانی قوتابخانەکەیدا چوون بۆ ئەوێ و ڕیزی لای پێشەوەیان گرت.. سەیری «کاکەسوور»یان دەکرد و هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ وێنەی سەر لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکانیاندا نەدەبینی، تەنها ئەوە نەبێت لە ئەسپە سپیەکەی دابەزیبوو و سەگە ڕەشەکەشی لە بەردەمیا هەڵترووشکابوو.. «کاکەسوور» بەو زمانە قسەی دەکرد و وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە، کە مەلاکان پێی دەدوێن و کتێبەکانی پێ دەنووسرێن.. خەڵک شاڵاویان دەهێنا تا بە دار و بەرد تێیکەون و لە چاوترووکانێکدا ونجڕ ونجڕی بکەن، بەڵام پۆلیس و سەربازەکان ڕێیان لێ دەگرتن و پێیان دەوتن، کە تەنها ئەو منالآنە دەبێت بێنە پێشێ و بەردبارانی بکەن، کەوا

باوک و برایان بە دەستی ئەو کوژراوە و ناوەکانیان لە لیستەی لای بەڕێوەبەری خۆیاندا هەیە.. لە قوتابخانەکەی «نەوال»دا بیستوچوار کچ بەشدارییان لە بەردبارانکردنی «کاکەسوور» و ئەسپ و سەگەکەیدا کرد و ئەوانی تر جورئەتیان نەکرد لێی نزیکبکەونەوە.. «نەوال» زۆر لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی خۆیان پاڕایەوە و گەلێکیش بە سائەقە و بە قوربانی بوو، کە ناوی ئەمیش لە لیستەکەدا بنووسێت و تووڕەگەیەک لەو بەردە سەیرانەی بداتێ، کە هیچ لە بەردی ئاسایی نەدەچوون و بە باوەڕی خۆی لە شوێنێکی زۆر دوور هێناویانن، چونکە «کاکەسوور» دوو جار دەستی بەسەر کاروانەکانی باوکیدا گرتووە و کۆمەڵێ لە پیاوەکانی بە گوللەی ئەو کوژراون، بەڵام بەڕێوەبەر ڕازیی نەبووو و چەند جارێکیش تەریقیکردەوە.. تەنانەت بەوەش قایل نەبوو پارچەیەکی بچووکی پشتێنەکەی «کاکەسوور»ی بداتێ و بۆ خۆی بیکات بە قردێلە.. قژی پێ ببەستێت و خۆی پێوە بنوێنێت.. سەری بادا و پێی وت:

ـ ئەمەش هەر بۆ ئەو منداڵانەیە، کە باوک و برایان بە دەستی ئەو کوژراون.

ساڵێکی برد و نەبرد جارێکی تریش «کاکەسوور» پەیدابووەوە و دەستی کردەوە بە کوشتنی سەرباز و پۆلیس.. «نەوال» ئەو ئێوارەیەی زۆر چاک لە یادە و مەحاڵە بیری بچێتەوە، کە لەگەڵ دایکی و «فەریال»ی خوشکی مەقەڵیەکەیان لە ناوەڕاستی باخەکەی خۆیاندا دانابوو و گۆشتیان لەسەر دەبرژاند، کاتێ «ئەمجەد»ی خاڵی بە کراس و پانتۆڵێکی ڕەشەوە دەرگاکەیانی بە لەقە کردەوە و بە شپرزەییەوە پێی وتن:

ـ کاکەسوور زیندووبووەتەوە..!!

ئەمان لە پێشدا وایان دەزانی گاڵتە دەکات و زۆر بە خەیاڵیاندا نەهات، بەڵام دوایی سوێندی خوارد و وتی، کە شەوی ڕابردوو دوانزدە کەس بە دەستی ئەو کوژراون و لاشەکانیان لەو دەشتە بەجێماون.. پیاوێک بە برینداریی گەیشتۆتەوە ناو شار و بە چاوی خۆی دیویەتی.. ئەمان ئەمجارە زۆر زیاتر لە جارانی پێشوو ترسان و شڵەژان، هەر لەبەر ئەوە نا «کاکەسوور» زیاتر لە ڕۆحێکی هەیە و نامرێت، بەڵکوو لەبەرئەوەیش باوکیان بۆ یەکەمین جار بەمەبەستی بینینی ناوچە

شاخاویەکان و بازرگانی، خۆی لەگەڵ پیاوەکانیدا چووبوو بۆ ئەو ڕێگایە و ترسیان لێهات بە ساغی بۆبان نەگەڕێتەوە.. دایکی دەگریا و دەیوت:

ـ لە خەونما بە سەتڵێکی ڕەش ماستم دەکردە تەنووری ماڵی سیامەندەوە، زۆر دەترسم بەبێ باوک بمێننەوە.

ئەمان لەو قسانەدا بوون و بیریان لە چارەنووسی باوکیان دەکردەوە، «ئەدهەم»ی باپیری چەراویەکەی خستبووە ژێر باڵی و دامێنی سایە سپیەکەی بە دەستیەوە گرتبوو، شپرزە و زارەترەک لە دەرگا سپیەکەی حەوشەدا پەیدابوو و بە هانکەهانکە بەرەو لایان هات.. ئەوەندەی ڕاکردبوو هەموو گیانی ژێر ئارەقە کەوتبوو و نەیدەتوانی قسە بکات.. پشووێکی کورتی دا و وتی:

ـ میقداد شەکرچی و هەر دوو کوڕەکەی کوژراون.

ئەوان چەند ڕۆژێ پێش کاروانەکەی باوکی دەرچووبوون و کەوتبوونە ڕێ، بۆبە ئەوەندەی تر زیرەیان کرد و هیوایان بە گەڕانەوەی نەما.. «نەوال» بۆ بەیانیەکەی، کە جانتاکەی هەڵگرت و چوو بۆ قوتابخانە، «بولدان»ی دراوسێیانی لە ڕێگا بینی و پێی وت، کەوا چوار سەرباز، دووانی کڵاوڕەش و دووانی کڵاوسپی، لەگەڵ هەشت پۆلیسی ڕەشپۆش بە دەستی «کاکەسوور» کوژراون و یەکێکیان باوکی کچێکی پۆلەکەیان بوو...

ئەو کاتەی چوار سەربازە سپیۆپشەکە تەرمەکەی «جابر»یان هێنایە حەوشەوە و لە ناوەڕاستی باخەکەیان دانا، «نەوال» لە هەیوانەکەدا دانیشتبوو و وێنەی قازێکی لەسەر ئەو دەفتەرە دەکێشا، کە «کاترینا» پێشکەشی کردبوو و بەرگەکەی ڕۆژژمێرێکی ئەو ساڵەی لەسەر کێشرابوو.. ئەو هەمیشە حەزی دەکرد «نەوال» لەپاڵ مۆسیقادا فێری نیگارکێشان بێت و زۆریش یارمەتیی دەدا، چونکە وایدەزانی توانایەکی شاراوەی لەو هونەرەدا هەیە و دوورنییە نیگارکێشێکی زۆر کارامەی لێ دەربچێت، بەڵام ئەم حەزی لێ نەدەکرد و پێشی ناخۆشبوو داوای شتی ئاوای لێبکات.. ئەگەر لەبەر دڵی «کاترینا» نەبوایە و ئەوەندە خۆشینەویستایە، هەرگیز ئاوا بە گەرمیی خەریکی نیگارکێشان نەدەبوو و شتی تر زۆربوو ئەم خۆی پێوە بخافڵێنێت.. «کاترینا» بۆئەوەی هانی بدات و وزەی

بخاته بەر، دەفتەر و قەڵەمی سەیر سەیری بۆ دەکڕی و باسی هونەرمەندە ناسراوەکانی جیهانی بۆ دەکرد.. هەر زوو زوو باسی گوێچکە بڕاوەکەی «ڤان کوخ»ی بۆ دەکرد و ئەم گوێچکەی بۆ شلدەکرد.. ئەو جارەی «نەوال» پەڕێکی تەنکی خستبووە سەر وێنەکەی «کاکەسوور» و بە قەڵەمێکی ڕەشی تۆخ تۆخ لەبەری گرتەوە، لەبەری گرتەوە و پیشانی «کاترینا»ی دا، ئەو زۆری پێ ناخۆشبوو و سەرزەنشتی کرد.. سەرێکی ناڕەزایی بۆ بادا و پێی وت:

ـ ئەمە چییە تۆ کردووتە.. ؟!

«نەوال» سەیرێکی چاوەکانی کرد و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ بۆچی تۆ پێت ناخۆشە من وێنەی کاکەسوور بکێشم.. ؟!

ـ من ئەوەم پێناخۆشە تۆ لەبەرت گرتۆتەوە، ئەگینا پێم ناخۆش نییە وێنەی ئەو بکێشیت.

دوای ئەوە «نەوال» وێنەکەی «کاکەسوور»ی لە بەردەمی خۆی دانا و زۆر بە دیقەت سەیری دەکرد.. سەیری دەکرد و سووک سووک قەڵەمە ڕەشەکەی دەجوڵاند، دەیویست هەر چۆنێ بێت وێنەیەکی وا بکێشێت کەمێ لەو بچێت و دڵی «کاترینا»ی پێ ڕازیی بکات، بەڵام کاتێ تەواویکرد و پیشانی دا، ئەو خێسەیەکی کرد و پێی وت:

ـ ئەمە وێنەی کاکەسوور نییە و لەویش ناچێت.

دواییش ناوچەوانی کەمێ گرژکرد و پێی وت:

ـ تۆ جارێ واز لە کاکەسوور بێنە، چونکە زۆر زەحمەتە بتوانیت وێنەی ئەو بکێشیت.. وا چاکترە بە وێنەی قاز دەست پێبکەیت.

«عەمار»ی کوڕی «حەسەن خوداداد» هەمیشە ئامۆژگاریی «نەوال»ی دەکرد و پێی دەوت، کە دەست لە نیگارکێشان هەڵبگرێت و بە کەڵکی نایەت.. هەر جارێ «نەوال» دەچوو بۆ دووکانەکەی باوکی و کارتۆنە سپیەکانی چا و هی بیبەری ڕەشی دەهێنا.. دەیهێنان و دەیخستنە سەر مێزە ڕەشەکەی بەردەمیەوە، سەیری شتەکانی دەوروبەری دەکرد و وێنەی دەکێشان.. بە زۆری ئەو ژنە ڕەشپۆشانە سەرنجیان ڕادەکێشا و خێرا دەیخستنە سەر کارتۆنەکان، کە قازە

سپیەکانیان بە دەستەوە بوو و دەیانبردنە مەیانەکەی ئەوبەر.. لە بەردەمی خۆیانیان دادەنان و دەیانفرۆشتن.. «نەوال» نەیدەزانی بە قسەی «کاترینا» بکات، یان بە هی «عەمار» و دڵی کامیان لە خۆی بڕەنجێنێت، چونکە هەر دووکیانی بەقەدەر یەک خۆشدەویست و نەیدەتوانی جیاوازییان لە نێواندا بکات.. هەمیشە وایدەزانی «عەمار» براگەورەیەتی و زۆر جار نازی بەسەردادەکرد.. جارێکیان لە دواوە دەستەکانی کردە ملی باوکیەوە و پێی وت:

ـ باوکە خۆزگە لەجیاتی میقداد شەکرچی، لەگەڵ باوکی عەماردا شەراکەتت دەکرد.

باوکی زۆری پێ خۆشبوو و کۆڵێ گەشایەوە، کە کچەکەی ئەوەندە ئاقڵە و لە ئێستاوە شتی ئاوا دەزانێت، بۆیە لە پێشا زۆر بە گەرمیی ئافەرینی لێکرد و دەستەکانی توند توند نووساند بە سنگی خۆیەوە، دواییش ماچی کردن و پێی وت:

ـ زۆر جارم پێ وتوە، کەچی ئەم هەمیشە ئاخێ هەڵدەکێشێت و دەڵێت: هیچ باڵندەیەک ئەوەندەی قاز حەزی لە فڕین نییە، بەڵام باڵەکانی لە قەدەر جەستەی نیین و ناتوانن بەرزیکەنەوە، بۆیە ئەنجام لەسەر زەوی دەیتوێننەوە.

ـ ئەمە یانی چی باوکە..؟! قاز چۆن دەتوێتەوە..؟!

ـ نازانم ڕۆحەکەم، بەڵام ئەوەندە دەزانم ڕازیی نابێت شەراکەتم لەگەڵدا بکات.

دایکی ئەوسا بە مەقەستە ڕەشەکە پارچە قوماشە سپیەکەی دەبڕی و بە سووکی گۆرانیی دەوت، بەبێ ئەوەی سەری بەرزبکاتەوە و سەیری ئەمان بکات، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ـ دوورنییە پێشبینیی دەرد و بەڵایەکی گەورەی کردبێت..!!

«عەمار» و «حەسەن خوداداد»ی باوکی، دوای کوژرانی «جابر»ی دراوسێی دووکانیان، هاتن و لەسەر داوای «ست سوعاد» «نەوال»یان برد بۆ لای خۆیان، چونکە «نەوال» لەو ڕۆژەوە تەرمەکەی باوکیان هێنایەوە و ئەم لەپڕ بینی، زۆر دەترسا و بە هیچ کلۆجێک خەوی لێنەدەکەوت.. دایکی ئاسنگەرێکی ڕەشپۆشی هێنا و پشتێنەی ئاسنی بۆ دەرگا و پەنجەرە سپیەکان کرد.. شەو لە تەیشت

خۆیەوە جێگای بۆ دادەخست و لەگەڵ «سیستەر شازەمان»ی ژنی «سیامەند»ی وێنەگر، کە دوای گیرانی مێردەکەی لەگەڵ ئەواندا دەژیا و هەمیشە دڵنەوایی دەکرد؛ تا بەیانی بە دیاریەوە دادەنیشتن و دەستەکانیان دەگوشی بە سنگی خۆیانەوە، کەچی هەر سوودی نەبوو و زیاتر هەڵدەلەرزی.. ئەگەرچی «شازە»یش لە خوێن و گۆشتی «کاکەسوور» بوو و لەناو ماڵەکەشیاندا دەژیا، کەچی لەو جارەوە، کە لە خەونیدا «کاکەسوور»ی بینی قژە درێژ و ڕەشەکەی ئەوی بەستبوو بە کلکی ئەستووری ئەسپەکەیەوە و لەسەر ڕێگایەکی خەڵووزڕێژدا بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشا.. ئەوەندەی تر لە ماڵی خۆیاندا هەستی بە ترس دەکرد و خەونی ناخۆش و ترسناکی دەبینی.. هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی ئەوە لە بیر خۆی بەرێتەوە، کە چۆن جلە سپیەکانی هەموو ڕۆژێ بە ئوتووە ڕەشەکە ئوتووی دەکردن و لە خەستەخانە لەبەریدەکردن، سەرەتا لەناو خەڵووزدا ڕەشهەڵگەڕان و دواییش خەڵتانی خوێن بوون... باپیری و «ئەمجەد»ی خاڵی و «دکتۆر سەلوا»ی خاڵۆژنیشی هاتن و بە ئێجگاری لەگەڵیاندا ژیان، بەڵام ئەم هەر دەترسا و ڕۆژ بە ڕۆژ سیس و لاواز دەبوو.. «ست هالە»ی پووری و «عەقید شەهاب»ی مێردی چەند ڕۆژێ بردیان بۆ لای خۆیان و لە ناوەڕاستی خۆیاندا دەیانخنواند، کەچی لەوێش هەر دەترسا و ناچار هێنایانەوە.. «ئەنوەر ئەبوەر»ی وەزیری بەرگری، کە ژنەکەی پوورزای «ست سوعاد» بوو و «هیام»ی کچی زۆر دڵی بە «نەوال» دەکرایەوە، تەلەفۆنی بۆ کردن و پێی وتن، با بیهێنن بۆ ماڵی ئەوان و لە ژێرزەمنەکە بینوێنن، بەوێش ڕازیی نەبوو و واشیدەزانی ماڵەکەی ئەوان لە هەموو شوێنێ زیاتر مەترسیی لێدەکرێت.. «کاترینا» هەمیشە دڵنیای دەکرد و پێی دەوت، کەوا «کاکەسوور» هەرگیز ناتوانێت جورئەت بێنێتە بەر خۆی و دوو پێی بخاتە ناو شار، لەبەرئەوە نا، کە ناوێرێت و لە هێزەکانی دەوڵەت دەترسێت، بەڵکوو ئەو لە شاری گەورەدا هەست بە شەرم دەکات و تەریقدەبێتەوە.. مرۆڤیش، کە تەریقبووەوە توانای دەستوەشاندنی نامێنێت و خۆی لە پێش هەموو کەسێکەوە دەبێت بە دوژمنی خۆی.. گوێی لەویش نەگرت و بۆ یەکەمین جار هەستی کرد «کاترینا» درۆی لەگەڵدا دەکات.. لە داخا دەستی کرد بە گریان و بە

کەس ژیرنەدەبووەوە...

ئەو ئێوارەیەی «عەمار» و «حەسەن خوداداد»ی باوکی هاتن بۆ سەردانیان و «نەوال»یان بینی بە لێفەیەکی سپی تا چەناگەی داپۆشرابوو، لە حەژمەتا دەستیان کرد بە گریان و فرمێسکیان بۆ ڕشت.. «نەوال» کە چاوی کردەوە و ئەوانی بە قاتی ڕەش و کراسی سپییەوە بینی، خێرا هەستایەوە و خۆی هەڵدایە باوەشی «حەسەن خوداداد»ـەوە، توند توند دەستەکانی «عەمار»یشی گرت و کردنیە ملی خۆیەوە.. دایکی و «فەریال»ی خوشکی، کە بینیان «نەوال» لە لای ئەوان هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەکات و ڕەنگی هاتۆتەوە بەر، بەزەییان پیادا هاتەوە و بە جووتە دایانە پرمەی گریان.. هەرچەند «عەمار» و باوکی دەیانویست هەستن و بڕۆن، ئەم توند توند دەیگرتن و دەگریا.. لێیان دەپاڕایەوە و پێی دەوتن:

ـ تووخوا مەڕۆن.. تووخوا شەو لای ئێمە بن.

دایکی فرمێسکەکانی چاوی بە چمکی کراسە ڕەشە گوڵسپییەکەی سڕی و بە شەرمێکەوە پێی وتن:

ـ ئەگەرچی دەزانم زەحمەتیشە، بەڵام خۆزگە ماوەیەک دەیبەن بۆ لای خۆتان، بەشکوو ترسی بشکێت و چاکببێتەوە.

«حەسەن خوداداد» زۆر بە خۆشحاڵییەوە سەیری کرد و وتی:

ـ برازای خۆمە وماڵیشم ماڵی خۆیەتی.

«عەمار» لە خۆشیا خەریکبوو باڵبگرێت و بە زمانێکی تێکئاڵاوەوە بە «ست سوعاد»ی وت:

ـ بڕوا بکە پێش ئەوەی تۆش بیڵێیت، خۆم دەمویست پێت بڵێم، بەڵام وتم نەوەکا ڕازیی نەبیت.

ئەوان ماڵێکی پەڕپووتیان هەبوو و هیچ لە هی دەوڵەمەندەکان نەدەچوو.. هەمیشە هەستت دەکرد شتەکانیان پێچاوەتەوە و بەتەمای گوێزانەوەن، بەڵام سەرەتا «نەوال» لەوێدا زۆر کەم هەستی بە ترس دەکرد و وردە وردە ڕەنگوڕووە گەشەکەی جارانی دەهاتەوە بەر.. ڕۆژانە بۆ خۆی لەگەڵ «هیجران»ی کچیان لە حەوشەکەدا بە جووتە یارییان دەکرد و وەزیفەیان دەنووسیەوە.. جار جاریش قاپ

و قـاچاغـيـان دەشت و نـاومـاڵەكـەيان گـسكدەدا.. شـەوانەش هەر بە يەكـەوە دەنووسـتن و تا درەنـگ بە چپـە قـسـەيان بۆ يەكـتـر دەكـرد.. «هيـجـران» بە زۆرى قـسـەكـانى «ست سـوعـاد»ى دايكى بۆ دەگـێـڕايەوە و تەمـسـيلى جـووڵە و هەڵسوكەوتەكانى دەكرد، كە چۆن لە قوتابييەكانى تووڕەدەبێت و بە توندى قژيان ڕادەكێشێت، لە كـاتێكدا ئەوى زۆر خۆشـدەوێت و هەمـيـشـە گـاڵتـەى لەگـەڵدا دەكات، چونكە زيرەكە و قسەى ڕەوانە.. شيعر لەبەردەكات و ڕستەكان بە ڕێكى ئيـعـراب دەكـات.. ئەگـەرچى «هيـجـران» دوو سـاڵ لـەم گـەورەتربـوو و زۆربەى ئارەزووەكـانى لەهى ئەم جـيـاوازبـوون، بەڵام ئەم ئەوەنـدە زۆرزان بوو بەقـەدەر ئەو شتى دەزانى و لە يەكتر بێزار نەدەبوون.. «مەديحە»ى دايكى «عەمار» ئەوەندەى تاقە كچـەكەى خۆشيـدەويست و وەكـوو دايك نازى دەكێشـا.. هەر جارێ «ست سوعـاد»يش دەهات بۆ لايان و پرسيارى لێدەكرد، ئەو پەنجەى باڵابەرزەى دەستى چەپى بە شێـوەيەكى زۆر سـەير ڕادەشـەقـاند و پێى دەوت، كـەوا كـچـەكـەى زۆر دەستڕەنگينە و فـێربووە بە دوو شيشى ڕەش خوريى سپيى بچنێت و بە زەنگيانە مێرووله و دووپشكى ڕەش، پەڕەسێلكە و حاجى لەقلەقى سپى درووست بكات..
هەمـوو بەيانـييـەكـيش «عـەمـار» دەسـتى هەر دووكـيـانى دەگـرت و دەيبـردنە لاى فـولكەكەى ئەوبەرى مـاڵى خۆيانەوە.. لەوێ لەسـەر زەوقى ئەم، عـانەيەكى دەدايە ئەو عەرەبانچيە سپيپۆشەى، كە دوو ئەسپى ڕەش عەرەبانە سپيەكەيان ڕادەكێشا و تا قـوتـابخـانەى دەبردن.. لە پێـشـدا «هيـجـران»يان لە بەردەم «ناوەنديى زەنووبيا ء»دا دادەگرت و ئەمـان دەمـانەوە.. دواى كـەمێكى تر لە لاى «سـەرەتايى خەولەى كچى ئەزوەر»دا بە جـووتە دادەبەزين و «عـەمـار» لەوێوە بە پێ دەچوو بۆ دووكـان.. تا تـەواو لێى دووردەكـەوتـەوە و دەچووە ناو حـەوشـەى قـوتابخـانە، پشتاوپشت دەڕۆيشت و باىباى بۆ دەكرد.. لەوسەريش لەگەڵ خۆيدا دەيهێنانەوە و لە ڕێگا گاڵتەى سەير سەيريان بە يەكەوە دەكرد....
«نەوال» هەميشە بيرى لەوە دەكردەوە ئەگەر جارێكى تر سەرباز و پۆليسـەكان «كـاكەسـوور»يان دەسگيركـردەوە و هێنايان بۆ گۆڕەپانێكى ناو شـار، ئەوا ئەم بە بەڕێوەبەرى قوتابخانەكەى خۆيان دەڵێت و بە هەر شێوەيەك بێت ڕازيبيدەكات، كە

چاكتر وايە گەورەكان خۆيان بە چەقۆ بێت، يان بە تفەنگ، بيكوژن و نەيدەنە دەست مناڵانەوە، چونكە مناڵان ناتوانن كەسێكی زل و كەتەی وەكوو «كاكەسوور» بكوژن و ئەو گيانە قايمەی لە كونەكانی لووتيەوە دەركەن.. ئەگەر بشيكوژن زيندووەبێتەوە و لە جاران ترسناكتر سەرهەڵدەداتەوە.. ئەم هەرگيز ئەوەشی لە بير نەدەچوو و هەميشە ئاخی بۆ هەڵدەكێشا ، كە ئەو جارە «ست ساميە»ی بەڕێوەبەر پارچەيەكی بچووكی پشتێنەكەی «كاكەسوور»ی نەدايە و زۆريش لێی تووڕەبوو، بۆيە دەيويست پێی بڵێت ئەمجارە لە پێش هەموو كەسێكەوە بيداتە ئەم و بۆ خۆی دەيكات بە قردێلە.. قژە ڕەش و خاوەكەی پێ دەبەستێت و لەبەر چاوی مناڵان خۆی پێوە دەنوێنێت، كەچی كاتێ بيری لە ژمارەی مناڵە باوككوژراوەكان دەكردەوە و لە خەياڵی خۆبدا تاوتوێيدەكردن، هيوای بەوە نەدەما ئەو پشتێنە چەنديش درێژبێت بەشی ئەو هەموو مناڵە بكات و تەواو پەستدەبوو.. خۆيشی نەيدەزانی بۆچی لێی بووبوو بە مەراق و هەميشە خەونی بەوەوە دەبينی، كە ڕۆژێ لە ڕۆژان پارچەيەكی ئەو پشتێنەی «كاكەسوور» بكات بە قردێلە و ئەو قژە ڕەشەی پێ ببەستێت..!!

«نەوال» لەو جارەوە، چوار پياوەكە هاتنەوە و ئەو كتێبانەيان لێ سەندنەوە، كە وێنەی «كاكەسوور»ی تيابوو و هەموو ڕۆژێ ژياننامەكەيان دەخوێند، ئەوەندەی تر لەوە هيوابڕاو بوو «كاكەسوور» دەمرێت و لە داخا حەزی نەدەكرد بچێت بۆ قوتابخانەش.. لەمەوە قەدەغەبوو هيچ كەسێ گەورە، يان بچووك، نە بە چاكە و نە بە خراپە، باسی خۆی و پياوەكانی بكات و جنێوەكانی سەر ديوار و سەر جامی ئۆتۆمۆبيلەكانيشيان سڕيەوە.. هاوكات تەرمی «حسەين خودادادا»ی مامی «عەمار»يش گەيشتە بەر دەرگا و «نەوال» و «هيجران» لە پێش هەموو كەسێكەوە بينيان.. ئيتر «نەوال» ترسەكەی بۆ هاتەوە و ئەوەندەی تر زەندەقی چوو.. ئەم تا ئەو كاتەش لەبەرئەوە ئەوەندە لای ئەوان هەستی بە دڵنيايی دەكرد و شەوانە بە ئاسانی خەوی لێدەكەوت، چونكە وايدەزانی زمانی «كاكەسوور» دەزانن و هەر كاتێ هەڵيكوتايە سەريان، دەتوانن لێی بپاڕێنەوە و وای لێبكەن دەستيان بۆ نەبات، كەچی وا ئەميش هيچ و ماڵی ئەوانيش وەكوو هەر

شوێنێکی تر لە مەترسیدایە......

ماڵی «حەسەن خوداداد» سەرقاڵی ناشتنی تەرمەکە بوون و ئاگایان لەم بڕابوو، وەکوو مشکی ترساو و زارەترەک لە کونجی ژوورەوە خۆی گرمۆڵە کردبوو و هەڵدەلەرزی.. خوا خوای بوو یەکێ بێت بە لایەوە و بیگەیەنێتەوە ماڵی خۆیان.. باشبوو دایکی کە زانی ئەوان بە کۆستی خۆیاندا کەوتوون و خەریکی قوڕپێوانن، هات بە شوێنیا و لەگەڵ خۆیدا بردیەوە.. جارێکی تر جێگاکەیان بۆ داخستەوە و بە دیاریەوە دانیشتن...

دوای هەڵگیرانی پرسەکە «عەمار» هاتەوە و جارێکی تر «نەوال»ی بردەوە لای خۆیان، بەڵام ئەم لە ماڵی ئەوانیشدا دەترسا و لەوەش ناخۆشتر ئەوەبوو شەرمی دەکرد پێیان بڵێت دەترسێت.. «عەمار» هەمیشە سەری ئەمی دەخستە سەر ڕانی خۆیەوە و بە سووکی دەستی بە قژە ڕەش و خاوەکەیدا دەهێنا.. جورئەتی دەنایە بەری و دڵنەوایی دەکرد، بەڵام «نەوال» وەکوو جاران لای ئەو هەستی بە دڵنیایی نەدەکرد و گاڵتەیشی لە قسەکانی دەهات.. ئەگەرچی زۆر لە جاران زیاتر خۆشیدەویستن و ئەوەندەی تر هۆگریان ببوو.. «عەمار» ڕۆژانی هەینی لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ دووکان و لەوێشەوە بۆ ناو بازاڕ.. دەستی دەگرت و شتی جوان جوانی بۆ دەکڕی.. شەوانیش کە ڕادەچڵەکی و بەدەم هاوار هاوارەوە خەبەریدەبووەوە، ئەو خێرا و لە پێش دایک و باوکیەوە بە فریای دەکەوت و دەستی چەپی دەخستە سەر ناوچەوانی.. دەستەکانی ئەمیشی دەنووساند بە دڵی خۆیەوە و بە لێفە سپیەکە دایدەپۆشیەوە، بەڵام مەحاڵبوو ترسی گیانی بڕەوێتەوە و خەوی لێبکەوێتەوە....

نیوەڕۆیەک «نەوال» هێشووە ترێیەکی ڕەشی کردبووە قاپێکی پلاسکۆی سپیەوە و دانە دانە دەیدایە ئەو قەلەموونە سپیەی، کە بە پەتێکی ڕەش قاچیان لە بۆریە سپیەکەی ناوەڕاستی باخەکەوە بەستبووەوە و ئەڵقەیەکی ڕەشیان کردبووە پۆپنە سوور و شۆڕەکەی ژێر دەنووکیەوە.. قەلەکە بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەنووکە سپیەکەی لە دەنکە ترێکان دەدا و دەیقۆزتنەوە.. ملە درێژ و بە گوڵنگە سوورەکانی بەرزدەکردەوە و لە چاوترووکانێکدا قووتیدەدان.. لەپڕ دەرگا ڕەشەکە

ترازا و سەربازێکی سپیپۆش لە حەوشەدا پەیدابوو.. بەر لە هەموو شتێ سەیری کڵاوەکەی کرد و بە وردی سەرنجی لێی دا، چونکە یەکەمجاربوو کڵاوی ئاوا سەیر لە سەری سەربازدا ببینێت و زۆریش ترسناک دەهاتە بەر چاوی.. درێژکۆڵەیەکی سپیی گوڵڕەش.. بە حەپەساویەوە سەیری دەکرد و بیری لێیدەکردەوە.. ئەو بە هەنگاوی کورت کورت لێی نزیککەوەتەوە و کڵاوەکەی بە سووکی داگرت.. کاتێ بۆی دانەویەوە و سەری لە سەری ئەم نزیککردەوە، لوولیکرد و خستیە سەر ئەژنۆیەوە.. چپاندی بە گوێچکەیەدا و پێی وت:

ـ ئەوە چییە دەڵێی نامناسیتەوە..!!

ئەمەی وت و بە سووکی سەری ئەمی خستە سەر سنگیەوە.. پەنجەکانی خستە قژە خاوەکەیەوە و پێی وت:

ـ بە لاتەوە سەیرە بووم بە سەرباز..؟!

کە «نەوال» وەڵامی نەدایەوە و شتێکی لەو ترس و سەرسوڕمانەی دەموچاوی نەگۆڕا، ئەو خۆی جووڵاند و بەسووکی سەری لە سنگی دوورخستەوە.. دوو دەنک ترێی لە ناو قاپەکەی دەستی ئەم هەڵگرت و خواردنی.. ئینجا بە پێکەنینەوە پاڵێکی سووکی پێوەنا و پێی وت:

ـ ئیتر نابێت شەوان بترسیت و بەدەم زریکوهووڕەوە خەبەرتبێتەوە.

«نەوال» بە هۆی مەسەلەی «کاکەسوور»ـەوە ئەوەندە بیری لە شەڕ و کوشتار کردبووەوە و ئەوەندە لە خەیاڵی خۆیدا تاوتوێی کردبوو، بەقەدەر ئەفسەرێکی تەقاویتی لە بارەی مەسەلەی سەربازییەوە دەزانی و زۆر جاریش بۆ «هیجران»ی باسدەکرد.. هەرچەند دەچووە دەرەوە و سەربازەکانی دەبینی، لە هێڵی سەر قۆڵ و تەختەی سەر شان و ئەستێرەی سەر کڵاوەکانیان ڕادەما و دەیزانی لە سەربازێکی ئاساییەوە تا هەرە گەورەکانیان لە یەکتر جیابکاتەوە.. تەنانەت دەیزانی هەر یەکەیان مانگانە چەند وەردەگرێت و لە کوێ وەریدەگرێت.. جارێکیان «ئەمجەد»ی خاڵی، کە لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ سەر ڕێگای ئۆردووگاکەی قەراغ شار و جارێکی تریش بۆ «مەیدان»، بۆئەوەی سەربازەکانی پیشاندات و کەمێ لەو ترسەی گیانی دەربکات، کە دوای بینینی تەرمەکەی باوکی هەستی پێدەکرد و

هەموویانی بە خۆیەوە خەریککردبوو، ئەم دەستی بۆ سەربازەکان درێژ دەکرد و پلەو پایەکانیانی پێ دەوت، کە وەکوو مێرووله بەدوای یەکتردا ڕیچکەیان بەستبوو و بە هەنگاوی ڕێک و قایم بە ڕێگادا دەڕۆیشتن.. ئەو زۆری پێخۆشبوو و لە دڵەوە قاقای لێدەدا، کەوا خوشکەزاکەی ئەوەندە زیرەکە و لە ئێستاوە ئەو هەموو شتە دەزانێت.. بۆیە دەستی دەکردە ملیەوە و پێی دەوت:

ـ ئافەرین.. ئافەرین.. تۆ کە گەورە بوویت دەتوانی بچیتە کۆلیجی سەربازی و ببیت بە ئەفسەر.

«ئەدهەم»ی باپیریشی، کە خۆی ئەفسەری تەقاویت بوو و لە هەموو شتێ زیاتر دڵی بەم قسە و باسانە دەکرایەوە، لە خۆشیا دەمی دادەپچڕی و گەز گەز باڵای دەکرد، کە کچەزاکەی دەبینی ئەوەندە ئارەزووی لە فێربوونی زانیاریی لەمەڕ سەربازییەوە هەیە و هەمیشە بیری لێدەکاتەوە، بۆیە وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دەدایەوە و بەم و بەوی دەوت، کەوا وەجاخی ڕۆشنە و دوورنییە کچەزاکەی ببێت بە ئەفسەر، یان فڕۆکەوانێکی شارەزا و ناوبانگی بە هەموو وڵاتدا بڵاوبێتەوە.. ئەو جارەش «نەقیب شاسوار»ی برای «شازە»ی بینی و پرسیاری لێی کرد، ئاخۆ ڕاستە ئەم دەتوانێت وەکوو ئەو لە کۆلیجی سەربازی بخوێنێت و ببێت بە ئەفسەر، ئەو بە دەستی چەپی زللەیەکی قایمی لە ڕوومەتی ڕاستی دا و پێی وت:

ـ کە چوویتەوە بۆ دایکتی باسکە، کە من لەسەرچی لێمداویت.

«ست هالە»ی پووریشی هەمیشە سەرزەنشتی دەکرد و جارێکیش زۆر بە توندی قژی ڕاکێشا، کە ئەم ئاوا خووی داوەتە شەڕ و تەقەمەنیەوە و لە هەموو شتێ زیاتر بیری لێدەکاتەوە.. ڕازییش نەدەبوو مێردەکەی وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە و باسی جۆرەکانی چەکی بۆ بکات.

«نەوال» زۆر چاک دەیزانی کوڕ تا تەواو گەورە نەبێت و نەگاتە تەمەنی هەژدە ساڵی بە سەرباز ناگیرێت، بۆیە زۆری بە لاوە سەیربوو و نەدەچووە ئەقڵیەوە، ئەمەی بەر چاوی «عەمار» بێت و بەڕاستیی بووبێت بە سەرباز.. ئاخر ئەوێک تەمەنی چواردە ساڵە و تازە خەریکە سمێڵی دێت، هەمیشە دایکی لە حەمامدا دەیشوات و وشکیدەکاتەوە، چۆن وەکوو سەربازەکانی تر دەتوانێت بچێت بۆ

ڕێگای دوور و له ئۆردووگـا و ڕەبیـەکـاندا بنوێت..؟! شـەوانیش چەکێ بکاتە شانیەوە و ئێشکبگرێت.. ڕاستە باڵابەرز و چوارشانەیە وەکوو باوکی و هەمیشە خۆی بە پیاو دەزانێت، بەڵام سەربازیی لە ڕۆژگارێکی وەکوو ئەمڕۆدا زەحمەتە و ڕەنگە بەرگەی ئەو ژیانە نەگرێت.. ئەو کڵاوەشی چەند بڵـێیت سەیرە و لە هی هیچ سەربازێکی تر ناچێت.. ئەم هێشتا «عەمار» نەچووبووە ژوورەوە و دایک و باوکی نەیانبینیبوو، کە بەراوردی ئەو و «کاکەسوور»ی دەکرد و لە خەیاڵی خۆیدا تاوتوێی دەکرد.. هەر دووکیان باڵابەرز و سووروسپی.. ئەمیان سەرتاپای سپی و ئەویان سەرتاپای ڕەش.. قۆپچەکانی ئەم ڕەش و هی ئەو سپی.. قایشی ئەمیان پان و سپی و پشـتێنی ئەویـان ڕەش و درێژ.. پێـڵاوی ئەمـیـان ڕەشی تۆخ تۆخ و کڵاشی ئەویان سپی سپی.. کڵاوی ئەمیـان سپـیی گـوڵڕەش و مشکیی ئەویان ڕەشی گوڵسپی... دایکی زۆر پێی ناخۆشبوو و هەمیشە سەرزەنشتی دەکرد، کە ئەم بەراوردی شـتـەکـانی دەکـرد و جیـاوازی و لەیەکـچوونەکـانی دەردەخسـتن.. دەسـتـەکـانی دەگـرت بەمـلا و بەولای ڕوومـەتەکـانی خـۆیەوە و بە دەمـوپلێکی تێکئالاوەوە پێی دەوت:

ـ هەرچەند تۆ بڵـێی فلان شت لە فیسـار شت دەچێت، یان ئەم شتە لەو شتە جیاوازە، خێرا دەرد و بەڵایەک ڕوومان تێدەکات.

هەرکـە «عـەمـار» چووە ژوورەوە و دایک و باوکی بینیـان، بوو بە دەمـەقـڕە و شـەڕ و هەرا.. ئەوان ئەگـەرچی ئەوسـا بە زمـانی خـۆیان دەدوان و هەر زوو زووش دەنگیـان نزمـدەکـردەوە، بەڵام «نەوال» کەم و زۆر تـێدەگـەیشت و دەیزانی پێـیـان ناخۆشە کوڕەکەیان بەبێ ئەوەی پرسیان پێبکات بووە بە سەرباز.. هەر زوو زووش گـوێی لە نـاوی خۆی و «کـاکەسـوور» دەبوو و زیاتر دەشڵـەژا.. ئـەوەندەی تر شـەرم دایدەگـرت و تەریقـدەبووەوە.. لە ڕووشی نەدەهات بـچێـتـە ژوورەوە و لە نـزیکەوە بیـانبینێت، بەشکوو دەموچاویان بخوێنێتـەوە و بزانێت ئەو شـەڕە چەند پەیوەندیی بەمــەوە هەیە.. دوایی کــە بە هەر دووکــیــان پەلامــاریان دا و بە شــەق و زللە تێیکەوتن.. بە پاڵەپەستۆ لە دەرگای ژوورەکەیان ئاودیوکرد و بە شپرزەییەوە لە پەنجەرەکەوە سەیریاندەکرد، بە تەواوی هەموو شتێکی بۆ دەرکەوت و زانی ئەو

فەرتەنەیە لەم زیاتر لەسەر هیچ کەسێکی تر نییە.. «عەمار» بە هەنگاوی خێرا خێرا بۆ لای دەرگای حەوشەکە دەچوو و دەیبۆڵاند.. دەیبۆڵاند و سەیری ئەمی دەکرد.. قاچی بردە دەرەوە و بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە شتێکی وت، ئەم ڕاچڵەکی و بە خۆی وت ئەوە دەڵێت: وا دەڕۆم و تا ماوم ڕوو ناکەمەوە ئەم ماڵە...

«نەوال» لە شەرما نەیدەزانی چی بکات و چی بڵێت.. لە بەرامبەر قەلەموونە سپییەکەدا وەستا بوو و بیری لە خۆی و لە «عەمار» و لەوانی تر دەکردەوە.. نەیدەویست سەر هەڵبڕێت و سەیریان بکات، کە ئەوەتا بە دەموچاوی گرژ و مۆنەوە لە پەنجەرەکەوە سەیری دەکەن و بە توڕەیی لەگەڵ یەکتردا دەدوێن.. سەری لەبەر نابوو و بە نینۆکەکانی یاریی بە قەراغی قاپە سپییەکەی دەستی دەکرد.. ئێوارەش کە سفرە سپییەکەیان داخست و نانیان دانا، بەبێ ئەوەی بانگی بکەن وای پیشاندەن وەکوو ڕۆژانی تر خۆشیاندەوێت، بە شەرمێکەوە لە سووچێکی لای خوارووی سفرەکەوە دانیشت و بە دەستی ڕاستی پارچەی بچووک بچووکی لە باینجانە سوورکراوەکەی ناو دەوریە سپییەکە دەکردەوە.. جار جاریش کەوچکە کلکسپییەکەی هەڵدەگرت و دەیکرد بە برنجی ناو بەلەمە شووشە ڕەشەکەدا، بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕێت و سەیریان بکات، بۆ دەمی دەبرد و بە خاووخلیچکی دەیجوو.. بە پێچەوانەی شەوانی پێشوو خوا خوای بوو جێگا داخەن و بە لێفە سپییەکە ئەو دوو چاوەیان لێ بشارێتەوە، کە لە هەموو کاتێکی تر ڕقی لێیانە و ئەگەر بە دەستی بێت، دەریاندەهێنێت و لە جەستەی خۆی جیایاندەکاتەوە.. ئەوسا هەستی کرد مرۆڤ کاتێ شەرم دایدەگرێت و تەریقدەبێتەوە، لە هەموو کاتێکی تر زیاتر هەست بە بوونی چاوەکانی دەکات و لێی دەبنە بەڵا.. وادەزانێ ئەو خەتایەی کردوویەتی ئەوان پێیان کردووە و هاوکات تێدەگات، کە شوێنێکی زۆر خراپیان هەیە و باشتر وابوو لەناو لەپەکانی بوونایە، بۆ ئەوەی لە کاتێکی ئاوادا دەستەکانی بقووچێنێت و لە چاوی کەسانی تریان بشارێتەوە.. هەر لەو شەرمەشەوە زانی گەورەبووە و حیسابی بۆ دەکرێت.. «شازەمان»ی بیر کەوتەوە و دالغەی ڕۆیشت، کە لەو تەمەنەی ئەمدا حەزی لە «سیامەند» کردووە و دوو ساڵ

دواتر شووی پێکردووه، بۆیه ئەوەندەی تر له خەیاڵی خۆیدا کەوته لێکدانەوەی ئەو شەڕ و فەرتەنەیەی ئەو نیوەڕۆیە لەم ماڵەدا ڕوویدا و زەوقی هەموویانی تێکدا.. بیری له جلەکانی «عەمار» و کڵاوه ئێجگار سەیرەکەی دەکردەوه و دەیهێنایەوه بەر چاوی.. تا چووه سەر جێگا و پاڵیشکەوت، چاوەڕێبوو لەپڕ له دەرگا بدات و بێتەوه، دەستی دایک و باوکی ماچ بکات و ئاشتیان بکاتەوه، بەڵام نەهاتەوه و به تەواوی دەنگی بڕا.. «هیجران»یش وەکوو شەوانی پێشوو نه دەستی کرده ملیەوه و نه تا چاویشی چووه خەو، به چپه قسەی بۆ کرد، تەنانەت پشتی تێیکرد و هەر سەیریشی نەکرد.. ئەوه له کاتێکدا بەتەمابوو هۆی شەڕەکه لەو بپرسێت و له نووکەوه بۆی باسبکات.. ئینجا تێگەیشت ئیتر ئەم ناتوانێت لەو ماڵەدا بمێنێتەوه و دەبێت به زووترین کات بەجێیبهێڵێت.. بڕیاری دا بەیانی هەرچۆنێ بێت شتومەکەکانی کۆکاتەوه و بیانخاته جانتا ڕەشەکەیەوه.. لەپڕ بەبێ هەست و خوست دەرگای حەوشه بکاتەوه و بچێتەوه ماڵی خۆیان.. ڕاسته له «بابلشێخ»ەوه بۆ «ڕەشید» دووره بۆ ئەم و دەبێت ماوەیەکی زۆر و هەر به تەنیاش بەپێ بڕوات، بەڵام باشتره لەوەی له ماڵێکدا بێت کەس قسەی لەگەڵدا نەکات و به دوژمنی خۆیانی بزانن.. له ڕووی نەیەت سەری هەڵبڕێت و چاوببڕێته چاویانەوه.. ئەوەی سەیربوو لەودا و هیچ لێی تێنەدەگەیشت، ئەوەبوو ئەو شەوه بەبێ ترس خەوی لێکەوت و وەکوو شەوانی تر ڕانەچڵەکی، بۆیه بەیانی له ڕێگای ماڵەوه بیری لەو جورئەته دەکردەوه و هەر زوو زوو لەبەر خۆیەوه دەیوت:

ـ تەریقبوونەوه ئەو هەستەیه، که دەرکەوت، هەموو هەستەکانی تر بەلاوه دەنێت.

ئینجا بیری له «کاترینا» کردەوه و زانی ئەو جاره ڕاستی کرد، که وتی: «کاکەسوور» ناتوانێت سنووری شار ببڕێت و دوو پێی بخاته ناویەوه، چونکه شەرمەدەکات و تەریقدەبێتەوه.. لەمەوه ترسی شکا و له ماڵی خۆشیاندا به ڕێکوپێکی دەنووست، بەڵام هەمیشه بیری له «عەمار» دەکردەوه و تەواو لێیبوو به مەراق، ئاخۆ چی بەسەرهاتووه و بۆ کوێ سەری خۆی هەڵگرتووه..؟! گەڕاوەتەوه ماڵ و لەگەڵ دایک و باوکی دەژی، یان نا..؟! ئاخۆ ناردوویانه بۆ

شەڕ و کوژراوە، یان چەکێکی کردۆتە شانی و لە ناو بازاڕ دەسووڕێتەوە..؟! هەر جارێ لەگەڵ دایکی و «شازە»، یان لەگەڵ «کاترینا»دا دەچوو بۆ بازاڕ و بەسەر شۆستەی شەقامەکاندا دەڕۆیشتن، چاوی بۆ دەگێڕا و سەیری کڵاوی سەربازەکانی دەکرد، تا بزانێت ئەو سپیە گوڵڕەشەی بەر چاو ناکەوێت و هەر خێرا بانگی بکات.. بەشکوو لە دواوەی ئیڤایەکی سەربازییدا قاچەکانی شۆڕکردبێتەوە و بیبینێت.. بیبینێت و بایبایەکی بۆ بکات، یان لە بەردەمی دووکانێکدا وەستابێت و بچێت بۆ لای.. دەستەکانی بگرێت و بە وردی باسی ئەو شەڕ و فەرتەنەیەی ئەو ڕۆژەی بۆ بکات.. لە بەدبەختیی ئەمیش «عەقید شەهاب»ی مێردی پووری بۆ «بەسرا» گوێزرابووەوە و لەبەر سەرقاڵییش مۆڵەتی وەرنەدەگرت، ئەگینا ئەو بە هەر شێوەیەک بوایە دەیتوانی سۆراغێکی بکات و بیدۆزێتەوە.. چەند جار لە دایکی و لە «شازە» پاڕایەوە و پێی وتن، کە بچن بۆ ماڵیان، یان بۆ دووکانی باوکی و هەواڵێکی بۆ بهێننەوە، بەڵام ئەوان ڕازیینەدەبوون و گوێیان پێنەدەدا.. دایکی ئاخی هەڵدەکێشا و پێی دەوت:

ـ سەربەگۆبەند کارێکی وات نەکردووە جارێکی تر لە ڕووم بێت چاوم لە ئاستیاندا هەڵبهێنم.. ئەگەر بشیانبینم ڕووی خۆمیان لێ وەردەگێڕم.

«شازە»یش هەموو جارێ دەستەکانی دەگرت بەملا و بەولای ڕوومەتەکانی خۆیەوە و پێی دەوت:

ـ بە سائەقەت بم نەوالەکەی ڕۆحم، تۆ هێشتا مناڵیت، هەقی خەڵکت چییە..؟!

ئیتر ئەم بە دەستی بوایە توند توند قوڕگی بگرتایە و ڕۆحی لە کونی لووتیەوە دەربکردایە.. هاوکات هەستیشی دەکرد ئەو شتێکی زانیوە و بەمی ناڵێت.....

شەوان بە دیار بەرنامە سەربازییەکانی تەلەفزیۆنەوە دادەنیشت و زۆر بە دیقەت سەیری ئەو شاشەیەی دەکرد، بەشکوو بیبینێت و کەمێ دڵی پێی خۆشبێت، بەڵام هەمیشە هەناسە سارد دەبوو و هەر بەو مەراقەوە خەوی لێدەکەوت.. زوو زووش داوای لە «ئەمجەد»ی خاڵی دەکرد و لێی دەپاڕایەوە، تا بیبات بۆ «مەیدان» و بۆ سەر ڕێگای ئۆردووگاکە.. درۆی لە گەڵدا دەکرد و پێی

دەوت:

ـ ئەو ڕۆژانەی سەیری سەربازەکان بکەم، شەو زوو خەوم لێدەکەوێت و خەونی ناخۆشیش نابینم.

دوایی خاڵی تەواو لێی بێزار بوو و چییتر لەگەڵی نەدەچوو.. هەرچەند لێی دەپاڕایەوە و سوێندی بۆ دەخوارد، کە بە بێدەنگیی سەیریان دەکات و ئیتر بە پرسیار هەراسانی ناکات، کەچی ئەو سەری بادەدا و پێی دەوت:

ـ من هەرچەند بە ڕۆژ لە سەر ئەو ڕێگایە بوەستم و سەیری سەربازەکان بکەم، شەو خەوم دەزڕێت و خەونی ناخۆش ناخۆش دەبینم.. بە زۆرییش خەون بە مێروولە و دووپشکی ڕەش و پەڕەسێلکە و حاجە لەقلەقی سپییەوە دەبینم.

«نەوال» تاقە هیوایەکی ئەوە بوو، مانگی ئۆکتۆبەر بێت و قوتابخانە دەستپێبکاتەوە، بۆئەوەی لەوێ «هیجران» ببینێت و هەرچۆنێ بێت ئاشتیبکاتەوە.. ئاشتیبکاتەوە و لێی بپرسێت، ئاخۆ براکەی چی بەسەرهاتووە و ئەو کڵاوە سەیرە چیبوو کردبوویە سەریەوە.. ئیتر ئەمیش دەچێت بۆ ناوەندی و دەتوانێت زوو زوو چاوی پێیبکەوێت.. قسەی لەگەڵدا بکات و وای لێبکات جارێکی تریش خۆشیبوێت.. با لە ڕووشی نەیەت بچێت بۆماڵیان و دایک و باوکی ببینێت، بەڵام خۆ هیچ نەبێت لە پشووی نێوان وانەکاندا یەکتر دەبینن و دەتوانن بەکامی دڵ باسی ئەو ڕۆژانە بکەن، کە وەکوو جووتە خوشک لە ماڵی ئەواندا بەسەریانبرد و هیچ شتێکیان بەبێ یەکتر نەدەکرد....

ئەو ساڵە «نەوال» بە پێچەوانەی ساڵانی پێشوو حەزی دەکرد زوو قوتابخانە دەستپێبکاتەوە و لەسەر ئاو و ئاگر چاوەڕێی دەکرد.. کەچی بۆ نەگبەتیی دوو ڕۆژ پێش تەواوبوونی پشووی هاوین لەسەر ئەسپە سپییەکە کەوتە خوارەوە و دەستێکی شکا.. لە خەستەخانە بۆیان لە گەچ گرت و کردیانە ملیەوە.. دایکی و «شازە» کراسێکی ڕەشی نیوقۆڵیان لەبەرکرد و لەسەر دۆشەگە ڕەشەکە پاڵیانخست.. بە لێفەیەکی سپی تا چەناگەیان داپۆشی و بە دیاریەوە دانیشتن.. ئەمە ئێوارەی ڕۆژە گەرمەکە بوو و خۆری کۆتایی ئەیلوول شەقامە قیرتاوەکانی داخکردبوو.. ئەو ڕۆژەی «کاترینا» ڕووتیکردەوە و لە حەوزە گەورەکەی ناوەڕاستی باخەکەی

خۆیاندا فێری مەلەی دەکرد.. لەسەر هەر دوو دەستی و لەسەر سک پاڵیدەخست و پێی دەوت خۆی شلکات.. دوای ئەوەی کەمێ دەست و قاچی دەجووڵاند و دەیکرد بە شڵپەوهوڕ، ئەو بە سووکی دەستەکانی دەکێشایەوە و ئەم سەر ئاو دەکەوت... «کاترینا» هەر دوو ناولەپی خۆی دا بە یەکا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ تۆ قازەکانت خۆشدەوێت، بۆیە زوو فێری مەلە دەبیت.

دواییش خۆیان گۆڕی و بە جووتە چوون بۆ گۆڕەپانی پشت دووکانەکەی جارانی باوکی، کە لەوێدا پیاوە ڕەشپۆشەکان بە عانەیەک خەڵکیان سواری ئەسپە سپیەکانیان دەکرد و کڵاوەکانیان لە پووشێکی سەیر درووستکرابوون.. «کاترینا» کراسێکی ڕەشی نیوقۆڵی لەبەر و شەپقەیەکی سپیی تەنکی کردبووە سەریەوە، ئەمی لە دواوەی خۆی سوارکرد و غاری بە ئەسپەکە دا.. ئەگەرچی زوو ئاگاداری کردبووەوە و پێی وتبوو، کە توند توند و بە هەر دوو دەست پشتی ئەو بگرێت و لە هیچ حاڵەتێکدا بەرینەدات، کەچی ئەم بۆئەوەی لەبەر چاوی ئەو مناڵانەدا خۆی بنوێنێت و سەرنجیان ڕابکێشێت، کە بە حەپەساویەوە سەریان دەکرد و نەیاندەوێرا وەکوو ئەم سواربن، یاخود کەس نەبوو پارەیان بۆ بدات و سواریانکات، دەستەکانی بەردا و لەملا و لەولاوە بڵاویکردنەوە.. لەپڕ هەڵبەزیەوە و کەوتە سەر خۆڵەکە، کە لە ژێر قاچی ناڵکراوی ئەسپەکاندا ورد ورد ببوو و بۆنێکی سەیری لێدەهات.. هەر زوو زووش دەبوو بە گەردەلوول و لە شێوەی گیانداری زەبەلاح و ئەفسانەیی بۆ تاقی ئاسمان هەڵدەکشا.. ئەو جارەی «عەمار» ئەم و «هیجران»ی هێنا و لەبەر سێبەری کەپرەکەی دانان، تا سەیری بکەن و چەپڵەی بۆ لێبدەن، کاتێ غار بە ئەسپ دەدات و پێشی هەموو ئەو پیاوانە دەگرێتەوە، کە خۆیان خاوەنی ئەسپەکانن و ناوکیان لەم کارەدا بڕاوە، ناوەڕاستی زستان بوو و تازە باران خۆشیکردبووەوە.. ئەسپەکان بە تیژی بە لایاندا تێدەپەڕین و قوڕ و لیتە لە ژێر قاچیاندا دەردەپەڕین.. دەردەپەڕین و جلەکانی ئەمانیان سواغدەدا.. ئەو ڕۆژە «نەوال» و «هیجران» لای ئەو حەشاماتەی لەوێ وەستابوون و بە حەپەساویەوە سەیری «عەمار»یان دەکرد، کاتێ

ئێجگار بە خێرایی غاری بە ئەسپە سپییەکە دەدا و بە تیژی بە لایاندا تێدەپەڕی، خۆیان دەنواند و دەیانوت:

ـ ئەمە برای ئێمەیە.

«نەوال» لە خۆشیا دەمی دادەپچڕی و گەز گەز بالآی دەکرد، کاتێ «عەمار» لە ئاستی ئەماندا دەستی لە ڕەشمەی ڕەشی ئەسپەکە بەردەدا و بۆ ئەوانی درێژ دەکرد.. تا هێزی تیابوو دەنگی هەڵدەبڕی و بانگی دەکردن.. جار جاریش لەسەر پشتە بەرزەکەی دەوەستا و دەستەکانی بەملا و بەولایدا بڵاودەکردەوە.. ئیتر خەڵکەکە هەندێکیان لە ترسا توند توند چاوی خۆیان دەگرت و هەندێکی تریان سەرسامتر سەیریان دەکرد.. دەمیان دادەپچڕی و قایم قایم چەپڵەیان بۆ لێ دەدا.. دوایی «نەوال» چوو بۆ لای «عەمار» و داوای لێکرد، کە لە پشتی خۆبەوە سواری بکات و ئاوا بە تیژی غاری پێبدات، بەڵام ئەو ڕازیی نەبوو و سەری بادا.. بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیری چاوەکانی کرد و پێی وت:

ـ تۆ نابێت سواری ئەسپ بیت.

ـ خۆ ناترسم.

ـ دەزانم ناترسیت، بەڵام نابێت سواری ئەسپ بیت، بەتایبەتی ئەسپی سپی.

ـ بۆچی..؟!

ـ مەپرسە.

ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

ـ ئەی هەموو جارێ بە عەرەبانەی ئەسپ ناچین بۆ قوتابخانە..؟!

ـ ئەمەیان جیایە.

یەکێ لە پیاوە ڕەشپۆشەکان دوای ئەوەی نەیتوانی بۆڕی «عەمار» بداتەوە و وەکوو ئەو غار بە ئەسپەکەی بدات.. غاری پێبدات و لەبەر چاوی خەڵک هونەری سوارچاکیی خۆی بنوێنێت، لە داخا دەمانچە ڕەشەکەی لە قایشە سپیەکەی پشتی جیاکردەوە و تاق تاق تاق تاق، چوار گوللەی نا بە سەری ئەسپە سپییەکەیەوە.. «هیجران» لە ترسا چاوەکانی گرت و زرووکاندی، کەچی «نەوال» جووڵەی نەکرد

و چاوی لێی نەدەترووکاند، کە بە تەنیشتا شلّپەی هات و کەوتە ناو قوڕاوەکەوە.. لە ماوەیەکی کەمدا هەموو گیانی بوو بە خەڵتانی خوێن و قوڕگی کەوتە لرخەلرخ.. بە سستی دەمە زلەکەی دەکردەوە و دایدەخستەوە.. دایدەخستەوە و دەیکردەوە.. تا چوونەوە ماڵیش و دەرگای ژوورەکەی خۆشیان کردەوە، «هیجران» هەموو گیانی دەلەرزی و دڵی بە خێرایی لێی دەدا.. دواییش «نەوال» هەر کاتێ دەچوونە سەر جێگا و پاڵدەکەوتن، سەرینە سپییەکەی خۆی دەنووشتاندەوە و وەکوو دەمی ئەسپەکەی لێدەکرد.. بە سستی دەیکردەوە و دایدەخستەوە.. دەیکردەوە و دایدەخستەوە.. لێزانانەش لرخەلرخێکی وەکوو هی قوڕگی ئەسپەکەی لە قوڕگیەوە دەردەکرد و «هیجران»ی پێ دەترساند.. «هیجران»یش بە کەمێ ترس و کەمێ مەکرەوە دەیزرووکاند و پەلاماری ئەمی دەدا.. دەیانکرد بە زۆران و یەکتریان دەخستە سەر دۆشەگە ڕەش و نەرمەکانەوە.. ئەوسا «نەوال» کە دەیبینی ئەو لێی دەترسێت و دەزرووکێنێت، جورئەت دەیگرت و بۆ ماوەیەک هەستی بە ترس نەدەکرد.... ئەو ڕۆژەش «نەوال» کە بە دەستی شکاوەوە لەسەر ئەو دۆشەگە ڕەشەی خۆیەوە پاڵکەوتبوو و چاوی بڕیبووە بنمیچەکەوە، بیری لە «هیجران» دەکردەوە و ئاخی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا، کەوا دوو ڕۆژی تر قوتابخانە دەستپێدەکاتەوە و ئەم ناتوانێت بیبینێت.. ئەگەرچی دایکی بەڵێنی پێی دا و دڵنیای کرد، کە لە قوتابخانەوە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتەوە و داوای لێدەکات شەو لایان بمێنێتەوە، بەڵام لەوە دەترسا ئەو ڕازیی نەبێت و لەگەڵیا نەیەت.. «کاترینا»ش ئەو ڕۆژە بەڵێنی پێدابوو دوای ئەوەی لای ئەسپەکان ئیشیان تەواوبوو و گەڕانەوە، بە لای کۆنە دووکانەکەی باوکیدا بیهێنێتەوە و لە دووکانی سەر فولکەکەش «ئەزبەری»ی بۆ دەکڕێت.. ئەمە لەسەر داوای خۆی بوو و هەر بەو مەرجەش ڕازیبوو لەگەڵیا بچێت.. مەبەستیشی ئەوەبوو لە دوورەوە و بە تیلەی چاو سەیری ناو دووکانەکەی ماڵی «عەمار» بکات و چاوی بۆ بگێڕێت، بەشکوو لەوێ بیبینێت و بانگی بکات...

ڕۆژی یەکی ئۆکتۆبەر، کە «ست سوعاد» و «فریال» چوون بۆ قوتابخانە و «شازە»یش وەکوو هەموو ڕۆژانی تر ڕێگای خەستەخانەی گرتە بەر، «نەوال»یان

لای «کاترینا» بەجێهێشت و پێیان وت، نەهێڵێت لە شوێنی خۆی هەستێتەوە و بچێت بۆ دەرەوە.. «کاترینا» زۆر داوای لێیکرد و گەلێ لێی پاڕایەوە، چاوەکانی بنووقێنێت و کەمێ بنوێت، چونکە دەیزانی بە درێژایی شەو چاوەکانی لێکنەناوە و بۆ «عەمار» گریاوە، بەڵام ئەم چاوەڕێبوو لەپڕ دەرگاکەیان بخرێتە سەر پشت و «هیجران» لەگەڵ «ست سوعاد»ی دایکیا خۆی بکا بە ژووردا.. دوای ئەوەی تێر تێر ئەملا و ئەولای ماچدەکات و دوورنییە خۆیشی بۆ نەگیرێت، خۆی بۆ نەگیرێت و دەستبکات بە گریان، ئینجا دەستە ساغەکەی دەخاتە سەر دڵی و پرسیاری «عەمار»ی لێدەکات، کەچی کاتێ دایکی هاتەوە و ئەوی لەگەڵدا نەبوو، ڕەنگی تێکچوو و شڵەژا.. دڵی داخورپا و هیچی بۆ نەوترا.. دایکی دڵنەوایی کرد و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی وت:

ـ مەترسە و هیچ خەفەتیش مەخۆ.. ئەمڕۆ نەهاتبوو بۆ قوتابخانە، بەیانی دێت و لەگەڵ خۆما دەیهێنمەوە.

بەڵام دە ڕۆژ زیاتری پێچوو و ئەو هەر نەهات.. «نەوال» کە دەستی چاکبووەوە و چوو بۆ قوتابخانە، لە ڕاڕەوەکەدا «سەحەر»ی دراوسێی ماڵی «هیجران»ی بینی و خێرا لێی پرسی، کە بۆچی «هیجران» نایەت و چی بەسەرهاتووە، ئەو سەری بادا و پێی وت:

ـ نازانم، چونکە ماڵیان لەوێ نەماوە.

ـ ئەی نازانی چوون بۆ کوێ..؟!

ـ کەس نازانێت، چونکە بە کەسیان نەوتوە دەچن بۆ کام گەڕەک.

کە «نەوال» هاتەوە و ئەمەی بە دایکی وت، ئەو لە مووبەقەکەدا بە چەقۆیەکی سپیی دەسکڕەش باینجانی لەسەر تەختە سپیەکە دەجنی و «سەلوا»ی خاڵۆژنیشی بەردەستیی دەکرد.. بە پەڕۆیەکی سپی ناوچەوانی بەستبوو و برنجی لە ناو سوزگیە ڕەشەکەدا دەشتەوە.. هەر دووکیان تێکڕا شڵەژان و ڕەنگیان تێکچوو.. «ست سوعاد» خێرا بانگی «ئەمجەد»ی برای کرد و پێی وت:

ـ هەر ئێستا دەچیت بۆ دووکانی حەسەن خوداداد و لە هەواڵیان دەپرسی.

کە «ئەمجەد» هاتەوە و وتی:

ـ دووکان و خانەکەشیان داخراون.. لە هەموو دووکاندارەکانی ئەو ناوەشم پرسی، کە بۆچی نایکەنەوە، ئەوانیش نایزانن.

ئیتر زیاتر شڵەژان و بە تەواوی بۆیان دەرکەوت، کەوا ئەو ماڵە تووشی دەرد و بەڵای خۆیان هاتوون و ئەوانیش دەستەوستانن لەوەی بە تەنگیانەوە بێن....

«نەوال» ئەوەندەی تر دۆزینەوەی «عەمار»ی لێبوو بە مەراق و لە خەیاڵی خۆیدا کەوتە تاوتوێکردنی.. وای لێهات هەموو ڕۆژێ بە تەنیا لە قوتابخانەوە دەچووە سەر ڕێگای ئۆردووگاکە و تا درەنگ لەوێ دەوەستا.. هەر سەربازێ دەهات و تێدەپەڕی، سەیری دەکرد و لێی وردەبووەوە.. بیچمی سەربازەکان ئەوەندە لەبەر چاوی دووبارەبووبوونەوە و دووبارەبووبوونەوە، هەموویانی دەناسی و بە ئاسانی لە یەکتری جیادەکردنەوە.. سەرەتا شەرمیدەکرد بیانوەستێنێت و لێیان بپرسێت، ئاخۆ «عەمار» ناناسن و لەو ئۆردووگایەی ئەوان نییە..؟! دوایی بیری کردەوە و وتی: «شەرمی بۆ چییە..؟! دەڵێم برامە».. دەشیزانی ئۆردووگایەکی ئاوا دوورنییە کۆمەڵێ ناو «عەمار»ی تیابێت و ئەوان نەزانن مەبەستی لە کامیانە، بۆیە دەستی بۆ سەرەوە هەڵدەبڕی و دەیپرسی:

ـ عەمار حەسەن خوداداد ناناسن..؟ کوڕێکی باڵابەرزە.

لە بەرامبەر لافیتە ڕەشەکاندا دەوەستا و دەست لەسەر دڵ دەیخوێندنەوە، کە هەمیشە بە بۆیەی سپی دەنووسران و بە وتەی سەرکردە مێژووییەکان دەیانڕازاندنەوە، نەوەکا لە شەڕێکدا کوژرابێت و ناوەکەیان لەسەر نووسیبێت.. لافیتەکان وەکوو جاران سومبولی وەزارەتی بەرگرییان لێنەدەدان و لەسەریان نەدەنووسرا: «فلانی کوڕی فلان لە ڕۆژی ئەوەندە و لە مانگی ئەوەندە بە دەستی کاکەسووری تاوانبار و پیاوە خوێنڕێژەکانی شەهیدکراوە»، بەڵکو تەنها ناو و مێژووی شەهیدبوونەکەیان دەنووسی و زۆر زووش لێیاندەکردنەوە.. بەڵام مناڵیش دەیزانی و بۆ هەموو کەسێ ڕوونبوو، کەوا هەر هەموویان بە دەستی «کاکەسوور» و پیاوەکانی کوژراون و کچان زۆر جار بە چپە لەگەڵ یەکتردا ئەو قسە و باسەیان دەکردەوە.. بەڕێوەبەر چەند جارێ بانگی «نەوال»ی کرد و لێی توورەبوو، لەسەر ئەوەی لای کچانی تر باسی «کاکەسوور»ی کردووە و هەندێکیانی ترساندووە..

دایکیشی لە ماڵەوە بە سۆندە ڕەشەکە تێیدەکەوت و تێر تێری دەکوتایەوە...

لەو جارەوە کە «چەتۆ»ی دەستەڕاستی «کاکەسوور» بە دیلگیرا و لە گۆڕەپانی «ئەبو عەبباسی سەففاح»دا گوللەبارانیان کرد، هەموو کەسێ دەیتوانی بە ئاشکرا باسی «کاکەسوور» بکات و داخی دڵی خۆی بۆ ئەویتر هەڵڕێژێت، بەڵام وەکوو جاران لە کتێبی قوتابخانەکاندا وێنەکەیان چاپنەکرد و نەیانکردە بابەتی خوێندن.. «نەوال» ئەو ڕۆژە لە هەموو ڕۆژەکانی تری ژیانیا ئاسوودەتربوو و بە تەواوی ترسەکەی گیانی ڕەویەوە، هەر لەبەرئەوە نا، کە یەکێ لە پیاوە هەرە جەربەزەکانی «کاکەسوور»ی بینی لەبەر چاوی ئەو هەموو خەڵکە درایە بەر دەسڕێژی گولله و لە خوێنا گەوزاندیان، بەڵکوو لەبەرئەوەیش، کە هەواڵی «عەمار»ی زانی و بۆ ئەم و بۆ هەموو کەسێکی تر دەرکەوت بە هەوڵی ئەو دەسگیرکراوە...

لەمەوە ناوبانگی «عەمار» لە سەرتاسەری وڵاتدا بڵاوبووەوە و لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکاندا باس باسی ئەوبوو.. ئیتر «نەوال» دەیتوانی ڕۆژ بە ڕۆژ ئاگاداری هەواڵی بێت و بزانێت چی دەکات و چی ناکات.. هەر لە ڕێگای هۆیەکانی ڕاگەیاندنیشەوە زانی ماڵی باوکی لە داخی «عەمار» «بەغا»یان بەجێهێشتووە و ڕوویان کردۆتە «سلێمانی».. بەڵام ئەوەی زۆر سەیربوو لەودا و بە هیچ شێوەیەک لێی تێنەدەگەیشت، ئەوەبوو تا ناوبانگی «عەمار» زیاتر بڵاودەبووەوە و زۆرتری لەسەر دەوترا، ئەم حەز و ئارەزووی بۆ گوێگرتن کەمدەبووەوە و هەستی دەکرد ئەو پەرۆشییەی جارانی بۆ بینینی نامێنێت.. تەنانەت ڕۆژێکیان کە لەگەڵ «کاترینا»دا خۆیان ڕووتکردبووەوە و بە شامپۆی ناو قوتووە ڕەشوسپییەکە سەگە ڕەشەکەیان لە حەمامەکەدا دەشت، دەرگا سپییەکەشیان خستبووە سەر پشت و سەتڵێکی ڕەشیان خستبووە بەری، بۆئەوەی سەگەکە هەناسەی تەنگ نەبێت و نەبووریتەوە، لە ڕادیۆ سپییەکەی سەر مێزە ڕەشەکەی ڕاڕەودا «سەمەر»ی دراوسێیان، کە دەنگێکی پیاوانەی هەبوو و بەرنامەی «جەماوەر و ئاسایش»ی پێشکەشدەکرد، باسی کڵاوە سپیە گوڵڕەشەکەی «عەمار»ی دەکرد و نهێنییەکانی ئاشکرادەکرد، ئەم وەکوو هەر گوێگرێکی ئاسایی

گوێی لێگرت و هیچ نەورووژا.. ئەو ڕۆژە لە هەموو شاردا باسی ئەو کلاوەبوو و قسەکانی ئەو کچەیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، گوایە نهێنییەکەی ئەوەیە لە هەر سەربازێکی تری جیابکاتەوە و بزانرێت، کە ئەو هەر تەنها شەڕکەرێکی بێوێنە نییە و لە سەرتاپای وڵاتدا کەس ناتوانێت شان لە شانی بدات، بەڵکوو پێشبینیکەرێکی مەزنیشە و بە پێشبینییەکانی تەنگی بە «کاکەسوور» و هێزەکەی هەڵچنیوە؛ ئەم هیچ نەدەخرۆشا و زۆری بە لاوە ئاسایی بوو.. ئەو جارەی لە گۆڕەپانەکەشدا دەستی «چەتۆ»یان لە دواوە بەستبوو و گوللەبارانیانکرد، ئەم هیچ بە لایەوە سەیرنەبوو ئەوەندە لە »کاکەسوور» دەچوو و بە موو جیاوازیان تیادا نەدەدۆزرایەوە.. ڕەنگی پێستی.. باڵای.. دەنگی.. جلوبەرگی.. جووڵە و هەڵسوکەوتی.. ئەسپە سپییەکەی.. سەگە ڕەشەکەی.. تەواو لە یەکتر دەچوون و هەرچی خەڵک هەبوو سەرسام و ئەبڵەق سەیریاندەکرد.. سەیریاندەکرد و زلوونگەیان لەسەر دەدا.. «فەریال»ی خوشکی، کە لە تەنیشتیەوە وەستابوو و دەستی ڕاستی کردبووە ملی ئەمەوە، ڕایتەکاند و پێی وت:

ـ دیوتە چەند لە کاکەسوور دەچێت..؟!

ئەم بەحاڵ دەنگی لێوەهات و وتی:

ـ ئا، دیومە.

«نەوال» خۆیشی زۆر زۆری بە لاوە سەیربوو و هەرچەندی دەکرد لەوە حاڵیی نەدەبوو، کە ئەم هەمیشە بە دوای بەراوردکردنی شتەکانەوە بوو و هەر زوو زوو لە ماڵ و لە کۆڵان و قوتابخانەدا لەسەر ئەو خووە تەریقیاندەکردەوە، کەچی لەیەکچوونێکی ئاوا نایورژێنێت و هەر بە خەیاڵیشیدا نایەت.. ئەوسا وایدەزانی لەبەر ئەو خۆشیەیە، کە بە هۆی دۆزینەوەی «عەمار» و گوللەبارانکردنی «چەتۆ»وە هەستی پێدەکرد و شتێکی کاتییە، کەچی دوای ئەوەش ببڕای ببڕای بیری لێینەکردەوە و حەزیشی نەدەکرد بیریبکەوێتەوە.. تا ماوەیەکی ئێجگار زۆر وازی لەوە هێنا پەیوەندیی نهێنی لە نێوان شتەکاندا بدۆزێتەوە و لە خەیاڵی خۆیدا تاوتوێیان بکات.. تەنانەت دایکی و «فەریال»ی خوشکیشی هەستیان کرد ئەم

زۆر گۆڕاوە و هەر دەڵێی کچەکەی جاران نییە.. دایکی هەر زوو زوو دەستی دەکردە ملیەوە و بە ڕووی خۆشەوە پێی دەوت:

ـ ئەوا شوکر شوێنی عەمارمان پێزانی، ڕۆژێ هەموومان دەچین بۆ لای.

بەڵام ئەم هیچ وا خۆی پیشان نەدەدا حەزدەکات لەگەڵیان بچێت و بە هی خۆی دەزانێت.. جارێکیان دایکی کە لەبەر ئاوێنەکەدا وەستابوو و بە شانەیەکی سپی قژە ڕەش و خاوەکەی دادەهێنا، لەپڕ ڕووی بە لای ئەمدا وەرگێڕا و وای وت، ئەم بە کراسێکی سپییەوە لەسەر کورسیە ڕەشەکە دانیشتبوو و یاریی بە قازی ملوانکەکەی دەکرد، بە بێزارییەوە سەری هەڵبڕی و وتی:

ـ بۆچی بچین.. ؟!

ئەو لێی تووڕەبوو و شانەکەی تێگرت.. بەر لارانی چەپی کەوت و هاواری لێ بەرز بووەوە:

ـ قەحپەی لە قەحپە کەوتوو.. زۆڵی لە هیچ کەس نەچوو.

ئەوان هەمیشە لای دەرودراوسێ و لە قوتابخانە و شوێنانی تردا خۆیان بە «عەمار»ـەوە هەڵدەکێشا و باسی ئەو ڕۆژانەیان دەکرد، کە هامشۆی ماڵی یەکتریاندەکرد و کچەکەیان ماوەیەکی زۆر لای ئەواندا ژیاوە.. ڕۆژێکیان کە لەناو باخەکەی خۆیاندا لەسەر کورسیە سپیەکان دانیشتبوون و «دکتۆر سەلوا»ی خاڵۆژنی قاوەی دەکردە ناو فنجانە سپیەکانی سەر مێزە ڕەشەکەی بەردەمیان، ئەوەندەیان نەزانی ئەفسەرێکی ڕەشپۆشی کڵاوسپیی منداڵکار لە ناوەڕاستی دەرگا سپیەکەی حەوشەیاندا پەیدابوو و تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق کەوتە لێدانی، کە تازە بۆیەیان کردبووەوە و بۆ هاتنەژوورەوەی هەوای کەمێ فێنکی ئەو ئێوارەیە خرابووە سەر پشت.. ئەفسەرەکە زەرفێکی سپیی لاکێشەیی لە گیرفانی پانتۆڵەکەی دەرهێنا و دایە دەست «فەریال»ـەوە.. سەیرێکی کرد و شەرمنانە و بە دەنگێکی کەمێ نزمەوە وتی:

ـ نامەی عەقید عەمارە بۆ ئێوەی ناردووە.. تۆ نەوالیت.. ؟

ـ نەخێر، من خوشکیم.

«فەریال» کاتێ دەستی درێژکرد و نامەکەی دایە دەست خوشکەکەی، جوانتر

لەو وردبووەوە و بە شەرمێکەوە پێی وت:

ـ ئەمە نەواله.

«ست سوعاد»یش کەمێ لێی هاتە پێشەوە و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی وت:

ـ دە فەرموو دانیشە، ئەوا قاوەشمان ئامادەیە.

«فەریال» کورسیەکەی خۆی لە هی خاڵیەوە نزیککردەوە و ئەو لەسەری دانیشت.. «ست سوعاد» پەرچەمە ڕەشەکەی لەسەر چاوەکانی لادا و لێی پرسی:

ـ دەنگوباسی عەقید عەمار چییە..؟!

ـ زۆر باشە، بەڵام چەند بڵێی ماندووە.

ـ خوا دەست بە باڵتانەوە بگرێت و سەرتانخات.. ئەگەر گەڕایتەوە لای پێی بڵێ پوورت دەڵێ بە هەر شێوەیەک بێت سەرێکمان لێبدات، چونکە زۆر بیری دەکەین.

ئەفسەرەکە لەپڕ هەستایەوە سەر پێ و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ بە ڕاستیی تۆ پووری ئەویت..؟! کەوابێ ئێوەش کوردن.. منیش کوردم.. منیش.......

ئیتر کەوتە قسەکردن بە زمانی کوردی و کۆمەڵێ شتی تریشی وت.. دەیوت و ئەمان لێی تێنەگەیشتن.. «ست سوعاد» کەمێ تەریقبووەوە و بە حەپەساویەوە سەیرێکی ئەمانی کرد.. دوایی خۆی هێمنکردەوە و بە لەفزێکی شیرین پێی وت:

ـ من پووری نیم بەو مانایەی خوشکی باوکی ئەوم، بەڵام لەگەڵ ئەوانا ئەوەندە تێکەڵین، ئەگەر بڵێم دایکیشیم لێم نابێتە درۆ.

ئینجا ئەفسەرەکە تەریقبووەوە و بە کزیی لە سەر کورسیەکەی دانیشتەوە.. بە پەنجە یاریی بە قەراغی کورسیەکە دەکرد و سەری خۆی لەبەر نابوو.. بەبێ ئەوەی سەری هەڵبڕێت و سەیریان بکات، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە شەرمەوە وتی:

ـ عەقید عەمار سوێندی خواردووە، تا سەری کاکەسوور بە دیاریی بۆ شار و پشتێنەکەی بۆ دەسگیرانەکەی نەهێنێتەوە ناگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر ئێوە حەزبکەن، دەتوانن سەردانی بکەن.

ڕێک ئاواشی لە نامەکەیدا نووسیبوو و ئەم چەند جارێ بە بێزاری و بە دەنگێکی نزم لە شوێنەکەی خۆیدا خوێندیەوە.. «عەمار» بە «خۆشەویستەکەم نەوال» دەستی پێکردبوو و هەر زوو زووش ڕستەی «بیرتدەکەم، بەڵام نامەوێت جارێ بتبینم» دووبارەدەبووەوە. ئەم گاڵتەی لێدەهات و سەری بادەدا.. تەنها مانگێ لەمەوبەر لەسەر ڕێگای قوتابخانە، کوڕە «سلێمانی»یە چوختیەکەی ماڵیان لەسەر سووچی کۆڵانەکەی خۆیان بوو و کاسکێتێکی ڕەشی دەکردە سەریەوە، لێی هاتە پێشەوە و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر پێی وت:

ـ دەڵێی چی ئەو قژە ڕەش و خاوەت بە فرمێسکەکانم بتوێنمەوە و لە شوێنیا بە خەونەکانم پەلکەزێڕینەیەکت بۆ سازبکەم..؟!

خۆبشی نەیزانی بۆچی ئەو دۆشەگە سپیەی بیرکەوتەوە و موچوڕکی پیاداهات، کە پێش ئەوەی پێڵاوەکانی لە پێبکات و لە ماڵ بێتە دەرەوە، «دکتۆر سەلوا»ی خاڵۆژنی دەرزیە سوورە گەورەکەی پیادا دەکرد و تەقەڵی شاش و ڕەشی لێدەدا.. هەستی کرد لەزەت و خۆشیەک ئابڵووقەیان داوە و ڕێگایان لێی تەنیوە، کە زۆر زەحمەتە بتوانێت لە دەستیان دەربازبێت و ناچارە خۆبان بە دەستەوەبدات.. بە سستی هەنگاوی دەنا و وردە وردە گیانی خاودەبووەوە.. قسەکە لە ناو سەریا دەزرینگایەوە و لەبەر خۆبەوە دەیوتەوە، بەڵام نا.. مەحاڵبوو بتوانێت وەکوو ئەوی بڵێت و هەمان لەرەی دەنگی ئەو لە قوڕگی هەستێنێت.. هەر زوو زوو سەری دەلەقاندەوە و لە دڵی خۆیدا دەیوت: «ئەوە چۆنت وت بە سائەقەت بم..؟! بیڵێرەوە.. بیڵێرەوە تووخوا بیڵێرەوە.. لەگەڵ تۆمە چاوسەوزەکەی کۆڵانی خۆمان وام پێبڵێ.. وام پێبڵێ و گیانم پڕکە لە دەنگت.. دڵم پڕکە لە عیشق و جوانییت.. زمانم بەو دەنگ و ئاوازەت ڕابێنە.. دەی لەگەڵ تۆمە وام پێبڵێ.. وام پێبڵێ.. دەدەی وام پێبڵێ.. ئۆف..!! بۆ بێ دەنگ بوویت بۆ..؟! ها ئەوە گوێچکەم و دەمتی پێوەنێ.. سووک سوک و هەر لەسەر ئەو ئاوازەی خۆت، تووخوا نەکەی بیگۆڕی، وام پێبلێ و وام پێبلێ و وام پێبلێ.. وام پێبلێ و و بێ دەنگ نەبیت.. نا.. نا.. نەکەی بێ دەنگ بیت ئاقڵ گیان.. نەکەی بێ دەنگ بیت.. نەکەی بە بێدەنگیی ڕۆحم داخ و جەستەم وێرانکەیت.. من بەرگەی هەموو

شتێ دەگرم، هی بێدەنگیی تۆ نەبێت تاقە چاوسەوزەکەی کۆڵان و گەڕەک و شارەکەی خۆمان»...

لە پۆل دالّغەی لێدەدا و خەیاڵی دەڕۆیی.. جار جار بەبێ ویست و پێزانین تۆقە سپیەکەی لە قژی دەکردەوە و بە دەستەکانی بڵاویدەکردەوە.. جارێکی تر بەبێ ویست کۆیدەکردەوە و دەیخستە دەمیەوە.. گازی لێدەگرت و بە زمان تەڕیدەکرد.. دوایی لەپڕ وەکوو شێت سەری ڕادەوەشاند و بەملا و بەولادا پەخشیدەکردەوە.. کچان سەیریاندەکرد و پێی پێدەکەنین.. مامۆستاکانی هەر زوو زوو بە ئاگایان دەهێنایەوە و لێی تووڕەدەبوون.. چەند جارێکیش بە بیانووی جۆراوجۆر چوو بۆ ژووری مامۆستایان و لە بەرامبەر ئاوێنە باڵانوماکەدا وەستا.. دەوەستا و سەیری خۆی دەکرد.. سووک سووک دەستی بە قژیا دەهێنا و بیری لە قسەی ئەو هەتیوە «سلێمانەیی»ـە دەکردەوە، کە سیحری لێکرد و لە ئاستی هەموو شتێکدا چاوی کوێر و گوێچکەی کەڕکرد.....

دایکی لەوە دەچوو هەستی پێیکردبێت و لێزانانە ناخی دڵی خوێندبێتەوە، بۆیە کاتێ دەستی بۆ کووپە ڕەشە پڕ لە شیرەکەی سەر مێزە سپیەکە برد و هەڵیگرت، پێش ئەوەی بۆ دەمی بەرێت و بیخواتەوە، لێی تووڕەبوو و پێی وت:

ـ بڕۆ دەرەوە و گومبە لەبەر چاوم، ئەگینا هەڵدەستم ئەو قژە بۆگەنەت بە مەقەست بۆ هەڵدەپاچم.

چوو جانتاکەی هەڵگرت و بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات، کە وانەی داهاتوو «ڕێزمانی عەرەبی»یان هەیە و دایکی پێیاندەڵێتەوە، بەرەو ماڵ گەڕایەوە و گورج گورج هەنگاوی دەنا، بەشکوو ئەو کوڕە لەبەر دەرگای ماڵی خۆیاندا ببینێتەوە و وای پێبڵێتەوە.. گەیشتە بەر ماڵەکەیان و بینییەوە، وەلێ ئەفسووس، نە وای پێ وت و نە وەکوو جاری پێشووش بە پەرۆشەوە سەرنجی لێی دا.. لە حەژمەتا وەکوو منالّ لچی هەڵدەهێنایەوە و خەریکبوو دەستبکات بە گریان.. تا گەیشتەوە بەردەمی ماڵی خۆشیان و دەرگاکەشی کردەوە، چەند جارێ ئاوڕی بۆ دایەوە و بە ڕوویەوە پێکەنی، کەچی ئەو مێش میوانی نەبوو و هیچ نەورووژا.. کە بە بێزاری و ناخی پڕ لە حەسرەتەوە چووە ماڵەوە و بە لەقە دەرگاکەی داخستەوە، لە دڵەوە

ئاواتی دەخواست خاڵۆژنی خەریکی درووینی دۆشەگە سپیەکە بێت و تێر تێر و بەکامی دڵ سەیری دەستی بکات، کاتێ ئەو دەرزییە نووکتیژەی پیادا دەکات و لەولاتر دەریدەهێنێت، بەڵام ئەم لەگەڵ خاڵی لە ژوورەکەی خۆیاندا دەرگایان بەسەر خۆیاندا داخستبوو و هەر هەستیشیان بەو نەدەکرد.. کەچی هێشتا حەز و ئارەزووی سەیرکردنی ئاوێنە یەخەیان بەرنەدابوو و خەیاڵیان هەڵدەفڕیواند.. جانتا ڕەشەکەی فڕێدایە سەر مێزە سپیەکە و قاچەکانی لە پێڵاوە ڕەشەکانی هێنایە دەرێ.. گۆرەویە سپیەکانی بە لوولکراوی داکەندن و بۆ بەردەمی کانتۆرە فۆرمیکا ڕەشەکەی هەڵدان.. کراسە ڕەشەکەی زۆر بە شل و خاویەوە داکەند و هەر بە هەڵەوگێڕاویەوە کردی بە عەللاگە سپیەکەی جلەکانەوە.. ستیانە سپیەکەی لە مەمکە قوتەکانی کردەوە و ئەو ڕۆژەی بیرکەوتەوە، کە دایکی بۆ یەکەمین جار ستیانی بۆ کڕی و خاڵۆژنی بە چپە پێی وت:

ـ کۆتر لەسەر سنگت هێلانەیان کردووە و قەفەزیان بۆ دەکڕین.

ئەم بە شەرمێکی تێکەڵ بە مەکرەوە، بەڵام چەند بڵێی زۆرزانانە پێکەنی و سەیری چاوەکانی کرد.. ئەو جارێکی تر سەری هێنایە پێشێ و بە گاڵتەوە پێی وت:

ـ نەیاندەیتە دەست هەتیوەوردکە، با پەڕ و باڵیان نەوەرێت.

لە بەرامبەر ئاوێنە باڵانووماکەدا وەستا و خۆی لەگەڵیا جووتکرد.. وردە وردە بە هەڵمی دەمی جەستەی ئاوێنەکەی تەڵخدەکرد و تەزووش بە سەراپای گیانیدا دەهات.. وا مەست و بێ هۆش ببوو و بە ڕادەیەک خەیاڵەکانی پەرش و بڵاو ببوونەوە، ئاگای لەوە نەبوو دایکی لە قوتابخانە گەڕابووەوە و لە پشتیەوە وەستابوو.. تا قژی نەگرت و قەپرغەی نەکێشا بە قەراغی مێزە سپیەکەدا، نەیزانی و هەستی پێینەکرد.. توند ڕایکێشایەوە و بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە دای بە کانتۆرە ڕەشەکەدا.. پێڵاوە ڕەشەکانی داکەندن و کەوتە گیانی ڕووت و قووتی.. لەگەڵ زرووکوهووڕی ئەم و جنێوی ئەودا خاڵی و خاڵۆژنی، ئەمیان بە فانیلەیەکی عەللاگەی سپی و شۆڕتێکی ڕەشەوە، ئەویان بە کراسێکی سپیی تەنک و بێقۆڵەوە، لە ژوورەکەی خۆیانەوە بە پڕتاوی هاتنە دەرەوە و خۆیان بۆیکرد

به قـــەڵغـــان، بەڵام ئەو لەوانیش تووڕەبوو و شـــاڵاوی بۆ دەبردن.. هەرچەند نزیکدەکەوتنەوە و دەیانویست لە ژێر دەستی دەربیهێنن، بە پێڵاو پیایدا دەکێشان و دووریدەخستنەوە.. «شازە»یش دوای بەربوونی مێردەکەی گەڕابووەوە ماڵی خۆیان و لەوێ نەمابوو، ئەگینا وەکوو هەموو جارێ، بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات چەند تاکە پێڵاوی بەردەکەوێت و چەند سەری پەنجە و ناولەپەکانی ئازاریان پێدەگات، خۆی بە سەردا دەهێنا و نەیدەهێشت ئەم هیچی بەرکەوێت.. هەرچۆنێ بوو خاڵی دەستەکانی گرت و دووریخستەوە، خاڵۆژنیشی کردیە باوەشیەوە و خێرا کراسەکەی لە عەلاگەی جلەکان جیاکردەوە.. لەولاتر کردنیە بەریەوە و توند توند نووساندی بە خۆیەوە.. «نەوال» لە باوەشی ئەودا دۆشەگە سپیەکەی بیرکەوتەوە و دەشیـزانی خاڵۆژنی هەر جارێ ئەم کراسـەی لە بەردابێت، ئەوا لەگەڵ خاڵیـدا دووپشکە ڕەشەکانیان لە مەکینەی قیمەی سپی داوە و ونجڕ ونجڕیان کردوون.. سەری دەنووساند بە سنگی ئەوەوە و ئەو جارەی ماڵی باپیری بیردەکەوتەوە، کاتێ بە نەعلە ڕەشەکانیەوە چووە بەر دەرگا سپیەکەی ژوورەکەیان و کردیەوە، تا بانگیانبکات و پێیان بڵێت بێن مەحەلەبی بخۆن، کە دایکی کردبوویە جامی شووشەی ڕەشەوە و لەسەر مێزە سپیەکەی ناو چیمەنەکەی دانابوون.. ئەوانی بینی جلی ئاوایان لەبەردابوو و بۆ خۆیان بێئاگا لە دەوروبەر لێکئالابوون.. خاڵی هەستایەوە و تا تینی تیابوو زللەیەکی بە ڕوومەتیا کێشا.. یەکێکی تر و پێی وت:

ـ چەند جارم پێ وتووی بەبێ لە دەرگادان خۆت نەکەی بە ژوورا..؟! ئیتر دوو پێت بێنیت بۆ بەردەمی ئەم دەرگایە لە بنا دەیانبڕمەوە.

خاڵۆژنی لە ژێر پەرچەمە ژاکاوەکەی سەرچاویەوە سەیرێکی کرد و لە مێردەکەی تووڕەبوو.. هەستا و قژی ڕەش و پەرش و بڵاوی کۆکردەوە.. لوولیکرد و بە تۆقە سپیەکە لە دواوە بەستی.. دەستی کردە ملیەوە و بە لەفزێکی شیرین پێی وت:

ـ تۆ بۆچی هاتووی گوڵم..؟!

ئەم بە پشتی دەستی فرمێسکەکانی سڕی و پێی وت:

ـ وەرن مەحەلەبی بخۆن.

ـ مەحەلەبی..؟! زۆر باشە.. تۆ بڕۆ، ئەوا ئێمەش هاتین.

خالۆژنی ڕۆژی پێش گەیشتنی نامەکەی «عەقید عەمار»یش، کە دایکی ڕاستە سپیەکەی بۆ هەڵگرت و پەلاماری دا، لەسەر ئەوەی ڕازیی نەدەبوو وەکوو «فەریال»ی خوشکی قژی بۆ بکات بە پرچ و لەگەڵیان بچێت بۆ ماڵی «هالە»ی پووری، بە فریای کەوت و دەستی دشەکەی توند توند گرت.. لێی پاڕایەوە و نەیهێشت لێی بدات، بەڵام ئەو پاڵێکی قایمی پێوەنا و خستی بە قەراغی دەرگا سپیە لە تۆتیا درووستکراوەکەی پەرژینی باخەکەدا.. دەستی چەپی لە مەچەکیەوە تا خوار ئانیشکی هەڵتۆقی و کراسە سپیەکەی لە خوێندا سووربوو.. کەچی هێشتا ڕووی گرژنەکرد و تووڕەش نەبوو.. ئەو کاتەی «فەریال» لەفافە سپیەکەی تێوە دەپێچا و لە حەژمەتا بۆی دەگریا.. بۆی دەگریا و فرمێسکی ورد وردی بۆ دەڕشت، ئەم دڵنەوایی ئەوی دەکرد و پێی دەوت:

ـ قەیناکات دەی هیچ نییە.. تووخوا مەگری ڕۆحەکەم.. وا دیارە هەواڵی کەسێکی ئازیزمان پێدەگات.. هەر جارێ دەستی چەپم خوێنی لێبێت، یان میوانێکی دوورم دێت، یانیش هەواڵی کەسێکی خۆشەویست دەبیستم.

ئەو ڕۆژە فنجانی قاوەکەی لە بەردەمی ئەفسەرەکە دانا و بە شەرمێکەوە پێی وت:

ـ من هەر دەمزانی ئەمڕۆ هەواڵێکی خۆشمان پێدەگات.

ئەفسەرەکە قاوەکەی خواردەوە و هەستایە سەرپێ.. کەمێ جلەکانی تەکاند و ڕۆیشت.. لەبەر دەرگا هەڵوێستەیەکی کرد و لەسەرخۆ بە «ست سوعاد»ی وت:

ـ وەکوو ڕێککەوتین پێنجشەممەی داهاتوو دێمەوە بۆ نامەکانتان.

ئەوان بە درێژایی ئەو حەفتەیە هەوڵیان لەگەڵ «نەوال» دا و لێی پاڕانەوە، تا نامە بۆ «عەمار» بنووسێت و پێی بڵێت، کە هەر ئەوی خۆشدەوێت و وەکوو کچێکی ئاقڵ و ژێر چاوەڕێی دەکات، بەڵام سوودی نەبوو و گوێی لێنەگرتن.. «ئەمجەد»ی خاڵی لە هەموویان زیاتر سەری دەکردە سەری و فشاری بۆ دەهێنا.. ئەو لە «ناوەندیی شەوانی ئیبن خەلدوون»دا زمانی ئینگلیزیی دەوتەوە و «عەمار»ی بە چاکترین قوتابی دەزانی.. خۆشیدەویست و زۆر پێی سەرسام

بووبوو، کە ئەو بە درێژایی ڕۆژ لەگەڵ باوکیدا کار دەکات و بە شەویش لە قوتابخانەدا دەخوێنێت، ئەوەندەش زیرەک و لێهاتووە و وەکوو کوڕێکی گەورەش هەڵسوکەوت دەکات.. «ست هالە»ی پووری تاقە کەس بوو پشتی بگرێت و لەسەرییکاتەوە، بەڵام چونکە بچووکی هەموویان بوو و بە زماندرێژیش ناسرابوو، گوێیان لێی نەدەگرت و قسەکانی حیسابیان بۆ نەدەکرا.. ڕۆژی عەرەفات تێر تێر جنێوی بە «ست سوعاد»ی خوشکی و «مامۆستا ئەمجەد»ی برای دا و بە تووڕەیی ماڵەکەی بەجێهێشت....

شەوی چوارشەممە لەسەر پێنجشەممە، کە دوا ڕۆژی جەژنی قوربان بوو و میوانەکانیان ڕۆیشتبوون، «نەوال» بە هەنگاوی کورت کورت لەمسەری بەرە ڕەشوسپییەکەوە بۆ ئەوسەری دەچوو و دەهاتەوە.. دەچوو و دەهاتەوە.. هێڵەکان لەبەر چاوی تێکەڵ بە یەکتر دەبوون و بۆ شتی سەیر سەیر دەگۆڕان.. کاتێ وەکوو دەرگا داخراوەکەی ماڵە «سلێمانی»یەکەی دەهاتنە بەر چاو، دڵی پڕدەبوو و ناخی دەورووژا.. بە هێمنیی، بەبێ ئەوەی بهێڵێت دایکی و ئەوان هەستی پێبکەن و بە گژیدابچن، کە لە ناو باخەکەدا دانیشتبوون و دەیزانی باسی کەللەڕەقیی ئەم دەکەن، دەگریا و تنۆک تنۆک فرمێسکی دادەباراند.. دەستی ڕاستی دەگرت بە دڵییەوە و بە دەنگی نزم دەیوت: «ئەی هاوار ئەو دەرگایە بۆچی لەپڕ داخرا و کەسێ نییە درزێکی تێبکات..؟! ئەو ماڵە بۆ کوێ چوون و کەی دێنەوە..؟! ئەو هەتیوە چاوسەوزە چی بەسەرهات خەڵکینە..؟! بۆ کەسێ نییە تێمبگەیەنێت بۆ..؟! بە فریامکەون من وا لە داخی ئەو دەرگا داخراوە دڵم لەتوکوت دەبێت.. هاکە زانیتان بە دەما کەوتم و گیانم دەرچوو».... سەرەتا وایدەزانی بە بۆنەی جەژنەوە چوون بۆ سەردانی کەسوکار و ڕەنگە دوای ماوەیەکی کورت بگەڕێنەوە، بەڵام کە زۆری پێچوو و هەر نەهاتنەوە، بە تەواوی هیوابڕاو بوو و ئەوەندەی تر لێیبوو بە مەراق.. هەر چەند خەڵکی کۆڵانی بە گیردەهێنا و لێی دەپرسین: ئاخۆ بۆ کوێ چوون و کەی دێنەوە، ئەوان سەرسام و ئەبڵەق خۆیان پیشاندەدا و هیچ وەڵامێکیان نەدەدایەوە.. کاتێ دەچوو بۆ لای کچی ئەو ماڵەی تەنیشتیان و لێی دەپرسی، ئەو بە گومانەوە سەیری دەکرد و بە شێوەیەک دەیوت:

ـ من چووزانم بۆچی لە من دەپرسی..؟!

کە ئەم وا لە دڵی دەچەسپی ئەو دەیزانێت و نایەوێت بەمی بڵێت.. ئیتر هەستی بە ترس و دڵەڕاوکێ دەکرد و بە شێوەی جۆراوجۆر لە خەیاڵی خۆبدا لێکی دەدایەوە.. هەرچۆنێ دەیهێنا و دەیبرد بەوە کۆتایی دەهات، کە تەواو ئیتر نایبینێتەوە و مەراق زیاتر بڕستی لەبەر دەبڕی.. زۆر سەیربوو بە درێژایی ئەو دوو ساڵەی ئەو ماڵە لەم گەڕەکە بوون و ئەم ڕۆژانە دەیبینین، نە خۆیان و نە ئەو دەرگایەیان سەرنجیان ڕانەکێشابوو و وەکوو هەر شتێکی تری ئاسایی سەیری دەکردن، کەچی دوای ئەوەی ئەو کوڕە هاتە سەر ڕێگای و ئەو قسە سەیرەی پێ وت.. پێی وت و ئەم سەرنجی لە چاوەکانی دا، کە یەکەمجاربوو ڕەنگێ ببینێت لە ڕەش و سپی و سوور جیابێت و ئەوەندەش جوانبێت، هەر خێرا ناوی بۆ دۆزیەوە و لە لای بووبوو بە تابلۆیەکی بەنرخی دانسقە.. بە دەیان شێوە خۆی دەنواند و لە سەیرکردنی تێرنەدەبوو.. ڕۆژی چەند جارێک، بە ئیش و بێ ئیش بەسەر ئەو ڕێگایەدا دەڕۆیشت و لە ئاستیدا هەنگاوەکانی خاودەکردنەوە.. خاویدەکردنەوە و بە حەزێکی زۆر سەیرەوە سەیری دەکرد.. بە پەرۆشەوە لێی ڕادەما و ئەو ڕۆژەی بیر خۆی دەخستەوە، کە چاوسەوزەکەی خۆی دەستی پێوەگرتبوو و وای پێوت.. جاران زۆر بە زەحمەت هەڵیاندەستاند و بە زۆر دەیاننارد بۆ نانەواخانەکەی بەرامبەری.. هەمیشە لەگەڵ «فەریال» دەبوو بە شەڕیان و تیتکی یەکتریان ڕادەکێشا ، لەسەر ئەوەی کێ بچێت و کێ نەچێت، کەچی دوای ئەوە بە گورجی لە ژێر لێفەکەی دەهاتە دەرێ و بەبێ قرە دەچوو.. پارەکەی لەسەرە دادەنا و لێی ڕادەما.. ئاخی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا و بیری دەکردەوە.. جارێکیان سەرزەنشتی خۆی کرد و لە ناخەوە وتی: «خۆ من وا گەورەبووم و لە ناوەندیم.. ئەوە ڕاستە کوڕێک تەنها قسەیەکی لەگەڵدا کردووم، ئەوا ساڵێ زیاترە بووە بە خولیای شەو و ڕۆژم و ناتوانم لە بیر خۆمی بەرمەوە..؟! ئەوەتا دەیان کوڕ، کوڕی زۆر قۆزیش خوا خوایانە سەیریان بکەم.. بە ڕوویانەوە پێبکەنم.. بزەیەکم.. چاونووقاندنێکم.. پەرچەم لادانێکم بە جووڵەی عەیارانەی سەر لەسەر چاوە ڕەش و جوانەکانم بەسە بۆ قۆزترینیان تا بە درێژایی شەو خەو

نەچێتە چاویەوە و لەناو پێخەفەکەیدا تلاوتل بکات»...

ئێوارەیەک کە باپیری سەرکەوتبووە سەر دارخورما سپیەکەی بەر دەرگا و خورما ڕەش و گەییوەکانی دەوەراند.. ئەم دانە دانە هەڵیدەگرتنەوە و دەیکردنە قاپە سپیە گەورەکەی دەستیەوە.. تێیدەکردن و بە خۆی دەوت: «ئایا بە ڕاستیی من حەزدەکەم جارێکی تر بیبینمەوە..؟!» ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە و نەیزانی چ وەڵامێکی خۆی بداتەوە.... ڕۆژێکیان لە وانەی «زمان و ڕێزمانی عەرەبی»دا پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشابوون و خەیاڵی ڕۆیشتبوو، بیری لەو پرسیارە دەکردەوە و لە مێشکی خۆیدا دەیهێنا و دەیبرد.. دەیبرد و دەیهێنایەوە.. دواتر لەپڕ سەری هەڵبڕی و بە خۆی وت: «لام ڕوون نییە حەزدەکەم، یان نا، بەڵام هیوادارم بۆئەوەی ئەو خۆشەویستیەی لەلام کۆتایی نەیەت، نەگەڕێتەوە».. ئینجا دەستەکانی گرت بە دڵیەوە و لە خۆی پرسی: «ئایا من خۆشمدەوێت، یان ونبوونی لەناکاویم لێبووە بە مەراق و بە دوای ئەوەدا وێڵم سۆراغێکی بکەم و بزانم چی بەسەرهات..؟!».. دایکی وەک بڵێی بزانێت بیر لە چی دەکاتەوە و جوان جوان ناخی خوێندبێتەوە، تەباشیرە سپیەکەی دەستی تێگرت و بەر یەخەی کراسە ڕەشەکەی کەوت.. پیایدا هەڵشاخا و پێی وت:

ـ ئادەی هەستە و پێم بڵێ باسی چییم دەکرد.

چاوەکانی کردەوە و سەیرێکی تەختەی نووسینەکەی کرد، لەسەرەوە تا خوارەوەی پڕکرابووەوە و وشەکان وەکوو سەرمێکوتەی بزێو لەبەر چاویا دەجوڵانەوە.. وەکوو بەرە ڕەشوسپیەکەی خۆیان و پیانۆکەی «کاترینا» و دەرگا داخراوەکەی دەهاتنە بەر چاو و ئەوەندەی تر خەیاڵی پەرشوبڵاودەبووەوە.... ئەو شەوەش کە لەسەر بەرە ڕەشوسپیەکەدا پیاسەی دەکرد و دەگریا، لەپڕ دایکی هاتە ژوورەوە و پێی وت:

ـ ئەوە بۆچی دەگری..؟!

کە ئەم سەیری نەکرد و وەڵامی نەدایەوە، ئەو پەنجەکانی خۆی لە یەکتر ئاڵاند و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ خۆشیی بێت و ترشیی بێت، دەبێت سبەی ئێوارە، کە ئەفسەرەکە هات تۆ

نامەی خۆتت نووسی بێت.

بەیانی هەمووویان لە هەیوانەکەدا کۆبوونەوە و بەرچاییان دەخوارد.. «ست سوعاد» کاتێ جامە شووشە ڕەشە پڕ لە ماستەکەی خستە سەر مێزە سپیەکەوە و پیاڵە شیرییەکانی لە بەردەمی براژنەکەی دانا، جارێکی تر بیری «نەوال»ی خستەوە و پێی وت:

ـ ئێمە نامەی خۆمانمان نووسیوە، هەر تۆ ماویت.. حەز ناکەم دەنگمان دەربچێت و دەرودراوسێ بێنە سەیرمان.. تێبگە دەڵێم چی.

ئەم کەللەیی بوو و هەستایە سەر پێ.. بە تووڕەیی سەیرێکی ئەوی کرد و لەقەیەکی قایمی بە کورسیەکەدا کێشا.. یەکێکی قایمتر و هەڵیگێڕایەوە.. لەتە نانە سپیەکەی دەستی توند هەڵدا و بەر پیاڵەچاکەی خاڵی کەوت.. پیاڵە بەسەر ژێرپیاڵەدا قلێپبووەوە و چا بەسەر مێزە سپیەکەدا ڕژا.. پشتی تێکردن و جانتا ڕەشەکەی لەسەر مێزە سپیەکەی ژوورەوە هەڵگرت.. کاتێ گۆرەوییە سپیەکانی لە پێکرد و ویستی قاچەکانی بخاتە پێڵاوە ڕەشە هاوینیەکەیەوە، «فەریال» دەستی کردە ملیەوە و پێی وت:

ـ وەرە نانەکەت بخۆ بە قوربانت بم، تۆ گەورە بوویت، ئەم دڵناسکی و نازە تا کەی..؟!

ئینجا لە دایکی پاڕایەوە و پێی وت:

ـ تۆ ئەمجارە وازی لێبێنە، من خۆم دوایی قسەی لەگەڵدا دەکەم و بزانە جارێکی تر چۆن دەینووسێت.

ئەوان چاک دەیانزانی «نەوال» تۆرینۆکێکی کەللەڕەقە و هەر جارەی بتۆرێت، دوو ڕۆژ دەم بۆ نان و ئاو نابات و ناچارن بە هەزار تکا و پاڕانەوە ئاشتی بکەنەوە، بۆیە زۆر جار لەو ترسە دڵیان ڕادەگرت و بە هەر شێوەیەک بوایە خۆیان لێی دەپاراست.. ئەمەش زیاتر خەتای باوکی بوو و ئەو ئێجگار پەتەکەی بۆ شلکردبوو، گوایە کچی بچووکی ماڵەوەیە و ناوی نابوو «ڕۆحەکەی بابە».. هەموو جارێ دایکی لای باوکی سکاڵای لێدەکرد و بە تەوسەوە پێی دەوت: «ئەمڕۆ ڕۆحەکەی بابە ئاوا و ئاوای کردووە و واو وای بە فلان وتووە».. ئەو

لەجیاتی ئەوەی سەرزەنشتی بکات و پیایدا بکێشێت، هەڵیدەبڕی و دەیکردە قەڵاندۆشکانیەوە.. بە درێژایی ژوورەکە، یان باخەکە دەیگێڕاو یاریی لەگەڵدا دەکرد.. کەچی جاری واش هەبوو وای تێهەڵدەدا هەر دەتوت باوەپیارەیەتی و هەستت نەدەکرد لە ئاستیا تۆزقاڵێ خۆشەویستیی لەو دڵەیدا هەیە.. ئەو هەمیشە لای بازرگان و دووکاندارەکانی هاورێی شانازیی بە «نەوال»ەوە دەکرد و پێی دەوتن، کە شەرم ناکات و کوڕانیە.. زۆر جار بە «شەمرووخ» بانگی دەکرد و دەیوت:

ـ کچەکەم وەکوو شەمرووخ پیاوانە هەڵکەوتووە.

«شەمرووخ»یش نازناوی ژنێکی کوردی چوارشانەی شەڕانی بوو و ئەم زۆر حەزی لە قسەکانی دەکرد.. لە بازاڕدا شان بە شانی بازرگانەکان کاری دەکرد و کەسیانی بە پیاو نەدەزانی.. قژە ڕەشەکەی کورت کورت دەکردەوە و قاتێکی ڕەشی پیاوانەی لەبەردەکرد.. تەربووشێکی سووری دەکردە سەری و گۆچانێکی سپیی بە دەستیەوە دەگرت.. زۆر جار لە سەر تەختە سپیەکەی بەردەم گازینۆکەی بەرامبەر دووکانی «باوکی نەوال»دا قاچ لەسەر قاچ دادەنیشت و بێشەرمانە چای هەڵدەقووڕاند.. بە فیز و کەشوفشەوە نێرگەلەی سپیی بنکرەشی دەکێشا و بە چاوە زەقەکانیەوە مۆرەی لە خەڵک دەکرد.. هەندێ جار دەفتەرێکی بچکۆلەی بەرگسپیی لە گیرفانی ناوەوەی چاکەتە ڕەشەکەی دەردەهێنا و بە قەڵەمە ڕەشەکە شتی لەسەر دەنووسی.. لەگەڵیا بیری دەکردەوە و سووک سووک سەری دەلەقاندەوە.. ڕۆژێکیان «نەوال» لەوێ بوو و بە چاوی خۆی بینی، کاتێ دوو پیاوی دیشداشەسپیی، کە قایشی ڕەش و پانیان لەپشتیان بەستبوو و جەزمەی درێژیان کردبووە پێیان، لەو گازینۆیە گاڵتەیان پێکرد و پێی پێکەنین، چۆن ئەو خێرا بۆیان هەستایەوە و سەری هەر دووکیانی دا بە یەکا.. پشتی نووساندن بە دیوارەکەوە و بە گۆچان تێیانکەوت.. ئەگەر حەماڵە ڕەشپۆشەکانی بە چاکی ئیشیان بۆی نەکردایە و زۆر بە گورجیی هەڵنەسووڕانایە، تووڕەدەبوو و پەلاماری فەردە سپیە هێلڕەشەکانی دەدا.. بەرزیدەکردنەوە و دەیخستنە سەر شانیەوە.. یەک لە دوای یەک دەیخستنە سەر عەرەبانە ڕەشەکە و پێی دەوتن:

ـ داوەشێن بۆ خۆتان و پیاوەتیشتان.. بتانخەمە سەر فەردەکان و لە بازاڕی شۆڕیجەدا بتانگێڕم.. ؟!

«نەوال» زۆری بە لاوە سەیر بوو و بگرە ئێجگاریش پێی سەرسام دەبوو، کە دەیبینی بێشەرمانە گاڵتە لەگەڵ باوکیدا دەکات و پێی دەڵێت:

ـ کورە هەی ژنت بگێم، نابێت کەمێ پیاو بیت.. ؟!

یان دەستەکانی ئەوی دەنووشتاندەوە و پێی دەوت:

ـ قەحپەدایک من خۆم ناوم زارای بارام گەرمیانیە، پێم ناڵێیت ئەو شەمرووخە چییە دواتخستووم.. ؟!

ـ تۆ هەموو شتێکت پیاوانەیە، دەبا ناوەکەشت پیاوانە بێت ئای..!!

ـ جا هەتیو ناوت نەدۆزیەوە شەمرووخ نەبێت.. ؟!

ـ تۆ پێم بڵێ شەمرووخ لە حەمامی ژنان، یان هی پیاوان خۆت دەشۆیت.. ؟!

ـ من لەگەڵ ژنەکەتا خۆم دەشۆم.

جا هەر بە ڕاستیی ڕۆژێکیان وا ڕێککەوت «شەمرووخ» لە یەکێ لە حەمامەکانی «بابلشێخ»دا لەگەڵ «ست سوعاد» و کچەکانیدا خۆی بشوات و «نەوال» بۆ یەکەمجار بە ڕووتیی بیبینێت.. ڕۆژێکی زۆر ساردی چلەی زستان بوو و حەمامەکە جمەی دەهات.. زۆر لە ژن و منالان بە پێوە وەستابوون و چاوەڕێی چۆڵبوونی جوڕنەکان بوون.. ئەمان زوو چووبوون و شوێنی خۆیان گرتبوو.. کاتێ «ست سوعاد» سەری هەڵبڕی و «شەمرووخ»ی بینی، وا جامی ڕەش و لیفکەی سپی بە دەستەوەیە و بە پێوە وەستاوە، خێرا هەستاو چوو هێنایە لای خۆیانەوە.. ئەو لە پێشا پشتی ئەمان و دواییش «ست سوعاد» هی ئەوی شت.. کاتێ لە ژووری خۆگۆڕین بە خاولیە سپیەکان گیانیان وشکدەکردەوە و جلە ڕەشەکانیان لەبەردەکرد، «شەمرووخ» قاقایەکی لێ دا و بە «ست سوعاد»ی وت:

ـ دەزانی نەمناسینەوە.. ؟!

ـ دەبوایە ئێمە تۆمان نەناسیایەتەوە..!!

ـ دەزانم دەڵێی چی..!!

ئینجا قاقایەکی بەرزتری لێ دا و وتی:

ـ ئێمە کاتێ خۆمان لەبەر چاوی یەکتر ڕووتدەکەینەوە، ئەو عەیب و عارەی جەستەمان دەردەخەین، کە لە ژێر جلەکانمانا حەشارماندراون، بۆیە سەیر نییە ئەگەر بە ڕووتیی یەکتر نەناسینەوە.

«نەوال» ئەم قسەیەی «شەمرووخ»ی زۆر بە لاوە سەیربوو و لەگەڵیا دەمی داپچڕی، چونکە ئەو بە ڕووتیی لەبەر چاویانا وەستابوو و هیچ عەیبێ بە جەستەیەوە دیار نەبوو، بە پێچەوانەوە بالایەکی ڕێک و پێستێکی سپیی شووشەیی.. دوو چاوی ڕەشی گەورە و دەموچاوێکی ساف و لووس و چەند بلێی جوان.. خۆی و دایکی و «فەریال»ی خوشکیشی لەو جوانتر و ناسکتر، ئیتر بۆچی وا دەڵێت و چ مەبەستێکی هەیە..؟! دواییش لەماڵەوە کاتێ ئاردی دەکرد بەسەر خورما گەییوەکانی ناو قاپە سپییەکەی دەستی و دەیخوارد، ڕوویکردە دایکی و لێی پرسی، ئاخۆ مەبەستی لەو قسەیە چی بوو و بۆچی ئەم لێی تێناگات.. ئەو ئەوسا لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا وەستابوو و عەتری ناو شووشە ڕەشە درێژکۆلەکەی لە دەموچاو و لاملی خۆی دەدا، ڕووی بۆ وەرگێڕا و پێی وت:

ـ ئیتر شەمرووخ نییە..!! کێ لە قسەکانی تێدەگات..!! باوکت لە هەقی نایەت، بەس نییە..!!

«نەوال» هەمیشە بە وردی سەرنجی لە قسە و هەڵسوکەوتی «شەمرووخ» دەدا و جوان جوان لێیان وردەبووەوە.. زۆر جار لە ماڵ و لە کۆلان و لە قوتابخانەدا لاسایی دەکردەوە و هەموویانی دەهێنایە پێکەنین.. ئەوەندە پێدەکەنین و دەتریقانەوە، توند توند سکی خۆیان دەگرت و دەکەوتنە سەر پشت.. لە بۆنە و ئاهەنگەکانی قوتابخانەدا بانگیان دەکردە سەر سەکۆ سپییەکەی گۆڕەپان و هەر جارێ لاسایی چەند جووڵە و هەڵسوکەوتێکی ئەوی دەکردەوە.. شەڕەکانی دەگێڕایەوە و بە تەمسیل بۆی دەکردن، یەک دوو منالیان بۆ دەهێنا و بە بەر شەقی دەدان.. دەنگی خۆی نێردەکرد و جنێوی سەیر سەیری پیاوانەی پێ دەدان.. ئەم لاساییکردنەوەیە بێجگە لەوەی «شەمرووخ»ی زیاتر بە خەڵک ناساند و ئەوەندەی تر ناوبانگی بە شاردا بڵاوکردەوە، توانایەکی هونەریی تریشی لە «نەوال»دا دەرخست و چ مامۆستا و چ قوتابییەکان بۆیان دەرکەوت، ئەم ئەکتەرێکی بە

توانایە و دەشێ بۆڕی هەموو ئەکتەرەکانی تر بداتەوە.. ئەو کاتەی پەیوەندیی بە «پەیمانگای هونەرە جوانەکان»ـەوە کرد و مامۆستاکانی تواناکانیان تاقییکردەوە، «مامۆستا سالم سەبری» لە هەموویان زیاتر پێی سەرسامبوو و لە ئاستی جووڵە سەیر سەیرەکانی دەمی دادەپچڕی.. ئەم بێشەرمانە و چەند بلێیی هونەرمەندانە لاسایی هەڵسوکەوتی کەسە ناسراوەکانی شاری دەکردەوە و دەنگەکانیانی وەکوو خۆی دەردەکرد.. ئەو زۆر هەوڵی لەگەڵ دا و پێی وت، کە بەشی تەمسیل هەڵبژێرێت و دوارۆژی لەوێدا ڕووناکە، بەڵام ئەم گوێی بەو نەدا و هەر سووربوو بەشی مۆسیقا و گۆرانی بخوێنێت.. دوای ئەوەش «مامۆستا سالم سەبری» هەر خۆشیدەویست و هەمیشە بە «شەمرووخ» بانگی دەکرد.. «مامۆستا عیماد» هەر لە زووەوە مرخی لە «نەوال» خۆشکردبوو و زۆر جار بە «مامۆستا ئەمجەد»ی دەوت:

ـ با پۆلی سێ ببڕێت، من هەوڵدەدەم لای خۆمان جێگای بۆ بکەمەوە و دەبێت چاکترین ئەکتەری لێ دەرچێت.

ئیتر لەمەوە زوو زوو سەرزەنشتی دەکرد و پێی دەوت:

ـ من ئیتر خاڵت نییم، چونکە بە قسەت نەکردم.

ئەو لەگەڵ «ست سوعاد»دا بە یەکەوە شیریان خواردبوو و هەر بە یەکەوەش گەورەبووبوون، بۆیە خۆی بە برای ئەو و خاڵی منداڵەکانی دەزانی و پەیوەندیی نێوانیان زۆر خۆشبوو.. دوای مردنی «جابر»یش بەردەوام هاتوچۆی دەکردن و سەری لێنەدەبڕین.. زۆر شەو لەلایان دەمایەوە و تا درەنگ لەگەڵ «مامۆستا ئەمجەد»دا دەیانخواردەوە.. «نەوال»یش جار جار گۆرانیی بۆ دەوتن و جار جاریش لاسایی ئەم و ئەوی بۆ دەکردنەوە.. ئیتر ئەوان بەدەم پێکهەڵدانەوە پێدەکەنین و دەتریقانەوە.... ئەو ڕۆژەی ئەفسەرەکە هاتەوە و نامەکانیان دایە، ئەم سەعاتێ بوو گەیشتبوو و لە سووچی ئەوسەری تەختی دانیشتنەکەدا یاریی بە پوولە ڕەشە خاڵسپییەکانی دۆمینەی سەر مێزە سپییەکە دەکرد، کە پێش ئەوەی ئەفسەرەکە بێت لەگەڵ «مام ئەدهەم»دا تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق پیایاندا دەکێشان و مێشکی سەری ئەمانیان پێ بردبوون.. لەسەر یەکتر

کەڵکەیدەکردن و خانووی بچکۆلە و چوارگۆشەیی پێ درووستدەکردن.. دواجار هەموویانی ڕماند و یەک خانووی لاکێشەیی گەورەی لێ درووستکردن.. بە کتێبە بەرگڕەشەکەی بەردەمی سەری گرت و دەستی بۆ خوێدانە ڕەشەکە برد، کە لە شێوەی سەرباز درووستکرابوو و لەبەر تیشکی ڕووناکیدا دەدرەوشایەوە.. خستیە سەریەوە و کەوتە سەرنجدانی.. «ست سوعاد» هەمیشە لە «نەوال» تووڕەدەبوو و سەری لێ بادەدا، کە ئەم ئەو خوێدانەی بۆ میوان دادەنا و ئەوانیش نەیاندەزانی سەری سەربازەکە بابدەن، تا کونەکانی دەم و لووتی بکرێنەوە و خوێکەیان لێبێتە دەرەوە.. ئەوان بە توندی ملیان ڕادەکێشا و سەرەکەیان بە دەستەوە دەهات، ئیتر خوێیەکە دەڕژا و تەریقدەبوونەوە.. «نەوال» گوێی نەدەدایە قسەی دایکی و بۆیەش وایدەکرد، تا باس بێتە سەر خوێدانەکە و ئەم خۆی بنوێنێت، کە شتێکی سەیری هەیە و بۆیان باسبکات، کەوا «کاترینا» لە «لەندەن»ـەوە لەگەڵ دەفتەرڕەسمێکی زۆر جوان و کراسێکی ڕەش، کە هەر بیستوشەش پیتی ئینگلیزیی بە ڕەنگی سپی لەسەر نووسراوە، بۆی هێناوە و لە بازاڕێکی ئەنتیکدا کڕیویەتی.. ئەو ڕۆژە کە «فەریال» ڕیزێ پەرداخی شووشەی ڕەشی پڕ لە ماستاوی هێنا و خستیە سەر مێزە سپیەکەوە، خاڵۆژنی خێرا دانەیەکی هەڵگرت و لە بەردەمی ئەفسەرەکەی دانا.. ئەم فڕێکی لێ دا و داوای خوێی کرد.. «نەوال» خێرا هەستا و چوو ئەو خوێدانەی بۆ هێنا.. ئەو لێی وەرگرت و وەک بڵێی دەیان جاری تر بەکاریهێنابێت، زۆر لێزانانە سەرەکەی جەڕاند و خوێکەی بە سووکی کردە ماستاوەکەوە.. ئینجا بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەری هەڵبڕی و بە پێکەنینەوە لێی پرسی:

ـ تۆ نەوالیت..؟!

«نەوال» سەری لەبەر نا و هیچی نەوت.. ئەم ئەوەشی زۆر بەلاوە سەیربوو و لەوساوە بیری لێدەکردەوە، کە ئەوێک حەفتەی پێشوو لە شەرما چاوی بۆ هەڵنەدەهات و زمانی تەتەڵەی دەکرد، کەچی وا ئەمجارە وەکوو ناسیاوێکی زۆر نزیکی خێزانەکەیان هەڵسوکەوت دەکات و بە ناوی خۆیانەوە بانگیان دەکات.. تەنانەت کە خاڵی دەستی ڕاستی خستە سەر شانی چەپی و پێی وت: نەڕوات و

نانی ئێواره لەگەڵ ئەواندا بخوات، ئەو زۆر ئاسایی و بەبێ مشتومڕ ڕەزامەندیی خۆی پیشاندا و نەڕۆیشت.. «فەریال» سفرە ڕەشە عەجەمیەکەی هێنا و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دایخست، کە شێوەیەکی چوارگۆشەیی هەبوو و تانوپۆی بە وێنەی قازی سپی نەخشابوو.. خاڵۆژنیشی قاپ و کەوچکە سپیەکانی لە قەراغەکانی دانا و ئاوی کردە پەرداخەکانەوە.. ئەو سفرەیە تەنها بۆ میوانی زۆر خۆشەویست دادەخرا و بازرگانێکی هاوڕێی باوکی لە «ئێران»ەوە بە دیاریی بۆی هێنابوون.. لە کاتی نانخواردندا «نەوال» لە تەنیشت دایکیەوە دانیشتبوو و سەرنجەکانی لەسەر ئەفسەرەکە نەدەگوێزایەوە، کە ڕێک کەوتبووە بەرامبەریەوە و قۆپچە سپیەکانی کراسە ڕەشەکەی تا سەر داخستبوو.. لە جووڵەی دەست و بزوانی چاوەکانی ورددەبووەوە و زۆر شتی لە دەموچاویدا خوێندەوە.. شەوێکیان «هیجران» لەسەر پشت پاڵکەوتبوو و هەر لە خۆیەوە پێی وت:

ـ ئەو کاتەی کەسێکت خۆشدەوێت و ئەو خۆشیناوێیت، یان هەستت پێناکات، لە هەموو کاتێکی تر چاکتر پەی بە ناخی کەسانی دەوروبەرت دەبەیت.

ـ بۆچی.. ؟!

ـ پێت نالێم.

ئەمەی وت و چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک.. لێفە سپیەکەی ڕاکێشا و سەری خۆی پێ داپۆشی.. لە ژێر لێفەکەوە هەنسکی دەدا و «نەوال»یش لێی نەدەپرسی: ئاخۆ بۆچی دەگری و ئەو هەموو فرمێسکە بۆچی هەڵدەڕێژێت، چونکە لەمەوپێش ئاگاداری کردبووەوە و چەند جارێکیش لێی تووڕەبووبوو، کاتێ گریا هیچی لەگەڵدا نەڵێت و بە پرسیار هەراسانی نەکات.... «نەوال» ئەو ئێوارەیە کە «هیجران»ی بیرکەوتەوە و سیمای قژە درێژەکەی هاتە بەر بینایی، خەریکبوو لەبەر چاوی هەموویان دەستکات بە گریان و فرمێسکی بۆ بڕێژێت.. هاوکات ئەوەشی بیرکەوتەوە و لەگەڵیا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، کاتێ ئەو ئەو قسەیەی کرد و ئاوا بەکوڵ و بەسۆز گریا، بلووزێکی ڕەشوسپیی تەنکی وەکوو پیانۆکەی «کاترینا»ی لەبەردابوو و زۆر جار ئەم یاریی بە قۆپچەکانی سنگی کردبوو، ئەمە ئەوەندەی تر لە ناخی ناخەوە هەژاندی و زیاتر بیری لە دەرگا

داخراوەکە کردەوە، بەڵام چاویشی لە ئەفسەرەکە نەدەترووکاند و دەیویست دوایی بە وردی بۆ «فەریال»ی خوشکی باسبکات، کەوا هەستی بە نهێنیەکی سەیری ناخی کردووە و باوەڕیش ناکات بە هەڵەداچووبێت.. دەشیزانی شەو کاتێ دەچنە سەر جێگا و دەرگای ژوورەکەیان دادەخەن، ئەو دێتە لایەوە و لە تەنیشتی پاڵدەکەوێت، تا بە قسەی خۆش ڕازیی بکات و وایلێبکات جارێکی تر نامە بۆ «عەمار» بنووسێت.. دواییش لای دایکی پۆز لێدەدات و باسی ئازایەتیی خۆی بۆ دەکات، کەوا هەر ئەو دەتوانێت کار لە «نەوال» بکات و بە هێمنیی بیهێنێتە سەر ڕێ.. کەچی خۆی بۆ نەگیرا و ئەو کاتەی لە سینگەکەی مووبەقدا بە جووتە قاپەکانیان دەشت، دەمی بردە لای گوێچکەی ڕاستیەوە و بە چپە پێی وت:

ـ خۆشیدەوێیت.

ئەو بە حەپەساوی و هەر بە چپەوە، لە کاتێکدا تەزوو بە هەموو گیانی دادەهات و ئەم بە جوانی هەستی پێیدەکرد، سەیری چاوەکانی کرد و بە شێوەیەکی زۆر سەیر وتی:

ـ کێ خۆشیدەوێم..؟! فوئاد..؟!

ـ ناوەکەشیت بە لاوە خۆشە وانییە..؟!

ـ تۆ پێم بڵێ چۆن دەزانی خۆشیدەوێم..؟!

ـ پێت ناڵێم.

ئەمەی وت و دڵی پڕبوو.. فرمێسک لە چاوەکانی قەتیس ما و ڕایکردە ژوورەکەی خۆیەوە.. لەسەر دەم پاڵکەوت و دایە گریانێکی بەکوڵ.. «فەریال» گەیشتە سەر سەری و دەستی کردە ملیەوە.. دەمی لە گوێچکەی نزیککردەوە و بە سەرسامیەوە لێی پرسی:

ـ نەوال گیان پێم بڵێ بۆچی ئاوا لەپڕ دەستتکرد بە گریان..؟!

ئەم بۆئەوەی خوشکەکەی زۆری لێنەکات هۆی گریانەکەی پێبڵێت و نهێنیی ناو دڵی خۆی بۆ ئاشکرا بکات، هەستا و بە چمکی کراسە سپیەکەی چاوەکانی سڕی.. «فەریال» لە تەنیشتی دانیشت و سەری خستە سەر سنگیەوە.. ماچێکی قژە ڕەشەکەی کرد و پێی وت:

ـ ئیتر گەورە بوویت چاوەکەم، لەوە دەرچوویت بە ورچە ڕەشەکە ژێرتبکەمەوە.

«نەوال» هەر لە باوەشی خوشکەکەیەوە سەری هەڵبڕی و بە چاوە فرمێسکاویەکانیەوە سەیرێکی دیوارەکەی بەرامبەری خۆی کرد.. ورچە ڕەش و زلە پەڕۆینەکە لە قەراغی تاقە سپیەکە دانیشتووە و قاچەکانی شۆڕکردوونەتەوە.. دەمە زلەکەی داخستووە و دەستەکانی بۆ پێشەوە درێژکردوون.. لەملا وێنەی دایکی و باوکی، ئەمیان بە قاتێکی ڕەش و ئەویان بە کراسێکی سپیی نیوقۆڵ.. دەستیان کردۆتە ملی یەکترەوە و پێدەکەنن.. لەولا وێنەی خۆی کاتێ تەمەنی ساڵەوەخت بووە و کراسێکی سپیی توولیان لەبەرکردووە.. خوشکەکەی لەسەر کورسیەکی ڕەش دانیشتووە و کردوویەتیە باوەشیەوە.. هەمان ئەو دوو وێنەیە بە گەورەیی لە ژووری میوان و لە جامخانەی «ستۆدیۆی ئەربیل»یشدا هەڵواسرابوون.. «سیامەند عومەر پیرداود» هەموو جارێ هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و بۆ ئەم و خوشکەکەی باسدەکرد، کە باوکیان حەزیکردووە وێنەی هەر یەکەیان بە جیا بگرێت و ئەو وای بە چاک زانیوە، هەر دووکیان بە جووتە بگرێت.. «فەریال» دەستەکانی دەگرت و پێی دەوت:

ـ مامە سیامەند من لە بیرمە، چونکە ئەو کاتە پۆلی یەک بووم.. ئەها سەیرکە.......!!

ئێوارەی ڕۆژی دووەمی جەژن، «سیامەند» هات بۆ ماڵیان و تەنیا خۆی و دایکی لە ماڵ بوون.. سەعاتێ بێش ئەوە، کاتێ خاڵی و خاڵۆژنی چوون بۆ سینەما و داوایان لە دایکی کرد لەگەڵیاندا بچێت، ئەو خۆی هێنایە حاڵی جاو و پێی وتن:

ـ ناتوانم بە خوا هەموو گیانم یەشێت.. ئێوە فەریال و نەوال لەگەڵ خۆتانا بەرن، من لە ماڵ دەمێنینەوە.

«نەوال» زۆری بە لاوە سەیربوو و هیچ لەوە حاڵی نەدەبوو، کە دایکی هەمیشە ئەوانی بە زۆر بۆ سینەما دەبرد و کە دەهاتنەوەش دوای حەفتەیەک ڕووداوی فیلمەکانی بۆ ئەم و ئەو دەگێڕایەوە، کەچی وا ئەمجارە بۆ فیلمی «محەمەد عەبدولوەهاب» ناچێت و بەقەدەر هەموو دنیاش حەزی لێدەکات.. بۆیە هەستی

کرد شتێ لە ئارادایە و دڵی کەوتە ختووره، لەسەر فولکەکەی ئەولا گەڕایەوە و بە دزییەوە خۆی کرد بە ماڵدا.. هەر ئەمەش وایلێکرد هاتنی «سیامەند»ی بە لاوە سەیربێت و گومانی لێبکات.. ئەو ئێوارەیەشی بیرکەوتەوە و دڵی داچڵەکی، کە قورگی دەیەشا و دایکی بردی بۆ لای «دکتۆر فازیل»ی ئامۆزای خۆی.. ئەو ڕۆژەش دایکی بۆ یەکەمجار دوای مردنی باوکی کراسە ڕەشە گوڵسپیەکەی فڕێدا و دانەیەکی سپیی گوڵڕەشی لەبەرکرد.. پاڵتۆیەکی ڕەشی سادەی درێژی بەسەرداهێنا و قۆپچە سپیەکانی تا سەر داخستن.. قژە ڕەشەکەی بە شێوەیەکی جیا لە ڕۆژان شانەکرد و سووراوێکی تەنکیشی کرد.. لەسەر نووکی پێ و لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا وەستا.. وەکوو کچێکی هەرزەکار بە لەنجەولار دەهات و دەچوو و بە وردی سەرنجی لە بەژن و باڵای خۆی دەدا.. دواییش کاتێ لای «دکتۆر فازیل» تەواوبوون و هاتنە دەرەوە، پێش ئەوەی ڕاچێتەکە بەرن بۆ دەرمانخانە و دەرمانەکان بکڕن، بە بیانووی هەواڵپرسینی «شازە»ی ژنی «سیامەند»، کە دوای کوژرانی تاقە براکەی بە دەستی «کاکەسوور» و بینینی لاشە شێواوەکەی، شێتبووبوو و لە ژوورە تاریکەکەی ئازووقەدا بەستبوویانەوە؛ خۆی کرد بە «ستۆدیۆی ئەربیل»دا و ئەمیش بە دوایەوە.. «نەوال» کە دەیبینی دایکی بە شێوەیەک لەگەڵ «سیامەند»دا دەدوێ و دەستبازیی لەگەڵدا دەکات، هەر وەک بڵێی مێردی بێت و بە هی خۆی بزانێت، تەواو پەست و نیگەران دەبوو و نەشیدەتوانی هیچی پێ بڵێت.. لە تاوی ئازاری قورگی و ئەو هەڵسوکەوتانەی دایکی لەسەر تەختە سپیەکە پشتی دابووەوە و پەشێو و بێزار سەری نابوو بە دیوارە سپیەکەوە.. سەیری دەکردن و قێزی دەکردەوە.. ئاخی هەڵدەکێشا و پیشی دەخواردەوە.. هەرچەند بەحاڵیش سەری لە دیوارەکە جیادەکردەوە و بە دەنگی کز پێی دەوت:

- با بڕۆین من هیلاکم.

ئەو پێدەکەنی و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی دەوت:

- دەڕۆین بە قوربان دەڕۆین.. پەلەی چییتە..!! من لە تۆ هیلاکترم.

دواییش «سیامەند» دەرگای ستۆدیۆکەی داخست و بە شۆفەرلێتە سپیەکەی

خۆی بردنی بۆ دەرمانخانەکەی سەر سووچەکە.. ئەوسا کە وێنەکەی دایک و باوکی دەبینی بە جووتە دەستیان کردۆتە ملی یەکترەوە و پێدەکەنن، بە جارێ قیزی لە پێکەنین و ماچ و ئاوێزان و هەموو شتێکی تر دەکردەوە و حەزیدەکرد بە سەریاندا بڕشێتەوە.. بە دەستی بوایە بە لەقە جامخانەکە و دواتر جام و چوارچێوەی وێنەکەی وردوخاش دەکرد و ئەوانیشی بە جنێو ڕیسوادەکرد، بەڵام ئازار وا زیفی لێسەندبوو و ئەو تایە گەرمەش بە شێوەیەک لە پەلوپۆی خستبوو، هیچی بۆ نەدەکرا و چاوەکانیشی بەحاڵ شتەکانیان دەبینی.. دەیویست لە ماڵەوە و لەبەر چاوی خاڵی ڕیسوای بکات و هەرچی جنێوی سووک هەیە پێی بدات، کەچی ئەو ڕۆژە لە بەدبەختیی ئەم خاڵی و خاڵۆژنی چووبوون بۆ میوانداری و دوو ڕۆژ دواتر هاتنەوە.. شەو لەتاوا خەوی لێنەدەکەوت و هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا نەیدەتوانی ئەو قسە و پێکەنینە بێتامانەی دایکی و «سیامەند» لە بیری خۆی بەرێتەوە.. ئەگەرچی ئازاری قوڕگی نەمابوو و تاکەشی سووکتر ببوو، بەڵام زۆر لە شەوی پێشوو زیاتر هەراسان ببوو و خەیاڵەکان بواریان نەدەدا بنوێت.. بۆ نەگبەتییش دایکی جێگاکەی خۆی لە تەنیشت هی ئەمەوە داخستبوو و ڕوویکردبووە لایەوە، گوایە نەخۆشە و ئەگەر شەو بەدەم ئازارەوە خەبەری بێتەوە، ئاگای لێدەبێت و دڵنەوایی دەکات.. «نەوال» تا درەنگی شەو سەیری ئەوی دەکرد و ئاخی هەڵدەکێشا، کە پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشابوون و لێفەکەشی تا سەر چەناگەی هێنابوو.. هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و هی قووڵتری دەدایەوە.. وێنەی قەد دیوارەکەی بەرامبەریشی، کە لە ژێر تیشکی کەمێ کزی لامپا شیریە بنکڕەشەکەدا ڕوونتر دەهاتە بەر چاوی و پێکەنینەکانیان زیاتر قیزی دەکردنەوە، ئەوەی شەوان لەجیاتی گڵۆپە شیرییەکە دایاندەگیرساند شێوەیەکی وەکوو هی کونەپەپووی هەبوو.. ئەوەندەی تر دیمەنەکەی لەبەر چاوی تازەدەکردەوە و قات قات خەفەتی تری لەسەر دڵی هەڵدەچنی.. هەر چۆنێک بوو هەستا و کورسیە ڕەشەکەی بە سووکی ڕاکێشایە ژێر قاچیەوە.. سەرکەوتە سەریەوە و بە ئەسپایی لە دیوارەکەی جیاکردەوە.. ویستی تیواوتیو و چەند بڵێی بە هێز بیکێشێت بە سەریا و لە چاوترووکانێکدا مێشکی بۆگەنی لە کونی لووتیەوە دەربکات..

پیایدا بکێشێت و بەسەر دنیاوەی نەهێڵێت، کەچی هەستی کرد دەستی دەلەرزێت و دڵی بە شێوەیەکی زۆر سەیر لێدەدات.. بیری لەوە دەکردەوە بەیانی لە شاردا هەواڵی کوشتنی دایکێک بە دەستی کچە هەرزەکارەکەی خۆی بڵاودەبێتەوە و بە خێرایی ئەم زار و ئەو زار دەکات.. ئەژنۆی دەلەرزی و ترس ئابڵووقەی دەدا.. بە ئەسپایی گەڕایەوە سەر جێگاکەی و پاڵکەوتەوە، بۆئەوەی پشوێک بدات و جورئەت بنێتە بەر خۆی.. وێنەکەی خستە ژێر لێفەکەوە و بیری لەو کورتەچیرۆکەی خاڵی کردەوە، کە لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا لە کتێبێکی بەرگ ڕەشوسپیدا چاپی کردووە و ئەم زۆر جار خوێندوویەتیەوە.. کوڕێکە و دەیەوێت دەزگیرانە ناپاکەکەی خۆی بکوژێت، کەچی چەند دەکات و دەکۆشێت، دەستی تێیناچێت و چەقۆکەی بۆ بەرزناکرێتەوە.. ناچار ساردەبێتەوە و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: «چۆن دڵمدێت ئازیزترین کەسی خۆم بکوژم و دەستم بە خوێنی سوورکەم..؟! نا.. نا.. مەحاڵە ئەوە بکەم.. ئەگەرچی ناپاکیشی لەگەڵدا کردووم، بەڵام من و کوشتنیان نەوتووە».. لە داری ساجی ڕەش و جامی شووشەی ساف و لووسدا چوارچێوەیەکی بەقەدەر باڵای ئەو درووست دەکات و شەو کاتێ لەسەر پشت خەوی لێدەکەوێت، بە سووکی دەیخاتە سەر جەستەی و چەسپی دەکات.. ئێستا ئەوەی وا بە بەر گوللەی دەدات و لەناوی دەبات وێنەی دەسگیرانەکەیەتی و خۆی نییە.... «نەوال» تا درەنگ لەسەر پشت ڕاکشا و بیری لە ڕێگایەک کردەوە، کە بەبێ ترس و دوودڵی، بەبێ ئەوەی هەست بە ئازاری ڕۆحی بکات و جەستەی بلەرزێت، دایکی پێ لەناوبەرێت و بۆ هەتاهەتایە لەبەر چاوی خۆی لایبەرێت، بەڵام ناو سەری ببوو بەو گۆڕەپانەی پیاوە ڕەشپۆشەکان ئەسپە سپیەکانیان تیادا بەکرێ دەدا و دەنگی قاچی ناڵکراوی ئەسپە سپی و زلەکان هەراسانیان دەکرد.. بیرە ترسناک و نیوەناچڵەکانیان وەکوو گەردەلوول، لە شێوەی گیانداری ئەفسانەیی بە ئاسماندا دەکرد و ئۆقرەیان لێ دەبڕی.. ئەوسا ئەوەندەی تر پەستیی و خەمناکیی دایگرت و ئارەقیکردەوە، کە هەستی دەکرد هێشتا مناڵە و توانای کوشتنی نییە.. پەنجەکانی خۆی دەنووشتاندەوە و بە ڕق و بێزاریەوە دەیوت: «من هێشتا هەر مناڵە داماو و

بێدەستەڵاتەکەی جارانم.. کاتێ دەتوانم بڵێم گەورەم، کە توانای کوشتنی خۆم، یان هی کەسێکی ترم هەبێت.. ئێستا لە مشکێکی ترساو و زارەترەک زیاتر، هیچی تر نیم».... دوایی خۆیشی نەیزانی چی ئەو ڕۆژەی بیرخستەوە و ئاوا زیاتر خەیاڵەکانی لە ناو سەریا تێکقژقژاند، کە «عەدنان»ی کوڕی «جەمیلە»ی فەڕاشی قوتابخانەکەیان دوو قوتووی سپیی بەقەدەر یەکی بە دەستەوەبوو و لە ژوورە تاریکەکەی ژێر قادرمەکەدا هاتە دەرێ.. بە بزمارە ڕەشەکە دوو کونی خشتی کردە ئەملا و ئەولایان و دوو پەتی ڕەشی تێهەڵکێشان.. قاچەکانی خستە سەریان و سەری پەتەکانی بە دەستیەوە گرت.. سووک سووک هەنگاوی دەنا و بە ئاوازێکی زۆر خۆش، کە «نەوال» تەنها خۆی دەیزانی چەند حەزی لێدەکات و چۆن لەگەڵیا سەری دەلەقێنێتەوە، دەیوت:

ـ تاک و جووت.. ژنی ڕووت.. پیاوی پووت.. بۆ تابووت... تاک و جووت.. ژنی ڕووت.. پیاوی پووت.. بۆ تابووت.......

لەسەر کاشیە ڕەشەکانی بەر دەرگا سپیەکەی ئەو قوتابخانەیەدا هەر دەڕۆیی و وای دەوت.. منالآن سەیریاندەکرد و پێی پێدەکەنین.. دوایدەکەوتن و بۆیان دەسەندەوە.... دوایی هەر ئەوەندەیان زانی «ست سامیە»ی بەڕێوەبەر بە کراسێکی سپی و تەنوورەیەکی ڕەشەوە لە دەرگا سپیەکەی قوتابخانەدا سەری دەرهێنا و بینی.. وەی.. وەی.. وەی.. وەی..!! خوێن زایە چاوە ڕەشەکانی و دەمارەکانی لاملی گرژبوون.. تفێکی خەستی کردە چاویەوە و پاڵێکی قایمی پێوەنا:

ـ هەی بێئەدەب شوێن نەماوە ئەو قسە قۆڕانەی لێ بکەیت بەر دەرگای قوتابخانەی کچان نەبێت..!!

«عەدنان» قاچەکانی لە باریەکتر چوون و قوتووەکان لە ژێریاندا ترازان.. لەولاتر سەری بەر شۆستە سپیەکەی شەقامە تازە قیرتاوەکە کەوت و هاواری لێ بەرزبووەوە.. خوێن فیچقەیکرد و گیانی بوو بە خەڵتانی خوێن.. بەسەر ئەوانیشدا هاواری کرد و بە تف و جنێو بەرەو پۆلەکانی خۆیانی ڕاپێچکردن.... ئەو شەوە «نەوال» دەست لەسەر وێنەکەی ژێر لێفە و چاو لەسەر دایکی، سەرسام

و ئەبلەق ئەو وشانەی لە دڵی خۆیدا دەوتەوە و دیمەنەکە وەکوو خۆی لەبەر چاویا تازەدەبووەوە.. دەنگی قوتووە سپیەکانیش لەسەر کاشیە ڕەشەکان تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، لە ناو سەریا دەزرنگانەوە.. تا مەلا جبەسپی و کەوارەشەکەی ئەو مزگەوتە منارەسپیەی پشتماڵیشیان دەنگی هەڵبڕی و بانگی دا، ئەم نە خەو چووە چاوی و نە توانی قسەکانی «عەدنان» لە بیر خۆی بەرێتەوە.. هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی لەوە تێبگات ئاخۆ چ پەیوەندیەکی سەیر و سەمەرە لە نێوان کوشتنی دایکی و ئەو قوتووانەدا هەیە و بۆچی لە کاتێکی ئاوادا بیریکەوتۆتەوە، کە «عەدنان» کردبوونی بە پێڵاو و پێیان دەڕۆیی، بەڵام هەر ئەوەندەی زانی وا سۆز و بەزەیی لە گیانیدا دەچۆڕێ و چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک.. بەبێ ویست و زۆر بە گەرمی و پەرۆشەوە دەستی کردە ملیەوە و دایە پرمەی گریانێکی بەکوڵ.. دایکی چاوەکانی کردەوە و بە پەنجەکانی هەڵیگلۆفین.. هەستا و خێرا دەستی خستە سەر ناوچەوانی:

ـ چییتە ئەوە ڕۆحەکەی دایە.. ئازارت هەیە..؟!

سەری خستە سەر سنگی ئەو و بەکوڵتر گریا.. دایکی چمکی لێفەکەی ڕاکێشا، تا هەر لە باوەشیا داپۆشێت و سەرمای نەبێت.. وێنەکە دەرکەوت و دەستی بۆ درێژ کرد:

ـ ئەمە چییە..؟! بۆچی داتگرتووە..؟!

پرسی و بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بکات، دەستی کرد بە گریان و کچەکەی زیاتر نووساند بە خۆیەوە.. دەگریا و هیچیشی نەدەوت.. دەگریا و فرمێسکەکانیشی نەدەسڕی.. نەخێر، نەیدەسڕین و تنۆک تنۆک بەسەر قژی کچەکەیدا دادەباراند.. شەونمئاسا تاڵەکانی تەڕدەکردن و لە ژێر تیشکی لامپاکەدا دەبریسکانەوە.. ئەم لەمەوە هەستی کرد و تەواویش باوەڕی هێنا، کە هەرچی دیبووی و بیستبووی، هەمووی خەونی ناخۆشبووە و لە تاوی ئازار و وڕێنەدا هاتۆتە بەر چاوی.. تەنانەت بەزەیی بە «مامە سیامەند»یشیدا دەهاتەوە و لە دڵەوە بۆی دەگریا، کە ژنەکەی لە حەژمەتی مەرگی تاقە براکەیدا شێتبووە و وا بە زنجیرێکی سپی لە ژوورە تاریکەکەدا بەستوویانەتەوە.. بیری لەوە دەکردەوە

بەیانی هەرکە ڕۆژبووەوە و هەموویان لە خەو هەستان، لەجیاتی قوتابخانە بچێت بۆ «ستۆدیۆی ئەربیل» و بەبێ پرسی دایکی بانگهێشتی ماڵی خۆیانی بکات.. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد دایکی شووی پێبکات و ببێت بە باوکی.... بەیانی کاتێ بێداربووەوە و چاوەکانی کردەوە، هەستی کرد دوای ئەوەی بیری لەم مەسەلەیە کردۆتەوە و باوەڕی پێیهێناوە، ئینجا لەو دڵەڕاوکێیە دەربازبووە و خەوی لێکەوتووە، کەچی کاتێ دایکی بینی لە حەمامەکەدا خۆی ڕووتکردبووەوە و مایۆ سپیە خوێناویەکەی دەگۆڕی، جارێکی تر ڕقی لێی هەڵگرتەوە و تەنانەت بێزی نەهات ئەو بەیانییە نان و چاکەی دەستیشی بخوات.. جارێکی تریش هاتەوە سەر باوەڕەکەی خۆی و چاکتر لە دڵیا چەسپی، کە دایکی حەزی لە «سیامەند»ـە و ئەو هەڵسوکەوتە سەیرانەی بە خۆڕایی نییە.. ئیتر لەمەوە هەرچەند دایکی خۆی دەگۆڕی و دەچوو بۆ دەرەوە، ئەم لەگەڵی دەچوو و لێی جیانەدەبووەوە.. یان بە دزیەوە هەنگاو هەنگاو دوای دەکەوت و بە دیقەت سەرنجی لە هەڵسوکەوتەکانی دەدا..... ڕۆژی دووەمی جەژنیش، کاتێ «سیامەند» ئۆتۆمۆبیلەکەی لەبەر دەرگادا وەستاند و هاتە ژوورەوە، ئەو لە ژوورەکەی خۆیدا دەستی ڕاستی خستبووە سەر دڵی و متەقی لە خۆی بڕیبوو، تا ترسی هیچ شتێکیان نەبێت و بە ئارەزووی دڵیان تێهەڵچن.. وا مەست و بێ هۆش ببن و بە ڕادەیەک ئاگایان لە دنیا نەمێنێت، کە ئەم لە قافا بیانگرێت و قسەی خۆی بکات.. گوێچکەکانی بۆ وشەیەک، دەنگێک، چرپەیەک، هەناسەیەک، شلپەی ماچێک، خستبووە بۆسەوە و هەموو گیانی دەلەرزی.. کەچی وەک بڵێی ئەوان هەستیان بە بوونی ئەم کردبێت و تەواو ناخیان خوێندبێتەوە، قسەیەکی وایان نەدەکرد و بە لای هیچ باسێکدا نەدەچوون، کە ئەم دڵی بکەوێتە غایەلەوە و گومانیان لێبکات.. بەڵام ئەو کاتەی لە مووبەقەکەدا کتریە سپیەکەی دەخستە سەر تەباخە ڕەشە دووچاوەکەوە و دایگیرساند، تا چایان بۆ لێبنێت و بەم بیانووەوە لەپڕ و بە ئەسپایی لەسەر نووکی پێ خۆی بە ژووردا بکات، سەرنجیان لێ بدات و دەموچاویان بخوێنێتەوە، گوێی لە جیرەجیرێکی زۆر سەیری تەختی دانیشتنەکە بوو و ڕاچڵەکی، کە تازەکی بە بۆنەی جەژنی قوربانەوە کڕیبوویان و بەرگێکی

قایشی ڕەشی کەمێ نەرمی وەکوو پێستی گامێشی تێگیرابوو.. جیرەجیرەکە لەسەر هەمان ئاواز و ڕیتم بەردەوامبوو و ئەم تا دەهات چاکتر دەیبیست.. ئیتر ترسێکی خەستتر دایگرت و گیانی زیاتر لەرزی.. دەیویست پچێتە ژوورەوە و هەموو شتێ بە چاوی خۆی ببینێت، بەڵام تاسابوو و قاچەکانی بە دوایدا نەدەهاتن.. وردە وردە هەناسەی تەنگ و بەر چاوی تاریک و لێڵدەبوو.. وەکوو تریش سوور دەیزانی ئەو جیرەجیرە لە ئەنجامی جووتبوونی دوو جەستەی جیاواز و بۆگەنەوە لەو تەختە هەڵدەستێ و ڕۆحی ئەم داخدەکات.. تا زیاتریش دەشڵەژا و دڵی خێراتر لێی دەدا، دەنگەکەی قایمتر دەبیست و زیاتر گیانی خاودەبووەوە.. وایدەزانی ها ئێستا نا کەمێکی تر وردوخاش دەبێت و قاچەکانی لە باریەکتر دەچن.. شڵپەیاندێت و دەکەونە خوارەوە.... کەچی کاتێ چاوی کردەوە و خۆی لەسەر دۆشەگە ڕەشەکەی ناوەڕاستی ژووری میواندا بینی، لەسەر گازەرای پشت پاڵیانخستووە و بە لێفە سپیەکە تا ناوقەدی داپۆشراوە، زانی ئەوەی بە دەما کەوتووە و شڵپەی لێوە هاتووە، ئەم بووە، نەک ئەوان و لە داخا کەوتە کرۆشتنی پەنجەکانی.. خاڵی و خاڵۆژنی لەملای و دایکی و «فەریال»یش لەولایەوە زۆر کز و ئێجگار مات و خەمبار دانیشتوون و سەیریاندەکرد.. هەستی دەکرد بێجگە لە بەرمووسەلانی سەرئەژنۆ و ناولەپەکانی لە هەموو شوێنێکی تری جەستەی زیاتر ئازاریان هەیە و دەتریوێنن، بەڵام گوێی نەدەدایە و دەیویست ورد ورد ساتەکانی پێش بوورانەوە بهێنێتە بەر چاوی خۆیەوە: جیرەجیری تەختی دانیشتنەکە.. کڵپەی ئاگری سووری تەباخە ڕەشە دووچاوەکە.. بریق و باقی کتریە سپیە گەورەکە.. ترس و شڵەژان.. ئەژنۆلەرزین و دانەچۆقە.. هەناسەتەنگی و گیانداهێزران.. دڵتێکهەلاتن و هێڵنجدان.. تاسان و بەرچاولێڵبوون.. بوورانەوە و بوورانەوە و بوورانەوە.. بوورانەوە و دوای بوورانەوە.. ئاخ بۆ دوای بوورانەوە..!! ئای بۆ چاوێکی کراوە و زیت و وریا ورد ورد هەموو شتێکی ئەو کاتەی دیبێت و ئاخ بۆ زمانێکی ڕاستگۆ و بوێریش لە نووکەوە بۆی باسکات..!! ئاخۆ لەو کاتەدا لە پشت چاوە بێئاگا و بێهۆشەکانی ئەم چییان کردبێت و لە ماڵی چۆڵ و هۆڵ و بێدەنگ و بێچرپەدا، وەکوو دوو پەڕەسێلکەی نێر و مێی سەر

دیواری قـوتابخـانه چۆنیـان گـوزەراندبێت..؟! دایکی هەر زوو زوو دەسـتـەکـانی دەگرت بەملا و بەولای ڕوومەتەکانیەوە و بۆی باسدەکردن، چۆن کاتێ کەوتووە و گوێیان لە شلّپەکەی بووە، بە جووتە و زۆر خێرا ڕایانکردووە و گەیشتوونەتە سەر سەری.. «سیامەند» کردوویەتیە کۆڵی و خستوویەتیە ناو ئۆتۆمۆبیلە سپیەکەی خۆبەوە.. دەمودەست گەیاندوویەتیـە خەسـتەخـانە و شەو تا بەیانی بە دیاریەوە دانیـشـتـووە.. دوای مـردنی «شـازە»، بە مـاوەیەکی زۆر کـەم «سـیـامـەند» داوای «ست سوعاد»ی کرد و «مامۆستا ئەمجەد» پێی وت:

ـ داوات سـەر سـەر و سـەرچاو، بەڵام گـرنگ ئەوەیە سـوعـادی خـوشکـم خـۆی ڕازیی بێت.

«ئەدهەم»ی باپیـریشی یاریی بە نینۆکـەکـانی قـاچی دەکـرد و بە دەنگە نووساوەکەی پێی دەوت:

ـ من نەک تۆ لە نزیکەوە دەناسم، بەڵکو خـۆت دەزانی لەگـەڵ باوکی خوالێخۆشبووشتدا ماوەیەکی زۆر بە یەکەوە ئەفسەر بووین و بگرە وەکوو براش وابووین، بەڵام ئەگەر سوعاد ڕازیی نەبێت، نابێت هیچ گلەییەکمان لێبکەیت.

ئێوارەی ڕۆژە زۆر ساردەکە بوو و هەموویان لە ماڵ کۆبوونەوە.. «سەلوا»ی خالۆژنی لە دەرگای ژوورەکەی خۆبان لەسەر کورسیە سپیە نزمەکە دانیشتبوو و مەمکە سپیەکەی چەپی لە یەخەی کەمێ تەسکی کراسە ڕەشە سادە ئەستوورەکەی دەرهێنابوو.. خسـتبوویە دەمی «ئەفکار»ی کـوریەوە و لە بنمـیـچی ڕاڕەوەکـەی دەڕوانی.. ئەویش بەحاڵ سەرگۆکەی گرتبوو و ملّچ ملّچ مژی لێدەدا.. دایکی و «فەریال»ی خوشکیشی لە مووبەقەکەدا سەریان بە پەڕۆی ڕەشوسپی بەستبوو و کەڵەشێرە سپیە کرماشانیەکەیان ئاوەڕووتدەکردەوە.. ئەم نەعلە سپیەکانی کردبووە پێی و کتێبێکی بەرگسپیی بە دەستیەوە گرتبوو، لەمسەری ڕاڕەوەکەدا دەچوو بۆ ئەوسـەری و دەهاتەوە، گـوایە سـەعـیی دەکـات و شت لەبەردەکـات، بەڵام لە ڕاسـتـیـدا، گـوێی بۆ قـسـەی پیـاوان شلکردبوو و دەیویست ورد ورد هەمـووی بیبیستێت.. بیانبیستێت و لە خەیاڵی خۆبدا جوان جوان تاوتوێیان بکات.. لە هەموو شتێکیش زیاتر سەرنجی لە کەڵەشێرە سەربڕاوەکەی ناو مەنجەڵە ڕەشە

گەورە پڕ لە ئاوە زۆرکولاّوەکەی مووبەقەکە دەدا و بیری لێدەکردەوە، کە دایکی جار جار دەیخستە ئاوە گەرمەکەوە و هەر خێرا دەریدەهێنایەوە.. ئەم وەکوو مەمکی زلی ئەو ژنەقەرەجە دەهاتە بەر چاوی و موچوڕکی پیادادەهات، کە شەوێکی تەمووزی ئەو ساڵە لە گۆڕەپانەکەی پشت ماڵی باپیری کوشتبوویان و لاشەکەیان لەو ناوە فڕێدابوو.. ئەم لەگەڵ «ویجدان» و «نیران»دا چوو بۆ سەیری و قێزی لێیکردەوە.. ئەمە ئەو کەڵەشێرە بوو، کە «سیامەند» بە جووچکیی بەخێویکردبوو و لە هەموو ژیانیدا هیچ شەڕێکی نەدۆڕاندبوو.. هەموو ئێوارەیەکی ڕۆژانی هەینی دەیهێنایە گازینۆکەی بەرامبەر دووکانەکەی ئەمان و کەڵەشێر لەسەر کەڵەشێری دەبەزاند.. «پیرۆت هەورامی»ی خاوەنی گازینۆکە، کە دەیبینی گازینۆکەی جمەی دێت لە خەڵک و هەر دوو دوو لەسەر یەک کورسی دانیشتوون، لە خۆشیا گۆرانیی دەوت و نرخی چای لە یەک عانەوە دەکرد بە دووان.. جارێکیان ئەوەندەی بە دەنووک کێشا بە سەر و گوێلاکی کەڵەشێرە ڕەشەکەی «شەمرووخ»دا و بەو باڵە بەهێزانەی ئەوەندەی خستە سەر ئەو کۆنکرێتە ڕەقوتەقەوە، تا هەموو گیانی لە خوێندا سوورکرد و بەر چاوەکانی گیران.. ئەنجام سەری گێژی خوارد و بەلاداهات.. «شەمرووخ» لە داخا تا تینی تیابوو گۆچانە سپیەکەی سرەواندە پشتی سەری و لەولاتر لە ژێر کورسیەکاندا ملی لاربووەوە.. گەورە و بچووک بە شانوباهووی ئەو کەڵەشێرەیاندا هەڵدەدا و لە کاتی شالاّوبردندا بە یەک دەنگ هاواریان دەکرد:

ـ شێرۆ..!! شێرۆ..!!

«سیامەند» «نەوال»ی لەسەر کورسیە سپیەکەی تەنیشت خۆی دادەنا و بەدەم چاخواردنەوە سەیری شەڕەکەڵەشێری دەکرد.. لە خۆشیا قاقای لێ دەدا و دەمی دادەپچڕی.. «نەوال»یش دەستی دەخستە سەر ڕانی ئەو و پۆزی بەسەر ئەو منالاّنەدا لێدەدا، کە لەگەڵ باوکیاندا هاتبوون و لە دوورەوە سەیریان دەکرد.. عەنتیکەیی «شێرۆ» هەر لەوەدا نەبوو هیچ شەڕێکی نەدەدۆڕاند و بواری بەرامبەرەکەی نەدەدا دەنووکێکی پیادا بکێشێت، بەڵکوو لە هەندێ جووڵە و نیشانەی «سیامەند»یش دەگەیشت و لە تووتیەکی زۆر شارەزا چاکتر سەرنجی

خەڵکی ڕادەکێشا.. دوای ئەوەی «شێرۆ» هەرچی کەڵەشێر هەبوو دەیبەزاندن و بە دەنگی زوڵاڵی لەسەر مێزەکان دەیخوێند، ئینجا «سیامەند» کامێرا ڕەشەکەی لە جانتا سپیەکەی دەردەهێنا و دەیکردە ملیەوە.. تا بووڵێڵەی ئێوارە چرک و چرک و چرک و چرک وێنەی ئەو خەڵکەی لەگەڵ «شێرۆ»دا دەگرت و بێ تاقەت نەدەبوو.. «نەوال»یش پارەی لێ وەردەگرتن و وەسڵێکی بچووکی دەدانێ.. هەموویشی جلی ڕەشی سادەیان لەبەردەکرد و ڕێک دەوەستان، تا کەڵەشێرە سپیە نەبەزەکەی باوەشیان بە جوانیی دەربکەوێت و بە شانازیەوە پیشانی ئەم و ئەوی بدەن.. زۆر جار «سیامەند» و «نەوال» کە لە بازاڕ پیاسەیان دەکرد و بە بەردەمی دووکانەکاندا دەڕۆیشتن، «شێرۆ» ئاقڵ و سەنگین، وەکوو سەگی ئینگلیزەکان بە دوایاندا ڕێیدەکرد و هەنگاو بە هەنگاو دوایان دەکەوت.. هەندێ جاریش بە قەستیی خۆیان لێی دەشاردەوە و ئەو دەیکرد بە ڕۆژی خۆی.. سەری بەم دووکان و بەو دووکاندا دەکرد و چاوی بۆ دەگێڕان.. لەسەر ئەم عەرەبانە بۆ سەر ئەو عەرەبانە و لەسەر بۆنیتی ئەم ئۆتۆمۆبیل بۆ یەکێکی تر هەڵدەفڕی و دوقدودووق دوودووق.. دوقدوودووق دوودووق بانگی دەکردن.. کاتێکیش خۆیان پیشاندەدایەوە و چەپڵەیان بۆ لێ دەدا، لە خۆشیا باڵەکانی دەدا بە یەکا و لە بەردەمیان سەمای بۆ دەکردن.. ئیتر ئەو خەڵکە بە حەپەساویەوە سەیریان دەکرد و سەرنجیان لێی دەدا.. ئەگەرچی «سیامەند» چاکترین وێنەگری شار بوو و ستۆدیۆکەشی لە شوێنێکی زۆر بەرچاوبوو، بەڵام وەکوو خۆی هەموو جارێ دانی پیادا دەنا و دەیوت: تا سەری «شێرۆ» پێنەگەیشت نەناسرا و ناوبانگی پەیدا نەکرد.. «جابر»ی باوکی «نەوال» لە هەر کەسێکی تر زیاتر پێی سەرسام ببوو و ئامادەبوو بە هەرچەندێک بێت لێی بکڕێت، بەڵام ئەو هەمیشە دەستی بە ڕوویەوە دەنا و پێی دەوت:

ـ داوای هەرچییم لێبکەیت ناڵێم نا، بەڵام بە ڕاستیی دەستم لە شێرۆ نابێتەوە.

بە درێژایی ئەو ماوەیەی «سیامەند» گیرابوو و خرابووە زیندانەوە، «نەوال» «شێرۆ»ی لەناو باخەکەی خۆیاندا بەخێوکرد و زۆر بە چاکی ئاگای لێیبوو.. هەر

جارێ لەگەڵ دایکی و «شازە» دەچوون بۆ بینینی «سیامەند» و لە کەلێنی تەلەکاندا دەیانبینی، ئەم سەری دەبردە لای گوێچکەیەوە و پێی دەوت، کەوا هیچ خەمی نەبێت و بیری لێنەکاتەوە.. ڕۆژی مردنی «شازە»یش «سیامەند» کەڵەشێرەکەی لە بیرنەچووبوو و لە هەر شتێکی تریماڵەکە زیاتر خەمی ئەوی بوو، لە کاتێکدا تابووتە بە خام داپۆشراوەکەیان دەخستە دواوەی پیکابە ڕەشەکەوە و بۆ گۆڕستانیان دەبرد، «نەوال»ی لە خەڵکەکە جیاکردەوە و بە قورگی پڕ لە گریانەوە بە گوێچکەیدا چپاند، کە هەر زوو زوو جۆی ناو قوتووە سپیەکەی بداتێ و ئاوی بۆ بکاتە ناو قاپە ڕەشەکەوە.... «نەوال» زۆری بە لاوە سەیر بوو و هیچ لەوە تێنەدەگەیشت، کە ئەو ڕۆژە «سیامەند» سووک و ئاسان کەڵەشێرەکەی لە شۆفەرلێتە ڕەشە تازەکەی داگرت و بردیە ژێر دارهەنجیرەکەی ناوەڕاستی باخەکەوە.. هەر خێرا باڵەکانی تێکپەڕاندن و خستینیە ژێر قاچیەوە.. چەقۆ دەسکڕەشەکەی لە قایشی سپیی پانتۆڵە ڕەشەکەی جیا کردەوە و بە ملیدا هێنا.. لەوەش سەیرتر ئەوە بوو «شێرۆ» هیچ پەلەقاژەیەکی نەکرد و لەگەڵ هەڵبەز و دابەز دیوارەکەی بە خوێن نەڕشاند.. لە کاتێکدا ئەم چاوەڕێیوو تا تەواو گیانی دەردەچێت و وزەی تیادا دەمێنێت، بەقەدەر باڵای دارهەنجیرەکە خۆی هەڵدات و سنگی بەر زەویە شێدارەکەدا بکێشێت.. ئەم هەمیشە بۆ ئەوە سەیری باڵندەی سەربڕاوی دەکرد و بە دیاریانەوە دەوەستا، تا سەرنج لە سەماکەیان بدات و لەو چۆڕاوگە خوێنە باریک باریکانەیان ڕابمێنێت، کە لە موولوولەکانی ملیانەوە بە تیژی فیچقەدەکەن و لە چاوترووکانێکدا پەڕی ڕەش و سپیەکانی جەستەیان سووردەکەن.. بێئاگایانە وێنەی شتی سەیر سەیر لە سەر زەوی و دیوارەکاندا دەکێشن و ئەم زۆر حەزیان لێدەکات.. کەچی «فەریال»ی خوشکی توند توند چاوەکانی خۆی دەگرت و بەمی دەوت:

ـ تۆ سەربەگۆبەندیت.. باوەڕ ناکەم بێجگە لە تۆ کەسێکی تر هەبێت حەز لە شتی ئاوا بکات..!!

دایکی ترس و ماتەمینیی دایدەگرت و بەدەم ئاخ و داخهەڵکێشانەوە دەیوت:

ـ ئای لەو کچەتیوە سەرەخۆرەیە..!! هەرچی دەرد و بەڵایە، ئەم بۆ ئەم ماڵەی

منی دەهێنێت.

خاڵی چیرۆکێکی زۆر درێژی لەسەر ئەمە نووسی و پاڵەوانە سەرەکیەکەشی ناو نا «نەوال».. لە ژێر ناونیشانی «سەمای سوور»، لە کتێبێکی بەرگسپیدا بە چاپی گەیاند و بڵاویکردەوە.. «ست سوعاد» خوێندیەوە و ئەوەندەی تر ترسا.. دەستەکانی گرت بە دڵیەوە و چی جنێوی سووک هەبوو بە براکەی دا....

خاڵی دواتریش هەر دوو چیرۆکی «بەفری وەکوو خەڵووز» و «خەڵووزی وەکوو بەفر»یشی هەر دەربارەی ژیانی «نەوال» نووسی و لە کتێبێکی بەرگ ڕەشوسپیدا چاپی کردن.. پاڵەوانی ئەمیانی ناونا «ئەحلام» و ئەویتریشیانی کرد بە «ئیلهام».. «نەوال» دەیخوێندنەوە و گاڵتەی لێیاندەهات.. دەیزانی خاڵی بە هەڵەداچووە و تەنها ئەو شتانەی نووسیوەتەوە، کە دایکی و خوشکی و کەسانی تریش دەیانزانی و کەم و زۆر بە لای شتە نهێنیەکاندا نەچووە.. بۆ نموونە لە چیرۆکی یەکەمیاندا تەنها باسی ئەوەی کردبوو «ئەحلام»ماڵی خۆیان بەجێدەهێڵێت و دەچێت بە ئێجگاری لەگەڵ «سیامەند»دا دەژی، بەبێ ئەوەی بڵێت چۆن و بۆچی..؟! جا هەر بە ڕاستیی ناهەقیشی نەبوو پەی بەو نهێنیانە نەبات و نەتوانێت شتێکیان لێوە هەڵکرێنێت، چونکە ئەو لە هەر کەسێکی دیکە زیاتر دەیزانی «نەوال» تاقە کەس بوو لە ماڵەکە بووە ڕێگر و ڕازیی نەبوو دایکی شوو بە «سیامەند» بکات.. تەنانەت لە چیرۆکەکەدا زوو زوو ئەو ڕستەیە لەسەر زمانی پاڵەوانە سەرەکیەکەدا دەوترێت و دەوترێتەوە:

ـ ئەگەر شوو بکەیت بە مامە سیامەندم، خۆم دەکوژم.

ئەو ڕۆژەی «ست سوعاد» هەر دوو کچەکەی بانگکردە ژوورەکەی خۆیەوە و دەرگاکەی داخست، تا لێیان بپرسێت ئاخۆ حەز دەکەن دایکیان شوو بە «سیامەند» بکات و بێت لە ماڵەکەیاندا بژی..؟! «فەریال» وەک بڵێی باوەڕی نەکردبێت و هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەبووبێت، ڕۆژێ لە ڕۆژان دایکی شتێکی ئاوای بەسەر زماندا تێپەڕێت و ڕووبەڕووی پرسیارێکی لەم جۆرەی بکاتەوە، بۆیە حەپەسا و دەمی بوو بە تەڵەی تەقییو.. دوایی دەستی ڕاستی گرت بە دڵیەوە و بە سەرسامیەوە لێی پرسی:

ـ تووخوا دایکە بە ڕاستیتە، یان گاڵتە دەکەیت..؟!

ـ بەڵێ، بە ڕاستیمە.. مەکر و گێلاخەشم ناوێت، دەمەوێت بزانم ڕازیین، یان نا..؟!

«فەریال» لە خۆشیا چاوی پڕبوو لە فرمێسک و توند توند باوەشی پیاداکرد.. دەستی کرد بە گریان و بە هیچ کلۆجێک ژێرنەدەبووەوە، کەچی «نەوال» پشتی تێکرد و چووە دەرەوە.. لە کاتێکدا دەرگا سپیەکەی بە قایم جووتکرد و قاچی بردە دەرەوە، تا هێزی تیابوو هاواری کرد و وتی:

ـ ئەگەر شوو بکەیت بە مامە سیامەندم، خۆم دەکوژم.

خاڵی بە دەستێ بیجامەی ڕەشوسپیەوە لە بەرامبەر ئاوێنە باڵانووماکەی ڕاڕەودا وەستابوو و بە مووکێشە سپیەکە تووکە ڕەشەکانی ڕوومەتی دەردەهێنا.. سەری هەڵبڕی و سەیرێکی چاوەکانی کرد.. بە گاڵتەیەک، کە ئەم زۆر چاک دەیزانی دەیەوێت سەرودڵی بگرێت و هەقی ئەو قسانەی لێ بکاتەوە، پێی وت:

ـ هاوار مەکە گوڵم، نەوەکا قوڕگت بێتە ژان و شەو لە تاوا خەوت لێنەکەوێت..!!

گوێی نەدایە و بە لەقەیەک دەرگای ژوورەکەی خۆی خستە سەر گازەرای پشت.. خێرا چووە ئەودیو و بە کلیل دایخست.. بە بێزاریەوە خۆی هەڵدایە سەر تەختی نووستنەکەی و لەسەر پشت لێی پاڵکەوت.. لەوێ لە مەبەستی خاڵی گەیشت و ئەو ڕۆژەی بیرکەوتەوە، کە قوڕگی دەیەشا و لە خەفەتی دایکی و «سیامەند» خەوی لێنەدەکەوت.. ئینجا تەواو حەیران و سەراسیمە بوو و خەیاڵەکان زیاتر لەناو مێشکیا تێکقژقژان.. هەر دوو دەستی گرت بەملاو بەولای سەریەوە و تا تینی تیا بوو گوشی.. گوشی و پەنجەکانیشی لە قژی گیرکردن.. چەپک چەپک دەریدەهێنان و وردە وردە بەر چاوی تاریکدادەهات.. بە لەقە لە دیوارەکەی دەدا و بە سەرسوڕمانەوە لە خۆی دەپرسی: «ئەوە خاڵم چۆن و لە کوێی زانیوە ئەو شەوە من بیرم لە دایکم و سیامەند کردۆتەوە..؟! تۆ بڵێیت وڕێنەم کردبێت و دایکم گوێی لێبووبێت.. گوێی لێبووبێت و دواییش ورد و باریک بۆ ئەوی گێڕابێتەوە..؟! نازانم.. ئەی هاوار من چییم بەسەرهاتووە و بە خۆمم

نەزانیــوە..!! ئەی هاوار من لە چ مــاڵێکی ســەیر و ســەمــەرە چاوم کــردەوە و گەورەبووم..!! نە لە خۆم و نە لە دایک و نە لە خوشک و نە لە خاڵ و خاڵۆژن و نە لە دار و دیواری ماڵەکەمان دەگەم..!!» ئینجا بیری لە دایکی کردەوە و خەیاڵە ورووژاوەکانی تێوەئالاند.. بیری لەو شەپقە سپییەی سەری دەکردەوە و دەیهێنایەوە بەر چاوی، کە بە گەڵای وشکی دارخورما و پەڕی کەڵەشێرەکە دروستی کردبوو و بە عەتر ڕشاندبووی.. لاستیکێکی ڕەشی لەملا و لەولاوە پێوە درووبوو و لە ملی شەتەکدابوو.. ئەوە لەمەوە فێربوو گەڵای دارخورما و پەڕی باڵندە بە خوێ بشوات و کڵاو و شەپقەی پێ دروست بکات.. ئەو جارەی کە لە هەیوانەکەدا دانیشتبوو و بە پەڕی قەلەموونە ڕەشەکە و گەڵای وشکی دارخورماکەی بەر دەرگا شەپقەی بۆ «فەریال»ی خوشکی دروستدەکرد، ئەو بە سەرسامیەوە سەیری دەستەکانی دەکرد و ئافەرینی لێیدەکرد.. ئەم سەیری چاوەکانی کرد و پێی وت:

ـ جارێکی تر دانەیەکی زۆر جوانیش بۆ تۆ دەکەم دایکە.

ـ ســوپاس نەوال گــیــان.. ئەوا من زانیــیم چۆن دەکــرێت.. حــەز دەکــەم خــۆم دروستی بکەم، بەڵام دەبێت تۆ یارمەتیم بدەیت.

ئەم زۆری پێناخۆش بوو و کــســپە لە دڵیەوە هات، کاتێ دایکی ئاوا وەڵامی دایەوە و لەگــەڵیــا بە لاقــرتێــوە شــانی هەڵتــەکــاند، بۆیە ناوچەوانی گــرژکــرد و ڕوویکردە ئەملاوە، کەچی ئەو بە شێوەیەکی زۆر سەیر، کە «نەوال» هەستی دەکرد شتێ لە ئاڕادایە و ئەم لێی تێناگات، پێی وت:

ـ ئەگەر یارمەتیشم نەدەیت، دەبێت کاتێ کردمە سەرم پیرۆزباییم لێبکەیت.

قــەلەمــوونەکــەش «فــوئاد» لەگــەڵ خــۆی هێنابوو و هەر خــۆشی بە خــەنجــەرە دەسکسپییەکەی و لە ژێر دارهەنجیرەکەی سووچی ئەوسەری باخەکەدا سەریبڕی.. دوو ڕۆژ پێش ئەوە، کــاتێ ئەم لە ژوورەکــەی خــۆی، لەســەر کــورســیــە ســپــیــە قەراغڕەشەکەدا دانیشتبوو و ئاسوودە و دڵخۆش پیانۆی دەژەند، لەپڕ لایکردەوە و سەرنجی کەوتە سەر خوشکەکەی، کە لەملای ئەمەوە بە مەقەستە ڕەشەکە قوماشە سپییەکەی دەبڕی و خەیاڵ دەیبردەوە.. لە ناکاو دەستی کرد بە گریان و فرمێسکە ورد وردەکانی داباریـنە سەر پارچە قوماشەکەی بەردەمی.. ئیتر ئەم ئەوەندەی تر

هەستی بە ئاسوودەیی کرد و لە ناخەوە خرۆشا، کە دەتوانێت بەو ئاوازەی تازە دایناوە و چەند بلّێیت دلّی پێی خۆشە، خوشکەکەی بورژێنێت و بیهێنێتە گریان.. ئەگەرچی تەواو لەوە دلّنیابوو ئەو بیری لە «فوئاد» دەکردەوە و هەر بۆ ئەویش دەگریا، بەلاّم وەکوو هونەرمەندێکیش ئەوەی زۆر چاک دەزانی و بە هەلّەدانەچووبوو، کە گریانی لە ناکاوی قورگی تاساو و فرمێسکی وردی شووشەیی چاوە خەمتێزاوەکان ئاکامی بیستنی مۆسیقای نەشئەبەخش و گۆرانیی ڕەسەنن و جوانترین دیمەنیان هەیە.. «فەریال» کە دەگریا، کولّمەکانی لە ژێر فرمێسکە ئێجگار وردەکانی، وەکوو دوو دەنک خورمای ئەشرەسیی گەییوبی بەر قرچەی هەتاوی گەرمی تەمووزی «بەغا» نەرم نەرم دەبوون و سوور سوورهەلّدەگەڕان.. «نەوال» هەموو جارێ دەمی دەخستە سەریان و ماچی دەکردن، بەلاّم قەستی دەکرد لەجیاتی ماچ، گازێکی قایمیان لێبگرێت و هەر بە جارێ لێیانبکاتەوە.. وەکوو مزرەسێو بیانکرمێنێت و تێر تێر بیانجوێت.. ئەوسا سەیری چاوە ڕەشەکانی دەکرد و چاکتر لێیان وردەبووەوە، کە لە ژێر تالّ تالّی پەرچەمی بە فرمێسک تەڕ و خووساویدا جوانتر دەردەکەوتن و وەکوو قۆزاخەی لۆکەی بەر هەتاو جوان بوون.. هەستی دەکرد تەنها ئەو کاتانە خۆشیدەوێن و حەزدەکات سەرنجیان لێ بدات، کە بە گریانەوە دەیانبینێت و پێلّووەکانی بە فرمێسک قورسدەبن.. دەستی لەسەر پیانۆکەی هەلّگرت و بە ماتە ماتە و لەسەر نووکی پێ، وێنەی بەتریق، لێی نزیککەوتەوە.. بە سووکی دەستی کردە ملیەوە و کەوتە ماچکردنی، کەچی ئەو بە نازێکەوە، نازێک، تەنها ئەو کچانە دەزانن بیکەن و خۆبانی پێوە بنوێنن، کە دلّیان بە گری عیشق ناسکبووە و هەموو شتێک بە گریان دەردەبڕن، خۆی ڕاپسکاند و وەکوو منالّ هەستایە سەر پێ.. لەولاتر دەستەکانی نا بە دیوارە سپیەکەی بەرامبەری و چاوەکانی خستە سەری.. ئیتر ئەوەندەی تر بەکولّ گریا و «نەوال»یش بەبێ ئەوەی لێی بپرسێت، ئاخۆ بۆچی دەگریت و ئەو هەموو فرمێسکە بۆچی هەلّدەڕێژێت، قژە ڕەش و خاوەکەی لە دواوە لە پەنجەکانی دەئالاّند و لوولیدەکرد.. لەپڕ پەنجەکانی دەردەهێنا و هێدی هێدی وەکوو پەردەی سپی و تەنک و نەرم و شلی پەنجەرەی ژوورەکەی بەسەر پشتیدا

دەهاتە خوارەوە.. دەهاتە خوارەوە و لەسەر سمتی خڕ و خەپانیدا لەنگەری دەگرت.. قژی زۆر درێژ و چەند بڵێی ڕەشی سەر بلووزی ئێجگار سپی، تەنها خۆی دەیزانی چەند دیمەنێکی جوان و دڵگیرە و چ نەشئە و چێژێکی خۆشی لێ دەبینێت، کاتێ بەدەم گوێگرتنی هەنسکی گریانی کچێکی تازە دڵدار و بێئارامدا لێی وردەبێتەوە و دەچێتە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە.. هەر بەو حەز و نەشئەیەوە چپاندیە گوێچکەی چەپی و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر پێی وت:

ـ فێرمکە.. فێرمکە تاقە خوشکەکەم، منیش فێرکە ئاوا وەکوو تۆ بەسۆز بگریم.

هەر خۆیشی سەرێکی بادا و وتی:

ـ بەڵام نا، من مەحاڵە فێری گریانی ئاوابم.

هەستی بە بێدەستەڵاتیی و کەمبەهرەیی خۆی دەکرد و ئێرەیی بە خوشکەکەی دەبرد، کە ئەوەندە جوان و بەسۆز دەگری و دەزانێت ئاوا بە ناز چاوەکانی هەڵبهێنێت.. هەڵیانبهێنێت و خێرا دایانبخاتەوە.. دایانخات و خێراتر هەڵیانبێنێتەوە.. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە خۆی وت: «مرۆڤ دەتوانێت بۆ هەموو ئەو شتانە بگریت و فرمێسک بڕێژێت، کە دەستەوستانە لە بەدیهێنانیان، بۆ گریان نەبێت.. ئەوەتا من ناتوانم بۆ ئەوە بگریم، کە فێرنابم وەکوو خوشکەکەم بگریم».. ئەم هەموو جارێ کە پیانۆکەی لێ دەدا و دەنگی گریانی دەردەکرد، «فەریال» لە هەر کەسێکی تر زیاتر پێی سەرسام دەبوو و لە ئاستیا متەقی لە خۆی دەبڕی.. گوێی بۆ شلدەکرد و چاوەکانی پڕدەبوون لە فرمێسک.. فرمێسکی ورد ورد، دڵۆپ دڵۆپ، وەکوو بێچووی سپیی مراویە ڕەشەکانی گۆمە گەورەکەی «بابلشێخ» بەرەو چەناگەی قەتارەیان دەبەست و لەوێ سووک سووک خۆیان بۆ ناو کۆشی هەڵدەدا.. بە قورگی پڕ لە گریانەوە چاوی دەبڕیە چاوەکانیەوە و پێی دەوت:

ـ بە سائەقەی ئەو دەستانەت بم خوشکە ئازیزەکەم، ئەمە جوانترین گریانە، کە من لە هەموو ژیانما گوێم لێی بووبێ.

«نەوال» ئەو ڕۆژە لە هەموو شتێ زیاتر ڕقی لە پیانۆکەی دەبووەوە و

خەریکبوو بیکێشێت بە زەویی ژوورەکەیدا.. وەکوو سەندووقە سپیەکانی چای بەردەمی دووکانەکەیان، کە لەگەڵ «عەمار» دەستی یەکتریان دەگرت و بە جووتە لەسەریان هەڵدەپەڕین، دەنگێکی وەکوو دەنگی کردنەوە و داخستنی دەرگای ناوەوەی «ستۆدیۆ ئەربیل»یان لێ هەڵدەستا و لە چاوترووکانێکدا ونجڕ ونجڕیان دەکردن، ئاوا بە لەقە تێیبکەوێت و لەتوکوتی بکات.. هەستی دەکرد دە ساڵی تریش خەریکی بێت و مەشقی لەسەر بکات، ناتوانێت گریانێکی وەکوو گریانی خوشکەکەی پێ دەرکات و کەمێ دڵی خۆی پێ ئاسوودەکات.. بیری لە شتێکی تریش کردەوە و وایزانی ئەم هێشتا منالە، ئەگەرچی بالای بەقەدەر بالای خوشکەکەیەتی و لە قۆناغی ناوەندیە، بەڵام هێشتا هەر کچە بچکۆلی دایەیە و گریانی ئاوا لە توانای ئەم بەدەرە.. ئیتر ئەوەندەی تر پەشێویی دایگرت و هەستی بە نابووتیی خۆی کرد.. ڕووی لە خوشکەکەی وەرگێڕا و کاتێ لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی ناو حەوشەکەیانی کرد، خالۆژنی بینی جلە سپیەکانی لەسەر تەنافە ڕەشەکەدا هەڵدەخست و بە جلگرە ڕەشوسپیەکان گیری دەکردن.. هەر ئەم جلانەی سەر ئەو تەنافە، چەند شەوێ لەمەوبەر لەبەر چاویا بووبوون بە ئەسپێکی سپیی وەکوو ئەسپەکەی «کاکەسوور» و لە ناوەڕاستی حەوشە تاریکەکەدا دەلەوەڕا....

زوو زووش کە منالّ بوو و هێشتا نەچووبوو بۆ قوتابخانە، شەوێکیان مەقەڵیی ناو باخەکە و مەنجەڵە ڕەشە گەورەکەی سەری لێبوو بە ورچ و زرووکاندی.. کاتێ دایک و باوکی گەیشتنە سەری و هەڵیانگرتەوە، ئەم بوورابووەوە و لەسەر کاشیە سپیەکانی هەیواندا بە پشتا کەوتبوو.. باوکی خێرا خستبویە ناو شۆفەرلێتە ڕەشەکەی و گەیاندبویە خەستەخانە.. «سەلوا»ی خالۆژنی، کە تازە لەو خەستەخانەیە دامەزرابوو و هێشتا شووی بە «ئەمجەد»ی خالی نەکردبوو؛ لە هەموو ئەوانی تر زیاتر یارمەتی دان و بە چرکە بەجێینەدەهێشت، بەڵام نە ئەو و نە هیچ یەکێ لە دکتۆرانی تری شار چارەیان بۆ نەدۆزرایەوە و لە نهێنیی نەخۆشیەکەی نەگەیشتن.. هیچ کامێکیان نەیتوانی سیما و تاپۆی ورچە ڕەشەکەی لە بیربەرێتەوە و جارێکی تر بەسەر پێی بخاتەوە.. ڕۆژ بە ڕۆژ چاوەکانی بە قووڵدا دەچوون و ڕەنگی زەردتر هەڵدەگەڕا.. تەمایان لێ دانا و

باوەڕیان نەدەکرد چاکبێتەوە.. دواجار «حەسەن خوداداد» ورچە ڕەشە پەڕۆینەکەی «عەمار»ی کوڕی بۆ هێنا و لە پشت سەری دانا.. کاتێ بینی نا بە ماستاوی ناو پەرداخە ڕەشەکەی سەر مێزە سپیەکە و بە دەسرە سپیەکەی گیرفانی سمێڵە ڕەشەکەی سڕی، سەرێکی بادا و وتی:

ـ ئێوە بە هەڵەداچوون، ئەم کچەی ئێوە لە ورچ نەترساوە، بەڵکوو چاوەکانی ئەوندە تیژن، دەتوانن لە دووری دوورەوە ئەو شتانە ببینن، کە کەسانی تر لە نزیکیشەوە نایانبینن.

سەری لەبەر نا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.. هەر خێرا هەڵیبڕیەوە و پێی وتن:

ـ هەر ئەمەشە هەمیشە سەغڵەتی دەکات..!!

«نەوال» ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەنگوڕووی گەشی جارانی دەهاتەوە بەر و چاکتر دەبوو.. تەنانەت تا تەواو گەورەبوو و چووە ناوەندییش، بەبێ ورچە ڕەشەکەی نەدەچووە سەر جێگا و تا توند توند نەینووساندایە بە خۆیەوە، پێڵووەکانی قورس نەدەبوون و خەوی لێنەدەکەوت.... ئەو ڕۆژەی «حەسەن خوداداد» و «عەمار» هاتن و بردیان بۆ ماڵی خۆیان، دایکی ئەویشی لەگەڵ شتومەکەکانی تری پێچایەوە و بۆیکردە جانتایەکی سپیی گەورەوە، بەڵام «عەمار» خستیەوە سەر تاقە سپیەکە و پێی وت:

ـ دانەیەکی تری ئاوامان هەیە و پێویست ناکات هی خۆی بهێنێت.

خاڵۆژنی هەر جارێ بیویستایە تووڕەی بکات و سەرودڵی بگرێت، چەمۆڵەیەکی لێ دەنا و پێی دەوت:

ـ تۆ قسە مەکە، هێشتا مناڵیت.. بڕۆ بەلای ورچەکەتەوە.

پەردە سپیەکەی بەسەر ڕووی پەنجەرە چوارچێوە ڕەشەکە دادایەوە و ژوورەکەی کەمێ تاریکداهێنا.. نەیویست چیتر چارەی خاڵۆژنی ببینێت و لەوە زیاتر ورچە ڕەشەکەی بیرکەوێتەوە، کە چەند ڕۆژێ لەمەوبەر هەر لە داخی ئەو بە چەقۆ دەسکسپیەکە لەتوکوتی کردبوو و نقێمە سوورەکانی چاوی لە ژێر چەکوشە دەسکڕەشەکەدا هاڕیبوو.. فلینە ورد وردەکانی، کە هەر یەکەی بەقەدەر

مووروویێک دەبوون و لەبەر هەتاودا دەبریسکانەوە، بەسەر بەرە ڕەشەکەی هەیواندا بڵاوبوونەوە و لەبەر چاویا وەکوو سەرەمێکوتەی شیریی کەوتنە جووڵەجووڵ.. ئەو هەموو ساڵە لەگەڵیا ژیا و خۆشەویسترین شتی ژوورەکەی بوو، شەو تا بەیانی لە باوەشی خۆیا دەینواند و زۆر بەکوڵ دەستی دەکردە ملیەوە، نەیزانیبوو ناخی ئاوا سپی و پاکە وەکوو بەفری ئەو شاخەی، کە «سیامەند» بە جلی ڕەشی کوردیەوە وێنەی لەسەرگرتووە و بە گەورەیی لە ژوورەکەی خۆیدا هەڵیواسیوە.. هەر جارێ ئەو دەیکردە قەڵاندۆشکانیەوە و لە ژوورەکەدا دەیگێڕا، ئەم لە ئاستی ئەو وێنەیەدا پێی دەوت بوەستێت و جووڵەنەکات، تا لە نزیکەوە، بەکامی دڵ سەیری بکات و لێی وردبێتەوە:

ـ مامە سیامەند، جارێ منیش دەبەیتە سەر ئەو کێوە، تا لەوێ ڕەسمم بگریت..؟!

ـ ڕۆحەکەی مامە، کە گەورەبوویت خۆت دەچیت.

«شازە» لەولاوە هەڵیدەدایە و پێی دەوت:

ـ من لەگەڵ خۆمت دەبەم نەونەو گیان.

ـ بەڵام من حەز دەکەم لەگەڵ مامە سیامەندم بچم..!!

ـ گوێت لێبێت شازێ، گوێت لێبێت..!!

«سیامەند» هەمیشە لافی بەسەر ژنەکەیدا لێ دەدا و شانازیی بەوەوە دەکرد، کە «نەونەو» ئەمی لەو خۆشتر دەوێت و زیاتر هۆگریەتی.. هەر کاتێ بیویستایە سەرودڵی بگرێت و تووڕەی بکات، دەچووە بنکلێشەی ئەم و فێریدەکرد پێی بڵێت: ئەوی خۆشناوێت و بە قسەی ناکات.. ئەوان چونکە خۆیان منالیان نەدەبوو و لە ماڵەوە هەستیان بە تەنیایی دەکرد، «نەونەو»یان بە کچی خۆیان دەزانی و لە دایک و باوکی خۆی زیاتر نازیان دەکێشا.. بە هەموو شێوەیەک دڵیان ڕادەگرت و داوای هەرچی بکردایە بۆیان دەکرد.. کە دەیانزانی بەوە تووڕەدەبێت و دەم و لچی دەدات بە یەکا، ئەگەر بە زمانی خۆیان قسەبکەن، چونکە لێیان تێنەدەگەیشت و نەیدەتوانی خۆی تێ هەڵقورتێنێت؛ ئەوەندەی ئەویان لابوایە هەر بە عەرەبی لەگەڵ یەکتر دەدوان و میوانەکانیشیان هەر ئاوا

ڕاهێنابوو.. شەوانەش هەر لە نێوان خۆباندا دەیاننواند و تا چاوی دەچووە خەو هەقایەتیان بۆ دەکرد.. «نەونەو» زیاتر حەزی لەو هەقایەتانە دەکرد و لەزەتی دنیای لە گوێگرتنیان دەبینی، کە شاخ و ئەشکەوت و شتی لەم بابەتەیان تیابوو و بە شێوەیەکی سەیر و چاوەڕواننەکراو کۆتاییان دەهات.. لە هەمووشیان زیاتر هەقایەتی ئەو ورچە ڕەشەی بەلاوە خۆشبوو و هەموو شەوێ دەبوایە بۆی بگێڕنەوە، کە عەشقی ژنە سپیپۆشەکە دەبێت و دەیرفێنێت.. دەیخاتە ئەشکەوتێکی تاریکەوە و بە بەردی گەورەی خاڵدار دەرگای لێ دەگرێت.. تەنها گۆشتی کاڵی دەرخوارد دەدات و لە ماوەیەکی کورتدا ڕەنگورووی تەواو دەگۆڕێت.. بە زمانە سوورەکەیشی بنی پێیکانی دەلسێتەوە و لیکە سپیەکانی بەسەردا دەڕێژێت، بۆئەوەی ئیتر نەتوانێت بڕوات و بەجێیبهێڵێت.. ئەوانیش هەموو شەوێ، کە جێگایان دادەخست و پاڵدەکەوتن، داوایان لە «نەونەو» دەکرد لاسایی جووجەڵە ڕەشەکەیان بۆ بکاتەوە و بە تەمسیل بۆیان بکات، کاتێ سەری لە هێلکە دەجووقێت و دەیکات بە جیوەجیو.. ئەوسا ئەم خۆی لەناو لێفە سپیەکەیدا گرمۆڵە دەکرد و هەستتدەکرد ئەو لێفەیە هەر بە ڕاستیی هێلکەیەکی گەورەیە.. لە پێشا سووک سووک و زۆر سەیر سەری دەردەهێنا و دواییش دەست و قاچەکانی.. بە جیوەجیو سەری دەخستە ژێر باڵیانەوە و خۆی متدەکرد.. ئیتر ئەوان دەستیان دەکرد بە پێکەنین و بە پشتا دەکەوتن.. بەڵام لەو جارەوە «شازە» کردیە باوەشیەوە و لەپڕ گریا، ئیتر ببڕای ببڕای بۆی نەکردنەوە و بە جارێ وازی لێهێنا.. زۆر سەیریشی لێهات و تەواو واقیوڕما، کە ئەو لە خووت و خۆڕایی گریا و ئەو هەموو فرمێسکەی ڕشت.. وەکوو منداڵ تا شەو درەنگانێ ژیرنەبووەوە و لە خەویشدا هەر هەنسکی دەدا.. «سیامەند» لێی تووڕەبوو و پێی وت:

ـ باشە دەبێت تۆ بۆ هەموو شتێ، خۆش و ناخۆش، هەر بگریت..؟! تۆ ئەم ماڵەت تەواو ناخۆشکردووە شازێ.

شەوێکیان «نەوال» لەگەڵ بۆنکرووز بێداربووەوە و کاتێ دەستیشی کوتا هەستی کرد «شازە»ی بە تەنیشتەوە نەماوە.. ئینجا دەستی کوتا و سەر جێگای مێردەکەی بۆ گەڕا، بەڵام لەویش نەبوو و ترس دایگرت.. خۆی خزاندە پاڵ

«سیامەند»ەوە و مـتـەقی لە خۆی بڕی، کە چووبووە خەوی قـوولـّەوە و دەنگی هەناسـەکـانی لە شێوەی گمـەگـمی کۆترە سـپـیـە نەجـەفـیـەکـانی خۆی دەهاتنە گـوێچکەیەوە.. خـەوی لێنەدەکـەوتەوە و دەیـویست بە هەر شـێـوەیەک بێت لەوە تێبگات ئاخۆ «شازە» چووە بۆ کوێ و ئەو بۆنکرووزە چییە لەو ماڵە دێت.... ئەو دوای تاوێک لەپڕ دەرگـاکـەی بە سـووکی ترازاند و بە ئەسـپـایی هات لەسـەر جێگاکەی پاڵکەوتەوە.. دوای ئەوەی بە لێفە سپیەکە خۆی داپۆشی و پشـوێکی کـورتی دا، لە «نەونەو» نزیککەوتەوە و توند توند بە خۆبەوەی نووساند.. ئەویش زۆڵانە خۆبکرد بە نـووستـوو و جووڵەی لە ئەندامەکانی لەشی بڕی.. هەستی کـرد بۆکرووزەکە لە قژە ڕەشەکەی ئەوەوە دێت و دەستـەکانیشی، کە خستبوویە سەر ڕوومەت و لاملی ئەمەوە، تەزیبوون و مووچووڕکیان بە سەراپای گیانیدا دەهێنا.. ئیتر ئەوەندەی تر ئەبلـەق و سەراسیمەبوو و تەواو لێی بوو بە مەراق.. تا درەنگ بیـری لێکردەوە و هیـچی بۆ ڕووننەبووەوە.. دواتریش لە قـوتابخـانە و لە مـاڵی خۆبان زۆر لە خـەیاڵی خۆبدا هێنای و بردی.. بردی و هێنای، هیـچی لێ حاڵیی نەبوو و هیچ ئەنجـامـێکی بە دەسـتـەوە نەهات.... هەر دوای ئەو شـەوە، چەند شەوێکی تریش، کە خەبەریبووەوە و خۆی بۆ مەڵاس دا، هەمان شتی لێ بینیەوە و گومانی لەوەدا نەما، کە ئەمەی ئەو دەیکات کارێکی ئاسایی نییە و چەند بلـێیی سەیرە.. شەوێکیان خۆی گەیاندە بەر پەنجەرەکە و پەردە سپیەکەی لەسەر لادا، کـە تانوپۆی بە وێنەی سـەرەمـێکوتەی ڕەش ڕەش نەخشـابوو و لەسـەر سکـەیەکی سـاجی لـووسی ڕەشوسـپـیدا دەکرایەوە.. دەکرایەوە و دادەخرایەوە.. «شازە»ی بە ڕووتوقووتیی لە هەیوانەکەدا بینی قژە زۆر ڕەش و ئێجگار درێژەکەی کردبووەوە و بە ئاگــر ســەری تاڵەکــانی هەڵدەکــرووزاند.. دواییش هەر بە ڕووتیی چووە ناوەڕاستی حەوشەکە و سەر بەرەوژێر و دەست بۆ سەرەوە هەڵبڕاو، وێنەی پەیکەر لەبەر باراندا وەستا و جووڵەی لە خۆی بڕی.. دوای تاوێک بە خاولیە سپیەکەی هەیوان خـۆی وشککردەوە و کـراسە ڕەشە بێقـۆڵەکـەی لەبەرکـرد.. جـارێکی تریش ئاگری نایەوە بە قژیا و هەڵیکرووزاند.. بەر لەوەی ئەو دەرگـاکە بکاتەوە و بێـتە ژوورەوە، ئەم بە ئەسپایی چۆوە سەر جێگاکەی و خۆی کرد بە خەوتوو.. ئیتر لە

وزەیدا نەما و نەیتوانی لەوە زیاتر خۆی بگرێت.. بەیانی دوای ئەوەی مێردەکەی چوو بۆ ئیش و هەر ئەمان لە ماڵ مانەوە، لە دواوە دەستەکانی کردە ملیەوە و بە ترسەوە لێی پرسی:

ـ ئەوە ئامۆژن تۆ بۆچی دوێنێ شەو بە ڕووتیی لەبەر باراندا وەستابوویت..؟!

ئەو لە پێشدا وەک بلێی باوەڕی نەکردبێت منالێکی وەکوو ئەم هەستی بەو هەڵسوکەوتەی ئەو کردبێت و بەم شێوەیە ڕووبەڕووی پرسیاری وای بکاتەوە، بۆیە بە سەرسامیەوە سەیری کرد و دەمی داپچڕی.. دوایی نکوولی لێکرد و پێی وت:

ـ ئەوە تۆ خەونت دیوە ڕۆحەکەم.. منالٚ خەونی سەیر سەیر دەبینن..!!

بەلاّم «نەوال» هی ئەوە نەبوو فێـلّی لێـبکرێت و ئاوا بە ئاسـانی باوەڕی پێبکات.. «شازە» خۆی لە هەموو کەس چاکتر ئەمەی دەزانی و هەمیشە لای ئەم و ئەویش باسی زۆرزانیی و مەکرەکانی دەکرد.. هەر جارێ لەگەڵ خۆیا دەیبرد بۆ خەستەخانە و ئەم بێشەرمانە دەستی بە قسەی زل زل دەکرد، ئەو خۆی پێوە دەنواند و بە سیستەرەکانی هاوکاری دەوت، کەوا بەم منالّیەی خۆی ئەوەندەی سەرەژنێک دەزانێت و موعجیزەیەکە بۆ خۆی.. جارێکیان ژنێکی خزمی خۆی بە زمانی عەرەبی، بۆئەوەی هەموویان گوێیان لێیبێت و لێی تێبگەن، تەریقیکردەوە و پێی وت:

ـ ئەو شوانە سـپـیـپـۆشـە چەند دەبەنگە، کـە کـەلّەکـێـوییـەکـان دێنە ناو مەڕەکانیەوە، دلّی پێیان خۆشە و وا دەزانێت گەنجینەی ئالّتوونی دۆزیوەتەوە، نازانێ، کاتێ تێر دەخۆن و دەدەنەوە شاخ و کێو، مەڕەکانیشی لەگەلّیان دەچن..!!

ئەو گوێی نەدایە و بەسەر خۆی نەهێنا، کەچی ئەو هەر وازی لێ نەهێنا و بە گالّتەیەکی زۆر سەیر، کە دەیویست تەواو سەرودلّی بگرێت و چاوی پێ شۆڕکات، پەنجەکانی لە یەکتر هەلّکێشان و بە شێوەیەکی زۆر سەیر لێی پرسی:

ـ تۆ چیرۆکی ئەو ژنە لادێییە ڕەشپۆشەت نەبیستووە، کە مانگا سپیەکان دەبات بۆ لەوەڕ و بێچووەمارە ڕەشەکە لە دەمی ژیشکە سپیەکە دەربازدەکات..؟! خۆشیدەوێت و لە باخەلّیا گەورەی دەکات.. ئەمیش پاداشتی دەداتەوە و بەسەر گۆی مەمکیەوە دەدات..؟!

«شازە» وەک بڵێیت باوەڕی نەکردبێت و نەچێتە ئەقڵییەوە، «نەونەو» لەو قسانە تێگەیشتبێت و ئاوا لە دڵی گرتبێت، بۆیە کاتێ لە ماڵەوە دەستی کردە ملیەوە و پێی وت، کەوا ئەو ژنەی خۆشناوێت و حەز ناکات چیتر چارەی ببینێتەوە، ئەو کردیە باوەشیەوە و پێی وت:

ـ بە سائەقەت بم ڕووناکیی ماڵە چۆڵەکەم، کچە جوان و دەنگخۆشەکەم، تۆ لە هەموو شتێ تێدەگەیت.. لە هەموو شتێ..!!

ئەو لە هەموو کەسێ زیاتر حەزی لە دەنگی «نەوال» دەکرد و باوەڕی وابوو لە دوارۆژدا هیچ گۆرانیبێژێ ناتوانێت شان لە شانی بدات.. هەمیشە هانی دەدا گۆرانی بڵێت و خۆی فێری مۆسیقا بکات.. هەموو سەری مانگێکیش دەیبرد بۆ بازاڕ و دیارییەکی جوانی بۆ دەکڕی.. هەر لە زووەوەش قاپێکی قووڵی سپیی چینی و ژێرپیاڵەیەکی ڕەشی شووشەی زۆر نایابی، لە پیاوێکی «کورد»ی سەرسپی، کە ناوی «کاکەڕەش» بوو و بە عەرەبانەیەکی ڕەش و بارگیرێکی سپییەوە دەهاتە گەڕەک، بۆ کڕیبوو و لەسەر بۆفیە ڕەشوسپییەکەی مووبەقدا دایانابوون.. بنکی ئەمیان بە وێنەی کوڕە گۆرانیبێژێکی ڕەشپۆش و هی ئەویان بە وێنەی کەمانێکی ئێجگار سپی نەخشابوو.. هەموو جارێ، کە چێشتی بۆ دەکردە قاپەکەوە و لە بەردەمی دادەنا، چاوەکانی دەبڕیە چاوەکانیەوە و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر پێی دەوت:

ـ بخۆ.. بخۆ.. بخۆ و مەوەستە، تا دەگەیتە کوڕە گۆرانیبێژەکە.

ئیتر «نەونەو» دەستی دەکرد بە پێکەنین و بە پشتا دەکەوت.. زۆر جار خواردنەکە لە قوڕگی دەگیرا و دەیکرد بە کۆکەکۆک.. ئەوجارەی لە بەردەم مووبەقەکەدا نانی دەخوارد و لەتە باینجانەکەی لە قوڕگی گیرا، هەناسەی لەبەر بڕا و گلێنەکانی سپیبوون.. «شازە» ئەژنۆی شکا و لە حەژمەتا توند توند دەستی چەپی بە چاوەکانیەوە گرت، بەڵام «سیامەند» خێرا پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی کرد بە دەمیا و دەریهێنا.. ئینجا کەوتە وێزەی ژنەکەی و بە شەق و زللە تێیکەوت.. ئانیشکی ڕاستی بە دیوارە سپیەکە ڕووشاند و دەمی پڕکرد لە خوێن.. برنج و شلەکەی کرد بەسەریا و ڕیسوای کرد بە جوێن.. لەمەوە «نەونەو»

هەر جـارێ قـاپەکـەی دەبینی و لێی وردەبووەوە، ئەو ڕۆژەی بیـردەکـەوتەوە و تەریقـدەبووەوە.. کـەچی «شـازە» دوای ئەوەش وەک نە بای دیبـێت و نە باران، هەمان قەوانی لێدەدایەوە و چاوقایمانە پێی دەوت:

ـ بخۆ.. بخۆ.. بخۆ و مەوەستە، تا دەگەیتە کوڕە گۆرانیبێژەکە.

چەند ساڵێ دوای ئەوەش پاڵتۆیەکی لە شێوەی پڵنگێکی ڕەشوسپیی بۆ کڕی و لای بەرگدرووێکی ڕەشپۆش زنجیرێکی سپیی بە گیرفانە گەورەکەیدا گرت.. کاتێ لەبەریدەکرد و قۆپچە بچکۆلەکانی لە خوارەوە تا سەرەوە بۆ دادەخست، توند توند دەینووساند بە خۆیەوە و پێی دەوت:

ـ خۆت بە تووکی پڵنگ داپۆشە ڕۆحەکەم با سەرمات نەبێت.

نیـوەڕۆی بەهارێـکی درەنگ، هەر لە خـۆیەوە، بەبێ ئەوەی کـزەبایەکی ساردی بێت، یان پەڵەهەورێکی تەنک بەری ڕۆژی ناوەڕاستی ئاسمانی گرتبێت، هەستی بە سەرما کرد و چوو لە باوەڵە گەورەکەی ژێر کەنتۆرەکە دەریهێنا، کە لە شێوەی شـەترەنج دروستـکرابوو و «شـازە» جلی زسـتـانەی تیـادا هەڵدەگـرت.. ئەمی لەبەرکردبوو و قاپەکەشی پڕکردبوو لە جۆ.. پەیتا پەیتا دەستی پیادەکرد و دەیدایە کـۆترە سـپـیـەکـانی «سـیـامـەند»، کـە لە سـەربانەوە شـەقـشـەشـەق شـەشـەق.. شەقـشـەشـەق شەشـەق، باڵەکانـیـان لێکدەدا و لەسەر سەری و لە ئاستی تەنافە ڕەشەکەدا، هێڵی بازنەیی و نیمچەبازنەییان پێکدەهێنا و وەکوو کلوەبەفری گەورە لە حەوشـەکەدا دەنیشـتنەوە.. لەوێچ لەوێچ بۆی هەڵدەدان و بیـری لە «سـیـامـەند» دەکردەوە، کە هەمیـشـە سەرزەنشتی دەکرد و پێی دەوت جۆ نەدات بە کـۆترەکـان، چونکە تەپۆ دەبن و ناتوانن بۆ ئاسمان هەڵفڕن.. «شازە»یش لەسەر تەباخە ڕەشە دووچاوەکەی مووبەقدا برنجی لێدەنا و لەبەر خۆیەوە گۆرانیی دەوت:

هذا منو دگ الباب

يمكن إجونا الأحباب

لەپڕ تەقـتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق لە دەرگا سپیەکەیان درا و ئەم خێرا چوو کردیەوە.. کردیەوە و ژنێکی باڵابەرزی زۆر ئێسکسووکی بینی، بە کراسێکی ڕەشی بێقۆڵی گوڵسپییەوە لێی هاتە پێشێ و خێرا کردیە باوەشی.. تێر تێر ئەملا

و ئەولای ماچکرد و لێی پرسی:

ـ تۆ نەوالیت..؟!

«نەوال» ئەگەرچی یەکەمجاری بوو چاوی پێبکەوێت و لەو ماڵەی خۆبانی ببینێت، کەچی خۆیشی نەیزانی بۆچی ئاوا زوو چووە دڵیەوە و خۆشیویست.. هەستی دەکرد لەمەوپێش هەرگیز ئافرەتی ئاوا خوێنشیرینی نەبینیوە و بە ماچی هیچ کەسێکی تر ئەوەندە دڵی پڕنەبووە لە ئەوین.. ئەم هەر جارێ ژنێکی نەدیو و نەناسی دەچوو بە دڵا و خۆشیدەویست، باوەڕی بەو قسەیەی «فەریال»ی خوشکی دەکرد و وردە وردە بیری لێدەکردەوە، کە هەر کاتێ دەبوو بە شەڕیان و لێی تووڕەدەبوو، پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی بۆ ڕادەشەقاند و پێی دەوت، گوایە کچی ژنەقەرەجێ بووە و باوکی لێی کڕیوە.. دایکی هەمیشە لەسەر ئەمە لە «فەریال» تووڕەدەبوو و سەرزەنشتی دەکرد، کەچی ئەو هەر وازی نەدەهێنا و تەمێ نەدەبوو.. جارێکیان قژی گرت و ئەوەندە بە قایم سەری کێشا بە دیوارە سپییەکەی هەیواندا، دەمودەست بوورایەوە و بە پشتا کەوت.. «شازە»، کە ئەوسا پێڵاوە ڕەشەکانی «نەوال»ی لەناو تەشتە سپییەکەی بەر بەلووعەدا دەشت و چاوی لێبوو، خێرا هەستا و گەیشتە سەر سەری.. دەستە تەڕ و شێدارەکانی خستە سەر ناوچەوانی و هێنایەوە هۆش خۆی.. ئینجا دەستی کرد بە گریان و ئێوارەش لە داخا نانی نەخوارد.. شەویش لەسەر جێگا، توندتر لە شەوانی پێشوو ئەمی دەگوشی بە خۆیەوە و دەگریا.. دەگریا و بە سووکی پێی دەوت:

ـ بە قوربانت بم نەونەوەکەی ڕۆحم، فەریال خوشکی گەورەتە و خۆشیدەوێیت، بۆیە وات پێدەڵێت.

«شازە»، کە دەگریا زۆر بە زەحمەت ژیردەبووەوە و تا درەنگ فرمێسکەکانی وشکیان نەدەکرد.. دواییش ژانەسەر دەیگرت و بەسەر دنیاوەی نەدەهێشت.. ئیتر تا دوو ڕۆژ بەرینەدەدا و هەر لەناو جێگادا تلاوتلی دەکرد.. ئەوسا لەجیاتی بە پەڕۆیەکی سپی ناوچەوانی ببەستێت و حەبی ناو شووشە ڕەشەکەی سەر تاقە سپییەکە بخوات، کە هەمیشە دەیدایە دراوسێکانی و پیایدا هەڵدەدا، دەستی «نەوال»ی دەگرت و دەیخستە سەر ناوچەوانی.. چاوەکانی توند توند دەنووقاندن

و دوای تاوێک خەوی لێدەکەوت.. «نەوال» هەندێ جار، کە ئاوا «شازە»ی دەبینی بەزەیی پیادادەهاتەوە و بە سووکی، بەبێ ئەوەی بهێڵێت دەنگی دەربچێت و بێداریبکاتەوە، بۆی دەگریا و فرمێسکی بۆ دەڕشت، کەچی هەندێ جار تەواو بێزاردەبوو و پیشی دەخواردەوە، کە دەستەکانی سڕدەبوون و نەدەبوایە بیانجووڵێنێت.. ئەوسا هەستی دەکرد لەم دنیایەدا کەسێکی تر نییە بەقەدەر «شازە» ڕەزاگران و ناشیرین و ڕووی لێ وەردەگێرا.. ڕووی لێ وەردەگێڕا و نەیدەویست چارەی ببینێت.. ڕقی لە دەستەکانی خۆی دەبووەوە و بیتوانیایە بە گاز دایدەڕزاندن، کە ژنێکی ئاوا دزێو و قێزەون چاکدەکەنەوە و ناهێڵن گیانی بۆگەنی لە کونی لووتیەوە دەربچێت.. جارێکیان «شازە» وەک بڵێی ناخی ئەمی خوێندبێتەوە و زانیبێتی بیری لە چی کردۆتەوە، لەپڕ هەستایەوە و توند توند دەستەکانی گرت.. ماچی کردن و بە سنگیەوەنان:

ـ من چەند بێویژدانم، هەر بۆئەوەی ئێشی ئەم سەرە بۆگەنەم دەربچێت، ئاوا ئەو دەستە جوانانەی تۆ ئازار دەدەم..!!

ئەو هەموو جارێ یەخەی کراسی خۆی دەکردەوە و دەستەکانی «نەوال»ی دەخستە سەر سنگی.. سەیری چاوەکانی دەکرد و بە شێوەیەکی ئێجگار خۆش پێی دەوت:

ـ من بە دەستە جوانەکانتا دەزانم، تۆ چ دڵێکی پاکت هەیە.

«نەوال»یش هەر لە منداڵییەوە وا ڕاهاتبوو قۆڵی کراسی «شازە»ی تا سەر شانی هەڵدەکرد و ڕوومەتی دەخستە سەری، چونکە وانەبوایە هەستی پێنەدەکرد و خەوی لێنەدەکەوت.. دوایی «شازە» هەرکاتێ خەوی بهاتایە و بچووبوایە سەر جێگا، کراسە قۆڵدرێژەکەی دادەکەنی و یەکێکی بێقۆڵی لەبەردەکرد.. «سیامەند» هەموو جارێ سەری بادەدا و بۆ خۆشیی بە «نەونەو»ی دەوت:

ـ جنۆکەی سەرشێت، ئەم بەزمەت لە چییە بەم سەرمایە..؟! بزانە چۆن ڕۆژێ ژنەکەم تووشی نەخۆشییەکی وا دەکەیت، ڕاستبوونەوەی نەبێت.

کەچی «شازە» توند توند بە خۆیەوەی دەنووساند و دەیوت:

ـ تووخوا وازی لێبێنە سیامۆ.. من ئەم گوڵەم لە باوەشا بێت، لەناو بەفریشا

بنووم هەست بە سەرما ناکەم.

ئینجا «سیامەند» گوێچکەی ئەوی دەگرت و بایدەدا:

ـ پیسی بۆگەن، هەتا کەمێ چمکی ئەو کراسەت هەڵدەکەم، قیر دەڵێت چەق، کەچی بۆ ئەم شتە پیسە ئامادەی خۆت ڕووتکەیتەوە.

ئەو ڕۆژەش کە میوانەکەیان سەری خستبووە سەر قۆڵی ڕووت و گۆشتنی و دەیگوشی بە خۆیەوە، هەستی دەکرد تامی قۆڵی «شازە» دەدات و هەر لە هی ئەویش دەچێت، بۆیە وای بۆچوو کەسێکی نزیکی بێت و لە شوێنێکی زۆر دوورەوە هاتبێت، بەڵام خێرا پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی خستە سەر چەناگەی خۆی و بیریکەوتەوە، کە ئەو لەم شارە هەر تاقە برایەک و تاقە خوشکێکی هەیە و ئەم زۆر چاک ئەوە دەزانێت.. ئەمیان باڵابەرزێکی چاوڕەشە و بە تەنیا لە خانووێکی چۆڵدا دەژی.. ئەویان بە موو لەگەڵ «شازە»دا جیاوازیان نییە و بە سکێکیش لە دایک بوون.. ناوی «شاناز»ەو مامی و ئامۆژنی بەخێویانکردووە.. تا ئێستاش شووی نەکردووە و هەر لەگەڵ ئەواندا دەژی.. لە «خەستەخانەی قادسیە»دا سیستەرە و لەگەڵ «شازە»دا قسە بە یەکەوە ناکەن.. «نەونەو» هەر جارێ دایکی دەیگۆڕی و لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆماڵیان، یان ئەو دەهات بۆ سەردانیان و دەیبینی، خێرا ڕایدەکردە ناو باوەشی و دەیوت:

ـ ئامۆژنم..!! ئامۆژنم..!!

ئەو توند توند دەیگوشی بە خۆیەوە و بە کەمێ بێزاریەوە پێی دەوت:

ـ من شانازی پوورتم، ئەو قەحپەیە نییم.. تۆ کەی فێری ئەوە دەبیت نەونەوەکەی ڕۆحم..؟!

تا ئەو کاتەی «شازە»یش لە مووبەقەکە هاتە دەرێ و وتی:

ـ ئەمەیە نەوال.. سەلیمە..!!

ئەم هەر ئەبلەق و سەراسیمە سەری خستبووە سەر قۆڵی و لە سەروسیمای ڕادەما.. بە دیقەت سەرنجی لێ دەدا و بیری لەوە دەکردەوە، ئاخۆ کێ بێت و لە کوێ ئەم دەناسێ..؟! «نەوال» لەمەوە زانی ئەوە «سەلیمە موراد»ی گۆرانیبێژە، کە لە هەموو شتێ زیاتر حەز لە دەنگی دەکات و هەر کاتێ لە ڕادیۆ سپیەکەی

خۆیان، یان ڕەشەکەی ماڵی «سیامەند»دا دەنگی دەهات و ئەم گوێی لێدەبوو، یان لە تەلەفزیۆندا دەردەکەوت و دەیبینی، بە دیاریەوە دەبوو بە بت و هەناسەی لە خۆی دەبڕی.. هەمیشە لە ماڵ و لە قوتابخانەدا لاسایی دەکردنەوە و ڕێک وەکوو خۆی دەیوتنەوە.. مامۆستاکانی ناویان نابوو «سەلیمە جابر» و لە هەموو شتێ زیاتر شانازیی پێوە دەکرد.. «شازە» هەموو جارێ گۆرانیی ئەوی بۆ دەچڕی و پێی دەوت:

ـ لە نزیکەوە دەیناسم و چەند بڵێی یەکترمان خۆشدەوێت.. باسی تۆم بۆی کردووە و ڕۆژێ بەتەمایە هەر بۆ ئەوە بێت بۆ ماڵمان تا بتبینێت.

«نەوال» سەرنجی لێ دەدا و لەگەڵ وێنەکانی تەلەفزیۆندا بەراوردی دەکرد، کە زۆر جیاوازبوون و تەواو حەپەسابوو، بۆیە دەستەکانی گرت بە دڵیەوە و بێشەرمانە لێی پرسی:

ـ تۆ بۆچی لە.........؟!

ئەو پێکەنی و پێی وت:

ـ ڕاست دەکەیت کچە بچکۆلەکە، تەلەفزیۆن منی زۆر گۆڕیوە.

«سەلیمە» وەک بڵێی لەمەوپێش باوەڕی بە «شازە» نەکردبێت و نەچووبێتە ئەقڵیەوە، کە «نەوال» ئەو دەنگە خۆشەی پێوەیە و ئاوا جوان گۆرانی دەچڕێت، بۆیە هەرکە ئەم دەنگی لێ هەڵبڕی و ئەو گوێی لێیگرت، بە جارێ ئەبڵەق و سەرسامبوو و دەستەکانی خستە سەر دڵی خۆیەوە.. سەیرێکی چاوەکانی «شازە»ی کرد و پێی وت:

ـ ئەم کچەی تۆ چاکترین گۆرانیبێژە..!! ئەم کچەی تۆ بلیمەتە شازە..!!

«شازە» لە خۆشیا دەستی کرد بە گریان و سەری خستە سەر ئەژنۆکانی..

«سەلیمە» پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشان و پێی وت:

ـ بگری شازە بگری.. تۆ زۆر پێویستە بگریت چاوەکەم.

«نەوال» حەپەسا و لێی پرسی:

ـ بۆچی بگری پوورە سەلیمە..؟!

ئەو سەیری چاوەکانی کرد و ویستی شتێکی پێبڵێت، کەچی نەیوت و لە

«شازە» بەکوڵتر دایە پرمەی گریان.. دەسرە ڕەشوسپیەکەی لە گیرفانی کراسەکەی دەرهێنا و بە چاوەکانیەوە نا.... «سەلیمە» دواییش هەمیشە باسی ئەو ڕۆژەی بۆ دەکرد و بیری ئەمی دەخستەوە، کە بۆ یەکەمجار لە ماڵی «شازە»دا چاوی پێیکەوت و تێر تێر بۆی گریا، کەچی هەرچەند «نەوال» داوای لێدەکرد و لێی دەپاڕایەوە، هۆی گریانەکەی پێبڵێت و لەو مەراقە دەربازی بکات.. ئەو ڕازیی نەدەبوو و پێشی دەوت:

- تووخوا نەوال ئەگەر بە ڕاستیی منت خۆشدەوێت، ئەم پرسیارەم لێ مەکە.

جارێکیان، کە لەملا و لەولای گۆڕەکەی «شازە»دا دانیشتبوون و ئەم زۆری لێکرد پێی بڵێت، ئەو ناوچەوانی گرژ کرد و پێی وت:

- بەم گۆڕەی شازە جارێکی تر ئەم باسەم لەگەڵدا بکەیتەوە، لە ژیانما قسەت لەگەڵ ناکەم.

کێلە سپیەکانی گۆڕی «شازە» بە بۆیەی ڕەشی زۆر تۆخ وێنەی دوو مانگیان لەسەر نەخشابوو و خرابوونە ناو دوو چوارگۆشەی نارێکەوە.. مانگەکان کەسێکی نەشارەزا کێشابوونی و زیاتر لە ناڵی ئەسپ دەچوون.. «نەوال» هەرچەند سەیری دەکردن و لێیان ورد دەبووەوە، ئەو ناڵبەندە ڕەشپۆشانەی بیردەکەوتەوە و دەچووە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە، کە جارێکیان بینینی قاچی ئەسپە سپیە ناوچەوانڕەشەکەیان ناڵکرد و دواییش نەرم نەرم غاریان پێدا.. ئەمە ئەو جارەبوو، کە «شازە» لە حەمامە کەمێ تاریکەکەدا شتی و «سیامەند» لەگەڵ خۆبدا بردی بۆ ناو ئەو جامبازانەی، جلی ڕەشیان لەبەر و جەزمەی سپیی درێژیان لە پێدەکرد.. بردی و لەسەر ئەسپی ڕەشی پیاوە سپیپۆشەکە وێنەی گرت.. کاتێ گەنجێکی هاوڕێی «سیامەند» کردیە باوەشی و لەسەر ئەسپەکەی داگرت، لە سووچی ئەوسەری خانەکەدا، ئەو دوو پیاوە ڕەشپۆشەی بینی و سەرنجی لێ دان، کە قۆڵی کراسیان تا ئانیشک هەڵکردبوو و ڕەشمەی ڕەشی ئەسپە سپیەکەشیان لە مێخزنجیرێکی سپی سپی، کە تەنها سەرەکەی بە دەرەوەبوو و لە قارچکی زل زل دەچوو، گرێدابوو.. بە بڕەبەندێکی ڕەشی ئێجگار گەورە بنی پێکانیان دەکڕاند و تۆزێکی سپی سپییان، لە شێوەی ئەو تۆزەی لە کولانەی ژووری ئازووقەی کەمێ

تاریکی ماڵی خۆیاندا دەردەکەوت و لەگەڵ تیشکی ئێجگار کزی هەتاودا ئاوێزان دەبوو، لێ هەڵدەوەری.. یەکێکیان قاچی هەڵدەبڕی و دەینووشتاندەوە، ئەویتریان بە مەقاشێکی ئاسنی ڕەش، بەڵام چەند بلێیی لێزانانە، پارچە ئاسنە سوورهەڵگەڕاوەکەی لەناو کوورەی ئاگرە جۆشدراوەکە دەردەهێنا و لە دووری خۆیەوە ڕایدەگرت، کە لە مانگێکی یەکشەویی قووپاو دەچوو و هەر خێرا بە بنی پێکانیانەوە دەلکاندن.. دەمودەستیش هەڵمێکی سپیی وەکوو هەڵمی دەم و لووتە زلەکەیان لێ بەرزدەبووەوە و لە کەلێنی پەنجەکانیاندا بێ سەروشوێن دەبوون، کە بە دووکەڵ ڕەش ڕەش ببوون و لە شێرەکوللە دەچوون.. وردە وردە ناڵە سوورهەڵگەڕاوەکان ساردەبوونەوە و ڕەنگە سوورەکەیان بۆ ڕەش دەگۆڕا.. ڕەش ڕەش و لووس و ساف.. لەولاتریش، لە پەنا پەرژینی سپی و کەمێ نزمی خانەکەدا، چوار پیاوی سایەلەبەر و چەڕاویەلەسەر، دانیشتبوون و ڕەبابەی ڕەشیان دەژەنی.. بە دەنگی ئێجگار خۆش و چەند بلێیی بەرزیان عەتتابەیان دەچڕی و سووک سووک و لەسەر یەک ڕێتم، شان و ملی ئەو پیاوانەیان دەبزواند و لە گێژەنی خەیاڵدا نقوومیان دەکردن، کە لە بەرامبەریان و لەسەر کورسیە ڕەشە چەپوچیرەکاندا دانیشتبوون و پەیتا پەیتا چایان دەخواردەوە.. خۆری ئەو ئێوارەیەش، هەر دەتوت لە زەنگیانەی ورد وردی هەناریی دروستکراوە و بۆ ساتێ خۆی لەو پەڵەهەورە ڕەشانە دزیبووەوە، کە لە شێوەی هێلکەشەیتانۆکەی زل زل بە ڕووی سپیی ئاسمانەوە دەرکەوتبوون و سووک سووک لە یەکتر نزیکدەکەوتنەوە، سێبەری ڕەش ڕەش و درێژ درێژی بۆ شتەکان دەکرد و تێکەڵ بە یەکتری دەکردن.. «نەوال» تەنها ئەو کاتانە خۆری خۆشدەویست و بە چاوە ڕەش و گەورەکانیەوە سەیری دەکرد، کە دەیتوانی پەلکەزێڕینەی سووری گەش لەسەر برژانگە فرمێسکاویەکانی بنەخشێنێت و سێبەری شتەکان لە خۆیان گەورەتر بکات.. ئەم نە قیبلەی ڕەشی هەبوو ڕووی تێبکات و نە بەرماڵێکی سپییش بۆ پێنج فەرزەی نوێژ، تا تێر تێر کڕنۆش بۆ خوای تاق و تەنیا بەرێت و لێی بپاڕێتەوە.. هەر دوو دەستی بەرەو سەرەوە هەڵبڕێت و دووعا بکات.. وێرد بخوێنێت و بکڕووزێتەوە.. لەو ئاسمانە گەورە و فراوانەشدا، هەر تەنها دیمەنی

خۆرئاوابوونی لا جوان بوو و دڵی پێدەکرایەوە، بەتایبەتی کاتێ لە گۆڕەپانەکەی بەردەمی ماڵی خۆیاندا بەکامی دڵ سەیری دەکرد و لێی وردەبووەوە، وێنەی لەقلەقێکی برینداری خوێناویی و لە جووڵەکەوتوو، سووک سووک لەسەر لمی دامێنی ئاسماندا نغرۆ دەبوو و بۆ ساتێ تارماییەکەی وەکوو پەشمەک بەجێدەما.. هەموو خۆرئاوابوونێک لەو گۆڕەپانەدا قەیسیی بیری ئەم دەخستەوە و ناو دەمی دەبوو بە ئاودرکەی لیک.. ئێوارەیەکیان ورکی بۆ قەیسی گرت و قاپە برنجەکەی بە لەقە لە بەردەمی خۆی لابرد.. تا درەنگ درەنگ گریا و ژیرنەبۆوە.. هەرچەند دەنگی هەڵدەبڕی و دەیوت:

ـ قەیسیی زەرد دەخۆم.

«شازە» لێی تووڕەدەبوو و پێی دەوت:

ـ دەرد و بەڵای ڕەش دەخۆیت.

ـ قەیسیی زەرد دەخۆم.

ـ ژەهری ڕەشی ماری سپی دەخۆیت.

ـ قەیسیی زەرد دەخۆم.

ـ قوزەڵقورتی ڕەشوسپی دەخۆیت.

ـ قەیسی زەرد دەخۆم.

ـ قەیسی قەیسی چییتە..؟! خەونت دیوە..؟!

ـ قەیسیی زەرد دەخۆم.

ـ بەسە بیبڕەوە، ئەگینا بەم شەوەڕەشە دەتکەمە دەرەوە و دەبێت تا بەیانی لەو حەوشە تاریکەدا بنوویت.

بەیانی کە لەسەر دۆشەگە ڕەشەکە و لە ژێر لێفە سپییەکەیدا چاوی کردەوە و ئامۆژنی بینی، جلە سپییەکانی لەبەرکردبوو و بەرچایی ئامادە دەکرد.. لەملا ماست و شیر و لەولا چای ناو قۆریە سپیەکە.. لەولاتر شەکردانە ڕەشەکە و چاپاڵێوە سپییەکە بە تەنیشت یەکترەوە.. پیاڵە شیرییەکە و ژێرپیاڵە ڕەشەکەی خۆی بینی و بە ڕقەوە سەرنجی لێ دان، لە ناوەڕاستی هەموویان دانرابوون و وەکوو دوو شتی نامۆی ماڵەکە دەردەکەوتن.. قێزی لێدەکردنەوە و نەیدەویست

چییتر چایان تیادا بخواتەوە.. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد شتێ ببینێت ڕەنگی لە ڕەنگی زەردەپەڕ و قەیسی بچێت و تێر تێر و بەکامی دڵ لێی وردبێتەوە، بەڵام مەحاڵبوو چاوی پێبکەوێت و کوڵی دڵی دامرکێتەوە.. نە لە ماڵی ئەوان و لە ماڵی خۆیان و نە لە کۆڵان و نە لە بازاڕ و نە لە دووکانی باوکیدا نەیدی و نەیدی.. ئەو ڕۆژە تەواو هەستی کرد ئەو سێ ڕەنگە، ڕەش و سپی و سوور بەشی شتە زۆر و زەبەندەکانی سرووشتی ئەم وڵاتە پانوپۆڕە ناکەن و دۆزینەوەی ڕەنگی تری لێبوو بە خەمێکی گەورە.. لێیبوو بە مەراق و خەون و خولیا.. بیری لە «شازە» کردەوە و هێنایە بەر چاوی، کاتێ لەو تەمەنەی ئەمدا بووە، لە «هەولێر»، لە ماڵی مامی، لەسەر قەڵا بەرزەکەدا بە هەر چوار لای خۆیدا ڕوانیویەتی و بێجگە لە ڕەش و سپی و سوور، زەرد و سەوزیشی بینیوە و پێیان شاگەشکە بووە.. خۆ جارێکیش، کە لە هەیوانەکەدا دانیشتبوون و وێنەکانی پیشاندەدا، سوێندی بۆ خوارد کراسەکەی بەری زەرد و تۆقەکەی سەری سەوزە، بەڵام خەتای کامێرا ڕەشوسپییەکانە ئاوا ئەمیان سپی و ئەویان ڕەش دەرکردووە و هەموو شتەکانیان شێواندووە.. «نەونەو» باوەڕی دەکرد و زۆر چاک تێدەگەیشت، کە ئەو دار و درەختەی لێرە ڕەشن و زۆر بە ئاسانی لە تاریکیدا وندەبن، لەوێ سەوزن و چەندیش بڵێیت جوانن.. بەرەکانیشیان زەردن و لە بەر تیشکی ڕووناکییدا جوان جوان دەدرەوشێنەوە.. یان ئەوانەی سپیین و بەرەکانیان ڕەشن، لەوێ زەردن و بەرەکانیشیان سەوزێکی تا بڵێی جوانن.. ئەو خۆرەی لێرە هەموو خەڵک بە سووریی دەیبینن و ڕەنگی شتەکانیش وەکوو خۆی سووردەکات، لەوێ زەرد زەردە و گەورە و بچووکیش هەر وا دێتە بەر چاویان.. وا لە دڵیشی چەسپی بوو ڕۆژێ دێت، بازرگان بە جیا و سەرباز بە جیا، ئەمیش بە جیا بە دوای ڕەنگی زەرد و سەوزدا دەچن و ڕێی هاتونەهاتی بۆ دەگرنەبەر، بەڵام نەیدەتوانی لە کەسی بگەیەنێت و هەر لە خۆبەوەش ترسێکی سەیر دایدەگرت.. «هیام»ی بیردەکەوتەوە و هەستی بە نائومێدیی دەکرد، کە ئەو جارە چوون بۆ ماڵیان و پێی وت، گوایە سرووشتی ئەم وڵاتە بێجگە لەم سێ ڕەنگە هیچی تر هەڵناگرێت و هەر ڕەنگێکی تری بۆ بهێنیت کاڵیدەکاتەوە.. مامی و ئامۆژنی و «خانزاد»ی دایکی «دیجلە» و

«فورات» و «کاترینا» و «جۆن» و هەموو ئەوانی تریش بە ڕەنگاوڕەنگیی هاتوون و لێرە ڕەنگیان وەکوو هی ئەوانی لێهاتووە.. هەر کەسێکی ئێرەش بچێتە ئەوێ و قاچی لە سنوورەکانیان ئاودیوکات، چی زەرد و سەوز هەن لەبەر چاویدا بۆ ڕەش و سپی دەگۆڕێن و ناتوانێت بیانبینێت.. ئەوسا ناچاردەبوو لە بیری خۆی بەرێتەوە و مێشکی پێوە خەریک نەکات.. ئەوەتا ئەم هەرچەند بڵێت زەردەپەڕ زەردە و لە قەیسی دەچێت، کەس باوەڕی پێناکات و هەر گوێشی لێناگرن.. یان گوێی لێدەگرن و سەریشی بۆ دەلەقێننەوە، بەڵام لەپڕ تەریقیدەکەنەوە و پێی دەڵێن: «زەردەپەڕ چییە کچێ..؟! زەردیش ڕەنگە..؟! ئەم وشە سەیر سەیرانەت لە کوێ هێناوە جنۆکەی سەرشێت..؟! خۆرئاوابوون چۆن لە قەیسی دەچێت..؟! ئەمیان سوور و ئەویان سپی..!! ئیتر بەسە و بیبڕەوە».. تەنانەت ئامۆژنیشی، کە هەموو منالّیی خۆی لە نێوان ڕەنگی سەوز و زەرددا بەسەر بردووە و لای ئەمی خۆشەویست کردوون، حەزناکات، یاخوود حەزدەکات و نایەوێت گوێی لێبگرێت، کە زەردەپەڕ لە قەیسی دەچێت و بەبینینی ئاوێکی سەیر دەزێتە دەمیە.. ئاوێک، هیچ لە لیک ناچێت و کاتێ قووتیدەداتەوە تەزووێکی نامۆ بە سەرتاپای گیانیدا دێنێت.. هەر وەکوو چۆن ئەو جارە باوەڕی پێینەکرد و ئەو هەموو جنێوە ناخۆشەی پێ دا.. هەر لەمەشەوە بیرێکی زۆر ترسناکی بۆ هات و گیانی لەگەڵیا کەوتە لەرزین.. وەکوو سەرەمێکوتەی بزێو لە دڵیا دەکەوتە جووڵەجووڵ و بەردەوام بە ئاگای دەهێنایەوە.. وای بۆ چوو، ئەم چاوەکانی تووشی نەخۆشیی بوون و ڕەنگەکانی تر نابینن.. سەری دەخستە سەر ئەژنۆی و «ئەبو عەلائی موعەڕی»ی دەهێنایە بەر چاوی، کە تەنیا ڕەنگی سووری بیردەکەوتەوە و ئەوانی تری لەبیرچووبوو، چونکە کاتێ نەخۆشیی ئاوڵە خستبووی و چاوەکانی تووشی ئازاربیوون، کراسێکی سووری لەبەردابووە و بەحاڵ بینیویەتی.. دواتر، کە کەمێ هەراشبوو و چاکتر تێگەیشت، دڵنەوایی خۆی دەکرد و دەیوت: «وانییە.. وانییە.. چاوەکانم بەڵایان لێ نییە و لە چاوی خەڵکی تر چاکتر شت دەبینن.. ئەی ئەو جارە پیاوە باڵابەرزەکەی هاوڕێی مامە سیامەندم، کە ئێستا ناوەکەیم بیرنەماوە و دەیتوانی بە ئاسانی ناخی خەڵک بخوێنێتەوە، پێی نەوتم: چاوەکانی

تۆ زۆر تیژن و دەتوانن لە دووری دوور دوورەوە ئەو شتانە ببینن، کە خەڵک لە نزیکیشەوە هەستیان پێناکەن..؟! ئەی باوکی عەمار بۆ ناڵێیت..؟! ئەو هەر لە زووەوە هەستی بە تیژیی چاوەکانی من کردووە و هەمان قسەی ئەو پیاوەیشی پێ وتووم.. خۆ من گوێچکەکانیشم زۆر سووکن و هەموو خشپە و چرپەیەک، چەندیش کزبن، دەبیستن و لێیان تێدەگەن.. ئەگەر ئەو ڕەنگانە هەبوونایە، جارێ لە دەمی کەسێکەوە هەر دەمبیستن....»، کەچی هەرچەند ئەو ڕۆژەی بیردەکەوتەوە و جنێوەکانی «شازە» لە گوێچکەیدا دەنگیان دەدایەوە، ترسێکی سەیرتر دایدەگرتەوە و وا دەچووە ئەقڵیەوە، کە ئەم نە دەتوانێت ئەو ڕەنگانەی تر ببینێت و نە ناوەکانیشیان ببیستێت.. تەنها ئامۆژنی لە توانایدایە پیشانی بدات و هەر بە دەنگی ئەویش دەتوانێت ناوەکانیان ببیستێت، بەڵام ئەوەتا ئەویش لێی چووە بە قینا و دەیەوێت بەو داخەوە بیکوژێت.. گەرەکیەتی دیقی پێبکات و بە جارێ حەیران و سەراسیمەی بکات.. ئەم چۆن ئەو ڕۆژەی لە بیردەچێتەوە و دەتوانێت لە خەیاڵی خۆی دەریکات، کە ئەو کارەی پێکرد و زووخاوی کرد بە دەمیەوە.... چەند شەوێ دوای ئەوە، کاتێ لە ماڵی ناسیاوێکی «سیامەند» دەهاتنەوە و سەری هەڵبڕی، ئەستێرە سوورەکان لەسەر ڕووی ئاسمانە ڕەشەکەدا، لەبەر چاوی بوون بەو شرووبانەی، کە لە ڕەنگی خوێنی ئەسپ دەچوون و مناڵە هیندیە قژ ئێجگار ڕەشەکانی لای مەرقەدی سپیی «شێخ عەبدولقادری گەیلانی» لەسەر سینیە شووشە ڕەشەکاندا چواریان بە عانەیەک دەفرۆشت.. جارێکیان «شازە» لەگەڵ خۆیدا بردبوویە ئەوێ و بۆی کڕیبوو.. بە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی لەگەڵ ئاردەکەدا تێکەڵی دەکرد و دەیخستە سەر زمانی.. هەستی دەکرد لە هەموو ژیانیدا شتی ئاوا بە لەزەتی نەخواردووە و قەستی دەکرد هەموو سینییەکە بە جارێ هەڵلووشێت.. لەمەوپێش لای مناڵە چەقاوەسووەکانی گەڕەکی «بابلشێخ» و «حەیدەرخانە» خواردبووی و زۆریشی خواردبوو، بەڵام هەرگیز ئەو تام و چێژەی لێ نەبینیبوو و تەنانەت هەستی دەکرد ڕەنگە سوورەکەیشی لە ڕەنگی سووری ئەوان جیاوازە.. کە تەواوبوو ڕووی کردە «شازە» و پێی وت:

ـ هی تریش دەخۆم.

ئەو سەری بادا و پێی وت:

ـ نابێت کچی شیرینم، چوار دانە بەسە.

ـ حەزم لێیەتی، هی تریش دەخۆم.

ـ نابێت بە سائەقە، ئەوەندە بخۆیت، سکت پڕی دەبێت لە کرمی ورد وردی سپی و کە شەودابێت کۆمت دەخورێت.

منداڵە هیندیەکان، گوێیان لە «شازە» بوو و تێکڕا دایانە قاقای پێکەنین.. پێکەنین و دانە سپیەکانیان لە ژێر لچ و لێوی ڕەشیاندا دەرکەوتن.. ئەو کوڕەی «نەونەو» شرووبی لا خوارد و لەسەر کورسیەکی داری ڕەش و چەپوچیری نزم دانیشتبوو، کەوتبوو بە پشتا و نەیدەتوانی هەستێتەوە.. «نەونەو»، سەرنجی کەوتە سەر جووتە گونە ڕەشەکەی و لێی وردبووەوە، کە لە ژێر دیشداشە سپیە تا سەر ئەژنۆ هەڵکراوەکەیدا، چرچ چرچ و ڕەش ڕەش وەکوو تەرسەقولی کەرە سپیەکەی ئەو پیاوە لادێییەی هەموو جارێ بە دیشداشەیەکی ڕەشەوە دۆشاوی خورما و ترێی دەهێنایە گەڕەک، هاتە بەر چاوی و قێزی لێیکردەوە.. دڵی تێکهەڵهات و خەریکبوو بڕشێتەوە، بۆیە کاتێ «شازە» عانەکەی دایە و پێی وت:

ـ ها بگرە، بەڵام ئیتر داوا نەکەیت.

ئەم لێی وەرگرت و تا تینی تیابوو هەڵدایە ناو جۆگەی باریکی ناوەڕاستی کۆڵانە تەنگەبەرەکە، کە قوڕاوێکی ڕەش ڕەشی پیادا دەڕۆیشت و تۆپەڵێ جنێوی زۆر سووکی پێدا.. لەماڵەوەش هەرچەند بیری لێدەکردەوە و دەیهێنایە بەر چاوی خۆی، هێڵنجی دەهاتێ و دڵی تێکهەڵدەهات.. «سیامەند»یش هەر جارێ دەیویست گاڵتەی لەگەڵدا بکات و بەزمی پێ بگێڕێت، بە سووکی دەمی لە گوێچکەی نزیکدەکردەوە و بە شێوەیەکی چەند بلێیت سەیر، کە زۆر زەحمەتبوو بتوانێت لاسایی بکاتەوە و دەنگی وەکوو ئەو لێبکات، پێی دەوت:

ـ دەڵێی چی گونی منداڵە هیندیەکانت بۆ بدەم لە شیش و لەسەر خەڵووز بۆتی ببرژێنم..؟!

ئەم قژی ئامۆژنی ڕادەکێشا و پێی دەوت:

ـ ئەوە تۆ بۆچی پێت وتووە ها.. ؟!

کەچی ئەو شەوە حەزی دەکرد دەستەکانی ئەوەندە درێژبوونایە، تا بۆ ئاسمان هەڵیبڕینایە و بە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپ و ڕاستی یەکە بە یەکە ئەو ئەستێرە سوورانەی بخستایەتە سەر زمانی.. وەکوو شرووبی مناڵە هیندیەکان بیخواردنایە و کوڵی دڵی دامرکاندایەتەوە.. کاتێ «شازە» لە هەیوانەکەدا دانەویبووەوە و پێڵاوە سپییەکانی دادەکەند، بە دزییەوە دەمی لە گوێچکەی ڕاستی نزیککردەوە و بە چپە، بۆئەوەی «سیامەند» گوێی لێنەبێت و گاڵتەی پێنەکات، پێی وت:

ـ حەزم لە شرووبە.

ـ ئینجا دەڵێی چی بەم شەوە.. ؟!

ئەم سەری لەبەر نا و هیچی نەوت.. «شازە» پێکەنی و پێی وت:

ـ بەیانی خۆم بۆتدەکەم.

ـ بەڵام من حەزم لە هی کوڕە هیندیەکانە.

ـ ئەوە چییە دیسان قوڕگت هاتۆتەوەیەک.. ؟!

«شازە» ئەمەی وت و بە هەر دوو پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپ و ڕاستی دەمی «نەوال»ی کردەوە.. لەبەر ڕووناکیی گڵۆپە شیرییەکەی هەیواندا سەیریکرد و پێی وت:

ـ ئا ، قوڕگت هاتۆتوەیەک، بۆیە ئاوا دەنگت گۆڕاوە.

ـ حەزم لە شرووبە.

ـ بەیانی لەگەڵ خۆمت دەبەم و بۆت دەکڕم، بەڵام وەرە جارێ بخەوە.

چوو لەسەر جێگاکەی پاڵکەوت و هەر زۆر زووش خەوی لێکەوت، بەڵام نیوەشەو بەدەم ئازارەوە بێداربووەوە و لەگەڵ ناڵە ناڵ ئامۆژنیشی بە ئاگا هێنا.. ئەم هەر جارێ نەخۆشدەکەوت و تای لێدەهات، نەیدەویست گوێی لە هیچ دەنگێ بێت و گوێچکەکانی خۆی توند توند دەگرت.. لەو کاتەدا دەنگی خۆش و ناخۆش، بەرز و نزم لای ئەم وەکوو یەک وابوون و تەواو پێیان قارس دەبوو.. باوکی خێرا دەیخستە ناو ئۆتۆمۆبیلە ڕەشەکەی و دەیهێنا بۆ لای «شازە».. تەنها ئەو دەرمانی

دەردی دەزانی و دەیزانی بە چی ئازاری گیانی دەردەچێت.. ئەم لە تەمەنی دوو ساڵییدا تووشی نەخۆشیەکی زۆر سەیر ببوو و تەواو سەغڵەتی کردبوون، بە ڕۆژ بەڵای لێنەبوو و ڕێکوپێک یاریی دەکرد، کەچی هەر شەو دادەهات و پەردەکانیان بەسەر ڕووی پەنجەرەکاندا دادەدایەوە، دەستی بە گریان و ناڵە ناڵ دەکرد و سەرودڵی هەموویانی دەگرت.. تایەکی گەرمی لێدەهات و هەموو گیانی سوورهەڵدەگەڕا.. بردیان بۆ لای چەند دکتۆر و کۆمەڵێ حەب و دەرمانی جۆراوجۆریان پێ تاقیکردەوە، هەر سوودی نەبوو و چاکنەبووەوە.. «شازە» کە هەر لە بنەڕەتەوە باوەڕی بەوە نەبوو پیشانی دکتۆری بدەن و ئەو هەموو حەب و دەرمانەی بە دەمەوە بکەن.. بردی و لە سووچی ئەوسەری ژووری نووستندا جێگای بۆ داخست.. شەوانە ڕووی دەکردە دیوارە سپیەکەوە و بە لێفە ڕەشەکە تا چەناگەی دادەپۆشی.. گلۆپە شیرییەکەی دەکوژاندەوە و چرایەکی بنکڕەشی کز کزی دادەگیرساند.. لە بەردەمی چراکەدا خۆی ڕووتدەکردەوە و سەمای بۆ دەکرد.. لەگەڵیا بە دەنگی ئێجگار خۆشی، بەڵام چەند بڵێیی بە سووکی گۆرانیی بۆ دەوت و دەیلاواندەوە.. «نەونەو» تەنها سێبەری ئێجگار ڕەشی ئەوی دەبینی بە گەورەیی لەسەر دیوارەکەدا دەردەکەوت و بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەجووڵایەوە.. بەیانی کە بەر لە «شازە» بێداردەبووەوە و چاوەکانی دەکردەوە، خێرا لە دیوارەکەی دەڕوانی و بۆ سێبەرەکە دەگەڕا.. هەڵدەستا و لە بەرامبەریدا دەوەستا.. سەمای دەکرد و لاساییدەکردەوە.. «شازە» کە ئاوا دەیبینی و سەرنجی لە جووڵەکانی لەشی دەدا، لە خۆشیا گەز گەز باڵای دەکرد و بەدەم قاقالێدانی بەرزەوە پێی دەوت:

ـ بە قوربانت بم تاقە کچی ماڵەکەم.. قەزات لەو دڵەم کەوێت کچە زۆرزان و زیرەکەکەم.

دواتریش کە کەمێ هەراشبوو و چوو بۆ قوتابخانە، بە قەڵەمی ڕەشی تۆخ تۆخ ئەو دیوارەی دەنووسی و هێڵی سەیر سەیری لەسەر دەکێشا.. لە ماوەی چەند ساڵێکدا تا ئەو ئاستەی دەستی پێی دەگەیشت و تەنەکە و قوتووەکان دەیانتوانی بەرزیکەنەوە، شوێنێکی سپیی پێوە دیارنەهێشت و هەر وازیشی نەهێنا.. سەر و

کلکی هێڵە کورت کورت و درێژ درێژەکان، هی ستوونی و ئاسۆیییەکان، بازنەیی و چەماوەییەکان، چوارگۆشەیی و لاکێشەیییەکان، وا چووبوون بە یەکا و بە شێوەیەک تێکقرژقرژابوون، بێجگە لە «شازە» کەسی تر سەری لێ دەرنەدەکردن و لێیان تێنەدەگەیشت.. ڕۆژێکیان کە ئەمان بۆ خەڵووزکڕین چووبوون بۆ بازاڕ و هەر «سیامەند» لە ماڵ مابووەوە، ئەو بە دزییەوە بۆیاغچییەکی ڕەشپۆشی هێنابوو و دیوارەکەی پێ بۆیەکردبووەوە.. «شازە» کە چووە ژوورەوە و بینی، بە جارێ شێت و هار بوو و توند توند یەخەی کراسە سپییەکەی گرت.. پاڵێکی قایمی پێوەنا و زۆر بە تووڕەیی پێی وت:

ـ دەستت بشکێت و ئەستۆت وردبێت سیامە دڵڕەق بۆ خۆت و ئیشی کردووتە.

ئیتر لەمەوە «نەونەو» هەرچەند نەخۆشیش بکەوتایە و لەناو جێدا بکەوتایە، ڕازیی نەدەبوو «شازە» سەمای بۆ بکات و لە سێبەرەکەی ڕابمێنێت، بەڵام خووێکی زۆر سەیرتری گرت و نەیدەتوانی وازی لێبهێنێت.. دەبوایە هەر لەو ژوورە تاریکە و لە ژێر ڕۆشنایی زۆر کزی چراکەدا لەسەر پشت پاڵکەوێت و ئامۆژنیشی بە دیاریەوە دانیشێت.. تاوەکوو تەواو کفتدەبێت و چاوی دەچێتە خەو، ئەم هەرچی بە خەیاڵیدا هات و دەریبڕی، ئەو وەکوو خۆی بیلێتەوە و بۆ ساتێکیش چاوی لە چاوەکانی ئەم نەتروووکێنێت، کە ئەوسا کز کز هەڵدەهاتن و هەموو شتێکیان لە شێوەی تارماییدا دەبینی.. ئەمەشی هەر بۆئەوە دەکرد و پێی خۆشبوو، تا بێجگە لە دەنگی خۆی، گوێی لە هیچ دەنگێکی تر نەبێت و وەڕز و هەراسان نەبێت.. ئیتر هەرچی دەهاتە بەردەمی نەیدەگێڕایەوە و دەیدا بەسەر یەکا.. ئەو جارەی «سیامەند» سەفەری کرد و ئەمان چوون بۆ ماڵی «خالیدە»ی دەستەخوشکی «شازە»، تا ئەو حەفتەیە لەوێ بمێننەوە و ئەم بۆ خۆی لەگەڵ «لوئەی»ی کوڕیان یاریی بکات، دوای دوو ڕۆژ نەخۆشکەوت و تایەکی ئێجگار گەرمی لێهات.. «شازە» تەمای لێ دانا و کەوتە ڕنینەوەی دەموچاوی خۆی، کەچی ئەم هێشتا ئاگای لەوەمابوو پێی بڵێت بیباتەوە ژوورەکەی خۆیان و لەوێ گوێ لە وڕێنەکانی بگرێت.. گوێیان لێبگرێت و بیانڵێتەوە.. کاتێ لە دواوەی

پیکابە سپییەکەشدا دانیشتبوون و سەری شل و خاو خستبووە سەر سنگی ئەوەوە، هەر زوو زوو پێی دەوت لەو چوار ژنە لادێییە ڕەشپۆشە تووڕەبێت و بێ دەنگیان بکات، کە لەگەڵ ئەمان سواربوون و دەمیان لە گۆ نەدەکەوت.. تەنانەت ڕقی لە دەنگی مراویە ئێجگار سپییەکانیشیان دەبووەوە و حەزی نەدەکرد بە هیچ شێوەیەک چاوی پێیان بکەوێت، کە بە پەڕۆی ڕەش ڕەش قاچەکانیان توند توند بە یەکەوە بەستبوون و لەناو زەمبیلەی پووشی ڕەش و لە بەردەمی خۆیانیان دانابوون.. هەرچەند دەنگیان لێ هەڵدەبڕی و دەیانوت: «قوپ قاپ.. قوپ قاپ» ، ئەم لە داخا چاوی دەچووە پشتی سەری و دانەکانی جیڕدەکردنەوە.. هەر ئەوەندە «شازە» هاواری بەسەرداکردن و پێی وتن:

ـ ئەرێ ئێوە نابێت کەمێ ئەو دەمە بۆگەنەتان داخەن..؟! نابینن کچەکەم نەخۆشە و بە دەنگی بڵح و ناخۆشتان بێزار دەبێت..؟!

ئەوان تێکڕا بۆی هەستانەوە و شاڵاویان بۆ برد.. هەر یەکەی لە ئاستی خۆیەوە دەستی بۆ قژی درێژدەکرد و چەپک چەپک دەریاندەهێنا.. بە چڕنووکی تیژ تیژیان ڕوومەتە سپی و ناسکەکانیان ڕووشاند و بە گاز نەرمەی قۆڵ و باسکی ڕووتیان دارژاند.. دەم و لووتیان پڕکرد لە خوێن و ڕیسوایان کرد بە جوێن.. مراویەکانیش ملیان درێژ دەکرد و تێکڕا و بە یەک ئاواز دەیانوت:

ـ قوپ قاپ.. قوپ قاپ.

ـ قەحپەی قاچ و قولڕووت.

ـ قوپ قاپ.. قوپ قاپ.

ـ وازم لێبێنن، کچەکەم زەندەقی چوو.

ـ قوپ قاپ.. قوپ قاپ.

ـ قۆنەرە.. قاپقاپ.

ـ قوپ قاپ.. قوپ قاپ.

ـ قەپرغەم کونبوو.. چاوم کوێربوو.. کچەکەم زەندەقی چوو، یەخەم بەردەن.

ـ قوپ قاپ.. قوپ قاپ.

کاتێ لە ماڵەوە «نەوال» بە «شازە»ی وت بە دیار سەریەوە دانیشێت و گوێ

لە وڕێنەکانی بگرێت، ئەو وەک بڵێی باوەڕی نەکردبێت و نەچێتە ئەقڵیەوە، ئەم دوای ئەو فەرتەنەیە، لە ڕووی بێت جارێکی تر بە لای قسەو باسی ئاوادا بچێتەوە و وازی لەو خووە پووچەی نەهێنابێت، بۆیە بە حەپەساویەوە سەیرێکی کرد و هیچیشی نەوت.. «نەوال» لەمەوە فێری ئەوەش بوو لەگەڵ هەر قسەیەک، کە دەیکرد قوپ قاپ.. قوپ قاپێکی دەوت.. «شازە»یش ئەوەندەی دەوتەوە تا تەواو گێژ دەبوو و بە قنگەوە خەوی لێدەکەوت.. بەڵام لە خەویشدا هەر دەمی دەجولا و دەیوت:

ـ قوپ قاپ.. قوپ قاپ.. قوپ قاپ.. قوپ قاپ.. ق.. و.. پ.. ق..ا.. پ.. ق... و... پ... ق... ا...پ.....

شەوێکیان گوێی لێبوو «شازە» خۆی خزاندبووە باوەشی مێردەکەی و بە چپە بۆی باسدەکرد، کەوا لە خەستەخانە، هەر کەسێکی بینیوە و قسەی لەگەڵدا کردووە، بەبێ ویست قوپ قاپ قوپ قاپی وتووە و تەریقبۆتەوە.. هەندێکیان گاڵتەیان پێیکردووە و پێی پێکەنیون، هەندێکیشیان لێی تووڕەبوون و سەرزەنشتیان کردووە.. «سیامەند» لێی تووڕەبوو و بە دەنگێکی کەمێ بەرز پێی وت:

ـ هەرچی شتی ناشیرین هەیە تۆ فێری دەکەیت و دواییش گلەیی دەکەیت.. دە بیخۆ دەی.. ئەگەر ڕۆژێ شێتیشی نەکردیت بزانە من هیچم نەزانیوە.

ئەو جارەی حەزیشی چووبووە سەر شرووبی کوڕە هیندیەکان و بەسەردا نەخۆشکەوت، «سیامەند»، کە پێخەفەکەی خۆی لە هی ئەوان دوورخستبووەوە و ڕووی کردبووە دیوارەکەی ئەولاوە، زۆر لە «شازێ» تووڕەبوو، کەوا بەم نیوەشەوە سەمای بۆ دەکات و لەبەر دەنگی گۆرانییەکانی ئەو خەوی لێناکەوێت.. کەچی ئەو گوێی بە قسەی مێردەکەی نەدا و نەهات لە تەنیشتیا پاڵکەوێت.. تا بەرەبەیان سووڕی بۆ دا و لە هەموو جارێ زیاتر دەنگی لێ هەڵبڕی.. «نەونەو»یش هەر زوو زوو، زۆر زۆر بە سستی، بەڵام چەند بڵێی بێزارانە، سەری قیتدەکردەوە و پێی دەوت:

ـ بە مامە سیامەندم بڵێ با قسە نەکات، چونکە حەزم لە دەنگی نییە و

نامەوێت گوێم لێبێت.

هەرچەند بۆ ساتێکی کورتیش پێڵووەکانی کفتدەبوون و چاوەکانی لێکدەنا، خەونی بە کوڕە هیندیەکانەوە دەبینی و ڕادەچڵەکی، کە وەکوو بووکەشووشەی زل زلی ناو کۆگاکانی بازاڕی جلوبەرگ، بە ڕیز لەسەر دیواری حەوشەی ماڵەکەیاندا دەوەستان و بە دان دامێنی دیشداشە سپیەکانیان دەگرت.. بە دەست یارییان بە گەڵوگونی ڕەشیان دەکرد و پیشانی ئەمیان دەدا.. سەری شەبزووزەکانیان توند توند دەگوشی و شلەیەکی سوور سووریان لە کونەکانیانەوە دەهێنا.. هەر کاتێکی دەزانی وا ئەو حەوشەیە سووردەچێتەوە و قاچەکانی، کە خستبوونیە جووتێ پێڵاوی پووشی سپیەوە و بە قەیتانێکی ڕەشی وەکوو باڵی پەپوولە توندی کردبوون، تا ئاوزنگ لەناویدا شڵپەیان دێت و هەست بە خورانیان دەکات.. کۆترەکانی «سیامەند»ی دەبینی و لێیان وردبووەوە، بە پەڕوباڵی سوورەوە لەسەر سەری ئەم دەخولانەوە و لەگەڵ لێکدانی باڵەکانیان شلە سوورەکەی گیانیان بۆ سەر دەموچاوی ترشاو و قژی ژاکاویدا پرووشەی دەکرد.. کاتێ لە ئاوێنەکەی هەیواندا سەیری خۆی دەکرد و بە دیقەت لێی ورد دەبووەوە، سەرتاپای سووردەچووەوە و لەبەر تیشکی مانگە ئێجگار سوورە چواردەشەویەکەدا دەبریسکایەوە، کە لەمەوپێش هەرگیز بەو شێوەیەی نەدیبوو و هەستی دەکرد بۆنێکی سەیری لێدێت.. پێڵاوەکانی دادەکەنی و خێرا خێرا بۆ ناوەڕاستی حەوشەکە ڕایدەکرد.. ئەوسا کۆمەڵێ ڕاهیبەی دەبینی و لێیان وردەبووەوە، کە لەسەر قەراغی تارمەی بانەکەیان دانیشتبوون و قاچیان شۆڕکردبووەوە.. دەستیان خستبووە سەر کۆشیان و بە کوڕە هیندیەکان پێدەکەنین.. لەولاتر، لەسەر پلێتی ئێجگار ڕەشی سەر کولانەی کەمێ بەرزی مریشکە سپیەکان، «شازە» بە ڕووتیی لەسەرپشت ڕاکشابوو و قاچەکانی لە شێوەی پیتی «لا»یەکی زل کردبووەوە.. دەینالاند و تەکانیدەدا.. تەکانیدەدا و ئارەقیدەکردەوە.. ئارەقیدەکردەوە و سوورهەڵدەگەڕا.. دواتر چوار مناڵی ساوای شەشپەنجە، یەک لە دوای یەک، کە لای ڕوون نەبوو کوڕن، یان کچ و سەرتاپایان بە ماددەیەکی ڕەقی سووروسپیی وەکو نینۆکی بنیادەمی پیر داپۆشرابوون، تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق

دەکەوتنە سەر پلێتەکە و لە ژێریدا مریشکەکان تێکڕا دوقدودووق دودووق.. دوقدووق دوقدووق دەنگیان بەرزدەکردەوە.. هەر ئەوساش لە دەرگای حەوشەدا، کە نەیدەزانی کێبوو بە لەقە دەیخستە سەر گازەرای پشت و بە قەیفەی ڕەش بەرگی تێدەگرت، «ست سامیە»ی بەڕێوەبەر و چوار مامۆستای تری خۆیان، کە هەر یەکەیان چمکێکی تەختەی نووسینەکەی پۆلی یەکیان خستبووە سەر شان و قژیان لە دواوە لە شێوەی دارلاستیک هۆنیبووەوە، دەردەکەوتن و دەهاتنە پێشێ.. «ست سامیە» منالەکانی بە سووکی لەسەر پلێتەکە هەڵدەگرت و دەیخستنە سەر تەختەی نووسینەکەوە، کە ئەوسا لە ژێر تیشکی مانگەکەدا «نار» و «نور»ـەکەی سەری جوانتر دەردەکەوتن و بە ئاسانی دەخوێندرانەوە.. لەوێچ لەوێچ مێخەکی لەناو جانتا سپیەکەی شانی دەردەهێنا و خێرا خێرا بەسەریدادەکردن.. ئەوانیش بە ئەسپایی بۆ دەرەوەیان دەبردن و لە چرکەساتێکدا لەو ناوە وندەبوون.. کە چاوەکانی دەکردەوە و هەر بەو ترسەوە دەیڕوانی، سێبەری «شازە»ی زۆر ڕەشتر بەسەر دیوارەکەوە دەبینی و هەستیشی دەکرد بۆنی مێخەکی لێدێت.. دڵی تێکهەڵدەهات و هێڵنجی دەدا.. بە سستی دەستی لە ژێر لێفەکەدا دەردەهێنا و بە بێزاریەوە پێی دەوت:

ـ سێبەری تۆ بۆنی مێخەکی لێدێت و من خەونی ناخۆش دەبینم.

ئامۆژنی دەنگێکی لە دەمی دەردەچوو و ئەم نەیدەزانی پێکەنینە، یان گریان و ئەوەندەی تر سەغڵەتدەبوو.. ئەم دەستەکانی ڕادەشەقاند و بەحاڵ پێی دەوت:

ـ ئەوە تۆ چییتە، بۆ قسە ناکەیت بۆ..؟! گوێت لێنییە دەڵێم: سێبەری تۆ بۆنی مێخەکی لێدێت و من خەونی ناخۆش دەبینم..؟!

ئەم هەر دەیوت و ئەو هەر وەڵامی نەدەدایەوە، بەڵام سێبەرەکەی بەردەوام و هێواش هێواش دەجووڵایەوە و پێڵووی چاوەکانی ئەمی قورس دەکرد.. بەیانی کە بێداربووەوە و چاوەکانی کردەوە، هەستی بە هیچ ئازارێ نەدەکرد، نە لە قورگی و نە لە هیچ شوێنێکی تری جەستەیدا و سیمای شتەکانیش بەردەوام لەبەر بیناییدا دەجووڵانەوە.. کە قاچەکانیشی هەڵبڕی و لێفەکەی لەسەر خۆی لادا، مێخەکبەندێکی بینی کرابووە ملیەوە و تا سەر ناوکی شۆڕبووبووەوە.. «شازە»،

وەکوو هەموو جارێکی تر، کە هەستی کرد چاکبۆتەوە و تاکەی نەماوە، بردی بۆ حەمامەکە و ڕووتیکردەوە.. کاتێ جلەکانی تەکاندن و بە عەللاگە ڕەشەکەوەی هەڵواسین، کە قولاپەکانی لە شێوەی قاز دروستکرابوون و بە دوو بزماری سپی بە دیوارەوە کوترابوو، دەستەکانی کردە ملیەوە و پێی وت:

ـ دەتشۆم و دەتبەم شرووبت بۆ دەکڕم، باشە ڕۆحەکەی شازە..؟!

ـ بەڵام بایی دوو عانە.

ـ هەرچەندی تۆ حەزبکەیت نەونەوەکەی دڵم.

کەچی کاتێ ئەو لەبەر چاویا خۆی ڕووتکردەوە و مایۆ خوێناویەکەی بینی، قێزی لە شرووب و لە هەموو شتێکی تری سووربا و کردەوە و دڵی تێکهەڵات.. هەرچەند سەیری ناوگەڵی خوێناوییشی دەکرد و لێی ورد دەبووەوە، ئەو جرجە ڕەشە زلەی بیردەکەوتەوە و قاچە گەورەکانی دەهاتنە بەر چاوی، کە جارێکیان بە تەڵە سپیەکەی باپیریەوە بووبوو و جیفلقاوی لە کونی کۆمیەوە دەرهاتبوو، بۆیە ئەوەندەی تر ڕقی لێی هەستا و نەیهێشت لەگەڵ خۆیدا بیشوات.. دەشیزانی ئەو بە هیچ شتێ شێت و هار نابێت، بەوەنەبێت پێی بڵێت، حەزناکات بیشوات و پۆدرەی ناو قووتوە ڕەشەکەی لە گیانی بدات.. سەرەتا ویستی لەگەڵیدا نەچێت بۆ لای کوڕە هیندیەکان و پێشی نەڵێت بۆچی، بەڵام دوایی بیری لەوە کردەوە لەوێ لەبەر چاوی ئەوان پارەکەی لێوەرگرێت و بیخاتە ناو جۆگەلەی قوڕاوە ڕەشەکەوە.. کەچی کاتێ چوون و کوڕەکانیان بینی لەجیاتی شرووب، گەنمەشامییان لەناو لەگەنە گەورە و ڕەشەکان دەفرۆشت و لەوێچ لەوێچ دەیانکردە لوولەکانەوە، جارێکی تر حەزی چووەوە سەر شرووب و پڕ بە دڵ ئارەزووی دەکرد، کاتێ چوونەوە لەگەڵ ئامۆژنیدا بچێتە حەمامەوە و لەجیاتی لیفکە سپیەکە، بە مایۆ خوێناویەکەی بیشوات و ئاوێکی گەرم گەرمیشی پیادا بکات.. هەر لە خۆیەوە و نەیزانی بۆچی بەزەیی پیاداهاتەوە و خەریکبوو دەستکات بە گریان.. هەر ئەو بەزەییەش بوو نەیهێشت عانەکان بخاتە ناو جۆگەلەکەوە و ڕقی هەستێنێت.. لەبەر دڵی ئەویش بوو گەنمەشامیی کڕی و دانە دانە، بەبێ ئەوەی حەزی لێبکات دەیخستە دەمیەوە.. بە نابەدڵی دەیجووی و بە زەحمەت

قووتیدەدا.. لە ڕێگاش «شازە» لوولەی گەنمەشامیەکەی خۆی دایە و پێی وت:

ـ ها دڵە گیان ئەمەی منیش بخۆ، تا شەو خەونی ناخۆش نەبینییت.

لێی وەرگرت و جووت جووت دەیدایە ئەو سەگە ڕەشەی، سووک سووک لە دوای پیاوە هیندیە سپیپۆشەکەی پێشیانەوە ڕێیدەکرد.. سەگەکە بە شێوەیەکی زۆر سەیر، کە ئەم هەر تەنها خۆی دەیزانی بۆچی حەزی لێیدەکرد و لەزەتی لە سەیرکردنی دەبینی، گەنمەشامییەکانی بە زمانە ئێجگار سوورەکەی لەسەر شەقامە تازەقیرتاوەکەدا دەقۆزتنەوە و چڵێسانە سەیری لوولەکەی دەستی ئەمی دەکرد.. ئیتر «نەونەو» کۆڵان کۆڵان دوای دەکەوت و پەیتا پەیتا بۆی هەڵدەدا.. لەوەدەچوو «شازە»یش زانیبێتی کچەکەی ئەوەندە دڵی بەوە خۆشە و حەز و نەشئەی لێدەبینێت، بۆیە پێی نەدەوت بگەڕێتەوە و ئەوە ڕێگای ئەمان نییە.. هەر کاتێکیان زانی گەیشتنە گۆڕەپانێکی فرەوان و هەرچی گەورە و بچووکی «هیندی»ی ئەو «بەغا»یە هەیە لەوێ کۆبووبوونەوە.. تێکڕا گۆرانییان دەوت و بە شێوەی جۆراوجۆر سەمایان دەکرد.. «نەونەو» ، بەبێ ئەوەی ئەوان هەستیان پێی کردبێت و بانگی بکەن، یان پرس بە «شازە» بکات، ئاخۆ ڕازییە و ڕێگای دەدات، لە منداڵەکان نزیککەوتەوە و تێکەڵیانبوو، کە چەند هەنگاوێ لە دووری ئەمان سەمایان دەکرد و دەستی پێکرد.. دوایی کاتێ چوو لە لای «شازە» پشووێ بدات و بزانێ سەماکەی ئەوی بەدڵە، ئەو کردیە باوەشیەوە و توند توند شانەکانی گوشی.. لەپڕ دەستی کرد بە گریان و خەمبارانە پێی وت:

ـ من چی لە تۆ و لەو دڵە هەڵقرچاوەی خۆم بکەم و لە کوێیان بپارێزم لە کوێ..؟!

ئانوسات پیرەمێردێکی کورتەبنەی ڕەشپۆش، بە کڵاوێکی سووری وەکوو قووتووی ڕۆن و گۆچانێکی سپیەوە لێیان نزیککەوتەوە و بە عەرەبییەکی نارێک، کە دواتر «نەونەو» لاسایی دەکردەوە و سەربەقوڕی دەهێنایە پێکەنین، لە «شازە»ی پرسی:

ـ ئەم کچە هی کێیە..؟!

ئەو توندتر «نەوال»ی گوشی بە خۆیەوە و وتی:

ـ هی منە.

پیرەمێرد لە کاتێکدا ئەو دوو نالّە ڕەشەی دەدا بە یەکا و دەنگێکی وەکوو دەنگی پارەی لێ هەڵدەستاندن، کە بە پەتێکی سپی کردبوونیە ملیەوە و لەملا و لەولاوە تا سەر سنگی تووکنی شۆڕبووبوونەوە، پێی وت:

ـ نا.. نا، کچی تۆ نییە.

«شازە» تەریقبووەوە و بە زمانێکی تێکئالاوەوە وتی:

ـ کچی برامە.

ـ کچی براشت نییە.

ـ خوشکەزامە.

ـ خوشکەزاتی چی..؟!

ئەوسا «نەوال»ی لە خۆی دوورخستەوە و بە تووڕەییەوە پێی وت:

ـ پیرەمێردی خەڵەفاو، تۆ بۆ خۆت هەر بلّێی و چەنەبە، کچی خۆمە و شیری مەمکی خۆمی خواردووە.

پیرەمێرد نالّی ئەسپەکانی لە دەمی خۆبەوە نزیککردەوە و پێی وتن:

ـ گوێتان لێبێت ئازیزەکانم دەلّێ کچی خۆمە و شیری مەمکی خۆمی خواردووە..!!

ئینجا دەستی لێبەردان و لەسەر سنگی دایان بە یەکا.. «نەونەو» بێشەرمانە لێی نزیککەوتەوە و هەر دووکیانی بەم دەست و بەو دەستی گرتن.. چەند جارێ بە یەکتری دادان و ڕەنگڕەنگ ڕەڕەنگ.. ڕەنگڕەنگ ڕەڕەنگ، دەنگی لێ بەرزکردنەوە.. سەیرێکی چاوەکانی کرد، کە هەرگیز لە هی بنیادەمی ئاسایی نەدەچوون و بە دەنگەکە تەواو ئەبلەق و سەرسام بووبوون، هەستی بە ترسێکی ناکاو کرد و دلّی داخورپا.. بەبێ ئەوەی چاو لە چاوی بترووکێنێت و دەستی لە نالّەکانیش بەربدات، هەناسەیەکی هەلّکێشا و پێی وت:

ـ ئەمانەم نادەیتێ بۆ خۆم..؟!

ئەو سەرێکی بادا و پێی وت:

ـ ئەمانە نالّی ئەسپی سپین، بە کەلّکی تۆ نایەن.

ـ لەبەرچی.. ؟!

ـ پێت نالێم.

ـ بۆچی.. ؟! تووخوا بۆچی..!!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

«شازە» بە شلەژاویەوە دەستی «نەونەو»ی گرت و پێی وت:

ـ وەرە با بڕۆین ڕۆحەکەی دایە، واز لەم پیرەمێردە خەڵەفاوە بێنە.

هەرکە چەند هەنگاوێ دوورکەوتنەوە و گەیشتنە سەری کۆڵانە تەنگەبەرەکەی لە بلوێری بێشکەی کوڕانە دەچوو، ئەوەی جارێکیان لە ماڵە کوردێکی ناسیاوی «شازە»دا بینیبووی و سەرنجی ڕاکێشابوو، ئەو دەنگی هەڵبڕی و وتی:

ـ بەڵام تۆ دایکی نییت و لە هەموو کەسێکیش چاکتر لە من تێدەگەیت.

«نەونەو» زۆر چاک هەستی بەوەدەکرد و تەواویش تێدەگەیشت، کە ئامۆژنی بە قسەکانی ئەو پیرەمێردە تێکچووە و لە ناخی دڵەوە بریندار بووە، بەڵام هەرچەند پرسیاری لێدەکرد و لێی دەپاڕایەوە مەبەستەکانی پێبڵێت، ئەو لێی تووڕە دەبوو و پێی دەوت:

ـ چەند جارم پێ وتووی هەقت بەسەر ئیشی گەورەوە نەبێت.

کە لە ماڵەوەش قژە درێژەکەی هۆنیەوە و کردی بە چوار پرچی باریکی درێژ، تەواو هەستی کرد شتێ لە ئارادایە و ئەم لێی تێناگات، چونکە ئەو هەر کاتێ خەفەتێکی گەورەی هەبوایە و خۆی لەبەر نەگرتایە، قژی دەکرد بە کەزی و لەچکێکی سپیی دەکردە سەریەوە.. «سیامەند»یش نیوەڕۆ، کە بۆ نانخواردن هاتەوە و ئاوای بینی، وەکوو هەموو جارێ چووە دەرەوە و لەبەر خۆیەوە وتی:

ـ دیسان بەزمەکەیە..!!

ئەو ئێوارەیە وەکوو ئێوارانی پێشوو نەهاتە دەرەوە و بەر دەرگاکەی گسک نەدا، تا چەرمی خۆشکراوی بزنە ڕەشەکە دابخات و بە کراسە سپیەکەیەوە لەگەڵ ژنانی گەڕەک دابنیشێت.. قسەیان بۆ بکات و چاوێکیشی هەر لەسەر «نەونەو» بێت، بۆئەوەی بە هەڵسوکەوتە سەیر سەیرەکانیدا هەڵبدات و خۆیانی پێوە بنوێنێت.. «نەونەو» هەر بە قەستی و بۆئەوەی سەرنجی ڕابکێشێت، گوشە

سپییه هێلڕەشەکەی هێنا و چووە ناوی.. لە پێشا لەناو حەوشە و دواییش لە دەرەوە کەوتە ڕاکردن، بەڵام مەحاڵبوو سەیری بکات و وەکوو ڕۆژان پێی بڵێت:
ـ قەزات لەو دڵە هەڵقرچاوەم کەوێت، تۆ لە هەموو شتێکا بلیمەتی، لە هەموو شتێکا..!!

تەنانەت کاتێ لەبەر دەرگای خۆباندا بە دەما کەوت و هاواری لێ بەرزبووەوە، نەهات هەڵیگرێتەوە و خوێنی دەم و لووتی بسرێت.. بە ئیسپرتۆ بیبرژێنێتەوە و بۆی بگریت.. «بەدریە»ی دراوسێیان هەڵیگرت و هێنایەوە ماڵ.. کە «شازە»ی بینی لە هەیوانەکەدا دانیشتبوو و جووڵەی نەدەکرد، سەرێکی لێ بادا و پێی وت:
ـ هەی قەحپەی گاندەر، منالی خەڵکت هێناوەتە لای خۆت، ئاوا ئاگات لێی دەبێت..؟!

کە ئەو دەنگی نەکرد و خۆی لە هووره نەبرد، «بەدریە»، زیاتر لێی تووڕەبوو و پێی وت:
ـ کچێ هەستە بە فریایکەوە قەحپەی لە قەحپەکەوتوو.. قوزچەقی لەکارکەوتوو.. وادیارە تۆ هەر بۆ ئەوە دەیهێنیتە لای خۆت، تا لای ئەم و ئەو خۆتی پێوە هەڵکێشیت..!!

دوای خۆرئاواش «سیامەند» بە سووکی دەرگای حەوشەی ترازاند و هاتەوە.. هەرکە «نەوال»ی بە دەم و لووتی پڕ لە خوێن و «شازە»ی بینی، لە شوێنی خۆبدا جووڵەی نەکردبوو، لە هەموو شتێ گەیشت و شێت و هاربوو.. بەبێ چەندوچوون دەستی نایە پرچەکانی و لە پەنجەکانی ئاڵاندن.. هەڵیبڕی و چەند جارێ کێشای بە کاشییە خاڵدارەکانی هەیواندا.. بە لەقە تێیکەوت و تۆپەڵێ جنێوی سووکی پێ دا.. کاتێ لەبەر ئاوێنەکەی هەیواندا، کە لە ژێر گڵۆپە شیرییەکەی سەر سەری ڕوونتر دەردەکەوت و «شازە» و «نەونەو»ی جوان تیا دیاربوو، ئاخی هەڵدەکێشا و تۆپەڵە قژەکەی لە پەنجەکانی دەکردەوە.. لێیدەکردەوە و لەبەر خۆیەوە دەیوت:
ـ هەر جارێ لەخەوما بەو کامێرا شوومە وێنەی مانگی چواردەشەوی بگرم، یان بە مەقاشی سپی بیگرم و بیخەمە سەر خەڵووزی ناو مەقەڵیی حەوشەکەی

ماڵی جابرەوە، تووشی دەرد و بەڵایەک دەبم.
دواییش بەبێ ئەوەی سەیری ئەمان بکات و بیاندوێنێت، چوو تاقمی تراشەکەی هێنا و هەر لەبەر ئاوێنەکەدا، وەکوو هەموو شەوێکی تر ڕیش و سمێڵی تاشی.. ئینجا بەو خاولیەی وەکوو شەترەنج وابوو و برادەرێکی جوولەکەی بە دیاریی بۆی هێنابوو، دەمەوچاوی سڕی و چووە دەرەوە.. پێش ئەوەی دەرگاکە بە دوای خۆیدا جووتکات و قاچی بباتە دەرەوە، بە دەنگێ، وەکوو ئەو دەنگەی لە کاتی سەرخۆشییدا گۆرانیی پێ دەوت و «شازە»ی لەگەڵ دەهێنایە گریانی بەکوڵ، وتی:
ـ من وا دەڕۆم و ئەمشەو نایەمەوە.. نامەوێت ئێوە ئاوا کز و خەمناک ببینم و لەوە زیاتر خەفەتتان لێ بخۆم.
«شازە» هەستایەوە و پشتی دایەوە دیوارەکە.. لەچکەکەی کردەوە سەری و چمکەکانی لە ملی گرێ دا.. دەستەکانی خستە سەر ئەژنۆکانی و سەری دانەواند.. دەمی وا داخستبوو و بە شێوەیەک جووڵەی لێبڕیبوو، هەر دەتوت لە هەموو ژیانیدا نەیکردۆتەوە و هیچ قسەیەک، خۆش و ناخۆشی پێنەکردووە.. «نەونەو»یش دوای ئەوەی «بەدریە» لەسەر کورسیە ڕەشەکەی دانابوو و پارچە پەڕۆیەکی سپیی ناو گیرفانی کراسە ڕەشەکەی خۆی دابووە دەستی، تا بە دەم و لووتیەوەی بگرێت و زوو زوو خوێنەکەی پێ بسڕێت، جووڵەی نەدەکرد و بیری لە خەوەکەی دوێنی شەوی و بێدەنگییەکەی ئامۆژنی دەکردەوە.. چەندی بە لاوە سەیربوو ئەو هەموو شەق و زللەیەی خوارد و دەنگی لێوەنەهات..!! چاوەڕێش بوو بە قنگەوە خەوی لێبکەوێت و ئاگای لە دنیا ببڕێت، بۆئەوەی بچێت بە سووکی، بەڵام زۆر بە وریایی پرچەکانی بۆ شیبکاتەوە و بە شانە سپیەکە قژی خاوی دابهێنێت.. زۆر جاری تریش ئاوای کردبوو و کاتێ خەبەری بووبووەوە، بەڵای لێنەمابوو.. هەرکە قژە درێژەکەشی لە دواوە دەهێنایە سەرچاوی و لە کەلێنی تاڵەکانیەوە سەیری ئەمی دەکرد، قاقای لێ دەدا و پێی دەوت:
ـ بە سائەقەت بم نەونەوەکەی خۆم، من تۆم نەبوایە، چییم دەکرد چی..!!
بەڵام ئەو جارە لە هەموو جارانی تر جیابوو و چاوە ڕەشەکانی، کە ئەوسا

هەرچەند سەیری دەکردن و لێیان ورددەبووەوە، شووشەمەرەکەبی سەر تاقی پەنجەرەکەی ژووری «ئەمجەد»ی خاڵی بیردەکەوتەوە و حەزی دەکرد سەری پەنجەکانیان تێبخات، ماندوونەدەبوون و بەسەر یەکتردا نەدەکەوتن.. نەخێر، بەسەر یەکتردا نەدەکەوتن و زەق زەق، وەکوو چاوی ورچە ڕەشە پەڕۆینەکەی، کە لە دوو هەڵماتی گەورەی شووشەی سووری زۆر ناسک درووستکرابوون، دەبریسکانەوە.. هەتا شەویش زیاتر ڕادەشکا و ئەو جووڵەی نەدەکرد، ئەم هەستی بە ترس دەکرد و خەیاڵی سەیر سەیر و ترسناکی بۆ دەهات.. ئەوە یەکەمجاربوو لە ژیانیا بەو ڕادەیە لە «شازە» بترسێت و زیرەی لێبکات.. هەرگیز باوەڕی نەدەکرد بتوانێت ئەو شەوە لە ماڵێکی چۆڵدا بکاتەوە و سەربخاتە سەر سەرین، کە ژنێکی ترسناکی تیابێت و بە بێدەنگییەکەی ڕۆحی ببات.. جار جار لە بیر خۆی دەبردەوە و دڵی بەوە خۆشدەکرد، کە «سیامەند» دەگەڕێتەوە و ناتوانێت ئەو شەوە لە لای برادەرەکانی بە سەرخۆشیی بەسەر بەرێت، لە کاتێکدا ئەم دەم و لووتی پڕیبووە لە خوێن و «شازە»ش ناچێت بە لایەوە.. زانیویەتی نانی نیوەڕۆ و ئێوارەشی نەخواردووە و برسیەتی، پاکەتێ بسکویتی سپیی بۆ دەهێنێت و هەر بە دەستی خۆیشی دانە دانە دەیانخاتە دەمیەوە.. چاوی لە دەرگاکە نەدەترووکاند و چاوەڕێ بوو هەرکە ترازاندی و پەیدابوو، هەستێت و خێرا ڕاکاتە ناو باوەشی... دەرگا تەقەی لێوەهات و ترازا، بەڵام ئەوەی هاتە ژوورەوە و ڕایچڵەکاند، «نەقیب شاسوار»ی برای «شازە» بوو، نەک «سیامەند» و کۆڵێ گەشایەوە.. بە جلێکی سەربازیی سپی و کڵاوێکی ڕەشەوە بەرەو ڕوویان دەهات و ئەبڵەق ئەبڵەق سەیری دەکردن.. «نەونەو» وەکوو هەموو جارێکی تر، ڕایکرد و بەرەو پیریییەوە چوو:

ـ مامە شاسوارم هات..!! مامە شاسوارم هات..!!

کەچی ئەو وەک بڵێیت نەیناسێت و لە ژیانیا نەیدیبێت، نە خۆی تێکەیاند و نە سەیریشی کرد.. «نەونەو» تەریقبووەوە و قوڕگی گیرا.. لچی هەڵهێنایەوە و شەرمیشی کرد بگری.. خێرا خێراش بە تیلەی چاو سەیری دەکرد و لە خۆی دەپرسی: «تۆ بڵێیت خۆی بێت..؟!» هەرگیز باوەڕی نەدەکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو ئاوا خۆی لێ نەناس بکات و دڵی بشکێنێت.. ئاخر ئەو هەر جارێ مۆڵەتی

وەردەگرت و دەهات بۆ لایان، لە پێش خوشکەکەی و زاواکەی، ئەمی دەکردە باوەشی و تێر تێر ماچی دەکرد.. چەناگەی دەخستە ناو قژە ڕەشەکەی و ماوەیەک چاوەکانی بەسەردا دادەخست.. هەڵیدەمژی و بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە پێی دەوت:

ـ من کەی لە بۆنی ئەو قژەی تۆ تێر دەبم..؟! کەی..؟!

هەر جارێ بهاتایە بۆ لایان و شەو بمابوایەتەوە، لای خۆی دەینواند و بە خوشکەکەی دەوت:

ـ ئەوەندەی من لێرەم، تۆ بۆت نییە بە کچی خۆتی بزانییت.

قژی «نەوال»ی دەخسە سەر سەرینەکەی خۆی و تا بەیانی سەری دەخستە سەری.. ئەم هەندێ جار زۆر بێزار دەبوو و خێسەی دەکرد، کە دەیویست خۆی بخاتە سەر لاکەی تری و نەیدەتوانی قژی لە ژێر سەرە زلەکەی ئەودا دەربهێنێت.. بەتایبەتی ئەو شەوانەی بە سەرخۆشیی لەپاڵیا دەخەوت و بە بۆنی بیرە و وێسکیەکەی دەمی هەراسانی دەکرد.. جارێکیان جورئەتی نایە بەر خۆی و لەبەر چاوی خوشکەکەی و زاواکەی پێی وت، کەوا چیتر لای ئەو نانوێت و دەگەڕێتەوە لای مامی و ئامۆژنی، چونکە ناتوانێت خۆی هەڵگێڕ و وەرگێڕ بکات و سەغڵەت دەبێت.. هەستی کرد ئەو زۆری پێناخۆش بوو و کۆڵێکیش تەریقبووەوە.. لەمەوە وازی هێنا و لەجیاتی ئەوە دەیخستە سەر چاوی، بۆئەوەی ئەم هەر کاتێ بیەوێت بە ئاسانی لای بەرێت و خەوی نەزڕێت.. شەوێکیان لەپڕ بێداربووەوە و هەستی کرد وا «شاسوار» دەگریت.. دەگریت و فرمێسکەکانیشی بە قژی ئەم دەسڕێت.. لە پێشدا وایزانی خەونی دیوە و هەرگیز باوەڕی نەدەکرد پیاوێکی کەتە و چوارشانەی وەکوو ئەو بگریت، کەچی دواتر بۆی دەرکەوت خەون نییە و بە ڕاستیی دەگریت.. کاتێ هونەرمەندانە تلێکی دا و خۆی هەڵگێڕایەوە، گوایە خەوتووە و دەنگی هەناسەکانی لەسەر یەک ڕێتم دەردەکرد، بە سووکی دەستی بۆ قژی برد و خستیە نێوان پەنجەکانیەوە.. هەستی کرد وەکوو گەڵای درەختی باخەکەیان کاتێ بە شەونم تەڕدەبوون و لەبەر هەتاودا دەبریسکانەوە، ئاوا تەڕبووە و تاڵەکانی بە یەکەوە لکاون.. موچوڕکی پیادادەهات و لە دڵی خۆیدا دەیوت: «قژم بە فرمێسکی پیاو تەڕبووە و چاوەکانم بۆ هەڵنایەن».. ئەو هەموو جارێ بۆ

گاڵتە و بۆئەوەی «نەوال» بهێنێتە پێکەنین، دەگریا و بە ڕاستییش فرمێسکی لە چاوەکانی دەهێنایە خوارەوە.. بەتایبەتی ئەو جارانەی «نەونەو» گازی لە قۆڵی دەگرت و جێی دانەکانی لەسەر دەردەکرد.. ئەم هەرچەند ئەو هێڵ و هێڵکارییەی بەسەر دەستییەوە دەبینی و سەرنجی لێ دەدان، کە بە ڕەنگی سوور کرابوون و لە شرووبی منالە چەقاوەسووەکانی گەڕەکی «حەیدەرخانە» و «بابلشێخ» دەچوون، حەزی دەکرد گازی لێبگرێت و لێی بکاتەوە.. هەموو جارێ دەستی دەخستە سەری و لێی دەپرسی:

ـ ئەمە بە چی نووسیوتە..؟!

کە ئەو پێی دەوت شیری ژنێکی هیندی و تۆزی ڕەشی ژێر مەنجەڵی فافۆنی سپیی تێکەڵکردووە و بە دەرزییەکی سەرڕەش کوتیویەتی، ئەم وایدەزانی گاڵتەی لەگەڵدا دەکات و باوەڕی پێی نەدەکرد.. باوەڕی نەدەکرد لە ڕەنگی ڕەش و سپیدا ئەو ڕەنگە سوورە جوانە پەیدا بێت و ئاوا دڵگیریش خۆی بنوێنێت، کە هەر جارێ دەیبینی و سەرنجی لێ دەدا، دەمی ئاوی دەکرد و گیانی بە ژێر لەزەتا دەکەوت.. هەندێ جار دەچوو چمکی خاولیە سپیەکەی تەڕدەکرد و پیایدا دەهێنا.. ئەو لە پێکەنینا دەکەوتە سەر پشت و بە شێوەیەکی زۆر خۆش پێی دەوت:

ـ ئەوە تۆ چی دەکەیت نەونەوە مەیموون..؟!

ـ دەیکوژێنمەوە.

جارێکیان بە گاڵتە و بە دەستی چەپی زللەیەکی زۆر سووکی لە ڕوومەتی ڕاستی دا و پێی وت:

ـ ئەمە تەنها بە یەک شت دەکوژێتەوە.

ـ بە چی..؟!

قاقایەکی بەرزی لێ دا و پێی وت:

ـ بە مردن.

ـ بەڵام مامە شاسوار، خۆ من تۆم خۆشدەوێت، حەزناکەم بمریت.

ـ بۆچی شتەپیس تۆش دەزانی مردن چییە..؟!

ـ ئەی چۆن نازانم، خۆ من گەورەم، ئەمساڵ، کە هاوین تەواوبێت، وەکوو

فەریال دەچم بۆ قوتابخانە.

ـ دەی باشە نەونەو مردن چییە..؟!

ـ نازانم.. بەڵام خەڵک، کە دەمرن ڕەنگیان کاڵدەبێتەوە.

ـ ڕەنگیان کاڵدەبێتەوە..؟! کچێ تۆ ئەو قسانە لە کوێ دەهێنیت جنۆکە..؟! باشە ڕەنگی من چۆنە..؟!

ـ تۆ گیانت ڕەشە و سەرت سپییە.

ئەو لەبەر پێکەنین خۆی بۆ دابین نەدەکرا و هەناسەی تەنگببوو.. هەستایەوە و تاکێکی پەنجەرە سپیەکەی کردەوە.. سەیرێکی زۆر سەیری چاوەکانی ئەمی کرد و بە گاڵتە پێی وت:

ـ تۆ نابێت ئەمساڵیش بچیت بۆ قوتابخانە..!!

ـ بۆچی مامە شاسوار..؟! ئەی نابم بە شەش ساڵ..؟!

ـ ئاخر تۆ جارێ ماوتە.. هێشتا فێرنەبوویت ڕەنگەکان لە یەکتر جیابکەیتەوە.. ئەوەتا من خۆم گیانم چەند بڵێیت سپی و سەرم چەند بڵێیت ڕەشە، کەچی تۆ لێت گۆڕاون.

کە «نەوال» هیچی نەوت و سەری لەبەر نا، ئەو وەک بیەوێت زیاتر بیدوێنێت و بۆ خۆی هەندێکی تر پێبکەنێت، لێی چووە پێشێ و لێی پرسی:

ـ نەونەو گیان، تۆ بۆچی وادەزانیت من گیانم ڕەش و سەرم سپییە..؟!

ـ ئەی ئەوە نییە جلەکانت سپین و کڵاوەکەت ڕەشە..؟!

ـ جا ئەمە یانی چی..؟!

ـ نازانم.

ـ ئەی من ئەگەر بمرم چۆن ڕەنگم کاڵدەبێتەوە..؟!

ـ نازانم.. بەڵام پیاوێکی تر ئەگەر جلێکی ڕەشی لەبەر و کڵاوێکی سپی لەسەربێت، دەتوانێت ڕەنگی تۆ کاڵبکاتەوە.

ـ ئەی من دەتوانم ڕەنگی کێ کاڵبکەمەوە..؟!

ـ تۆش دەتوانیت ڕەنگی کەسێکی جلڕەش و کڵاوسپی کاڵبکەیتەوە.

ـ جا ئەڵبەتە ئەو کەسە جلڕەش و کڵاوسپییە، خۆی گیانی سپی و سەری ڕەشە،

وانییه..؟!

ـ ئەها تۆش فێربوویت..!!

ـ لەو فێربوونە..!! ئەی پێم بڵێ تۆ کامیان بە چاکتر دەزانیت..؟!

ـ نازانم، بەڵام من تۆم خۆشدەوێت.

ـ باشە باوکت ڕەنگی چۆنە..؟!

ـ چووزانم، خۆ باوکم سەرباز نییە..!!

ـ ئەی کێ دەتوانێت ڕەنگی ئەو کاڵبکاتەوە..؟! من، یان پیاوێکی جلڕەش و کڵاوسپی..؟!

ـ هەر دووکتان.

«شاسوار» دەستی چەپی لە چاوەکانی ئەم نزیککردەوە و بە دەنگێکی سەیر لێی پرسی:

ـ ئەم سوورەش ڕەشە..؟!

ـ ئا، بەڵام زۆر جوانە، لە شرووب دەچێت.

ـ بۆبە ئاوا گازی لێدەگریت..؟!

ـ تووخوا مامە شاسوار پێم دەڵێیت چییت لەسەری نووسیوە..؟!

ـ کە چوویت بۆ قوتابخانە و فێری خوێندنەوە بوویت دەیزانیت.

«نەوال»، کە چوو بۆ قوتابخانە و پیتەکانی ناسی، حەزی دەکرد «شاسوار» ببینێت و نووسینی سەر دەستی بخوێنێتەوە، چونکە لێی بووبوو بە مەراق، بەتایبەتی، کە هەر جارێ بە «سیامەند» و «شازێ»ی دەوت پێی بڵێن و ئەوان لێی تووڕەدەبوون.. سەرزەنشتیان دەکرد و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر پێیان دەوت:

ـ تۆ هەقت بەسەر هەموو شتێکەوە نەبێت.

بۆ نەگبەتییش لەو جارەوە، کە «شاسوار» کردبووی بە شەڕ لەگەڵیان و لە هەیوانەکەی خۆباندا سەری «سیامەند»ی شکاند.. بە لەقە کەوتە گیانی خوشکەکەی و دەم و لووتی پڕکرد لە خوێن؛ نەدەهات بۆ لایان و نەیدەبینی.. نەیدەتوانی بە تەنیا بچێت بۆماڵەکەی و لاشی ڕوون نەبوو کەی لەوێیە.. ئەو نە

ژنی هەبوو، نە منالّ و بە تاقی تەنیا لەو خانووە دوو ژوورییەدا دەژیا، کە لە باوکییەوە بۆی مابووەوە و سوێندی خواردبوو تا لە ژیاندا مابێت بەجێینەهێڵێت..

«نەوال» هەر جارێ لەگەڵ «شازە»دا دەچوو بۆ لای و ماڵەکەیان بۆ ڕێکدەخستەوە، لە هەموو شتێ زیاتر سەیری ئەو ئەسپە سپییەی دەکرد و زۆر بە دیقەت سەرنجی لێی دەدا، کە بە زەنگیانەی ورد ورد دروستیکردبوو و بە پەتێکی ڕەش ڕەش بە بنمیچی سپیی کەمێ بەرزی ژووری دانیشتنەکەیەوە شۆڕیکردبووەوە.. ئەم تەواو سەری لەو چەپکە قژە ڕەش و درێژە کچانەیە سوڕدەما و خەیاڵی سەیر سەیری بۆ دەهات، کە لە قژی خۆی دەچوو و کرابووە کلکی ئەسپەکە.. هەرچەند پرسیاریشی لێدەکرد و پێی دەوت:

ـ مامە شاسوار ئەمە قژی کێیە تۆ کردووتە بە کلکی ئەم ئەسپە..؟!

ئەو سەیرێکی چاوەکانی دەکرد و پێی دەوت:

ـ نابێت پرسیاری ئاوام لێبکەیت، ئەگینا لێت تووڕە دەبم.

هەر جارێ «شازە»شی بە گیر دەهێنا و پێی دەوت، نهێنیی کلکی ئەو ئەسپە چییە و بۆچی لێی دەشارنەوە، ئەو خۆی لێ گێلدەکرد و وەڵامی نەدەدایەوە.. ئەم لە هەموو کەسێ چاکتر لە «شازە» دەگەیشت و دەیتوانی ناخی دڵی بخوێنێتەوە، بۆیە هەر کاتێ ئەفەرۆزی بکردایە و گوێچکەی خۆی لە پرسیارەکانی کەڕبکردایە، یان لێی تووڕەبوایە و لە کۆڵ خۆی بکردایەتەوە، دەیزانی نهێنییەک لەو پرسیارەدا هەیە و ئەوەندەی تر لێی دەبوو بە مەراق.. ئەو جارە پێڵاوە سپییەکانی لە پێکرد و پێی وت:

ـ من تۆم خۆشناوێت و ئیتر نایەم بۆ لات، بۆچی پێم ناڵێیت چی لەسەر دەستی مامە شاسوارم نووسراوە..؟!

ـ بە قوربانی چاوەکانت بم تۆ هەقی ئەوت نەبێت.. بە چاوی خۆت نەتبینی چۆن لە ئێمەی دا..؟! ئیتر بەسە بیر خۆتی بەرەوە.

بەڵام نەیدەتوانی ئاوا بە ئاسانی لە بیر خۆی بەرێتەوە و لە خەیاڵیا دەریکات.. هەر زوو زوو دەگریا و لێیان دەپاڕایەوە، کە بچن ئاشتیبکەنەوە و پێی بڵێن «نەونەو» بیری دەکات.. نیوەڕۆیەکی بەهار، کاتێ «سیامەند» لە

قوتابخانه هێنایەوە و بۆ ماڵی بردەوە، «شاسوار»ی بینی بە دەستێ بیجامەی ڕەشی سادەوە لەسەر کورسیە سپیەکەی هەیواندا دانیشتبوو و بە لەفافێکی سپی دەستی چەپی تا ئانیشک پێچرابوو.. لە خۆشیا دەمی داپچڕی و جانتا ڕەشەکەی فڕێ دا، کە «شازەمان» بۆی کڕیبوو و وێنەی قازێکی سپیی بەسەرەوەبوو.. باڵەکانی کردەوە و بەرەو باوەشی چوو، بەڵام «شازە» گرتی و پێی وت:

ـ نابێت بچیتە باوەشیەوە، چونکە دەستی بریندارە و ناتوانێت هەڵتگرێت.. هەر ئەوەندە بە سووکی ماچێکی ڕوومەتی بکە و تەواو.

ئیتر ئەم تەریقبووەوە و سوورهەڵگەڕا.. دڵی پڕبوو و لچی هەڵهێنایەوە.. هەر ئەوەندە ئەو دەستە ساغەکەی بۆ درێژکرد و پێی وت:

ـ وەرە دڵەکەی مامە شاسوار، تۆ هەقی شازەت نەبێت.

ئەم دایە پرمەی گریان و بە هیچ کلۆجێ بۆیان ژیرنەدەبووەوە.. «شاسوار» هەستا و هێنایە لای خۆیەوە.. بە دەستی ڕاستی هەڵیبڕی و خستیە سەر ڕانی چەپی:

ـ تۆ ئیتر چوویت بۆ قوتابخانە و گەورەبوویت، نابێت بگریت.

حەزی دەکرد سەیری چاوە ئێجگار ڕەش و گەورەکانی بکات و پێی بڵێت، کەوا هەموو پیتەکان دەناسێت و دەتوانێت نووسینی سەر دەستی ئەویش بخوێنێتەوە، بەڵام شەرمی دەکرد و سەری خۆی دادەخست.. بیریشی لەوە دەکردەوە ئاخۆ بە چی بریندارببوە و کەی چاکدەبێتەوە..؟! لەوە دەترسا پێستی سەر نووسینەکەی داماڵابێت و سڕابێتەوە، یان شێوابێت و نەتوانێت بیخوێنێتەوە.. ئەوسا چەند ڕقی لە «شازە» دەبووەوە و بە دەستی بوایە تا تینی تیایە قژی ڕابکێشێت، کە ئاوا تەریقیکردەوە و نەیهێشت بەکامی دڵ قسەی لەگەڵدا بکات.. «سیامەند» ویستی شەرمی بشکێنێت و بیهێنێتە قسە، بۆیە بەدەم پێکەنینەوە سەیری ئەمی کرد و بە «شاسوار»ی وت:

ـ کچمان لەوەتەی دەچێت بۆ قوتابخانە، قسەکانی ئەوەندەی تر زل بوون و بە گوێچکەمانەوە ناچن.

ـ ئەی کوا..؟! من هیچم نەبیست..!!

«شازە» جانتاکەی لە لای دەرگای حەوشە هێنایەوە و پێی وت:
ـ نەونەو گیان لاسایی ئەو منالّە نەوسنانەی بۆ بکەرەوە، کە کاتی نانخواردن دەچن بۆ مالّان.. برسیانە و شەرمیش دەکەن نان بخۆن.
کە ئەم سەری هەلّنەبڕی و هیچی نەوت، ئەو دەستی چەپی خستە سەر شانی ڕاستی براکەی و پێی وت:
ـ کاکە شاسوار ئەگەر دەیبینیت چۆن سەری دادەخات و یاریی بە نینۆکەکانی دەکات.. دواییش بە سووکی و بە شەرمەوە سەرهەلّدەبڕێت و لیکی ناو دەمی هەلّدەلووشێتەوە، هەر قەستدەکەیت بیخۆیت و وەکوو نوقلّ قووتی بدەیت، ئەوەندە جوانی دەکات..!!
ـ جا خۆ خۆبشی کەم نەوسن نییە.
هاوکات سەیرێکی چاوەکانی ئەمی کرد و بە پێکەنینەوە لێی پرسی:
ـ ئێستاش وەکوو جاران نەوسنیت..؟!
بە تەواوی لە مەبەستی «شاسوار» گەیشت و زانی بۆچی وای پێ دەلّێت، کەچی وا کەوتبوو بە شەرما، نەیدەتوانی دەمی هەلّێنێتەوە و هیچ شتێکی پێ بلّێت.. «شاسوار» بە سووکی دەستی ڕاستی بە قژیدا هێنا و بە پێکەنینەوە بە خوشکەکەی وت:
ـ ئەو قاپەی ماوە، کە بنکەکەی وێنەی گۆرانیبێژە ڕەشپۆشەکەی لەسەر کێشراوە..؟!
ـ ئەی چۆن نەیماوە..!! دەیبینی چۆن بۆی لەگەلّ جیهازی بووکێنیەکەشی دادەنێم.
«شاسوار» بە پەنجەی دۆشاومژەی چەناگە بچکۆلەکەی بەرزکردەوە و بە گالّتە لێی پرسی:
ـ شوو دەکەیت..؟
«شازە» هەموو جارێ دایدەنا و بە دزیەوە فێریدەکرد، بە براکەی بلّێت بۆچی ژن ناهێنێت و پێشی نەلّێت ئەو فێری کردووە.. ئەوسا «شاسوار» دەیکردە باوەشیەوە و سەیری چاوەکانی دەکرد.. دەستەکانی بە ڕوومەتەکانیدا دەهێنا و

پێی دەوت:

ـ چاوەڕێ دەکەم تۆ گەورەبیت و بۆم دەستنیشان بکەیت.. حەز دەکەم کەسێ بهێنم، تۆی لە هەموو کەسێ خۆشتربوێت و هەر لە تۆش بچێت.

ـ لە من بچێت..؟!

ـ ئا، لە تۆ بچێت، بەتایبەتی قژی.

ئینجا سەری «نەونەو»ی توند توند دەنووساند بە سنگی خۆیەوە و بە گاڵتە لێی دەپرسی:

ـ ئەی تۆ شوو ناکەیت..؟!

ئەم پێدەکەنی و دەیوت:

ـ من منالم.

«نەونەو» کاتێ ئەو قسانەی لەگەڵ «شاسوار»دا دەکرد و لە چاوەکانی ڕادەما، هەر لە خۆیەوە و نەیدەزانی بۆچی، موچڕکی پیادا دەهات و هەستی بە خۆشیەک دەکرد، کە لە هیچ حاڵەتێکی تردا هەستی پێنەکردبوو و ئاوا دەمارەکانی نەکەوتبوونە کرتەکرت.. هەر ئەو خۆشیی و لەزەتەش وایلێدەکرد، زوو زوو، بەبێ ئەوەی شەرم بکات، ئەو پرسیارەی لێبکات و لێبکاتەوە.. هەستی دەکرد ئەویش پێیخۆشە و لە وەڵامدانەوەی بێ تاقەت نابێت.. هەر ئەوسا توندتر دەستەکانی لە ملی دەئاڵاند و لە باوەشیا متەقی لە خۆی دەبڕی.. دواییش ماچی قووڵ قووڵی ڕوومەت و لامله لووس و سپیەکەی دەکرد و بە دەستی بوایە دەمی لەسەر هەڵنەدەگرتن.. ئەو جارەی دایکیشی لە حەمامەکەی خۆیاندا دەیشت و بە جامە ڕەشەکە ئاوی گەرمی ناو سەتڵە سپیەکەی پیادا دەکرد، هەر لە خۆیەوە هەستایەوە سەر پێ و بە دەنگێکی بەرز وتی:

ـ ماچی کەس ناگات بە ماچی مامە شاسوارم.

دایکی لە پێشدا حەپەسا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیری چاوەکانی کرد، کە لەبەر پاشماوەی کەفاوەکە بەحاڵ دەکرانەوە و ئەویان وەکوو چەند بێژنگێکی لەسەر یەکتر کەڵەکەکراو دەبینی.. دواییش تا تینی تیابوو پەنجەکانی لە قژە تەڕەکەی ئاڵاند و سەری کێشا بە دیوارەکەدا.. لەقەیەکی لە پشتی دا و پێی وت:

ـ پیسی بۆگەن، چی لەم کاتەیا ئەوی بیری تۆ ختستەوە..؟!

زۆر سەیری لێهات و تەواو واقیوڕما، کە دایکی لەسەر قسەیەکی ئاوا لێی توورەبوو و لێی دا.. لەوەش سەیرتر ئەوەبوو کاتێ بەو خاولیە ڕەشوسپییە تووکنەی لە شێوەی پڵنگ دروستکرابوو و تازە لە قەیسەریە تاریکەکەدا بۆی کڕیبوو، وشکیدەکردەوە و بە چمکەکانی پاشماوەی کەفاوی ناو گوێچکەی دەسڕی، لەپڕ دەستی کرد بە گریان و سەری نووساند بە مەمکەکانیەوە، کە لە یەخەی ئەتەگە ڕەشەکەیدا دەرکەوتبوون و وەکوو دوو قالب حەڵوای سپی دەهاتنە بەر چاوی.. ئەو حەڵوایانەی زۆر جار لە خەوندا دەیبینین فریشتە ڕەشپۆش و سپیپۆشەکان لە پاشماوەی هەورە تەنک و شێدارەکان دروستیان دەکردن و بەسەر مناڵاندا دایاندەباراندن.. بە سەیرکردنیان ئاو دەزایە دەمیەوە و چاوی لێیان نەدەترووکاند.. ئارەزووی دەکرد گازی سووک سووکیان لێبگرێت و زۆر زۆر بە حەزەوە بیانخوات.. بۆ بەیانیەکەشی «فەریال»ی خوشکی لە ڕێگەی قوتابخانەدا دەستی چەپی کردە ملیەوە و پێی وت، کەوا شەو لە خەودا وڕێنەی کردووە و وتوویەتی:

ـ من دەستی مامە شاسوارمم خۆشدەوێت.

ئاخر خەونی پێوە دیبوو و لە خەونیدا خۆی و «عەمار» لە ئەمارە گەورەکەی باوکیدا بە جووتە یاریبیان بە سەنووقە چاکان دەکرد.. خێرا خێرا سەریان هەڵدەپچڕین و چنگ چنگ دەیانکرد بەسەر یەکترا.. هەر ئەوەندەی زانی لە یەکێ لە سەنووقەکاندا شتێکی نەرمۆڵەی بە دەستەوە هات و تەزووێکی زۆر سەیر بە هەموو گیانیدا هات.. کە هەڵیبڕی و تەکاندی.. سەیری کرد و چاک لێی وردبووەوە، دەستێکی سپی و چەند بڵێی جوان بوو.. هەڵیگێڕایەوە و هێڵکاریە سوورەکەی بەسەرەوە بینی.. دڵی داخورپا و هاواری کرد:

ـ ئەمە دەستی مامە شاسوارمە.

«عەمار» لێی وەرگرت و پێی وت:

ـ ناوی تۆی لەسەر نووسراوە.

لێی وەرگرتەوە و بە سنگی خۆیەوە نا.. زوو زوو ماچی دەکرد و بە دەنگی

بەرز بەرز دەیوت:

ـ من دەستی مامە شاسوارمم خۆشدەوێت.

ئەو نیوەڕۆیەش وەکوو زۆر نیوەڕۆی تر، «شازە» لە قوتابخانەوە بردی بۆ دووکانی باوکی و خۆیشی لەوێوە چوو بۆ خەستەخانە.. باوکی بە قاتێکی ڕەشەوە، کز و خەمناک لەسەر کورسیە سپیەکەی پشت مێزە ڕەشەکە دانیشتبوو و بێزارانە یاریی بە تەزبێحە خاڵدارەکەی دەستی ڕاستی دەکرد، کە دیاریی پیاوێکی کەرکووکی بوو و لە ژێر تیشکی رووناکییدا دەدرەوشایەوە.. بە سستی سەری هەڵبڕی و بە «شازە»ی وت:

ـ خۆزگە ئەمڕۆ نەتهێنایە.

«شازە» لە کاتێکدا جانتا ڕەشەکەی دەکردە شانی ڕاستیەوە و دەیویست بڕوات، ماچی ڕوومەتی چەپی «نەونەو»ی کرد و پێی وت:

ـ بۆیە هێنام، چونکە سوعاد کەمێ بێتاقەتە و دیسان سەریەشەکەی بۆ هاتۆتەوە.. لە قوتابخانەش چوار ڕۆژ مۆڵەتیان داوەتێ.

«نەونەو» وایدەزانی ئەگەر لای باوکی دانیشێت و خەونەکەی بۆ بگێڕێتەوە، ئەو هاوار لە شاگردەکانی دەکات و پێیان دەڵێت، خێرا سەری سەنووقەکان هەڵپچڕن و لێی بگەڕێن، چونکە وا چووبووە ئەقڵیەوە بە ڕاستیی لە یەکێ لەو سەنووقانەدایە و دەتوانن بیدۆزنەوە، کەچی هەر ئەوەندە لێی نزیککەوتەوە و پێی وت، ئەو ڕەنگوڕووی تەواو گۆڕا و بە جارێ شڵەژا.. ئەمی بە تاقی تەنیا لە دووکان بەجێهێشت و ڕایکردە دەرەوە.. هەر کاتێکی زانی بە هەڵەداوان هاتەوە و «شەمرووخ»یشی لەگەڵدابوو.. دوای ئەوانیش حەماڵە ڕەشپۆشەکانی «شەمرووخ» بە عەرەبانەکانیانەوە دەرکەوتن و خێرا خێرا بەرەو ئەمارەکە چوون.. گورج گورج سەنووقە سپیەکانیان دەهێنایە دەرێ و ئازا ئازا دەیانخستنە سەر عەرەبانە ڕەشەکانیان.. لەسەر یەکتر کەڵەکەیاندەکردن و لە چاوترووکانێکدا دەیانگوێزانەوە.. تا درەنگ درەنگ خەریکبوون و تاقە سەنووقێکیان لەو ئەمارەدا نەهێشت.. ئێوارەش باوکی و «میقداد شەکرچی»ی شەریکی لێیان بوو بە شەڕ و تێر قسەی ناشیرینیان بە یەکتر وت، لەسەر ئەوەی ئەم بەبێ پرسی ئەو و زۆر بە

هەرزان فـرۆشـتـوونی و زیانـێکی زۆریان لـێکەوتبـوو.. «مـیـقـداد» هەر زوو زوو دەنگی بەسەردا هەڵدەبڕی و پێی دەوت:

ـ تۆ شێت بوویت جابر، ئاخر کەس بەم پارەیە چای فرۆشتووە..؟!

ئەو پەیتـا پەیتـا بە دەسرە سپـیـەکەی ئارەقی دەمـوچاوی دەسڕی و هێـواش هێواش پێی دەوت:

ـ ئێستا مەیکە بە قڕەقڕ و ناخۆشی، هەڵەی منە و خۆشم دەچمە ژێری.. دوا عانەیت بۆ دەبژێرم و هیچم لەگەڵ مەڵێ.

پێش خـۆرئاوا و بەرەبەری داخـسـتنی دەرگـای دووکـانەکـان، «نەونەو» و «عەمار» لەسەر مێزە ڕەشوسپیەکەی ئەوان، کە لە ساجێکی نایاب درووستکرابوو و وێنەی «خوداداد»ی باپیری لە لای پێشـەوەی درابوو، شـێـروخـەتیـان دەکـرد و هەموو جارێ هەر لێی دەبردەوە.. «عەمار» گووپی ڕاستی پڕدەکرد و ئەم بە دەستی چەپی لێی دەدا.. لێی دەدا و پێی دەوت:

ـ وێنەی ناڵی ئەسپی سپی لەسەر ڕوومەتت دەکێشم.

ئەمە لە «عەمار»ـەوە فێرببوو ئاوا بڵێت و ئەم گاڵتەیەی لەگەڵدا بکات.. ئەو هەر جارێ لێی دەبردەوە و بە دەستی راستی لە ڕوومەتی چەپی ئەمی دەدا، جێی پەنجەکانی سوور سوور هەڵدەگەڕان و پێی دەوت:

ـ وێنەی ناڵی ئەسپی ڕەش لەسەر ڕوومەتت دەکێشم.

«عەمار» عانەکەی خستە گیرفانی ڕاستی پانتۆڵە ڕەشەکەی و بە سووکی پێی وت:

ـ ئیتر یاریی ناکەین، چونکە تۆ ئەوەندە بە ڕوومەتی مندا بکێشیت، دەستت دەیەشێت.. ئەها چۆن سوورهەڵگەڕاوە..!!

ئەم سەیری ناو لەپی خۆی کرد و لێی پرسی:

ـ نازانی باوکم بۆچی سەنووقی چاکانی بە شەمرووخ فرۆشت..؟!

ـ نازانم، بەڵام باوکت ئەمڕۆ زۆر توورەیە و کەس خۆشی ناوێت.

ـ من پێت بڵێم بۆچی..؟!

ـ ئادەی بۆچی..؟!

ـ چونکە دەستی مامە شاسوارم لە یەکێ لە سەنووقەکاندابوو.
ـ مامە شاسوار کێیە..؟!
ـ برای شازەی ئامۆژنم.. نایناسیت..؟!
ـ هەر پوورە شازە دەناسم.. خۆشیشمناوێت، چونکە دەستی زۆر قورسە.. ئەو جارە کە دەرزیی لێدام زۆر ئازاری پێگەیاندم.
ـ بەڵام دەستی مامە شاسوارم زۆر جوانە.
ـ تۆ نابێت ئەم قسانە بکەیت.
ـ بۆچی..؟!
ـ چونکە دایک و باوکت لێیاندەبێت بە شەڕ.
ـ بۆچی لێیاندەبێت بە شەڕ..؟!
ـ پێت ناڵێم.
ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!
ـ مەپرسە..!! تووخوا مەپرسە..!!
ـ خۆ مامە شاسوارم ناوی منی لەسەر دەستی خۆی نووسیوە..!!
ـ وانییە.. وانییە.
ـ تۆ چووزانی خۆ نەتدیوە..؟!
ـ کەس ناوی تۆ لەسەر دەستی خۆی نانووسێت.
وەکوو سەرەژنی عەیار چەمۆڵەیەکی لێ نا و پێی وت:
ـ تۆ هەر قسەی ناخۆش دەکەیت.
لەسەر ئەم چەمۆڵەلێنانە «سیامەند» هەمیشە لێی تووڕەدەبوو و سەرزەنشتی دەکرد.. ئەو جارەش کە لەبەر دەرگا، چەمۆڵەی لە «ئەدیب»ی کوڕی «بەدری»ی دراوسێیان نا و ئەو بینی، دەستی گرت و بایدا.. پاڵێکی قایمی پێوەنا و پێی وت:
ـ خوام لەو خوایەیە جارێکی تر چەمۆڵە لە خەڵک دەنێیت، دەبێت ئەم دەستانەت لە بنا بۆ ببڕمەوە.
دەستی کرد بە گریان و بە لەقە دەرگاکەی کردەوە.. «شازە»ی بینی جلە

سپیەکانی «شاسوار»ی لەسەر تەنافە ڕەشەکەدا هەڵدەخست و لەبەر خۆیەوە گۆرانیی دەوت.. بە چوار جلگرەی ڕەش گیری کردن و پێی وت:

ـ چیرۆکی ئەو کچە ڕەشپۆشەت بیرچووەوە، کە هەر چەمۆڵەی لە خەڵک دەنا، تا ڕۆژێ بوو بە مارمێلکەی سپی..؟!

«شاسوار» بە بلووز و پانتۆڵێکی ڕەشی سادەوە لە ژوورەوە هاتەدەرێ و وتی:

ـ بەڵام شازە، نەونەو دەبێت بە ورچی ڕەش، نابێت بە مارمێلکەی سپی.

کە لێشی نزیککەوتەوە و لە دواوە دەستی کردە ملیەوە، قاقایەکی لێ دا و وتی:

ـ ئینجا پەتێکی سپیی دەکەینە لووتیەوە و لەسەر دوو قاچ ڕایدەگرین.. ئێمە فیکەی بۆ لێدەدەین و ئەویش بە دەستەکانی چەمۆڵەمان لێدەنێت.

ئەم مەکربازانە دەستی «شاسوار»ی گرت و گازێکی قایمی لە هێلکاریە سوورەکەی گرت.. «شاسوار» دەستی ڕاکێشایەوە و پیشانی «شازە»ی دا.. بە پەنجەی دۆشاومژەی دەستەکەی تری ئاماژەی بۆ شوێنی دانەکانی کرد و پێی وت:

ـ ئەها سەیریکە..!! قسەکەم ڕاستە، یان نا..؟! وەکوو ورچی مێ حەزی لە گۆشتی پیاوە.

«نەوال» سەری هەڵبڕی و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ مامە شاسوار ورچی مێ حەزی لە گۆشتی پیاوە..؟!

ـ ئەی ئەوە نییە تۆ گۆشتی دەستی من دەخۆیت..؟!

ـ جا من ورچم..؟!

ـ ئەی ورچ نییت، چییت..؟! مەیموونیت..؟!

ـ من نەوالم.

ـ ئەی تۆوی ناوی نەوالیش ببڕێتەوە لە دنیایا، مادام تۆ ئەوەندەی پێوە دەنازیت..!!

لەمەوە «شاسوار»، هەرچەند بیویستایە گاڵتەی لەگەڵدا بکات و دەمی بکاتەوە، بە «ورچە ڕەشەکە» بانگی دەکرد و ئەمیش بە نازێکی زۆر جوان، کە چەند بڵێیت هەستبزوێن بوو و هەر لە خۆی دەهات، دەستی ئەوی دەخستە نێوان

دانەکانیەوە و گازی لێدەگرت.. لەپڕ دەمی لەسەر هەڵدەگرت و پێی دەوت:

ـ ئیتر وام پێ نەڵێیت، ئەگینا دەستت لێدەکەمەوە.

ئەو ڕۆژە «شاسوار» چەند ڕایتەکاند و پێی وت:

ـ ورچە ڕەشەکە بۆچی ئاوا بێ دەنگ بوویت..؟! دە شتێ بڵێ دەی، دڵم تەقی.

ئەم دەنگی نەدەکرد و سەری هەڵنەدەبڕی.. دواییش لە قسەی زۆر ئاسایی زیاتر، ئەویش بە شەرمە، هیچی تری لەگەڵدا نەدەوتن و حەزیشی نەدەکرد چارەی «شازە» بە هیچ شێوەیەک ببینێت.. دوای نانخواردنی نیوەڕۆ کاتێ «سیامەند» و «شاسوار» بە جووتە چوونە دەرێ و ئەو پێی وت:

ـ تۆ بۆ لەگەڵیان ناچیت نەوال..؟!

ئەم بە ڕقەوە سەیری کرد و پێی وت:

ـ تۆ قسە مەکە، حەزم لە دەنگت نییە.

شەویش بەبێ ئەوەی، تا تەواو کفتدەبێت و چاوی دەچێتە خەو، یاریی بە تووکە ڕەشەکانی سنگی «شاسوار» بکات و پرسیاری سەیر سەیری لێبکات، لە باوەشیا خۆی گرمۆڵەکرد و خواخوای بوو خەوی لێبکەوێت.. بەڵام بە پێچەوانەوە خەوی لێ نەدەکەت و بە دەنگی نارۆشنی «شازە» و «سیامەند»یش ئەوەندەی تر سەغڵەتدەبوو، کە لە ژوورەکەی ئەودیو بە جووتە پاڵکەوتبوون و نەیدەزانی باسی چی دەکەن.. هەر جارێ قاقاشیان لێ دەدا و لە ژوورەکەدا دەنگیدەدایەوە، ئەم کونی گوێچکەکانی توند توند دەگرت و لە دڵی خۆیدا جنێوی سووک سووکی پێدەدان.. لە داخا قژەکەی لەسەر چاوی «شاسوار» لابرد و ڕوویکردە ئەولاوە.. بەیانی کە بێداربووەوە و «شاسوار»ی بە تەنیشتەوە نەمابوو، خێرا هەستا و ڕایکردە ژووری ئەودیو.. «شازە»ی بە تەنیا بینی بە دیار قاپە ماستەکە و قۆریە چاکەوە دۆشی دابردبووەوە و یاریی بە نینۆکەکانی دەکرد.. سەری هەڵبڕی و پێی وت:

ـ بۆچی ئاوا زوو هەستایت بە قوربان، خۆ ئەمڕۆ قوتابخانە نییە..؟!

ـ کوا مامە شاسوارم..؟!

ـ ڕۆیشت.
ـ ئەی نایەتەوە..؟!
ـ نازانم.
ئەمەی وت و قۆریە سپیەکەی خستە سەر تەباخە ڕەشە بچکۆلەکەی تەنیشتیەوە.. کەمێ ئاگرەکەی زیادکرد و پێی وت:
ـ دەستت پێکردەوە..؟! ئەی پێم نەوتیت وازی لێبێنە..؟!
لەمەوە تێگەیشت و تەواو بۆی دەرکەوت، کە نایەتەوە و ئەویش نایەوێت بە ئاشکرا پێی بڵێت، بۆیە سەری کێشا بە دیوارەکەدا و قاچەکانی بە توندی لە زەوی کوتا.. دەستەکانی لە قژی گیرکردن و بە گریانەوە پێی وت:
ـ بۆ زوو هەڵتنەستاندم..؟! بۆ..؟! بۆ..؟!
کە ئەو هیچی نەوت و سەری لێ بادا، ئەم لە داخا بە قاچی ڕاستی لەقەیەکی لەو سەبەتە ڕەشەی بەردەمی دا و کێشای بە دیوارەکەی بەرامبەریدا، کە بۆنی پەڕی پێچووەکۆتری لێدەهات و نانی گەرمی بازاڕیان تێدەکرد.. لەقەیەکی تری لێ دا و نانە سپیەکانی بەو ناوەدا بڵاوکردنەوە.. سەری خۆی کێشا بە دیواردا و پێی وت:
ـ ئەی دەستی چاکەبۆتەوە..؟!
«شازە» بۆی هەستایەوە و بە هەر دوو دەست دەستی ڕاستی گرت.. ڕایکێشایە هەیوانەکە و لەوێ پاڵێکی قایمی پێوەنا.. لە حەوشەکەدا بە پشتا کەوت و دەرگاکەی بەسەردا داخست.. لە تاکێکی پەنجەرەکەوە سەری بۆ دەرهێنا و پێی وت:
ـ خوام لەو خوایەیە جارێکی تر ئەم قسانەت لە دەم دەردەچێت، هەر خۆم دەزانم چۆن ئەم زمانەت لە بنا بۆ دەبڕم.
سەری هەڵبڕی و «ئەدیب»ی دراوسێیانی بینی، لە سەربانەکەی خۆیان وەستابوو و قوتوویێکی بچکۆلەی ڕەشی بە دەستی چەپیەوە گرتبوو.. پەتێکی سپیی تێوەپێچابوو و بە دەنگی بەرز بەمی دەوت:
ـ نەوال وەرە بۆ سەربانی خۆتان و سەیرکە کۆڵلارەکەم چەندێ بەرزبۆتەوە..!!

حەزی دەکـرد بچـێت و سـەیری بکات، بەڵام لەبەر ئامـۆژنی نەیدەوێرا و پێی دەوت:

ـ من حەزم لەسەیرکردنی کۆڵلارە نییە.

«شازە» سوێندی لێ خواردبوو ئەگەر لەگەڵ «ئەدیب» و هەر کوڕێکی لە خۆی گەورەتردا بیبینێت، بە چەقۆ ڕەشـەکەی مووبەق لەتوکوتی دەکات و دەیدات بەو سەگە سپیە بەڕەڵلایانەی، شەوانە بە دزە دزە لە چۆڵیەوە دێن و لەناو تەنەکە خۆڵە ڕەشەکانی بەر دەرگای ماڵان ورد ورد بە دوای ئێسقانی سپییدا دەگەڕێن.. ئاخر دوو سێ ڕۆژ پێش ئەوە، لە سەربانی ماڵی خۆیان، لەسەر ئەو بەڕە ڕەشوسپییەی، کە تازە بە پارەیەکی زۆر کڕیبووی و لەبەر هەتاوی سەرباندا هەڵیخستبوو، یاریی «کچە خنکاوەکە»یان کردبوو و لەسەر ئەمە لێدانێکی زۆر پیسی خواردبوو.. ئەمە خەتای «ئەدیب» بوو و ئەو لە خشـتەی برد، ئەگینا ئەم لە ژیانیا نە یاریی وای بیستبوو و نە بیریشی لێکردبووەوە.. ئەو هاتە بنکلێشەی و پێی وت:

ـ بە قەستی ئەم بەڕەیە زێی دیجلەیە و تۆش مەلەی تیا دەکەیت.. لەپڕ نقووم دەبیت و دەکەویتە ژێر ئاوەکەوە.. من مەلەوانێکی شارەزام و دێم بە فریاتدەکەوم.

«نەوال»ی ڕووتکردەوە و پێی وت، دوای ئەوەی کـەمێ دەسـتـەکـانی دەجووڵێنێت و بەرەو پێشەوە دەچێت، لەپڕ لەسەر پشت پاڵبکەوێت و چاوەکانی بنووقـێنێت.. ئەو کـاتەی ئـامـۆژنی هات و کـردی بە زرووکـوهووڕ، «ئەدیب» بە ڕووتیی لەسـەر «نەوال»دا پاڵکەوتبـوو و جـووڵەیان لە خـۆیان بڕیبـوو.. «شازە» دوای ئەوەی «نەوال»ی بە قژ لە سەربان هێنایە خوارەوە و لە حەوشەش ئەوەندەی بە زللە کێشا بەو گیانە ڕووتەیدا، تا جێی دەستەکانی لەسەر هەموو شوێنێکیا نەخشـاند و لە زمانی خست.. ئینجا جلەکانی لەبەرکرد و هەرچی جنێو بەسـەر زاریدا دەهات، پێـیـدا.. دواییش چوو بەڕەکـەی لوولکرد و لە سـەربان هێنایە خـوارەوە.. بردی و لە گـۆڕەپانەکـەی بەر مـاڵـیـان نەوتی ناو قـوتووە ڕەشـەکـەی پیـاداکـرد.. ئاگـری پێـوەنا و سـووتـاندی.. چەند ڕۆژێ پێش ئەوە، کـاتێ ئەم و دایکی و «شازە» چوون بۆ دووکانی «سامی سەماوی» و ویستیان سەر و دانە لەو بەڕەیە بکڕن، لە ڕێگا، ڕێک لە «گـــۆڕەپانی ڕەســـافی»دا ئەو ســـواڵکەرە

ڕەشپۆشەیان بینی و لە ئاستیا هەڵوێستەیان کرد، کە لەسەر زەویە شێدارەکە دانیشتبوو و متەقی لە خۆی بڕیبوو، ئەوەی تەنها دەستی لەبەر ژنان پاندەکردەوە و هەرگیز لە عانەیەک زیاتریشی وەرنەدەگرت.. هەر ژنێکیش ئەفەرۆزی بکردایە و پارەی نەدابوایە، ئەو بە نەغمەیەکی زۆر سەیر، کە سەربەقوڕی دەهێنایە پێکەنین و تەنها «نەوال» دەیتوانی لاسایی بکاتەوە، پێی دەوت:

ـ ئەگەر من و تۆ لەناو بەرمیلێکدا بنووین و مێردەکەت بەردەوام بە لەقە تلۆرمانکاتەوە، کاممان دەکەوینە لای خوارەوە..؟!

«شازە» بەبێ ئەوەی سەیری کردبێت و پێی وتبێت، عانەیەکی لە جانتا ڕەشەکەی شانی چەپی دەرهێنا و بۆی ڕاگرت، کەچی ئەو بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەری بادا و پێی وت:

ـ پارەی تۆم ناوێت.

دوو کوڕی هەرزەکاری جوان، سەر و بلووزی سپی و پانتۆڵی ڕەشیان لەبەردابوو و لە دوانە دەچوون، بە جووتە قاقای بەرزیان لێ دا و چووختیانە و قایم ناولەپی دەستی ڕاستیان دا بە یەکا.. یەکێکیان کەمێ هاتە پێشێ و بە دەنگێکی بەرز، بۆئەوەی ئەمان چاک گوێیان لێبێت و بیانورژێنێت، بە سواڵکەرەکەی وت:

ـ ئەوە تۆ چۆن مێبازێکیت، ئەم پەریەت لێبووە بە پیاو و پارەی لێ وەرناگریت..!!

ئەو ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و پێی وت:

ـ پارە لە دەستی مردووا زیندوو و لە دەستی زیندووا مردووە.. من تەنها پارەی مردوو کۆدەکەمەوە.

«شازە» ئەوەندەی تەریقبووەوە و ئارەقی کردەوە، دوو ئەوەندەش ترسا و شڵەژا.. سووک سووک هەنگاوەکانی خاودەبوونەوە و ڕەنگوڕووی سوورهەڵدەگەڕا.. ئەو کاتەی پارەی بەڕەکەیشی دەبژارد و دەیویست بیخاتە ناو دەستی چەپی «سامی سەماوی»ـەوە، «حەسەن خودادا»، کە لەوێ دانیشتبوو و بە دەستی ڕاستی یاریی بە تەزبێحە خاڵدارەکەی دەکرد، سەری هەڵبڕی و بە

سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ شازە تۆ بەڕەت بۆ چییە.. ؟!

ـ ماڵم هەیە و تیایدا دادەخەم.

ـ بەڵام ئەمە بە کەڵکی ماڵی تۆ نایەت.

«شازە» تووڕەبوو و پڕ جنێوی کرد:

ـ بۆچی گەوادی نامەرد ماڵی من چی لە ماڵی خەڵک کەمترە.. ؟!

ئەو ڕۆژە «شازە» بە دیار ئاگری ئێجگار سوور و گەشی بەڕە ڕەشوسپیەکەوە وەستابوو و سەیری دووکەڵە سپیەکەی دەکرد، کە جار جار لە شێوەی منارە و جار جار لە شێوەی گۆرەویی درێژی کچانە بەرزدەبووەوە.. بەرزدەبووەوە و نەرم نەرم و بە کاوەخۆ بەرە و ئاسمان هەڵدەکشا، لەبەر خۆیەوە جنێوی سووک سووک و ناشیرینی بۆ «حەسەن خوداداد» دەنارد و ئاخی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا.. «بەدریە»، «شەلال»ی ساوای کردبوو بە قومات و لەسەر دەستی خۆی دانابوو.. سووک سووک و ئەبڵەق ئەبڵەق لە ئاگرەکە نزیککەوتەوە و بە سەرسوڕمانێکی ئێجگار سەیرەوە لە «شازە»ی پرسی:

ـ ئەوە تۆ چییت بەسەرهاتووە خوشکە ئازیزەکەم.. ؟! ئەم بەڕە نفتونۆیە بۆچی دەستووێنیت.. ؟!

«شازە» بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕێت و سەیری «بەدریە» بکات، پەنجەکانی بەرامبەر بە ئاگرەکە کردنەوە و وتی:

ـ ئەمە بەڕ نییە، زێی دیجلەیە.. دەیسووتێنم و ناهێڵم چیتر منالی تیا بخنکێت.

«بەدریە» دەستی ڕاستی بە سووکی لە مەلۆتکەکەی بەردا و بە قایم، تا هێزی تیابوو کێشای بە ڕوومەتی چەپی خۆیا.. پیایدا کێشایەوە و وتی:

ـ کوێراییم دایە، خۆ خەڵەفاوە..!!

**ـ نەوال وەرە بۆ سەربانی خۆتان و سەیرکە کۆلارەکەم چەندێ بەرزبۆتەوە..!!**

«شازە» بە خێرایی دەرگاکەی کردەوە و بە قالدرمەکەدا سەرکەوتە سەربان.. بە هەر دوو دەست دەستی ڕاستی «ئەدیب»ی گرت و بایدا.. قوتووەکەی لە دەست

کـەوتە خـوارەوە و لەناو حـەوشـەی خـۆیان و ڕێک بە تەنیـشت «نەونەو»دا تلۆربووەوە.. تلۆربووەوە و تلۆربووەوە.. تلۆربووەوە و تلۆربووەوە.. لەولاتر بەر بەرمیلی نەوتەکە کەوت و گەڕایەوە.. گەڕایەوە و لە تەنیشت تەشتە سپیەکەی بەر بەلووعەدا، کە پلاسکۆیەکی تۆکمەبوو و جلە ڕەشەکانی قوتابخانەی ئەمی تیابوو، کەوتە سەر دەم و لەنگەری گرت.. لە سەربانیش «ئەدیب» لە تاو دەستی، کە لەوەنەدەچوو «شازێ» ئاوا بە ئاسانی بەربیدات و وازی لێبهێنێت، هاواری دەکرد و دەپاڕایەوە.. باشبوو «بەدریە»ی دایکی و «ئەمیرە»ی پووری، ئەمیان بە کراسێکی سپیی گوڵڕەش و ئەویان بە ڕەشێکی گوڵسپیەوە بە فریایکەوتن و لەملا و لەولاوە پەلاماری «شازە»یان دا.. قژیان گرت و تێیکەوتن، بەڵام هەر ئەوەندە ئەو خۆی ڕاپسکاند و لە ژێر دەستیان هاتە دەرێ، خێرا خێرا قژی هەر دووکیانی گرت و ئازا ئازا لە پەنجەکانی ئاڵاندن.. توند توند سەری دەکێشان بە پەرژینی کەمێ نزمی بانەکەی خۆیاندا و زروکوهوریان دەگەیشتە ئەوسەری گەڕەک.. هەر ئەوندە دەستی لێبەردان و بەرەڵلایکردن، بە سەروگوێلاکی شکاو و بە قالدرمەکەی خۆیاندا چوونە خوارێ و لە حەوشە دەستیان بە جنێوکرد.. «نەوال» بە دەستی چەپی قوتووەکەی هەڵگرتەوە و لە نزیکەوە سەیری کرد.. سەری پەتەکەی گرت و ڕایکێشا.. هەستی کرد پەتێکی زۆر خراپە و هەر چۆنێ ڕایکێشیت، سووک، یان قایم، هەر دەپچڕێت و هی ئەوە نییە بەرگەی بەرزکردنەوەی کوڵلارە بگرێت.. ئینجا زانی ئەو هەتیوە بە درۆ ئەو قوتووە دەزووەی پیشاندەدا و وای دەردەخست، کەوا کۆڵلارەی هەڵداوە و بۆ تاقی ئاسمان بەرزیکردۆتەوە.. بەڵام ئێوارە، کاتێ هاتە کۆڵان و ئەم بینی، بە لەفافێکی سپی دەستی ڕاستی تا ئانیشک پێچرابوو و کرابووە ملیەوە، گومانی لەوەدا نەبوو، ئازاری پێگەیشتووە و ڕەنگە شەویش لە تاوا خەوی لێنەکەوێت.. «کەچی مامە شاسوار دوێنێ شەو زۆر زوو خەوی لێکەوت و هیچ ناڵە ناڵیشی لێوەنەهات».. بۆی دەرکەوت ئەمە فێڵێ بوو لەمیان کرد و خەتاکەیشی خستە ئەستۆی «شازە»وە.. ئەم دواتر هەستی بە شتێکی تریش کرد و ئەوندەی تر مەراقی زیادیکرد، ئەویش ئەوەبوو، «شاسوار» ئەو کاتانە دەهات و شەویش دەمایەوە، کە

ئەم لەوێ نەبوایە و دواییش پێیان نەدەوت.. ساڵێ زیاتری پێچوو و ئەو هەر خۆی پیشان نەدا.. لە دوا تاقیکردنەوەی سەری ساڵ، «ست ساهیرە»ی «بیرکاری» هاتە پۆل و پێی وتن، کەوا بە پێی ناوخۆشیی، نەک بە پێی ئەلف و بێ بانگیان دەکات و یەکەم کەس بانگی ئەمی کرد.. لە ماوەی چەند دەقەیەکدا تەواوبوو و چووە دەرێ.. ئەم چونکە ناوەکەی بە «نوون» دەستی پێدەکرد و ژمارەی قوتابیانی پۆلەکەیشی زۆربوون، دەبوایە هەموو ڕۆژێ تا درەنگ چاوەڕێ بکات و زۆر جار تەواو ڕقی لە خاڵی هەڵدەستا، کە ناوی ناوە «نەوال» و هەمیشە دەیخەنە دواوەی دواوە.. کەچی «شاسوار» لە هەموو شتێ زیاتری پێ خۆشبوو و پێی دەوت:

ـ ناوەکەت و جوانیەکەت زۆر لە یەکتر هاتوون زۆر..!!

ئەمە هەمان قسەی «ست ساهیرە»یش بوو و هەر جارێ بانگی دەکرد وای پێ دەوت.. جارێکیان هەستایەوە و لێی پرسی:

ـ تۆ مامە شاسوار ناناسیت..؟!

ـ مامە شاسوار کێیە..؟!

ـ برای ئامۆژنمە.. ناوی منی لەسەر دەستی خۆی نووسیوە.

ـ بەڵام کەس ناوی تۆ لەسەر دەستی خۆی نانووسێت..!!

ـ چونکە منالم..؟!

ـ نا.. نا.. لەبەر ئەوە نا..!!

ـ ئەی لەبەرچی..؟!

ـ پێت ناڵێم..!!

ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ـ مەپرسە..!! تووخوا مەپرسە..!!

ئەو ڕۆژە لەبەر دەرگا سپیەکەی قوتابخانەدا بیری لە ناوی خۆی دەکردەوە و کوڵێ دڵی خۆشبوو، کە «ست ساهیرە» لە پێش هەموویانەوە بانگی ئەمی کرد و چاویشی لێبوو دەی بۆ دانا.. چاوەڕێ بوو «شازە» بێت بە شوێنیا و بۆی باسکات، کەچی بیریکەوتەوە و خێرا پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی خستە

دەمـیـەوە، کە ئەو بەمە نـازانێت و هەر وەکـوو ڕۆژان درەنگ دێت بە دوایا.. لەپڕ جانتـاکەی کردە پشـتی و وا هات بە خەیاڵیا، بچێت بۆ مـاڵی «شـاسـوار» و هەر خـێـراش بێـتـەوە، کـەچی لە ترسـا ڕێگای ونـکرد و لەناو ئەو کـۆڵانە تەسک و پێچاوپێچانەی «حەیدەرخانە»، کە پشیلە ڕەشە بزێوەکان دەتوانن زۆر بە ئاسانی لەمبەرەوە بۆ ئەوبەری بازبدەن و سەربانی خانووەکـانیان ڕێک لە دارەمەیتی سپی دەچن، وەکــوو مــشـکی زارەترەکی نـاو مـەتاهەی تاقـیـگاکـان دەهات و دەچوو.. دەچوو و دەهاتەوە.. لە سەری یەکێ لە کۆڵانەکان دەنگی ژنێکی هاتە گوێ و خێرا ئاوڕی بۆ دایەوە:

ـ نەوال ئەوە لێرە چی دەکەیت..؟!

هێـشـتـا وەڵامی نەدابووەوە و بە تەواوی سـەیری نەکـردبوو، ئەو بە دەسـتی ڕاستی کێشای بە ڕوومەتی چەپی خۆیدا و پێی وت:

ـ ئەی کوا شازە..؟! ئاگای لێیە تۆ هاتوویت بۆ ئێرە..؟!

«نەوال» ناسـیـەوە و زانی «فەوزیە»ی ژنی «جاسم حەڵواچی»یە، کە هەمـوو جارێ بۆ دەرزیلێدان، مناڵەکانی دەهێنایە لای «شازێ» و حەڵـوای سـپـیی بۆ ئەم دەهێنا.. لە هەمـوو شتێ زیاتر بە هەڵسوکەوتەکانی ئەم سەرسام دەبوو و بە وردی سەرنجی لێ دەدان.. هەر زوو زووش سەری لێ بادەدا و بەدەم قـاقـالێـدانەوە پێی دەوت:

ـ تۆ حەوت شوو دەکەیت.

«نەوال» لە پێشا ویستی پێی بڵێت گومبووە و ماڵی خۆیان نادۆزێتەوە، بەڵام دوایی زۆڵانە ڕێکیخست و پێی وت:

ـ ئامۆژنم چووە بۆ ماڵی مامە شاسوارم، منیش دەمەوێت بچم بۆ لای.

ـ جا تۆ ماڵەکەیان دەزانیت..؟!

ـ نەء، نایزانم.

عەباکەی هێنا و مناڵەکانی لای دراوسێ سپیپۆشەکەیان بەجێهێشت.. چەند کـۆڵانێـکیـان بڕی و گەیشـتـن.. لە دەرگایان دا و چاوەڕێیـان کرد.. لێیـانـدایەوە و کــەس نەیـکـردەوە.. «نەوال» ســەری بردە پێـــشــەوە و دەمی بە درزی دەرگـــا

ڕەشوسپیەکەوە نا، کە هەر لە بەرە سووتاوەکەی «شازە» و ئەوەی خۆیان و پیانۆکەی کاترینا دەچوو، دەستەکانی گرت بەملا و بەولایەوە و تا تینی تیابوو هاواری کرد:

ـ مامە شاسوار.. مامە شاسوار.. نەوالەکەی خۆت هاتووە.

ژنێکی سپیپۆشی دراوسێیان، کە قژە ڕەشەکەی لە شێوەی دارلاستیک هۆنیبووەوە و لە دەرگا سپیەکەی تەنیشتیان هاتە دەرەوە، لێیان هاتە پێشێ و بە دەنگێکی زۆر سەیر، وەکوو ئەو دەنگەی بنیادەم لە کاتی هێڵنجداندا قسەی پێدەکات و چاوی لەگەڵ دەنووقێنێت، وتی:

ـ نەقیب شاسوار لە ماڵ نییە.

«فەوزیە» سەیرێکی کرد و پێی وت:

ـ بەڵام شازە هاتووە بۆ ئێرە.

ئەو وەڵامی «فەوزیە»ی نەدایەوە و ڕووی کردە «نەوال».. بە سەرسوڕمانەوە سەیری کرد و لێی پرسی:

ـ تۆ کچی ست سوعادیت..؟!

وەک بڵێیت تەواو لەوە دڵنیابێت کچی ئەوە و پێوستی بە وەڵامی ئەم نەبێت، مەکربازانە دەستەکانی بە سنگی خۆیەوەنا و وتی:

ـ ئەه..!! چەند لە دایکت دەچییت..!!

ـ تۆ لە کوێ دایکم دەناسیت..؟!

ئەو بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەستی ڕاستی بۆ دەرگاکە درێژکرد و پێی وت:

ـ لێرە.. لەم ماڵە.

ئینجا کەمێکی تر لێیان نزیککەوتەوە و بزەیەکی پڕ مەغزای خستە سەر لێوی ئەستووری، کە لەملا و لەولاوە وێنەی کۆڵلارەی سووری لەسەر قەراغەکانی کوتیبوو و سیمایەکی سەیریان پێدابوو.. بە دەستی چەپی پرچە درێژەکەی هێنایە لای دەموچاویەوە و پێی وت:

ـ ئەویش جاران وەکوو تۆ دەهات، بەڵام ئاوا وەکوو تۆ بانگی نەدەکرد، بەڵکو بەبێ شەرم و وەکوو خاوەنماڵ خۆی دەکرد بە ژوورا.

«نەوال» بەدەم گـوێگرتنەوە دیقـەتی لە کـۆللارەکـانی لالغـاوی دەدا و لێـیـان وردەبۆوە.. دەشیـویـست دەرفـەت بێنێت و لێی بپرسێت، ئاخۆ «مـامـە شاسوار» ناوی کێی لەسەر دەستی خۆی نووسیوە و ئەو قژە هی کێیە کردوویەتی بە کلکی ئەسپـە هەڵواسـراوەکـەوە، چونکە هەسـتی دەکـرد ئەو ژنە جـانانەیە هەمـوو شـتێ دەزانێت و حەزیش دەکـات بیـانڵـێت، کـەچی «فـەوزیە» لەپڕ بە دەسـتی چەپی دەستی ڕاستی گرت و ڕایکێشا.. بە پێش خۆی دا و پێی وت:

ـ ئێستا تەواو باوەڕم کرد تۆ چەند جارێکی تریش ژیاویت.

«فـەوزیە»، کـاتێ بردیەوە مـاڵیش و بەوانی سپـارد، بە سـووکی کـێشـای بە شـانی ڕاسـتـیـدا و هەمـان قـسـەی پێ وت، بەڵام باشـبـوو نە «شـازە» و نە «ست سوعاد»یش گوێیان لێنەبوو و بە سەلامەتی بۆی دەرچوو.. ئەوان ئەوەندە لە خۆبان دابوو و لەوساوە کۆڵان بە کـۆڵان بە شـوێنیـا گـەڕابوون، تەواو شـەکەت و مـاندوو بـوون و ئاگـایان لە دەوروپشـتی خۆبان نەمـابوو، ئاخـۆ چی دەڵێن و چی نـاڵێن، ئەگـینا ڕازیی نەدەبوون، وای پێ بڵێت و بە جنێو ڕیسوایان دەکرد.. هەر لەسەر ئەمـە «شـازە» لەگـەڵ زۆربەی ژنانـی گـەڕەک شـەڕی کـردبوو و دەسـتی لە تیـتکی نابوون.. یەکەمجاریش «سیامەند» وای پێ وت و ئاوا خستیە بەردەمی خەڵک.. ئەو هەرکە هەڵسوکەوتێکی سەیری لێدەبینی و هەستی دەکرد لە هی منالّ ناچێت، لە خۆشیا دەمی دادەپچڕی و بەم و بەوی دەوت:

ـ کچەکەمان وەکوو بووزای پێغەمبەری هیندیە بووزیەکان چەند جارێکی تریش ژیاوە.

«شـــازە»، ئەگــەرچی هەمـــیـــشـــە بەرپەرچی خــەڵکی دەدایەوە و بە درۆی دەخستنەوە، کەچی خۆی لە هەموویان زیاتر باوەڕی کردبوو و چووبووە ئەقڵـیەوە.. ئەو شـەوەی «سـیـامـەند» وای پێ وت و ژیاننامـەی «بووزا»ی پێـغـەمـبـەری بۆ خوێندەوە، ئەو لە ترسا بە لێفە سپیەکە خۆی داپۆشی و لە ژێریا وەکوو مشکی زارەترەک هەڵدەلەرزی.. لەمەوە تووشی نەخـۆشـیی بوو و مـاوەیەک لەناو جێدا کەوت.. لەپڕ ڕادەپەڕی و هەڵدەستایەوە.. شتەکانی ژوورەکە لەبەر چاویا دەگۆڕان و قسەی هەلەقومەلەقی دەکرد.. تاقە شتێ، کە لێی تێکنەدەچوو و لە تاریکیشا

دەیناسیەوە، شێوەی «نەوال» بوو.. هەر ئەمەش وای لێکردبوو زیاتر باوەڕ بەو قسەیەی مێردەکەی بکات و هەمیشە بیری لێبکاتەوە.. کەچی ڕازییش نەدەبوو، لێی دوورخەنەوە و شەوانەش هەر وەکوو جاران لە تەنیشت خۆیدا پاڵی دەخست.. دواتر وردە وردە ڕاهات و ترسەکەی شکا.. لەمەوە «سیامەند» نەیدەوێرا ئەو قسەیە دووبارەبکاتەوە و هەر زوو زووش بە ژنەکەی دەوت:

ـ من کە شتێ بۆ گاڵتە دەڵێم، مانای ئەوە نییە تۆ بە ڕاست وەریگریت و لە خەیاڵی خۆتا لێکیبدەیتەوە چاوەکەم.

«ست سوعاد» هەمیشە سەرزەنشتی «سیامەند»ی دەکرد و تەریقیدەکردەوە، لەسەر ئەوەی لای ئەم و ئەو باسی بلیمەتیی «نەوال»ی دەکرد و خۆی پێوەدەنواند.. ئەو شەوە ئێجگار سارد و سایەقەیەی، کە چوون بۆ ماڵی «ئەدهەم»ی باپیری و ئەو و ژنەکەیشی دوو ڕۆژ بوو لەوێ بوون.. دەیانویست ئەو شەوەش لەوێ بمێننەوە و نەچنەوە ماڵی خۆیان، «ئەمجەد»ی خاڵی، کە هەمیشە گاڵتەی لەگەڵ «سیامەند»دا دەکرد و جاری واهەبوو بە قەستیی تووڕەشی دەکرد، چونکە پێی وابوو لە کاتی تووڕەبووندا ڕەنگی دەموچاوی بە شێوەیەکی زۆر سەیر سوورهەڵدەگەڕێت و زۆر جوان زمانی تەتەڵە دەکات؛ کاتێ دەیانویست بنوون و لێفەکان بەشی نەدەکردن، ڕووی تێکرد و پێی وت:

ـ کاکە ماسی و میوان دوای دوو ڕۆژ بۆگەندەکەن.

«سیامەند» نەیدەزانی چی پێ بڵێت و چۆن وەڵامی بداتەوە، کەچی «نەوال» دەمودەست لە نێوان «شازە» و «هالە»ی پووریەوە سەری لە ژێر لێفە ڕەشوسپییەکەدا دەرهێنا و بە شێوەیەک، تەنها خۆی دەیزانی چۆنە و چۆن دەوترێت، بە خاڵی وت:

ـ جا خاڵە ئەمجەد ماڵی ئێوە، ئەوەندە ساردە، ماسی و میوان چەند تیایدا بمێننەوە بۆگەن ناکەن، بەڵام لەوانەیە لە سەرما ڕەقببنەوە.

«سیامەند» لە شوێنی خۆیەوە حەپەسا و هەر ئەوەندەی پێکرا، بەملا و بەولای ڕانەکانی خۆیدا بکێشێت و بڵێت:

ـ قەزات لەو گۆڕەی پیرداودی باپیرم کەوێت نەونەوەکەم.. تۆ بلیمەتیت..!!

تۆ موعجیزەیت..!!

«ست سوعاد»، کە ئەوسا ناوچەوانی خۆی بە پەڕۆیەکی سپی بەستبوو و «فەریال»ی بە لێفە ڕەشەکە دادەپۆشی، خێسەیەکی لێکرد و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ نازانم سیامەند تۆ کەی فێردەبیت چەنەبازیی و بلیمەتیی لە یەکتر جیابکەیتەوە..!!

«سیامەند» کەمێ تەریقبووەوە و بە شەرمێکەوە وتی:

ـ بەڵام منالێک هێشتا پۆلی چواری تەواونەکردووە و ئەم قسانە دەزانێت، مانای وایە زیرەکە و زۆرزانیشە.

«ئەدهەم»ی باپیری پێکەنی و وتی:

ـ سوعاد لەم تەمەنەی ئەما قسەی وای دەکرد، هەموومان لە شوێنی خۆمانا دەحەپەساین.

باوکی لەوێ نەبوو و چووبوو بۆ «بەسرا»، ئەگینا وەکوو هەموو جارێ هەڵیدەدایە و پێی دەوت:

ـ مامە خۆت ماندوو مەکە، هەموو کەسێ دەزانێت کچی من لە کچی تۆ زیرەکترە.

«نەوال» هەر جارێ گوێی لە باپیری دەبوو، باسی منالیی دایکی دەکرد و قسە زلەکانی دەگێڕایەوە، کە لەبەر چاوی ئەم و ئەودا بێشەرمانە کردوویەتی و سەرسامی کردوون، ئەو ژنە جانانەیەی دراوسێی ماڵی «شاسوار»ی بیردەکەوتەوە و سیما سەیرەکەی دەهاتەوە بەر چاوی، کە وێنەی دوو کوڵلارەی بچکۆلەی سووری لە لالغاوی خۆیدا کێشابوو و وتی دایکی بێشەرمانە خۆی کردووە بە ماڵی «شاسوار»دا.. کاتێ «فەوزیە»ش هێنایەوە و پێی وت کچەکەی چووە بۆ ماڵی «شاسوار»، ئەو ڕەنگی هەڵبزڕکا و چاوەکانی زەقبوونەوە.. خێرا خێرا بە دەستی ڕاستی قژی گرت و توند توند سەری کێشا بە دەرگا سپییەکەی ماڵی «سیامەند»دا.. بە هێز بە هێز ڕایکێشایەوە و ڕووی کردە خۆیەوە.. دانەکانی لێ جیڕکردنەوە و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ وا لەبەر چاومە، چۆن دەبیت بە قەحپە و هەر ڕۆژێ یەکێ سواری خۆت دەکەیت.. جا بۆ لە ئێستاوە نەتکوژم و ئەم سەرە بۆگەنەت لە ژێر قاچەکانما نەپلیشێنمەوە..؟!

پالێکی قایم قایمی پێوەنا و لەبەر دەرگا بە دەما خستی.. هەر زوو زووش پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی ڕادەوەشاند و بە دەنگی بەرز پێی دەیوت:

ـ حاشا تۆ کچی من نیت و نامەوێیت.. ئینجا بزانم چ قەحپەیەکی لە خۆت قەحپەتر هەڵتدەگرێتەوە و دەتگرێتە خۆی.

«شازە» لە ترسا کز کز پشتی دابووە دیوارەکەی خۆبان و هۆ هۆ هەڵدەلەرزی.. زەق زەق سەیری دەکردن و نەشیدەوێرا فزە بکات.. کەچی ئەوەندەی پێنەچوو، «ست سوعاد» هەر خۆی هەڵیگرتەوە و تێر تێر بۆی گریا.. دواییش لە ژوورەوە بە پەڕۆیەکی سپی قژی بەست و سەری خستە سەر سەرینە ڕەشەکەی «سیامەند»ەوە.. ئاخی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا و فرمێسکی ورد وردی دەڕشت.. «فەوزیە» لە لای سەری و «شازە»یش لە لای قاچەکانیدا قنج قنج دانیشتبوو.. ئەمیان دەستی چەپی خستبووە سەر ڕوومەتی ڕاستی و ئەویان بە دەستی ڕاستی سووک سووک پووزی چەپی ڕووت و سپیی دەشێلا.. دەیشێلا و بە هێمنیی پێی دەوت:

ـ بە قوربانت بم خوشکە گەورەکەم، تۆ بە خۆڕایی ئاوا لە خۆت دەکەیت و ئەو هەموو خەم و خەفەتە لەو منالە دەخۆیت.

ـ دە شازە گیان پێی بلێ با بەس وام لێبکات ئاوا دلڕەقانە لێیبدەم و دواییش بەزەییم پیایدا بێتەوە.. خەفەتی لێ بخۆم و بەدەم ئازارەوە بۆی بتلێمەوە.. بە قوربانت بم، بەقسەی تۆ نەبێت بە قسەی کەس ناکات و پێی بلێ با ئاقڵ بێت.

ئەوسا «شازە» خەتاکەی خستە ئەستۆی «ست ساهیرە»ەوە و بە سەرلەقاندنێکەوە پێی وت:

ـ با بیبینم، هەر خۆم دەزانم چۆن ئابرووی دەبەم.

«ست ساهیرە» لە تاقیکردنەوەی نیوەی سالی داهاتووشدا، کە ڕۆژی

تەرزەبارانەکە بوو و هەورە ڕەشەکان وەکوو مێگەلێ مەڕ لە پانتایی ئاسمانی سەر قوتابخانەدا دەلەوەڕان، بە پالتۆیەکی سپیەوە خۆی کرد بە پۆلدا و «نەوال»ی لە پێش هەموویانەوە بانگکرد.. کاتێ ناولەپی دەستی ڕاستیشی خستبووە ژێر چەناگەی و لە دەموچاوی وردەبووەوە، پێی وت:

ـ من پرسیاری حیسابت لێناکەم، بەڵکوو دەمەوێت لێت بپرسم، تۆ دەزانی بۆچی یەکەم کەس بانگم کردیت..؟!

ـ چونکە ناوی من لە ناوی هەموویان خۆشترە.

ـ نا.. نا.. لەبەرئەوە نییە.

ـ ئەی لەبەرچییە..؟!

ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ـ مەپرسە.

ئەو ڕۆژە «سیامەند» بە چەترێکی ڕەشەوە هات بە شوێنیا و چەترە سپیە بچکۆلەکەی خۆیشی بۆ هێنابوو.. لە ڕێگا، ڕێک لە بەردەمی ماڵی ئەو ژنە کوردەی هەر جارێ بە لای ماڵەکەیاندا تێدەپەڕی و ئەو دەیبینی، سەری بادەدا و بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە و بە زمانەکەی خۆیان پێی دەوت: «بەخێوت دەکەن زۆر بەناز، دەتتوێننەوە وەکوو قاز» و لێی حاڵی نەدەبوو، بۆی گێڕایەوە و ئەو پێی وت:

ـ ئەمە لەبەرئەوەیە تۆ باڵات لە باڵای هەموویان بەرزترە.

«نەونەو» بە شێوەیەکی زۆر سەیر، کە خاڵی نەبوو لە گومان و سەرسوڕمان، هەڵیدەدا و باڵای بەرزدەبوو.. تەنانەت لە پۆلی چواری سەرەتایی مەمکی کرد و لە هەموو کچانی قوتابخانەکەی گەورەتر دیاربوو.. هەر ئەمەش وایکردبوو زۆر کەس، بەتایبەتی ئەوانەی لەملاو لەولاوە بۆ دەرزیلێدان دەهاتن و تەواو نەیاندەناسین، وابزانن خوشکی بچووکی «شازە»یە و «ست سوعاد»یش خوشکی گەورەی ئەمانە.. «شازە» و «ست سوعاد» لە تەمەنێکی زۆر زوودا خۆشەویستی و دواییش شوویان کردبوو و تەنانەت هەر دووکیشیان لای مێردەکانیان خوێندنیان تەواوکردبوو، بۆیە زیاتر سیمای کچی عازەبیان هەبوو، نەوەک ژن و هەمیشە

خۆشیان پێوە بادەدا.. «ست سوعاد» پێنج ساڵ لەم و ئەم پانزدە ساڵ لە «نەوال» گەورەتربوو.. «شازە» زۆری پێخۆش بوو و گەز گەز باڵای دەکرد، کە خەڵک «نەوال»یان بە خوشکی بچووکی ئەو دەزانی و هەمیشە خۆی پێوە دەنواند.. هەر زوو زوو بە خۆی دەگرت و پێی دەوت:

ـ تۆ نەک هەر لە دایکت، بەڵکوو لە منیش درێژتر دەبیت.

ـ من حەز دەکەم باڵام بەقەدەر باڵای مامە شاسوارم بەرز بێت.

ڕۆژێکیان، تازە لە حەمام هاتبووە دەرێ و لە ئاوێنەکەی ژووری دانیشتنەوە سەیری خۆی دەکرد، بەناز و سووک سووک بە شانە سپیەکە قژە درێژەکەی دادەهێنا و خۆش خۆش گۆرانیی دەوت، لەپڕ گوێی لێبوو کوڕێکی گەنج لە دەرگای حەوشە لەگەڵ ئامۆژنیدا قسەی دەکرد و دەنگەکەی زۆر بە لاوە سەیربوو.. دواییش هاتە هەیوانەکەوە و لێی پرسی:

ـ ئەی کوا نەونەو، تا ماچێکی بکەم..؟!

«شازە» بانگی کرد و پێی وت:

ـ نەوال وەرە میوانمان هاتووە.

هەرکە «نەوال» چووە دەرەوە و سەیری کوڕەی کرد، ئەو لە شوێنی خۆیدا ئەبڵەقبوو و تەریقبووەوە.. بە شەرمەوە سەیرێکی «شازە»ی کرد و بە زمانێکی تێکئالاوەوە پێی وت:

ـ بە ڕاستیی ئەمە نەواڵە..؟!

«شازە» ڕووی لەو وەرگێڕا و بۆ «نەوال»ی باسکرد، ئەمە «عارف»ی کۆنەدراوسێیانە و بۆ سەردانیان هاتووە، کە جاران ئەمی لە هەموو مناڵانی گەڕەک زیاتر خۆشدەویست و ئێستا لە «پەیمانگای هونەرە جوانەکان» مۆسیقا دەخوێنێت.. دواییش کردی بە گاڵتە و بە «عارف»ی وت:

ـ ئەگەر بۆ داوای کچمان هاتوویت، ئەوا جارێ بەتەمانین بیدەین بە شوو، بەڵام ئەگەر هەر ماچێکت بوێت، ئەوا تۆ لە دوورەوە هاتوویت و من حەزناکەم دڵت بشکێنێت.

«عارف» شەرمی شکا و پێی وت:

ـ پیاو هەر میوانی ماڵی ئاوا بێت، لەجیاتی چا و قاوە، ماچی کچی جوانی بدەنێ.

«نەوال» لەولاوە هەڵیدایە و بە گاڵتەیەکی زۆر جوان، کە ئەوی تەواو سەرسامکرد و چاوەکانی زەقکردنەوە، پێی وت:

ـ جا کێ دەڵێت من ڕازییم ماچم بکەیت..؟!

ـ بەڵام من لەمەوپێش زۆرم ماچکردوویت کچەدراوسێ.

ـ من ئێستا ئەوەی جاران نییم، تا بتوانیت بە ئاسانی ماچم بکەیت.

ـ منیش ئەوەی جاران نییم و ئەگەر بمەوێت دەتوانم ماچت بکەم.

ـ تۆ هەر ئەوەی جارانی، تەنها سفرێکت زیاد کردووە، بەڵام من دنیایەک شتم تیا گۆڕاوە.

ـ من تەنها سفرێکم زیاد کردووە..؟! چییە ئەم قسانە جنۆکە..؟!

ـ تۆ لە عارف بوویت بە عازف.. تووخوا سفریش شتە پیاو خۆی پێوە بنازێت..؟!

«عارف» دواییش، کە لە «پەیمانگا»دا وانەی مۆسیقای پێ دەوتن و بە چاوێکی جیا لە قوتابییەکانی تری سەیری دەکرد، زوو زوو ئەو ڕۆژەی بیردەخستەوە و دەیویست بیهێنێتە پێکەنین، کەچی ئەم بە هیچ کلۆجێ حەزی نەدەکرد بیریبکەوێتەوە و خەفەتی لێ بخوات.. جارێکیان «عارف» هەستی کرد ئەم پێی ناخۆشە و حەزناکات گوێی لێبگرێت.. بۆیە تەریقبووەوە و ڕەنگی هەڵبزڕکا.. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و پێی وت:

ـ ببوورە نەوال، کە من بەم قسانە سەرودڵم گرتی و شازەی ئامۆژنتم بیرخستیتیەوە.

«نەوال» دڵی پڕبوو و فرمێسک لە چاوەکانی قەتیس مان.. پشتی تێیکرد و بەرەو ناو باخەکەی «پەیمانگا» هەنگاوی هەڵهێنا.. لەبەر دەرگای پۆلەکەیان «سەوسەن» بەرەو ڕووی هات و لێی پرسی:

ـ نەوال ئەوە چییتە..؟! بۆچی ئاوا شڵەژاویت..؟!

نە سەیری کرد و نە وەڵامی دایەوە.. چوو پشتی دا بە درەختێک و لە پرمەی

گریانی دا.. وێنەی ئەو کچەکوردە سپیپۆشەی بیرکەوتەوە و وەکوو تارمایی دەکەوتە بەر بینایی، کە لەو ژوورەی «شازە» تیایدا دەرزیی لە خەڵک دەدا و لە تەنیشت وێنە زۆر گەورەکەی خۆی هەڵواسرابوو.. ئەوەندەی تر ناخی هەژا و زۆر بەکوڵتر گریا.. ئەویش ئاوا پشتی دابووە سنەوبەرێک و دەستی بە چاوەکانیەوە گرتبوو.. دەگریا و فرمێسکەکانی وەکوو زریزەی زیوی بەسەر ڕوومەتەکانیەوە دیاربوون.. ئێوارەیەکی تەمومژاوی بوو و شار بۆنی درەختی سنەوبەری لێدەهات، کە «شاسوار» بە دەستی ڕاستی جانتا ڕەشەکەی کردەوە و بە لوولکراوی تیایدا دەریهێنا.. بە سووکی کردیەوە و پێی وتن:

ـ سەیریکەن چەند لە نەوالەکەی خۆم دەچێت..!!

«شازە» تووڕەبوو و پێی وت:

ـ وانیە.. وانییە.. ئەمە کوێی لە نەوال دەچێت..؟!

ئنجا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ـ نەیبینم.. خوایە نەبینم نەوالەکەم فرمێسک بە چاوەکانیەوە بێت.

«شاسوار» کاتێ بە دەستی چەپی زنجیری سپیی جانتاکەی دادەخستەوە و سەیری «نەوال»ی دەکرد، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ـ هەر چۆنێ بێت ئەوانەی دەتوانن بگرین و فرمێسک برێژن لەوانە ئاسوودەترن، کە فرمێسکیان بۆ دەڕێژن.

شەویش پێش ئەوەی بنوون و هەر خۆی و خۆی لەو ژوورە بوون، «شاسوار» هەر لە خۆیەوە، بەبێ ئەوەی باسی هیچ شتێ کرابێت و ئەم بزانێت بۆچی، چاوە گەورەگانی، کە یەکەمجار بوو، ئاوا کز و خەمناک بیانبینێت و هەست بکات ڕەونەقیان تیادا نەماوە، بە هەر دوو پەنجەتووتەی دەستی چەپ و ڕاستی هەڵیگلۆفتن و بە دەنگێک، وەکوو ئەو دەنگەی بنیادەم دوای گریانی بەکوڵ و فرمێسکڕشتنی زۆردا قسەی پێدەکات، وتی:

ـ بۆئەوەی بزانین ماوین و نەمردووین، دەبێت زوو زوو بگرین.

لەوەدەچوو چاوەڕێ بێت، «نەوال» وەکوو هەر جارێ، کە دەستی چەپی دەکردە ملیەوە و قسەی بۆ دەکرد، گوێچکەکانی قولاغ و چاوەکانی زەقدەکردەوە، ئاوا

بحەپەسێت و لێی بپرسێت بۆچی مامە شاسوار..؟!، کەچی ئەم وا مات ببوو هیچی بۆ نەدەوترا و حەزیشی نەدەکرد هیچ قسەیەکی بۆ بکات، بۆبە هەر خۆی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە دەنگێکی کزتر وتی:

ـ چونکە بەوەدا دەزانین دڵمان لە کارنەکەوتووە، کە دەتوانین وەکوو لیمۆ بیگوشین و ئاوی لێبێنین.

ئەمەی وت و بە تەمەڵیەوە لەسەر جێگاکەیدا پاڵکەوت.. کاتێ بە دەستی ڕاستی سەرینە سپیەکەی ڕێکدەخستەوە و بە هی چەپی لێفە سپیە گوڵگوڵیەکەی بۆ سەر سنگی توکنی ڕادەکێشا، هەناسەیەکی زۆر قووڵتری هەڵکێشا و پێی وت:

ـ چەند حەز دەکەم، ئەمشەو وەکوو جاران لەگەڵما بنوویت و سەر بخەمە سەر قژە خاوەکەت..!!

«نەوال» هەر لە خۆیەوە و نەیزانی بۆچی، دڵی پڕبوو و پشتی تێکرد.. بە ئەسپایی دەرگاکەی کردەوە و چووە هەیوان.. لە بەرامبەر ئەو ئاوێنەیەی، کە شەو نەبوو خەونی پێوە نەبینێت و لەبەر چاویا وێنەی ناڵی ئەسپی سپیی لەسەر نەکێشن، وەستا و لە پرمەی گریانی دا.. دەمودەست «شازە» و «سیامەند»، ئەمیان بە کراسێکی ڕەش و ئەویان بە دەستێ بیجامەی سپیەوە، لە ژوورەکەی خۆیان هاتنە دەرێ و سەرسام و ئەبڵەق لە بەرامبەریدا وەستان.. وەستابوون و هیچیشیان نەدەوت.. «سیامەند» لەو جارەوە، کە بینی لەپڕ لە ژێر لێفەکەیدا گریا و لێی پرسی بۆچی دەگریت، ئەم ڕووی گرژکرد و پێی وت، نابێت سەیری بکات و لێی بپرسێت، ئیتر نەک خۆی، بەڵکوو ڕازیی نەدەبوو «شازێ»ش پرسیاری لێبکات و دەمی بکاتەوە.. ئەوەی سەیربوو «شاسوار» بوو، سوور دەیزانی ئەم وا لەو هەیوانەدا خەمناک خەمناک و زۆر زۆر بەکوڵ دەگری و دەنگی گریانەکەی دەگاتە کۆڵان، کەچی نەدەهاتە دەرەوە و گوێی پێنەدەدا.. سەرەتا وایدەزانی ڕادیۆ ڕەشەکەی بە گوێچکەیەوە ناوە و دەنگی گریانی ئەم نابیستێت، کەچی دوایی کە «شازە»، بانگی کرد و پێی وت:

ـ کاکە شاسوار، ئەوە تۆ گوێت لە گریانی نەوال نییە..؟!

ئەو دەنگی هەڵبڕی و پێی وت:

ـ گوێم لێیە، بەڵام چی لێبکەم..؟!

ئینجا تەواو دڵی کەوتە خورپە و بەکوڵتر دەنگی لێهەڵبڕی.. ئەوسا پڕ بە دڵ حەزی دەکرد، لێی بپرسن بۆچی دەگریت و ئەو هەموو فرمێسکە بۆ هەڵدەڕێژیت.. بۆ..؟! بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! بۆ..؟! ئەگەرچی سوور دەیزانی ناتوانێت دەمی هەڵێنێتەوە و تێیانبگەینێت، کەچی خۆیشی نەیدەزانی بۆچی ئەوەندەی حەزدەکرد لێی بپرسن.. بۆ..؟! بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! بۆ..؟! بۆچی ئەوەندەی حەزدەکرد..؟! کاتێ «شازێ»ش لێی هاتە پێشەوە و بە دەستی ڕاستی پەرچەمە بە فرمێسک تەڕ و خووساوەکەی لەسەر چاوەکانی لادا، ئەم وایزانی ئەو پرسیارەی لێدەکات و کەمێ کوڵی دڵە هەژاوەکەی دادەمرکێنێتەوە، کەچی ئەو بە دەنگێک، کە قوڵپی گریانێکی خەمناک ئابلۆقەی دابوو و تەواو نەغمەکەی گۆڕی بوو، لێی پرسی:

ـ لای ئێمە دەخەویت، یان لای مامە شاسوارت..؟!

بەبێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە و فرمێسکەکانی چاوی بسڕێت، ڕایکردە ژوورەکەی ئەوان و لەسەر جێگاکەی «سیامەند» پاڵکەوت.. کاتێ «سیامەند» بە ئەسپایی هات و لە تەنیشتیا ڕاکشا.. ڕاکشا و بە لێفە سپیەکە داپۆشی، ئەم دەستی ڕاستی گرت و خستیە ملی خۆیەوە.. «شازە» دەستی چەپی بەسەر شانی ڕاستی «سیامەند»دا درێژکرد و لەسەر ناوچەوانی ئەمی دانا.. بە پەنجەکانی سووک سووک بۆی شێلا و پێی وت:

ـ خۆزگە ئەمشەو لای مامە شاسوارت دەنووستیت.

ئەم لەو جارەوە، کە زانی ئەوەی «شاسوار» لەسەر دەستی کوتیویەتی ناوی دایکیەتی و هی خۆی نییە، شەوانە لە لای نەدەنووست و وەکوو جاران دەوروخولی نەدەدا، کەچی هەر خۆشیشیدەویست و بە جوانترین پیاوی ئەو شارەی دەزانی.. هێشتا هەر بە «قمر الزمان»ی «الف ليله و ليله»ی دەهاتە بەر چاو و باوەڕی وابوو ئەو لە کازێوەی ڕۆژێکی باراناویی سەرەتای پاییزدا لە دایکبووە.. هەر بۆیەشە چاوەکانی پڕن لە نهێنی و ئەم ئەوەندە پێیان سەرسامە.. چەندیش پێی

دەوت و لێی دەپاڕایەوە، ناوی ئەم لەسەر دەستی ڕاستی بکوتێت و دڵی پێی خۆشدەبێت، کەچی ئەو ڕازیی نەدەبوو و پێی دەوت:

ـ من ئیتر ناتوانم ناوی کەس لەسەر دەستی خۆم بکوتم.

ـ ناوی منیش.. ؟!

ـ هی هیچ کەسێ نەوال گیان.. هی هیچ کەسێ.

ـ ئەی کێ ناوی من لەسەر دەستی خۆی دەکوتێت.. ؟! کێ.. ؟! کێ.. ؟!

ـ کەس ناوی تۆ لەسەر دەستی خۆی ناکوتێت.

ـ چونکە منالّم.. ؟!

ـ نا.. نا..، لەبەرئەوە نا..!!

ـ ئەی لەبەرچی.. ؟!

ـ پێت نالّێم.

ـ بۆچی.. ؟! تووخوا بۆچی.. ؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

«شاسوار»، کە چاوی دەبڕیە چاوەکانی و ئاوای پێ دەوت، لەرەی دەنگی تەواو دەگۆڕا و بە کزی سەری دادەخست.. ئەم دەیزانی ئەوە قولّپی گریانە قوڕگی گرتووە و نەغمەی قسەکانی گۆڕیوە، بۆیە ئەوەندەی تر ئەو «مەپرسە.. تووخوا مەپرسە»یەی لێدەبووە مەراق و ئارام و ئۆقرەی لێدەبڕا.. ئەو جارەیش خۆی و دوو لە هاوڕێکانی، کە زۆر زۆر لە یەکتر دەچوون و وای بۆچوو دووانەبن، بە جلە سپیەکانیانەوە لەسەر کورسیە ڕەشەکانی پشت مێزە سپیەکەی ناوەڕاستی باخەکە دانیشتبوون و دەمانچە ڕەشەکانیان لە بەردەمی خۆیان دانابوو.. چایان دەخواردەوە و سەیری ئەو قەسابە ڕەشپۆشەیان دەکرد، کە دەستی ڕاستی شەش پەنجەی پێوەبوو و لە ژێر دارهەنجیرەکەی سووچی ئەوسەری باخەکەدا بە چەقۆیەکی دەسکرەشوسپی مەڕە سپی و قەلّەوەکەی سەردەبڕی.. قاچەکانی، کە کردبوونیە جووتێ جەزمەی لاستیکی سپیەوە و کتومت لە کەولّی بێچووەورچ دەچوون، دەیخستنە خوێناوەکەوە و دەمی چەقۆکەی بە گەلاّ ڕەشەکان پاکدەکردەوە.. «نەوال» سەرەتا چەند بەزەیی بە مەڕەکەدا هاتەوە و خەریکبوو دەست بکات بە

گریان، کە هەرچەند تەکانیدەدا و خۆی ڕادەپسکاند، نەیدەتوانی پەتە ڕەشەکە لە قاچەکانی بکاتەوە و ملی لە چەقۆ ئێجگار تیژەکە دوورخاتەوە، کەچی کاتێ قەسابەکە زۆر لێزانانە و بە شێوەیەکی چەند بلێیت سەیر، هەڵیبڕی و سەربەرەوخوار بەو شیشە ڕەشەی هەڵواسی، کە هەر لە زووەوە بەو دیوارە سپییەدا کوترابوو و زۆر جار «شازە» سەرێکی جۆلانە ڕەشوسپییەکەی ئەمی پێوە گرێدابوو، هەر لە خۆبەوە و نەیزانی بۆچی بە جووڵە و هەڵسوکەوتی قەسابەکە سەرسامبوو و حەزی دەکرد چاوی لێ نەترووکێنێت.. خۆ ئەو کاتەی خێرا خێرا بە چەقۆ دەسکرەش و نووکباریکەکە چەرمەکەی لێ دادەماڵی و گۆشتە سوورەکە لە ژێر پەنجەکانیدا دەردەکەوتن، هەر قەستی دەکرد گازی تیژ تیژ لە دەستی ئەو بگرێت و سوورەگۆشتی مەڕەکەش بە کاڵیی بخوات.. قەسابەکە هەرکە چەقۆ دەسکسپی و زلەکەی لەناو توورەکەیەکی ڕەش ڕەشدا دەرهێنا و بە بربەندە ڕەشوسپییەکە تیژیکرد.. ئانوسات ورگی هەڵدڕی و بەرخێکی ڕەشی مردووی تیادا هێنایە دەرێ.. خستیە سەر دەستەکانی و بە سووکی لەسەر ئەو گوشە سپییەی دانا، کە ئەم هەموو جارێ دەیبردە گۆڕەپانەکەی بەردەم ماڵەکەیان و تیژ تیژ لەناویدا ڕایدەکرد.. بە کەوڵی مەڕەکە داپۆشی و جارێکی تر هات بە لای لاشەکەوە.. دوای ئەوەی لەتوکوتی کرد و خستنیە ناو ئەو چوار مەنجەڵە سپیە فافۆنەی، کە بنکەکانیان لەسەر ئاگری بەتینی تەباخە ڕەشەکەی مووبەقدا ڕەشبووبوون و بە ڕیز لە ناوەڕاستی باخەکەدا دانرابوون، ئینجا بەرخە مرداربووەوەکە و چەرمی مەڕەکەی خستە ناو گوشەکەوە و دای بە کۆڵی خۆیا.. هەر بە دەستی خوێناویەوە دەرگای حەوشەی کردەوە و بە بێدەنگیی چووە دەرەوە.. ئەم جووتێ نەعلی «سیامەند»ی کردبووە پێی و سووک سووک لە مەنجەڵەکان نزیکدەکەوتەوە.. لێیان دەچووە پێش و بیری لەوە دەکردەوە، ئاخۆ ئەو قەسابە بەرخی مردووی بۆچییە و چی لێدەکات..؟! چەندیشی بە لاوە سەیربوو و چۆن دەستەکانی گرت بە دڵیەوە، کە بەرخێکی ڕەش لەناو سکی مەڕێکی سپیدا هاتە دەرێ و وێڵاشە ڕەشوسپییەکەشی وەکوو فەقیانەی ژنە کوردەکانی «بابلشێخ» پیادا شۆڕبووبووەوە.. دەیویست هەموو ئەو پرسیارانە لە لای خۆی کۆکاتەوە و دوایی لە ئامۆژنیان بکات، چونکە

دەیزانی لە کاتێکی ئاوادا «شاسوار» وەڵامی ناداتەوە و لێشی تووڕەدەبێت، کەچی «شازە» لە ژوورەکەی خۆیدا دەرزیی لە «ئەدیب» دەدا و لەگەڵ «بەدریە»دا ڕازی قسەیان دامەزراندبوو.. جار جار قاقایان لێ دەدا و دەنگیان دەگەیشتە کۆڵان.. کاتێ ئەوانیشی بەڕێکرد و سەتڵێکی ڕەشی پڕئاوی هێنا، تا بیکات بەسەر خوێنەکەدا و بە ناخی زەویە ئێجگار نەرمەکەیدا بەرێتە خوارەوە، لەپڕ بە دەستی ڕاستی قژی ئەمی ڕاکێشا و پێی وت:

ـ چەند جارم پێ وتوویت نەعلی گەورە لە پێنەکەیت..!!

زۆر جاری تریش ئاوا قژی ڕاکێشابوو و پێی وتبوو، مناڵ نابێت نەعلی گەورە، بەتایبەتی هی سپی لە پێبکات و خش خش پێیان بڕوات، چونکە دەمرێت و بۆی دەکەن بە کێلی گۆڕەکەی.. تاکێکی لە لای سەری و ئەوی تری لە لای قاچەکانیەوە دەچەقێنن.. «نەوال» لە داخا هەر بە قاچ نەعلەکانی هەڵدا و لەملا و لەولای «شاسوار» و هاوڕێکانی کەوتنەوە.. دەم و لچی دا بە یەکا و چوو لەسەر یەکەم پلەی قادرمەکە دانیشت.. «شاسوار» بە هەنگاوی سست سست هات بۆ لای و بە دەستی چەپی توند توند دەستی ڕاستی گرت.. سووک سووک هەڵیستاند و هێواش هێواش هێنایە لای خۆیانەوە.. بە ئەسپایی لەسەر کورسیەکەی تەنیشت خۆی داینا و دەستی چەپی کردە ملیەوە.. «نەوال» لە نزیکەوە سەیری پیاوەکانی دەکرد و زۆریشی بە لاوە سەیربوو، کە ئەو هەموو کاتە لەگەڵ «شاسوار»دا دانیشتبوون و هیچ قسەیەکیان نەدەکرد.. لە سیمای لەیەکچوویان وردەبووەوە و دەیویست هەرچۆنێ بێت جیاوازییەکیان تیادا بدۆزێتەوە، بەڵام مەحاڵبوو، نەک ئەم، بەڵکوو هیچ کەسێ بتوانێت لە یەکتریان جیابکاتەوە و نهێنیی ئەو لەیەکچوونەیان بدۆزێتەوە.. «نەوال» ئێوارە لەسەر سفرە سپیە گوڵگوڵیەکەی نانخواردندا، کاتێ سەیری کردن و تەواو لێیان وردبووەوە، قۆڵی خۆیان تا ئانیشک هەڵکرد و دەستی چەپیان بۆ ئەو کەوچکە ڕەشانە درێژکرد، کە یەکەمجار بوو لەمماڵەی دەبینین و لە سەرەمێکوتەی زل دەچوون، ناڵێکی سوور و ڕستێ وشەی سوورتری بەسەر مەچەکیانەوە بینی.. ئەگەرچی بە پیتی عەرەبی نووسرابوون و دەیتوانی بە ئاسانی بیانخوێنێتەوە،

کەچی لێیـان تێنەدەگەیشت و ئەوەندەی تر لە ئاستیاندا ئەبلەق و سەراسیمەبوو.. خۆی بۆ نەگیرا و بە ئەسپایی دەمی لە گوێچکەی چەپی «شاسوار» نزیککردەوە.. بە تیلەی چاو سەیری ئەوانی دەکرد و بە چپە لێی پرسی:

ـ مامە شاسوار ئەو پیاوانە ناوی کێیان لەسەر دەستی خۆیان کوتیوە..؟!

ئەو بەدەم هەناسەهەڵکێشـانەوە سـەیرێکی چاوەکـانی ئەمی کـرد و زۆر کـز و خەمبارانە پێی وت:

ـ ناوی هیچ کەسێکیان لەسەر دەستی خۆیان نەکوتیوە.

ـ ئەی ئەوەنییە شتیان لەسەر نووسیوە..!!

ـ نووسیـویانە ڕۆحەکەی مـامە، بەڵام ئەگەر بـۆشتیان بـخوێنمەوە، تۆ هەر لێیـان تێناگەیت.

ـ لەبەرچی..؟!

ـ پێت ناڵێم.

ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ـ مەپرسە..!! تووخوا مەپرسە..!!

لەمـەوە ئەوەندەی تر تـرسـا و هەسـتی دەکـرد مـردن وەکـوو پشـیلە ڕەشـەکـەی «ئەدیب»ی دراوسـێـیـان، کە زۆر جار دەرفەتـی دەهێنا و دەهاتە حەوشـەکەیانەوە، ئاوا هاتـووە و ئەگـەر جـوان جـوان ژێر کـانتـۆر و پشت دەرگـا و ناو نـوێنەکـانی بۆ بگەڕێت، دەیدۆزێتـەوە و دەتـوانێت بیکاتە بـاوەشـیـەوە.. یان دەتوانێت دەسـتی ڕاستی بێت، یان هی چەپی بخاتە سەر پشـتی و یاریی لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەم لە کوێ دەوێرێت لە شوێنی خۆیدا بجووڵێت و هەستێتـە سەرپێ.. تەنانەت ئەو کاتەش نەیتوانی تەکانبدات و خۆی بگەیێنێتە ژووری نووستن، کە ئامۆژنی تیایدا دەگریا و بە زمانەکەی خۆیان شتی سەیر سەیری دەوت.. لەمەوە تەواو زمانی شکا و تواناى پرسـیـارکردنیـشی نەمـا.. ئەو دەگـریا و دەیقـیـژاند، کـەچی ئەوان وەک بڵێیت نەیبیستن، یاخود نەیانەوێت گوێی لێبگرن و دەست لە نانەکە بکێشنەوە، بەسـەر خۆیان نەدەهێنا و هەر سەیری یەکتریشـیـان نەدەکرد.. ئەم چاوی بڕیبـووە نووسـینی سەر دەسـتی پیـاوەکـان و ورد ورد گـوێی بۆ گریانەکەی ئەو شلکردبوو،

بەشکوو لەو قسانە تێبگات و بزانێت چی ڕوویداوە و چیتریش ڕوودەدات.. بەڵام مەحاڵبوو هیچی بۆ ڕوونبێتەوە و بگاتە هیچ سەرەنجامێ.. ویستی خۆی بخەڵەتێنێت و ترسەکەی گیانی بەوە دەرکات، کەوا وەکوو زۆر جاری تر بۆ مناڵ دەگریت و تا ئەم پێی پەست نەبێت، پەست نەبێت و بە پرسیار هەراسانی نەکات، خۆی خزاندۆتە کونجی ژوورەوە و بە زمانی خۆیان ئاخ و داخی دەردەبڕێت.. چەند ڕۆژێ پێش کوژرانی «شاسوار»، دایکی و خوشکی و خاڵۆژنی هاتن بۆ سەردانی و «ست هالە»ی پووریشی لە پێش ئەمانەوە گەیشتبوو.. «شازە» وەکوو هەموو جارێ کەوتە هەڵڕشتنی داخی دڵی و دەستی کرد بە گریان بۆ بەدبەختیی خۆی.. لە ناو چیمەنەکەدا سەری «نەوال»ی خستبووە سەر ڕانی چەپی و بە دەستی ڕاستی یاریی بە قژە ڕەشەکەی دەکرد.. فرمێسکەکانیشی ورد ورد لە چاوەکانی دزەیان دەکرد و بەسەر چەناگەی خڕیدا بۆ ناو سنگی ڕێچکەیان دەبەست.. «نەوال» چاوی بڕیبووە بێشکەی بووکەشووشەکە و بیری دەکردەوە، کە بە ڕەنگی ڕەش بۆیەکرابوو و بە بزمارێکی سپیی زۆر گەورە بە دیوارە سپیەکەی هەیواندا هەڵواسرابوو.. هەر جارێ داوای لێدەکرد بۆی داگرێت، تا یاریی پێبکات و بە نۆرە بووکەکانی تیادا بنوێنێت، ئەو بە توندی دەستی چەپی دەکردە ملیەوە و پێی دەوت:

ـ بۆت دادەگرم نەونەو گیان، بەڵام دەبێت گۆرانیی بێشکەی بەتاڵم بۆ بڵێیت.

سەرەتا «نەوال» بەبێ چەندوچوون بۆی دەوت و ئەویش دەستی دەکرد بە گریان.. سەری دەخستە سەر ئەژنۆکانی و فرمێسکی هەڵدەڕشت.. ئیتر ئەم تەریقدەبۆوە و شەرم دایدەگرت، بۆیە چییتر نە داوای بێشکەی لێکرد و نە ئەو گۆرانیەشی بۆ وت.. هەندێ جار بە دزییەوە کورسیە سپیەکەی ڕادەکێشایە ژێر قاچیەوە و لە بزمارە کوتراوەکەی دیواری دەکردەوە.. هەر بە دزیەوەش یاریی پێدەکرد و بووکەشووشە سپیپۆشەکانی تیادا دەنواند.. ئەمە تاقە شتی ئەو ماڵەبوو، کە ئەم بۆی نەبوو دەستی بۆ بەرێت و وا لە «شازە» بکات لێی زویربێت.. بە تووڕەیی لێی دەسەند و دەیخستەوە شوێنی خۆی.. ڕۆژی تەرزەبارانەکە بینی و بە قایم پاڵێکی پێوەنا.. قاچەکانی لە باریەکتر چوون و

کەوتە سەر کاشیە ڕەقەکانی هەیوانەوە.. ئەژنۆکانی ڕووشان و ناوچەوانی قرنجا:
ـ پیسی بۆگەن، چەند جارم پێ وتووی لە خۆتەوە دەسکاریی ئەم بێشکەیەی من نەکەیت..!!

«نەوال» کە ئەو ڕۆژانەی منالیی خۆی بیرکەوتەوە و گوێی لە هەنسکی گریانی ئامۆژنی بوو، دڵی پڕبوو و خەریکبوو لەو بەکوڵتر، چەند بلێیی بەسۆزتر بگریت، کەچی خۆیشی نەیزانی چی بوو ڕێگەی گریانی لێدەگرت و نەیدەهێشت فرمێسکەکانی وەکوو سەرەمێکوتەی شووشەیی بزێو بەسەر کوڵمەکانیدا بۆ سەر چەناگەی ڕێبکەن.. «شازە» ئەو ڕۆژە ئاشکرایکرد و تەواو ڕوونیکردەوە، کە بۆچی شەوانی زستان بە ڕووتیی لەبەر لێزمەباراندا دەوەستا و گیانی خۆی لە ئاو هەڵدەکێشا.. دواییش ئاگری دەنا بە قژیەوە و دەیسووتاند:
ـ ئەی هاوار من چەند بەدبەخت و نەگبەتم.. ئەو هەموو شەوە خۆم ڕووتکردەوە و بە سەعات لەبەر باران وەستام.. وەستام و گوێم بە سەرما و سۆڵی زستانی سەخت نەدا.. قژمم هەمووی سووتاند و خۆم ئەتککرد، هەر چاو و دڵم بە منالێک ڕۆشەننەبۆوە.

«ست سوعاد» و «فەریال» لەملا و «دکتۆر سەلوا»ش لەولاوە دایانە پرمەی گریان و دەستیان بە چاویانەوە گرت، کەچی «ست هالە» بە دەستی ڕاستی سووک سووک لە ئەژنۆی چەپی ئەوی دەدا و پێی وت:
ـ تۆ دەتەوێت پێمان بلێیت زۆر داماو و گوناهیت، کەوا بۆ هاتنەدنیای مرۆڤێک ئازارت چەشتووە، بەڵام بەبێ ئەوەی ئاگات لێبێت، باسی تاوانی خۆت دەکەیت.. تۆ تاوانباری شازە.. هێنانەدنیای مرۆڤ وەکوو کوشتن و لەناوبردنی وایە ئازیزم.. بە داخەوە شازە من وامدەزانی تۆ تاقە کەسی پاکی و تاوانی کوشتنی هیچ کەسێکت لە ئەستۆدا نییە.. وانەبوو شازە.. وانەبوو.. من بە هەڵە لێت تێگەیشتبووم چاوەکەم.. تۆ بکوژیت خۆشەویستم.. تۆ تاوانباری ڕۆحەکەم.. تۆ ویستووتە کەسێک بخولقێنیت و تەمەنێکی کورتی پێ ببەخشیت.. تەمەنێکی کورت و بێدەستەڵاتی وا، کە لە ئاستی مردندا ئەوەندە دەستەوستانە، بەبێ پەلەقاژە خۆی بەدەستەوەدات و لە ژێر قاچیا بەبێ جووڵە ڕادەکشێت.. بە

داخەوە شازەکەی ڕۆحم ناخی تۆش بۆگەنی کردووە و باوەڕم بە تۆش نەما گوڵم.. تۆش تاوانبارێکی بێدەستەڵاتیت ئەی ئەو ژنەی تا کەمێ لەمەوبەر بە فریشتەم دەزانیت و وام دەزانی ناو دڵی تۆ پاکترین شوێنی سەر ڕووی ئەم زەمینە بۆگەن و قێزەونەیە........

ـ تۆ درۆزنی هالە.. تۆ دەتەوێت بە ڕۆژی ڕووناک چاوبەستم بکەیت و ڕاستییم لێ بشاریتەوە.. تۆ ئەگەر باوەڕت بەم شتانەیە، کە دەیانڵێیت، بۆچی شووتکرد..؟! کە شووشتکرد، بۆچی هێشتت سکت پڕبێت..؟!

ـ منیش تاوانبارم شازە منیش.. ئەگەرچی بۆ ئەوە شووم نەکرد، تا ببمە هۆی خولقاندن و لەناوبردنی ڕۆحی تر، بەڵام هەر بکوژم.. هەر تاوانبارم.. پیاو لە خشتەی بردم شازە گیان.. پیاو زۆری لێکردم دەستم بە خوێن سوورکەم تاقە شازەمانی شارە بۆگەنەکەم.. ناخی منیش وەکوو هی تۆ بۆگەنیکردووە ڕۆحی شیرینم.

ـ ناخی تۆ بۆگەنی کردووە ئا، هەر بۆیە ناتوانی کەست خۆشبوێت، بەڵام ڕازیی نابم من بهێنیتە ڕیزی خۆت.

ـ مرۆڤ ڕابردووێکی بەسەرچووە شازە گیان.. ڕق و خۆشەویستی لە ئاستی مەرگدا هەمان شتن گوڵم.. ژیانی ئێمە وەکوو ئەو داستان و چیرۆکانە وایە، کە باس لە سەردەمە زووەکان دەکەن.. ئەو پاڵەوانانەت خۆشدەوێن، کە دەچەوسێنەوە و ڕقیشت لەوانەیە، کە چەوسێنەرن.. حەز بە سەرکەوتنی ئەمان و دۆڕانی ئەوان دەکەیت، بەڵام هەر هەموویان مردوون مردوو شازەکەم.. ئەنجام هەر ئەنجامە.. چاک و خراپ.. جوان و دزێو.. ئاسوودە و خەمبار.. ئازا و ترسنۆک.. براوە و دۆڕاو لەو شوێنەدا کۆدەبنەوە و تێکەڵ بە یەکتر دەبن، کە پێی دەوترێت ماڵی مەرگ.. کاکەسوور و عەقید عەمار، عەقید شەهابی مێردم، ئەمجەدی نووسەری برام و سیامەندی هونەرمەندی مێردی تۆ، شەمرووخ و ئەو شەرحەبیلەی لە گۆڕەپانی یەزیدی کوڕی معاویەدا دیلەکان بە بەر گوللە دەدات وەکوو یەک وان و هیچ جیاوازییەکیان نییە.. دەنگی سەلیمە موراد و نەوال جابر لەگەڵ دەنگی ئەو غەنیمە عەبوودەی، کە لە ڕادیۆ ناوی دیلە کوژراوەکان دەخوێنێتەوە، هیچ

جیاوازییەکیان نییە گیان و دڵەکەم.. ئێمە بە مردوویی لە دایک بووین شازەکەی ڕۆحم، بۆیە دەستەوستانین لە ئاستی ڕق و خۆشەویستیدا.. ئێمە لە جیهانێکدا ژیانی کورت بەسەردەبەین، کە بە مرۆڤ بۆگەن بووە.. ئێمە تاوانبارین، کە نەوە بۆ مەرگ دەخەینەوە شازەی دڵ و گیانم.. تۆ دەبێت هەموو کاتێ ئەو دێڕەشیعرەی «موعەڕی»ت لەبیربێت، کە دەڵێت:

فليت وليدا مات ساعه وضعه  ولم يرتضع من أمه النفساء«١»

«دکتۆر سەلوا» وەک بڵێیت بیەوێت دشەکەی لە یەخەی «شازە» بکاتەوە و نەهێڵێت لەوە زیاتر سەر بکاتە سەری، چەناگەی هەڵبڕی و بە قورگی پڕ لە گریانەوە لێی پرسی:

ـ ئەرێ پێم بڵێ خۆشەویستم، خۆ تۆ سیستەرێکی زۆر شارەزا و لێهاتوویت، ئەم قژهەڵکڕووزاندن و بە ڕووتیی لەبەر باران وەستانە چییە و لە کێ فێری بوویت..؟!

ـ لە کەس فێری نەبووم، تەنها باوەڕێکی تایبەتیی خۆم بوو، بەڵام دوای ئەوەی زانییم بە کەڵکم نایەت، وازم لێیهێنا.. وا دیارە من لە چارەما نووسراوە وەجاغی خۆم نەبینم.

«ست سوعاد» کەوتە دڵنەوایی‌کردنی و پێی وت:

ـ گوێی مەیەرێ شازە گیان، هێشتا زۆرت بە بەرەوە ماوە.. هەقی چەنەچەنی هالەشت نەبێت.. خۆت نازانی ئەم ئەوە بیستوحەوت ساڵە زمانی گرتووە، تا ئێستا بیستوحەوت قسەی ڕێکوپێکی وای نەکردووە، کەمێ لە هی بنیادەم بچن..؟!

ـ گوێی نادەمێ، با بۆ خۆی هەر بڵێت.. خوا دەکات ئەم دامێنە وشک و ڕەقهەڵاتووەی من زۆڵێکی لێ دەکەوێتە خوارەوە، با هەر بە تاوانبار و بکوژم بزانن.

ئینجا قژی درێژ و ڕەشی «نەوال»ی هەڵبڕی بە دەموچاویەوە نا.. بەدەم ئاخ و هەناسەهەڵکێشانەوە فرمێسکەکانی چاوی پێ سڕی و زۆر خەمبارانە وتی:

ـ بە سائەقەی تاڵ بەتاڵی ئەم قژەت بم، کە لە هەموو شتی دنیا جوانترە.. بە

خوا ئەگەر بزانم کچێکی وەکوو تۆم دەبێت، ئامادەم نەک بە ڕووتیی لەبەر باران بوەستم، بەڵکوو خۆم دەخەمە کوورەی بە ئاگر جۆشدراویشەوە.

«فەریال» وەکوو کای کۆن گڕی گرت و بە پشتی دەستی چەپی فرمێسکەکانی سڕی.. ڕووی تێکرد و بە کەمێ تووڕەیی و کەمێ گلەییەوە پێی وت:

ـ بۆچی پوورە شازە من چییم لە نەوال کەمترە، تۆ هەر باسی ئەو دەکەیت..؟!

«شازە» وەک بڵێیت باوەڕی نەکردبێت و نەچێتە ئەقڵییەوە، «فەریال» لە کاتێکی ئاوادا سەرزەنشتی بکات و بێشەرمانە ڕووبەڕووی پرسیاری وای بکاتەوە، بۆیە لە پێشدا بە سەرسامییەوە سەیری کرد و هیچی نەوت، دوایی ئاخێکی هەڵکێشا و بە تەوسەوە پێی وت:

ـ جا بە قوربان من خۆم چییم و قسەکانم چیین، تا تۆ پێیان دڵگران ببیت..!!

«نەوال» زۆری پێناخۆشبوو و لە دڵەوە هەستی بە نیگەرانیی کرد، کە خوشکەکەی ئێرەیی پێبرد و «شازە»ی دەمکوتکردەوە.... کەچی ئەو ڕۆژە، ئەو ڕۆژەی ئەو لە ژوورەکەی خۆباندا دەستەکانی نووساندبوو و بە دیوارەوە و چاوەکانیشی خستبووە سەریان، بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەگریا و ئەم نەیدەتوانی لە نهێنیی جوانی ئەو گریانە تێبگات، لێی تێبگات و وەکوو ئەو بگریت، بیکات بە ئاواز و بە پیانۆکەی بیژەنێت، خۆبشی چاوی لە ئاستیا هەڵنەدەهات و دەیویست بە هەر ڕێگایەک بێت بێ دەنگی بکات و چیتر نەهێڵێت ئەو هەموو فرمێسکە بڕیژێت.. دەمی لە گوێچکەی چەپی نزیککردەوە و بە چپە پێی وت:

ـ بەس بگری بە قوربانی ئەو فرمێسکە ورد وردانەت بم.. دەبەس ئازاری ئەو چاوە ڕەش و جوانانەت بدە.

کە ئەو هەر ژیرنەبووەوە و سەری هەڵنەبڕی، ئەم دەستی چەپی خستە سەر پیانۆکەی و بە مەکرێکەوە پێی وت:

ـ لەم ڕۆژانە دێت و دەیبینی.

«فەریال» لەپڕ ڕووی وەرگێڕا و بە خۆگێلکردنەوە لێی پرسی:

ـ مەبەستت کێیە..؟!

ـ مەبەستم خۆیەتی.. ئەوەی وا بۆی دەگریت و ئەو شین و واوەیلایەی بۆ

دەکەیت.

ئەو لە کاتێکدا بە چمکی کراسە ڕەشەکەی فرمێسکی چاوەکانی دەسڕی و پەرچەمەکەی لەسەر لادەدا، لیکی ناو دەمی قوتدایەوە و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ چووزانی..؟!

ـ دەزانم.. دڵم خەبەری داوە.

ـ بە سائەقەی ئەو دڵە پاک و بێگەردەت بم تاقە خوشکەکەم.

ئەمەی وت و باوەشی پیاکرد.. بە گەرمیی ڕوومەتەکانی ماچکرد و توند توند گوشی بە خۆیەوە.... دوو ڕۆژ دوای ئەوە، کاتێ کەروێشکە سپیەکانی لای «کاترینا» دەهێنا و بە سمتی پاڵی بە دەرگا سپیەکەی حەوشەوە نا، قەلەموونێکی ڕەشی خرتی بینی بە پەتێکی سپی لە بۆریە ڕەشەکەی کەپری مێوەوە بەسترابووەوە و بەردەوام تەکانیدەدا، ئەو قەلەموونەی ئەم بە پەڕەکانی و گەڵای وشکی دارخورماکەی بەر دەرگای خۆیان شەپقەی بۆ خوشکەکەی درووستکرد و دایکی زۆری بە دڵبوو.. تەکانیدەدا و دەیویست پەتەکە بپچڕێنێت.. کە ئەوی بەجێهێشت بەرەو لای سەرووش هەڵکشا، جووتێ جەزمەی ڕەشی سەربازیی لە هەیوانەکەدا بینی و زانی «فوئاد» هاتووە.. بۆئەوەی نەیبینن و بە گیری نەهێنن، لە دەرگا ڕەشوسپیەکەی مووبەقەوە چووە ژوورەکەی و زۆر بە سووکی دەرگای بەسەر خۆیدا داخست.. پەردە سپیەکەی بەسەر ڕووی پەنجەرەکەدا دایەوە و ژوورەکەی کەمێ تاریکداهێنا.. قەفەزی کەروێشکەکانی لە بەردەمی خۆیەوە دانا و پەنجەکانی خستە کەلێنی تەلە ڕەشەکانیەوە.. لێوی خوارەوەی خستبووە ژێر دانەکانی سەرەوەی و بیری لەوە دەکردەوە، کە ئێوارە دایکی لێی تووڕەدەبێت و ڕەنگە دەستیشی لێ بەرزبکاتەوە، لەسەر ئەوەی کەروێشکی هێناوەتە ماڵەکەوە و سەرپێچیی لە فەرمانی ئەو کردووە.. ئاخر ئەو لەو جارەوە کەروێشکە سپیەکانی بە خنکاوی بینی و لە حەژمەتا کەوتە سنگکوتان و خۆڕنینەوە، سوێندی خوارد ئیتر ناهێڵێت ناوی کەروێشک لە ماڵەکەیدا بهێنرێت و تەنانەت وێنەی کەروێشکە سپیەکە و مناڵە ڕەشپۆشەکەشی لە دیواری هەیوانەکە کردەوە.. کەچی

«نەوال» لەوانەوە حەزی لە بەخێوکردنیان کرد و لێیبوو بە مەراق.. هەمیشە لە دایکی دەپاڕایەوە و داوای لێدەکرد، کە ڕێگەی بدات جووتە سپیەکەی «کاترینا» بهێنێت و بۆ خۆی دوای سەعیکردن کاتیان لەگەڵدا بەسەربەرێت.. جووتە ڕەشەکەی پێشووی لەگەڵ کوڕێکی سپیپۆشی گەڕەکی «بابلشێخ» بە جووتێ دەسکێشی سپیی خوری و جووتێ ماچ گۆڕیبووەوە و لە هەموو شتێکی تری ماڵەکە زیاتر خۆشیدەویستن.. ئێوارەیەکی درەنگی زستان بوو و تازە باران خۆشی کردبووەوە.. بە پاڵتۆیەکی ڕەشەوە لەبەر دەرگا سپیەکەی ماڵی «ست هالە»ی پووری وەستابوو و لەبەر خۆیەوە گۆرانیی دەوت.. ئەو کوڕەی بینی و بەرەو ڕووی چوو، کە جووتێ کەروێشکی ڕەشی کردبووە قەفەزێکی سپیی تەلبەندەوە و کز و خەمبار لە مەیانەکە دەیهێنانەوە.. زۆر بێشەرمانە چاوی بڕیە چاوەکانیەوە و پێی وت:

ـ کوڕەکە ئەم کەروێشکانەم نادەیتێ.. ؟!

ئەو سەیرێکی کرد و پێی وت:

ـ ئاخر تۆش ئەم دەسکێشانەم دەدەیتێ.. ؟!

«نەونەو» هەر خێرا دایکەندن و دایە دەستی، کەچی ئەو زۆڵانە شانەکانی هەڵتەکاند و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ جووتێ دەسکێش بە جووتێ کەروێشک.. ؟! نا.. نا.. نایگۆڕمەوە.. زەرەرمە.. باوکم لێمدەدا.. ماچێکیشم لەسەر بدەرێ.

ئەم هەستی کرد ئەو کوڕە ئەگەرچی لەمیش گەورەترە و لە بازاڕ شت دەفرۆشێت، بەڵام زۆر کەمزانە و هیچ نازانێت، کەوا داوای ماچی لێدەکات و بە کەروێشک لەگەڵیا دەیگۆڕێتەوە.. سەیری دەکرد و لە دڵی خۆیدا دەیوت: «باشە خۆ ماچ پارە و شتومەک نییە، تا پیشانی باوکی بدات و دڵی پێ خۆش بکات..!!» بەڵام بۆئەوەی پەشیمان نەبێتەوە و لە دەستی نەچن، نەیویست پێی بڵێت و وریای بکاتەوە، بەڵکوو بە سووکی ڕوومەتی لە دەمی نزیککردەوە و پێی وت:

ـ هانێ ئەوەش ماچ کوڕەکە.

ئەو قـەفـەزەكـەی دايە و بە سـووكی پەنجـەكـانی خسـتـە قـژیەوە.. دەمی نا بە ڕوومـەتی چەپیەوە و مـاچێكی سەر كـولـمـە سوورهەڵـگەڕاوەكەی كـرد.. «نەونەو» هەسـتی كـرد تەزوو بە هەمـوو گـيـانيـدا دێت و لەزەتێكی سـەير لە دڵـيـا مێـرووله دەكات.. لەزەتێک، كە لەمەوپێش هەرگـيـز بەم شێوەيە هەستی پێنەكردووە و چەند بڵێيت سەيرە.. بەبێ ويست ڕووی بۆ وەرگێڕا و پێی وت:

ـ كوڕەكە ماچێكی ئەملايەشم..!!

هەركـە ئەو بە سـووكی دەمی خسـتـە سـەری و مـاچێكی تری كـرد، ئەم تەواو گـيـانی خاوبووەوە و دەمـارەكـانی لـەشی بە شـێـوەيەكی سەير كەوتنـە كـرتەكرت.. كـەچی هێـشـتـا ئاگـای لەوەمـابـوو بيـر لەو ئاڵـوگـۆڕە بكـاتـەوە و بزانێت كـامـيـان قـازانجی كردووە و كـامـيـان زيان..؟! ئاخـۆ ئەو ماچانە بەر كـامـيـان دەكـەوێت و دەبێت بە هی كێ..؟! بيـری لە «ست هاله»ی پووری دەكـردەوە و سـووک سـووک دڵی دەكـەوتە خورپە، كە پێش ئەوەی ئەم دەرگـای حەوشە بكـاتـەوە و بێتـە دەرەوە، لەگـەڵ مـێـردەكـەی، بە جلی سـپـيـەوە لەسـەر سـۆفـا ڕەشـەكـەی ژووری مـيـوان دانيـشـتـبـوون و يەكـتـريان مـاچدەكـرد.. كـاتێ قـەفـەزەكـەشی بردەوە و لە ژوورەكـە نزيككەوتەوە، پووری بەرەو ڕووی هات و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ ئەوە ئەم كەروێشكانەت لە كوێ بوو نەونەو..؟!

ـ لە گەڵ ئەو كوڕە بە جووتێ دەسكێش گۆڕيمەوە.

خۆيشی نەيزانی بۆچی ماچەكانی شاردەوە و نەيوت، بەڵام هەستی كـرد لەپاڵ لەزەت و خـۆشـيـەكـەدا، ترسـێـک وەكـوو سـەرەمـێكوتەی بزێو لە دڵـيـا كـەوتـۆتە جووڵەجووڵ و خەريكە لەناو دەميا سەر دێنێتە دەرێ.. ئينجا بيـری لە پەيوەنديی نێـــوان مــــاچ و ترس و مــــاچ و درۆ كــــردەوە و لە خــــەيالّی خــــۆيدا كــــەوتە تاوتوێكردنيان.. بيری لە كوڕەكەش كردەوە و هێنايە بەر چاوی خۆی، ئاخۆ ئەويش درۆ لەگەڵ باوكی دەكات و ڕاستيـەكـەی دەشارێتەوە، يان جورئەت دەكـات و ڕێک و ڕەوان پێی دەڵێت: «باوكـە جووتە كـەروێشـكـەكەم لەگـەڵ كـچـێـكی زۆر جـوانی مــاڵە دەوڵـەمــەندەكــان بە جــووتێ دسكێش و جــووتێ مــاچ گــۆڕيەوە و كــوڵێ دڵخـۆشم».. بەيـانی باوكی، كـە هات بە شـوێنيـا و برديەوە، هەمـان درۆی لەگـەڵ

ئەویشدا کرد و وەکوو ئەوان هەڵیخەڵەتاند، کەچی ئەو لە خۆشییا زمانی گۆی نەدەکرد و لە ناخی دڵەوە قاقای لێ دەدا.. کاتێ لە «ستۆدیۆی ئەربیل»یشدا لایان دا و چوونە ژوورەوە، دەستی چەپی خستە سەر شانی ڕاستی «سیامەند» و بە شێوەیەکی زۆر خۆش پێی وت:

ـ وەرە بزانە شەمرووخی برازات چ ئاڵوگۆڕێکی کردووە..!!

«سیامەند» بردیە ژووری وێنەگرتن و لە بەرامبەر کامێرا ڕەشەکەدا وەستاندی.. «نەونەو» کەروێشکەکانی بەم دەست و بەو دەستی گرت و بەملا و بەولای سنگیەوە نان.. دوایی کە سەیری نێگەتیفەکەی کرد و سەرنجی لێی دا، کەروێشکەکان و قژە ڕەشەکەی سپی و کراسە سپیەکەی ڕەش دەرچووبوو، دەستی ڕاستی گرت بە سنگیەوە و وتی:

ـ ئای..!! چەندە سەیرە مامە سیامەند، خۆ بە پێچەوانە دەرچووە..!!

ـ ئەمە نێگەتیفەکەیەتی ڕۆحی مامە سیامەند.. دوایی لە ڕەسمەکەدا بە ڕاستیی دەردەکەوێت.

«نەونەو» سەیری دەکرد و بە هەموو ئەقڵی خۆی دەیویست ماچەکان بە سەر ڕوومەتیەوە ببینێت.. بیری دەکردەوە و لە خۆی دەپرسی: «ئایا ماچ ڕەشە وەکوو خەڵووزی ناو مەقەڵیی باخەکەی خۆمان، یان سپییە وەکوو بەفری ئەو شاخەی مامە سیامەندم ڕەسمی لەسەر گرتووە..» هەر خۆیشی وەڵامی خۆی دایەوە و دەیوت: «ڕەشە وەکوو کەروێشکەکان».. کەچی دوای ئەوەی کەروێشکەکان کونێکیان لە ژێر دارهەنجیرەکەی سووچی ئەوسەری باخەکەدا کرد و چوار بێچووی سپی سپیی وەکوو دەسکێشەکەیان لێبوو، جارێکی تر کەوتە گومان لە ڕەنگی ماچ و زۆریشی بە لاوە سەیربوو، کە ئەو بێچووە سپی سپیانە لەو کەروێشکە ڕەش ڕەشانە پەیدابوون و لە دڵەوە ترس دایگرت.. هەورە ڕەشەکانی بیردەکەوتەوە و بەبێ ویست سەری بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی، کە لە پەنجەرەی ژووری میوانی ماڵی خۆیاندا سەیری دەکردن و لە شێوەی ئەو ڕەوە مانگایە دەهاتنە بەر چاوی، ئەوەی گاوانە سپیپۆشەکە، بەیانیەکیان بەرەو مەیانەکەی دەبردن و تۆزێکی سپی لە ژێر قاچەکانیاندا بەرزدەبۆوە.. وایدەزانی بارانی ڕەشیان لێ دەبارێت و دەرگا

سپیەکەی حەوشەیان لە وسمە دەگرێت، کەچی تەرزەیەکی سپی سپییان لێ دەکەوتە خوارێ و کاتێ بەر پارچە تۆتیا ڕەشەکەی سەر کولانەی کۆترە سپیە نەجەفیەکانی «سیامەند» دەکەوتن، تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، دەنگیان لێ بەرزدەبووەوە و گیانی ئەمیان ڕادەتەکاند.. مەگەر هەر خۆی بزانێت چەند حەزیان لێدەکات و چۆن بە بیستنیان موچوڕک بە سەرتاپای گیانیدا دێت..
«نەوال» ماوەیەکی زۆر خووی دایە ئەوەی بزانێت ڕەنگی ماچ چۆنە و لە چی دەچێت.. واشیدەزانی تەنها لە ڕەنگی کەروێشکەکانیەوە، دەتوانێت بیدۆزێتەوە و بە ئەنجامەکەی بگات.. چاوەڕێبوو جووتە ڕەشەکە جارێکی تریش زاوزێ بکەن و بزانێت ئەمجارە سپی دەهێنن، یان ڕەش.. کەچی چ ئەوان و چ بێچووەکانیش، کە گەورەبوون، لێی چووبوون بە قینا و لە سپییان زیاتر نەدەهێنا.. سپی لە دوای سپی و سپی لە دوای سپی.. حەوشە و باخەکەیان پڕی بوو لە کەروێشکی سپی و هەر ئەو نهێنییەی بۆ نەدۆزرایەوە.. جارێکیان، کە لەگەڵ ئامۆژنی چووبوو بۆماڵی «لوئەی» و شەو لەوێ مانەوە، دایکی «ئەرقەم هەلاج»ی مێردی «جەمیلە»ی فەڕاشی قوتابخانەیانی بانگکردبوو و لۆکەی دۆشەگە ڕەشەکەی ئەمی دابوێ، تا بۆی شیبکاتەوە و بەرگێکی تری تێبگرێت، کاتێ ویستبووی هەقەکەی بداتێ و بەڕێی بکات، ئەو پێی وتبوو لەجیاتی پارە، جووتە کەروێشکە ڕەشەکەی دەوێت و بۆ «عەدنان»ی کوڕی دەیانباتەوە.. «نەوال» لەسەر ئەمە خۆی لەتوکوت کرد و لە بەیانییەوە تا شەو درەنگانێ بۆیان گریا.. وێنەکەی «سیامەند» بۆی گرتبوو و لەناو ئەلبوومە ڕەشەکەی دایانبوو، بە چاویەوە دەنا و فرمێسکەکانی دادەبارانده سەری.. سەری بە دیواری هەیواندا دەکێشا و بەر چاوی تاریکدادەهات.. ئەم لە هەموویان زۆرتر ئەوانی خۆشدەویست و زیاتر باوەڕی وابوو لەوانەوە لە نهێنیی ماچ دەگات و ڕەنگ و شێوەکەی دەدۆزێتەوە.. هەندێ جار نێرەکەیانی دەگرت و دەمە خڕ و بچکۆلەکەی دەنا بە ڕوومەتی خۆیەوە.. سووک سووک دەیهێنا و دەیبرد.. دەیبرد و دەیهێنایەوە.. یان هەر دوو ڕانی جووتدەکرد و چمکی کراسە سپیەکەی بە دان دەگرت، لەسەری دادەنا و نەرم نەرم دەستی بە پشتیدا دەهێنا، ئیتر مووچووڕکە بە هەموو گیانیا دەهات و بە ژێر

لەزەت و خۆشیا دەکەوت.. ئەو ڕۆژانەی بیردەکەوتەوە و زیاتر دەگریا.. قژی دەڕنییەوە و جلەکانی لەبەر خۆی دادەڕنی.. باوکی دڵنەوایی کرد و پێی وت:

ـ بەیانی لەگەڵ خۆم دەتبەم بۆ مەیانەکە و جووتێکی ڕەشی وەکوو ئەوانەی خۆتت بۆ دەکڕم.

ـ من هەر ئەوانەی خۆمم دەوێتەوە.

ـ دەی باشە من جووتێکی تر بۆ عەدنان دەکڕم و ئەوانەی خۆتت بۆ دەهێنمەوە.

لەمەوە ژیربووەوە و فرمێسکی چاوەکانی سڕی.. بەر لەوەی بچێتە سەر جێگاکەی و پاڵکەوێت، وا لە دڵی چەسپی لەمەودوا سپییەکان هی ڕەشیان دەبێت و ئیتر ئەو مەتەڵەی بۆ شیکار دەبێت، بۆیە بەیانی چوو بۆ لای باوکی و پێی وت:

ـ قەیناکات باوکە ڕەشەکان مەهێنەرەوە، با بۆ عەدنان بن.

ـ تۆ چۆنت پێخۆشە، با ئاوابێت شەمرووخ گیان.

ئەم بە هەڵەدا چووبوو و سپییەکان لە سپیی سادە زیاتریان نەدەبوو.. وای لێهات ئەوەندە زۆر بوون، ناو ئەو باخە ڕیزاوڕیز بوو بە کونی کەروێشک و دایکی هەمیشە دەیبۆڵاند.. سەرزەنشتی دەکرد و نەشیدەوێرا بیاندات بە کەس.. هەر زوو زوو سەری لێ بادەدا و پێی دەوت:

ـ ئەگەر ڕۆژێ ئەم خانووەمان بە سەردا نەڕووخا، بزانە من هیچ شتێ نازانم..!!

ئەو کاتەی باوکی بە مەبەستی بازرگانی سەفەری کرد بۆ «بەسرا» و هەر خۆیان لە ماڵ مانەوە.. بۆئەوەی بێ تاقەت نەبن و شەوان هەست بە ترس نەکەن، «سیامەند» ئەمی برد بۆ لای خۆیان و دایکی و «فەریال»یش چوون بۆ لای باپیری.. «ست سوعاد» بە «ئەدهەم»ی باوکی وتبوو هەموو ڕۆژێ سەر لە ماڵەکە بدات و ئاو و خواردن بۆ کەروێشکەکان دابنێت.. ئەو شەوەی پۆلیسە سپیپۆشەکان وەکوو زۆر جاری تر هاتن «سیامەند»یان بە دەستێ بیجامەی ڕەشەوە لەناو پێخەفە سپیەکەیەوە دەرهێنا و بردیان، «شازە» دەستی «نەوال»ی گرت و چوون بۆ ماڵی «ئەدهەم»ی باپیری.. «نەوال» هەرکە چووە ژوورەوە و

باپیری بینی، پەنجەکانی لە یەکتر ئالاندن و لێی پرسی:

ـ باپیرە ئاو و خواردنت بۆ کەروێشکەکان داناوە..؟!

ئەو بە هەر دوو دەست کێشای بە ئەژنۆکانی خۆیدا و وتی:

ـ ئەی ماڵی وێرانم، ئەوە سێ ڕۆژە نەچووم..!!

«شازە» هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە دەنگێ، کە قوڵپی گریانێکی زۆر بەسۆز ئابڵووقەی دابوو و بەحاڵ لەژێر لێوەکانیەوە دەردەچوو، وتی:

ـ ئەگەر لە تینوا نەخنکابن، لە ناو ئەو هەموو دار و درەختە لە برسا نامرن.

هەر خێرا و بە هەڵەداوان خۆیان گەیاندە ئەوێ و دەرگایان کردەوە.. هەر هەموویان لەسەر کاشیەکان، ڕێک لەو شوێنەی ئاوی بەلوعە چاڵکیردبوو و کردبووی بە گۆمیلکە، پەلەواژبیوونەوە و لە حەوشە تاریکەکەدا وەکوو مردووی کفنکراو دەهاتنە بەر چاو.. ئەوان هەر هەموویان ترسان و هەزارویەک مانایان بۆ لێکدانەوە، بەڵام «نەوال» تەنها یەک شتی بۆ دەرکەوت و هەر ئەویشی لە دڵی خۆیدا دەوتەوە: «ماچ وەکوو کفنی مردوو سپییە» و لەگەڵیا موچورک بە سەرتاپای گیانیدا دەهات.... کەچی دوایی جارێکی تریش پەشیمانبووەوە و لە خەیاڵی خۆیدا کەوتەوە ڕاوەڕاو بە دوای دۆزینەوەی ڕەنگ و شێوەی ماچدا.. ڕۆژێکیان چوو بۆ لای ماڵی «عەدنان» و تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، لە دەرگا ڕەشەکەیانی دا.. هەرکە ئەو بە دیشداشەیەکی سپی و کڵاوێکی ڕەشەوە دەرگای لێکردەوە و سەری دەرهێنا، ئەم خێرا دەستی چەپی بە سنگیەوە گرت و بە ترسەوە پرسیاری جووتە ڕەشەکەی لێکرد، ئەو لیکی ناو دەمی قووتدایەوە و پێی وت:

ـ بردمن بۆ مەیانەکە و فرۆشتمن.. بۆ خۆم جووتێ پێڵاوی ڕەشی جوانم پێ کڕین.

ئینجا بیری لە جووتە سپیەکەی «کاترینا» کردەوە و بڕیاری دا داوایان لێبکات، کە ماوەیەکی زۆرە بەخێویان دەکات و تا ئێستا زاوزێیان نەکردووە.. بیری لێدەکردنەوە و لەبەر خۆیەوە دەیوت: «دەیانهێنم، بەشکوو بە پێچەوانەی جووتەکەی تر، ئەمان بێچووی ڕەشیان ببێت و ئەو نهێنییەم بۆ دەرکەوێت..؟!»..

ئەو ڕۆژە داوای لێکرد و ئەو بەبێ چەندوچوون بۆی خستنە ناو قەفەزێکی ڕەشەوە.... کاتێ سەیری پەنجەکانی خۆی کرد و لێیان وردبووەوە، کە هەر یەکەیانی خستبووە کەلێنێکی تەلە ڕەشەکانەوە و تازە لای «کاترینا» نینۆکەکانیانی بە سوورێکی تۆخ تۆخ بۆبە کردبوون، بیرێکی سەیری بۆ هات و وای بۆچوو لە ڕێگەی ژمارەوە دەتوانێت ڕەنگ و شێوەی ماچ بدۆزێتەوە و کۆتایی بەو خووە پووچەی بهێنێت، کە ئەوە چەند ساڵە دەستبەرداری نابێت و تەواو هەراسانی کردووە.. لێوی خوارەوەی دەخستە ژێر دانەکانی سەرەوەی و بیری لەو شەوە کردەوە، کە باپیری چمکی دیشداشە سپیەکەی بە دان گرتبوو و دوو زەرفی نایلۆنی ڕەشی لەم دەست و لەو دەستی هەڵکێشابوو.. دانە دانە گوێچکەی کەروێشکە خنکاوەکانی دەگرت و دەیخستنە فەردەی ڕەشەوە.. تێیدەخستن و دەیبژاردن.. دەیبژاردن و ئاخ و داخی هەڵدەکێشا.. «شازە»ش لە بەرامبەریدا کز و خەمناک وەستابوو و وەکوو مناڵ یاریی بە قازی ڕەشی ملوانکە سپیەکەی ملی دەکرد.. یاریی پێدەکرد و بیری دەکردەوە.. بیری دەکردەوە و فرمێسکەکانیش ورد ورد لە چاوەکانیدا بەرەو چەناگەی ڕێچکەیان دەبەست.. باپیری چوار فەردەی ڕەشی لێ پڕکردن و بردنیە بەر دەرگا سپیەکە، بۆئەوەی بەیانی خۆڵڕێژە بەدڵەسپیەکان بێن و بیانکەنە ناو ئەو عەربانە ڕەشەی، کە دوو ئەسپی سپی ئێجگار زل ڕایدەکێشن و بە ناڵە ڕەش ڕەشەکانی قاچیان گوێچکەی پردەکەن لە تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق.. زۆر جار هەمان دەنگی لە تەختەڕەشی پۆل هەڵدەستاند و هەموو مناڵانی سەرسامدەکرد.. کەچی ڕۆژی تەرزەبارانەکە، کاتێ «ست سامیە»ی بەڕێوەبەر بینی و گوێی لێگرت، هەر خێرا دەستەکانی نایە قژیەوە و توند توند سەری کێشا بە دیوارە سپیەکەدا.. ژانی خستە دڵیەوە و بەر چاوی لێڵبوو.. لێڵتر و لێڵتربوو.. «ست سامیە»ی بە جلە ڕەشە سادەکانیەوە وەکوو بەرمیلە ڕەشەکەی حەوشەی خۆیان دەبینی و موچوڕکی پیادا دەهات، کە نەوتیان تێدەکرد و هەمان دەنگی لێ بەرزدەکردەوە.... باپیری کاتێ بەر بەلووعەکەی بە نەوتی ناو قوتووە ڕەشەکە دەشت و بە گوشە سپیەکە وشکیدەکردەوە، بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە سەری بادەدا و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر دەیوت:

ـ ماڵی وێرانم، چلوهەشت جووت کەروێشک بە جارێ خنکان.

«نەوال» پەنجەکانی لە کەلێنی تەلەکانەوە دەرهێنان و خستنیە ناو قژیەوە.. دوایی قەڵەمێکی ڕەشی لە چەکمەجەی مێزە سپیەکەی دەرهێنا و بە تۆخی لەسەر دەفتەرە بەرگڕەشەکەی نووسی: چلوهەشت جووت کەروێشکی سپیی خنکاو.. جووتێکی ڕەشی تری بێسەروشوێنیش.. جووتێ دەسکێشی سپی.. جووتێ پێڵاوی ڕەش.. ئینجا لە چاوی خۆیەوە نزیکی کردەوە و بە سەریەکەوە دەیوتنەوە.. ئەوەندەی وتنەوە و وتنەوە، تا تەواو لێیان بێزاربوو و هەستی بە تاڵیی ناودەمی کرد.. شەرمی لە خۆی دەکردەوە و تەریقدەبووەوە.. کاغەزەکەی لە دەفتەرەکە کردەوە و توند توند لەناو دەستیا لوولیکرد.. لوولیکرد و وەکوو بنێشت خستیە دەمیەوە.. بە دان لەتوکوتی کرد و تفیکردەوە سەر بەڕە ڕەشە گوڵسپیەکەوە.. سەیری جووتەکەی ناو قەفەزەکەی دەکرد و قێزی لێیاندەکردەوە.. هەستی دەکرد ئەم هێشتا مناڵە کەمزان و ساویلکەکەی ئەو ڕۆژەیە و هەرگیز گەورەنابێت، کە کوڕە دیشداشەسپیەکەی گەڕەکی «بابلشێخ»، لەبەر دەرگای ماڵی پووریدا خەڵەتاندی و ماچیکرد.. هێشتا ئەو مناڵە نەفامەیە و هیچ نەگۆڕاوە، کە بیر لە شتی بێسەروبەر دەکاتەوە و هەڵسوکەوتی سەیر سەیر دەکات.. لە داخا تا تینی تیابوو شەقێکی لە قەفەزەکە هەڵدا و بە دیوارە سپیەکەیدا دا.. کەروێشکەکان بەر یەکترکەوتن و ئاوی ناو قاپە ڕەشەکەی بەردەمیان قلپبووەوە.. دەرگا سپیەکەی کردەوە و هەر دووکیانی هێنایە دەرێ.. قوڕگی گرتن و توند توند و تا هێزی تیابوو گوشینی.. گوشینی و دانەکانی جیڕکردەوە.. تا گیانیان دەرنەچوو و ملیان لارنەکردەوە، وازی لێنەهێنان و دڵی ئۆخەی نەکرد.. کەچی هێشتا لە ناخیا بیری لە ماچ دەکردەوە و دەیوت: «مردووە وەکوو کەروێشک.. ڕەشوسپییە وەکوو پیانۆکەم و دەرگا داخراوەکەی شاسوار و هی ئەو کوڕەی نازانم چی لێهات و بۆ کوێ چوو».. هەڵیدانە سەر دۆشەگە ڕەشەکەی و بە بێزاریەوە پەردە سپیەکەی لەسەر ڕووی پەنجەرە چوارچێوەڕەشەکەی لادا.. «فوئاد»ی بینی خەنجەرێکی سپیی دەسکڕەشی گرتبوو بە دەستی چەپیەوە و لە ژێر دارهەنجیرەکەی سووچی ئەوسەری باخەکەدا، باڵی قەلەموونە ڕەشەکەی خستبووە

ژێر قاچی ڕاستیەوە.. لە چاوتروکانێکدا دانەویەوە و سەری لە جەستەی جیاکردەوە.. «فەریال»یش بە مەکرەوە دەستی گرتبوو بە چاویەوە و دەیزرووکاند.. «فوئاد» سەری قەلەکەی گرت بە دەستی ڕاستیەوە و خوێنەکەی ملی بە چیمەنە تەڕەکە پاککردەوە، کە هێشتا گیانی تیا مابوو و بە سستی دەنووکی دەکردەوە.. دەیکردەوە و دایدەخستەوە.. دایدەخستەوە و دەیکردەوە.. چوختیانە لە «فەریال»ی نزیکدەکردەوە و بە گاڵتە دەیترساند.. ئەو عەیارانە و بە زرووکە زرووک لەناو باخەکەدا ڕایدەکرد و جار جار خۆی هەڵدەدایە سەر چیمەنەکەوە.. هەر خێرا هەڵدەستایەوە و ڕایدەکرد.. ئەم ڕایدەکرد و ئەو دوایدەکەوت.. کەروێشکەکانیش جاران ئاوا ڕاوی یەکتریان دەنا و لەناو باخەکەدا یارییان دەکرد.. دایکی بینی کراسە ڕەشە گوڵسپیەکەی کردبووە بەری و بە تۆقەیەکی سپی قژە ڕەشەکەی لە دواوە بەستبوو.. سووک سووک لێیان نزیکدەکەوتەوە و سەیری دەکردن.. سەیری دەکردن و قاقای لێ دەدا.. لەپڕ دەستی چەپی گرت بە یەکێ لە بۆریە ڕەشەکانی کەپری مێوەکەوە و پاڵی پێ دا.. بە مەکرێکی هەرزەکارانەوە سەری هەڵبڕی و بە «فەریال»ی وت:

ـ داوەشێیت.. چۆن کچێکی، لە سەری قەل زیڕەت کردووە..!!

ـ ئاخر دایکە خوێناوییە..!!

ـ جا با خوێناوییش بێت..!! دەبێت ئاوا بترسیت..؟!

جارێکی تر پەردەکەی بە سەر پەنجەرەکەدا دایەوە و نەیویست لەوە زیاتر چارەیان ببینێت.. سەرنجی کەوتەوە سەر کەروێشکە مردووەکان و لێیان نزیککەوتەوە.. هەر دووکیانی بە گوێچکە هەڵبڕین و خستنیە ناو قەفەزەکەوە.. قەفەزەکەی هەڵگرت و هێنایە ناوەڕاستی ژوورەکەیەوە.. لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت و بە سووکی دەستەکانی خستە سەریەوە.. سەری لە نێوان دەستەکانی دانا و لە پرمەی گریانی دا.. فرمێسکەکانی لە کەلێنی تەلەکانەوە تک تک بە سەر جەستەی کەروێشکە مردووەکاندا دەچۆڕان و پەیتا پەیتا تووکە نەرمەکانیان تەڕدەکردن.. کاتێکی زانی دەرگاکە ترازا و دایکی و خوشکی و «فوئاد» ئەبڵەق و سەرسام دەرکەوتن.. لە پێشدا سەیریان دەکرد و هیچیشیان پێی نەدەوت، دوایی

دایکی لێی هاتە پێشەوە و بە سەرسامیەوە لێی پرسی:
ـ ئەوە تۆ لێرەیت..؟!
بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی لێبکات و چاو ببڕێتە چاوەکانیەوە، دەستی ڕاستی خستە سەر شانی چەپی و پێی وت:
ـ ئەم کەروێشکە مردووانە چیین لەناو ئەم قەفەزە..؟! ئەوە بۆ دەگری..؟! ئەو مەکر و گێلاخەیەت لە چییە..؟!
«نەوال» بەبێ ئەوەی چاوببڕێتە چاویەوە و وەڵامی بداتەوە، بە شەرمێکەوە سەیری «فوئاد»ی کرد و خێرا سەری داخستەوە.. ئەوەندەی تر هەستی بە تەریقبوونەوە کرد و لە دڵەوە قێزی لە خۆی کردەوە.. «فوئاد» هاتە پێشێ و لە کەروێشکەکان ڕاما.. سەیرێکی «نەوال»ی کرد و بزەیەکی بۆ کرد.. دەستی چەپی خستە سەر قەفەزەکە و لێی پرسی:
ـ ئەوە زۆرت خۆشدەویستن، بۆیە ئاوا بەکوڵ بۆیان دەگریت..؟!
کە «نەوال» سەری هەڵنەبڕی و وەڵامی نەدایەوە، ئەو بە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی ئاماژەی بە مێیەکەیان کرد و پێی وت:
ـ دەزانی ئاوسە..؟! ئەگەر نەمردایە ئەمڕۆ سبەی دەزا.
«فەریال» لێی چووە پێش و بە مەکرێکەوە لێی پرسی:
ـ ئەوە چۆن دەزانی فوئاد..؟!
«فوئاد» دەستی ڕاستی بردە ناو قەفەزەکە و دەریهێنا.. دەریهێنا و لە چاوی «فەریال»ی نزیککردەوە، بۆئەوەی پیشانی بدات و تێی بگەیەنێت، کەچی ئەو وەکوو منداڵ خۆی خستە پەنای دایکی و بە مەکرەوە زرووکاندی:
ـ مەترسە شتەپیس، خۆ ناتخوات.. دەمەوێ پێت بڵێم، بە چیا دیارە ئاوسە.
کە «فەریال» هەر جورئەتی نەکرد لێی نزیکبکەوێتەوە و سەیری بکات، ئەو کەروێشکەکەی خستەوە ناو قەفەزەکە و لە «نەوال»ی پرسی:
ـ چیرۆکی ئەو کەروێشکە سپیەت بیستووە، کە دووپشکە ڕەشەکە پێوەی دەدات..؟!
ویستی بڕوانێتە چاوەکانی و پێی بڵێت: «نەخێر، نەمبیستووە»، کەچی

دایکی و خوشکەکەی بە جووتە دایانە قاقای پێکەنین و «فوئاد»یش لە دوای ئەوان دەستی پێکرد.. هەستی دەکرد ئەو قسەیە مانایەکی تیایە و ئەم لێی تێناگات.. ئیتر ئەوەندەی تر هەستی بە داماویی خۆی کرد و لە داخا شەقێکی قایمی لە قەفەزەکە هەڵدا.. ئینجا بۆی دانەویەوە و پری پیاکرد.. بردیە بەر دەرگای حەوشە و تا تینی تیابوو بە زەویەکەیدا کێشا.. کە گەڕایشەوە لە هەیوانەکەدا پێشیان لێیگرت و بەرەو ڕووی هاتن.. دایکی بە هەر دوو دەستی قژی خۆی ڕێکخستەوە و بە گاڵتە پێی وت:

ـ ئەی پێم نەوتی ئیتر کەروێشک نەهێنیتەوە ئەم ماڵە..؟!

کاتێ لەسەر کورسیە سپیەکە دانیشت و پشتی دایەوە، دەستی ڕاستی کرد بە گیرفانیا و پێی وت:

ـ هەر کاتێ ماڵی خۆتت کرد، دەتوانیت نەک کەروێشک، بەڵکوو سەگ و مەیموونیش بەخێوبکەیت.

هەر خێراش نامەیەکی دەرهێنا و پێی وت:

ـ بگرە ئەمە بۆ تۆ هاتووە.

«نەوال» دەیزانی «عەمار» ناردوویەتی و ویستی وەرینەگرێت، بەڵام بۆئەوەی بزانێت چی تیا نووسیوە و بە کوێ گەیشتووە، دەستی چەپی بۆ درێژکرد و بردیە ژوورەکەی خۆیەوە.. کاتێ زەرفە ڕەشەکەی هەڵپچڕی و خوێندیەوە، زانی، کەوا دایکی لە نامەکەی خۆیدا بۆی نووسیوە، ئەم حەزی کردووە و لە ڕووی نەهاتووە نامەی بۆ بنێرێت.. ئیتر ئەوەندەی تر پەست و نیگەران بوو و ڕقی لە هەموو شتێکی ناو ماڵەکە هەستا.. ئینجا تەواو هەستی کرد ئەم منداڵە و «عەمار»یش تەنها وەکوو منداڵێکی هەتیو بەزەیی پیادا دێتەوە.. هەر ئەو بەزەییەشە پاڵی پێوەناوە چەک هەڵگرێت و ژیانی خۆی بۆ بخاتە مەترسیەوە.. دەیویست ئێوارە کاتێ «فوئاد» ڕۆیشت و هەر خۆیان مانەوە، لەگەڵ دایکی بیکات بە شەڕ و هەرچی داخی دڵی هەیە پێی بڕێژێت، کەچی «فوئاد» ئەو حەفتەیە هەتا سەر لایان مایەوە و وەکوو کوڕی ماڵەکە هەڵسوکەوتی دەکرد.. نە باپیری و نە خاڵی و خاڵۆژنیشی لە ماڵ نەبوون و ئەوان بە ئارەزووی خۆیان تیایدا هەڵدەسووڕان..

باپیری ماوەیەکی زۆربوو لەگەڵ «ست هالە»ی پووری دەژیا و جار جار بە میوانی دەهاتەوە بۆ لایان، چونکە مێردەکەی درەنگ درەنگ دەهاتەوە و ئەو بە تەنیا مابووەوە.. خاڵی و خاڵۆژنیشی دوو حەفتە مۆڵەتیان وەرگرتبوو و بۆ کەیف و سەفا چووبوونە «حەببانیە».. سەیر ئەوەبوو، «فوئاد» بە هەموو شێوەیەک دەیویست خۆی لەم نزیکبکاتەوە و وەکوو دایکی و خوشکەکەی گاڵتە و دەسبازیی لەگەڵدا بکات.. بەڵام ئەم خێسەی لێدەکرد و ڕووی نەدەدایە.. کاتێ خۆیان دەگۆڕی و دەچوون بۆ دەرەوە، ئەم لەگەڵیان نەدەچوو و بە تەنیا لە ماڵ دەمایەوە.. ئەو جارە دایکی سەرزەنشتی کرد و پێی وت:

ـ یانی چی تۆ ئاوا لە ئێمەت هەڵپێچاوە، نە قسەمان لەگەڵ دەکەیت و نە لەگەڵمان دێیتە دەرەوە..؟!

«فوئاد» سەیرێکی ئەمی کرد و بەدەم پێکەنینێکی خۆشەوە بە «ست سوعاد»ی وت:

ـ ئەویش کەسی خۆی هەیە بیدوێنێت و بیهێنێتە پێکەنین.

ئەم لچێکی لێ هەڵقورتاند و ڕووی خۆی کرد بەملاوە.. کەچی ئێوارەی ڕۆژی هەینی، کاتێ «فوئاد» بە فانیلە و شۆڕتێکی سپیەوە لە حەمامەکە هاتە دەرێ و بە خاولیە ڕەشە لاکێشەییەکە سەری خۆی وشکدەکردەوە، ئەم نووسینێکی سەیری وەکوو نووسینی سەر دەستی هاوڕێکانی «شاسوار»ی لەسەر قۆڵی ڕاستی بینی و داچڵەکی.. بەبێ ویست سەری بردە پێشێ و لێی پرسی:

ـ ئەوە تۆ چییت لەسەر دەستی خۆت نووسیوە..؟!

ئەو سەرێکی بادا و پێی وت:

ـ ئەو هەموو کاتە لەم ماڵەم، قسەیەکت لەگەڵدا نەکردووم، ئێستا وا دەمەوێت بڕۆم، پرسیاری ئەمەم لێدەکەیت..؟!

ئەم تەریقبووەوە و سەری خۆی لەبەر نا، کەچی ئەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و پێی وت:

ـ بە داخەوە من ناتوانم بۆتی بخوێنمەوە.. ئەگەر بۆشتی بخوێنمەوە، هەر لێی تێناگەیت.

هەر بە شەرمەوە سەری هەڵبڕی و پێی وت:

ـ ئەی نابێت بۆم بکەیت بە عەرەبی..؟!

ـ ئەمە شتێکە لە زمانەکانی ترا ماناکەی دەگۆڕێت.

ـ لەبەرچی..؟!

ـ ناتوانم پێت بڵێم.

لەو گۆڕستانەی «مام وەیس»ی باوکی «شاسوار»یشی تیا نێژرابوو و زۆر جار لەگەڵ «شازە»دا سەردانیان کردبوو، لەناو پەرژینێکی کەمێ نزم، کە لە شێوەی دەرگا ڕەشوسپیەکەی «شاسوار»دا بۆیەکرابوو و لەبەر تیشکی هەتاودا دەبریسکایەوە، دوانزدە گۆڕی کورت و کورتر، درێژ و درێژتری بینیبوو و نووسینی سەر کێلەکانیان، ئەگەرچی بەپیتی عەرەبیی و بە بۆیەی ڕەشی تۆخ تۆخ نووسرابوون، کەچی ئەم لە مێژووی مردنەکەیان زیاتر، کە (١٦ ـ ٣) بوو و لە شێوەی خەڕەکی ژنە لادێیە سپیپۆشەکان دەهاتە بەر چاوی، هیچی تریان لێ تێنەدەگەیشت و لێیببوو بە مەراق.. خەڵکی شاریش بە ئارەزووی خۆیان چیرۆکی جۆراوجۆریان بۆ هەڵدەبەستن و بڵاویاندەکردنەوە.. ئەم گاڵتەی لە هەموو ئەو چیرۆکانە دەهات و ئەوانەیشی بە گەمژە دەزانی، کە گوێیان لەو سەرگوزشتە بێتام و بێلەزەتانە دەگرت و ئاخ و داخیان بۆ هەڵدەکێشان.. ڕۆژی سەرژمێرییە گشتیەکە، کاتێ ئەو دوو پیاوە قەموورەی کتومت لە یەکتر دەچوون و بە موو جیاوازییان نەبوو، بە جلی ڕەش و کڵاوی قووچی سپیەوە، زۆر بە سووکی دەرگایان ترازاند و چەند بڵێی بە ئەسپایی هاتنە حەوشەوە، تا ناویان لەو دەفتەرە لاکێشەییەدا بنووسن و ئیمزاکەیان پێبکەن، ئەوەی بەرگە ئەستوورەکەی بە هێڵی ڕەشوسپی نەخشابوو و یەکێکیان خستبوویە بن هەنگڵی ڕاستیەوە، ئەم دانیشتبوو و قەیتانە ڕەشەکانی لە پێڵاوە سپیەکانی «سیامەند» هەڵدەکێشا، کە هەر یەکەیان شەش کونی چوارگۆشەییان پێوە بوو و قەراغەکانیان بە سوورێکی تۆخ تۆخ بۆیە کرابوون، بیری لەوە دەکردەوە چیرۆکێکی جیا لە چیرۆکی ئەوانیان بۆ هەڵبەستێت و لە پێش هەموو کەسێکیشەوە بۆ «شاسوار»ی بگێڕێتەوە، بەڵام هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا بۆی ڕێکنەدەخرا و ڕووداوێکی وای بە خەیاڵدا

نەدەهات کەمێ جێگای باوەڕبێت.. چەند جار جەمسەری قەیتانەکانی لە یەکتر گرێدان و کردنیەوە.. گرێیدان و کردنیەوە.. دەربهێنان و پیایداکردنەوە.. پیایداکردنەوە و دەربهێنانەوە، هیچ ئەنجامێکی دەسگیر نەبوو و ناو سەری کەوتە خولانەوە.. جار جاریش سەیری «شازە» و «سیامەند»ی دەکرد و لێیان وردەبووەوە، کە ئەمیان لەسەر کورسیە سپیەکەی هەیوان، لە بەرامبەر مەکینە ڕەشەکەی دروومان دانیشتبوو و ئۆبەی سپیی باریکی بە کراسە ڕەشەکەی قوتابخانەی ئەودا دەگرت.. ئەویان بە باوەشێنە سپیەکە خەڵووزی ناو مەقەڵیەکەی گەشدەکردەوە و لەگەڵیا هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا، بەبێ ئەوەی سەریش هەڵبڕن و سەیری یەکتر بکەن، یان بێن بە لای ئەو پیاوانەوە و لێیان بپرسن، ئاخۆ بۆچی هاتوون و ئەو ژمارەیە چەندبوو لەسەر دەرگاکەیانیان نووسی.. جار جاریش چاوی بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر دەکەوتە ڕەشکەوپێشکە و سیمای ئەو دوو مارە ڕەشەی دەبینی، کە شەوی تەرزەبارانەکە لە خەونیا ئازا ئازا گرتنی و کردنی بە قەیتانی پێڵاوە سپیەکانی.. سەر و کلکیانی لە یەکتر گرێدان و لەسەریا کەوتنە جووڵەجووڵ.. سەرەتا لەسەر شەقامی تازەقیرتاوکراوی «ڕەشید»دا سەفەرتاسێکی سپیی بنکرەشی بە دەستەوە گرتبوو و پێیانەوە تیژ تیژ ڕایدەکرد.. ڕایدەکرد و بەبێ ئەوەی بزانێت مەبەستی چییە، تا هێزی تیابوو هاواری دەکرد و دەیوت:

ـ البعير من يوگع تكثر سچاچينه.. البعير من يوگع تكثر سچاچينه.«٢»

ئەوێی بەجێهێشت و خۆی لەسەر بەرێکی ڕەشوسپیدا بینیەوە، کە لەملا و لەولایەوە ژنەقەرەجی ڕەشپۆش کز کز و زۆر زۆر خەمناک لەسەری دانیشتبوون و قازە ئێجگار سپیەکانیان بە قاچی بەستراوەوە لە بەردەمی خۆیان دانابوو.. ئەم بەبێ ئەوەی بزانێت بۆ کوێ دەچێت و چ مەبەستێکی هەیە، سەفەرتاجەکەی دەستی بادەدا و ڕایدەکرد.. بایدەدا و ڕایدەکرد.. ڕایدەکرد و هاواری دەکرد:

ـ البعير من يوگع تكثر سچاچينه.. البعير من يوگع تكثر سچاچينه.

هەرچەندیش هەنگاوەکانی گورجەکردەوە و قایمتر ڕایدەکرد، ئەو ڕێگایە هەر نەدەبڕایەوە و کۆتایی نەدەهات.. کۆتایی نەدەهات و نەدەگەیشتە ئەوسەری

بەرەکـەوە.. دواتر هەرچۆنێ بوو بەلای دەسـتـە ڕاسـتـدا لای دا و بە نێـوان دوو ژنەقەرەجی لەیەکچوودا ڕەتبوو.. تیژتر ڕایکرد و کەوتە سەر شەقامێکی تر، کە نەیدەزانی کوێیە و بۆچی ئەو هەموو جۆیەیان لەسەر ڕۆکردووە.. دەنکە جۆکان لە ژێر قـاچەکانیـدا کرتە کـرتیـان لێـوە دەهات و ورد ورد دەبوون.. ورد ورد دەبوون و دەبوون بە ئاردێکی سـپی سـپی.. شـوێنپـێـکانی قـوولـدەبوون و لە شـێـوەی تەڵەمشکی ڕەش ڕەش بەجێدەمان.. هەر جارێ ئاوڕی لە دواوەی خۆی دەدایەوە و دەیبینین، لە ترسا زیڕەی دەکرد و لەجیاتی هەموو شتێکیش دەیوت:

- ألبعير من يوگع تكثر سچاچينه.. ألبعير من يوگع تكثر سچاچينه.

هەر بەو ترس و لەرزەوە لەبەر دەرگـا سـپـیـەکـەی قـوتابخـانەی خـۆیاندا هەڵوێستەیەکی کرد و بنکی سەفەرتاجەکەی لەسەر سەکۆ ڕەشوسپییەکەدا دانا، کە جارێکیـان «جەمیلە»ی فـەڕاش بە سەتڵێ کەفـاوەوە لەسەری هەڵخلیسکابوو و دەستی چەپی شکابوو.. مەنجەڵەکانی لە باریەکـتـر دەرهێنان و لە دەسکەکـەی جیـایکردنەوە، کە شیـریان لەسەر دەرژانەوە و سەرەمێکوتەی ڕەش ڕەش مەلەیان تیـادا دەکـردن.. هەر چواریانی بە تەنیـشت یەکـەوە دانان و جـوان جـوان لێـیـان وردبووەوە.. ئەوسـا مـارەکـان بە بەر چاویەوە هێـواش هێـواش سـەر و کلکیـان لە باریەکـتـر دەرهێنا و سووک سووک خۆیان لە کونی قـەیتـانەکان دەربازکـرد.. وردە وردە لەبەر چاویا ئەسـتـوور و درێژ دەبوون و بە شـێـوەیەکی زۆر سـەیر دەیانفیشکاند.. لەملا و لەولاوە ملیان بۆ ناو مەنجەڵەکان درێژ دەکرد و دانە دانە بە زمـانە زۆر سپـیـەکـانیـان، کـە هەر دەتـوت لە تەپەدۆر درووسـتکراون و لەبەر ڕۆشنایی گـڵـۆپە سـوورەکـەی سـەر سـەری دەبریسکانەوە، سـەرەمێـکوتەکـانیـان دەقۆزتنەوە و ئاودیوباندەکردن.. دواییش کە هەر هەموویان هەڵلووشین و تۆویان بڕینەوە، بە ئەسـپـایی بە ژێر دەرگـا ئاسنەکـەدا خشکەیانکرد و چوونە ئەودیو.. چوونە ئەودیو و لە چاوانی ئەم ونبوون.. «نەوال» خێرا و زۆر بـە ئاسانی قـاچی لە پێڵاوەکانی هێنایە دەرێ و خستینیە سەر کۆنکرێتە ڕەقەکەوە، کە دوای ئەوەی قـەیتـانەکـانیـان تیـا نەمـابوون لە پێی شل بووبوون و نەیدەتوانی هەنگاویان پێ بنێت.. کراسە سپیە گوڵگوڵیـەکەی تا سـەر ئەژنۆ هەڵکرد و بە سووکـی بۆبان

دانەویەوە.. بە دەســتی ڕاست تاکی چەپ و بە دەســتی چەپ تاکی ڕاســتی هەڵگرت و لە چاوەکــانی نزیکیکردنەوە.. چەند هەنگاوێ لەولاتر، ڕێک لەو شوێنەی جارێکیان دایکی ماچیکرد و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ ما ینفع العطشان کثر السبوح، ولا ینفع الجوعان شم التنانیر.«٣»

تا هێــزی تیــابوو هەڵیــدان و وەکــوو جــووتێ کــۆتری عــینوانلی بە تەقڵــە بەرزبوونەوە.. کەوتنە ناو حەوشەی قوتابخانە و شڵپەیان لێوەهات.. هەر خێرا دەرگــا ترازا و «ست ســامــیــە»ی بەڕێوەبەر بە کــراســێکی ڕەشی گــوڵگوڵیی سەرەمێکوتەیی نیــوقــۆڵ و جــووتێ نەعلی سپــیــەوە دەرکەوت.. قــژە ئێــجگار ڕەشەکەی کردبوو بە دوو پرچی ئەستوور و بەملا و بەولای ملی سپی و گۆشتنیدا شــۆڕیکردبوونەوە.. چاوەڕێ بوو بە تیــتک قــایم قــایم ڕایکێــشــێت و توند توند سەری بکێشێت بە دیوارە سپیەکەدا، یان پیایدا هەڵبشاخێت و تێر تێر جنێوی سووکی پێ بدات، کەچی بە پێچەوانەوە پەنجەکانی، کە نینۆکەکانیانی بە سوورێکی تۆخ تۆخ بۆیەکردبوون و لەبەر ڕۆشنایی گڵۆپە سوورەکەدا بە شێوەیەکی زۆر زۆر سەیر دەبریسکانەوە، لە یەکتری ئالاندن و بە چاوە ڕەش و گەورەکانی کز کز کەوتە سەیری ئەم و مەنجەڵە شیرەکان.. خۆیشی نەیدەزانی بۆچی هەرکە «ست سامیە»ی بینی و لە سیمــای دەموچاوی وردبووەوەوە، هەستی بە وشکیی دەم و قورگی کرد و وایدەزانی ها ئێستا نا ساتێکی تر لە تینوا دەخنکێت.. دەخنکێت و وەکوو پەیکەر بۆ هەتا هەتایە لەبەر ئەو دەرگایە دەمێنێتەوە.. خێرا خێرا، بەبێ ئەوەی بزانێت بۆچی، یان شەرم لە بەڕێوەبەری خۆی بکات، کراس و ژێرکراس و مایۆکەی داکەند و وەکوو ئەو پشیلە ڕەشەی شەوی مانگگیرانەکە، لە ماڵی «عەمار»دا بینی دەمی خستبووە مەنجەڵی شیری هەیوانەکەوە و بۆ بەیانیەکەی لە خەستەخانە بۆ «شازە» و لە ڕێگای مۆزەخانەدا بۆ «سیامەند»ی گێڕایەوە، لەسەر دەست و ئەژنۆکانی هەڵترووشکا و دەمی خستە مەنجەڵەکانەوە، کە لەبەر چاویا وەکوو ئەو قوتووانەی جارێکیان «عەدنان» هەر لەبەر ئەم دەرگایە کردبوونی بە پێڵاو و سووک سووک پێیان دەڕۆیشت، دەردەکەوتن و دەبریسکانەوە.. هەر چواریانی خواردەوە و هەر تینوویەتی نەشکا.. ویستی ڕاکات و بچێتە بەر

تانکیە سپیەکەی ناوەڕاستی حەوشەی قوتابخانە، کە شێوەیەکی لاکێشەیی هەبوو و لەسەر چوار بلۆکی ڕەشی زل دانرابوو، دەمی بنێت بە شێرەکەیەوە و ئاو بخواتەوە، ئەو شێرەیەی لە شێوەی پەڕەسێلکەی ڕەشی سادە دروستکرابوو و لە کاتی کردنەوەیدا زیکەیەکی سەیری لێوە دەهات، بەڵام «شازە»ی بیردەکەوتەوە و دڵی دادەخوریا، کە هەموو جارێ دەستی دەکردە ملیەوە و پێی دەوت:

ـ بە سائەقەت بم نەونەوەکەی خۆم نەکەی ئاوی ئەو قوتابخانەیە بخۆیتەوە.

هەر لەبەرئەوەش بوو مەتارەیەکی سپیی قازیی پلاسکۆی بۆ کڕیبوو و بە توێکڵی وشکی هەنار بۆی پاکدەکردەوە، کە دوو نقێمە ڕەشەکەی چاوی لە بەر ڕووناکییدا بە شێوەیەکی زۆر زۆر سەیر دەبریسکانەوە و هەندێ جار بە زمان تێر تێر دەیلستنەوە.. لەگەڵیا چاوەکانی توند توند دەنووقاندن و تەزوویەکی سەیر سەیر بە سەرتاپای گیانیدا دەهات، کە لە هیچ حاڵەتێکی تردا هەستی پێینەدەکرد و لە ناخی ناخەوە ڕایدەتەکاند.. هەر وەرز دەگۆڕا و هەوا کەمێ گەرمدادەهات، «شازە» بۆی پڕدەکرد لە ئاوی سارد ساردی ماڵەوە و بە قایشە ڕەشوسپیەکەی دەیکردە ملیەوە.. هەندێ جار توند توند دەستی دەگرت بە سەرقاپەکەی و پێی دەوت:

ـ ئەگەر تەواوبوو، نەکەیت لە ئاوی ئەو تانکیە پڕیبکەیتەوە.. باشە ڕۆحەکەی شازە..؟!

هەر جارێکیش ئەم بە سەرسوڕمانەوە ڕووی تێدەکرد و لێی دەپرسی:

ـ بۆچی ئامۆژن..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ئەو هەناسەیەکی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا و کزکز پێی دەوت:

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

ئەو جارەی تووشی نەخۆشیی سووریژە بوو و لە تاوی تای گەرم خێرا خێرا دەم و قوڕگی وشکدەبوو.. «شازە» هەر زوو زوو بۆی پڕدەکرد لە ئاوی سارد سارد و ئەم لەسەر سنگی خۆی دادەنا.. جار جار بەسەر دەمی خۆیەوەی دەنا و چۆڕی لێدەبڕی.. جار جاریش دەنووکە پانەکەی دەخستە ناو دەمیەوە و سووک سووک دەیمژی.. دەیمژی و لەگەڵیا گازی قایم قایمی لێدەگرت.. ئەو ئێوارەیەی «شازە»

خۆی گۆڕی و قاپە قوولەکەی ئەمی لەسەر سینیە ڕەشەکە هەڵگرت، کە بنکەکەی بە وێنەی گۆرانیبێژە ڕەشپۆشەکە نەخشابوو و جارێکیان پشیلەکەی «ئەدیب» بە زمان لستبوویەوە، چوو ماست و دۆشاوی بۆ بکڕێت و ئەمی بەتەمای «شاسوار» بەجێیهێشت.. دانەویەوە و بە ئەسپایی پێی وت:

ـ کاکە شاسوار با لەبەر نەوال ئەم دەرگایە هەر کراوە بێت، چونکە تاکەی گەرمە چاوەکەم.

هەرکە «شازە» ڕۆیشت و لە دەرگای حەوشە ئاودیوبوو، ئەم بە سستی ڕووی بە لای «شاسوار»دا وەرگێڕا و لێی پرسی:

ـ مامە شاسوار بۆچی ئامۆژنم حەزناکات من ئاوی تانکیی قوتابخانە بخۆمەوە..؟!

ئەو سەرێکی بادا و پێی وت:

ـ چونکە وادەزانێت تۆ دەنگت خۆشە و کە گەورە بوویت، دەبیت بە گۆرانیبێژێکی زۆر چاک.

ئەم حەپەسا و لێی پرسی:

ـ بۆچی ئەوەی دەنگی خۆش بێت، نابێت لە قوتابخانە ئاو بخواتەوە..؟!

ـ ئا، چونکە ئاوی قوتابخانە دەنگی بنیادەم ناخۆش دەکەن، بەڵام خۆ تۆ نە دەنگت خۆشە و نە دەبیت بە گۆرانیبێژیش.

ـ من دەنگم خۆش نییە..؟! من نابم بە گۆرانیبێژ..؟!

ئەمەی وت و لە داخا مەتارەکەی بە پڕی بۆ ناو دەرگاکە هەڵدا.. لەولاتر کەوتە سەر تاکی ڕاستی پێڵاوە ڕەشەکەی «شاسوار» و سەرقاپەکەی ترازا.. قلێپبووەوە و بلق ببلق ببلق.. بلق بلبق بلبق، ڕژایە ناو پێڵاوەکەوە.. «شاسوار» بە دەستی ڕاست و بە سووکی دەیکێشا بە ڕوومەتی چەپی خۆیدا و پێدەکەنی.. پێدەکەنی و پێی دەوت:

ـ نەموت..؟! نەموت تۆ دەنگت خۆش نییە و نابیت بە گۆرانیبێژ..؟!

ئینجا بە پڕتاوی هەستا و چوو بۆ لای دەرگاکەوە.. بە دەستی چەپ پێڵاوەکەی هەڵگرت و ئاوەکەی تیا بەتاڵکرد.. پیشانی دا و بە شێوەیەکی زۆر

سەیر، کە ئەم تەواو دەترسا و دەیزانی گاڵتەی لەگەڵدا ناکات، پێی وت:

ـ قازەکە لە ڕەشایی شەودا دەتوێتەوە و تۆ لە تینوا دەخنکێیت چاوەکەم.

ئەو شەوەش لەبەر دەرگای ئەو قوتابخانەیەدا، لەپڕ دەنگی «شاسوار»ی هاتە گوێی و وەکوو ئەوسا پێی دەوت:

ـ قازەکە لە ڕەشایی شەودا دەتوێتەوە و تۆ لە تینوا دەخنکێیت چاوەکەم.

هەر بە ڕووتی و چەند بڵێیی بە پرتاو بە تەنیشت «ست سامیە»دا لە دەرگا چووە ژوورەوە و بەرەو پۆلەکان ملی نا.. خۆی بە مشکێکی زارەترەک و قوتابخانەکەی بە تەڵەمشکێکی گەورە دەهاتە بەر چاوی و قێزی لێیدەکردەوە.. سەری دەکرد بە هەر پۆلێکدا و چاوی دەگێڕا، ئەو مریشکە ڕەشانەی لەسەر کورسیە سپیەکاندا قاچیان بەستبوون و سەرو گۆشەپێوی سوور سووریان کردبوونە مل، تێکڕا دوقدوودووق دودووق.. دوقدوودووق دودووق دەنگیان لێ هەڵدەبڕی و دەنگەکەیان لێ وندەکرد.. تینوێتیش تا دەهات زۆری بۆ دەهێنا و حاڵی پەرێشانتر دەکرد.. هەستی دەکرد ها ئێستا نا ساتێکی تر سەرەنگرێ دەبێت و بە دەما، یان بە پشتا دەکەوێت، کەچی هێشتا ئاگای لەوە مابوو گوێی بۆ دەنگەکە شلبکات و وەکوو سەری دەزووی سپی بیدۆزێتەوە.. بیدۆزێتەوە و وێنەی ئەو مێروولە ڕەشە ورد وردانەی بەیانیانی زوو زووی هاوین، دانە دانە لە دیوارە سپیەکەی هەیوانی ماڵی خۆیاندا دەهاتنە دەرێ و سووک سووک و ڕێک ڕێک بەسەر دەزوێکی باریک باریکی وەهمییدا بۆ ناو ژێرپیاڵە شیریەکەی ڕێچکەیان دەبەست، ئاوا بیگرێت و خۆی بگەینێتە لای.. دەمی بخاتە ناو دەمی و هەموو تەڕایی ئەو لەشەی هەڵمژێت، بەڵام ئاخ..!! لە گارەگاری مریشکی قاچبەستراو و دەنگی ناسازی «ست سامیە»ی بەڕێوەبەر بەولاوە، کە هاواری دەکرد و دەیوت:

ـ یرکب بالماعون ویفرغ بالجدر.«٤»

هیچی تری نەدەبیست و ئەوەندەی تر هەستی بە ڕەقبوونەوەی سیەکانی دەکرد.. ئەو سیانەی کە جارێکیان لەو ئیشاعە ئێجگار ڕەشەی «شازە» بە ئامێرە چەند بڵێیی سپیەکە بۆی گرت و لەسەر تەختە سپیەکەی خەستەخانە پیشانی دا، وەکوو دوو تەڵەمشکی زۆر زۆر سپی هاتنە بەر چاوی و دڵی تێکهەڵات..

ڕشایەوە و ئاوێکی ڕەش ڕەشی هێنایەوە.. «شازە»یش لەجیاتی ئەوەی بۆی بگریت و قژە درێژ و ڕەشەکەی بۆ بڕنێتەوە.. سنگە پان و سپیەکەی بکوتێت و باوکەڕۆی بۆ بکات، قاقای لێ دەدا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر، کە ئەم تەنها خۆی دەیزانی چەند ڕقی لێیەتی و چۆن دڵی پێی تێکدەچێت، پێی دەوت:

ـ ئەوەی منی خۆشنەوێت و ڕقی لێم بێت، ئاوا قازەکەی ناخی دەتوێنمەوە.

ئەو ڕۆژە لە ماڵەوە، بۆئەوەی پیسیی ناو هەناوی بشواتەوە و چیتر قێز لە ناخی خۆی نەکاتەوە، هەر فریادەکەوت مەتارەکەی پڕکات لە ئاو و بینێت بەسەر دەمیەوە.. ئەوەندەی خواردەوە و خواردەوە، سکی ئاوسا و وەکوو مەشکەی ئەو ژنە لادێیە سپیپۆشەی لێهات، کە جارێکیان لەگەڵ «سیامەند» چوون بە کامێرا ڕەشوسپیەکە وێنەیان گرت و سەر و جامی ڕەشی بۆ پڕکردن لە دۆی خەست.. ئەم بە دەستی ڕاستی جامەکەی بۆ دەمی هەڵبڕی و بە دەستی چەپی دەمبەبەمب بەمبەمب.. دەمبەبەمب بەمبەمب لە مەشکەکەی دەدا.. لێی دەدا و بە دەمیش لاساییدەکردەوە.. ژنەکە پێکەنی و بە ڕوویەکی ئێجگار خۆشەوە پێی وت:

ـ تۆ کچێکی زۆر زیرەکیت و دەتوانیت دەنگی ناڵی ئەسپی ڕەش دەرکەیت.

دواییش قۆڵی ڕاستی هەڵکرد و خستیە سەر مەشکەکەی، کە وێنەی دووپشکێکی لەسەر کوتابوو و دەمی بۆ خاڵەکەی سەر مەچەکی کردبووەوە.. بە پەنجەی دەستی چەپی ئاماژەی بۆ ئەم کرد و بە لەفزێکی زۆر شیرین و خۆش لێی پرسی:

ـ کچی جوان ئەو شتە چییە..؟! پشتی ڕەشە و دەیسوتێنین، سکی سپییە و دەمانسووتێنێت.

«نەونەو» خێرا دەستی ڕاستی خستە سەر مەشکەکە و وتی:

ـ ئەم شتەیە.

ئەو سەری بادا و زۆر سەنگینانە و چەند بڵێی بە نەرم و نیانیی وتی:

ـ نەتزانی کچی خۆم.

ئەم ئەوسا پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی خستە سەر ناوچەوانی و بیریکردەوە.. لەپڕ و بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەستی ڕاستی لەسەر کۆشی خۆی

دانا و وتی:

ـ شەنتووزە.

هەر ئەوەندە ئەم دەمی کردەوە و ئاوای وت، «سیامەند» دایە قاقای پێکەنین و ژنە تەواو کەللەیی بوو.. ڕووی کردە «سیامەند» و پێی وت:

ـ گەوادی نامەرد، ئێوە لە شار ئاوا منالّ فێری ئەخلاق دەکەن..؟!

«سیامەند» ترسا و کەمێ چووە دواوە، کەچی نەشیدەتوانی دان بە خۆیدا بگرێت و پێنەکەنێت.. هەر ئەوەندەی پێکرا دەستی چەپی بخاتە سەر شانی ڕاستی «نەونەو» و هەر بە پێکەنینەوە پێی بڵێت:

ـ نەیزانی خوشکم.. منالّەو هەر ئەوەندە ئەقڵی بڕدەکات.. دەسا پێشت ناخۆش نەبێت مەتەڵەکەی تۆ هەر لەوە دەچێت.

ژنە ئەوەندەی تر تووڕەبوو و پێی وت:

ـ ئاخر گەوادی بێشەرەف، شەنتووزت دیوە پشتی ڕەش بێت و بیسووتێنین، سکی سپی بێت و بمانسووتێنێت..؟!

«سیامەند» دەستی لەسەر شانی «نەونەو» هێنایە خوارێ و زۆر هێمنانە پێی وت:

ـ نە بە خوا نەمدیوە..!! بەڵام باشە چییە ئەو مەتەڵە..؟!

ـ بۆ نازانی مەنجەڵە..؟! ئەی ئێوە مەتەڵێ شتێکی خۆش نازانن..؟!

دواییش «نەوال» هەرچەند سەیری وێنەکەی دەکرد و لێی ورددەبووەوە، کە لە چوارچێوەیەکی ڕەشوسپییان گرتبوو و لە سووچێکی دیواری ژووری میوانیاندا هەڵواسیبوو، ئەو ڕۆژەی بیردەکەوتەوە و ناو دەمی بۆ ئەو دۆیە خەست و خۆڵە دەبوو بە ئاودڕکەی لیک، کە بۆ یەکەمجار خواردیەوە و ئەو هەموو لەزەتەی لێبینی.. مەتارەکەی پڕدەکرد لە ئاو و لە بەرامبەری دەوەستا.. دەیخواردەوە و سەرنجی لێ دەدا.. ئەو ئێوارەیەی پیاوە کورتەبنەکەی دیشداشەیەکی سپیی سادەی پۆشی بوو و بە چەرخە ڕەشەکەی، چەقۆ سپیە دەسکڕەشەکانی لە ناوەڕاستی حەوشەکەیاندا تیژدەکردەوە و بەردەوام سەری لەگەڵ بادەدا، ئەم لە ئاستی وێنەکەدا وا مەست بووبوو و بە شێوەیەک خەیاڵی ڕۆیشتبوو، ئاگای

لەوە نەمابوو میزی کردووە بە خۆیا و وا بە لا ڕان و پووزیدا دێتە خوارەوە.. کاتێکیش «شازە» بە ئاگای هێنایەوە و پێی وت:

ـ ئەوە نەوال تۆ گوێت لێنییە ئەم پیاوە ئەو گۆرانیە خۆش خۆشانە دەڵێت..؟!

دەستی ڕاستی خستبووە سەر کۆشی و پەنجەکانی لەسەریا وا بە یەکەوە لکابوون، هەستی دەکرد تەختەسڕەکەی پۆلە و موچوڕکی پیادادەهات، کە لە لاستیکێکی سفتوسۆڵی ڕەش و پارچە لبادێکی سپیی زۆر زۆر زبر درووستکرابوو و هەر جارێ قۆڵی هەڵدەکرد و تەختەڕەشەکەی پێ دەسڕی، لەناو دەستیا گەرمدادەهات و ئارەقیدەکردەوە.. ئارەقیدەکردەوە و بۆنی تووکی ڕەشی سەر سنگ و بنباڵی «شاسوار»ی لێدەهات.. ئەو ڕۆژەی چوار سیستەرەکە هاتن منالانی قوتابخانە بکوتن و منالێکی چاوڕەشی پۆلی دوو لە ترسا ڕۆحی دەرچووبوو، «ست سامیە» تەختەسڕەکەی لە نێوان هەر دوو ڕانی ئەمدا دۆزیەوە و لە داخا تا تینی تیابوو لە پەنجەرەکەوە هەڵیدایە حەوشەی قوتابخانەوە.. ئەم چاوی لێبوو بەر تانکیەکە کەوت و دەنگێکی ئێجگار سەیری لێ بەرزبووەوە.. ئینجا ئەمی بە قژ ڕاکێشا و سەری کێشا بە تەختەڕەشەکەدا، کە بە تەباشیری سپی سەرتاپای نووسرابوو و لەبەر چاویا وەکوو بەرە سووتاوەکەی «شازە» و دەرگا داخراوەکەی «شاسوار» دەهاتە بەر چاوی.. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد «ست سامیە» ڕووتی بکردایەتەوە و زۆر دڵڕەقانە بە تەختەسڕەکە تێی بکەوتایە.. حەزی دەکرد هەموو گیانی سووربێتەوە و شوێنی تەختەسڕی لەسەر دەربکەوێت، بۆئەوەی هەست بکات جەستەیەکی هەیە و بێجگە لە خۆی، کەسانی تریش دەیبینن و بیری لێدەکەنەوە، کەچی «ست سامیە» وەک بڵێی ناخی ئەو ببینێت و ورد ورد بیخوێنێتەوە، هەر خێرا ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و بە دەنگێ، کە هورووژمی گریانێکی ناکاوی دایکانە تەنگی پێ هەڵچنیبوو و لەگەڵ لەرەیەکی ئێجگار بەسۆزدا دەردەچوو، پێی وت:

ـ هەستە بچۆ دەموچاوت بشۆ و چۆڕێ ئاو بخۆرەوە.. ئیتر تۆ گەورەبوویت رۆحەکەم، واز لە سەرەڕۆیی بێنە.. دە بەس وام لێبکە ئاوا دڵڕەقانە تێتهەڵدەم و دواییش بەزەییم پیاتا بێتەوە.

ئەم خێرا سەری هەڵبڕی و بە دەستی چەپی قژی لەسەر چاوی لادا.. بێشەرمانە وەک بڵێی قسە لەگەڵ منالآنی گەڕەک بکات و بیەوێت تەواو ڕقی هەستێنێت، لێی هاتە پێشێ و پێی وت:

ـ من گۆرانیبێژم لە قوتابخانە ئاو ناخۆمەوە.

کچان تێکڕا دایانە قاقای پێکەنین و ئەبلەق ئەبلەق کەوتنە سەیرکردنی، بەڵام «ست سامیە» وەک بڵێیت دەمێک بێت چاوەڕێی ئەو قسەیەی لێکردبێت و دەقاودەق وەڵامەکەی بۆ ئامادە کردبێت، دەمودەست سەری بادا و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر پێی وت:

ـ نا.. نا لەبەر ئەوە نییە..!!

ویستی ڕووی تێکات و پێی بڵێت، ئەی لەبەر چییە، بەڵام خۆیشی نەیزانی بۆچی لەپڕ سەری داخست و وای نەوت.. دواییش لە وانەی «مێژووی تازەی عەرەب»دا کاتێ بەرامبەر بە تەختەڕەشەکە و لەسەر کورسیە سپیەکەی خۆی دانیشتبوو و لە ژێر کراسە ڕەشەکەیدا هەر دوو دەستی لەملا و لەولاوە خستبووە ناو گۆرەویە سپیەکانی، سووک سووک و نەرم نەرم پووزەکانی دەشێلا و ورد ورد بیری لێکردەوە.. بیری لێدەکردەوە و لە خۆی دەپرسی: «ئایا بە ڕاستیی من گۆرانیبێژم و لەبەر ئامۆژنم ئاو لە قوتابخانە ناخۆمەوە، یان.. یان.. یان چی..؟! تووخوا چی..؟!».. زۆری وت و وتەوە.. وتی و وتیەوە.. گەلێکی هێنا و برد.. بردی و هێنایەوە، هیچی بۆ ڕوون نەبووەوە و نەگەیشتە هیچ سەرەنجامێک.. ئەوەندەی دەزانی حەزی دەکرد قوتابخانە بەجێبهێڵێت و بە خێرایی بگەڕێتەوە ماڵ.. حەزی دەکرد زوو زەنگەکە لێبدات و بەبێ ئەوەی چاوەڕێی «بولدان»ی هاوپۆلی بکات، کە زۆربەی ڕۆژ بە یەکەوە دەهاتنەوە و بە جووتە لاسایی مامۆستاکانیان دەکردەوە، جانتا ڕەشوسپیەکەی هەڵگرێت و بیدات بە شانیا، کە ڕۆژی پێشوو یەکێ لە کچە هار و هاجەکانی پۆل بە قەڵەمی سووری تۆخ تۆخ وێنەی کوڕێکی ڕووتی لەسەر کێشابوو و لە ژێرەوەش نووسیبووی «گوللەبەندی ڕەشوسپی».. بە پێچەوانەی ڕۆژانیش حەزی دەکرد بچێتەوە لای دایکی، نەک لای «شازە» و دایکی ببینێت وا لە مووبەقەکەی خۆیان و لەناو دەسکەوانە

سپیەکەدا بیبەری ڕەش دەکوتێت.. ئەو قایم قایم لێی بدات و ئەم لەگەڵیا وەکوو هەموو جارێ لاسایی ژنەڕەشپۆشەکانی سەر گۆڕستانی «شێخ عومەر»ی بۆ دەکردەوە و ئەو قاقای لێ دەدا، ئاوا، بەڵام ئەمجارە بە ڕاستیی و بەبێ ئەوەی بشهێڵێت ئەو هەستی پێبکات، سنگی خۆی بکوتێت و تا دەنگی تیایە هاوار بکات: «یومه حو.. یا یومه.. یومه حو.. یا یومه»«٥» ئەوەندەی لێبدات و لێبدات، تا ئەو جووتە مەمکۆڵەیەی، کە هەندێ جار لە دوو برمەی سووروسپی بچکۆلە دەچوون و زۆر جار قەستی کردبوو بیانخوات و هەندێ جاریش وەکوو دوو کڵافە خوری دەهاتنە بەر چاوی و حەزی دەکرد بە سەری پەنجەکانی، بەڵام چەند بڵێی بە سووکی ختووکەیان بدات و لەگەڵیا چاوەکانی توند توند بنووقێنێت، بە جارێ لەتوکوت ببن و ئازار زیفیان لێبستێنێت.. کەچی کاتێ دەرگای کردەوە و پێی خستە حەوشەوە، دایکی بە تەنوورەیەکی ڕەش و بلووزێکی ملداری سپیەوە، مەقەستێکی سپیی دەسکڕەشی بە دەستی ڕاستی و شانەیەکی ڕەشی کلکسپیی بە دەستی چەپییەوە گرتبوو و قژی خاو و ئێجگار ڕەشی «ئیبتیسام»ی پوورزای دەبڕی، کە لەسەر کورسیە ڕەشەکەدا دانیشتبوو و بەروانکەیەکی سپیی کردبووە مل.. هەرکە ئەمی بینی لە خۆشیا هەر دوو دەمی مەقەستەکەی دا بە یەکا و زمانی بەو گۆرانییە هەڵهێنایەوە، کە زۆر جاری تریش بۆی وتبوو و ئەم بۆی سەندبووەوە:

الف ليرة نكدتها
وميت جهادي صبحتها
وطاقه زري للمختار
ومن ملبس للجيران
كله واخوها زعلان«٦»

وایدەزانی کچەکەی دەچێتە باوەشیەوە و تێر تێر ئەملا و ئەولای ماچدەکات، بۆیە مەقەستەکەی دایە دەستی چەپی «ئیبتیسام» و شانەکەی خستە ناومستی ڕاستیەوە.. تەنوورەکەی تەکاند و بەرەو پیریەوە چوو، کەچی ئەم ناوچەوانی گرژکرد و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ خۆ من منداڵ نیمیم، تا تۆ بەم دەنگە ناخۆشەتەوە ئەم گۆرانییە هیچوپووچەم بۆ بڵێییت.

دایکی تەریقبووەوە و سەری خۆی لەبەر نا.. لەکاتێکدا ئەم حەزی دەکرد لێی توورە بێت و بە نووکی تیژی مەقەستەکەی جەستەی بکات بە نانە ئێجگار سوور و کون کونەکانی «ڕەحمە ڕەشپۆش»ی نانەوا، کە جارێکیان لە گەڕەکی «فەزڵ»دا «شازە» بە دەفلسیەکی سوور بۆی کڕیبوو و لە ماڵی ژنە نەخۆش و سپیپۆشەکەی چوون دەرزیی لێبدەن، بە دۆشاوێکی خورمای زۆر خەست خواردبووی.. هەر بۆئەوەی سەرودڵی بگرێت و تەواو توورەی بکات، کەمێ لێی چووە پێشێ و بە قاقالێدانەوە پێی وت:

ـ ئەوە تۆ کەی زانیوتە قژ ببڕیت، ئاوا خۆت لەسەر پوورە ئیبتیسامم کردووە بە دەلاک..؟!

ئەو پەنجەکانی لە یەکتر ئاڵاندن و ئاخێکی قووڵ قووڵی هەڵکێشا.. سەری هەڵبڕی و ویستی قسەیەک بکات، کەچی نەیکرد و بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە هەناسەیەکی قووڵتری هەڵکێشا.. سەرێکی لێ بادا و دەستی چەپی گرت بە ناوچەوانییەوە.. «ئیبتیسام» لچێکی هەڵقورچاند و بەبێ ئەوەی سەیری ئەمان بکات، نووکی مەقەستەکەی بۆ ناوگەڵی خۆی ڕەوانەکرد و بە شێوەیەکی زۆر سەیر، وەک بڵێی لەگەڵ منداڵ بدوێت و بیەوێت تەمێی بکات، پێی وت:

ـ گوێچکەت دەبڕم، ئەگەر زۆڵێکی ئاوات لێبکەوێتە خوارێ.

«نەوال» هەر خێرا، وەک بڵێی زۆر دەمێک بێت وەڵامی بۆ ئامادەکردبێت و چاوەڕێی هەلێکی ئاوا بێت، بزەیەکی پڕمانای سەیری خستە سەر لێوی و پێی وت:

ـ تۆ بۆچی واز لە گوێچکەی ئەو بەستەزمانە ناهێنیت..؟! ڕۆژێ دەیسمیت و ڕۆژێ دەیبڕیت..؟!

ئەو تەواو لێی تێگەیشت و لە شوێنی خۆی ساردبوو.. سەری داخست و لچ و لێوی کەوتنە لەرزین، «نەوال» پڕکێشیی کردەوە و بە دەنگێکی بەرزتر، بەڵام چەند بڵێی ئابڕووبەرانەتر، پێی وت:

- واباشتر نییە چاوەڕێ بکەیت خاڵە عیمادم جووتێ گوارەیان بۆ بێنێت و تێیان بکات..؟!

دەیویست ئەو ڕۆژەی بە تەواوی بیربخاتەوە و بە جارێ تورەی بکات، کە لەگەڵ «نیهایەت»ی دایکی هاتبوو بۆ ماڵی «ئەدهەم»ی باپیری و کراسێکی نیوقۆڵی سپیی یاخەڕەشی پۆشیبوو.. دواییش بە ڕێکەوتێکی زۆر سەیر بینی وا لەسەر قەرەوێڵە ڕەشەکە و لە ژێر جەستەی ڕووت و سووروسپیی «مامۆستا عیماد»ی شیربرای دایکیدا پاڵکەوتووە.. «مامۆستا عیماد» کاتێ بە شپرزەییەوە هەستایەوە و بە جلە ڕەشەکانی خۆی، لە خوار ناوکیەوەی دادەپۆشی، کەمێ لێی هاتە پێشێ و بە دەموپلێکی تێکئالاوەوە پێی وت:

- نەونەوەکەی خۆم دەتبەم بۆ بازاڕ و جووتێ گوارەی ئاڵتوونی جوانت بۆ دەکڕم، ئەگەر بە کەسی نەڵێیت.

کەچی «ئیبتیسام» هەستایەوە و بە دەستی ڕاستی قژە ڕەش و ژاکاوەکەی لەسەر چاوی لادا، کە سەری تاڵەکانی بە لیکی ناودەمی «مامۆستا عیماد» تەڕببوون و لەبەر تیشکی ڕووناکییدا دەدرەوشانەوە.. بە دەستی چەپیشی قوڕگی گرت و پێی وت:

- خوام لەو خوایەیە لە دەمت دەردەچێت، هەر بە خنکاندن دەتخنکێنم.

کاتێ ستیانە ڕەشەکەشی لەسەر مەمکە سپیەکانی بەست و کراسە سپیەکەی بەسەردا هێنا، پەنجەکانی هەر دوو دەستی پیشاندا، کە نینۆکەکانی بە سوورێکی تۆخ تۆخ بۆیەکردبوون و پێی وت:

- وێنەی ناڵی ڕەشی ئەسپی سپی لەسەر گیانی بۆگەنت دەکێشم، ئەگەر لە دەمی یەک کەسی ببیستم.

کەچی ئەو ڕۆژە لە بەختی ئەم وا نقەی لە خۆی بڕیبوو و دەمی بە شێوەیەک چووبووە کلیلەوە، هەر دەتوت تەلیسمی لێکراوە و ئەو ژنە هار و جانانەیەی ئەو جارە نییە، کە تەنها ئەلفێکی بەس بوو، تا سواری سەر و ملی بێت و تیر تیری بکوتێتەوە.. ئینجا زانی ئەوان ناخی ناخی ئەم دەبینن و دەزانن چی لێیان دەوێت، بۆیە دژایەتی دەکەن و دەیانەوێت بە بێدەنگیی ڕۆحی داخبکەن.. ئەی

ئەگەر وانییە، ئەوەتا دایکی سوور دەزانێ خۆی لە قوتابخانە دزیوەتەوە و دوو سەعات زووتر هاتۆتەوە، بۆچی دەنگی لەگەڵدا ناکات و لێی ناپرسێتەوە..؟! بۆ..؟ بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! بیری لەوە کردەوە بچێت بۆ لای «شازە» و شەڕ بەو بفرۆشێت.. خۆ هەر هیچ نەبێت دەتوانێت گاڵتە بە ناوەکەی بکات و بیکات بە «شازەومان» و «شازەبۆی» و «شازەگێرڵ» و شتی لەم بابەتە.. یان بە شێوەیەکی زۆر سەیر چەمۆڵەی لێبنێت و بە دەنگێکی نێرانە پێی بڵێت:

ـ تۆ پیاویت، ژن نییت، بۆیە منالْت نابێت.

ئینجا بەرگی یەکەمی کتێبی «هەزارویەک شەوە» لە تاقە سپیەکە دەربهێنێت و پیشانی بدات، کە «شازەمان» ناوی پاشایەکی «سەمەرقەند»ـە و ناوبانگی بە دنیادا بڵاوبووەتەوە.. ئیتر هەر خۆی دەزانێت ئەو چەند بەم قسانە تووڕەدەبێت و چۆن وەکوو فیشەکە شێتە دەچێت بە ئاسمانا.. جارێکیان ئەوەندە تووڕەی کرد و بە شێوەیەک سەرودڵی گرت، ئەو لە داخا بە دەستی ڕاستی چمکی کراسە سپیەکەی تاسەر ناوکی هەڵکرد و بە پەنجەکانی دەستی چەپی مایۆ ڕەشەکەی داکەند.. تا تینی تیابوو زللەیەکی بە ناوگەڵی خۆیدا کێشا و پێی وت:

ـ قەحپەدایک ئەمە هی پیاوە..؟! هی پیاو ئاوایە..؟!

«سیامەند»، کە تازە بە دیشداشەیەکی ڕەشی هێڵسپی، لە حەمامەکە هاتبووە دەرەوە و بە خاولیەکی سپیی ریشوودار سەری خۆی وشکدەکردەوە، قاقای لێ دەدا و پێی دەوت:

ـ جا شازێ خۆ نەوالیش هەر وا دەڵێت.. دەڵێت هی پیاو نییە، یانی بە کەڵکی پیاو نایەت.

ـ تووخوا ئەگەر بێ دەنگ نەبیت تۆش، لە هەموو قسەیەک، مانایەکی قۆڕ دەدۆزیتەوە..!!

«نەوال» خاولیەکەی لە «سیامەند» وەرگرت و تەکاندی.. ئینجا پێی وت لەسەر کورسیە ڕەشەکە دابنیشێت و جووڵە نەکات، تا وەکوو لەچک بیکاتە سەری و بیکات بە ژن.. «سیامەند»، کە تازە بە گوێزانە سوورەکە ڕیش و سمێڵە

تەنک و ڕەشەکەی تاشی بوو و دەموچاوە سپیەکەی دەبریسکایەوە؛ بەو لەچکەوە کتومت لەو ژنە کراسڕەشە لەچکسپیە دەچوو و ئەم حەزیدەکرد زۆر بە وردی دیقەتی لێبدات، کە جارێکیان «شازە» دەرزیی لێ دا و ئەو پێی وت:

ـ دەزانی شازە هەرچەند ناوکەفی سپیی ناو پێلاوی ڕەش دەبینم، برسییم دەبێت، چونکە برنجی ناو ئەو مەنجەڵەم بیردەکەوێتەوە، کە لە شاییەکەی تۆدا خستبوویانە سەر چوار بەردی گەورەی ڕەشەوە و دوو ژنە سپیپۆشەکە بە کەوگیری ڕەش دەیانکردە قاپە سپیەکانەوە.

«نەوال» دەستی ڕاستی خستە سەر شانی چەپی «سیامەند» و سەیرێکی «شازە»ی کرد، کە دوای ئەو هەموو تووڕەییە، دەستی چەپی گرتبوو بە سکیەوە و قاقای بەرز بەرزی لێ دەدا، زمانی لێ دەرهێنا و پێی وت:

ـ بزانە من چەند ئازام، دەتوانم پیاو بکەم بە ژن..!!

«شازە» سەیرێکی چاوەکانی کرد و بەبێ ئەوەی شتێ لە پێکەنینەکەی بگۆڕێت، پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی بۆ ڕاشەقاند و پێی وت:

ـ بە خۆتەوە مەنازە چاوەکەم.. بە خۆتەوە مەنازە.. تۆ تەنها دەتوانیت ئەو پیاوانە بکەیت بە ژن، کە خۆبان لە بنەڕەتا لە ژن دەچن، ئەگینا....

تا «نەوال» بە حەپەساویەوە سەیری چاوەکانی کرد و لێی پرسی:

ـ ئەگینا چی..؟!

ئەو خۆی گەیاندە لای مێردەکەی و بە گوێچکەیدا چپاند.. بە جووتە سەیری ئەمیان کرد و قاقایان لێ دا.. ئەم زانی درێژەی قسەکەی بۆ ئەو تەواوکرد و لەمی شاردەوە، بۆیە دامێنی کراسەکەی گرت و ڕایکێشا.. چاوی بڕیە چاوی و چەند جارێ بەسەریەکەوە لێی پرسی:

ـ ئەگینا چی..؟! ئەگینا چی..؟! پێم بڵێ دەی.

«شازە» کەمێ ناوچەوانی گرژکرد و پێی وت:

ـ ئەگەر بزانم مردوویت و پێی چاکدەبیتەوە، پێت ناڵێم.

ئەوسا بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی «سیامەند» و بە دەستی چەپی دەستی ڕاستی گرت و پێی وت:

ـ تووخوا مامە سیامەند ئامۆژنم چی پێ وتیت..؟!
ـ ناتوانم پێتی بڵێم.
بە بێزاریەوە دەستەکانی مامی بەردا و ڕووی کردەوە مامۆژنی.. لە دواوە بە توندی قۆڵەکانی گرت و چڕنووکە تیژەکانی لێگیر کردن:
ـ پێم بڵێ دەی، ئەگینا وازت لێناهێنم.
«شازە» خۆی وەرسوڕاند و تا تینی تیابوو بە دەستی ڕاستی زللەیەکی سرەواندە لای ڕوومەتی چەپیەوە.. پەنجەکانی دەستی چەپی لە قژی گیرکرد و بە لەقە لە ناوگەڵی دەدا.. بەمەشەوە نەوەستا و ڕایکێشایە لای پەنجەرەکەوە.. زۆر بە توندی سەری کێشا بە قەراغەکەیدا و ژانی خستە دڵیەوە.. هەرچەند دەرفەتیشی دەهێنا و هاواری دەکرد:
ـ مامە سیامەند گیان بە فریامکەوە، مردم.
ئەو توندتر پیایدا دەکێشا و دەیوت:
ـ خوام لەو خوایەیە لە شوێنی خۆی دەجووڵێت، دەبێت بە سەروگوێلاکی شکاوەوە لەم ماڵەی بەدەرنێم.
ئەوسا «سیامەند» هەر بە لەچکەکەی سەریەوە دەکەوتە بەر بینایی لێڵی و وەکوو مەقەڵییەکی زۆر گەورە دەردەکەوت.. ئیتر ئەوەندەی تر دەترسا و زیڕەی دەکرد.... ئەو ڕۆژەی دایکی و «ئیبتیسام»ی بەجێهێشت و بەرەو ماڵی «شازە» کەوتە ڕێ، پڕ بە دڵ حەزی دەکرد لێدانێکی تری ئاوا بە چاوی خۆی ببینێتەوە و کەفوکوڵی ئەو جەستەیەی دامرکێتەوە، کەچی بە پێچەوانەوە ئەو لە هەموو ڕۆژان ڕووخۆشتر بوو لەگەڵیا و بە هەموو شێوەیەک لابەردایی لە گێچەڵەکانی ئەم دەکرد.. ئەویش وەکوو دایکی هەر ئەوەندە دەرگای حەوشەی کردەوە و قاچی هێنایە ژوورەوە، دەستی لەسەر تەماتەکانی ناو سوزگیە ڕەشەکەی بەر بەلووعە هەڵگرت و دەمی بەو گۆرانییە هەڵهێنایەوە، کە هەر لە منالییەوە بۆی وتبوو و ئەم حەزی لێدەکرد:

هلە بیچ من جیتی
اباب الحوش خشیتی

له داخـا تا تینی تیـابوو جـانتـاكـەی بۆ لای هەیوانەكـه هەڵدا و كـتـێب و دەفـتـەرەكـانی بەو ناوەدا بڵاوبوونەوە.. ویسـتی پیایدا هەڵبشاخێت و تێر تێر جنێوی سووكی پێبدات، كەچی گوێی لێبوو «ئەدیب» لەسەر دیوارەكەی خۆبانەوە دەنگی بەرزكردەوە و وتی:

ـ بە سائەقەی ئەو دەنگە خۆشەت بم پووره شازه..!!

كـه سەری هەڵبڕی و سـەیری كـرد، بینی وا كـتێـبێكی بەرگڕەشی بە دەسـتی چەپی و پشیله ڕەشه چاوسپیەكەشی بە دەستی ڕاستی گرتووە.. هەر دووكیانی بە سنگیـەوە ناوە و سـەیری ئەم دەكـات.. ئەم دەیزانی ئەو هەر جـارێ ئەو پشـیلەیە بگرێت بە دەسـتیـەوە و پیـشـانـی ئەمی بدات، ئەوا فـێـڵـێكی زۆر سـەیری لە ژێر سەردایە و چەند بلـێیت بلیمەتانەش ئەنجامی دەدات.. لەو جارەوە بۆی دەركەوت و ئەو باوەڕەی لا خولقـا، كە هەر خۆی و خۆی لە ماڵ بـوون و «شازە» چووبوو بۆ لای «بەدریە»ی دایكی ئەو، تا لە چێشتلێناندا یارمـەتیی بدات و خواردن بۆ ئەو مـیـوانانەیان ئـامـادەكـەن، كە لە «بوهرز»ـەوە هاتبـوون و سـەبەتەیەكی ڕەشی پڕ لە مـاسیی سپـییـان لەگەڵ خۆباندا هێنابوو.. «ئەدیب» پەتێكی سپیی كردبووە ملی پشـیلەكـەی و هێنابووی، تا لە حـەوشـەكـەی ئەمـاندا بەڕەڵڵای بكات و یاریی لەگەڵدا بكەن.. دوایی لەپڕ، بە دەستی ڕاستی وردبینێكی سپیی زلی كلكڕەشی لە گیرفانی لای چەپی پانتۆڵە سپییە هێلڕەشەكەیدا دەرهێنا و پێی وت:

ـ چەند خۆشە شتە بچووكەكان بە گەورەیی ببینین..!! وانییە نەوال..؟!

ئەم پێش ئەوەی «ئەدیب»یش پیـشـانی بدات و پێی بلـێت، خـۆی زۆر چاك دەیزانی بینینی شتە وردەكان بە گەورەیی چەند جوانە و چ لەزەتێكی لێدەبینێت.. زۆر جار بە وردبینە سپیەكەی «سیامەند»، كە شێوەیەكی چوارگۆشەیی و كلكێكی وەكـوو دووپشكی ڕەشی هەبـوو و لەوەی ئەو گـەورەتریش بوو، سـەیری فرمـێسكە سوور سوورەكـانی چاوی سپیی مێرووله ڕەش و ورد وردەكانی پێدەكرد و سەرنجی لێ دەدان، كـاتێ «شـازە» بە گـۆرانیـیـەكی زۆر سـەیر، كە ئەم لێی تێنەدەگەیشت و

نەیدەتوانی لەبەریکات، دەیهێنانە گریان و لەگەڵیا ڕێچکەکەیانی لێدەگۆڕین..
ئەو جارەیش، کە وانەی «مێروولەی سپیی باڵدار»یان خوێند و «ست لامیعە» بە تەباشیری سپی وێنەی مێروولەیەکی گەورەی بۆ لەسەر تەختەڕەشەکە کێشان، ئەم هەستایەوە و وتی:

ـ ئامۆژنم دەتوانێت بە گۆرانی مێروولە بێنێتە گریان و فرمێسکی سووریان لە چاو بێنێتە خوارێ.

پۆلەکە تێکڕا دایانە قاقای پێکەنین و «ست لامیعە» بە گاڵتە پێی وت:

ـ ئەگەر وابێت، دەتوانێت بە واوەیلا و باوکەڕۆ قازی سپییش بێنێتە پێکەنین.

ـ جا خۆ پێکەنینی قاز بە وردبین نابینرێت.. ؟!

ـ کچێ تۆ ئەم قسانە لە کوێ دەهێنیت جنۆکە.. ؟!

«ئەدیب» ، کە وردبینەکەی خستە سەر چاوە سپیەکانی پشیلە ڕەشەکە و پێی وت:

ـ تۆ دەڵێی لە چی دەچن.. ؟!

ئەم سەیرێکی کردن و جوان جوان لێیان وردبووەوە، هەستی کرد لە دوو هێلکەی دەڵەمە دەچن و حەزی دەکرد سووک سووک، بەڵام نەرم نەرم دەستیان لێبدات.. دەستیان لێبدات و خۆش خۆش هەڵیانگلۆفێت.. کەچی خۆیشی نەیزانی بۆچی لە «ئەدیب»ی شاردەوە و وای پێ نەوت، بەڵکوو وەکوو سەرەژنێکی زۆرزان، سەرێکی بادا و پێی وت:

ـ هەر لە چاوەکانی خۆی دەچن، بەڵام گەورەترن.

ـ گەورەترن وانییە.. ؟!

ـ ئا ، زۆر گەورەترن ئەدیبۆ..!!

«ئەدیب» پشیلەکەی دانا و بە قاچی ڕاستی شەقێکی سووکی لە قنگی دا.. وەک بڵێی لەمەوپێش ڕایهێنابێت و مەشقی دنیای پێکردبێت، کلکە ئەستوورەکەی ڕەپکرد و خستیە سەر پشتی.. زمانە ئێجگار سوورەکەی دەرهێنا و کەوتە لستنەوەی لامل و پشتە تووکنەکەی.. شەقێکی کەمێ توندتری لە

قەپرغەی دا و بە دەمیش لە شێوەی دەنگی ماچ، دەنگێکی بۆ دەرکرد.. چەند جارێکی تر لەسەر هەمان ڕێتم دووبارەیکردەوە و بە پەنجەکانیشی سووک سووک چەقەنەی بۆ لێدەدا.. ئیتر ئەم لە پێشا بە شێوەیەکی زۆر زۆر سەیر خۆی دەچەماندەوە و بە قاچەکانی ئەودا هەڵدەگەڕا.. پیایدا هەڵدەگەڕا و سەری خۆی لە پووزەکانی هەڵدەسووی.. پیایدا هەڵدەگەڕا و سەری خۆی لە پووزەکانی هەڵدەسووی.. دواییش بە قادرمەکەدا سەرکەوت و لەسەر دیوارەکەی نێوانیان، کە ئەم زۆر جار بە چاوی بەستراوەوە بە سەریدا ڕۆیشتبوو و منالانی گەڕەک قایم قایم چەپڵەیان بۆ لێدابوو، قەڵەمبازێکی بۆ ناو حەوشەکەی خۆباندا هەڵدا و لەودیو دەستی کرد بە میاوەمیاو.. ئەوسا «ئەدیب» وردبینەکەی بە چاوی «نەوال»ـەوە نا و پێی وت:

ـ چاوەکانی تۆ زۆر جوانترن، بەڵام تۆ ناتوانیت بیانبینیت.

ـ چۆن ناتوانم..؟! ئەی چاوی خۆم نیین..؟!

ـ ئاخر بۆیە ناتوانیت بیانبینیت، چونکە هی خۆتن.

ـ ئەی تۆ دەتوانیت چاوەکانی خۆت ببینیت..؟!

ـ منیش ناتوانم.

ـ خۆ لە ئاوێنەدا دەتوانین چاوی خۆمان ببینین.

ـ وانییە.. وانییە.. ئەوەی لە ئاوێنەدا دەیبینین، چاو نییە.. دوو بەردی وڵاتی جنۆکانن.

ـ چۆن..؟! بەردی وڵاتی جنۆکانن..؟! ئەی ئەوە نییە دەکرێنەوە و دادەخرێن.. دەکرێنەوە و دادەخرێن..؟!

ـ ئێمە دوو چاوی زۆر جوان و جەستەیەکی ئێجگار دزێومان هەیە.. بۆئەوەی کاتێ لە یەکتر ڕادەمێنین، یان لە ئاوێنەدا سەیری خۆمان دەکەین، قێز لە خۆمان نەکەینەوە، خوای گەورە دوو بەردی وڵاتی جنۆکانمان بۆ دەکات بە چاو.

ـ دەزانی تۆ گەورە بوویت، وەکوو مامە سیامەند و خاڵە ئەمجەدم قسە دەکەیت..؟!

ـ ئەوە لە خاڵە حیسامم فێربووم، هەر ئەویش ئەم وردبینەی بۆ کڕیوم.

ئەمەی وت و زنجیری ڕەشی پانتۆڵەکەی بە سووکی کردەوە.. بە دەستی چەپی شەبزووزەکەی دەرهێنا و هەڵیگلۆفی، کە لە شێرەکوللە دەچوو و سوور سوور هەڵگەڕابوو.. ئینجا بە دەستەکەی تری وردبینەکەی خستە سەری و پێی وت:

ـ ئەها سەیرکە، وەکوو هی پیاو زلە..!!

«نەوال» سەری هێنایە پێشێ و چاوە ئەبڵەقەکانی ئاراستەی سەری کرد.. هەستی دەکرد تەزووێکی قووڵ قووڵ، بەڵام پڕ لە ترس و شپرزەیی، بە سەرتاپای گیانیدا دێت و چاوی بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەکەوێتە ڕەشکەوپێشکە.. هەرچەند گوێی لە دوقدوودووق دوودووق.. دوقدوودووق دوودووقی مریشکەکانی خۆیان و قرچققرچ ققرچ.. قرچققرچ ققرچی ماسییە سپی سپییەکانی ناو تاوە ڕەش ڕەشەکەش دەبوو، کە لەودیو «شازە» و «بەدریە» خەریکی بوون و بە دەمیەوە قسەی سەیر سەیریان دەکرد، دەترسا و ڕەنگی هەڵدەبزڕکا.. کەچی وەکووتر نەیدەتوانی سەیری نەکات و ڕووی خۆی بکات بەولاوە.. «ئەدیب» بە سووکی دەستی چەپی درێژکرد و پەنجە بزێوەکانی خستە ناو قژی ئەمەوە، کە تازە دایکی لەسەر مۆدێلی «فەڕەنسی» بۆی بڕیبوو و لای مامی ڕەسمی پێوەگرتبوو.. بە سووکی ڕایکێشا و بە دەنگێکی شێواوەوە پێی وت:

ـ حەز دەکەیت پەنجەکانی تۆش گەورەبن..؟!

ـ ئا، بەڵام چۆن..؟!

ـ بێنە بیانخەرە سەری.

«نەوال» نەیدەزانی کەی و چۆن دەستی درێژکردبوو و بە پەنجەکانی، کە تازە «هالە»ی پووری نینۆکەکانیانی بە بڕەندە ڕەشەکە لووس و بە سوورێکی تۆخ تۆخ بۆیە کردبوون، وەکوو مۆم شەبزووزەکەی گرتبوو و دەیگوشی، بەڵام هەستی دەکرد وێنەی سەرەمێکوتە ڕەشە بزێوەکانی ناو گۆمە سپییەکەی «بابلشێخ»، کە دەیگرتن و لەناو دەستیا دەخزین، ئاوا دەخزێت و تەکاندەدات.. دەخزێت و تەکاندەدات.. ئەو تەکاندەدات و ئەم توندتر دەیگوشێت.. ئەوسا دیمەنەکەشی بە شێوەیەکی زۆر جیا دەبینی و بەردەوامیش دەگۆڕا، بۆیە ئەوەندەی تر هەستی بە پەشۆکان دەکرد و زیاتر دەنگەکان، هی کز کز و هی بەرز بەرز، خۆیان دەکرد بە

کونی گوێچکەیا.. وایدەزانی کچان کاتێ شەبزووزی کوڕان دەبینن و دەستیان لێدەدەن، چاویان تاریک تاریک و گوێچکەیان سووک سووک دەبێت، بە ڕادەیەک ئەو دەنگانەش دەبیستن، کە هێشتا لە قوڕگ و دەم دەرنەچوون و لێیان دەسڵەمنەوە.. ڕاستیشی دەکرد و بە هەڵەدا نەچووبوو، ئەم جارێ لە شێوەی کونەپەپووی سوور و جارێکی تر وەکوو چرا هەڵواسراوەکەی هەیوان دەهاتە بەر چاوی و تەزوو بە سەرتاپای گیانیدا دەهات.. جار جاریش وەکوو ئەو دەخیلە سپییەی دەبینی و دڵی دەکەوتە خورپەیەکی سەیر، کە لەسەر تاقە ڕەشە فۆرمیکاکەی ژووری نووستنی خۆیدا دایانابوو و هەموو ڕۆژێ عانەیەکی سووری تێدەکرد.. خۆیشی نەیدەزانی بۆچی لەو کاتەدا حەزی دەکرد، خۆی ڕووتکاتەوە و هەر بە ڕووتیی بچێتە ناو گوشە زبرەکەوە.. بچێتە ناویەوە و لە گۆڕەپانەکەی بەر ماڵی خۆیاندا تیژ تیژ ڕاکات.. تیژ تیژ ڕاکات و دووپشکێکی ڕەش ڕەشیش بخاتە دەمیەوە.. بە گاز دایکرمێنێت وەکوو نوقڵ بیمژێت.. بیمژێت و قووتیشی نەدات.. وا مەست و بێ هۆش ببوو، ئاگای لەوە نەمابوو وردبینەکە لەسەر کاشیەکان و لە ژێر قاچەکانی ئەم و «ئەدیب»دا وردوخاش ببوو.. ئەو کاتەی «ئەدیب» پارچە شیرییەکانی کۆدەکردەوە و دانە دانە دەیکردنە ناو قوتوویکی ڕەشەوە، کە ئەم پێشتر موورووی سپیی تێدەکرد و جار جار تەقتەتەقتەتەق..

تەقتەتەقتەتەق بە سەری نینۆکە ڕەقەکانی لە ژێرەکەی دەدا، لێی پرسی:

ـ ئەوە بۆچی کە ماچم دەکردی، تۆ دەتوت ڕێواس.. ڕێواس.. ڕێواس..؟! یانی چی ڕێواس..؟!

ـ نازانم.

ڕاستیشی دەکرد و نەیدەزانی چییە، ئەوەندەی دەزانی وشەیەکە بە وتنی ئاوێکی سەیر، کە هیچ لە لیک ناچێت دەخزێتە دەمیەوە و تەزوو بە گیانیدا دێت.. هەر ئەوەندەی دەزانی چەند شەوێ لەمەوبەر، کاتێ بێداربووەوە و چاوەکانی کردەوە، خێرا دەستی لەسەر جێگاکەی «شازە» کوتا و لەوێی نەبینی.. هاوکاتیش گوێی لێبوو لەسەر جێگای مێردەکەی هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا و بەدەم هانکەهانکی بەردەوام، دەیوت:

ـ ڕێواس.. ڕێواس.. ڕێواس.. ڕێواس.. ڕ..ێ.. و.. ا.. س.....

ئەم خۆی کرد بە نووستوو و گوێی بۆ دەنگەکە شلکرد، کە لەسەر شێوەی دڵۆپەئاوی ژێر کووپە سپیەکەی ماڵی «جەمیلە»ی فەڕاش، ئەوەی لەسەر بنکێکی ئاسنی ڕەشیان دانابوو و کاتێ دەتکایە ناو قاپە سپیەکەی ژێریەوە بە «دینگدیدینگ.. دیندیگ... دینگدیدینگ.. دیندیگ....» دەهاتە گوێچکەیەوە.. بەیانی کە دەموچاوی شت و هاتە سەر سفرە ڕەشەکەوە، پێش هەموو شتێ چاوی بڕیە چاویەوە و لێی پرسی:

ـ ئامۆژن ڕێواس یانی چی..؟!

ئەو تووڕەبوو و تا تینی تیابوو بە دەستی ڕاستی زللەیەکی لە ڕوومەتی چەپی دا:

ـ هەی بێئەدەب.. تۆ کەی واز لە قسەی ناشیرین دەهێنیت..؟!

**ـ پوورە شازە، قەیناکات نەوال بێت بۆ ماڵی ئێمە، بۆ خۆمان یاریی بکەین..؟!**

«شازە» بە دەستی چەپی سووزگیە پڕ تەماتەکەی هەڵگرت و وتی:

ـ قەیناکات ئەدیبۆ، بەڵام لێی نەیەیت.

ـ نە بە خوا لێی نایەم.

«نەوال» خێسەیەکی لێکرد و بە بێزاریەوە پێی وت:

ـ یاریی چی..؟! خۆ من مناڵ نییم.

ـ دەی باشە، بۆ خۆمان سەعیی دەکەین.

لچێکی هەڵقورتاند و سەیرێکی کتێب و دەفتەرەکانی کرد، کە لە جانتاکەوە هاتبوونە دەرێ و بەو ناوەدا بڵاوبووبوونەوە.. بیری لەوە کردەوە بگەڕێتەوە قوتابخانە و تەختەسڕەکە لەگەڵ خۆیدا بێنێتەوە.. شەو بیخاتە سەر سنگی، یان نێوان هەر دوو ڕانی و بچێتە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە.. کە گیانی تەواو خاوبووەوە و چاوی چووە خەوەوە، خەونی تەڕ و شێدار ببینێت و بەیانی بیریان لێبکاتەوە.. چاوەکانی توند توند بنووقێنێت و ورد ورد پیایاندا بچێتەوە.. کەچی کاتێ کەوتە ڕێ و گەیشتە ئەوێ، شەوی بەسەرداهات و دەرگا زەبەلاحەکە داخرابوو.. زۆر

چاوی بۆ بەرمیلێ، تەنەکەیەک، قوتوویێکی زل، گێڕا، تا بچێتە سەری و خۆی بگەیەنێتە ئەودیو، بەڵام هیچی بەر چاو نەکەوت و لە داخا تۆپەڵێ جنێوی خەستی بۆ ئەو وەستا سپیپۆش و کرێکارە ڕەشپۆشانە نارد، کە دروستیان کردبوو و ئاوا بەرزیانکردبووەوە.. ئاواتی دەخواست جەستەی ئەو ئێسقانە ڕەقانەی تیا نەمابووایە و وەکوو هی ئەو مارە ڕەشانەی لێبهاتایە، کە ئەو جارە لە خەونیا بە ژێر دەرگاکەوە چوونە ژوورەوە و لە چاوەکانی ئەم ونبوون، کەچی ئەو کاتەی بە قوڕگی وشکی وەک بەردی بەر قرچەی گەرمای تەمووزی «بەغا» و زمانی گەرمی وەک بنی مەنجەڵی سەر سێکوچکەی ژنەلادێییەکان، هەنگاوی دەنا و لە دەنگی «شاسوار»دا دەگەڕا، هەر دووکیانی لەسەر کورسیەکەی خۆی بینی و وەکوو ملپێچ لە ملی ئاڵاندن.. لە ملی ئاڵاندن و کەوتەوە ڕاکردن.. هەر کاتێکی زانی وا سەرتاپای گیانی کەوتۆتە ژێر ئارەقەیەکی کەمێ شێدارەوە و لەسەر سەکۆ سپیەکەی ناوەڕاستی حەوشەی قوتابخانەدا وەستاوە، کە هەموو جارێ گۆرانیی لەسەر دەوت و کچان تێکڕا قایم قایم چەپڵەیان بۆ لێدەدا.. ئەوسا تانکیەکەی لە شێوەی تیمساحێکی زلی سپی سپی دەبینی و دڵی دەکەوتە خورپە، کە لەسەر چوار قاچی ڕەش ڕەش وەستابوو و لە تاریکییە تۆخ تۆخەکەدا دەبریسکایەوە.. هەرچەند دەیویست بچێت بە دەم بنێت بە شێرەکەیەوە و بەکامی دڵ ئاوی ساردی تیا بخواتەوە، مارەکان خۆیان لە قاچی دەئاڵاند و بە دەما دەیانخستە سەر ئەو سەکۆیە ڕەق و تەقەوە.. ئەوەندەیان خست و خست، خست و خست، هەموو ناولەپ و سەرئەژنۆکانی رووشان و بە خوڕ خوێنیان لێ دەچۆڕایەوە.. چاوەکانی دەکەوتنە ڕەشکەوپێشکە و دیمەنی شتەکانی تەواو لێ دەگۆڕا.. سەری هەڵدەبڕی و دوو تارمایی لە شێوەی ئەو دووکەڵە سپییە دەبینی، کە هەموو جارێ لە دووکەڵکێشە ڕەشە زلەکەی سەربانی خۆیان بەرزدەبووەوە و جارێ لە شێوەی سەوڵی سپیی بەلەمی ڕەش و جارێ وەکوو بووکی تازەدابەزیوی سەر ئەسپی ڕەش، کە جارێکیان لە لادێیەکی خوارووی «بەغا»دا دیبووی و سەرنجی ڕاکێشابوو، بەرزدەبووەوە و بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا.. وردە وردە تارماییەکان لە یەکتر نزیکدەکەوتنەوە و چاکتر ڕووخساریان دەردەکەوت.. کاتێ بینینی دایکی و

«شاسوار» بوون و بە ڕووتیی لە بەردەمی تیمساحەکەدا لە یەکتر ئالآن، چۆن سەری گێژی خوارد و ناو هەناوی وەکوو چینی و بلووریەکانی سەر تاقە ڕەشەکەی مووبەقی ماڵی خۆبان، کە ڕۆژی بوومەلەرزەکە دەلەرینەوە و بەر یەکتر دەکەوتن، دەلەرینەوە و بەر یەکتر دەکەوتن، ئاوا دەهەژا و دادەڕووخا.. دەهەژا و دادەڕووخا.. مارەکانیش دەست و قاچیان شەتەکدا و نەیاندەهێشت لە شوێنی خۆی بجوولێت.. هەرکە بێداربووەوە و چاوە خەواڵووەکانی بە ترسەوە کردەوە، قاچە ڕووتەکانی خۆی بینی لەسەر ڕانی «شاسوار»دا داینابوون و لەناو میزدا شلّپەیان دەهات.. سەرەتا هەستی بە گەرمیی و دواتر بە ساردییان دەکرد و «شازە»ی دەهێنایە بیری خۆی، کە بەیانی وەکوو منالێک هیچ نەزانێت و تازە پێی گرتبێت، ئاوا دڵنەوایی دەکات و بە سائەقە و بە قوربانی دەبێت.. دەیبات بۆ حەمامەکە و بە ئاوێکی شلەتێن دەیشوات.. جلەکانی لێ دەگۆڕێت و دەیهێنێتەوە.. هەر زوو زوو دەستەکانی دەکاتە ملیەوە و پێی دەڵێت:

ـ بە خوا حەزدەکەم هەموو شەوێ بیکەی بە خۆتا، تا هەست نەکەم گەورەبوویت و لێم جیادەبیتەوە.

ڕەنگە ئەمجارە «شاسوار»یش بیجامە ڕەشەکەی خۆی پیشانی خوشکی بدات و بە گاڵتەیەک، کە ئەم هیچ حەزی لێناکات و تەواو پێی تەریقدەبێتەوە، پێی بڵێت:

ـ ئەوەتا شازێ منیش ئەمشەو کردوومە بە خۆما، تا هەر وابزانیت منالّم و لێت جیانابمەوە.

بەیانی کە جارێکی تر بێداربووەوە و چاوەکانی کردەوە، نەیدەزانی شەو کەی سەری خستۆتەوە سەر سەرینەکەی خۆی و چۆن خەوی لێکەوتۆتەوە، بەڵام ئەوەندەی دەبینی «شاسوار»ی بە تەنیشتەوە نەمابوو و جێگاکەشی هەڵگیرابوو.. کاتێ دەرگای ژوورەکەشی کردەوە و ڕوانی، بینی بە جلە سەربازییەکانیەوە لەگەڵ ئەو دوو پیاوەی تەواو لە یەکتردەچوون و شتی سەیر سەیریان لەسەر دەستی خۆبان کوتیبوو، دەرگای حەوشەیان کردەوە و چوونە دەرەوە.. هەرچەند هاواری کرد و وتی:

ـ مامە شاسوار.. مامە شاسوار.. نەوالەکەی خۆت ماچکە، ئینجا برۆ.. نەوالەکەی......

کەچی ئەو لای نەکردەوە و واشی دەرخست گوێی لەم نییە.. ڕایکرد و خێرا خۆی گەیاندە بەر دەرگا.. لەوێ دەستەکانی بەملا و بەولای دەمیەوە گرت و بە دەنگی بەرزتر وتی:

ـ مامە شاسوار نیوەڕۆ نایەیتەوە..؟! لەگەڵ تۆمە مامە شاسوار بۆچی وەڵامم نادەیتەوە..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟!

دڵی پڕبوو و دەستی کرد بە گریان.. کەچی هەر چاویشی لەسەر نەدەگوێزایەوە و هێشتا هیوای هەبوو لایەکی لێبکاتەوە، یان بگەڕێتەوە و تێر تێر بینووسێنێت بە خۆیەوە.. قژە ڕەشەکەی بۆن بکات و گازی سووک سووک لە کولمە سوور سوورەکانی بگرێت.. بەڵام کە هەر دوو دەستی خستە ناو پانتۆڵەکەی و بەبێ ئەوەی شێوەی ڕۆیشتنەکەی بگۆڕێت، سەری کەمێ بۆ ئاسمان هەڵبڕی، ئەم هەستی کرد شتێ لە ئارادایە و تووشی تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە بووە، چونکە ئەو هەر کاتێ خەمێکی گەورەی هەبوایە و بیویستایە لە خەڵکی بشارێتەوە، جا لە ماڵ بوایە یان لە ڕێگا، دەستەکانی لەناو گیرفانەکانی توند توند دەکرد و بە زمانەکەی خۆیان گۆرانیی خەمناک خەمناکی دەچڕی.. دەیچڕی و هەموویانی دەهێنایە گریان.. هەر بەدەم گریان و چاوی پڕ لە فرمێسکەوە هاتەوە و ڕووی لە ژووری میوان کرد.. «شازە»ی بینی قژە درێژەکەی کردبوو بە چوار پرچی بەقەدەر یەک و دەستەکانی لە ئەژنۆیەوە ئاڵاندبوو.. ویستی پرچەکانی شیبکاتەوە و شانە سپییەکەی سەر تاقە ڕەشەکەی ئەودیو بێنێت، تا بۆی شانە بکات و ئەو ماتەمینییە بەریدات، بەڵام خێرا پەشیمانبووەوە و بیری لەوە کردەوە، هەر خۆی جلەکانی بگۆڕێت و بچێتە کۆڵان.. چونکە باوەڕی نەدەکرد ئەو ئاوا بە ئاسانی خەم و پەژارە بەریبدات و وەکوو ڕۆژان گوێ لە قسەکانی ئەم بگرێت.. کە دەرگای حەوشەشی کردەوە و قاچی بردە دەرەوە، «دیجلە» و «فورات»ی بینی بە کراسی سپیی هێڵڕەشەوە، لەبەر دەرگا ڕەشەکەی خۆیاندا وەستابوون و سەیری ئەو دوو کرێکارە بەدلەڕەشەیان دەکرد، کە کتومت لە یەکتر دەچوون و خەریکی گۆڕینی

گلۆپی ستوونە ڕەشەکانی کارەبای کۆڵان بوون.. یەکێکیان سەرکەوتبووە سەر پەیژەیەکی سپی و ئەویتریان لە خوارەوە توند توند گرتبووی.. کاتێ چووە پێشەوە و لێیان نزیککەوتەوە، گوێی لێبوو «دیجلە» سەری هەڵبڕیبوو و بە کرێکارەکەی سەرەوەی دەوت:

ـ گلۆپە سووتاوەکە نەدەیتە کەس، بیدە بە ئێمە.. بۆخۆمان بە قەڵەمی ڕەش وێنەی دەموچاوی بنیادەمی لەسەر دەکێشین.

ئەوەی خوارەوە سەیرێکی کرد و پێی وت:

ـ ئەگەر بزانن پەیوەندیی نێوان پەیژە و گریان چییە، من پێی دەڵێم بتانداتێ.

هەر دووکیان بە جووتە دەستیان کرد بە پێکەنین و بە سەرسوڕمانەوە وتیان:

ـ چووزانین..!!

کەچی «نەوال»، کە ئەوسا گەیشتبووە لای ئەوان و پەنجەکانی لە یەکتر ئاڵاندبوون، چاوەکانی بڕیە چاویەوە و پێی وت:

ـ هەر دووکیان بۆ ئەو شتانە بەکاردەهێنین، کە دەستمان پێیان ناگات.

کرێکارەکە، وەک بڵێی باوەڕی نەکردبێت کچێک لەو تەمەنەدا شتی وا بزانێت و ئاواش بە ڕێکوپێکی بدوێت، بۆبە حەپەسا و دەمی داپچڕی.. ئینجا ڕووی کردە «دیجلە» و «فوڕات» و پێی وتن:

ـ بزانن ئەم مناڵە لە ئێوە زیرەکترە..!!

«نەوال» خێرا پیایدا هەڵشاخا و پێی وت:

ـ من مناڵ نییم، گەورەم.

کرێکارەکە پێکەنی و پێی وت:

ـ دەی چاکە، مادام گەورەیت، بۆ شووم پێ ناکەیت..؟! من زۆر حەز دەکەم کچێکی ئاوا جوان و زیرەکی وەکوو تۆ بخوازم.

«نەوال» لە پێشا ویستی لێی تووڕەبێت و جنێوی پێ بدات، بەڵام هەر لە خۆبەوە و نەیزانی بۆچی، پەشیمانبووەوە و سەری داخست.. دوای کەمێ چاوی هەڵبڕی و پێی وت:

ـ ئەگەر بزانیت جیاوازیی نێوان تۆ و ئەو کرێکارەی سەرەوە چییە، من شووت

پێدەکەم.

ئەو بە حەپەساویەوە دەستی ڕاستی لە پەیژەکە بەردا و نای بە ناوچەوانیەوە.. کەمێ بیری کردەوە و پێی وت:

ـ نازانم.. تۆ پێم بڵێ.

ـ ئەو بۆئەوەی لەسەرەوە نەکەوێتە خوارەوە و ملی نەشکێت، دەبێت ئاگای لە دەستی بێت، کارەبا نەیگرێت، بەڵام تۆ بۆئەوەی بە قۆنەرەکانم تێتنەکەوم و بە تف بە سەرت نەخەم، دەبێت ئاگات لە دەمت بێت.

کرێکارەکە ئەوەندەی حەپەسا، ئەوەندە سەغڵەت نەبوو و تەواو متەقی لە خۆی بڕی.. «خانزاد مامان»ی دایکی «دیجلە» و «فوڕات»یش، کە وا دیاربوو، لە ماڵی خۆبانەوە گوێی لەو قسانەیان ببوو و خۆی بۆ نەگیرابوو، دەرگاکەی کردەوە و بە کراسێکی ڕەشی گوڵگوڵیی درێژەوە دەرکەوت.. ڕووی کردە کرێکارەکە و پێی وت:

ـ کاکە تۆ خوا شێتی کردوویت، ئاوا دەمت خستۆتە دەمی ئەم عاجباتیەوە..؟! مەگەر هەر من ئەمە بناسم..!! بە خوا ئەو ڕۆژەی ناوکیم بڕی بە دایکیم وت: ئەم کچەی تۆ......

قسەکەی تەواو نەکرد و سەرێکی بادا، بەڵام ئەم درێژەی قسەکەی دەزانی و لە دڵەوە حەزی دەکرد تەواوی بکات.. ئەو چەند جاری تریش ئەو قسەیەی دووبارەکردبووەوە و لای ئەم و ئەو وتبووی، گوایە ئەو کاتەی جیایکردۆتەوە و بە چەقۆ دەسکرەشەکە ناوکی بڕیوە، دەمی لە گوێچکەی چەپی دایکی نزیککردۆتەوە و پیایدا چپاندووە:

ـ ئەم کچەی تۆ یان دەبێت بە گۆرانیبێژێکی قەحپە، یانیش دەبێتە بلیمەت.. لە هەر دوو حاڵەتەکەشدا بۆ ئەو شوێنە سەر هەڵدەگرێت، کە منی لێهاتووم و ناوبانگی بە هەموو دنیادا بڵاودەبێتەوە.

ئەو هەمیشە پۆزیشی لێ دەدا و شانازیی بەوەوە دەکرد، کە خۆی ناوکی بڕیوە و لەپاڵیا خۆش خۆش پڕوپاگەندەی بۆ کارەکەی دەکرد.. ئەو جارەش، کە زانیبووی مامۆستای «جۆگرافیای عێراق و وڵاتانی دراوسێ»، کاتێ هەڵیستاندووە و لێی

پرسـیـوە، دیجلە و فـورات لە کـوێ هەڵدەقـوڵێن و ئەم وتویەتی: لە ناوگـەڵی «خانزادی مامان» ، ئەو نەک هەر تووڕەنەبووە و بە زمانە شڕەکەی جنێوی بۆ ڕەوانە نەکردووە، بەڵکوو پێکەنیوە و بە ژنانی گەڕەکی وتوە:

ـ هەر منالێ من ناوکی ببڕم، ئاوا بلیمەت دەردەچێت.

«نەوال»یش ئەگەرچی «شازە» هەڕەشەی لێکردبوو و پێی وتبوو، نەچێت بۆ ماڵیان و گوێ لە قسە هیچوپووچەکانی نەگرێت، بەڵام لە هەموو ژنانی گەڕەک زیاتر دڵی پێی دەکرایەوە و حەزی دنیای لە سەرگوزشتەکانی دەکرد.. ئەو سەرگوزشتانەی، کە تەنها خۆی دەیزانی بەو تام و لەزەتەوە بیانگێڕێتەوە و بە جووڵە سەیر سەیرەکانی تەمسیلیان بکات.. «نەوال» پێی وابوو لەو شارە ژنێکی تری تیانییە، ئەوەندە وریا بێت و سەری لە هەموو ئیشێ دەربچێت.. مامانێکی زۆر شـارەزا، بەرگـدرووێکی ئێـجگار لێـهـاتوو، دەلاکـێکی چەند بلـێـی دەستڕەنگین.. بەڵام لەسەرووی هەموو ئەمانەشەوە پێشبینیکەرێکی بلیمەتی وابوو، هیچ پێشبینیەکی کورتی نەدەهێنا و درەنگ، یان زوو، دەبوایە ڕێک و ڕاست دەربچن.. هەر ئەمەش بوو وای لە «نەوال» دەکرد لێی نزیکبکەوێتەوە و بیەوێت لە نهێنیی ئەو توانا سەیرەی بگات.. بەتایبەتی، کە هەستی دەکرد هیچ کەسێکی تر وەکوو ئەو حەوسەڵەی نییە، ئاوا گوێ لە پرسیارە زۆر و زەبەندەکانی بگرێت و وەڵامیان بداتەوە.. هەر زوو زوو دەچوو بۆ لای و داوای لێدەکرد، باسی سەربردەی ژیانی خۆی بۆ بکات و ورد ورد بۆی بگێڕێتەوە، کەچی ئەو نەک هەر بێـزار نەدەبوو و دەسـتی بە ڕوویەوە نەدەنا، بەڵکوو هەمـوو جـارێ دەرگـا ڕەشوسپیەکەی ژوورەوەی دادەخست و دەستی پێدەکرد، کە چۆن دوای ئەوەی «ساڵە سوور»ی باوکی، کەوا چاکترین گۆرانیبێژی «سلێمانی» بووە و چەتە سپیپۆشەکان بە تفەنگە ڕەشەکانیان کوشتوویانە.. دایکیشی ڕەدوو کوڕێکی ڕەشپۆشی «شارەزووری» کەوتووە و ئەوی بە تەنیا بەجێهێشتووە.. خاڵی بردوویەتیە لای خۆی و گەورەی کردووە.. ئەوەندە جوان و بەرچاویش بووە، کوڕانی «سابوونکەران» تێکڕا چاویان تێبڕیوە و هەمیشە شەڕیان لەسەر کردووە.. بەڵام ئەو بڕیاری داوە تەنها شوو بە «هیشام»ی کوڕی ئەو «زوبێر»ـە بکات، کە

لەگەڵ خاڵیدا پەیوەندیی بازرگانییان هەبووە و هەر جارێ بهاتنایەتە «سلێمانی» لە لایان دەمانەوە.. دواجار بەگەڵی دەکەوێت و تا «بەغا» ناوەستێت.. دوای ئەوەی بە سکی یەکەمی «دیجلە» و «فورات»ی دەبێت و لەوەدایە پێ بگرن، «هیشام»ی باوکیان لە نزیک «سلێمانی» بە دەستی چەتە ڕەشپۆشەکان دەکوژرێت و سەربازە سپیپۆشەکان تەرمەکەیان بۆ دەهێننەوە.. دوای ئەوەی ماڵی خەزووری حاشای لێدەکەن و بە هی خۆیانی نازانن، دەرودراوسێ داوای لێدەکەن شووبکاتەوە و ئەوان پیاوێکی باشی بۆ دەدۆزنەوە، بەتایبەتی ئەو لەم شارەدا کەسی نییە و ڕەنگە جوانییەکەشی گۆیەندی بۆ بنێتەوە، بەڵام ئەو دەستی بە ڕوویانەوە نابوو و پێی وتبوون:

ـ دڵی من دووپشکی ڕەشە، بچێتە هەر کەسێکەوە، بە ژەهرە سپیەکەی دەیکوژێت.. بۆ نەگبەتییش ڕقم لە هیچ پیاوێکی ئەم شارە نییە و هەموویانم بەقەدەر یەکتر خۆشدەوێت.. ئێوە وازم لێبێنن، تا خۆم پیاوێ دەدۆزمەوە، کە ڕقم لێی بێت، بۆئەوەی تا ماوم لەگەڵیا ئاسوودە بژیم.

ئەوان گاڵتەیان لێهاتبوو و باوەڕیان پێی نەکردبوو، بۆیە هەر سووربوون لەسەر ئەوەی بە ئەرکی سەر شانی خۆیان هەستن و بیدەن بە شوو.. لە ماوەی دوو ساڵدا، چوار مێردیان بۆ دۆزیەوە و هیچیان سەر جێگاکەیان نەبینی.. هەر دوای شەکراوخواردنەوە ڕۆحیان دەردەچوو و بە پشتا، یان بە دەما دەکەوتن.. ئیتر لەمەوە باوەڕیان هێنا و بۆیان دەرکەوت، کە ئەم مەخلووقە توانایەکی بێئەندازەی لە پێشبینیی داهاتوودا هەیە و هەمیشە بە چاوی پڕ لە گومان و ترسەوە سەیریان دەکرد.. کاتێ دەچوون بۆ لای و پرسیاریان لێی دەکرد، کەوا بۆچی «هیشام» تا دوو ساڵ نەمرد و لەگەڵی مایەوە، ئەو بە شێوەیەکی زۆر سەیر، کە هەر هەموویانی سەرسام و ئەبڵەق دەکرد و جووڵەی لێدەبڕین، پێی دەوتن:

ـ ئاخر لە هەموو ئەو پیاوانەی لە ژیانما دیبوونم، تەنها ئەوم خۆشنەدەویست. کاتێکیش خۆشمویست.......

«خانزاد» وا ناوبانگی دەرکردبوو، ڕۆژانە خەڵک لە هەموو لایەکەوە ڕوویان دەکردە ماڵەکەی و سەرەیان لەبەر دەرگاکەی دەگرت، تا پێیان بڵێت چییان بەسەر

دێت و چی بکەن باشە.. سەرەتا دەرگای لە هەموویان دەکردەوە و یەک لە دوای یەک بەڕێی دەکردن، بەڵام دوایی بڕیاری دا تەنها ڕێی ئەو ژنانە بدات، بێنە ماڵەکەی، کە دووگیانن و هەر ئەوەندەشیان پێ بڵێت، ئەوەی سکیان کوڕە، یان کچ و لە دوارۆژدا چییان بەسەردێت.. کە «ست سوعاد» سکی بە «نەوال»ـەوە هەبووە و چووە بۆ لای، ئەو هەرچەند سەری هێناوە و بردووە، نەیزانیوە کوڕە، یان کچ و ئاخۆ داهاتووی چی دەبێت.. داوای لێکردبوو بچێت مۆزێکی سپی سپی لەگەڵ خۆیدا بهێنێت و بێتەوە.. ئەو توێکڵی مۆزەکەی خستبووە سەر تەنافێکی سوور سوورەوە، کە ئەملا و ئەولای بە دوو بزماری ڕەش لە دیوار کوتیبوو و هەمیشە پەڕەسێلکەکان لەسەری هەڵدەنیشتن.. دوای چەند ڕۆژێ، کە توێکڵی مۆزەکە وشکبووەتەوە و ڕەش ڕەش هەڵگەڕاوە، ئەو لە چاوەکانی خۆی نزیکیکردۆتەوە و جوان جوان سەرنجی لێیداوە، لە نێوان شێوەی قاز و ورچدا خۆی نواندووە و سەری باداوە.. ئاخی هەڵکێشاوە و بە حەپەساویەوە پێی وتووە:

ـ تا لە دایک نەبێت، ناتوانم هیچ بڕیارێ بدەم.

لەمەوە بە تەواوی وازی لەو کارە هێناوە و ببڕای ببڕای بەلایدا نەچۆتەوە.. وازی لێهێناوە و قیڕوسیای لەو هەموو پارەیە کردووە، کە ڕۆژانە دەستی کەوتووە و بڕیاریداوە هەر بە مامانی و جلدروین و دەلاکیەوە بژێوی خۆی و «دیجلە» و «فوڕات»ـەکەی پەیدا بکات.. تەنها بۆ «نەوال» و لەو ژوورە تاریکەی، کە ڕێگای هیچ کەسێکی تری نەدەدا پێی تێبخەن و بیبینن، نهێنیەکانی دڵی دەکردەوە و پێشبینیەکانی خۆی ئاشکرا دەکرد.. ئەویش نەک هەموویان و بە تێروتەسەلی، بەڵکوو بەشێکی زۆر کەمیان و بە زمانی ئاماژەش.. چونکە پێی وابوو لەگەڵ ئەوانەی خۆشیان توانای پێشبینییان هەیە و ناخی خەڵک دەخوێننەوە، دەبێت بە زمانی ئاماژە و شفرە قسە بکات، نەک بە ئاشکرا و ڕێک و ڕەوان و بەردەوامیش ئاگای لە زمانی خۆی بێت.. «نەوال» هەرچەند لێی دەپاڕایەوە و داوای لێدەکرد، پێی بڵێت، ئاخۆ چارەنووسی لەو شوێنەی سەری بۆ هەڵدەگرێت چی دەبێت و بە کوێ دەگات، ئەو سەری بادەدا و پێی دەوت:

ـ هەرچییم لێ دەپرسیت، بیپرسە، بەڵام ئەم پرسیارەم لێمەکە.

ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی:: ؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

هەموو جارێکیش، کە دەهاتنە دەرەوە و بە کلیلە ڕەشەکە دەرگا سپییەکەی دادەدەخست، پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی ڕادەشەقاند و پێی دەوت، کە نابێت نهێنیی ئەو ژوورە بەرێتە دەرەوە و لای هیچ کەسێ، نە گەورە و نە بچووک، باسی بکات.. جارێکیان هەر لەو ژوورە تاریک و نووتەکەدا، قازێکی سپیی لەناو سەندووقێکی ڕەشی چوارگۆشەییدا دەرهێنا و فووی کردە دەنووکیەوە.. قازەکە وردە وردە، گیانی لێکدەکێشرایەوە و وەکوو بالۆن گەورە دەبوو.. گەورەتر و گەورەتر دەبوو.. ئەم سەرەتا وایزانی هەر ئەو قازە نایلۆنانەیە، کە زۆر جار «شاسوار» بۆی دەهێنا و لەگەڵ «شازە»، لەسەر بەڕێکی ڕەشی سادە و لاکێشەییدا، یارییان پێدەکرد، بەڵام، کە دەستی لێی دا و جوان جوان لێی وردبووەوە، هەستی کرد زیندووە و دەمارەکانی لە ژێر پەنجەکانیدا کرتەکرتیان لێوە دێت.. «خانزاد»، کە داینا و بە قاچی ڕاستی شەقێکی سووکی لە قنگی دا، لەسەر بەڕە ڕەش و لاکێشەییەکەدا کەوتە جووڵە و بە قورسی هەنگاوی کورت کورتی دەنا.. ئینجا سەیرێکی ئەمی کرد و پێی وت:

ـ تۆ زۆر ئازایت، لەم تاریکییە لە قاز ناترسیت.

ئەمەی وت و قازەکەی کردە باوەشیەوە.. دەستی چەپی کرد بە کۆمیا و لە دەنووکی هێنایە دەرەوە.. بە «نەوال»ی وت خۆی ڕووتکاتەوە و پەنجەکانی دەستی ڕاستی لەوانەی ئەو هەڵکێشێت، کە ئەوەتا وەکوو سەرەمێکوتەی بزێو دەجووڵێنەوە و نینۆکە سوور سوورەکانیان بە شێوەیەکی زۆر زۆر سەیر دەبریسکێنەوە.. «نەوال» بەبێ دوودڵیی جلەکانی خۆی داکەند و پەنجەکانی بە پەنجەکانی ئەو سپارد.. ئەو خێرا ڕایکێشا و لە کۆمی قازەکەی هێنایە دەرەوە.. لە پێشا وای هەستدەکرد دەستی خستۆتە قوڕ و لیتەیەکی خەستەوە و وا وردە وردە لەناویا وەکوو ناڵی سپیی ئەسپی ڕەش ڕەقدەبێت.. دوایی هەر لە خۆبەوە و نەیزانی بۆچی، قێزی دەکردەوە و هێڵنجی دەهاتێ.. هێڵنجی دەهاتێ و دڵی تێکهەڵدەهات.. چاوی دەکەوتە ڕەشکەوپێشکە و شتەکانی بەحاڵ و بە

شێـوەیەکی زۆر زۆر جیا دەبینی.. ویستی تا تینی تیایە بقیـژێنێت و پڕبەدەمی هاوار بکات، کەچی نەیتوانی و هەستی کرد زمانی گیراوە.. گوێی کپبووە و هیچ دەنگێ، نە هی کز و نە هی بەرز، نابیسـتێت.. ئینجا هەستی کـرد، نەک هەر دەستی، بەڵکوو هەموو جەستەی خزاوەتە ناو هەناوی قازەکەوە و بە پەردەیەکی ڕەشی ئەستووری وەکوو پزدانی گرنج گرنج پێچاویانە.. ژانێکی سەیر، بەڵێ، زۆر زۆر سەیر، کە لەمەوپێش هەرگیز هەستی پێنەکردبوو، بە سەرتاپای گیانیدا دەگەڕا و بێهـوودە ئەمسـەر و ئەوسـەری دەکرد.. خـۆیشی نەیزانی دەنگی کێ بوو و لە کـوێوە هات، هات و پێی وت: ئەمـە ژانی لەدایکبـوونە و وریای خـۆتبـە.. ژانی لەدایکبـوونەوەیەکی تازەیە و ئارام بگرە.. هەسـتی دەکـرد، ئەو ئازارەی هەمـوو کەسێ دوای بوون، لە یادی دەکەن و بیریان ناکەوێتەوە، یاخوود بە قەستیی لە بیر خۆیانی دەبەنەوە و هەڵەتەی ئەودیو سنوورە دوور دوورەکـانی خەیاڵی دەکەن، وا ئەم جارێکی تر وەکوو خۆی، ئا.. ئا.. ڕێک وەکوو خۆی، دەیچێژێتەوە و بۆ هەتا هەتایەش لێی جیـانابێـتـەوە.. هەر ئەو ژانەش بوو هەسـتـێکی تازە و بەهێـزی پێدەبەخشی.. هەستێک، کە لەپاڵیا هەموو شتێـک دەبینرێت و دەبیسـترێت.. بۆن دەکرێت و دەچێـژرێت.. ئەوەتا «شازە»ی تەمەن پانزدە ساڵان قژی کردووە بە چوار پرچی بەقـەدەر یەک و پەنجـەکانی لە یەکـتـر هەڵکێـشـاون.. ڕێک لە خـوار قاچەکانی دایکی، کە لە شێـوەی پیتی «لا»یەکی زل کراونەتەوە و لە تاوی ئازار دەلەرزن، لەسـەر بەرە سـپـیـەکـەدا وەسـتـاوە و کـز کـز سـەری لەبەرنـاوە.. «هالە»ی پووری بە کـراسێکی نیوقـۆڵی سپیەوە، لەسەر کورسیـە ڕەشەکەدا دانیـشـتـووە و دەستی خستـۆتە ژێرچەناگەیەوە.. سەیری بنمیـچەکە دەکات و بیردەکاتەوە.. لە هەیوانیش هاوڕێکانی باوکی، بێـجگە لە «شـاسـوار»، هەر هەمـوویان چاوەڕێی هەواڵن و گوێچکەکانیان خستـۆتە بۆسەوە.. ئا ئەوەتا دەستەکانی «خانزاد»، گەرم گەرم و گورجوگۆڵ، هەڵیدەگرن و هەر بەو ژانەوە لە پەڕۆ ڕەشوسپیەکانی دەپێچن.. هەر بەو ژانەوە مـەمـک لە دەم دەگـرێت و دەیمـژێت.. هەر بەو ژانەوە دەگـری و پێدەکەنێت.. هەر بەو ژانەوە گـڕوگـاڵ دەکات و زمـان دەگـرێت.. هەر بەو ژانەوە گۆزان گۆزان دەکات و شەقشەقە ڕادەشەقێنێت.. هەر بەو ژانەوە گاگۆڵکێ دەکات

و پێدەگرێت.. هەر بەو ژانەوە دەچێتە قوتابخانە و گوێدەگرێت.. هەر بەو ژانەوە یاریی دەکات و هەڵدەبەزێت.. هەر بەو ژانەوە گۆرانی دەڵێت و مۆسیقا دەژەنێت.. هەر بەو ژانەوە خۆشەویستیی دەکات و ڕق لە دڵ دەگرێت.. هەر بەو ژانەوە بیردەکاتەوە و ئازار دەچێژێت.. هەر بەو ژانەوە پشت لە شار دەکات و بەجێیدەهێڵێت.. هەر بەو ژانەوە ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان دەیگرێت و ژان دەیگرێت.. ژان و ژان و ژان و ژان.... ژان.. ژان.. ژان..

ژ.. ژ.. ژ.. ا.. ا.. ا.. ن.. ن.. ن.... ژ.. ژ..ا.. ا.. ن.. ن.... ژ.. ا.. ن..... ئای لەو ژانەی، کە لە ناو سکی قازێکی ئەفسانەییدا بۆیان هەڵگرتبوو و بە دەستی خۆی تێکەڵی جەستە و ڕۆحی کردەوە..!! هەر ئەوساش جیاوازیی نێوان عەبا و ژانی دۆزیەوە و موچوڕکەی ئاسوودەیی پیادا هات، کە هەر لەوەتەی فامی کردبووەوە، ببووە خولیای و هەمیشە لە خەیاڵی خۆیدا لێکی دەدایەوە.. ئینجا زانی ئەمیان ڕەشە و ئەویان سپی.. ئەمیان بەڵای دەرەوەی جەستەدا دەدرێت و دەیشێوێنێت.. ئەویان دەکرێت بە دیوی ناوەوەیدا و دەیبوژێنێتەوە.. چلچرای تیادا هەڵدەکات و ڕۆشەن ڕۆشەن، هەر زۆر زۆر ڕۆشەنی دەکاتەوە.. ئەم هەرچەند لەو سەربانەی ماڵی باپیریەوە، سەیری ئەو دووکەڵە ڕەشەی دەکرد و لێی وردەبووەوە، کە لە گزۆزی سپیی شەمەندەفەرە ڕەشەکانەوە دەهاتە دەرێ و لە شێوەی ژنی عەبابەسەر بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا، ئەو گامێشە ڕەش ڕەشانەی بیردەکەوتەوە و تەزووێکی بەتین بەسەرتاپای گیانیدا دەهات، کە ڕۆژی تەمومژە ئێجگار سپییەکە، لەگەڵ «سیامەند» و «شازە»دا بینیان و هەستێکی سەیریان لە دڵیدا خولقاند، هەندێکیان لە زێیەکەدا مەلەیان دەکرد و هەندێکیان خرم خرم ئالیکی سپیی ناو ئاخوورە ڕەشەکانیان دەخوارد.. سەرەتا، کە لە دوورەوە بینینی و سەرنجی لێ دان، وەکوو کۆمەڵێ بێشکەی مناڵە کوردەکان دەهاتنە بەر چاوی و حەزی دەکرد دەستیان پێوە بگرێت.. دەستیان پێوە بگرێت و بەدەم لایلایەیەکی

ئێجگار خەمناکەوە، کە لە ژنە کوردێکی سپیپۆشی گەڕەکی «حەیدەرخانە» فێری ببوو و ماناکەی نەدەزانی، هێواش هێواش ڕایانهەژێنێت، بەڵام هەرچەند ئەوان بە ئۆتۆمۆبیلە ڕەشەکەی خۆیان، لێیان نزیکدەکەوتنەوە، کە لەسەر ڕێگا خۆڵەکە سووک سووک دەڕۆیشت و تۆزێکی سپیتری تێکەڵ بە تەمومژە سپیەکە دەکرد، لەبەر چاوی دەگۆڕان و شێوەی تریان بە خۆیانەوە دەگرت.. جارێ وەکوو تەختەڕەشی ڕەش ڕەش و جارێکی تر وەکوو کۆمەڵێ ڕەشماڵی قەرەجە سپیپۆشەکان دەکەوتنە بەر دیدەی و خەیاڵیان بەملا و بەولادا پەرش و بڵاودەکردەوە.

ئەو کچە عازەبە سپیپۆشەی، بە دەستی ڕاستی سەتڵێکی ڕەشی پڕ لە شیر و بە دەستی چەپی چەقۆیەکی سپیی دەسکڕەشی گرتبوو، کاتێ پێڵاوە ڕەشەکانی بە بەردە سپیەکان پاککردەوە و لێیان هاتە پێشێ، بە دەنگێ، وەکوو ئەو دەنگەی دوای شیوەن و واوەیلایەکی زۆر زۆردا دەنووسێت و بەحاڵ دەبیسترێت، بە «سیامەند» و «شازە»ی وت:

ـ با ئەم کچە لەو گامێشانە نزیکنەکەوێتەوە، نەوەکا بترسێت و شەو خەون بە قازی سپیەوە ببینێت.

«نەوال» بە حەپەساویەوە سەیری کرد و لێی پرسی:

ـ بۆچی کچەکە ئەوەی لە گامێش بترسێت، شەو خەون بە قازەوە دەبینێت..؟!

ئەو لە کاتێکدا کەمێ دانەویبووەوە و بە ئانیشکی چەپی پاڵی بە دەرگا ڕەشەکەی ئەو ژوورە لاکێشەییەوە دەنا، کە لە بەردی سپیی چوارگۆشەیی دروستکرابوو و بە قامیشی درێژی ڕەشوسپی سەری گیرابوو، بزەیەکی خستە سەر لێوە ئەستوورەکەی و بە شێوەیەکی زۆر سەیر، کە «نەوال» هەر لە خۆیەوە و نەیزانی بۆچی ترسا و مووچڕکی پیادا هات، پێی وت:

ـ بۆچی بچکۆل تۆ ئەوە نازانی..؟!

ویستی خۆی بخاتە باوەشی «سیامەند»ـەوە و توند توند دەستەکانی بگرێت، کەچی خۆیشی نەیزانی بۆچی واینەکرد و هەر بەو ترسەوە لە ژوورەکە نزیککەوتەوە.. هەرکە چەند هەنگاوێکی کورت کورتی ناو گەیشتە بەر دەرگا،

کوڕێکی گەنجی باڵابەرزی بینی و سڵەمیەوە، کە بە دیشداشەیەکی سپی و پێڵاوێکی ڕەشی تۆکمەوە هاتە دەرێ و بە جامانەیەکی ڕەشتر دەموچاوی خۆی دەپێچا.. وەک بڵێی دەیان جاری تر دیبێتی و زۆر لە نزیکەوە بیناسێت، بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی گرت و لە گامێشەکانی نزیککردەوە.. کاتێ بە دەستە بەهێزەکانی هەڵیبڕی و ویستی سواری ئەو گامێشەی بکات، کە پارچە لبادێکی سپییان خستبووە سەر پشتی و بۆنی مێخەکی لێدەهات، سەری بەرزکردەوە و چاوی کەوتە سەر ئەو دوو پیاوە سپیپۆشەی، کە لە دووری ئەوان و ڕێک لە ژێر ئەو کەپرەی بە قامیشی سپی کردبوویان و ڕیشۆڵە هار و هاجەکان لەسەری هەڵنیشتبوون، گامێشێکی زلیان وەکوو گوڕ دابوو بە زەویدا و خۆشیان وێنەی دوو کێل لەملا و لەولایەوە وەستابوون.. دەستەکانی بە پشتی ملی گامێشەکەوە گرت و نینۆکەکانی لێگیرکردن، کە هەر لە عەبای ژنە سپیپۆشەکانی «بابلشێخ» دەچوو و وەکوو ئەوان دەبریسکایەوە.. قاچەکانیشی بەملا و بەولای قەپرغە زلەکانیەوە توندکرد و بە سەرسوڕمان و کەمێ ترسەوە، لە کوڕەکەی پرسی:

ـ ئەوە ئەم پیاوانە چی لەو گامێشە دەکەن..؟

ـ دووعای لەسەر دەخوێنن.

ـ بۆچی مامە..؟! بۆچی دووعای لەسەر دەخوێنن..؟!

ـ ئاخر تووشی بەگەڵیی بووە.

ـ بەگەڵیی چییە..؟!

ـ تۆ مناڵی نازانی بەگەڵیی چییە.

ـ من مناڵ نییم.. پۆلی چوارم.. ئێمە لە قوتابخانە نەخۆشیەکانی ئاژەڵ دەخوێنین.

ـ باوەڕناکەم نەخۆشیی بەگەڵیی بخوێنن.. ئەگەر بیشیخوێنن، هەر لێی تێناگەن.

ـ تووخوا مامە پێم بڵێ ئەو گامێشە داماوە چی بەسەرهاتووە..؟

ـ ناوگەڵی ئاوساوە کچم.. ناوگەڵی ئاوساوە.

ـ ناوگەڵی ئاوساوە..؟! بۆچی..؟!

ـ چونکە گامێشە نێرەکان خۆیان داوە بە سەریا.

«نەوال» تێگەیشت و دەستی کرد بە پێکەنین.. کەچی کاتێ سەیری چاوەکانی گامێشەکەی ژێری خۆی کرد و «ست سامیە»ی بیرکەوتەوە، کە جارێکیان بە ڕووتیی لەسەر تەختە سپیەکەی ماڵی خۆیان؛ ئەوەی بە چەرچەفێکی ڕەش داپۆشرابوو و وێنەی پەرەسێلکەی سپی سپیی ورد وردیان لەسەر نەخشاندبوو، قاچەکانی لە شێوەی دارلاستیک کردبووەوە و لەسەر پشت ڕاکشابوو، «شازە»ش زۆر دڵڕەقانە دەستەکانی جووتدەکرد و دەیخستنە سەر مۆمدانەکەی.. دەیخستنە سەری و ئەو هاواری لێ بەرزدەبووەوە؛ ماتەمینیی دایگرت و لێی پرسی:

ـ ئازاری هەیە وانییە مامە..؟!

ـ زۆر..!! من هەر گامێشێکم تووشی بووبێت، دەمودەست چەقۆ سپیەکەم بە بڕبەندە ڕەشەکە تیژکردووە و خێرا سەریم لە جەستەی جیاکردۆتەوە.

ـ لەبەرچی..؟!

ـ پێت نالێم.

ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

«نەوال» سەری بەرزکردەوە و سەیرێکی تری پیاوەکانی کرد، کە لە شوێنی خۆیاندا جووڵەیان نەدەکرد و هەڵمێکی سپی سپییان لە دەم دەردەچوو.. ئینجا ڕووی کردە کوڕەکەی لای خۆی و پێی وت:

ـ ئامۆژنم سیستەرە، دەتوانێت گامێشی ئەو پیاوانە چاکبکاتەوە.

ئەو قاقایەکی بەرزی لێ دا و لێی پرسی:

ـ ئامۆژنت کێیە..؟!

ئەم لە داخی ئەو پێکەنینە ناکاو و بێتامەی ئەو، چاوی چووە پشتی سەری و بە بێزاریەوە پێی وت:

ـ شازە..!! ئەی نابینی وا لەگەڵ مامە سیامەندم وەستاوە و سەیرمان دەکات..!!

ـ ئامـۆژنت دەتوانێت، چارەسـەری ئەو خـەڵکانە بکات، کـە بەدەم خـەوەوە دەڕۆن..؟!

ـ چۆن ناتوانێت..!! ئەی سیستەر نییە..؟!

ـ بەڵام ناتوانێت چارەسەری بەگەڵیی گامێش بکات.

«نەوال» هیـچی نەوت و سەری لەبەر نا.. کەچی ئەو بە سـووکی دەسـتـەکانی درێژکرد و خستیە سەر دەستی ئەم، کە لەسەر ملی گامێشەکەدا لەنگەریان گرتبوو و ئارەقیـان کردبووەوە.. بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیرێکی چاوەکانی کرد و پێی وت:

ـ دەزانی من شـەوانە بەدەم خـەوەوە دەڕۆم..؟! ئەگـەر ئامـۆژنت بیـەوێت چارەسەرم بکات، دەبێت لەگەڵما بنوێت و دەستی بکاتە ملمەوە..؟!

خۆیشی نەیزانی بۆچی هەموو گیانی کەوتە لەرزین و هەستێکی زۆر سەیر، کە لێی تێنەدەگەیشت و بە هیچ شێوەیەک سەری لێدەرنەدەکرد، لە دڵیدا هەڵتۆقی و وێنەی کرم کەوتە جووڵەجووڵ.. بەر چاوی تاریکبوو و وشـەکان لە گوێچکەیدا وەکوو زاق و زریقی پەڕەسێلکەکانی سـەر قامیـشـە ڕەشـەکـان، کـە بەردەوام لەسەریان هەڵدەفڕین و هەڵدەنیشتنەوە.. هەڵدەنیشتن و هەڵدەفڕینەوە، دەنگی دەدایەوە و کاسیاندەکرد.. «شازە»ی دەبینی لەسەر پێخەفەکەی خۆی لەگەڵیا پاڵکەوتووە و قـۆڵە سـپی و ڕووتەکـانی توند توند لە ملی ئاڵاندووە.. ئەویش پەیتا پەیتا بە گاز تێیان دەکەوێت و جێی ددانەکانی وەکوو وێنەی تەڵەمشکی خوێناویی بەسەریانەوە دەردەکەون.. دەم و لچە ئەستوور و لووتە پانەکەی دەخاتە ناو قژە درێژ و خاوەکەیەوە و بۆنیدەکات.. چاوە زەقەکانی لەگەڵیا توند توند دەنووقێنێت و هەناسەی قووڵ قووڵ هەڵدەکێشێت.. گەوزی پێدەدات و لەمسەری ژوورەکەوە بۆ ئەوسەری تلۆریدەکاتەوە.. هاوکات ئەو جنێوانەی بیردەکەوتەوە و ئاخی قووڵی هەڵدەکێشا، کە ژنە دەمشڕەکانی «بابلشێخ»، لە کاتی شەڕەکانیان بە یەکتریان دەدا و وەکوو دەنگی دەسکەوانی سپی، کاتێ زەنگزەزەنگ زەزەنگ زەنگ.. زەنگزەزەنگ زەزەنگ زەنگ، بیبـەری ڕەشی لەناو دەکـوتن و چاویان لەگەڵ دەنووقێنن، ئاوا لەناو سەریا دەزرینگانەوە:

ـ کچێ برۆ هەی قەحپە، تۆ بە هی گامێشەوانەکانیش دانامرکێیتەوە.

ـ هی گامێشەوانەکان بکە بە خۆتا، بەربادی ئالۆشاویی، بەشکو ڕەحەت بیت و چیتر شەڕ بە ئێمە نەفرۆشیت.

دەیویست دەستەکانی لە ژێر دەستی ئەودا دەربهێبێت و لەسەر پشتی گامێشەکەوە خۆی هەڵداتە خوارەوە، بەڵام وا تاسابوو، بۆی نەدەکرا و ئەوەندەی تر شپرزەدەبوو.. هەرچۆنێ بوو دەمی هەڵهێنایەوە و بە ڕقەوە پێی وت:

ـ بە مامە سیامەندم دەڵێم وەکوو سەگ بتتۆپێنێت.

ئەو قاقیەکی تری لێ دا و وتی:

ـ کام مامە سیامەندەت..؟! ئەوەی لە ژن دەچێت..؟! باوکی ئەویشت بۆ بە بەر شەق هەڵدەدەم.

ئینجا ئەوەندەی تر گیانی خاوبووەوە و چاوی زیاتر کەوتە ڕەشکەوپێشکە.. دانەکانی لە لێوی گیردەکردن و دەیکرۆژتن.. لەمەوە حەزی دەکرد، ئەو قسەیەی پێی وت، پێی بڵێت و پێی بڵێتەوە.. پێی بڵێت و پێی بڵێتەوە، تا تەواو بێ هۆش دەبێت و بە پشتا دەکەوێتە خوارەوە.. دەکەوێتە ژێر قاچی گامێشەکەوە و ڕۆحی لە کونی لووتیەوە دەردەچێت.. ئەوسا لە هەموو شتێ زیاتر ڕقی لە جەستەی «شازە» دەبووەوە و هەستی دەکرد تەواو بۆگەنیکردووە.. قێزی لێیدەکردەوە و باوەڕی نەدەکرد جارێکی تر بتوانێت خواردنی دەستی بخوات، یان شەوان سەر بخاتە سەر قۆڵی ڕووتی و بێخەم لێی بنوێت.. بەتایبەتی کاتێ چاوەکانی دادەخست و بیریدەکەوتەوە، کە ئەو تەگبیری کرد و ئەمانی هێنا بۆ سەر زێ، گوایە بای باڵی خۆیان دەدەن و لەگەڵ دەستیان ماست و سەرتوێژی گامێش دەکڕن.. پڕبەدڵ حەزی دەکرد، ئەو کوڕە شەڕانییە بە بەر چاویەوە ڕووتی بکاتەوە و بە کێردێکی زل زل، بەڵام چەند بڵێیت دڵڕەقانە، تێیبکەوێت.. لە پێشا بیخاتە ناو گەڵیەوە و لە ناوەڕاستەوە بیکات بە دوو لەتەوە.. ئینجا ونجڕ ونجڕی بکات و پارچەکانی بدات بەو سەگە سپییەی، کە لەسەر تەنوورە ڕەشەکەی ئەولایانەوە هەڵتڕووشکابوو و زەق زەق سەیری ئەمانی دەکرد.. لە داخا چەند جارێ، بەبێ ویست دەمی کردەوە و وتی:

ـ ئامۆژنم قەحپەیە.. گاندەدات.. حەزدەکات گامێشەوانەکان سواری خۆی بکات.

کەچی ئەو وەک بڵێی بیەوێت ئەوەندەی تر تووڕەی بکات و زیاتر ناخی بورژێنێت.. دەمی لە گوێچکەی ڕاستی نزیکدەکردەوە و پێی دەوت:

ـ ئای..!! ئەوە چۆن دڵت دێت وای پێ بڵێیت..؟! ئامۆژنت جوانترین ژنی ئەم دنیایەیە.. من دەیکەم بە ژنی خۆم و شەو تا بەیانی سەر دەخەمە سەر ئەو قژە درێژەی.

گەیشتە تینی و پڕ بە هەموو دەمی هاواری کرد:

ـ شازە قەحپە.. شازە گاندەر.

چاوەڕێبوو «شازە» بێت و وەکوو هەموو جارێ، کە ئەو جنێوانەی پێ دەدا و تووڕەیدەکرد، بە قژ ڕایدەکێشا و بە لەقە تێیدەکەوت، ئاوا لەسەر ئەو گامێشەی بێنێتە خوارێ و مارکوژی بکات، بەڵام کە چەند جارێکی تری وتەوە و ئەو هەر نەهات، ئینجا ئاوڕێکی دایەوە و زانی ئەمان زۆر دوورکەوتوونەتەوە و دەنگی ناگاتە لای ئەوان.. کاتێ کوڕەکەش لەپڕ دەستی ڕاستی لە چمکی دیشداشەکەی خۆی گیرکرد و بۆ سەرەوە هەڵیکرد، ئەم چاوی زەقبووەوە و لە دڵی خۆیدا وتی: ئاخۆ چی بکات و چ نیازێکی هەبێت..؟! کەچی ئەو خێرا قایشێکی سپیی باریکی لە کەمەری خۆی ترازاند و چەند جارێ بە لاڕانی چەپیدا کێشا.. ئینجا بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەرێکی لە ملی گامێشەکەی گرێ دا و سەرەکەی تری خستە ناو دەستی چەپی ئەمەوە.. سەری بردە ژێر گوێچکەی و پێی وت:

ـ ئەمە بگرە بە دەستەوە، بۆئەوەی گامێشەکە بزانێت تۆ خۆشتدەوێت و نەتخاتە خوارەوە.

ویستی تووڕەتر سەیری چاوەکانی بکات و لێی بپرسێت، ئاژەڵێکی ئاوا چۆن شتی وا دەزانێت و خۆ ئەم منالێکی دەبەنگ نییە باوەڕ بە قسەی ئاوا بکات، بەڵام جۆری قایشەکە سەرسامیکرد و زمانی لە گۆ خست.. هەستی دەکرد مادەیەکی زۆر سەیرە و هەر لە پووکی بنیادەم دەچێت.. ناودەستی ختووکە دەدا و تەزووی بە هەموو گیانیدا دەهێنا.. پەنجەی ئەسپێکوژەی دەستی ڕاستی لە

کراسە ڕەشە هێلسپیەکەی خشاند و خستیە دەمیەوە، تا بەراوردی ئەو و پووکی خۆی بکات و جیاوازییان تیادا بدۆزێتەوە.. بەڵام نەیتوانی و ئەوەندەی تر حەپەسا.. دەریهێنایەوە و سەری قایشەکەی تێخست.. خستیە نێوان دانەکانی و گازی لێگرت.. حەزی دەکرد لەتوکوتی بکات و پارچەکانی قووتبدات، کەچی ئەو بە خۆی نەدەزانی و هیچی بەسەرنەدەهات.. هەر ئەمەش بوو وای لێدەکرد بەردەوام بیجوێت و بیجوێت.. بیجوێت و بیجوێت.. کاتێ بەلای گامێشەکانی تردا دەڕۆیشت و سەیری دەکردن، کە لەملا و لەولایەوە پاڵکەوتبوون و کاوێژیان دەکرد، خۆی بە بەچکەگامێشێ دەهاتە بەر چاو و موچوڕکی پیادادەهات.. هێلکەشەیتانۆکە زل زل و زۆر سپیەکانیش لە ژێر قاچی ئێجگار ڕەشی گامێشەکەی ژێریدا بەردەوام دەپلیشانەوە و دەنگێکی وەکوو دەنگی ئەو سەرکە خەلووزانەیان لێ بەرزدەبووەوە، کە جارێکیان بینینی پیاوێکی سپیپۆش لەو دووکانەی هەر لە شووشەمەرەکەبێکی چەند بلێیی زلی لاشکاو دەچوو و زووو زووو پیاوێکی ڕەشپۆش هەللاجی تیادا دەکرد، بە خاکەنازێکی سپیی دەسکڕەش دەیکردنە زەرفە سپیەکەی دەستی «شازە»ـەوە و جار جاریش بەبێ ئەوەی حیساب بۆ ئەم بکات، سەیری مەمکەکانی دەکرد و لێیان ورددەبووەوە، کە لە یەخەی کراسە ڕەشە سادە و کەمێ تەنکەکەیدا جوان جوان دیاربوون و وەکوو هێلکەشەیتانۆکەی سپی سپی دەهاتنە بەر چاو.. ئەم لە «دیجلە» و «فوڕات»ـەوە فێربوو، هێلکەشەیتانۆکە لە قەراغی زێ و گۆمەکان کۆکاتەوە و دانە دانە بیانخاتە ناو ئەو سەتڵە ڕەشەی خۆیەوە، کە «هالە»ی پووری بۆی کڕیبوو و باپیری وایەری ڕەشی بۆ لە دەسکە سپی و لووسەکەیەوە پێچابوو.. پڕاوپڕی دەکرد و دەیهێنایەوە گەڕەک.. لە نێوان هەر دووکیان دادەنیشت و لە بەبەردەمی خۆی دایدەنا.. وەکوو ئەوان دەیخستنە سەر بەردێکی ڕەش و بە بەردێکی ڕەشتر دەیشکاندن.. ئەم سەرەتا گاڵتەی لێیان دەهات و پێیان پێدەکەنی، کە دەیانوت: ئازاری لەدایکبوونی هەر کەسێ لەناو هێلکەشەیتانۆکەیەکدا هەڵگیراوە و ئەوەی بۆی بگەڕێت دەیدۆزێتەوە.. هەرکە دۆزیەوەش دەتوانێت هەموو ژیانی خۆی هەر لە سکی دایکیەوە، تا ئێستای بیربکەوێتەوە.. بەڵام ئەو جارەی، کە لەبەر چاوی

ئەم پارچە ورد وردەکانیان کردە مەنجەڵێکی ڕەشەوە و لە پەنا دیواری قوتابخانەکەی خۆیاندا خستیانە سەر چوار بەردی سپیەوە.. دوای تاوێ بە گڕی کەمێ بەتینی ئاگرەکە توانەوە و بوون بە شلەیەکی مەیلەو خەست.. شلەکەیان کرد بەسەر دەرگا داخراوەکەی قوتابخانەدا و دەمودەست وێنەی قازێکی گەورەی لەسەر نەخشا.. شەو «شازە» کاتێ جانتا ڕەشەکەی هەڵگرت و ویستی بچێت دەرزی لە «ست ساهیرە» بدات، ئەمیشی گۆڕی و لەگەڵ خۆیدا بردی.. دەستی چەپی کردە ملیەوە و بە بەردەمی قوتابخانەیدا برد.. ئەوسا تاریکایی وەکوو کوللەی بێشکە هەموو شتێکی داپۆشیبوو و لە چاوی ڕێبوارانی شاردبوونەوە، تەنها قازەکە نەبێت زرت و زیت باڵەکانی کردبووەوە و نزم نزم و سووک سووک هەڵدەفڕی.. چاوە سوور سوورەکانی دەبریسکانەوە و پریشکی ورد وردیان دەهاویشت.. ڕۆژی دواییش «ست سامیە»، کە پاڵتۆیەکی سپیی درێژی پۆشیبوو و قژە ڕەشەکەی لە شێوەی دارلاستیک هۆنیبووەوە، هەرچی شووشەمەرەکەبی ڕەشی ناو لۆکەرە سپیەکەی خۆی هەبوو، هێنایی و بە سەریداکردن.. وردە وردە جەستەی قازەکەی وندەکرد و هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا.. ئەم دەرگاکەی وەکوو سپلێکی ئێجگار گەورە، کە نەیدەزانی هی چ گیانلەبەرێکی ئەفسانەییە، دەهاتە بەر چاو و بێزی لێی دەهاتەوە.. دڵی تێکهەڵدەهات و هێڵنجی دەدا.. بۆیە بەبێ ویست دەمی کردەوە و وتی:

ـ قوتابخانە ئاژەڵێکی ناشیرینە و دەرگاکەی سپلێکی بۆگەنە.

ئیتر لەمەوە باوەڕی هێنا و لەوان بە پەرۆشتر خووی دایە کۆکردنەوە و شکاندنی هێلکەشەیتانۆکەکان.... ئەو ڕۆژەی «خانزاد»ی دایکیشیان خستیە ناو سکی قازەکەوە و سەرتاپا ڕابردووی بەسەرچووی خۆی بۆ کرد بە پارچە پەڕۆیەکی شەفافی ڕەش.. وەکوو منداڵی ساوا تێوەی پێچاو کردی بە قومات.. زیاتر بۆی دەرکەوت، کەوا قازەکان لە هێلکەشەیتانۆکەی تواوە دەخولقێن و هەر بۆیەش مەلەوانن، بەڵام لەگەڵ توانەوەی هەر قازێکدا ڕۆحی سووری هونەرمەندێ، لەودیو بینایی چاوە ئاساییەکاندا، تووشی تاعوونی ڕەشوسپی دەبێت و دەمودەست پەلەواژدەبێتەوە.. تەنها ئەوانەش هەستی پێدەکەن و دەتوانن ببینن، کە دڵێکی

پاک و ناسکیان هەیە و هەموو شتێ بە گریان دەردەبڕن.. یان ئەوانەی هەستی قێزکردنەوەیان لە هەموو هەستەکانی تریان بەهێزترە و هەمیشە ئەو شتانە بە دزێو و قێزەون دەزانن، کە لەلای خەڵکی تر ئاساییین و دڵی کەس ناورژێنن.. ئەم ئەو ڕۆژە لە هەموو کاتێ زیاتر قێزی لە دەوروبەری خۆی دەکردەوە و بە بینینی هەر شتێ، جوان و دزێو، دڵی تێکهەڵدەهات و لەگەڵیا سەری گێژیدەخوارد.. هەستێکی سەیریش، بەڵێ، ئێجگار سەیر، کە لێواولێو بوو لە ترس و دڵەڕاوکێ، لە گیانیا چەکەرەی دەکرد و لەبەر خۆیەوە دەیوت: «من وا بە ڕاستیی، نەک بە قسە، قێز لە خۆم و لە ڕۆژی لەدایکبوونی خۆم دەکەمەوە».. ئێوارەش گۆشتی سووری قەلەموونە ڕەشەکەی ناو قاپە سپییەکەی خۆی، کە بنکی بە وێنەی گۆرانیبێژێکی ڕەشپۆش نەخشابوو و چێشتی گەرمی زوو تیادا ساردەبووەوە، لێدەبووە هێلکەشەیتانۆکە و هەرچەند دەیخستە سەر زمانی و بە قێز و بێزەوە گازی لێدەگرت، ئەو شتە لینج و نەرمۆڵەیەی بیردەکەوتەوە و هەموو گیانی خاودەبووەوە، کە لەگەڵ بەردپیاکێشاندا لێیان دەهاتە دەرەوە و دەفلیقایەوە.. بە بەردەکانەوە دەنووسا و بۆنێکی ناخۆش ناخۆشی لێدەهات.. هەر زوو زووش دەستەکانی خۆی بۆندەکرد و لچی هەڵدەقورتاند.. لەپڕ هەڵدەستا و دەچووە بەر بەلووعەکەوە.. هێلنجی دەدا و نەشدەڕشایەوە.. دەستەکانی جوان جوان بە ئاو و سابوون دەشت و دەهاتەوە.. خەیاڵ دەیبردەوە و ماتدەبوو.. تەنانەت ئاگای لەوە نەبوو، وا «شازە» لەسەر سەری وەستاوە و ورد ورد سەرنجی لێ دەدات.. هەر ئەوەندەی زانی دەستێ قژی گرت و بەهێز بەهێز ڕایکێشا.. لەقەیەک قرچەی لە مووڕەغەی پشتیەوە هێنا و ژانی خستە دڵیەوە.. بەر چاوی تاریکبوو و شتەکانی وەکوو تارمایی دەبینی.. «سیامەند» دەستەکانی «شازە»ی گرتبوو و ئەم بەحاڵ دەیبینی، کە دەیویست لە دەرگای ئاودیو بکات و بە تووڕەیی پێی دەوت:

ـ سەرشێتی بۆگەن.. ئاخر نابێت بزانم چی کردووە، تۆ ئاوا دڵڕەقانە تێیکەوتوویت..؟!

ـ تۆ هیچ قسەیەک نەکەیت، خۆی چاک دەزانێت، بۆچی دەمەوێت سەری بۆگەنی لە ژێر قاچما بپلیشێنمەوە.. ئەگەر خانزادە فلّقنم بۆ لەم شارە بەدەر نەنا،

بزانە هەموو بەغا قەحپەیەکی تری تیانییە وەکوو من.

کەچی دوایی، کاتێ هات چێشتی ناو قاپەکانی کردە مەنجەڵەکەوە و ویستی بیانبات بۆ مووبەق، چاوەکانی پڕبووبوون لە فرمێسک و بە کەساسیەوە سەیرێکی ئەمی کرد، کە لە سووچێکی ژوورەکەدا خۆی متکردبوو و وەکوو مشکی زارەترەک هەڵدەلەرزی.. دەیویست پێی بڵێت هەڵیاننەگرێت و ئەم برسیەتی، کەچی چەندی دەکرد و دەکۆشا نەیدەتوانی و ناچار سەری خۆی لەبەر دەنا.. زۆریشی بەلاوە سەیربوو، کە هەر دوای لێدانەکە قێزەکەی نەما و هەستیشی بە برسێتیەکی بێئەندازە کرد.. ئەوسا گۆرانیبێژە ڕەشپۆشەکەی دەبینی کز کز و زۆر زۆر خەمناک سەیری ئەمی دەکرد و ئاخی قووڵ قووڵی بۆ هەڵدەکێشا.. شەوی پێشوو خەونی پێوەدیبوو و کوڵێ خەفەتی بۆ خواردبوو.. لە خەونیدا ئەمان و دانیشتووی گەڕەکەیان، بە گەورە و بچووکیەوە چووبوون بۆ سەیران و لە دەشتێکی پان و پۆڕدا بارگە و بنەیان خستبوو.. کاتی نانخواردن، کە ئەمان خۆیان لە خێزانەکانی تر جیاکردبووەوە و چەند هەنگاوێ لە دووری ئەواندا دانیشتبوون، لەپڕ گەردەلوولێکی سپی لە بنکی قاپەکەدا هەڵیکرد و لە شێوەی ورچێکی زل زل بەرەو ئاسمان هەڵکشا.. گۆرانیبێژەکەی لوولکرد و بەرزیکردەوە.. سەرەتا بە حەپەساویەوە سەیری دەکرد و کەمێکیش دەترسا، کە دەیبینی وردە وردە بنکی قاپەکە فراوانتر و قەدی گەردەلوولەکە ئەستوورتر دەبوو.. ئەستوورتر دەبوو و ئەمی لە «سیامەند» و لە «شازە» و لە خەڵکی گەڕەکەکەی دادەبڕی.. زۆریشی بەلاوە سەیربوو و کوڵێ دەترسا، کە سێبەری گەردەلوولەکەی بە ڕەشی و هی گۆرانیبێژەکەی بە سپی لەو دەشتەدا دەبینی.. هەرچەندیش ئەم زیاتر هەڵدەچوو و بەرەو سەرەوە هەڵدەکشا، ئەویش بەو ئەندازەیە لەسەر زەوی و بە ئاراستەی باکوور دەکشا و درێژدەبووەوە.. درێژدەبووەوە و زیاتر کوڕەکەی لێ دووردەکەوتەوە.. دوایی هەستایەوە سەرپێ و پێڵاوە سپیەکانی لە پێکرد، کە تازە «شازە» بۆی کڕیبوو و دایکی قەیتانە ڕەشەکانی بۆ لە کونە بازنەییەکانی هەڵکێشابوو.. بەسەر سێبەرەکەدا ڕایدەکرد و پڕ بە هەموو قوڕگی هاواری دەکرد:

ـ ئەی گۆرانیبێژی ناو قاپە بەتاڵەکەم.. ڕەشپۆشی ماڵە چۆڵەکەم،

بەجێممەهێڵە.

وشـەکـان لە شـێـوەی دووپشـکی ڕەش ڕەش لە دەمی دەردەچوون و نەرم نەرم دەکەوتنە سەر زەوی.. قاچی دەخستە سەریان و بە ژێر پێڵاوەکانیەوە دەنووسان.. دەمودەست ڕەقدەبوون و وەکوو ناڵی ئەسپیان لێدەهات.. لەسەر ئەو زەویە تەختە، کە هەر دەتوت چەرمی دەهۆڵە و دەترسا قـاچەکـانی ڕۆبچنە ناویەوە، تەقـتـەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، دەنگی دەدایەوە.. ژنە ڕاهیبەکانیش لەملا و لەولایەوە بە ڕیز وەستابوون و زەق زەق سەیریاندەکرد.. هەرچەند ئەم دەستەکانی بە دەمیەوە دەگرت و قایم قایم دەیوت:

ـ ئەی گـۆرانـیـبـێـژی ناو قـاپە بەتاڵـەکـەم.. ڕەشـپـۆشی مـاڵە چۆڵەکـەم، بەجێممەهێڵە.

ئەوان تێکڕا قـاقـایان لێ دەدا و وەکـوو درەخـتی بەردەم ڕەشـەبا دەچەمـانەوە.. دەچەمانەوە و هەڵدەستانەوە.. هەڵدەستـانەوە و هەمدیس دەچەمانەوە.. ئەم گوێی نەدەدانێ و تەقـتـەتەق تەتەق.. تەقـتـەتەق تەتەق، بەدوایدا ڕایدەکرد.. ڕایدەکرد و دەشت و دۆڵ و دەربەند و دارسـتـان، گـرد و گـردۆلکە و شـاخ و کـێـوی دەبڕی.. دەیبڕی و هاواری دەکرد:

ـ ئەی گـۆرانـیـبـێـژی ناو قـاپە بەتاڵـەکـەم.. ڕەشـپـۆشی مـاڵە چۆڵەکـەم، بەجێممەهێڵە.

لەسەر لووتکەی کێوێکی زۆر زۆر ڕەش و چەند بڵێی بەرزدا، دوانزدە چەتەی ڕەشپۆش، لە ڕاوەپڵنـگ دەگەڕانەوە و سەری پڵنگە چاوڕەشەکانیان بە نووکی ڕمە ڕەشوسپیەکانیانەوە کردبوو، بە ئەسپی زۆر زل و ئێجگار سپیەوە، کە گوێچکە پانەکانیان لە کێلی گۆڕ دەچوون و شتی سەیر سەیریان لەسەر نووسیبوون، لێیان پەیدابوون و پێشـیـان لێگرتـن.. حاجی لەقلەقە سـپیـەکـانیش باڵە ڕەشـەکـانیـان کـردبوونەوە و لەسـەر سـەریان نزم نزم و تیـژ تیـژ ڕێیـاندەکـرد.. جار جـار دەنووکـە زلەکـانیـان دەکـردنەوە و بە دەنگی غـەتغـەت غـەتغـات.. غـەتغـەت غـەتغـات ئەو ناوەیان دەهەژاند.. هەر هەمـوویان لەپڕ و بە جـارێ لەسـەر سـەری ڕەشـپـۆشـەکـە نیـشـتـنەوە و لە ژێر چنگە سـوور و بەهێـزەکـانیـاندا خـپـیـانکـرد.. ئەم خێـرا ڕووی

وەرگێڕا و پشتی تێکردن.. زارەترەک و ڕەنگپەڕیو، چاوتاریک و خوێنمەییو، دەیزرووکاند و هەر بەسەر سێبەری ڕەشی گەردەلوولە سپیەکەدا ڕایدەکرد، کە نەیدەزانی بۆچی ئەمجارەیان لە منداڵدانێکی تاریک و نووتەک دەچوو و لە ژێر قاچیا وەکوو ئەو پەتە ڕەشوسپییەی «شازە» بۆی دەکرد بە جۆڵلانە، خاودەبووەوە و لە باریەکدەچوو.. خاودەبووەوە و لە باریەکدەچوو.. ئەم ڕایدەکرد و ئەوان تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق و حاجی لەقلەقەکانیش غەتغەت غەتغات.. غەتغەت غەتغات بەدوایەوە.. کاتێکی زانی گەیشتەوە لای قاپەکەی و لە قەراغەکەیا خۆی دا بە عەرزا، کە لە گۆمە گەورەکەی «بابلشێخ» دەچوو و سەرمێکوتەی ڕەش ڕەش و بزێو بزێو مەلەیان تیادادەکرد.. دواییش دوو پۆل ژن، یەکێکی ڕەشپۆش و یەکێکی سپیپۆش، ئەمیان لە لای دەستی چەپی و ئەویان لە لای دەستی ڕاستیەوە، دەرکەوتن و کزکز و خەمناک خەمناک بەرەو قەراغی گۆمەکەوە دەهاتن.. ئەمان بوخچەی ڕەشی پڕ لە جلی سپیی سەربازیی و ئەوان هی سپیی پڕ لە ڕەشیان کردەوە و تیانخستن.. لە چاوترووکانێکدا ئاوی گۆمەکەیان سوورکرد و کەوتنە سنگکوتان و خۆڕنینەوە.. ئەم سەرەمێکوتە سوورەکانی دەخستە ناولەپی هەر دوو دەستی و دەیوت:

ـ گۆرانیبێژەکە بەجێیهێشتم و سەرەمێکوتەکان خوێناویی بوون.

کە بەدەم هاوار هاوارەوە بێداربووەوە و بە ترسەوە چاوەکانی کردنەوە، خۆی لە باوەشی «سیامەند»دا گرمۆڵە کردبوو و هەڵدەلەرزی.. سەری پەنجەکانی ئەمی گرتبوو و هەڵیدەگلۆفین.. هەڵیدەگلۆفین و بیری لە پەنجەی باڵابەرزە و دۆشاومژەی دەستی ڕاست و چەپی چەتەکان دەکردەوە، کە بە یەکەوە نووسابوون و بە هیچ شێوەیەک بۆیان نەدەکرا بیانجووڵێنن.. لەمەوە بەزەیی پیایاندا هاتەوە و خەریکبوو دەست بکات بە گریان، چونکە لە «شازە»ی بیستبوو، کە بنیادەم هەموو خراپەیەک بەو چوار پەنجەیە دەکات و هەرچی پیسیی و پۆخڵیی ناو جەستە هەیە لە سەری ئەواندا کۆدەبنەوە.. ئەوە ئەو جارە لای خۆی داینا و وای پێی وت، کە چووبوون بۆ ماڵی «نازناز» و شەو لایان مانەوە.. «شازە» هەرکاتێ بیویستایە لە بێشکەی «شەماڵ» و «شارا» نزیکبکەوێتەوە و ڕایانبهەژێنێت، کە

بە کوللەی ڕەشی تەنک داپۆشرابوون و بلوێری سووری کەمێ ئەستووریشیان لە ژێرەکانیانەوە شۆڕکرابووەوە، بە لەفافێکی سپی هەر دوو پەنجەی بالآبەرزە و دۆشاومژەی دەستی چەپ و ڕاستی بە یەکەوە دەپێچا و توند توند گرێی لێ دەدان.. ڕەپ ڕەپ دەیوەستاندن و لەوانی تری دووردەخستنەوە.. لە ناوەڕاستی هەر دووکیان دادەنیشت و تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق دەیلەقاندنەوە.. ئەم سەیری لێهات و لێی پرسی:

ـ ئەوە ئامۆژن گیان تۆ بۆچی پەنجەکانت دەبەستیت..؟! خۆ بریندار نیین..!!

ـ ئاخر نابێت بەم دوو پەنجەیە، کە هەرچی خراپە هەیە ئەمان دەیکەن و هەموو پیسیی و پۆخڵەواتی گیانمان لەسەرە شوومەکانیاندا کۆبوونەتەوە، بێشکەی مناڵ ڕاهەژێنین.

لەماڵەوەش کاتێ ئامۆژنی ئەمووستیلە ڕەشەکەی دروومانی کردبووە پەنجەی ئەسپێکوژەی دەستی چەپی و بە دەرزی و دەزووێکی سپی، کراسێکی ڕەشی سادەی بۆ بووکەشووشە سپیەکەی ئەم دەدرووی، لە بەرامبەری دانیشت و لێی پرسی:

ـ باشە ئامۆژن بۆچی خەڵک ئەو پەنجانەی خۆیان ناقرتێنن..؟!

ـ بۆچی بیانقرتێنن..؟! قەزات لە دڵەکەم کەوێت.

ـ بۆئەوەی گیانیان پاکبێتەوە.

ئەو بە ددان سەری دەزووەکەی قرتاند و چاوی بڕیە چاویەوە.. کراسەکەی بۆ هەڵدا و کەوتە سەر ئەژنۆکانی، کە جووتی کردبوون و لەملا و لەولاوە دەستەکانی تێوەئاڵاندبوون.. هەستی دەکرد لەو شەمشەمەکوێرە ڕەشە دەچێت و دڵی تێکهەڵدەهات، کە قاچەکانی بە تەلی سپیی ستوونە ڕەشەکەی کارەبای بەر ماڵی «خانزاد»ەوە شۆڕکردبووەوە و ئەو جارە لەسەر قەڵاندۆشکانی «سیامەند»ەوە بینی.. چاوەکانی توند توند نووقاند و قێزی لێیکردەوە.. ئەم هەر لە خۆیەوە و نەیدەزانی بۆچی قێزی لە شەمشەمەکوێرە دەکردەوە و بە بینینیان ڕۆحی دەردەچوو.. تەنانەت بێزی نەدەهات دەستەکانیشی بە سابوونی شەمشەمەکوێرە بشوات و هەمیشە لە «شازە»ش تووڕەدەبوو، چونکە لەجیاتی سابوونی پشیلە،

کە ئەم حەزی لێیدەکرد و بۆنەکەی بەلاوە خۆشبوو، هی شەمشەمەکوێرەی دەکڕی و لەبەر بەلووعەکەی دادەنا.. ڕقی دنیای لە «نەجوا»ی کچی «ماهیر ئەبرەق»ی خاوەنی کارگەی سابوونی «شەمشەمەکوێرە» بوو و هەمیشە شەڕی پێ دەفرۆشت.. لە لای قوتابییەکانیش وا بڵاویکردبووەوە، هەر کەسێ بە گوێرەی کتێبی «هونەری چێشتلێنان»ی «ست ساجیدە»ی دایکی، کە وانەی «گۆرانی و مۆسیقا»ی پێ دەوتن و هەموو جارێ دەی بۆ ئەم دادەنا، چێشت لێبنێت و بیخوات، گەڕ و گول دەبێت و هیچ دکتۆرێ ناتوانێت چارەسەری بکات.. گیانی بۆگەندەکات و بە هەموو سابوونی ئەم شارە پاکنابێتەوە.. دواییش دەبێت بە شەمشەمەکوێرەیەکی زل و خواردنی دەبێتە زیندەوەری پیس پیس.. ڕۆژێکیان «ست ساجیدە» بە پەڕۆیەکی سپی، قژە ڕەشەکەی بەستبوو و هاتە سەر «شازە».. کردی بە شاتە شات و پێی وت:

ـ ئەگەر ئەو بێچووەکونەپەپووە، کە نازانم چی تۆیە و ئەوەندە لەم کەلاوەیەی ئێوە چی دەکات، واز لەو چەنەبازییەی نەهێنێت، ئەوا منیش لە هەموو شاردا بڵاوی دەکەمەوە، هەر کەسێ تۆ بەم دەستە بۆگەنانەت دەرزیی لێبدەیت، وەکوو خۆت نەزۆک دەبێت و ناوگەڵی دەبێت بە گوللەبەند.

ئامۆژنی ئەوسا پڵاوپاڵێوێکی ڕەشی بە دەستەوەبوو و بە سووکی دەیکێشا بە ڕانەکانی خۆیا.. لەپڕ هەڵیدایە سەر حاجەتەکانی بەر بەلووعە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ جا تووخوا گوللەبەند بێت باشتر نییە لەوەی وەکوو ئەوەی تۆ بەلەمی ماهیر ئەبرەق بێت و لەسەر دیجلە خوێری و چەورە سواری بن.. سەوڵی لێبدەن و ئەمبەر و ئەوبەری پێبکەن..؟!

«ست ساجیدە» گەیشتە تینی و پەلاماری دا.. بە دەستی ڕاست دەستی چەپ و بە دەستی چەپ دەستی ڕاستی گرت و پشتی نووساند بە دیواری هەیوانەوە.. «نەوال» هاواری لێ بەرزبووەوە و وایدەزانی ها ئێستا نا ساتێکی تر ئامۆژنی دەخنکێنێت، کەچی «شازە» لەپڕ و زۆر بە هێز خۆی ڕاپسکاند و لەولاتر لەنگەری گرتەوە.. خێرا قژی لەسەر چاوی لادا و شاڵاوی بۆ هێنا.. بە هەر دوو دەستی

دەستی ڕاستی گرت و تا تینی تیابوو پەنجەی باڵابەرزە و دۆشاومژەی بۆ دواوە نووشتاندنەوە.. ئەم پڕ بە هەموو دەمی هاواری دەکرد و دەپاڕایەوە.. ژنان هەرچۆنێ بوو فریایکەوتن و لە ژێر دەستیان دەرهێنا.. ڕۆژی دواییش «نەوال»، کە لە کۆڵان هاتەوە و «ست ساجیدە»ی بینی، بە کراسێکی سپیی گوڵگوڵیەوە لای «شازە» دانیشتبوو و چای دەخواردەوە، واقیوڕما و زۆر زۆریش تەریقبووەوە، کەچی ئەو بە دەمیەوە پێکەنی و بە گاڵتەیەکی چەند بلێیت سەیر پێی وت:

ـ گۆرانیبێژەکان هەمیشە شەڕ بەرپا دەکەن، کەچی وا خۆیان پیشاندەدەن، کە لێی تێناگەن.

ئەم لە شەرما چووە ژوورەکەی تر و بە هەموو هێزی خۆیەوە کەوتە گازگرتن لەو چوار پەنجەیەی.. حەزی دەکرد بیانقرتێنێت و بە مەکینەی قیمە ورد وردیان بکات.. ئەو مەکینەیەی کە لەبەر چاویا لە مردن دەچوو و هەر جارێ لەبەر ئەو تاڵە تیشکە سوورانەی لە جامی پەنجەرەی مووبەقەوە دزەیان دەکرد و خۆیان لە گیانی سپیی هەڵدەسووی، دەبریسکایەوە و موچوڕکیان بە هەموو گیانیدا دەهێنا.... ڕۆژی سەرژمێریە گشتیەکەش دوای ئەوەی زۆر هەوڵی دا چیرۆکێ بۆ ئەو دوانزدە گۆڕە هەڵبەستێت، کە مێژووی (١٦)ی (٣)یان لەسەر کێلەکانیان نووسیبوون و هیچی بۆ نەهات، هەر لە خۆیەوە چووە مووبەقەکە و بینی.. دەسکە ڕەشەکەی گرت و بایدا.. بایدا و بیری کردەوە.. لەناو گێژەنی خەیاڵەکانیدا نوقمبوو و هێڵی ڕەش ڕەشی باریک باریکی دەزوولەیی، وەکوو تەونی جاڵجاڵۆکە ڕەشەکانی سەر دیواری چەند بلێیت لووسی قوتابخانە، دەکەوتنە بەر چاوی و لە شێوەی شتی سەیر سەیر خۆیان دەنواند.. دواجار بوون بە کۆمەڵێ دووپشکی بزێو و ئیلهامی چیرۆکێکی کورت کورتیان پێبەخشی.. ئەوەندەی نەبرد لە هەموو شاردا بڵاوبووەوە و جێگەی بە هەموو چیرۆکەکانی تر چۆڵکرد:

دووپشکێکی ڕەشی گۆرانیبێژ، دڵی چووە بەو تاقە پەڕەسێلکە ڕەشوسپییە لەخۆباییەی، کە هێلانەیەکی ڕەشی شێوە دەسکەوانی لەسەر لووتکەی منارەیەکی سپیی بلووری کردووە و لە دەشتێکی پان و پۆڕدا، دوور لە ئاوەدانی ژیان بەسەر دەبات.. دووپشکی دڵدار و کڵۆڵ هەموو شتێ بەلاوە دەنێت و دەکەوێتە دوای

سێبەری منارە و هێڵلانەی پەڕەسێلکەوە، کە ئەمیان بە ڕەشی و ئەویان بە سپی لەسەر ئەو زەویە تەخت و سوورەدا دەردەکەوێت.. بە دڵی پڕ لە ئەوین و چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گۆرانیی بۆ دەچڕێت و وەکوو میلی کاتژمێر بەردەوام دەخولێتەوە.. دەخولێتەوە و دەخولێتەوە.. ڕۆژێکی تەمومژ، تەمومژێکی ئێجگار سپی، کرێکارە سپیپۆش و وەستا ڕەشپۆشەکان دێن و بە بەر چاویەوە منارەکە دەڕمێنن.. دەیڕمێنن و دەیکەن بە بیری ئیرتوازی.. لای سەرووی دەکەن بە کارگەی ڕەشی حەڵوای سپی و خواروی دەکەن بە خەستەخانەی سپیی دەرگاڕەش.. ڕۆژهەڵاتی دەکەن بە مزگەوتی سپیی منارەڕەش و ڕۆژئاوای دەکەن بە گەڕەکی گۆزەفرۆشە ڕەشپۆشەکان.. دەیکەن بە گەڕەکی گۆزەفرۆشە ڕەشپۆشەکان و تێکەڵ بە شاری دەکەنەوە.. دووپشکی دڵ پڕ لە حەسرەت، ناچار سەرهەڵدەگرێت و شێت و شەیدا، بە دوای پەڕەسێلکەی ئاوارە و لانەوازدا دەگەڕێت.. منارە بە منارەی ئەو شارەی بۆ دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە.. دواجار بڕیاردەدات لەناو ئامێرێکدا کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێت، کە قووچەک بێت وەکوو منارە و قووڵ بێت وەکوو بیری ئاو.. لە ماڵی «یاوەر هەورامی»ی وەستای گەچکاریدا، مەکینەیەکی قیمەی سپیی دەسکڕەشی بەر چاو دەکەوێت و دەچێتە ناویەوە.. «پوورە ئەختەر» کاتێ گۆشتی سووری گوێرەکە ڕەشەکەی تێدەکات و دەیەوێت بیکات بە شفتە، نازانێت دووپشکی تیایە و دەیجنێت.. دەیجنێت و دەیجنێت.. دەیجنێت و ژەهری سپیی دووپشکی ڕەش تێکەڵ بە سوورە گۆشتەکە دەبێت.. خۆی و مێردەکەی، هەر پێنج کچ و هەر پێنج کوڕەکەی بە جارێ دەمرن و تۆویان دەبڕێتەوە...

ئەگەرچی بڕیاری دابوو لە پێش هەموو کەسێکەوە بۆ «شاسوار»ی بگێڕێتەوە و پێی بڵێت توانای هەڵبەستنی چیرۆکی هەیە، بەڵام خۆی بۆ نەگیرا و حەزی دەکرد، هەرکە دوو قەموورەکە ناویان لە دەفتەرە لاکێشەییەکەدا نووسین و چوونە دەرەوە، خێرا بۆ «سیامەند» و «شازە»ی بگێڕێتەوە.. کەچی ئەوان نە گوێیان لێیدەگرت و نە سەیریشیان دەکرد.. چەند دەستی ڕاستی خستە سەر شانی چەپیان و پێی وتن:

ـ ئامۆژن.. ئامۆژن، چیرۆکێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە..؟! ئەی تۆ مامە

سیامەند..؟! ئەوە بۆچی قسە ناکەن..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! بۆ..؟!

دڵی پڕبوو و دەستی کرد بە گریان.. کەچی ئەوان هێشتا گوێیان لێی نەگرت و نەهاتن بەلایەوە.. ئەمیان ئۆبە سپییەکەی بە کراسە ڕەشەکەی قوتابخانەی ئەودا دەگرت.و سەری لەسەر مەکینەی دروومانەکەی هەڵنەدەبڕی، کە «شاسوار» ڕۆژی پێشوو لە پیاوێکی «تکریتی»ی بۆی کڕیبوو و وێنەی کۆترێکی سپییان لەسەر کێشابوو.. ئەویان بەردەوام بە باوەشێنە سپییەکەی خەڵووزی ناو مەقەڵیە ڕەشەکەی گەشدەکردەوە و لەگەڵیا هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا.. لەمەوە بڕیاری دا بۆ «شاسوار»یشی نەگێڕێتەوە و هەستیشی کرد ئەمە چیرۆکی منالانەیە و بە کەڵکی گەورە نایەت.. دواییش کاتێ «شازە» قۆپچە سپیە چوار کونیەکانی بە کراسەکەیدا دەگرت و ئەمووستیلە ڕەشەکەی دروومانی کردبووە پەنجەی ئەسپێکوژەیەوە، لەپڕ و نەیزانی بۆچی دەرزیەکەی کرد بە پەنجەی دۆشاومژە و بالابەرزەی دەستی چەپیا و خوێنی لێهێنان.. جار جار دەیخستنە دەمیەوە و مژی لێدەدان، جار جاریش بە قەراغی مەکینەکەیدا دەهێنان و وێنەی کۆترە سپیەکەی پێ سووردەکرد.. «نەوال» ئەگەرچی کاتێ جەستەی کۆترەکەی دەبینی وردە وردە سوورهەڵدەگەڕا و خەڵتانی خوێن دەبوو، زۆری بەلاوە جوانبوو و لەزەتی دنیای لە سەیرکردنی دەبینی، بەڵام سەری لەو کارەی ئامۆژنی سوڕما و لێی پرسی:

ـ ئەوە تۆ بۆچی خوێنت لە پەنجەکانی خۆت هێنا..؟!

ئەو سەری هەڵبڕی و پێی وت:

ـ تۆ هەقی ئەم شتانەت نەبێت.

کەچی ئەو ڕۆژەی لە ماڵی «نازناز» هاتنەوە و هەر لەو شوێنە دانیشتبوون، هەر پرسیارێکی دەربارەی پەنجەکان لێدەکرد، ڕێکوپێک وەڵامی دەدایەوە و جوان جوان تێیدەگەیاند.. کاتێ کراسەکەشی دەکردە بەری بووکەکەی و پێی وت:

ـ وا چاکە هەر کەسێ بیەوێت گیانی خۆی پاکبکاتەوە و پیسیی و پۆخڵەواتی تیادا نەهێڵێت، ئەو چوار پەنجەیەی لە بنا ببڕێت.

ئەو پێکەنی و پێی وت:

ـ بۆئەوەی لە یەکتر جیا نەبینەوە و هەر کەسێ بۆ خۆی نەژی، دەبێت ئەم پەنجانەمان بپارێزین.

ـ من لە تۆ تێناگەم ئامۆژن.. ئەوە تۆ دەڵێی چی چاوەکەم..؟!

ئەو هەر چواریانی لە چاوی ئەم نزیککردەوە و پێی وت:

ـ ئێمە لەبەر ئەم پەنجانەیە یەکترمان خۆشدەوێت.. هەر ئەمانەشن وامان لێدەکەن یەکتر ببینین.

ـ تۆ و مامە سیامەندیشم هەر لەبەر خاتری ئەم چوار پەنجەیە بە یەکەوە دەژین..؟!

ـ کچێ بە سائەقەت بم نەوالەکەی ڕۆحم، تۆ زۆر زیرەکیت زۆر..!!

ـ ئەی باشە تۆ بۆچی بێشکەی شیمال و شارا بەم پەنجانەت ڕاناهەژێنیت..؟!

ـ ئاخر شەماڵ و شارا، کە گەورەبن، دەبن بە گۆرانیبێژ.

ـ ئەی من، کە لە بێشکەیا بووم......؟!

ـ تۆشم قەت بەم پەنجانەم ڕانەهەژاندووە گوڵم.

«نێرگز»ی کچی «نازناز» ، کە لەگەڵ «نەوال»دا بە یەک ڕۆژ لە دایک ببوون و لە پۆلیش بە تەنیشت یەکەوە دادەنیشتن، هەموو جارێ بەرگەسەرێنێکی ڕەشی لە سەری خۆی هەڵدەکێشا و لایەکی بێشکە بەتاڵەکەی «شەماڵ»ی برای، یان ئەوەی «شارا»ی خوشکی بەرزدەکردەوە.. لەسەر یەک قاچ دەیوەستاند و ملی لە کەوانەکەی سەرەوەی هەڵدەکێشا.. دەستەکانی لەملا و لەولای کوڵلەکەیدا دەردەهێنا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی دەوت:

ـ ورچ ئاوا لەسەر قاچ دەوەستێت نەوال..!!

ئەو جارەی «نازناز»ی دایکیشی لە هەیوانەکەی خۆباندا بە پەتێکی سپی برۆی «شازە»ی هەڵدەگرت و بێشکەکانیشیان خستبووە بەر هەتاوی کەمێ گەرمی ناوەڕاستی حەوشەوە، ئەو کوڵلەکەی لەسەر ئەوەی «شەماڵ» لابرد و پێی وت:

ـ ئەگەر ئەم کەوانانەی لێبکەیتەوە و لەسەر دەم دایبنێیت دەبێت بە گۆڕی مردوو.. چونکە ئەم قاچانەی هەر لە کێلی گۆڕ دەچن.

«نەوال» ئەو پارچە تەختە لاکێشە ڕەشەی بیرکەوتەوە و خەیاڵی ڕۆیشت، کە

له سـووچێکی ژوورەکـەی خـاڵـیـدا هەڵـواسـرابوو و بە ڕەشـێـکی تۆخ تۆخ وێنەی پیـاوێکی کـەچەڵی سـمێـڵـزلی لەسـەر کـێـشـرابوو.. لە خـوار ئەویش ڕووبەرێک جیاکرابووەوە و لەسەری نووسرابوو: «هەر منالێکم بینیبێت، ئەوەم بیرکەوتۆتەوە، کە دەبێت بە پیرێکی پەککەوتە و هەر بێشکەیەکم دیبێت، گۆڕم بـیرکەوتۆتەوە.. هەرچەند سەیری ئافرەتم کردبێت و لێی وردبووبێتـمەوە، پەیکەری ئێسقانەکەیم دیوە»..«٨» بۆیە هەناسەیەکی قووڵ قووڵی هەڵکێشا و پێی وت:

ـ بەڵام ئەگەر قاچەکانی لێبکەیتەوە و لەمـلا و لەولاشەوە دوو دەسکی بۆ بکەیت، دەبێت بە دارەمەیتێکی بچکۆلە.

«نێرگز» کوللەکەی بەسەر بێشکەی براکەیدا دایەوە و لێی پرسی:

ـ ئەی ئەگەر هەر دووکیان لێکبدەیت، لە چی دەچن..؟

«نەوال» سەیرێکی هەر دوو بێشکەکەی کرد و وردتر سەرنجی لێدان، کە لە ڕیزی یەکـتـر دانرابوون و کـولله ڕەش و شـەفـافـەکـانیـان لەبەر هەتاوەکـە دەبریسکانەوە.. پەنجـەی دۆشـاومـژەی دەسـتی ڕاسـتی نا بە چەناگـەیەوە و بیریکردەوە.. لیکی ناودەمی قووتدایەوە و بە سووکی پێی وت:

ـ لە سەنووقی فیشەک دەچن.

مەبەستیشی ئەو سەنووقە ڕەشانە بوو، کە ڕۆژی لێزمەبارانەکە بینینی و لە جامی کەمێ تەڵخی شۆفەرلێتە سپیەکەی باوکیەوە سەیری دەکردن، کاتێ سەربازە سپیپۆشەکان، ئەملا و ئەولایان دەگرتن و خێرا خێرا لە دواوەی زیلە سپیەکانیان باردەکـردن.. ئەم بە سـووکی، بەڵام بەبێ ئەوەی چاویان لێ بتـرووکـێنێت و ڕوویبکات بەولاوە، دەستی چەپی خستە سەر ڕانی ڕاستی باوکی و لێی پرسی:

ـ باوکـە بۆچی وێنەی پەنجـەی منالـیـان لەسـەر ئەو سـەنووقـە گـەورانە کێشاوە..؟!

ـ ئاخر چونکە پەنجەی منالّ لە فیشەک دەچێت.

ـ پەنجەکانی منیش لە فیشەک دەچن..؟!

ـ جا تۆ کەی منالـییت شەمرووخ گیـان..؟! ئەی ئەوە نییـە بوویت بە پۆلی چوار..؟!

ـ باوکە بۆچی من کاتێ سەیری پەنجەی منالی ساوا دەکەم برسییم دەبێت..؟!
ـ برسییت دەبێت..؟! بۆ..؟!
ـ ئەی ئەوە نییە من لە تۆ دەپرسم..؟!
ـ جا من وەڵامی چییت بدەمەوە..؟!

ئەو ڕۆژەش هەرچەند سەیری پەنجە بچکۆلە و ئێجگار باریکەکانی «شەماڵ» و «شارا»ی دەکرد و لە نینۆکە زۆر زۆر سپیەکانیان وردەبووەوە، کە لە ژێر دەسرازە سپیەکاندا هاتبوونە دەرێ و لەودیوی کوللە شەفافەکاندا جوان جوان دیاربوون، سەنووقە فیشەک و سەربازەکانی بیردەکەوتەوە و خەیاڵی بەملا و بەولادا دەڕۆیشت.. بیری لە باوکی دەکردەوە و دەیهێنایە بەر چاوی، کە هەر دوای پرسیارەکەی ئەم ڕەنگی تێکچوو و متەقی لە خۆی بڕی.. جار جاریش هەر لەخۆیەوە و بەبێ ویست پەنجەی دۆشاومژە و باڵابەرزەی دەستی ڕاستی دەخستە سەر هۆڕینەکە و دیدیدید دیدید.. دیدیدید دیدید، دەنگی لێ بەرزدەکردەوە.. گایە سوورەکەش، ئەوەی بە وایەرێکی ڕەشوسپیی لووس بە لای پێشەوەی بنمیچەکەوە شۆڕ کرابووەوە و تا ناوەڕاستی جامەکە هاتبوو، بەردەوام هەڵدەبەزیەوە و پەلاماری بووکە سپیپۆش و زاوا ڕەشپۆشەکەی دەدا، کە ئەمیان بە پەتی ڕەش و ئەویان بە هی سپی شۆڕکرابووەوە و بە قۆچەکانی تێیاندەکەوت.. سەیری دەکردن و لە خەیاڵی خۆیدا ورد ورد تاوتوێی دەکردن.. هەستی کرد باوکی کارێکی خراپی کردووە گاکەی بە وایەر و بووک و زاواکەی بە پەت بەستۆتەوە، چونکە ئەمیان بە ئاسانی دەکشێت و دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی ئەمسەر و ئەوسەر بکات.. لە کاتێکدا ئەوان ناتوانن بە چاکی بجووڵێن و خۆیان لە قۆچە تیژ و بە هێزەکانی بپارێزن.. ویستی ڕووی تێبکات و پێی بڵێت، کەوا ئەم هیچ حەزناکات و زۆریش دڵی تەنگدەبێت، ئەو گایە بڵحەی بەوێوە هەڵواسیوە و بە شاخەکانی تەنگ بەو بووک و زاوایە هەڵدەچنێت، بەڵام دەیزانی ئەم هەر ئەوەندە دەمی هەڵێنێتەوە و قسەیەکی تر بکات، ئەوا ئەو خێرا بە سەریدا دەتەقێتەوە و داخی دڵی خۆی پێ هەڵدەڕێژێت.. بۆیە سەری خۆی لەبەر نا و کەوتە یارییکردن بە نینۆکەکانی، کە تازە «شازە» بە بڕەندە ڕەشە بچکۆلەکە لووس و بە سوورێکی

تۆخ تۆخ بۆیەی کردبوون.. ئەم لە ماڵەوەش بەو مەرجە ڕازیبوو و لەگەڵی هات، کە بیبات بۆ «بازاڕی سەرای» و لەوێ سەیری ئەو سیحربازە سپیپۆشە بکەن، کە جارێکیان بینیبووی بێچووەکەروێشکی ڕەشی دەکرد بە کونی ڕەحەتیەکی سپیدا و دەیخستنە ناو تەنەکەیەکی سوورەوە.. کەچی کاتێ لە لای دووکانەکەی خۆی لایدا و لە گەراجەکەی ئەوبەر وەستاندی، ئەوەی دەرگایەکی تۆتیای ڕەشی پێوەبوو و جارێکیان کچەقەرەجێکی سپیپۆشیان لەپاڵدا کوشتبوو، نەیوێرا دەم هەڵێنێتەوە و پێی بڵێت لەگەڵی نایەت.. کە گەیشتنە لای دووکانەکەی خۆشیان و دابەزین، حەزی نەکرد لەگەڵی بچێتە ژوورەوە و گوێ لە ئاخ و ئۆفە ناخۆشەکانی بگرێت، ئەگەرچی «سیامەند» و «جیهاد ئەعنەس»ی کاپتنی تیپی هەڵبژێردراوی «عێراق»یشی بینی بە پاڵتۆی ڕەشی درێژەوە، لەسەر کورسیە سپیەکانی ئەملا و ئەولای «میقداد شەکرچی»ـەوە دانیشتبوون و قاقایان لێ دەدا.. ویستی بچێت بۆ لای «عەمار» و حاجی لەقلەقە مۆمیاکراوەکە، لەسەر تاقە ڕەشەکە داگرێتە خوارەوە.. بینووسێنێت بە سنگیەوە و لووتی بخانە ناو پەڕە نەرمەکانیەوە.. چاوەکانی بنووقێنێت و بۆنی بکات.. تێر تێر هەڵیمژێت و وابزانێت چۆتە ناو ئەشکەوتی سەردەمە زۆر زووەکانەوە.. ئەو ئەشکەوتە تاریک و نووتەکانەی هەمیشە لە چیرۆکەکانی «شازە» و «شاناز»دا ناویان دەهات و بە ڕاستیی هەستی پێدەکردن.. هەرچەند لە لووتی «عەمار»یشی نزیکدەکردەوە و لێی دەپرسی:

ـ بۆنی ئەشکەوتی لێنایەت..؟!

ئەو بەبێ ئەوەی کەمێ دانەوێتەوە و بۆنی بکات، سەری بادەدا و پێی دەوت:

ـ تۆ ئەشکەوتت دیوە، تابزانی بۆنەکەی چۆنە..؟!

ـ نەمدیوە، بەڵام دەزانم ئاوایە.

ئیتر «عەمار» سەری لەبەر دەنا و بێ دەنگ دەبوو.. بەڵام جارێکیان، شەپقەیەکی سپیی کردبووە سەری و ئەو پێڵاوە ڕەشانەشی لە پێکردبوو، کە بنێکی ڕەقی وەکوو ئێسقانیان پێوەبوو و لەسەر کۆنکرێتە ڕەقەکە تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، پێیان دەڕۆیی، لەپڕ بە پەنجەی دۆشاومژە و باڵابەرزەی دەستی ڕاستی، تۆقە سپیەکەی لە قژی ئەم کردەوە و ڕوومەتی چەپی خۆی پێ

خوراند، که هی منالّیی «شازە» بوو و لە شێوەی دووپشک درووستکرابوو، ئینجا دەستی چەپی خستە سەر شانی ڕاستی و بە شێوەیەکی چەند بلّێیت سەیر پێی وت:

ـ تۆ زۆر زیرەکیت، کە وا دەزانیت بۆنی ئەشکەوتی لێدێت، چونکە ئەم حاجی لەقلەقە دوای ئەوەی چەتە ڕەشپۆشەکان، بە گوللەی ڕەشی تفەنگە سپیەکانیان، برینداریان کردووە و لە بناری شاخێکدا بە دەما کەوتووە، ورچێکی ڕەش بە زمانە سوورەکەی لستوویەتیەوە.

ـ ئەی چۆن نەیخواردووە.. ؟!

ـ پێت نالّێم.

ـ بۆچی.. ؟! تووخوا بۆچی.. ؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

کاتێ سەری بەناو دووکانەکەیاندا گرت و نەیبنی، ویستی لە «حەسەن خوداداد»ی باوکی بپرسێت، ئاخۆ کوڕەکەی لە کوێیە و ئەم حەزدەکات بیبینێت، بەلّام لەپڕ گوێی لە دەنگێکی زۆر سەیر بوو و خێرا بۆ دواوە گەڕایەوە.. کە سەیری کرد منالّە هیندیە سپیپۆشەکان بوون و داچلەکی، بەبێ ئەوەی گوێ بەو لێزمەبارانە بدەن و پێی سەغلّەتبن، کە بەسەریاندا دەباری و بەردەوام تەڕیدەکردن، بە ڕیز لە بەردەم گازینۆکەی «پیرۆت هەورامی»دا دانیشتبوون و سەر و کلّاوی چەرمی ڕەشیان کردبووە سەریان.. قوتووی ڕەشیان لە ناوەڕاستەوە کونکردبوو و وایەرێکی سپییان تێهەلّکێشابوون.. خستبوویاننە نێوان هەر دوو قاچیان و بە پەنجەی دۆشاومژە و ئەسپێکوژەی دەستی ڕاست و چەپیان، وایەرەکانیان ڕادەکێشا.. ڕایاندەکێشان و دەنگێکی زۆر سەیری وەکوو قرووسکە قرووسکی سەگیان لێ بەرزدەکردنەوە.. پەڕیەوە ئەوبەر و لێیان نزیککەوتەوە.. جوانتر سەرنجی لە دەستیان دا و چاکتر لێیان وردبووەوە.. ئەو ژنە سپیپۆشانەی بیردەکەوتەوە و دلّی دەکەوتە خورپە، کە لە لادێیەکی قەراغ شاردا دیبوونی و سەرنجیان ڕاکێشابوو، مانگا ڕەشەکانیان دەدۆشی و شیرێکی ئێجگار سپیان لە گوانەکانیان دەهێنایە خوارێ.. لە کەلێنی پەنجەکانیان، کە هەر لە شێرەکوللە

دەچوون و بە هەموو لایەکدا دەجوولان، بە خوڕ دەڕژانە ناو سەتڵە ڕەشەکانەوە و دەنگێکی وەکوو دەنگی ماچیان لێ بەرزدەبووەوە.. دەستی چەپی لە گیرفانی کراسە سپیەکەی هێنایە دەرێ و خستیە سەر شانی ڕاستی ئەوەی وێنەی پەڕەسێلکەیەکی وردی لەسەر چەناگەی کەمێ درێژی کوتیبوو.. لیکی ناو دەمی قووتدایەوە و پێی وت:

ـ منیش کەمێ بیدۆشم..؟

ئەو پەنجەکانی لەسەر گوانی مانگاکە هەڵگرت و خستینیە سەر دەستی ڕاستی ئەم.. پەنجەی دۆشاومژە و باڵابەرزەی گرت و کەمێ گوشینی.. سەری هەڵبڕی و پێی وت:

ـ تۆ نابێت مانگا بدۆشیت.

ـ خۆ دەتوانم.

ـ دەزانم دەتوانیت، بەڵام نابێت ئەم پەنجانەت بخەیتە گوانی مانگاوە.

ـ لەبەرچی..؟

ـ پێتناڵێم.

ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

دڵی داخورپا و پشتی تێکردن.. بیریدەکردەوە و بەرەو لای مامی و ئامۆژنی بە ترسەوە هەنگاوی کورت کورتی دەنا، کە سەر و جامی شووشەی ڕەشیان بە دەستەوە گرتبوو و خەریکی کرینی ماست و سەرتوێژ بوون.. دوو ژنی ڕەشپۆشی بینی لەملا و لەولای دەستاڕێکی سپیەوە دانیشتبوون و جۆبان دەهاڕی.. لەوێچ لەوێچ لەناو تەشتە سپیەکەوە دەیانهێنا و دەیانکردە کونە خشتەکەیەوە.. دەبوو بە ئاردێکی ورد وردی سپی سپی و پەیتا پەیتا بە قەراغەکانیدا دەهاتە خوارەوە.. دەڕژایە سەر ئەو پەڕۆ ڕەشەی لە ژێریاندا ڕاخستبوو و بازنەیەکی ئەستووری بە دەوریدا دەخولقاند.. ئەوە یەکەمجاری بوو دەستاڕ ببینێت و بزانێت بۆچی بەکاردێت، بۆیە زۆری بەلاوە سەیربوو و ئەبلەق و سەراسیمە بە دیاریانەوە وەستا.. سەیری ئەو دوو بەردە پان و ڕەقەی دەکرد و دیقەتی لێ دەدان، کە وەکوو

یەک وابوون و هەر لە خـۆیەوە و نەیدەزانی بۆچی مـوچوڕکی پیـادادەهات.. ئەمانیش بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕن و سەیری بکەن، یان وا هەست بکەن، کچێکە و لە لایان وەستاوە، داری ڕەشی ژێردەستاڕەکەیان گرتبوو و بایاندەدا، کە چووبوو بەناو کونی سەردەستاڕەکەدا و ڕەپ ڕەپ وەستابوو.. سووک سووک بایاندەدا و بە دەنگی ئێجگار بەسۆزیان خۆش خۆش گۆرانییان دەوت:

ـ شـــیـــبـت و گـــرانـی صـــبـــایـا
وشـــیـــبـت مـن هـظـمـی هـوایـه
وشـــیـــبـت مـن جـــور الـورایـه
ـ أبـات الـلـیـل چـل مـــچـلـوب عـــضـن
ونـیـــبـــان الـدهر بـحـــشـــای عـــضـن
زمـطـت بـصـــاحـــبـی ومـــا طـلـع عـــالـظـن
شـــمـــرنـی وشـــمـــتـــو بی الـعـــدا«٩»

دڵی پڕبوو و دەستی کرد بە گریان.. فرمێسک لە چاوەکانی هاتنە خوارێ و تنۆک تنۆک بۆ ناو سنگی ڕێچکەیان بەست.. ئەوان دەستیـان هەڵگرت و خێـرا هەستانە سەرپێ.. ئەم دەست و ئەو دەستیـان گرت و لای خۆیان دایاننا.. کەچی لێشیـان نەدەپرسی بۆچی هاتووە و لەبەرچی دەگری.. ئاخر لەبەرچی..؟! تووخوا لەبەرچی ئاوا گـوناه و بە سـۆز دەگـری و ئەو هەمـوو فـرمـێـسکە ورد وردە هەڵدەڕێژێت..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! بەبێ ئەوەی پرسیـان پێبکات و بزانێت ڕازیین، یان نا، دەستی چەپی بۆ دارە لووسەکـە درێژکـرد و بایدا.. بایدەدا و بایدەدا.. گۆرانیـەکانی ئەوانی وەکوو خۆیان و بگرە خۆشتریش دەوتەوە و هەر دووکیـانی هێنایە گـریانی زۆر بەکـوڵ.. بایدەدا و بایدەدا.. گـوێی نەدەدانێ و بایدەدا.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و لەوێچ لەوێچ جۆی دەکردە کونەکەیەوە.. بایدەدا و بایـدەدا.. بایدەدا و بێ دەنگ نـەدەبوو.. بایـدەدا و بایدەدا.. بـایدەدا و زیـاتر دەنگی لێ هەڵدەبڕی.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و چاوەکـانی دەکـەوتنە ڕەشکەوپێشکە.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و دیمەنی شتـەکانی لێ دەگۆڕا.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و دەنکە جۆبە درشتـەکانی وەکوو قالۆنچە ڕەقەکانی

دەشت دەبینی.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و دەنگی فلیقانەوەیانی دەبیست.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و قیژیدەکردەوە.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و دڵی تێکهەڵدەهات.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و نەشدەڕشایەوە.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و وردە وردە گوێچکەی کپدەبوو.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و دەنگی شتەکانی لێ دەگۆڕا.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و دەنگی وردبوونی دەنکە جۆکانی وەکوو خوڕەی زێرابە ڕەشەکەی پشت ئۆردووگا سپیەکەی قەراغ شار دەبیست.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و گیانی خاودەبووەوە.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و بایدەدا.. بایدەدا و بایدەدا.... بایدەدا و هەر بایدەدا.. بایدەدا و هەر بایدەدا.. بایدەدا و هەر بایدەدا.. بایدەدا و هەر بایدەدا.. بایدەدا و هەر بایدەدا.... بای.. دەدا.. بای.. دەدا.. بای.. دەدا.. بای.. دەدا.. بای.. دەدا....... کاتێکی زانی وا کراسێکی سپیی درێژیان لەبەرکردووە و لەسەر دۆشەگە ڕەشەکەی خۆی پاڵیانخستووە.. دایکی و ئامۆژنی بە جلی ڕەشی سادەوە لەملا و لەولای دانیشتوون و بە پەڕۆی سپی ناوچەوانی خۆیان بەستووە.. ژێردەستارەکە لەبەر چاویا وەکوو ئەم لەسەر پشت ڕاکشابوو و دارە لووسەکەی کردبوو بە کونی سەردەستارەکەیا.. کونەکەی تریش لەولا گەورەتر خۆی دەنواند و وەکوو لوولەی دووربینە ڕەشەکەی خۆی دەهاتە بەر چاوی، کە بە وێنەی کچە سپیپۆشێکی سەماکەر لەگەڵ «ئەدیب»ی گۆڕیبۆوە و بە قایشێکی چەرمی کەمێ زبر دەیکردە ملیەوە.. بەبێ ئەوەی کەس دەستی بۆ بەرێت و دەسکەکەی بابدات، هەر لە خۆیەوە دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. هەستی دەکرد چوار پەنجەکەشی دەخورێن و تەواو پەرێشانیانکردووە.. بەردەوام بە کراسە زبرەکانی دایکی و ئامۆژنی دەیخوراندن و لەگەڵیا هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا.. هەرچەندیش ڕووی تێدەکردن و لێی دەپرسین، ئەوە چی بەسەرهاتووە و بۆچی خورووی ئەو پەنجانەی نامرێت، کە ئەوەتا سوور سوورهەڵگەڕاون و خەریکە پێستەکەیان دادەماڵرێن، کەچی ئەوان خۆیان لێی گێلدەکرد و سووک سووک

قاچەکانیان دەشێلا.. دەیانشێلان و دەمارەکانیان خاودەکردنەوە.. یان ئەمیان سەری بەرزدەکردەوە و ئەویان ئاوی ناو پەرداغە ڕەشەکەی بە دەمەوە دەکرد.. خۆ ئەم زۆر هاواری کرد و پێی وتن، کە تینووی نییە و ناتوانێت ئەو هەموو ئاوە بخواتەوە، ئەی بۆچی گوێیان لێینەدەگرت و بە قسەیان نەکرد..؟! ئاخر بۆ..؟! بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟! بۆ..؟! دواترییش چەند هەوڵی لەگەڵ مامی و ئامۆژنی دا و لێیان پاڕایەوە، کە باسی ڕۆژی دەستارەکەی بۆ بکەن و پێی بڵێن بۆچی بوورابووەوە، ئەوان لێی تووڕەدەبوون و پێیان دەوت حەزناکەن پرسیاری ئەو ڕۆژەیان لێبکات.. «شازە» هەر زوو زوو دەرمانێکی سپیی بۆ دەکردە سەتڵێکی ڕەشەوە و پەنجەکانی تێدەخست، بەڵام ئەم هیچ حەزی لێی نەدەکرد و بۆنەکەی زۆر بەلاوە ناخۆشبوو.. حەزی دەکرد ئەو بەردە ڕەش و زبرانەیان پێ بگرێت و خوروویان پێ بمرێنێت، کە لەبەر هەتاوی چەند بڵێی گەرمی تەمووزی ئەو گۆڕەپانەی بەرماڵیان داخ داخ بووبوون و موچوڕکیان بە سەرتاپای گیانیدا دەهێنا.. یان دەستەکانی لە لیفکە سپیە ئێجگار زبرەکانی ئەمان هەڵکێشێت و بیانخاتە ئاوی زۆر زۆر کوڵاوەوە.. لەمەوە خووی بە گرتنی بەردی گەرم و دەستخستنە ئاوی کوڵاوەوە گرت و دوای ئەوەی چاکیشبووەوە و خورانەکەشیان نەما، هەر دەستبەرداری نەدەبوو و نەیدەتوانی لە بیر خۆی بەرێتەوە.. ئەو جارەی لە حەمامەکەش پشتی «سیامەند»ی بە لیفکەکەی خۆی دەشت و گۆرانیی «هذا مو إنصاف منك»ی «سەلیمە موراد»ی بۆ دەوت، لەپڕ بە دەستی ڕاستی جامێ ئاوی کوڵاوی لە ناو مەنجەڵە ڕەشەکە هەڵچنی و کردی بە پەنجەکانی دەستی چەپیا، کە خستبوونیە سەر شانی ڕاستی ئەو و مێروولەیان دەکرد.. «سیامەند» هاواری لێ بەرزبووەوە و لە تاوا خێرا هەستایەوە سەرپێ.. بە دەستی ڕاستی قژی گرت و لە دەرگای ئاودیوکرد.. سەری دەرهێنا و بانگی «شازە»ی کرد، کە تازە لە خەستەخانە هاتبووەوە و هێشتا پێڵاوەکانی دانەکەندبوو.. «شازە» لەجیاتی ئەوەی دەستبکاتە ملیەوە و دڵنەوایی بداتەوە، وەکوو منداڵ زمانی لێ دەرهێنا و بە پەنجەی باڵابەرزە و ئەسپێکوژەی دەستی چەپیشی چەقەنەی بۆ لێ دەدا.. ئینجا بە بەرچاویەوە خشکەی کرد و خۆی کرد بە ژوورا.. لەوێش بەجووتە کردیان بە

بەزمی خۆیان و قاقای پێکەنینیان دەگەیشتە ئەوسەری کۆڵان.. بە دەستی بوایە بە لەقە دەکەوتە گیانی ئەو دەرگایە و لە گرێژنەی دەبرد، کە نەیدەزانی بۆچی وەکوو پێستی ئێجگار ئەستووری گامێشی زۆر زل دەهاتە بەر چاوی و قێزی لێیدەکردەوە.. بە سەریاندا دەتەقیەوە و بە جنێو ڕیسوای دەکردن، بەڵام سوور دەیزانی لەو کاتەیا ئەگەر لێشیان بچێتە ژوورەوە و چی جنێوی پیس هەیە پێیانبدات، ئەوان لە پێکەنینی خۆیان ناکەون و تا بۆشیان بکرێت گاڵتەی پێدەکەن.. خۆ ئەم کە هاتنە دەرەوە و بە جووتە بۆ ژوورەوە چوون، زۆر بە ڕقەوە سەیری کردن و ئەو پەندەی بۆ هێنانەوە، کە «شازە» بە هەق و ناهەق دەیوتەوە و مێردەکەی پێی قارس دەبوو:

ـ سچین متکص سچین.. سچین متکص سچین.«١٠»

کەچی وەک بڵێیت لەگەڵ ئەوانی نەبێت و هەست نەکەن وا کچێ قسەی ناخۆشیان پێ دەڵێت، سەیریان نەدەکرد و هەر خۆشیان لە هووره نەدەبرد.. ویستی بەوە تووڕەیان بکات، نانی نیوەڕۆ نەخوات و بچێت لەسەر یەکەم پلەی قادرمەکە، لەبەر ئەو هەتاوە گەرمە دابنیشێت.. دابنیشێت و پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشێت.. هەرچەند لێی بپاڕێنەوە و ئەملا و ئەولای ماچ بکەن، ئەم وەڵامیان نەداتەوە و هەر سەیریشیان نەکات.. بەڵام کاتێ «شازە» زەرفە سپیەکەی لەناو دۆڵابە ڕەشەکەی مووبەق هێنایە دەرێ و بۆنی کەباب هات بە لووتیا، ناودەمی بوو بە ئاودڕکەی لیک و هەر خواخوای بوو کەمێ زووتر داینێن.. ئامۆژنی کاتێ سفرەکەی دادەخست و قاپەکانی بە سەردا بڵاودەکردەوە، سەیرێکی چاوەکانی کرد و پێی وت:

ـ بە سائەقەت بم، بەخوا لەبەر تۆ هێناومە.

«سیامەند» قاقایەکی بەرزی لێ دا و پێی وت:

ـ ڕاست دەکات، لەبەر تۆ هێناویەتی، ئەگینا خۆی کەبابی ئاوا هەر ناخوات.

«شازە» بەدەم تریقانەوەیەکی زۆر زۆر سەیرەوە پەلاماری دا و ملی گرت.. توند توند سەری نووساند بە سنگی خۆیەوە و بە نازێکی منداڵانەی چەند بڵێیت خۆشەوە پێی وت:

ـ ئەوە تۆ کەی واز لە قسەی حیز دەهێنیت کەی..؟! بتخنکێنم ها..؟! بتخنکێنم..؟! ئیتر قسەی وا دەکەیت..؟!

ـ چەتیو کەبابەکەت بخۆ، تا نەوال تەواوی نەکردووە.

ـ نایخۆم، با تەواوی کات.. نۆشی گیانی بێت.

ـ ئێ وایە بۆت ناخورێت.. ئینتەلاتکردووە.

ـ کورە بێ دەنگ بە سیامۆ.. دەتکوژم.. دوایی نەڵێی پێی نەوتم ها..!!

«نەوال» لە هەموو شتێ تێدەگەیشت و بۆ خۆی بەدەم کەبابخواردنەوە پێدەکەنی.. بەڵام هەرکە شتێکی ڕەشی بە پشتی نانە سپییەکەوە بینی و سەرنجی لێی دا، قێزی کردەوە و دڵی تێکهەڵات.. دەستی کێشایەوە و پارووەکەی ناو دەمی تفکردەوە.. بەر چاوی تاریکداهات و ئەو شەوەی بیرکەوتەوە، کە ئەم و ئامۆژنی لە ژوورەوە دانیشتبوون و بە کەوچکە ڕەشە شووشەکان، محەلەبیی سپیی ناو جامە ڕەشەکەیان دەخوارد، کاتێ «سیامەند» لە هەیوانەکەوە بانگی کرد و پێی وت:

ـ سەیرکە ئێستا سیحرت بۆ دەکەم.

قاچی ڕاستی لە دووری تاکێ نەعلی سپی دانابوو و سووک سووک دەیجوڵاند.. هاوکات نەعلەکەش دەجووڵا و ئەملا و ئەولای دەکرد.. ئەم سەری سوڕما و تەواو ئەبڵەقبوو.. قاچی لە نێوانیان دەدا و وایدەزانی بە شتێ بەستوونیەتیەوە، کەچی وانەبوو و ئەوەندەی تر سەراسیمەبوو.. دوایی دەرکەوت قالۆنچەیەکی ڕەشی لە ژێریا داناوە و ئەوە تەکاندەدا.. تەکاندەدات و نەعلەکە دەجووڵێنێتەوە.. خۆیشی نەیزانی بۆچی، ئاوا دڵڕەقانە و تا تینی تیابوو نەعلەکەی بە قالۆنچەکەدا کێشا و فلیقاندیەوە.. بە ژێرەکەیەوە نووسا و قێزی لێیکردەوە.. دڵی تێکهەڵات و ئەوەندەی نەمابوو بڕشێتەوە.. هاوکات بەزەیی پیادا هاتەوە و خەریکبوو دەستبکات بە گریان.. هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و «نێرگز»ی بیردەکەوتەوە، کە ئەو جارە لە حەوشەی قوتابخانە قۆڵی چەپی کرد بە قۆڵی ڕاستیدا و پێی وت، کەوا قالۆنچە کچێکی سپیپۆشی زۆر زۆر جوانی لە تەمەنی ئەماندا بووە و هەر زوو زوو وڕکی بۆ مانگی سووری ئاسمانی ڕەش

گـرتووه.. هەمـــوو شـــەوێ تا بەیانی گــریاوە و داوای لە بـاوکــە ڕەشــپــۆشــە کارەباچییەکەی کردووە، کە پەیژەیەکی درێژ.. درێژ.. درێژ.. درێژ بێنێت و بۆی داگرێت.. بۆی داگرێت و بۆ خۆی بیکات بە ملوانکە.. بیکاتە ملیەوە و خۆی پێوە بنوێنێت.. تا بەیانییەک بووە بە قالۆنچە و بەرەو دەشت هەڵفڕیوە.. دەیویست زیاتر بیری لێبکاتەوە و ئەو چارەنووسە ناخۆشەی بێنێتە بەر چاوی خۆی، بۆئەوەی زیاتر بەزەیی پیادابێتەوە و هەستی قێزکردنەوەکەی نەمێنێت، بەڵام نەیتوانی و خێرا ڕایکردە حەمامەکە.. دەستبەجێ جلەکانی داکەند و بە جامە سپیەکە ئاوی ناو مەنجەڵە ڕەشەکەی کرد بە خۆیا.. لیفکەکەی «سیامەند»ی لە بزمارە سپیە کوتراوەکەی دیوار جیاکردەوە و خێرا خێرا و بەهێز بەهێز بە لەشی خۆی دادەهێنا.. هەر کاتێکی زانی ئامۆژنی بە لەقە دەرگاکەی خستە سەرپشت و هاتە ژوورەوە.. بە تاکەنەعلەکە تێیکەوت و بە هەموو هێزی خۆی لەو گیانە ڕووت و قووتەی دەدا.. کاتێ مامی بە فریایکەوت و لە ژێر دەستی دەرهێنا، ئەو کاری خۆی کردبوو و بە جارێ لە زمانی خستبوو.. ناو سەری دەخولایەوە و بەر چاوی تاریکببوو.. بەحاڵ بەردەمی خۆی دەبینی و حەمامەکەی وەکوو ئەو عەرەبانە ڕەشە لاکێشەییە دەهاتە بەر چاو، کە لە شێوەی ژوورێکی گەورە درووستکرابوو و دوو ئەسپی سپی ڕایاندەکێشا.. پیاوە ڕەشپۆشەکان بە عانەیەکی سوور مناڵ و مێردمناڵیان سواردەکرد و خۆشیان لەسەر پشتی ئەسپەکان قاچە درێژ و ئەستوورەکانیان شۆڕدەکردەوە.. بە قامچیە سوورەکان تێیاندەکەوتن و غاریان پێدەدان.. ڕۆژی جەژنی نیشتیمانیی بوو و قوتابخانە و بازاڕ و هەموو شتێ داخرابوون.. ئەم و «نێرگز»یش وەکوو مناڵانی تر خۆیان گۆڕیبوو و سەر و کراسی نیوقۆڵی سپییان لەبەرکردبوو.. «نێرگز» ڕازیینەبوو سواربێت و بەدەم خێسەیەکەوە وتی:

ـ من لەگەڵ ئەم هەموو کوڕە چوختیە سوارنابم..!!

کەچی ئەم گوێی نەدایە و بە ئەسپایی خۆی هەڵدایە سەری.. کوڕەکان زۆڵانە دەستیان دەگرت و ڕایاندەکێشا.. دەیانخستە سەر کۆشیان و بێباکانە پێیان دەوت:

ـ لێرە دانیشە.. کچەکە ئێرە نەرمە.

هەتیوێکیان، کە لەوان گەورەتربوو و قایشێکی سپیی سەرخڕی لەسەر پانتۆڵە ڕەشە چرچەکەی بەستبوو، لە دواوە کراسەکەی ڕاکێشا و وتی:

ـ لێرە دانیشە.. کچەکە ئێرە ڕەقە.

ئینجا دەنگی خۆی وەکوو هی پیاو نێرکرد و پێی وتن:

ـ ئێوە زۆر کەرن.. ئەم حەز لە شوێنی ڕەق دەکات.

هەر هەموویان دەستیانکرد بە پێکەنین و قاقای بەرزیان لێ دا.. ئەم خۆی ڕادەپسکاند و بە چەپۆک تێیاندەکەوت.. بەڵام ئەوان وازیان لێنەدەهێنا و فڕکان فڕکانیان پێدەکرد.. لەپڕ کوڕێکی چاوڕەشی باریکەڵە، کە قژێکی کچانەی پێوەبوو و ئەموستیلەیەکی زیوی کردبووە پەنجەی بالابەرزەی دەستی چەپییەوە، لە سووچی ئەوسەر هەستایەوە و پێی وتن:

ـ خوشکحیزینە وازی لێبێنن، ئەمە خزمی منە.

«نەوال» پەرچەمەکەی لەسەر چاوی لادا و سەیری کرد.. لێی وردبووەوە و ناسیەوە.. «لوئەی»ی کوڕی «خالیدە»ی دەستەخوشکی ئامۆژنی بوو و ماڵیان لەسەر سووچی کۆلانێکی «ئەعزەمیە» بوو.. دایکی هەر جارێ دەهات بۆ ماڵیان، دەستی ڕاستی دەخستە سەر شانی چەپی کوڕەکەی و بە گاڵتە بە «شازە»ی دەوت:

ـ بۆ خوازبێنیی کچەکەتان هاتووم.

ئەوسا «نەوال» و «لوئەی» بە شەرمەوە سەیری یەکتریاندەکرد و سەریان لەبەر دەنا.. جارێکیش کە لە ژوورەوە قەیسیی سپییان دەخوارد و ئاوەکەی بە دەمیاندا دەهاتە خوارێ.. جار جاریش خۆیان هەڵدەدایە سەر دۆشەگە نەرمەکە و قاچەکانیان بۆ سەرەوە هەڵدەبڕی، «لوئەی» ناوکی ڕەشی قەیسیەکەی کێشا بە پەنجەرەکەدا و پێی وت:

ـ وایە من و تۆ کە گەورەبین، دەبین بە ژن و مێرد..؟!

ئەم ڕاچڵەکی و تەزوویێکی سەیر بە سەرتاپای گیانیدا هات.. هەر لە خۆیەوە و نەیزانی بۆچی ئەو بەرخە ڕەشەی بیرکەوتەوە و خەیاڵی تێوەی ئالا، کە

«سیامەند» لە چەرچیەکی سپیپۆش بۆی کڕیبوو و بە مەمەمکەمژە ڕەشەکە بەخێوی دەکرد.. سەرەکەی دەگرت و لاستیکەکەی دەخستە دەمیەوە.. دەریدەهێنا و تێیدەخستەوە.. تێیدەخست و دەریدەهێنایەوە.. ئامۆژنی لێی تووڕەدەبوو و پێی دەوت:

ـ تۆ نابێت ئاوا لەو بەرخە بەستەزمانە بکەیت نەونەو.. یاری ئاوا نابێت.. بە جوانیی بیخەرە دەمی و با بە ڕەحەتیی بیمژێت.

ئەو بەیانیەی لە خەو هەستا و چوو بۆ لای، سەیری کرد و بینی وا لەسەر ئەو گوشە مردار بووەتەوە، کە ئەم دەچووە ناوی و لەبەر دەرگا تیژ تیژ پێیەوە ڕایدەکرد، دەستی کرد بە گریان و توند توند سەری خۆی بە دیوارەکەی هەیواندا کێشا.. «شازە» پەنجەکانی لە قژی گیرکرد و بەهێز بەهێز ڕایکێشا.. پاڵێکی قایم قایمی پێوەنا و پێی وت:

ـ تۆ کوشتت..!!

ناوکی قەیسیەکەی خۆی لە ناولەپی ڕاستی گوشی و پێی وت:

ـ دەزانی لوئەی ئەگەر بە جوانی مەمکەمژە نەخەیتە ناو دەمی بەرخەوە دەمرێت..؟!

ـ بۆ..؟! بۆ دەمرێت..؟!

ـ چونکە سییەکانی وشکدەبێت.

ـ سیەکانی وشکدەبێت..؟!

«نەوال» هەستی دەکرد «لوئەی» دەنگی گۆڕاوە و ڕێک وەکوو ئەو کاتە قسە دەکات، کە خەتەنەیان کردبوو و ئەم و ئامۆژنی چووبوون بۆ ماڵیان.. دیشداشەیەکی سپییان لەبەرکردبوو و وەکوو پیاوی پیر بە ترسەوە هەنگاوی کورت کورتی لەناو حەوشەکەی خۆیان دەنا.. کاتێ چووە لای قوتووە ڕەشەکە و ویستی میز بکات، چاوەکانی توند توند نوقاند و گیانی سووک سووک دەلەرزی.. میزەکە لە کونی شەبزووزەکەیەوە بەحاڵ دەهاتە دەرێ و بەملا و بەولایدا پرووشەی دەکرد، کە بە لەفافێکی سپی ناوقەدیان پێچابوو و سەرەکەی قەتماخەیەکی سووری گرتبوو.. هەرچەند سەیری دەکرد و لێی ورددەبووەوە، وەکوو کەباب دەهاتە بەر

چاوی و ناودەمی دەبوو بە ئاودڕکەی لیک.. شەویش کاتێ «سیامەند» بە شۆفەرلێتە ڕەشەکەی هات بە شوێنیاندا و بردنیەوە، لە ڕێگا وڕکی بۆ کەباب گرت و پێی وتن:

ـ لەگەڵتان نایەمەوە، ئەگەر بۆم نەکڕن.

«شازە»، کە لە پێشەوە دانیشتبوو و بە پەنجەکانی یاریی بە پەرچەمەکەی دەکرد، بە سەرسوڕمانەوە ئاوڕی دایەوە و پێی وت:

ـ ئەوە تۆ خەونت دیوە..؟!

«سیامەند»یش سەری بادا و پێی وت:

ـ جنۆکە پێم ناڵێیت چی لەم کاتەیا کەبابی بیری تۆ خستەوە..؟!

قژی «شازە»ی ڕاکێشا و قایمتر پێی وت:

ـ کەباب دەخۆم.

ـ کەبابی چی بە سائەقە..؟! کوا کەباب بەم شەوە..؟!

ـ مادام با بگەڕێینەوە ماڵی لوئەی.

مامی قاقایەکی بەرزی لێ دا و پێی وت:

ـ بۆچی ماڵی ئەوان کەبابخانەیە..؟!

ناوکی قەیسیەکەی قایم هەڵدایە سەر تاقە سپیەکەی بەرامبەری و بە دەنگێکی نزم پێی وت:

ـ لوئەی تۆ دەزانی بۆچی کەبابخانەی ناو بازاڕی مسگەرەکانیان داخست..؟!

ـ بۆچی دایانخست..؟

ـ چونکە گۆشتی بەرخی مرداربووەوەیان تیادا کردبوو بە کەباب.

ـ ڕاستە ئەوەی گۆشتی حەیوانی مرداربووەوە بخوات، دەبێت بە کەسێکی شەڕانی و شەڕ بە خەڵک دەفرۆشێت..؟!

وەکوو سەرژنێکی عەیار شانەکانی هەڵتەکاند و پێی وت:

ـ ئەوە تۆ ئەم قسەیەت لە کوێ هێناوە..؟!

کەچی ئەو ڕۆژە ترسا لەوەی ئەو کوڕە چوختی و چەقاوەسووانە گەلەکۆمەی لێبکەن و بە هەموویان پەلاماری بدەن.. پەنجەی باڵابەرزە و دۆشاومژەی دەستی

چەپی خستە سەر لێوی و بە ترسەوە پێی وت:

ـ وازیان لێبێنە.. ئەمانە گۆشتی حەیوانی مرداریان خواردووە.. زۆر هارن.

ئەوان تێکڕا دایانە قاقای پێکەنین و ئەم ئەوەندەی تر ترسا.. «لوئەی»یش دەستی چەپی خستبووە سەر قایشی سپیی پانتۆڵە ڕەشەکەی و بەردەوام دانی بە جیڕەوەدەبرد.. ئارەقیدەکردەوە و دەیوت:

ـ ئەوەی گاڵتە بە خزمی من بکات، خوشکی دەگێم.

کوڕێکیان لووتێکی زلی وەکوو ڕەحەتیی پێوەبوو و پێڵاوە ڕەشەکانی کردبوو بە نەعل، دەستەکانی لەملا و لەولای کەمەری توندکرد و بە فیزێکەوە پێی وت:

ـ تۆ درۆ دەکەیت خزمت نییە.. ئەمە کچی شازەی سیستەرە و من چاکیان دەناسم.

ئەوەی تەنیشتی، کە خاڵێکی ڕەشی زۆر گەورە و ناشیرینی بە مەچەکە سپیەکەیەوە بوو و ئەم قێزی لێیدەکردەوە، دەمی داپچڕی و بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

ـ ژنە جوانەکە..؟!

ـ ئا، ئەوەی هەموو جارێ بوتڵی بەتاڵ دەهێنێت و لەبەر چاوی دکتۆر و برینپێچەکان، پەنجەی باڵابەرزە و دۆشاومژەی دەخاتە دەمەکەیەوە.. تێیاندەکات و دەریاندەهێنێت، پێیان دەڵێت: کورە ئەوە ئێوە کەستان پیاو نین، ئاوام لێبکەن..؟!

«لوئەی» گەیشتە تینی و قایشەکەی پشتی کردەوە.. خێرا ڕایکێشا و دەریهێنا.. پەلاماری دا و کێشای بە سەروگوێلاکیا.. ئەو هاواری لێ بەرزبووەوە و دەستی گرت بە چاویا.. ئیتر ئەوان شێت و هاربوون و هەر هەموویان بە جارێ بۆی هاتن.. گرتیان و بە پشتا خستیان.. بە لەقە تێیکەوتن و تێر تێریان کوتایەوە.. ئەو هاواری دەکرد و دەیناڵاند.. ئەسپەکانیش بێئاگا لەوەی چی لەدواوە ڕوودەدات و چ فەرتەنەیەک نراوەتەوە، تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق بەسەر ئەو شەقامەدا دەڕۆیشتن و عەرەبانە زلەکەیان ڕادەکێشا.. پیاوەکانیش نە لەم و نە لەوانی تریش دیارنەبوون و بەردەوام قامچیی خۆیان

دەوەشاند.. ئەمیش خواخوای بوو زووتر لە فولکەکەی ئەوسەر پێچکەنەوە و بگەنەوە شوێنی خۆیان.. کاتێ خۆی هەڵدایە خوارەوە و جلەکانی تەکاند، بەبێ ئەوەی سەیری «لوئەی» بکات و بزانێت دەتوانێت هەستێتەوە، یان نا، ڕێی ماڵەوەی گرت و پێی پێوەنا.. هەرچەند «نێرگز» دوای کەوت و هاواری کرد:

ـ نەوال ئەوە چییتە..؟! لەگەڵ تۆمە نەوال، بۆچی بەجێمدەهێڵی..؟! کچێ بوەستە هەی قەحپە.. چاوقایمی نێرەکوڕانی.

ڕایدەکرد و قسەی ئەو هەتیوە چەنەبازانە لە گوێچکەیدا دەزرنگانەوە.. دەیویست خێرا بگاتەوە ماڵ و بەبێ چەندوچوون بەسەر ئامۆژنیدا بتەقێتەوە.. بە جنێو ڕیسوای بکات و بە تف دەموچاوی سواغبدات.. دەست بنێتە ئەو قژە بۆگەنەی و چەپک چەپک دەریبهێنێت.. دواجار بە گاز، بەڵام زۆر زۆر بەهێز و چەند بلێیت دلڕەقانە ئەو پەنجانەی لە بنا بۆ بقرتێنێت و بیانخاتە مەکینەی قیمەوە.. دەسکە ڕەشەکەی بابدات و ونجر ونجریان بکات.. کەچی کاتێ گەیشتەوە ماڵ و نەیبینی، زانی ئەمشەو نۆرەی ئێشککگرتنیەتی و تا بەیانی نایەتەوە.. ئیتر ئەوەندەی تر کەللەیی بوو و خەریکبوو دەسبەجێ ببووڕێتەوە.. «سیامەند»ی بینی لەوێچ لەوێچ جۆی ناو قاپە سپیەکەی دەدایە مریشک و کەڵەشێرەکانی و سووک سووک فیکەی بۆ لێدەدان.. بۆکسێکی قایمی لە دەستی دا و قاپەکەی تووڕهەڵدا.. لەولاتر، کەوتە سەر کولانەی مریشکەکان و تەقەیەکی ناخۆشی لێ هەستا.. دەنکە جۆبەکان بە سەریدا پەرش و بڵاوبوونەوە و وەکوو قالۆنچەی ڕەش ڕەش دەهاتنە بەر چاوی.. جووڵەجووڵیان پێکەوتبوو و دڵیان تێکهەڵدەهێنا.. مستێکی تری لە سنگی دا و پێی وت:

ـ کوا شازە قەحپە..؟!

«سیامەند» کردیە باوەشیەوە و سەری نووساند بە سنگی خۆیەوە، بەڵام ئەم بە هیچ شێوەیەک دابین نەدەبوو و نەیدەتوانی ئەو ڕقەی ناو دڵی ئاوا بە ئاسانی دامرکێنێتەوە.. لە داخا پەنجەکانی دەستی ڕاستی ئەوی گرت و توند توند و بەهێز بەهێز گازی لێگرتن.. بە هەموو توانای خۆی دانەکانی لێبردنە خوارەوە و کرۆشتینی.. کاتێکیش دەمی لەسەر هەڵگرتن و سەرنجی لێ دان، وەکوو

لاستیکی خەتکوژاندنەوەکەی خۆی، کە هەرچەند تووڕەبوایە و دەیخستە بەر دانی، ئاوا سوورهەڵگەڕابوون و دەلەرزین.. هێشتا دڵی ئاوی نەخواردەوە و پەلاماری ئەوانەی دەستی چەپیشی دا.. خستنیە دەمی و قایمتر کرۆشتینی.. کەچی ئەو بەسەر خۆی نەدەهێنا و لە گوڵ کاڵتری پێ نەدەوت.. ئەمجارەیان پشتی تێیکرد و بەرەو لای هەیوانەکە چوو.. قایم قایم سەری دەکێشا بەو دیوارە ڕەقەدا و جنێوی پیس پیسی دەدا.. ئەوندەی تر بەر چاوی تاریکبوو و دیمەنی شتەکانی لێگۆڕا.. ئەوەندەی تر گوێچکەی کپبوو و ناوسەری وەکوو ناو عەرەبانە ڕەشەکە ژاوەژاوی تێکەوت.. مامی گەیشتە سەر سەری و دەستەکانی گرت.. هەر وەک ناو دڵی ئەمی خوێندبێتەوە و بزانێت چی لێی دەوێت، بە خاولیەکەی خۆی جوان جوان دەموچاوی سڕی و پێی وت:

ـ هەر ئێستا دەتبەم بۆ لای ئامۆژنت ڕۆحەکەم.. تۆ بۆچی ئاوا لە خۆت دەکەیت بۆ..؟!

هەستی کرد شتێ ڕوویداوە و لەمی دەشارێتەوە.. بەوەدا دەیزانی، کە لە کاتی قسەکردنا بە دانی سەرەوەی لێوی خوارەوەی بە سووکی دەکرۆشت.. دەیکرۆشت و چاوەکانی لەگەڵ دەنووقاند.. ئەو جارەش، کە چوار تاک بازنی زیوی مناڵیی ئامۆژنی کردبووە دەستی و لەگەڵ کچانی گەڕەک یاریی «یا لیلێ علویش تبچین..؟!»یان دەکرد..«١١» ئەو بە پڕتاوی لە ماڵ هاتە دەرێ و ویستی بەبێ قسە تێپەڕێت.. بەڵام ئەم منالانی بەجێهێشت و بەرەو پیریەوە چوو.. بە دەستی ڕاست دەستی چەپ و بە دەستی چەپ دەستی ڕاستی گرت و پێی وت:

ـ مامە سیامەند، قەڵەمی بۆیەی وەکوو هی نەرجسم بۆ دەکڕی..؟!

ـ داوای هەرچی بکەیت بۆت دەکڕم نەوال گیان، بەڵام بۆ قەڵەمی بۆیە پێم مەڵێ.

ـ لەبەرچی..؟!

ـ پێت ناڵێم.

ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

ڕۆژی پێشوو، کە لەگەڵ ئامۆژنی چووبوو بۆ بازاڕ و داوای لێکرد بۆی بکڕێت، هەمـــان وەڵامـی دایەوە و وەکـــوو ئەویش ســـەری بادا، بەڵام ئەو لە کـــۆتایی هەر ڕستەیەکیدا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر دانی دەخستە سەر لێوی.. ئیتر ئەم هەستی دەکرد، ئەوە ئاخێکە و پڕ لە ناسۆر، لێـواولێو لە ژان و خەفەت، وێنەی ژیلەمۆ لە ناخی ناخی دڵـیەوە هەڵدەستـێت و لەوێ چزززز خامۆشـدەبێت.. پشـتی تێکرد و بەرەو ماڵ گەڕایەوە.. هەرچەند کچان بانگیان کرد و بە دەنگی بەرز پێیان وت:

ـ بۆ کوێ نەوال.. ؟! خۆ تەواومان نەکردووە..!!

گـوێی نەدانێ و لای لێ نەکردنەوە.. هەرکە پاڵـی بە دەرگـاکەوە ناو قـاچی بردە ئەودیو، «شـازە»ی بینی لەبەر بەلـووعـەکـە کـەوتبـوو و خـوێن لە دەم و لووتیـەوە فـیـچقـەی دەکـرد.. بەبێ ئەوەی بچێت بەلایەوە و لـێی بپـرسێت، چی بووە و کێ ئاوای لێکردووە، لە هەمـوو شتێ تێگەیشت و چوو ئانیشکی ڕاستـی خسـتە سەر تاقی دەرەوەی پەنجەرەی ژووری میـوان.. چەناگەی خستە سەر لەپی و بیـری لەوە دەکـردەوە، مـامی ئێـوارە کـز کز و چەند بلـێی خـەمناک خـۆی دەکـاتەوە بە ژوورا و وەکوو مـیـوانێکی ئێجگار شەرمن لەسەر کورسیە سپیەکە دادەنیـشێت.. لە پێشا سـەری لەبەر دەنێت و وێنەی منـاڵ یاریی بە نینۆکـەکـانی دەکـات.. جـار جـاریش بەدەم ئاخـهەڵکێشانەوە دەست بە قژە خاوەکەیدا دێنێت و لەگـەڵیا سـەرنجی خێـرا خێرا لە دەموچاوی ژنەکەی دەدات، کە لەسەر کورسیەکەی بەرامبەری دانیشتووە و مــتــەقی لە خــۆی بڕیوە.. دوایی هەر بە شــەرمــەوە هەڵدەســتــێت و لەمــســەری ژوورەکەوە بۆ ئـەوسەری دەچێت.. جـار جـار سووک و جـار جـار خێـرا.. دەچێت و دێتـەوە.. دەچێت و دێتـەوە.. لەپڕ لە ئاستی ئەودا دادەنەوێتـەوە و بە ئـەسـپـایی دەسـتـەکـانی لەسـەر ئەم ڕان و ئەو ڕانـی دادەنێت.. سـەری دەخـاتە سـەر کـۆشی و ماوەیەک هەناسە لە خۆی دەبڕێت.. دوایی یان بە قـاقای پێکەنینێکی قـایم قایم، یاخـود بە هەنسکـی گـریـانێکی هێـدی هێـدی، سـەر هەڵدەبڕێت و هەر خـێــراش دایدەنێـتـەوە.. دایدەنێـتـەوە و دەسـتـەکـانی شل شل لە کـەمـەری دەئاڵێنێت.. تا «شازە» یاریی بە قژی نەکات و لە پەنجەی باڵابەرزە و دۆشاومژەی دەستی چەپی خۆی نەئاڵێنێت، بە دەستی ڕاسـتیش شانەکانی سووک سووک نەشێلێت و نەرم

نەرم و زۆر زۆر لێزانانە دەمارەکانی نەگرێت، هەڵیناپڕێتەوە و دەستەکانی لە کەمەری ناترازێنێت.. هەموو شەڕ و ئاشتبوونەوەیەکیان بۆ ئەم تەریقبوونەوەیەکی پێوەیە و کۆڵێ خەفەتیان لێدەخوات.. ئینجا ئەم زۆر چاکیش دەزانێت ئەو جارانەی بگریت و پێڵووەکانی بئاوسێن، ئەوە تەنگوچەڵەمەی لەگەڵ کەسانێکی تردا هەیە و هەر ئەمەشە وایلێکردووە شەڕی پێ بفرۆشێت.. خۆیشی بە قەرزاری دەزانێت، کە بە کەڵکی دێت و لە هەموو کەس چاکتر لێی تێدەگات.. بەڵام کاتێ پێدەکەنێت و گلێنە ڕەشەکانی لەناو ئاوێکی تەلیسماوی، کە هیچ لە فرمێسک ناچێت و دیمەنێکی چەند بلێی دڵگیری هەیە، بکەونە جوولەجوولێ و بدرەوشێنەوە، ئەوا هەست دەکات هێشتا زیندووە و توانای ئازارچەشتنی هەیە..
ئەو ڕۆژەی سەربازە ڕەشپۆشەکانی ئۆردووگا سپیەکەی ڕۆژهەڵاتی شار، تۆپە سپیەکانیان تاقیدەکردەوە و جامخانەی ستۆدیۆکەی لەگەڵ دەهەژایەوە، کاتێ پەنجەکانی دەستی چەپی خستە قژی «نەوال» و بە سووکی ڕایکێشا، ڕووی کردە «جیهاد ئەعنەس» و پێی وت:
ـ بەوەدا دەزانم هێشتا زیندووم و گیانم تیا ماوە، کە دەتوانم ئازار بچێژم.
«جیهاد» بە کراس و پانتۆڵێکی ڕەشەوە، کز و خەمناک لەسەر ئەو کورسیە سپیە دانیشتبوو و پەنجەکانی لە یەکتر ئاڵاندبوون.. هیچ لەو ڕەسمەی نەدەچوو، کە لەگەڵ ڕەسمی یاریکەرەکانی تردا، بە بچووکی و لە شێوەی لاکێشەدا چاپکرابوون و لە بازاڕ دەیانفرۆشتن.. لەوێ بە شۆڕت و فانیلەیەکی سپیەوە، تۆپێکی ڕەشی دابووە پێش خۆی و لەسەر هێڵە سپیە بازنەییەکان، بەرەو گۆڵەکە باڵیگرتبوو.. «نەوال»یش وەکوو منالانی تری گەڕەک لەو ڕەسمانەی دەکڕی و یاریی پێدەکردن.. یاریەکەش ئاوابوو، هەر کەسێ بیتوانیایە ڕەسمێکی وەکوو ئەو ڕەسمەی بەرامبەرەکەی فڕێیداوە، بهێنێت و بەبێ ئەوەی سەیری بکات، ئەوا دەیبردەوە و سەرجەمی ڕەسمەکانی ئەوانی تری بۆ خۆی هەڵدەگرت.. ئەم هەمیشە لە وێنەی «جیهاد»دا دەیدۆڕاند و مایەپووچ دەبوو.. ئەوسا تووڕەدەبوو و بە بێزارییەوە دەیوت:
ـ ئاخ..!! من هەمیشە لە جیهادی ڕەزاگران و ناشیرین دەدۆڕێم..!!

ئامـۆژنی ئەو جارە لە بەردەرگـاکـەی خـۆیان، دەسکێـشـێکی ڕەشی نایلۆنی ئێجگار تەنکی لە دەستەکانی کردبوو و گرێی لە دەفتەرە کۆنەکانی ئەم بەردەدا، گوێی لێبوو و پێی وت:

ـ باشـە باش..!! ئەگـەر تۆ لەسـەر جـیـهـاد، ئەو سـەرەت لە جـەسـتـەت جیانەکرایەوە، بزانە من هیچم نەزانیوە..!!

ئەم ئەوەندەی تر تووڕەبوو و پێی وت:

ـ تۆ هەقی جیهادی کەللەزلت چییە..؟!

ئامۆژنی لە کاتێکدا دەستکێشەکانی لە دەستی دادەکەندن و وەکوو ئیسپرینگ لە یەکتری ڕادەکێشانەوە.. ڕایدەکێشانەوە و خاوی دەکردنەوە.. خاوی دەکردنەوە و ڕایدەکێشانەوە، بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە سەرێکی بۆ لەقاند و پێی وت:

ـ دەبینی هەقم هەیە، یان نا..!!

لە داخـا ڕەسـمـەکـانی ئەوی لە لای خـۆی گلدەدایەوە و بە جـیـا دایدەنان.. ژمارەیەکی زۆری کـۆکردەوە و بردنی بۆ مـاڵەوە.. جـانتـا سـپـیـەکـەی لەسەر دۆلابە ڕەشەکە داگرت و قـەڵـەمی ناو گیرفانەکەی دەرهێنا.. دانـە دانـە سمێڵی بۆ دەکردن و شـێـوەکـەی تەواو دەگـۆڕین.. وایدەزانی لەمـەوە هەر دەیبـاتەوە و گـیـرفـانەکـانی پڕدەبن لە یاریکەری جـۆراوجـۆر، بەڵام هەروەکـوو جـاران دەدۆڕا و پارە و پوولی بەدەست «شـازە»وە نەهێـشـت.. ئینجـا باوەڕی هێنا تا ئەو بە ڕاسـتـیـی ئەو دەموچاوە شوومەی نەگۆڕێت و ڕەسمی تر نەگرێت، ئەم هەر دەدۆڕێت و دەبێت بە گاڵتـەجاڕی منالان.. ئەو جارەی بۆ سەروپێ بانگیـان کـردبوو و لە بەرامـبەر ئەو گوڵەجۆیە وشکە وەستابوو، کە «سیـامـەند» لە دیواری دابوو و «شازە» دڵی پێی تەنگدەبوو، «نەوال» لێی چووە پێشێ و پێی وت:

ـ ئەوە مامە جیهاد تۆ بۆچی سمێڵ دانانێیت..؟!

ئەو وەک بڵـێی چاوەڕێی قـسـەی ئاوای لـەو منالە نەکـردبێت و باوەڕ نەکـات ڕووبەڕووی پرسـیـارێکی لەمـجـۆرەی بکاتەوە، بۆیە حـەپەسـا و کـەمـێکیش تەریقبووەوە.. بە جووڵەیەکی زۆر سەیر ڕووی وەرگێڕا و بە لەفزێکی منالانە پێی وت:

ـ من و مامه سیامەندت سمێڵمان لێنایەت.

ـ بەڵام تۆ بە سمێڵەوە زۆر جوانیت.

ئەو دەستی کرد بە پێکەنین و وتی:

ـ ئاخر جنۆکە، تۆ منت بە سمێڵەوە بینیوە، تا بزانیت جوانم، یان ناشیرین..؟!

«نەوال» دەستی چەپی کرد بە گیرفانیا و ڕەسمەکانی ئەوی دەرهێنا.. لە چاوی نزیککردنەوە و پێی وت:

ـ سەیریانکە، بزانە چەندت لێهاتووە..!!

ئەو هەر ئەوەندە دەستی بۆ بردن و سەیری کردن، قاقایەکی بەرزی لێ دا و خۆی بە کورسیە سپیەکەی بەردەمی گرتەوە.. بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی گرت و هەر بەدەم قاقالێدانەوە لێی پرسی:

ـ تۆ پێم بڵێ، کێ ئاوای لەم ڕەسمانەی من کردووە..؟!

ـ من.

ـ بۆچی..؟!

ـ بۆئەوەی لە ڕەسمڕەسمێنەیا بیبەمەوە.

ـ بیبەیتەوە..؟! چۆن..؟!

ـ ئاخر ئەگەر تۆ شێوەت بگۆڕێت من دەیبەمەوە.

ـ جا دوای ئەوەی سمێڵت بۆ کردن، بردتەوە..؟!

ـ نەء، بەڵام ئەگەر تۆ بە ڕاستیی شێوەت بگۆڕیت، من دەیبەمەوە.

ئامۆژنی سفرە ڕەشەکەی هێنا و هاتە ژوورەوە.. لە شەرما دەموچاوی سوورهەڵگەڕابوو و چاوەکانی بۆ بلندنەدەکرا، سەری بۆ ڕاشەقاند و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ پیسی بۆگەن.. ئەگەر شازە بم ناهێڵم لەسەرت بچێت.

ئینجا ڕوویکردە ئەو و پێی وت:

ـ هەرچی شتی قۆڕ هەیە، ئەم کچەی ئێمە دەیکات.

«جیهاد» گوێی بە «شازە» نەدا و سەیرێکی «نەوال»ی کرد.. ئاخێکی قووڵ

قوولّی هەڵکێشا و پێی وت:

ـ تۆ چاکترین هونەرمەندی..!!

«نەوال» هەستی کرد ڕەنگوڕووی «جیهاد» دوای ئەو پێکەنینە تەواو گۆڕا و بوو بە کەسێکی تر.. ئەو لچ و لێوەی وا خستبووە سەریەک و دابوونی بە یەکا، هەر دەتوت، لە هەموو ژیانیا هەڵینەهێناونەتەوە و هیچ قسەیەک، نە خۆش و نە ناخۆشی پێنەکردوون.. کاتێکیش «سیامەند» قاپەکەی لە بەردەمی دانا و بە کەشوفشێکەوە پێی وت:

ـ کچمان نیگارکێشێکە، گاڵتەی پێ ناکرێت جیهاد..!!

ئەو ئاخێکی قوولّتری هەڵکێشا و بە دەنگێکی زۆر کز وتی:

ـ بەچی دەچێت، کە دەستی بە ڕەنگەکان نەگات.

«شازە» بە حەپەساویەوە سەری هەڵبڕی و بە ترسەوە لێی پرسی:

ـ ئەوە وتت چی..؟!

ئەو سەری بەسەر قاپەکەیدا شۆڕکردەوە و وتی:

ـ کوا چییم وتوە..؟!

ئەوسا «نەوال»، کە سەیری گۆرانیبێژە ڕەشپۆشەکەی دەکرد و لێی وردەبووەوە، هەر لە خۆیەوە و نەیدەزانی بۆچی، ڕقی لێی هەڵدەستا و قێزی لێیدەکردەوە.. کاتێ ئامۆژنی دەستی ڕاستی درێژکرد و ویستی بە کەوگیرە ڕەشەکە برنجی ناو گیپە ڕەشەکەی بۆ تێکات، کە لەناو قاپەکەی خۆی دەزووە سپیەکەی لێ هێنابووە دەرێ و بە کەوچکە کلکڕەشەکە هەڵیوەشاندبوو، ئەم بە ئانیشکی چەپی پاڵێکی پێوە نا و پێی وت:

ـ لاییە، نایخۆم.. لە هێلکەشەیتانۆکەی فلیقاوە دەچێت.

تا ئەو جارەی بە قەڵەمە سوورەکەی «نێرگز» سەرتاپای جەستەی بۆیەنەکرد و شێوەکەی تەواو نەگۆڕی، ئەلهای نەدەکرد هیچ شتێ لەناو ئەو قاپەدا بخوات و پێی خۆش نەبوو هەر چاویشی پێبکەوێت.. ئەوسا «نازناز»، کە جلە سپیەکانی «شارا» و «شەماڵ»ی لەناو تەشتە ڕەشەکەی بەر بەلووعەکەدا دەشت و نەعلە ڕەشەکانی «شازە»ی کردبووە پێی، سەری بادەدا و پێی دەوت:

ـ سەربەگۆبەند..!!

دواییش بە سووکی بانگی «شازە»ی کرد و پێی وت:

ـ تعای شوفي بنتچ شتسوی..!! (وەرە بزانە کچەکەت خەریکی چییە..!!).

ئەو خێرا لە مووبەقەکە هاتە دەرێ و سەیری کرد.. لە خۆشیا دەمی داپچڕی و بە لەفزێکی منالانە، کە هەر لە خۆی دەهات و کەس کەس نەیدەتوانی لاسایی بکاتەوە، وتی:

ـ فدوە أروحلها.. اني اگول بنتي فنانە..!! (بە سائەقەی بم.. من دەلێم کچم هونەرمەندە..!!)

«نازناز» جلەکانی توند توند گوشی و ئاوێکی سپی سپیی لێهێنان.. خستینیە سەتڵە ڕەشەکەوە و بەدەم هەناسەهەڵکێشانی قووڵەوە پێی وت:

ـ آخ منچ شازە..!! (ئاخ لە تۆ شازە..!!)

«شازە» و «نازە» هەمیشە مشتومڕیان بوو، لەسەر ئەوەی کچی کامیان چاکتر نیگار دەکێشێت و جوانتر ڕەنگی دەکات.. ئەوەندەیان لەگەڵ یەکتر وتبوو، سیوایان ببووەوە و زۆر جار دەبوو بە قڕەقڕیشیان.. هەر ئەوەندە دەما جنێو بە یەکتر بدەن و چەپۆکیان بخەنە کار.. ئەو ڕۆژەی «شازە» گوارە زیوەکانی سەردەمی منالیی خۆی کردبووە گوێچکەی و لەبەر بەلووعە حاجەتی دەشت، قۆریی چاکەی دایە دەست «نەوال» تا لەناو تەنەکەی خۆڵە سپییەکەی بەر دەرگا بەتاڵی بکات و بۆی بێنێتەوە، ئەم چوو چاکەی لە ژێر کەپری مێوەکە ڕۆکرد و تلێپەکەی خستە سەر کارتۆنی ئەو زۆپا ڕەشەی، کە بە نەوت ئیشی دەکرد و ڕۆژی پێشوو لە «هاشم ئەعنەش»ی باوکی «ست سامیە»یان کڕیبوو.. دوایی بە پەنجەی دۆشاومژە و بالابەرزەی دەستی چەپی بلاویکردنەوە و لێزانانە، بەلام چەند بلێیی بە دیقەت وێنەی ژنێکی ڕووتی پێ لەسەر کێشان.. «شازە» کە بینی و سەرنجی لێی دا، خێرا بانگی «نازە»ی کرد و پێی وت:

ـ وەرە سەیرکە، بزانە کچم چی کردووە، ئینجا باسی کچی خۆتم بۆ بکە چاوەکەم..!!

«نازە»، کە هات و سەیری کرد، چاوی چووە پشتی سەری و بە دەستی ڕاستی

کێشای بە ڕوومەتی چەپی خۆیا.. چاوەکانی لەسەر گوێزایەوە و بەسەر «شازە»دا قڕیشکاندی:

ـ من چۆن جارێکی تر قاچم دەخەمە ئەم قەحپەخانەیەی تۆوە و دەهێڵم کچم لەگەڵ چاوحیزی ئاوا هەڵسێ و دانیشێ..!!

منالە ساواکانی کردە ئەم باوەش و ئەو باوەشی و کچەکەی بە پێش خۆی دا.. کاتێ دەیویست دەرگا بکاتەوە و قاچەکانی بباتە دەرەوە، بە شێوەیەکی زۆر سەیر ڕووی کردە «شازە» و پێی وت:

ـ ئەو ژنە شەشپەنجەیە دەناسیت، کە لە داخی پەنجە زیادەکەی بووبوو بە داسک و دەزوو، بەڵام بۆئەوەی خەڵک گاڵتەی پێنەکەن و نەیکەن بە گاڵتەجاڕی خۆیان، بە هەق و ناهەق دەیوت: ئای پەنجە خۆشەویستەکەم، تۆ چەنێ جوانییت..؟!

«نەوال» دەستی کرد بە گریان و خۆی خستە باوەشی ئامۆژنیەوە.. دەستەکانی لە کەمەری ئاڵاند و توند توند گوشی.. نەیدەزانی گیانی خۆی بوو، یان هی ئەو، ئاوا موچوڕکی پیادادەهات و سووک سووک دەلەرزی، بەڵام هەستی دەکرد دڵی ئەو وەکوو قازێکی پێکراوی خەڵتانی خوێنی گەرم، کەوتۆتە پەلەقاژە و ئەگەر کەمێکی تر گوێی خۆی سووکبکات، دەنگی باڵەکانی دەبیستێت، کە لە تاوی ئازار، جار جار بە هێز و جار جار بە سستی ڕایاندەوەشێنێت.. بەبێ ئەوەی سەری هەڵبڕێت و سەیری چاوەکانی بکات، دەنگی پڕ لە گریان و لێواولێو لە سۆزی لێ هەڵبڕی و پێی وت:

ـ من پەنجەی زیاد و بێکەڵکی تۆ نییم.

ئەو وەک بڵێی تا ئەو کاتە لەبەر دڵی ئەم نەگریابێت و نەیوبستبێت ئەوەندەی تر پەست و نیگەرانی بکات، بۆیە لەو بەکوڵتر دەستی پێکرد و هەر زوو زووش بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە دەیوت:

ـ تۆ دڵ و گیانی منییت، گلێنەی چاوەکانمییت، ڕووناکیی ماڵە چۆڵەکەم.. کچە هونەرمەندەکەم..!!

دواییش هەرچەند دەستی چەپی دەکردە ملیەوە و بۆنی قژە خاوەکەی دەکرد، بە

قوولّی هەڵیدەمژی و پێی دەوت:

ـ بە سائەقەت بم، تۆ زۆر زیرەکیت زۆر..!! خۆ من باوەڕم نەدەکرد لە مانای ئەو قسەیە تێگەیشتبیت..!!

«نەوال» چوو بە دەستی ڕاستی ژنە ڕووتەکەی لەسەر کارتۆنەکە لابرد و کردیە سەتڵەکەی خۆیەوە، بردی بۆ لای تەنەکەی خۆڵی بەر دەرگا و فڕێی دا.. ئینجا بە لەقە کەوتە گیانی کارتۆنەکە و نووشتاندیەوە.. «شازە» لە ژوورەوە هاتە دەرێ و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ ئای..!! ئای..!! ئەوە تۆ چی لەم کارتۆنە دەکەیت..؟! نابێت بیدڕێنیت گوڵە گیان، چونکە کاتێ دنیا گەرم دابێت، زۆپاکەی تێدەکەینەوە..!!

هات و بۆی دانەویەوە.. هەڵیگرت و چاکیکردەوە.. بردیە ژووری زەخیرە و هەڵیدایە سەر شتەکانی تر.. گەڕایەوە و ویستی شتێکی پێ بڵێت، بەڵام لە دەرگا درا و هەر خێراش دەستێ خستیە سەر پشت.. «جەموول ئەجهەر»ی مێژوونووسی دراوسێیان بە دیشداشەیەکی سپی و جووتێ نەعلی ڕەشەوە دەرکەوت و بە دەنگە نووساوەکەی وتی:

ـ شازە دوو دەنکی تری حەبی خەوم بەرێ.

ئەو لێی تووڕەبوو و پێی وت:

ـ تۆ نابێت هەر ئێوارە داهات و ڕۆژ ئاوابوو، بۆ حەبی خەو دەرگامان لێبگریت مامۆستا..!! تەواو ئیتر نییمە و حەزیش ناکەم چیتر بێیتەوە..!! بە جارێ ناخۆشتکردووە..!!

ناوی «جەمووڵ ئەجهەر» لەگەڵ ناوی سێ مێژوونووسی تر، بە ڕەشێکی تۆخ تۆخ لەسەر بەرگی کتێبی مێژووی پۆلی چوار نووسرابوو و خرابوونە ناو لاکێشەیەکی بچکۆلەوە.. «نەوال» جارێکیان بە دەرزیی تۆقە سپیەکەی خۆی، کە لە شێوەی مەیموون دروستکرابوو و بە ملپێچێکی ڕەشی خوریی زۆر جوان لەگەڵ «فەربال»ی خوشکی گۆڕیبوویەوە، خاڵی ژێر «جیم»ـەکەی کڕاند و کردی بە «حەمووڵ».. دوایی بە قەڵەمەکەی خاڵێکی لەسەر «حاء»ـەکە دانا و بوو بە «خەمووڵ».. بە دزییەوە پیشانی «نێرگز»ی دا و ئەو پێکەنی.. «ست ئەنفال»،

کە قژی بە شێوەی قۆریی چا لە ناوەڕاستی سەریا بەستبوو و مەمکەکانی لە یاخەی کراوەی کراسە سپیە گوڵگوڵیەکەیدا دەرکەوتبوون، دەستی چەپی ئەم و دەستی ڕاستی ئەوی ڕاکێشا و کردنیە دەرەوە.. لەوێ «نێرگز» خەتاکەی خستە سەر ئەم و بە چەپۆک شالاّوی بۆ برد.. «نەوال» قاچەکانی لە زەوی توندکرد و بەرپەرچی دایەوە.. توند توند قژی گرت و ملی کەچکرد.. لە پێشدا بە ئەژنۆکانی لە دەموچاوی دەدا و دەیویست دانەکانی بشکێنێت.. دواییش بە هەموو توانای خۆی ڕایکێشا و تا هێزی تیابوو سەری کێشا بە قەراغی پەنجەرەی پۆلەوە.. هەر خێرا خوێن فیچقەی کرد و بە تاساچوو.. «جەمیلە»ی فەڕاش، کە ئەوسا لووتەوانەیەکی زیوی کردبووە لووتیەوە و کراسێکی ڕەشی سادەی لەبەرکردبوو، بە فریایکەوت و دەستەکانی خستە ژێر ئەم باڵ و ئەوباڵیەوە.. هەڵیستاند و بردی بۆ ژووری بەڕێوەبەر.. بە دەرمانە سوورەکە بۆیان تیمارکرد و بە لەفافی سپی و لە شێوەی هێلکەشەیتانۆکەی زل پێچایان.. «ست سامیە» بۆ ماوەیەکی زۆر، «نەوال»ی لەبەر ئەو دەرگایەی خۆی، لەسەر یەک قاچ وەستاند و قوتابیەکان کەوتنە گاڵتەپێکردنی.. لاساییان دەکردەوە و پێیان دەوت:

ـ ورچ ئاوا لەسەر یەک قاچ دەوەستێت نەوال..!!

«جەمیلە» کاتێ دەستی «نێرگز»ی گرتبوو و بە لۆژە لۆژ بۆ ماڵەوەی دەبردەوە، بە بەردەمی ئەویدا هێنا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ بۆئەوەی ژاوەژاوی مناڵان هەراسانت نەکەن و ڕقت هەڵنەستێنن، چاوەکانت توند توند بنووقێنە و بیر لە پیاوێکی ڕەشپۆش بکەرەوە، کە لە دەشتێکی چۆڵ و هۆڵدا وەستاوە و بە دوو داری سوور، دەهۆڵێکی ئێجگار گەورە و چەند بلێیت سپی دەکوتێت..!!

بەڵام ئەم لە دارکاریکردنی ئێوارە زیاتر بیری لە هیچی تر نەدەکردەوە و هەستی دەکرد مەحاڵە وا بە ئاسانی لێی خۆشبن.. ئەگەر بچێتەوە ئەملا، دایکی و ڕوو لەولاش بکات، «سیامەند» دەیکوتێتەوە.. دوایی هەر چۆنێ بوو ڕێی ئەولای گرت و لەبەر خۆیەوە دەیوت: «بەشکوو مامە سیامەندم وەکوو زۆر شەوی تر درەنگ درەنگ و بە سەرخۆشیی بێتەوە و پێی نەزانێت».. کاتێ دەرگاکەشی بە

سووکی ترازاند و قاچی برده ئەودیو، ویستی ترسەکەی دەموچاوی بشارێتەوە و وا خۆی پیشان نەدات تووشی چورتوومێ بووە.. هەرچەندیش زۆری لێبکەن و سەر بکەنە سەری لە سفرەکە نزیکنەکەوێتەوە و نانیان لەگەڵ نەخوات، چونکە «شازە» پێی وابوو دەموچاوی بنیادەم لە کاتی نانخواردندا لە هەموو کاتێکی تر چاکتر دەردەکەوێت و ئەوەی کەمێ شارەزایی هەبێت، دەتوانێت بیخوێنێتەوە و نهێنییەکانی دەربخات.. زۆر جار ئاوا مێردەکەی لە قافا گرتبوو و وایلێکردبوو دان بە تەنگوچەڵەمەکانی دابنێت.. کەچی کاتێ لە هەیوان پێڵاوە سپیەکانی داکەند و پاڵی بە دەرگاکەوە نا، هەر دووکیانی بینی کز کز لەسەر کورسیەکان دانیشتبوون و وەک بڵێی هەست بە بوونی ئەم نەکەن، یاخود نەیانەوێت هەستی پێبکەن و وای پیشاندەن حەز لە چارەی دەکەن، سەریان هەڵنەدەبڕی و بە تیلەی چاویش سەیریان نەدەکرد.. ئەمیان بە سوورێکی تۆخ تۆخ نینۆکەکانی بۆبەدەکرد و لەبەر تیشکی گڵۆپە شیریەکەی سەر سەریدا دەبریسکانەوە.. ئەویان بە قەڵەمە ڕەشەکەی دەستی خەریکی نووسینی ئەو کتێبە بوو لەسەر چۆنیەتی وێنەگرتن و جار جار بە ڕاستە سپیەکە هێڵکاریی بۆ دەکرد.. دەیویست جانتاکەی هەڵگرێت و بەجێیان بهێڵێت.. پشتیان تێبکات و هەر بە جارێ لە بیر خۆیانیان بەرێتەوە.. سەری هەڵگرێت و ئیتر تا ماوە ڕوو لەماڵیان نەکاتەوە، کە ئەوەتا بۆ یەکەمجارە تیایدا هەست بە نامۆبی بکات و وابزانێت میوانێکی ڕەزاگرانە.. بیری لەوە دەکردەوە ملی ڕێگایەکی نەزانراو بگرێت و بەدەم گۆرانیی «غريبه غريبه وانا مابين اهلي»ـەوە بڕوات، کە هەر جارێ دەنگی لێ هەڵبڕیبوو و بۆی وتبوون، بە جووتە دابوبانە گریانی بەکوڵ و حەیران و سەراسیمە ببوون.. بڕوات و هەر بڕوات.. بڕوات و ئاوڕنەداتەوە.. تا قاچەکانی هێزیان تیادا نامێنێت و بە دەما، یان بە پشتا دەکەوێت و دەبێتە خۆراکی ورچی ڕەش و کەمتیاری سپی.. هەر جارێ مێروولە ڕەش ڕەش و ورد وردەکان لە کونی دیوارە سپیەکەی هەیوانەوە دەهاتنە دەرێ و دەچوونە ناو ژێرپیاڵەکەیەوە، بۆ ماوەیەک لەسەر کەمانە سپیەکە خۆیان مەتدەکرد و شیلەکەیان دەمژی، ئامۆژنی هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا و پێی دەوت:

ـ ئەگەر مێرووڵەیەک ڕێی لێ تێکبچێت و بە هەڵە بچێت بۆ شارێکی تر، خێرا بە بۆنەکەی دەزانێت ئەمە شاری خۆی نییە و لە داخا دەسبەجێ دەمرێت.

ـ بۆچی ئامۆژن..؟!

ـ چونکە لە شارەکەی خۆی وەریناگرنەوە.

ـ جا لەبەرچی وەریناگرنەوە..؟!

ـ پێت ناڵێم.

ـ بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

حەزی دەکرد مێرووڵەیەک بوایە و ئانوسات ڕۆحی دەربچوایە، نەک ئاوا ئەفەرۆزی بکەن و بە هی خۆیانی نەزانن.. پڕ بە دڵ ئارەزووی دەکرد بە هەر دووکیان تێبکەون و بە شەق و بە زللە، بە گاز و بە چڕنووک ئەو جەستەیەی دابڕزێنن، چونکە لە حالەتێکی ئاوادا تەنها لێدان دەیتوانی ئەو هەستەی لا بخولقێنێت، کە ئەمە ماڵی ئەمە و ئەوان دڵ و گیانەکەین.. بەڵام وا لێی چووبوون بە قینا، حیسابی هیچیان بۆی نەدەکرد و دەیانویست هەر بە داخ و خەفەت دیقی پێبکەن.. تا ئەو کاتەی لە دەرگاکەیان درا و «سیامەند» چوو بیکاتەوە، ئەم هەر لەسەر ئەو کورسیەی پشت دەرگا دانیشتبوو و بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە سەیری دەکردن.. دەردی «دیجلە» دەیوت: لە کەشتیی خەیاڵێکەوە دادەبەزی و سواری یەکێکی تر دەبوو.. هەر ئەوەندەش «سیامەند» بە دەستی چەپی ئەڵقەڕێزی دەرگاکەی بادا و کردیەوە، دوو پیاو پەلاماریان دا و بە بۆکس تێیکەوتن.. کە ئەمان بە شپرزەیی ڕایانکرد و خۆیان گەیاندێ، بینیان «خەسرۆ»ی باوکی «نێرگز» و «نەهرۆ»ی مامی بوون و خستبوویانە ژێر خۆیانەوە.. «نازە»ش بە پەڕۆیەکی سپی قژی بەستبوو و لە حاجی لەقلەقێکی زل دەچوو، لەسەری کۆڵانەوە بە شاتەشات دەهات و کردبووی بە ڕۆژی خۆی.. «شازە» ڕایکردە مووبەقەکە و بڕەندە سپیە کلکڕەشەکەی هێنا.. هەر خێرا بە دەستی ڕاستی کێشای بە سەریاندا و لە خوێندا سووری کردن.. هەر ئەوەندەش «نازە» پەلاماری دا و ویستی بڕەندەکەی لێ بسەنێت، ئەم هەڵیبڕی و کێشای بە سەری ئەویشدا.. لە

ژێر قاچەکانی ڕەهێڵبوو و لە خۆڵدا گەوزاندی.. هەرچۆنێ بوو خەڵکی گەڕەک کەوتنە نێوانیان و لە یەکتریان جیاکردنەوە.. ئەمان بە سەری شکاوەوە گەڕانەوە و ئەوانیش لەبەر دەرگای خۆیان بە دڵی پڕ لە خەفەتەوە لێی دانیشتن.. «جەموول ئەجهەر» هاتە پێشێ و پێی وتن:

ـ باوکم بە خوا منالّ ئەوە ناهێنێت، ئێوە ئاوا شەڕی لەسەر بەرپابکەن.. هەمیشە ئەو شەڕانەی گەورە لەسەر منالآن بەرپایدەکەن، هیچوپووچن، چونکە منالآن لەسەر شتی زۆر هیچوپووچ نەبێت شەڕ ناکەن.

تا بۆ ئەمان و بۆ خەڵکی گەڕەکیشی بسەلمێنێت قسەکەی ڕاستە و بە هەڵەدا نەچووە، دەستی ڕاستی کردە ملی «نەوال» و بە لەفزێکی منالآنە لێی پرسی:

ـ ئەوە ئێوە لەسەر چی شەڕتان بوو ڕۆحەکەی من..؟!

ـ لەسەر تۆ.

ئەو لە شوێنی خۆی ساردبوو و سەری لەبەر نا.. «سیامەند»یش لەولاوە، وەک نە بای دیبێت و نەباران، قاقای لێ دەدا و دەیوت:

ـ ئەوە خۆ قسەکەی مامۆستا ڕاست دەرچوو..!!

ئەو شەوە لە ماڵەوەش تا درەنگ ئەو دەیوتەوە و ئەمان پێدەکەنین.. «نەوال»یش هەرچەند بیری لە ماڵی «نێرگز» دەکردەوە و دەیهێنانە بەر چاوی، کە هەموویان سەریان شکاوە و بە لەفافی سپی پێچاویانە، پێکەنینی دەهات و پێی دەوتن:

ـ لە کۆڕسی گۆرانی دەچن.

بەڵام کاتێ جێگایان داخست و پاڵکەوتن، بیری لە بەیانی کردەوە و وردە وردە خەفەت دایدەگرت، کە «نێرگز» نایەت بۆ قوتابخانە و تەخت و کورسیەکەی تەنیشتی بە چۆڵیی دەمێننەوە.. هەرچەند سەیریان بکات و دەستی چەپی بخاتە سەریان، بیریدەکەوێتەوە و تەریقدەبێتەوە.. خۆ ئەگەر بشیەت و لە تەنیشتی دابنیشێت، ئەوا هەر لە ڕووی نایەت سەیری بکات و بیدوێنێت.. کەچی بەیانی کاتێ بینی لە پێش ئەمەوە گەیشتبوو و زۆر لێزانانە و چەند بڵێیت خێرا، بە پڕگاڵە ڕەشەکەی دەستی چەپی، کە ئەموستیلەیەکی زیوی کردبووە پەنجەی

بالابەرزەی و لەبەر گەورەیی دەزووی ڕەشی تێوە پێچابوو، هێڵی بازنەیی لەسەر دەفتەرە لاکێشەییەکەی بەردەمی دەکێشا، قاچە ئێجگار سپیەکانی ئەو ژنە سەماکەرەی بیرکەوتەوە و داچڵەکی، کە ئەو ڕۆژەی دانی سەرەوەی کەوت و هەڵیدایە ناو زێرابە قووڵەکەی بەردەم قوتابخانە، لەگەڵ «کاترینا» لەسەر شانۆ ڕەشەکە دیان و سەرنجی ڕاکێشا، تووڵێکی ڕەشی تەنکی لەبەرکردبوو و وەکوو پڕگاڵ دەیجوولاندن، دەیجوولاندن و نینۆکە سوور سوورەکانیان وێنەی چاوی پشیلە ڕەشەکە لە تاریکیە کەمێ تۆخەکەدا دەبریسکانەوە، بۆیە حەزی دەکرد بە هەر شێوەیەک بێت لەگەڵی ئاشتبێتەوە و تێیبگەیەنێت، کە چۆن و کەی فێری ئەو هونەرە بووە و ئاوا تیایدا کولاوە، لە کاتێکدا ئەم هەوڵی دنیای دا و هەر فێری نەبوو.. هەرچەند دەیبینی هونەرمەندانە و بە جووڵەیەکی زۆر سەیر، جووڵەیەک مەگەر هەر خۆی بزانێت چۆنە و چۆن دەکرێت، هەڵیدەدایە سەر دەفتەرەکە و نووکەکەی لێ دەچەقی؛ قەڵەمە ڕەشە بچکۆلەکەش، کە چووبوو بەناو کونی خشتی لاکەی تریدا و بە قەڵەمدادەرە سوورەکە نووکەکەی تیژ تیژ کرابوو، هەر لە خۆبەوە دەخولایەوە و بازنەیەکی ڕێک ڕێکی دەکێشا، ئەم تەواو دەحەپەسا و بە جارێ سەراسیمە دەبوو.. ئاخر ئەو شەوەی هاتنەوە و بە پرتاو خۆی کرد بە ژوورەکەی خۆیا، خێرا پڕگاڵە ڕەشەکەی لەناو قوتووە سپیەکەی سەر تاقە ڕەشەکە و کارتۆنە سپیەکەی لە چەکمەجە ڕەشەکەی کانتۆرە سپیەکە هێنایە دەرێ.. ئەمی بە دەستی چەپی گرت و ئەویانی خستە سەر کۆشی.. ئەو کارتۆنەی کون کون کرد و هەر نهێنیی ئەو جووڵە سەیرەی بۆ نەدۆزرایەوە.. چەند جار ئەو نووکە تیژە لە ڕانەکانی چەقی و ژانی خستە دڵیەوە، هەر گوێی نەدایە و دەستی هەڵنەگرت.. دواجاریش کە بە توندی هەڵیدا و جەستەی کارتۆنەکەی سمی، سمی و لە ژێرەوە گۆشەی تیژی نێوان هەر دوو ڕانی کرد بە نیشانە، هاواری لێ بەرزبووەوە و بەر چاوی تاریکبوو.. «فەریال»ی خوشکی بوو دایکی لێ ئاگادار کردەوە و هێنایە سەری، ئەگینا ئەم هێشتا بەتەمانەبوو کۆڵ بدات و ئەو شەوە چاوەکانی لێکبنێت.. نەیدەزانی دایکی کام دەستەی لەو قژەی گیرکرد و سەری بە کام دیوارەدا کێشا، بەڵام ئەوەندەی دەزانی ئازاری سەر و بنی تێکەڵ بە یەکتر دەبوون

و دەبوونە بازنەی سووری خوێناویی.. ئەوسا تەختە شەختە سپیەکانی بیردەکەوتەوە و لەگەڵ جووڵەی قاچی سەماکەرەکەی بەراورد دەکردن، کە بەیانیان زوو زوو دەسکێشە ڕەشە چەرمەکەی دەکردە دەستی و لەگەڵ کچانی گەڕەک لەو گۆمەی ئەوبەر دەریدەهێنان.. لەولاتر لە نێوان «دیجلە» و «فوراتـ»دا، دەیخستنە سەر چوار بەردی گەورەی ڕەش و لە شێوەی بازنەکانی دەستی چەپی، هی بچووک بچووکی لەسەر ڕیزدەکردن، کە بە بۆیەی نینۆک سوور سووری کردبوون و لەبەر تیشکی ڕۆژەکەدا دەبریسکانەوە.. بەردەکان وردە وردە هەروەک گیانیان لەبەربێت و هەست بە لەزەت و جوانیی ئەو دیمەنە ئێجگار سۆزرەت و دڵگیرە بکەن، شوێنی خۆیان لەسەر تەختە شەختەکە هەڵدەکۆڵی و بە شێوەیەکی زۆر سەیر ڕۆدەچوون.. ڕۆدەچوون و زۆر بە نەرم و شلیی دەکەوتنە سەر زەویەکە.. بازنەیەکی سووریان لێ دەخولقا و گیانیان لە چێژ و لەزەتێکی چەند بلێی خۆشدا نقوومدەکرد.. جەستەی کون کونی شەختەکەش، کە بۆیەی نینۆکی بە سەردا بڵاوبووبووەوە و لە نانی سووری تەنووری ڕەشی ژنە سپیپۆشەکانی «بابلشێخ» دەچوو، خۆی لەبەر تیشکی ڕۆژەکەدا نەدەگرت و پەیتا پەیتا دەتوایەوە.. دەتوایەوە و سووک سووک دەتکا.. دەتکا و تنۆک تنۆک تێکەڵ بە بەردەکان دەبوو.. چاوی گریاوی عاشق چۆنە، کاتێ لەناو فرمێسکی زۆر و چەند بلێیت بە خوڕدا سوورهەڵدەگەڕێت و پڕشنگ دەدات..؟! بەردەکان لەناو ئاوی تەزیوی ژێریاندا ئاوا و بگرە جوانتریش بوون.. ئا.. ئا.. جوانتر بوون و لە خەونی بەرەبەیانێکی فێنکی سەربانی خۆیانیان دەکرد.. ئەو خەونانەی دوای بە ئاگاهاتنەوەش هەر دەبینران و لە چاو ونندەبوون.. ئەو خەونانەی تەنها «شازە» دەیتوانی جوان جوان لێکیانبداتەوە و درووست ئاکامەکانیان دەربخات.. وا دیاربوو ئەویش هەستی بەو لەیەکچوونە کردبوو و دەیزانی تاقە کچەکەی چەندێ بەو یاریە ئاسوودەیە، بۆیە سەرزەنشتی نەدەکرد و پێی ناخۆش نەبوو بەو سەرما و سۆڵە دەستەکانی بخاتە زوقمی ئەو گۆمەوە.. ئەو جارەی «سیامەند» بینی وا جانتای قوتابخانەی فڕێداوە و خەریکی ئەو بەزمەیە، بە دەستی ڕاستی قژی گرت و کێشای بە بەردە گەورەکانا.. ناوەڕاستی سەری شەقبوو و خوێنی

پیادا هاته خوارەوە.. «شازە» کاتێ لە هەیوانەکە بە لەفافی سپی سەری لە شێوەی هێلکەشەیتانۆکەی زل دەپێچا و فرمێسکی ورد وردی وەکوو بەردەکانی بۆ دەڕشت، جنێوی بۆ دەنارد و دەیوت:

ـ ئەو دەستانەت بشکێت سیامە دڵڕەق..!!

چوار ڕۆژ نەچوو بۆ قوتابخانە و «شازە» لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ خەستەخانە.. «سیستەر موفیدە» بۆ خۆشیی تووڕەی دەکرد و زوو زوو پێی دەوت:

ـ تۆ دەزانی کچ چەند جار سەری بشکێت، ئەوەندە شووە دەکات..؟!

«نەوال» بە مەکرێکەوە دەستی چەپی دەخستە سەر ڕانی ڕاستی ئامۆژنی و پێی دەوت:

ـ پێی بڵێ ئەو قسانە نەکات، ئەگینا لێی تووڕەدەبم ها..!!

ئەویش پێدەکەنی و بە گوێچکەی چەپیدا دەچپاند:

ـ پێی بڵێ: ئەگەر ئەو قسەیە ڕاست بوایە تۆ هەموو ڕۆژێ دوو جار سەری خۆتت دەشکاند.

لە پۆلیش «نێرگز» دەستی چەپی خستە سەر قەتماخە سوورەکەی و لێی پرسی:

ـ ڕاستە ئەو کچەی بە بەرد سەری بشکێت، ورچ حەز لە گۆشتەکەی ناکات..؟!

ـ من ئەمەم نەبیستووە.

کەچی ئەو ڕۆژە بۆئەوەی شەرمی بشکێنێت و ئاشتیبکاتەوە، دەمی بردە بن گوێچکەی چەپیەوە و پێی وت:

ـ دەزانی نەرجس قسەکەی تۆ ڕاستە، کچ ئەگەر سەری بە بەرد بشکێت، ورچ ناتوانێت گۆشتەکەی بخوات..؟!

ئەو پرگاڵەکەی بە سووکی کێشا بە پشتی دەستی ڕاستی خۆیا و بە خێسەیەکەوە پێی وت:

ـ تۆ نابێت لەگەڵ من قسە بکەیت.

دوابیش چەند جاری تر هەوڵی لەگەڵ دا دڵی ئاشتبکاتەوە و وەکوو پێشان بە

یەکـەوە یاریـبـکەن، بەڵام ئەو ڕازیی نەدەبوو و هەر سـەیریشی نەدەکـرد.. ڕۆژی پێش جەژنی نیشتـیـمـانیی، «ست ساجیـدە» پێکـیـهـێنانەوە و سەرو دوو نوقـوڵی سپـییـشی دانێ، ئەوانەی لە کاغـەزێکی ڕەش پێـچـرابوون و تامێکـی وەکـوو هی توێکڵی گـوڵـیـان هەبوو.. بۆ بەیـانیـەکـەشی، کـە خـۆی گـۆڕی و چوو بە شـوێنیـا، وایدەزانی دایک و باوکی لێی تووڕەدەبن و بە جنێـو دەریدەکـەن، بەڵام لە جـاران چاکـتـر دەیاندواند و بە ڕوویەوە پێـدەکـەنیـن.... ئەو کـاتەی مـامی خستـیـە ناو ئۆتۆمۆبیلەکەی و بردی بۆ لای ئامـۆژنی، بۆئەوەی داخی دڵی پێ بڕێژێت و بە جنێو ڕیسوای بکات، هەر دووکیانی بینی بە جلی ڕەشەوە کز و خەمناک لەسەر کورسیە سپیەکانی ڕاڕەوەکە دانیـشـتـبوون و منداڵەکانیـان کردبووە باوەش.. کـاتێ ئەمـان لێـیـان نزیککەوتنەوە و خـەریکبـوون بگەنە بەردەم قـاوشی ژمـارە هەشت، ئەوان هەستـانەوە و بەرەو پیریانەوە هاتن.. کەچی هیـچیان نەدەوت و هەر ئاخ و داخیان هەڵدەکـێشـا.. «نەوال» گـوێی لە دەنگی دایکی و «فـەریال»ی خـوشکـی بوو، لە قـاوشـەکـەی بەرامـبـەریان دەهات و دەگـەیشـتـە دەرەوە.. دڵی داچڵـەکی و لێـوی خوارەوەی خستە ژێر دانەکانی سەرەوەی.. هەر خێرا بە ئانیـشکـی ڕاستی پاڵی بە دەرگـا ڕەشـەکـەوە نا و خـۆی کـرد بە ژوورا.. «شـازە»ی بینی لەسـەر پشت پاڵـیـانخـسـتـبـوو و دایکی و خـوشکـیـشـی لەمـلا و لەولایەوە دانیـشـتـبـوون.. ئـامـۆژنـی، کـە بە سـسـتی ڕووی وەرگـێـڕا و ئەمی بینی، دایە پرمـەی گـریان و دەیویست سەری هەڵبـڕێت.. «ست سوعاد» دەستی چەپی دەخستە سەر سنگی و نەیدەهێشت.. کاتێ «سیامەند»یش هاتە ژوورەوە و لێیان نزیککەوتەوە، «شازە» لێی تووڕەبوو و هەر بەدەم گریانەوە پێی دەوت:

ـ نەمـوت مـەیهـێنە، با ئـاوا نەمبـینێت..؟! بۆچی هێنـات..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟!

«نەوال» کـاتێ لە خوشکەکەی نزیککەوتەوە و بیستی، گوایە گـوللەی خۆشیی بەر نەرمەی قۆڵی چەپی کەوتووە و کوناودەری کردووە، ئەو هەتیوەی بیرکەوتەوە و ئاخـێکی قـووڵی هەڵکێـشـا، کـە لەناو عـەرەبانەکـە پەنجـەی دۆشـاومـژە و ئەسپـێکوژەی دەستی چەپی کـردبوو بە ئەڵقـە و پەنجـەی باڵابەرزە و دۆشـاومژەی

دەستی ڕاستی بە جووتکراوی پیادەکرد.. پیایدەکردن و دەریدەهێنانەوە.. دەریدەهێنانەوە و پیایدەکردنەوە.. بۆبە هیچ بەزەیی پیادا نەدەهاتەوە و پڕبەدڵ حەزی دەکرد گیانی دەربچێت.. کاتێ «دکتۆر سەلوا»ش دەستی چەپی کردە ملیەوە و پێی وت:

ـ خەفەت مەخۆ بە قوربان، هەر چەند ڕۆژێکی ترە و چاکدەبێتەوە.

ئەم لە ترسی دایکی نەبوایە، دەنگی هەڵدەبڕی و دەیوت:

ـ من هیچ حەزناکەم چاکبێتەوە.

هەرچەندیش «شازە» بە دەنگی پڕ لە ژانی سەخت و سوێی جەرگبڕ بانگی کرد و داوای لێکرد بە دیار سەریەوە دابنیشێت.. دابنیشێت و قژەکەی بۆ بکات بە کەپر.. بۆی بکات بە کەپر و دەموچاوی پێ داپۆشێت.. دەموچاوی پێ داپۆشێت و هەناسەکانی لە ژێریا هەڵمژێت، کە لە شێوەی گمەگمی کۆتری هاقووی نێر دەردەچن و لە هەموو شتێ زیاتر حەزیان لێدەکات، هەڵیانمژێت و بەرەو قووڵایی سیەکانی خۆیانیان بەرێت.. تێکەڵ بە ئاخ و ئۆفەکانی ناخیان بکات و بیانهێنێتەوە، بۆئەوەی هەست بکات هێشتا زیندووە و دڵی لە لێدان نەکەوتووە؛ ئەم هەر گوێی نەدایە و خواخواشی بوو زووتر بەجێیبهێڵێت.. کاتێ «هالە»ی پووری بە کراسێکی سپیی نیوقۆڵی گوڵگوڵی و تەنوورەیەکی ڕەشەوە هات، بۆئەوەی شەو لەلای بمێنیتەوە و ئاگای لێیبێت، دایکی جانتا ڕەشەکەی کردە شانی چەپی و لێی پرسی:

ـ نەوال گیان تۆ لەگەڵ ئێمە دێیت، یان لای مامە سیامەندت دەبیت..؟!

«شازە» دەستی ڕاستی بە سستی بەرزکردەوە و بەدەم گریانەوە وتی:

ـ نا، تووخوا مادام هەر هاتووە، با لای خۆم بێت.

کەچی ئەم بەبێ ئەوەی ئاوڕی لێبداتەوە و سەیری بکات، بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی «فەریال»ی گرت و پێی وت:

ـ لەگەڵ ئێوە دێم.

کاتێ «سیامەند»یش گەیاندنیە بەر دەرگا و دەستەکانی لەسەر ستێرنی ئوتۆمۆبیلەکەی هەڵگرت، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە دەنگێکی زۆر سەیر

پێی وت:

ـ نەوالەکەم سەیری ڕۆژەکە بکە، تا تەواو ئاوانەبووە.

سەری هەڵبڕی و چاوەکانی تێبڕی.. وەک دڵۆپێ فرمێسکی سووری گەورە بێت و بەسەر ڕوومەتی ئاسمانە سپیە خەمناکەکەدا هاتبێتە خوارێ.. هاتبێتە خوارێ و لەسەر چەناگەی درێژی لەنگەری گرتبێت، ئاوا دەهاتە بەر بینایی و تەزووی بە هەموو گیانیدا دەهێنا.. هەستی دەکرد ها ئێستا نا ساتێکی تر دەتکێت و دەکەوێتە سەر ڕەشماڵی قەرەجە سپیپۆشەکانی قەراغ شار.. ڕەنگە منالێ، یان کوڕێکی هەرزەکار، تۆ بڵێ کچێکی عازەب، دووریش نییە پیرەمێردێ هەڵیگرێتەوە و توند توند بینووسێنێت بە سنگی خۆیەوە.. ئا ئەمە ئەو دیمەنە بوو، کە ئەم هەمیشە لە خەوندا دەیدی و پێی سەرسامدەبوو.. هەر ئەوەندە بە ئاگادەهاتەوە و چاوەکانیشی دەکردەوە بەکامی دڵ بۆی دەگەڕا.. سووک سووک دەستەکانی دەکوتا و ورد ورد کون و کەلەبەری ژوورەکەی خۆی بۆ دەپشکنی..

«سیامەند» ئێوارەیەکیان، کە بە دەستی ڕاستی دەڕابەی ڕەشی ستۆدیۆکەی هێنایە خوارەوە و بە قاچی چەپی لەگەڵ زەویەکەدا جووتیکرد، قوفڵە سپیەکانی دایە دەست ئەم، تا دایانخات و کلیلە ڕەشەکانیان بخاتە گیرفانی چەپی کراسە سپیەکەیەوە.. ئەوسا لە قوفڵەکان ورددەبووەوە و لەبەر دیدەیدا لە شێوەی دەموچاوی ئەو مەیموونە ڕەشە خۆیان دەنواند، کە لە پارکی ئاژەڵاندا دیبووی و بە دیقەت سەرنجی لێ دابوو، ئەوەی بەرکۆشەیەکی سپییان لەبەرکردبوو و وەکوو بنیادەم باوێشکی دەدا.. باوێشکی دەدا و بە دەستەکانی سووک سووک سەری خۆی دەخوراند.. مامی بە ئەسپایی دەستی چەپی کردە ملیەوە و بە دەنگێ، کە ئەم نەیدەزانی بۆچی ئاوا گۆڕاوە و ڕێک لە هی منالٚ دەچێت، پێی وت:

ـ سەیری ڕۆژکە نەوالەکەی دڵم، دەڵێی کەروێشکە دامێنی ئاسمان دەکات بە کون و وردە وردە خۆی تیادا متدەکات..!!

دڵی داخوڕپا و سەیرێکی چاوەکانی کرد، کە لە چاوی ئێجگار ڕەشی بتە زۆر سپییەکەی «مۆزەخانەی بەغا» دەچوون و وەکوو ئەوان دەیانترساند.. دەیانترساند و مووچرکیان بە سەرتاپای گیانیدا دەهێنا.. دەستی چەپی گرت بە قایشی سپیی

پانتۆڵە ڕەشەکەی و لێی پرسی:

ـ ئەوە مامە سیامەند تۆ دەتەوێ بگریت..؟!

که ئەو هیچی نەوت و چاوەکانی له ڕۆژەکه نەترووکاند، ئەو لیکی ناودەمی قووتدایەوە و پێی وت:

ـ من دەزانم تۆ حەزدەکەیت بگریت، بەڵام شەرمدەکەیت.

به سستی سەری داخست و نەیدەزانی بۆچی «شازە»ی دەهاتە بەر چاو، کەوا له ناوەڕاستی هەیوانەکەی خۆیاندا به چەکوشە سپیەکە گوێزی هیندی دەشکێنێت و لەبەر خۆیەوە گۆرانییەکی خەمناک دەڵێت.. ئاوە شیریەکەی دەکاتە قاپێکی ڕەشی قووڵەوە و لەسەر تاقە سپیەکەی مووبەق هەڵیدەگرێت.. هەرکە ئەم هاتەوە و پێڵاوەکانی داکەند، دەیداتێ و پێی دەڵێت:

ـ بیخۆرەوە ڕۆحەکەی شازە، بۆئەوەی کاتێ دەگریت، فرمێسکەکانت لەبەر ڕووناکیدا بدرەوشێنەوە و به جوانیی دەربکەون.

توێکڵە ڕەشە تووکنەکەشی دەکاتە تاسەیەکی پلاسکۆی سپی و لەسەر بۆفیە ڕەشەکەی هەڵدەگرێت، هەتا وشک وشک بێتەوە و به دەسکەوانە سپیەکە قایم قایم بیکوتێت.. ورد وردی دەکات و لەسەر تاقی ئێجگار سپیی حەمامەکەی دادەنێت.. هەموو جارێ قاچەکانی ئەمی پێ دەشوات و پێی دەڵێت:

ـ ئێستا ئەگەر به پێی پەتییش بەسەر شەقامە داخبووەکاندا بڕۆیت، قاچەکانت ناسووتێن.

ئەو ئێوارەیەش که بۆ پیاسە چوونە دەرەوە و گەیشتنە نزیک پردەکەی ئەوبەر، ئەوەی به تەختەداری زۆر ئەستووری سپی دروستکرابوو و ئەم وەکوو دارەمەیت دەهاتە بەر چاوی، ئامۆژنی بەجێهێشت و پێڵاوەکانی داکەند.. باڵەکانی دەکردەوە و لەمسەریەوە بۆ ئەوسەری ڕایدەکرد.. دەچوو و دەهاتەوە.. دەچوو و دەهاتەوە.. دوو کوڕی هەرزەکاری ڕەشپۆش، سەرو کاسکێتی سپییان کردبووە سەریان و سنگیان خستبووە سەر پەرژینی پردەکەوە.. سەیری ئاوەکەیان دەکرد و به دەنگی خۆشیان گۆرانییان دەوت.. باڵابەرزەکەیان ڕووی وەرگێڕا و هەر به گۆرانی، بەڵام به چ ئاوازێکی خۆش..!! ئاااى..!! به چ ئاوازێکی خۆش و پڕسۆز..!! پێی وت:

ـ کچەکە ئەوەندە بە پێی پەتیی بەسەر ئەم پردەدا ڕامەکە، نەبادا قاچەکانت بئاوسێن و شەو خەون بە ئەستێرەی کشاوەوە ببینیت..!!

ئەم هەڵوێستەیەکی کرد و کەمێ لێیان چووە پێشەوە.. پێڵاوە ڕەشەکانی وەکوو دەسکێش لەم دەست و لەو دەستی هەڵکێشابوون و بزێمە سوورەکانیان لەبەر تیشکی کەمێ کزی ڕۆژی دامێنی ئاسمانە بێگەردەکەدا جوان دەدرەوشانەوە.. لەپڕ هەر دووکیانی دا بە یەکا و بە چەناگەی ئاماژەی بۆ «شازە» کرد، کە بە کراسێکی نیوقۆڵی ڕەشی سادە و بە هەنگاوی کورت کورت لە سەراوردی پردەکەوە بەرەو ڕوویان دەهات و جانتایەکی سپیی سادەی کردبووە شانی چەپییەوە.. ئەژنۆ ڕووتەکانی لە یەکتر خشاند و بێشەرمانە پێی وت:

ـ خەمی قاچی منت نەبێت، هیچیان لێنایە، چونکە ئامۆژنم بە توێکڵی گوێزی هیندی بۆی شتووم.

ئەو قاقایەکی بەرزی لێ دا و هیچی نەوت.. ئەویتر بە حەپەساویەوە ئاوڕی دایەوە و بە دەستی چەپی کاسکێتەکەی داگرت.. چاوی بڕیە چاوەکانی و بەدەم پێکەنینەوە لێی پرسی:

ـ تۆ دەزانی ئەم پردە لە چی دروستکراوە..؟!

ـ ئەی ئەوە نییە لە دار دروستکراوە..!!

ـ ئاخر لە داری چی..؟!

ئەم بۆ وەڵام داما و بە سەرسوڕمانەوە وتی:

ـ نازانم..!! تۆ پێم بڵێ.

ـ لە داری بەڕوو دروستکراوە.

«شازە» گەیشتە لایان و بە گاڵتە پێی وتن:

ـ ئەوە بۆچی شەڕ بە کچم دەفرۆشن..؟!

باڵابەرزەکەیان سەیری کرد و بۆ خۆشیی پێی وت:

ـ کچی تۆ نییە، هی هێوەرژنەکەتە..!!

ـ تۆ بە هەڵەدا چوویت، بەڵام قسەی برادەرەکەت زۆر ڕاستە، ئەم پردە لە داری بەڕوو دروستکراوە.

ئەو سەری لەبەر ناو ورتەی لە دەم نەهاتە دەرێ، بەڵام ئەوەی تریان بە زمان لێوی تەڕکردەوە و پێی وت:

ـ ئەی کە ئاوا دەزانییت، بۆچی ڕێگای ئەو کچەت دەدەیت، بە پێی پەتیی بەسەریدا بڕوات..؟!

«شازە» پێکەنی و زۆر بەدڵنیاییەوە پێی وت:

ـ کچی من گۆرانیبێژە..!!

ئەو سەری لەبەر نا و ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا.. هەر خێرا هەڵیبڕیەوە و سەیری خۆرەکەی کرد، کە هێزی لەبەر بڕابوو و ڕێک لەو پارچە قەیفە ڕەش و نەرمە خوێناویەی دەکرد، ئەوەی بەر لەوەی خۆبان بگۆڕن و بێنە دەرەوە، «شازە» لەناو تەشتە سپییەکەی حەمامە کەمێ تاریکەکەدا دەیشت و وردە وردە لەبەر بینایییدا کاڵدەبووەوە.. بەبێ ئەوەی چاوەکانی لێ بتروووکێنێت و سەیری ئەمان بکات، ئاخێکی قووڵتری هەڵکێشا و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر پێی وت:

ـ خۆت دەزانی وا شەو داهات و دەبێت بەجێیبهێڵین، ئەگینا هەندێ قسەم لەگەڵدا دەکردی..!!

ئەوان سووک سووک بەلای خواروو و «نەوال» و ئامۆژنیشی بەلای سەروودا ڕۆیشتن.. ئەم بە دەستی چەپی دەستی ڕاستی ئامۆژنی توند توند گرت و لێی پرسی:

ـ ئەوە تۆ و ئەو کوڕە چۆن دەزانن ئەم پردە لە داری بەڕوو درووستکراوە..؟!

ئەو دەستی خۆی بە هێز ڕاکێشایەوە و پێی وت:

ـ دەبێ تۆ هەموو شتێ هەر بزانییت..؟!

ئەوسا ئەم ئاوڕێکی لە کوڕەکان دایەوە و سەیری کردن، کە گەیشتبوونە گەرووی پردەکە و وەکوو بێشکەکانی «شارا» و «شەماڵ»ی دەهاتنە بەر چاو، کاتێ «نێرگز» بەرزی دەکردنەوە و پێی دەوت:

ـ ورچ ئاوا لەسەر قاچ دەوەستێت نەوال..!!

ئەم لەمەوپێش لە منالانی گەڕەکی بیستبوو و بە پەرۆشیشەوە گوێی بۆ شلکردبوون، گوایە ئەو پردە شەوان دەبێتە مەڵبەندی جنۆکە و دەوروپشتی دەبێتە

جـەنگەڵسـتـان.. هەر بۆیەش ناویان نابـوو «پردی جنۆکـان» و ئەم ئەوی تری پێ دەترسـاند.. «نێرگز» لە هەمـوویان زیاتر لێی دەترسا و لە هەمـوو منالآنی تر پـتر باسی دەکـرد.. هەر ئەویش بـوو ئەو جـارەی لەسـەر تاقی پەنجـەرەی پۆل قنج قنج دانیشـتبوون و شل شل قاچیان شۆڕکردبووەوە، پەرچەمەکەی لەسەر چاوی لادا و پێی وت:

- ڕەنگی خـۆیان و شـتـەکـانیـان زۆر سـەیرن، هیچ لە ڕەنگی ئێـمـە و هی شتـەکانمان ناچن.. دار و درەختـەکـانیـان، جلوبەرگیـان، قـاپوقـاچاغـیـان، هەر هەمـوویان جیـاوازن، بەڵام لەبەر تیشـکی ڕووناکـیـدا کـاڵدەبنەوە و وردە نامێنن.

«هیام»ی کچی «ئەنوەر ئەبوەر»ی وەزیری «بەرگری»یش، کـە دایکی پوورزای دایکی بوو و جار جار دەچوون بۆ مـاڵیـان، ئەو نیـوەڕۆیەی خۆی ڕووتکردبووەوە و لە حەوزی کەمێ قـووڵ و ئێجگار ڕوونی ناوەڕاستی باخەکەیان مەلەیدەکرد، لەپڕ بە دەسـتی چەپی دەسـتی ڕاسـتی ئەمی ڕاکـێـشـا و هەر بە جلە ڕەشـە گـوڵگوڵیەکـانیـەوە خسـتیـە ناو ئاوەکـەوە.. هەر چۆنێ بوو بە شـڵپـەشڵپ خـۆی گەیاندە پەیژەکە و دەستی پێوەگرت، کە لە بۆریەکی لـووس لووس سازکـرابوو و لە شێـوەی شـەترەنج بۆیەیان کـردبوو.. پیـایدا سـەرکـەوت و لە قـەراغی حـەوزەکـە دانیـشت.. قـاچەکـانی خسـتـە ئاوەکـەوە و لە یەکـتـری خشـاندن.. ئەو، کە تەنـها سـەری لە دەرەوەبوو و قـژە زۆر ڕەش و چەنـد بڵـێـی درێژە تـەڕەکـەی لـە شـێـوەی ڕیشـووی مـافووری هەڵـخراوی سەر دیوارەکـانی گـەڕەکی «خـان لاوەند» دەهاتە بەر چاو، ئەگـینا لە ملی بەرەو خوار لە قـووڵایی ئاوەکەدا وەکـوو هێـشـووەترێیەکی زل دەبینرا و ناودەمی ئەمی دەکرد بە ئاودڕکەی لیـک، لێی نزیککەوتەوە و قاچەکـانی بە ئەسپایی گـرت.. خسـتینیـە سەر ئەم مـەمـک و ئەو مـەمکی و سـووک سووک لەسـەریان چەسـپـیـکردن، کـە لـە دوو بووکـەشـووشـە دەچوون و حـەزی دەکـرد هەڵیـانپـەڕێنێت.. هەڵیـانپەڕێنێت و بە دەنـگی ئێجگار خۆشی گـۆرانیی «بنیه علیَ بنیه ولا الگعده بلاش»یان بۆ بڵێت.. نەیدەزانی ئەوە گیانی کامیان بوو تەزووی پیادا دەهات و حەز و لەزەت پەڕەسێلکەئاسا کردبوویان بە هێللانە، بەڵام هەستی دەکرد

ژیانی ڕاستەقینە لە ناو ئاودایە و وشکاوەکیەکان تەنها بۆ ئەوە هەن، گوێ لە هەقایەتی بەختەوەرانی ئاویی بگرن.. چیرۆکی «هێلکەشەیتانۆکەی وێران»ی «ئەمجەد»ی خاڵی بیردەکەوتەوە و تارمایی پاڵەوانەکانی دەبینی، کە پێیان وایە مرۆڤ گەمژەترین بوونەوەری ئاویی بووە و لەبەر گەمژەیی خۆی نەیتوانیوە لەزەت لە ژیانی ناو ئاو ببینێت.. خواوەندی جوانی و زەوق، بە ڕاوێژی خواوەندی ئەقڵ و هۆشیاری، سزایداوە و بۆ سەر زەویی ڕەق و تەق دووریخستۆتەوە.. بە دەستی چەپی قژی گرت و لە پەنجەی دۆشاومژە و بالابەرزەی ئالاندن.. بە دەنگێ، کە لەگەڵ هەناسەی قووڵ نەبوایە دەرنەدەچوو و نەدەبیسترا، پێی وت:

ـ گازیان لێبگرە هیام..!! گازیان لێبگرە..!!

ئەو قاچەکانی بەردا و شل شل بە دیواری حەوزەکەوە نووسان.. ئینجا لەپڕ و زۆر زۆر بە سووکی، بەلام نەرم نەرم، بەبێ ئەوەی گیانی لە ئاوەکە دەربهێنێت و بیکات بە شلپ و هوور، سەری خستە سەر ڕانی و چاوە ڕەش ڕەشەکانی بڕیە چاوەکانیەوە، کە ئەو بە ئاشکرا لەزەتی تیا دەبینین و گلێنەکانیان وەکوو سەرەمێکوتەی بزێو کەوتبوونە جووڵەجووڵ.. خۆ ئەگەر بیویستایە سووک سووک دەستەکانی درێژدەکرد و بە پەنجەکانی وەکوو باڵی زۆر زۆر تەنک و ئێجگار ناسکی پەپوولە دەیگرتن.. دەیگرتن و جیایدەکردنەوە.. جیایدەکردنەوە و لەسەر دەفتەری نیگارکێشانەکەی خۆی نیگاری پێدەکێشان، کە بەرگێکی ڕەشی لووسی هەبوو و پێش نانخواردنی نیوەڕۆ نیگاری «پردی جنۆکان»ی بۆ لەسەر کێشابوو.. ئەوسا ئەو سەرێکی بادا و پێی وت:

ـ ئەمەی تۆ کێشاوتە هی ڕۆژە، بەلام خۆ نازانیت لە کاتی شەودا بیکێشیت..!!

ـ مەبەستت ئەوەیە بە ڕەشێکی تۆخ تۆخ بۆیەی بکەم..؟!

ـ نا.. نا.. مەبەستم ئەوە نییە..!!

ئەمەی وت و سەری لەبەر نا.. هەر خێرا هەڵیبڕیەوە و بەدەم پێکەنینێکی سەیرەوە پێی وت:

ـ تۆ منالیت ئەگەر پێشت بلێم هەر تێناگەیت.. ئەگەر تێشبگەیت هەر

ناتوانیت نیگارەکەی بکێشیت، چونکە ڕەنگی وەکوو ڕەنگی ئەوانت نییە..!!

«نەوال» تێگەیشت و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ بۆچی ئەوە ڕاستە شەوان........؟!

ئەو سەری بۆ لەقاندەوە و نەیهێشت قسەکەی تەواو بکات.. دوایی‌یش ئاوڕێکی خێرای بەلای دەرگاکەدا دایەوە و بە گومانەوە سەیرێکی کرد، کە لە ساجێکی ڕەشی زۆر لووس درووستکرابوو و بە پشتێنەی ئاسنی سپی دادەخرا.. ئینجا دەفتەری نیگارکێشانەکەی داخستەوە و پێی وت:

ـ هەستە با بچین بۆ لای حەوزی مەلەکە، تۆ هەقی ئەم شتانەت نەبێت.

کەچی ئەو کاتەی جووتێ نەعلی سپیی کردبووە پێی و بە خاولیە ڕەشە ئەستوورەکە گیانی خۆی وشکدەکردەوە، هەر لە خۆیەوە بەبێ ئەوەی ئەم زۆری لێکردبێت و بیری مابێت، دەستی چەپی کردە ملیەوە و بۆی باسکرد، گوایە لە باوکی بیستووە، ئەو لادێییە ڕەشپۆشانەی لای سەروو، کە بەیانیان زوو زوو ڕوو لە شار دەکەن و بەسەر ئەو پردەدا دەپەڕنەوە، زۆر جار کەلوپەلی وەکوو خەنجەر و تەزبێح و ملوانکەیان دۆزیوەتەوە؛ ڕەنگی چەند بلێیت سەیریان هەبووە و هەرکە دەستیان بۆ بردوون کاڵبوونەتەوە.. کاتێ ستیانە ڕەشەکەشی لەسەر مەمکەکانی دەبەست و ڕانە ڕووتەکانی لە یەکتر دەخشاند، بە زمان لێوەکانی تەڕکردەوە و وتی:

ـ دەڵێن هەر ئەو ڕەنگانە لە باکوور هەن، بەڵام ئێمە کاتێ سەیریان بکەین، لەبەر چاوماندا بۆ ڕەش، یان سپی دەگۆڕێن.. خۆ ئەگەر ڕقمان لێیان هەستێت، یاخوود خۆشمانبوێن، ئەوا سوورهەڵدەگەڕێن.

ئەم حەپەسا و بیری لە ڕەنگی سوور کردەوە، کە نهێنیی هەموو دنیای تیادا حەشاردراوە و هیچ کەسێ لێی تێناگات.. بیری دەکردەوە و لە دڵی خۆیدا دەیوت: «سووری ڕق و سووری خۆشەویستی.. سووری ڕق و سووری خۆشەویستی.. سووری ڕق و سووری خۆشەویستی.. سووری ڕق و سووری خۆشەویستی....».. ئەوەندەی وت و وتەوە.. وت و وتەوە.. وت و وتەوە.. وت و وتەوە.. وت و وتەوە.. وت و وتەوە.. وت و وتەوە.. وت و وتەوە.. وت و

وتەوە.. وت و وتەوە.. وت و وتەوە.. و.. ت.. و.. و.. ت.. ە.. و.. ە.. تا ناو سەری خولایەوە و تەواو گێژبوو.. بەر چاوی تاریکبوو و «هیام»ی وەکوو تارمایی دەبینی.. وردە وردە کاڵدەبووەوە و نەدەما.. گوێچکەکانی کپبوون و دەنگی دڵۆپە ئاوێکی دەبیست، کە نەیدەزانی هی بارانە، یان هی چی و لە چییەوە دەتکێ.. دەتکێ و بەر چ تاوێرەبەردێکی ئەفسانەیی دەکەوێت، ئاوا تییم.. تییم.. تییم.. تییم، دەنگدەداتەوە..!! کاتێکی زانی لەسەر دۆشەگی ڕەشی سەر جۆللانە سپییەکەی ناوەڕاستی باخەکە پاڵیانخستووە و سەریان بە پەڕۆیەک بەستووە، کە نەیدەزانی ڕەنگی چۆنە و لە کوێیان هێناوە.. دایکی و «نازک»ی دایکی «هیام»ی بینی بە جلی ڕەشی سادەوە، لەسەر کورسییە سپییەکانی بەرامبەری کز و خەمناک دانیشتبوون و متەقیان لە خۆیان بڕیبوو.. وەزیر قاتێکی سپیی و کراسێکی ڕەشی لەبەرکردبوو و لە ژوورەوە هاتە دەرێ.. دەستەکانی لە پشتییەوە گرتبوو و بە هەنگاوی کورت کورت، بەسەر ڕیزە کاشییە سپییەکەی ناو باخەکەدا، بەرەو ڕووی هات، کە ئەملا و ئەولای چیمەنە ڕەشە چوارگۆشەییەکەی لە یەکتر جیاکردبووەوە و کردبوونی بە دوو بەشی وەکوو یەکەوە.. دەنگی پێڵاوی ڕەشی قالّتاغی، تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، دەنگیدەدایەوە و دڵی ئەمی دادەخورپاند.. گەیشتە لای و بە سووکی دەستی ڕاستی خستە سەر ناوچەوانی.. ئەم سەرنجی وەکوو پەپوولە لەسەر بۆینباغە سوورەکەی نیشتەوە و دیقەتی لێ دا.. دیقەتی لێ دا و بیری لێکردەوە.. بیری لێکردەوە و خەیاڵ بردیەوە.. بردیەوە و هێنایەوە.. هێنایەوە و بردیەوە.. جارێکی تر بردیەوە و هەمدیس هێنایەوە.. ناو سەری بوو بە ئەشکەوتی تاریک و نووتەکی چیرۆکەکانی ئامۆژنی و دڵۆپەئاوەکانیش تییم. تییم.. تییم.. تییم، لە بنمیچەکەیەوە دەتکان، کە هەرچەند سەری هەڵدەبڕی و بۆی دەڕوانین، نەیدەبینین و لە داخا، یان لە بێزاریا چاوەکانی توند توند دادەخست.. دایدەخستن و دەیکردنەوە.. دایدەخستن و دەیکردنەوە.. دواجار بیری لە پاکەتی قەڵەمی بۆیەی ناو چەکمەجەی ڕەشی کانتۆرە سپییەکەی کردەوە و دڵی پڕبوو.. هەر لە خۆیەوە و نەیدەزانی بۆچی بەزەیی پیادادەهاتەوە و دەیویست زۆر بەکوڵ بۆی بگریت، کە لە

شێوەی لمۆزی فیلی ڕەش و سپی و سوور درووستکراوە و تەنها سێ دانەی تێکراوە.. ئاخر تووخوا سێ دانە چییە و وێنەی چیان پێ بکێشێت..؟! چی..؟! چی..؟! چی..؟! لەمەوپێشیش زۆر بۆ «مامە سیامەند»ی گریابوو و فرمێسکی دنیای بۆ ڕشتبوو، کە لە ستۆدیۆکەیدا تەنها دوو ڕەنگی ڕەش و سپی هەن و ڕۆژانە تەنیا و خەمناک لەگەڵیاندا دەژی.. تەنانەت سووری تۆخ تۆخیش لای ئەو دەگۆڕێت و دەبێت بە ڕەشی ڕەش ڕەش.. دایکی ئەو جارە بە دەستی ڕاستی گوێچکەی چەپی ڕاکێشا و بە بێزاریەوە وتی:

ـ ئاخر تووخوا ئەگەر نەگبەتیی نەبێت، مناڵ هەیە لە دنیایا بۆ شتی ئاوا هیچوپووچ و بێمانا بگریت..!!

ئەو شەوە بە کەسیان ژێرنەدەبووەوە و بە هیچ شێوەیەک ڕازیی نەدەبوو سەر بخاتە سەر سەرینەکەی.. باوکی خستیە ناو ئۆتۆمۆبیلەکەی و بردی بۆ ماڵی مامی.. «شازە» لە خەستەخانە نۆرەی ئێشکگرتنی بوو و «سیامەند» بە تەنیا لەماڵ مابووەوە.. لە تەنیشتی پاڵکەوتوو و دەستی چەپی کردە ملیەوە.. ئەو هەرچەند توندتر دەینووساند بە خۆیەوە و بە هێزتر دەیگوشی، ئەم ئەوەندە بەکوڵتر دەگریا و زیاتر دەنگی لێ هەڵدەبڕی.. «سیامەند» بەردەوام هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا و بە دەنگێ، کە بە حاڵ خۆی لە گریانی قوڕگی تاساوی جیاکردبووەوە و لەرەیەکی زۆر زۆر گوناه و چەند بڵێیت لەرزۆکی تێکەوتبوو، پێی دەوت:

ـ ئاخ نەونەوەکەی ڕۆحم، تۆ چەند لە ناخی من تێدەگەیت..!! ئای ڕووناکیی ماڵە چۆڵەکەم تۆ چ دڵێکی پاک و وریات هەیە..!!

ئەم دەستی توند توند دەگرت بە دەمیەوە و هەر بە گریانەوە پێی دەوت:

ـ وام پێمەڵێ..!! وام پێمەڵێ..!! تووخوا وام پێمەڵێ..!! تۆ زۆر گوناهییت زۆر.. زۆر.. زۆر.. زۆر....

هەر لە خۆیەوە هەستی بە مردنی ئەو دەکرد و دڵی دادەخوریا.. وایدەزانی بنیادەم بەر لەوەی بمرێت و ڕەنگی کاڵبێتەوە، دەنگی ناسک دەبێت و ئاوا وەکوو ئەو قسە دەکات.. ویستی هەستێتەوە و پێی بڵێت:

ـ مامە سیامەندەکەی ڕۆحم، ئاگات لە خۆت بێت چاوەکەم، تۆ وا دەمریت..!!

کـەچی نەیدەتوانی و ئەوەندەی تر دەترسـا.. بەیانی، کـە خـەبەریبـووەوە و چاوەکـانی کـردەوە، نەیدەزانی کـەی ژیربۆتەوە و خـەوی لێکەوتووە، بەڵام هەر ئەوەندەی دەزانی وا «شـازە» بە کـراسـێکی سـپی و تەنوورەیەکی ڕەشی درێژەوە، لەسـەر سەری وەسـتـاوە و بە دیقەت سـەیری دەکات.. ئەم وەکـوو ئەو بەتریقـانەی ڕۆژی پێـشـوو لە سـینەمـا دیبوونی و حـەزی لە لەنجـەولاریان کردبوو، دەهاتە بەر چاوی و سەرسـامـدەبوو.. ئەو بە ئـەسپایی بۆی دانەویەوە و دەسـتـەکانی لەمـلا و لەولای سەری و ئەژنۆکانی لەملا و لەولای کەمەری دانا.. بەبێ ئەوەی خۆی بدات بە سـەریا و سنگی بنووسـێنێت بە سنگیەوە، دەمی خسـتـە سەر کولـمی چەپی و ماچیکرد.. هەڵیگرتەوە و بەدەم هەناسەیەکی قووڵەوە پێی وت:

ـ بە قـوربانت بم..!! دەزانی من لە کـەیەوە وەسـتـاوم و چاوەڕێم ئەو چاوانەت بکەیتـەوە، تا ئاوا لە نزیکەوە سەرنجـیـان لێ بدەم و هەرچی خەم و خەفـەتی ئەو دڵە هەڵقرچاوەم هەن، لە بیرم بچنەوە..؟!

«سـیـامـەند»، کـە پشـتـی کـردبووە ئەم و لـەسـەر قـەراغی ئەوسـەری دۆشـەگـە ڕەشەکەی نووستبوو، بەبێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە و سەیریان بکات، بە دەستی چەپی چمکی لێفە سپیەکەی بۆ لای سەری ڕاکێشا و وتی:

ـ ئەی تۆ دەزانی تـا داشیخستوون، چ خوێناوێکی کردووە بە دڵی مندا..؟!

«شـازە» لێی تێنەدەگـەیشت و وایدەزانی گـاڵـتـەی لەگـەڵدا دەکـات.. قـاچی چەپی زۆر بە سـووکی خـسـتـە سـەر شـانی چەپی ئەو و بە نـازێکی منالانەوە پێی وت:

ـ ئەوە تۆ بە خەبەری پیرەمێرد..؟! هەستە دەی..!! هەستە..!!

کەچی هەر خۆبشی بە جووڵەیەکی زۆر سەیر قاچی لابرد و وتی:

ـ هەڵـمەستە.. هەڵـمـەستە.. لە ئێستاوە هەڵدەستیت چی دەکەیت سیامەکەی ڕۆحم..؟!

جلەکانی دەرەوەی داکەندن و کراسە بێقۆڵەکەی نووستنی لەبەرکرد.. هات لە نێـوان هەر دووکـیـاندا لەسـەر پشت پاڵکەوت و لایەکی لێـفـەکەی «نەونەو»ی ڕاکێشـایە سەر خۆی.. دەسـتی ڕاستی کردە ملی «سیامەند» و هی چەپی خستە

سەر ناوچەوانی کچەکەیەوە.. «نەوال» هەستی بە ساردیی دەکرد و دەستی چەپی خستە سەری.. ڕایکێشا و خستیە ژێر لێفەکەوە.. لەوێ بە سنگی خۆبەوەی نا و پێی وت:

ـ من بەم دەستەی تۆ دەزانم دەرەوە چەند ساردە ئامۆژنە ڕۆحەکەم.

«سیامەند» قاقایەکی بەرزی لێ دا و بەبێ ئەوەی ڕووی وەرگێڕێت و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر وتی:

ـ منیش بەم دەستەیانی دەزانم، دەروونی چەند گەرمداهاتووە و چۆنیش هاتۆتە جۆش.

«شازە» بەدەم پێکەنینەوە لە «نەونەو»ی ڕوانی و بە شێوەیەکی زۆر سەیر چاوی چەپی لێ نووقاند.. بە دەنگێ وەکوو ئەو دەنگەی منالآن کاتێ ورک بۆ شت دەگرن و قاچیان لە زەوی دەکوتن، قسەی پێدەکەن و توند توند دەستیان بە دەموچاویانەوە دەگرن، پێی وت:

ـ گوێت لێیە نەونەو گیان مامت چیم پێ دەڵێ..؟!

ئەم تێدەگەیشت و دەشیزانی هەمیشە لە دوای قسەی ئاوادا دەیکەن بە دەسبازی.. هەندێ جار پێی خۆشە و ئەمیش خۆی تێوە دەگلێنێت، هەندێ جاریش پێی پەستدەبێت و بە هەر شێوەیەک بێت لێیان تێکدەدات.. بەڵام زۆڵانە خۆی لێ گێلکرد و وتی:

ـ جا ئەمە یانی چی..؟!

ـ یانی من ئەوم خۆشدەوێت.. تۆ ڕازیی دەبیت خۆشمبوێت..؟!

ـ ئەی چۆن..!! مامە سیامەند دڵەکەی ئێمە نییە..؟!

«شازە» دەستی لەسەر ملی مێردەکەی کێشایەوە و خستیە سەر سنگی خۆیەوە.. دوای تاوێ «سیامەند» بە تەمەڵی و بە قاچ لێفەکەی لەسەر جەستەی لابرد و خۆی کێشایەوە.. بە ئەسپایی ڕووی وەرگێڕا و ماچی ناوچەوانی ژنەکەی کرد.. هەر خێرا هەستایەوە و بەدەم پشتتەقاندنەوە و ئەیەیەیەوە وتی:

ـ هەستە نەوال گیان، ئێمە بچین لەودیو نانەکەمان بخۆین، با ئامۆژنیشت بۆ خۆی بنوێت.

ـ ئەمڕۆ من لەگەڵ تۆ دێم، خۆ قوتانخانە نییە..!!

ـ دێیت، بەڵام ئاقڵ دەبیت و بیانووم پێ ناگریت..!!

ئەو هەمـوو کاتێ بەو مـەرجە ڕازیی دەبوو و لەگەڵ خـۆی دەیبرد، کـە لەوێ بە پرسیار هەراسانی نەکات و بە هیچ شێوەیەکیش قاچی نەخاتە ژوورە تاریکەکەی ئیشـکردن.. ئەو جارەش کە دەرفـەتی هێنا و خـۆی گـەیاندێ، ئەو هەر خـێـرا بە دەسـتی چەپی قژی گـرت و هێنایە دەرەوە.. سەری کـێشـا بە مێـزە سپـیـەکـەدا و زیرەی لێ هەڵسـاند.. «جیـهـاد»، بە فـریای کـەوت و لە ژێر دەستی دەریهـێنا.. کردیە باوەشی و لەولاتر لەسەر کورسیە ڕەشەکەی تەنیشت خۆی داینا.. دەسـتی چەپی خستە ملیەوە و پێی وت:

ـ تۆ ئەوەندە هەقی ئیشی گەورەت نەبێت نەونەوەکەی ڕۆحم.

ئەم وەک نە بای دیبـێت و نە باران، دەسـتـەکـانی بۆ ئەم جـەمـسـەر و ئەو جەمسـەری قـەیتـانە ڕەشـەکەی سنگی کـراسە سپـیـەکەی ئەو برد و گـرێیـەکـەی کـردەوە.. سنگە سپـیـەکەی دەرکـەوت و بە پەنجەکـانی ختـووکەی دەدا، کە هەر لە هی ژن دەچوو و مەمکەکانی لە هی کـچێکی تازەباڵق گەورەتر بوون.. چاوەکـانی بڕیە چاوەکانیەوە و لێی پرسی:

ـ مامە جیهاد خانووەکەتان نافرۆشن..؟!

«جیـهـاد» لە پێشا واقـیـوڕما و چاوەکانی زەقبوونەوە.. ئینجا قاقـایەکی بەرزی لێ دا و هاواری لە «سیامەند» کرد:

ـ وەرە هەتیو گوێی لێبگرە..!!

ئەو لە ژوورەوە ئیشی دەکرد و دەرگاکەی بەسەر خۆیدا داخستبوو، بۆیە گـوێی لەم نەبوو و وا پەست ببـوو، گـوێشی لێـبـوایە هەر وەڵامـی نەدەدایەوە.. بەدەم قاقالێدانەوە ڕووی کردەوە خۆی و لێی پرسی:

ـ ئەوە چی لەم کاتەیا خانووی ئێمەی بیری تۆ خستەوە..؟!

ـ نازانم، بەڵام زۆر حەزم لێیەتی.. خۆزگە هی ئێمە دەبوو..!!

ـ کەواتە وەرە ببە بە کچی ئێمە.. خۆ دایکم تۆی زۆر خۆشدەوێت.

ـ ئەوە تۆ بۆچی باوکم، یان مامە سیامەندم ڕازیی ناکەیت بیکڕن..؟!

ـ جا کێ دەڵێت ئێمە دەیفرۆشین..؟!

دەستی کرد بە گریان و خۆی خستە باوەشیەوە.. سەری خستە سەر سنگی و پێی وت:

ـ تووخوا خانووەکەتانمان پێ بفرۆشن.

«جیهاد» ئەوەندەی تر سەراسیمەبوو و زیاتر سەری لە قسەکانی سوڕما.. بە سستی سەری هەڵبڕی و بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە ڕووی لە بنمیچەکە کرد، کە تانوپۆی بەو کاغەزە سپیەی وێنەی قۆزاغەی ڕەشی لۆکەی لەسەر کێشرابوو، داپۆشرا بوو و گلۆپێکی سپیی بە ناوەڕاستەکەیەوە شۆڕکرابووەوە.. پەنجەکانی دەستی چەپی خستە ناو قژی و خەمناکانە لە بەر خۆیەوە وتی:

ـ نەبووە منداڵ بۆ خانوو بگریت..!!

بە دیقەت سەیرێکی چاوەکانی کرد و بە دەنگێکی قایمتر وتی:

ـ نا.. نا.. نەبووە..!!

ئەم لەو جارەوە «شازە» سەردانی کردن و لەگەڵ خۆیدا بردی، بە پێچەوانەی زۆر ماڵی تر دڵی تیادا کرایەوە و ئاواتی دەخواست ئەوە هی ئەمان بوایە.. ئەوسا جێگای خۆیان و ماڵی «مامە سیامەند»یشی تیا دەبێتەوە و دەتوانن بە یەکەوە بژین.. ئەم زیاتر لەبەرئەوەش ئاوا شێت و شەیدای بوو و حەزی نەدەکرد بەجێیبهێڵن، چونکە دوو دەرگای هەبوو و هەر یەکەیان لەسەر کۆڵانێک دەکرایەوە.. ئەو کۆڵانانەی تەواو لە یەکتر جیاواز بوون و دەتوت هەر یەکەیان سەر بە وڵات و کێشوەرێکی ترە.. هەر پێی دەکرا ئەمیان داخات و ئەویان بکاتەوە.. حەزی دەکرد کۆمەڵێ منداڵی ئەملا و کۆمەڵێکی ئەولا بانگی ناو ئەو باخە گەورەیە بکات و یارییان لەگەڵدا بکات، کە باوەڕی نەدەکرد لە هەموو ژیانیاندا یەکتریان دیبێت و پێکەوە یاریی، یان شەڕیان کردبێت.. سەیری دەکردن و ئەو بێچووەبۆقە سپیانەی بیردەکەوتەوە، کە هەموو جارێ لەگەڵ «دیجلە» و فوڕات»دا دەیانکردنە ناو قوتووی ڕەشەوە و لە بەردەم شارەمێروولەدا هەڵیاندەڕشتن.. لە چاوترووکانێکدا هەر تیپە و پەلاماری بێچووەبۆقێکیان دەدا و سووک سووک و بەرەو کونەکەیان دەبردن.. لەوێ هەندێکیان لە ناوەوە ڕایاندەکێشان و هەندێکیان

له دەرەوە پاڵیان پێوەدەنان.. پاڵیان پێوەدانان و بەردەوام تەکانیان پێدەدان.. پاڵیان پێوەدەنان و بەردەوام تەکانیان پێدەدان.. لەشە نەرمەکانیان بە زەحمەت پێوەدەچوو و بۆ ماوەیەک عاسی دەبوون.. ئەوسا وایدەزانی لاشەی بێچووەبۆقێکی کوژراو دەتوانێت شارەمێروولەیەکی زرت و زیندوو لەناوبەرێت و تۆویان ببڕێتەوە.. ئەوانەی ناوەوە دەخنکێن و ئەوانەی دەرەوە سەرگەردان و پەرەوازە دەبن، کەچی ئەوەندەی نەدەبرد وەکوو شەبزووزی سووری ئەو مراویە ڕەشەی لە قەراغ گۆمەکەی «بابلشێخ» دوای ئەوەی بەسەر مراویە سپیەکەدا تسی و لە شێوەی زمانی بنیادەم هاتبووە دەرێ، سەرەمێکوتەی بزێوئاسا دەجوولایەوە و وردە وردە دەچووەوە شوێنی خۆی؛ ئاوا دەیانکرد بە ناوەوە و ئاودیوبان دەکرد.. ئەم هەر کاتێ «دیجلە» و «فوڕات»ی بەجێدەهێشت و دەگەڕایەوە ماڵ.. دەستەکانی جوان جوان بە سابوونی پشیلە دەشت و لەسەر سفرەکە دادەنیشت.. ئەوسا هەموو شتێ لەبەر چاویا دەبوو بە گۆشتی بۆق و دڵی تێکهەڵدەهات.. بیری لە لەشە ئێجگار لووسەکەیان دەکردەوە و ڕۆحی دەردەچوو، کە بەو زلیەی خۆبان بەو کونە تەسکەوە دەچن و لەودیو دەفلیقێنەوە.. دەفلیقێنەوە و لەمیش زیاتر هیچ کەسێکی تر ناتوانێت بیانبینێت.. سەیری لە خۆی دەهات و سەری سوڕدەما، کە ئاوا قێزیان لێدەکاتەوە و هەرکە دەیانگرێت، ناو هەناوی سەراوبن دەبێت و مردن بە چاوی خۆی دەبینێت، کەچی ناشتوانێت واز لەو یارییە هیچوپووچە بێنێت و بە قسەی ئەو کچەتیوانە نەکات.... دواتر «جومانە»ی دایکی «جیهاد»یش تووشی نەخۆشیەکی سەیربوو و قێزی لە هەموو کەسێ دەکردەوە.. نەدەبوایە بە هیچ شێوەیەک چاوی بە بنیادەم بکەوێت و لێیان نزیکبکەوێتەوە.. بە بینینی منالّ و هەرزەکار، گەنج و پیر، نێر و مێ، پاک و پیس دڵی تێکهەڵدەهات و دەرشایەوە.. ئەو ئەگەرچی کەمێ بە تەمەنبوو و کوڕ و کچی گەورە بوون، کەچی لە کچێکی هەرزەکاری دڵتەڕ زیاتر دەستی بە خۆیا دەهێنا و لەسەر مۆدێل نەبوایە، جلی لەبەرنەدەکرد.. قژە ڕەش و درێژەکەی، کە هەمیشە بە عەتری سپیی ناو شووشە ڕەشەکانی سەر مێزی تەوالێتە سپیەکەی دەرشاند و بە ڕۆنە ئاویەکە چەوری دەکرد، وەکوو گەڵای دارخورما بەملا و بەولای

ملیا بۆ سەر سنگی سپی و کەمێ ڕووتیدا شۆڕدەکردەوە و پێڵاوی بەرز بەرزی بریقەداری لەپێدەکرد.. دوای مردنی مێردەکەشی وازی لە کەشخەیی و ڕێکپۆشیی نەهێنا و گوێی بە تانە و تەشەر نەدەدا.. «نەوال» جارێکیان چاوی لێبوو لەوبەری ستۆدیۆکەی مامی، کوڕێکی گەنجی ڕەشپۆش سەیری کرد و پێی وت:

ـ دەزانم کوڕەکەت بەقەدەر منە، بەڵام هەمووماڵەکەمت بۆ دەفرۆشم، ئەگەر ڕازیبیت ماچێکی سەر سنگت بکەم..!!

ئەو بە حوکمی ئەوەی ژنەسەفیر بوو و لە دەرەوە ژیابوو، وەکوو ئەورووپییەکان هەڵسوکەوتی دەکرد و منداڵەکانیشی هەر ئاوا ڕاهێنابوو.. لە سەرتاپای شاریشدا تەنها دڵی بە «شازە» دەکرایەوە و ئەوەندەی کچەکانی خۆشیدەویست.. کاتێ تووشی ئەو نەخۆشیە بوو و دکتۆرەکان نەیانتوانی چارەسەری بکەن، لە ماڵەوە کەوت و ڕۆژ بە ڕۆژ لاواز دەبوو؛ «شازە» سەری لێ نەدەبڕی و لە هەموو کەسێ زیاتر بە کەڵکی دەهات.. ماوەیەکی زۆر لای مایەوە و شەویش بەجێینەدەهێشت.. «نەوال» ئەگەرچی هەموو جارێ لەگەڵ ئامۆژنیدا دەچوو و ئەویش دەیزانی وا هاتووە، بەڵام نەدەبوایە پێی بخاتە ژوورەکەی و بیبینێت، کەچی هەستی دەکرد تەنها ئەم هۆی نەخۆشیەکەی دەزانێت و ڕەنگە هەر ئەمیش بتوانێت چارەسەری بکات.. هەمیشە بەراوردی نێوان بۆق و مێروولە و خەڵکی دوو کۆڵانە جیاوازەکەی دەکرد و لە خەیاڵی خۆیدا دەیهێنا و دەیبرد.. دەیبرد و دەیهێنایەوە.. ئەوەی سەری لێ دەرنەدەکرد و چەند هەوڵی دا هەر پێی نەگەیشت، ئەوەبوو کام لایان لە بۆقەکان و کام لایان لە مێروولەکان دەچن و قێز لە کام لایان دەکاتەوە.. هەرچەند سەیری دەکردن و بە دیقەت سەرنجی لێ دەدان، ئەنجام هەر ئەنجام بوو و نەدەگۆڕا.. ئەوەندە هەبوو هیچ لایەکیان چارەیان نەدەویست و هەر سەیریشیان نەدەکرد.. بە بەردەمیدا دەڕۆیشتن و سەریان هەڵنەدەبڕی.. خۆ زۆر لە گەورەکان نزیککەوتەوە و خۆی لە قسە و باسەکانیان هەڵقورتاند.. چووە ناو منداڵەکان و ویستی یارییان لەگەڵدا بکات.. سەیری کوڕە هەرزەکارەکانی کرد و بە ڕوویانەوە پێکەنی.. گوێی لە ڕازی کچە باڵق و قەیرەکان گرت و سەری بۆ لەقاندنەوە، کەچی ئەوان وەک بڵێی نەیبینن، یاخود نەیانەوێت بیبینن و وا خۆیان

دەرخەن زانیویانە کچێکی زۆر ڕۆحسووک هاتۆتە کۆڵانەکەیان.. هاتووە و خۆشیدەوێن.. خۆشیدەوێن و ئەگەر ئەوان حەزبکەن و ببن بە هاوڕێی، دەرگاکانی ماڵی «جیهاد»یان بۆ دەکاتەوە و هەر هەموویان، مناڵ و پیر و گەنج و نێر و مێیان دەباتە ناو ئەو باخەوە.. ئەملا و ئەولایان بە یەکتر دەناسێنێت و دەیانکات بە هاوڕێ و کەسوکاری یەکتر.. خۆشترین گۆرانییان بۆ دەڵێت و جوانترین سەمایان بۆ دەکات.. ئەوەتا ئامۆژنیشی لە هەموو دنیادا دەنگخۆشێکی تر نییە شان لە شانی بدات و کەس نییە ئەوەندەی ئەو سەما بزانێت، وا لە ژوورەوەیە و بانگی دەکات، تا ئاهەنگەکەیان بۆ خۆشتر بکات و بە جارێ لە ناخی ناخەوە بیانهەژێنێت.. بەڵام ئەفسووس نە گوێی لێدەگرن و نە سەیریشی دەکەن..!! ئاخ کەس نایەوێت لە ماڵی «جیهاد» نزیککەوێتەوە و ئەو مەتەڵە بۆ ئەم شیتەڵبکات..!! ئەوە مناڵێکی هاروهاج نییە دارلاستیکێکی پێ بێت و بەردێ بگرێتە ئەو هەموو باڵندە سەیر سەیرانەی سەر ئەو درەختانە..؟! کە ئەوەتا بێ ترس لەسەریان هەڵنیشتوون بە ئاوازی جۆراوجۆر دەخوێنن.. ئەوە هەتیوێکی چوختی نییە بچێتە سەر ئەو دیوارە نزمانەی حەوشە و لەسەریان ڕابکات..؟! بەری درەختەکان لێبکاتەوە و بۆ ئەوانەی خوارەوەیان هەڵدات..؟! هەندێکیان بخۆن و شەڕ بە هەندێکیان بکەن..؟! ئەی کوڕێکی گەنجی تیا نییە حەز و شەهوەت بیبزوێنێت و لە سەربان، یان لە کۆڵان سەرەتاتکێ لەگەڵ «دیلهام» و «ریهام» و «ئەنوار» و «نەوار»دا بکات و چاویان لێ بنووقێنێت..؟! ماچیان بۆ هەڵدات و لێویان لێ بقووچێنێت..؟! پەنجەی دۆشاومژە و ئەسپێکوژەی دەستی ڕاستی بکات بە ئەڵقە و پەنجەی باڵابەرزە و دۆشاومژەی دەستی چەپی پیابکات و پیشانیان بدات..؟! هەوەسیان ببزوێنێت و ناخیان بکات بە ئاودڕکەی حەز و شەهوەت..؟! ئەوەتا بە کراسی زۆر تەنکی بێقۆڵ و یاخەی کراوەوە لەناو ئەو باخە دێن و دەچن.. قاچ لەسەر قاچ لەسەر جۆڵلانەی ناوەڕاستی چیمەنەکە دادەنیشن و بەناز بەناز خۆیان دەلەقێننەوە.. چۆن دەبێت لەو هەموو کچی وا زۆر و زەبەند، یەکێ نەبێت ئەو «جیهاد»ـە قۆزە سەرنجی ڕابکێشێت و چاوێ لە چاوە نوقولێیەکانی بنووقێنێت..؟! باشە ئەوە سوالکەرێکی تیانییە لەو دەرگایانە بدات

و داوای شتێ بکات..؟! ئەی هاوار بۆ کەسێ نییە سەیری ماڵی «جیهاد» بکات و لێی نزیکبکەوێتەوە.. بۆ..؟! بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! بۆچی ئاوا لێی چوون بە قینا و دەیانەوێت بەو داخەوە دیقی پێبکەن..؟! سەراسیمە و ئەبلەقی بکەن و دواجار هەر بەو کەسەرەوە بیکوژن.. خۆ ماڵی «جیهاد» خانووەکەیان بە دەوڵەت فرۆشت و ئەو مەتەڵەی هەر بۆ شیتەڵ نەبوو.. کردیان بە دایەرەی «نفووس و سەرژمێری» و هەر ئەنجامەکەی بە دەستەوە نەهات.. «جومانە» چاکبووەوە و هەر هیچی بۆ روون نەبووەوە.. شووی کرد بە «بەدران ئەقهەب»ی بەرێوەبەری کارگەی شیرەمەنی و هەر سەری لێدەرنەکرد.. مێردەکەی مرد و هەر لێی تێنەگەیشت.. شێتبوو و هەر هیچی بۆ دەرنەکەوت.. بە پێی پەتیی و بە جلی پەرپووتی رەشەوە لە بازاردا دەسووڕایەوە و مەکینەیەکی سپیی قیمەی دەگرت بە دەستیەوە.. ئەنجام هەر ئەنجام بوو و نەدەگۆڕا.. گۆشتی سووری تێدەکرد و دەسکە رەشەکەی بادەدا.. ئەنجام هەر ئەنجام بوو و نەدەگۆڕا.. بایدەدا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر بە خەڵکی دەوت:

ـ ئەم مەکینەیە زۆر لە ئێوە پاکترە.. لە سەرەوە گۆشتی تێدەکەم و لە خوارەوە قیمەی لێ دێتە خوارەوە، بەڵام ئێوە ئەگەر پەڕەی گوڵتان دەرخواردبدەم، هەر دەیکەن بە پیسایی.. ئێوە پیسن.. بۆگەنن.. ئامێری بەرهەمهێنانی پیساییین.

«نەوال» هەر جارێ لەسەر رێگای قوتابخانە، یان لای ستۆدیۆکەی مامیدا دەیبینی و سەرنجی دەدایە، کە مناڵان بە: «جومانە شێت.. جومانە شێت» دوای دەکەوتن و چەپڵەیان بۆ لێ دەدا، قێزی دەکردەوە و دڵی تێکهەڵدەهات.. حەزی نەدەکرد بە هیچ شێوەیەک پێی بخاتە مووبەق و مەکینەی قیمە ببینێت.. ئەو جارەش، کە لە قوتابخانە هاتەوە و ئامۆژنی بینی شفتەی سوورکردبووەوە، لە داخا مەنجەڵەکەی هەڵگرت و هەر خێرا قلێپی ناو تەنەکەی خۆڵی بەر دەرگای کردەوە.. هاتەوە و بە دەستی راستی توند توند قژی راکێشا.. کردی بە قریشکوهووڕ و هەرچی جنێوی سووک هەبوو پێی دا.. کەچی ئەو بەسەرخۆی نەدەهێنا و پێی دەوت:

ـ بە سائەقەت بم، چەند جارم پێ وتووی، سەیری ئەو شێتە مەکە و ڕووی خۆت بکەرە ئەولاوە..!! بەشکوو بیرت بچێتەوە و ئاوا قێز لەم شت و لەو شت نەکەیتەوە.

ئەو جارەیش، کە بە یەکەوە چوون بۆ بازاڕی مسگەرەکان و لە بەردەمی کەبابخانەکە بینیان، ئەم دڵی تێکهەڵهات و هێڵنجی دا.. ئەو دەستی ڕاستی خستە سەر چاوەکانی و پێی وت:

ـ هەر کاتێ قێزت لە شتێ، یان لە کەسێ کردەوە، خێرا بیر لە قسەیەکی قۆڕ بکەرەوە، کە لە دەمت دەرچووە و پێی تەریقبوویتەوە.

ـ بۆچی..؟!

ـ بۆئەوەی قێز لە خۆت بکەیتەوە و ئەوت لە بیربچێتەوە.

ـ جا ئەگەر وابکەم، دڵم تێکهەڵنایەت..؟

ـ با، بەڵام کە قێز لە خۆت دەکەیتەوە، لە هەموو کاتێکی تر هەست بە ناوەوەت دەکەیت و خۆتت خۆشدەوێت، کەچی ئەو کاتانەی قێز لە کەسانی تر دەکەیتەوە، لە هەموو کاتێکی تر زیاتر دەرەوەیان دەبینیت و ڕقت لێیان هەڵدەستێت.

ـ من لە تۆ تێناگەم ئامۆژن ئەوە دەڵێی چی..؟!

ـ دەڵێم سەیری جومانە شێت مەکە، با قێزی لێنەکەیتەوە.

ڕاستە ئەو وای پێ دەوت و ئەمیش گوێی لێدەگرت، بەڵام بە دەست خۆی نەبوو و نەیدەتوانی سەیری نەکات.. ئێجگار سەرنجیشی لە مەکینەی قیمەکەی دەستی دەدا و زیاتر بیری لەو دەکردەوە، کە تاقە مەکینە بوو لەبەر چاویا لە مردن نەچێت و بە بینینی ترس داینەگرێت.. ئەوسا لەجیاتی ئەوە، بیری لە پەیوەندیی نێوان مردن و قێزکردنەوە دەکردەوە و هەموو شتێکی تری بەلاوە دەنا.. خۆ هەرچەند سەری دەهێنا و دەبرد، هەستی نەدەکرد هیچ شتێک ئەوانە بە یەکەوە ببەستێتەوە و پەیوەندیی دۆستانە، یان دوژمنکارانەیان لە نێواندا بێت.. کەچی نەشیدەتوانی لە خەیاڵی خۆیدا بەدەری بنێت و بۆ هەتاهەتایە وازی لێبێنێت.. ئەو ڕۆژەی «جەمیلە»ی فەڕاش تەڵەمشکە ڕەشەکەی لە ژووری کتێبە کۆنەکانی ژێر

قـادرمـەکـە هێنایە دەرێ و لە نـاوەڕاسـتـی ڕاڕەوەکـەی دانـا، کـە لـە شـێـوەی قـەفـەز دروسـتـکـرابـوو و دەرگـایـەکـی سـپـیـی گـرنـج گـرنجـی وەکـوو پـەراسـووی بـنـیـادەمـی پێوەبوو.. ئەم سەیری مشکە زارەترەکەکەی دەکرد و لە جوولە و هەڵسوکەوتەکانی وردەبووەوە.. لەو تەلە سـوورەی دەڕوانـی و سـەری لێ دەبردە پێـشــەوە، کــە ســەرێکی بە دەرگـــاکـــە و ســەرەکـــەی تری بە پـارچە نـانـێـکـی ڕەشـی چەوورەوە بەسترابووەوە.. دەیزانی مشکەکە کاتێ دەمی لەو پارچە نانە داوە و ویستوویەتی بیخوات، دەرگاکە خێرا داخراوەتەوە و بۆ خۆی پێوەبووە.. پێوەبووە و وەکوو زۆر لە هاوتـوخـومـەکـانـی تـری کـاتـێ تـێـیـکـەوتـبـوون و بێ دەرەتان بووبوون، چاوەڕێیە دەوامی کچان تەواو بێت و هی کوڕان دەستپێبکات، بۆئەوەی لەناکاو بەرەڵلای بکەن و لە هەمـوو لایەکـەوە بە شـەق تێـیـکەون.. دوای تاوێک لەسـەر کـاشـیـە ڕەشوسپییەکاندا دەپلیشێتەوە و بەدەم زیکەیەکی زۆر کز، کە بەحاڵ دەبیسترێت و نابیسترێت، گیانی دەردەچێت.. ئەم جارێکیان چاوەڕێی کرد و بە چاوی خۆی ئەو بەزمـەی بینی.. دڵی تێکهـەڵات و ڕشـایەوەش.. بەڵام ئەو ڕۆژە دانی بە خـۆیدا گرت و دەیویست جوان جوان دیقەتی لێبدات.. هەستی دەکرد وا مشکەکە وردە وردە ترسەکەی گیانی کەمدەبێتەوە و خۆی ڕادەهێنێت.. دوایی لە پارچە نانەکە نزیککەوتەوە و کرت کرت کەوتە قرتاندنی.. هەرچەند ئەو ترسەکەی کەمدەبووەوە و چاکتر گازی لێدەگرت، ئەمیش بەو ئەندازەیە قێزەکەی کەمدەبووەوە و باشتر سەیری دەکرد.. ئەگەرچی وانەی «مێژووی عێراق و وڵاتانی دراوسێ»یان مابوو و دەشیزانی «ست ئەنفال» چەند توورە دەبێت، ئەگەر هەر لە خۆبەوە بەجێیبهێڵێت و پرس بەم نەکات.. دواییش ئامۆژنی، یان دایکی لێ تێدەگەیەنێت و ئەوەندەی تر قوڕەکەی بۆ خەستدەکاتەوە، کەچی گوێی نەدایە و جانتاکەی هەڵگرت.. کردیە شانی چەپی و بە لای کچانی پۆلەکەیدا ڕۆیشت، کە هێشتا سەیری مشکی ناو قەفەزەکەیان دەکرد و زلوونگەیان لەسەر دەدا.. دەیویست وەکوو زۆر نیوەڕۆی تر «جومانە شێت» ببینێت و لە نزیکەوە سەرنجی لێ بدات.. دواییش قیمەکە لەگەڵ خۆبدا بەرێت و لە ماڵەوە «شازە» بۆی بکات بە شفتە.. بەڵام ئەو ناوەی هەموو بۆ گەڕا و نەیبینی.. دوای نیوەڕۆ لەگەڵ مامی چوو بۆ ستۆدیۆ و لەوێش زۆر

چاوی بۆ گێڕا.. نەبوو و نەبوو.. ڕۆژی دواتر لە «جیهاد»ی پرسی و ئەو پێی وت، کەوا ماوەیەکە لەگەڵ کۆمەڵێ شێتی تری تازەدا بۆ شێتخانەیان بردوون و ناهێڵن بێتە دەرەوە.. ئەو جارەش، کە «تیپی هەڵبژێردراوی عێراق» چوون بۆ «تورکیا» و «سیامەند»یشیان وەکوو وێنەگر و وەرگێڕی زمان لەگەڵ خۆیاندا برد، «جیهاد» خوشکەکانی لای ئەوان بەجێهێشت و مانگێ لایان مانەوە؛ ئەم هەرچەند لێیان نزیکدەکەوتەوە و پرسیاری دایکیانی لێدەکردن، ئەوان ئەفەرۆزیان دەکرد و وەڵامیان نەدەدایەوە.. دوایی «شازە»، کە چمکی کراسە سپی و تەنکەکەی تا سەر ئەژنۆی هەڵکردبوو و بە سۆندە ڕەشەکە حەوشەی دەشت، دەمی هێنایە لای گوێچکەی ڕاستی و بە چپە پێی وت:

ـ باسی دایکیان لا مەکە، نەوەکا شەو هەستنەوە و بەدەم خەوەوە بڕۆن..!!

ئەم لە شوێنی خۆی ئەبلەق و سەرسام بوو و دەستی چەپی گرت بە سنگیەوە.. ئەویش ڕووی سۆندەکەی کردە قاچەکانی و ئاوی پیاداکردن، کە لە نەعلە ڕەشەکانی هەڵکێشابوون و پەنجەکانی وەکوو لەبزینە سپیەکانی سەر سینیە ڕەشەکەی «پوورە ڕوقیە»ی گەڕەکی «ئەعزەمیە» دەهاتنە بەر چاو، ئەوەی هەر جارێ دەچوون بۆ ماڵی «لوئەی» و بە لایدا تێدەپەڕین، بە کراسە سپیەکەیەوە پێشی لێدەگرتن و بە حەپەسانێکی ئێجگار سەیرەوە لەمی دەپرسی:

ـ ئەوە تۆی هەموو شەوێ دێیتە خەونی منەوە..؟!

ئەم سەرسامدەبوو و نەیدەزانی چ وەڵامێکی بداتەوە.. ئامۆژنیشی قاقای لێ دەدا و پێی دەوت:

ـ هەر ئەو ژنە لەبزینەفرۆشە لە هەقت دێت و دەتوانێت ئەم زمانە هارەت لە جووڵە بخات.

«شازە» ئەو جارەش قاپقاپە ڕەشەکانی کردبووە پێی و بە مەقەستە سپیەکە قژە ڕەش و درێژەکەی «خالیدە»ی دەبڕی، کاتێ «پوورە ڕوقیە» بە بەر دەرگادا ڕۆیشت و بانگی لەبزینەی کرد، ئەو بە دەستی چەپی شانە کلکڕەشەکەی کێشا بە دەسکی کورسیە قاچسپیەکەدا و وتی:

ـ ئەم ژنە چاکترین هونەرمەندە.. دەتوانێت بە پرسیارێکی زۆر سادە سەرسامت

بکات و دەمت بکات بە تەڵەی تەقییو.

«خالیدە»ش ئەو کاتەی بە سۆندە ڕەشەکە حەوشەکەی دەشت و بە گسکە سپیەکە پاشماوەی قژە بڕاوەکەی خۆی ڕادەمالی، لە چاوەکانی «شازە»ی ڕوانی و بە شێوەیەکی زۆر سەیر، کە زیاتر لەسەرزەنشت دەچوو و لەرەی دەنگی تەواو گۆڕابوو، پێی وت:

ـ هونەرمەند هەبێت، هەر تۆیت، دەتوانیت نەک بە پرسیارێ، بەڵکوو بە وشەیەک دەمی هەمووومان ببەستیت..!!

«شازە» ، کە ئەوسا لەسەر کورسیەکەی هەیوان دانیشتبوو و یاریی بە ملوانکە ڕەشەکەی ملی دەکرد، پێکەنی و بە گاڵتە پێی وت:

ـ ئاخر ئەمەیە ئیشی هونەرمەند، لەجیاتی درۆ، بە قسەی سەیر و سەمەرە خەڵک هەڵدەخەڵەتێنێت.

«نەوال» ، کە پێڵاوە ڕەشەکانی داکەندبوو و لەگەڵ «لوئەی»دا قاچیان دەخستە ئاوی حەوشەکەوە، دەیانکرد بە شڵپ و هووڕ و یەکتریان تەڕدەکرد، لەپڕ قاچی چەپی خستە سەر پەنجەکانی قاچی ڕاستی ئەو و پێی وت:

ـ خۆ دایکی تۆ نازانێت، وەکوو ئامۆژنی من قسە بکات..!!

«خالیدە» ڕووی سۆندەکەی تێکرد و بە گاڵتە پێی وت:

ـ کچێ تۆ بێ دەنگ بە، هەی لە ئامۆژنت قەحپەتر.

**«نەوال» سەری سۆندەکەی لە ئامۆژنی وەرگرت و هەر بە چپە لێی پرسی:**

ـ من لە تۆ تێناگەم ئامۆژن، بۆچی ئەگەر باسی دایکیان بکەم، شەو خەبەریان دەبێتەوە و بەدەم خەووەوە دەڕۆن..؟!

ـ چونکە خەفەت دەخۆن و خەون بە ماتماتیکەوە دەبینن.

سەری هەڵبڕی و هەر چواریانی بینی، بە ڕیز لە سەربان وەستابوون و سەریان لە پەرژینەکەوە شۆڕکردبووەوە.. بە دیقەت سەرنجی لێ دەدان و بیری لە قسەکانی ئامۆژنی دەکردەوە.. بیری لە پەیوەندیی نێوان ماتماتیک و خەفەتخواردن و بێداربوونەوە و ڕۆیشتن بەدەم خەووەوە دەکردەوە و ناو سەری گێژی دەخوارد.. هەستی دەکرد ئامۆژنی بە قەستیی وای پێ وت و ویستی ئاوا بە مەراقەوە

بیکوژێت، ئەگینا هیچ شتێ ئەمانە بە یەکەوە نابەستێتەوە و لەوەش بێماناتر نییە بنیادەم مێشکی خۆی بە مەسەلەی ئاوا هیچوپووچەوە خەریکبکات.. کەچی ئێوارە کاتێ هەر هەموویان سۆندەکەیان ڕاکێشایە سەربان و کۆنکرێتە داخبووەکەیان ڕشاند، بۆئەوەی فێنکبێتەوە و شەو جێگای لەسەر داخەن، ئەم سەیری قاچەکانی کردن و بە دیقەت لێیان وردبووەوە، کە بە ڕووتیی و چەند بلێیت بەناز لەسەر پلەکانی قادرمەیان دادەنان و هەر یەکەی شەش پەنجەیان پێوەبوو.. ئیتر حەپەسا و هەر لە خۆبەوە دڵی کەوتە ختوورە.. ئەم لەمەوپێش «باقر شەشپەنجە»ی بەڕێوەبەری دایەرەی «نفووس و سەرژمێری» و «عەدەویە»ی گامێشەوانی بینیبوو و زۆر زۆر خۆی بە بژاردنی پەنجەکانیانەوە خەریککردبوو.. لەگەڵ ئەوانەی خۆیانی بەراوردکردبوون و نەگەیشتبووە هیچ سەرەنجامێ.. ئەمەش خەتای «ویجدان» و «نیران» بوو و ئەوان فێری ئەو خووە پووچەیانکرد.. ئەو جارە «عەدەویە» بە کراسێکی ڕەشی سادەی ئەستوورەوە پشتی دابوو بە دیواری پێشەوەی قوتابخانە و مەنجەڵە بەتاڵەکەیشی خستبووە بەردەمی، کە ماست و سەرتوێژی پێ دەهێنایە گەڕەکی ماڵی باپیری و بە دەستی ڕاستی لە یەکە بە یەکەی دەرگاکانی دەدا.. لێی دەدان و پەنجە زیادەکەی بە شێوەیەکی جیا لەوانی تر لەسەریان هەڵدەپەڕی.. ئەم جانتا ڕەشەکەی خۆی کردە پشتی و بە «ویجدان»ی وت:

ـ بۆچی عەدەویە یانزدە پەنجەی هەیە..؟

ئەو پێکەنی و پێی وت:

ـ ئەو دەی هەیە، بەڵام ئێمە یانزدەمان هەیە.

ئەم تووڕەبوو و پێی وتن، کە ئەوان ناتوانن گاڵتەی پێبکەن و ئەم پێش ئەوەی لە قوتابخانەش وەربگیرێت، دایکی فێریکردووە پەنجەکانی خۆی بژێرێت و ناوی یەکە بەیەکەشیان دەزانێت، کەچی ئەو و خوشکەکەی خێرا چوون بۆ لای «عەدەویە» و دەستی ڕاستیان گرت.. گرتیان و لە سەرەوە بۆ خوارەوەی کەوتنە بژاردنی:

ـ تووتە دە.. براتووتە نۆ.. باڵابەرزە هەشت.. دۆشاومژە حەوت.. پەنجەگەورە

شەش.. ئەم زیادەیەش پێنج.

ئینجا دەستی چەپیان گرت و وتیان:

ـ ئەمەش پێنج.. بوو بە دە.

ئەم بە هەمان شێوە پەنجەکانی خۆی بژارد و بوون بە یانزدە.. پشتی تێکردن و بەدەم ڕێگاوە لێکیدەدانەوە.. کۆیدەکردنەوە و لێکیدەردەکردن.. لە خوارەوە بۆ سەرەوە و لە سەرەوە بۆ خوارەوە.. لە ڕاستەوە بۆ چەپ و لە چەپەوە بۆ ڕاست.. سەری دەخولایەوە و بەحاڵ بەر چاوی خۆی دەبینی.. ئەو جارەش «باقر شەشپەنجە»ی لەگەڵ سێ چوار پیاوی تر لە دووکانی باوکی بینی و بێشەرمانە لێی پرسی:

ـ تۆ دەزانی چەند پەنجەت هەیە..؟

هەر هەموویان قاقایان لێ دا و ئەم تەریقبووەوە.. کەچی «باقر» دوایی بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیری چاوەکانی کرد و پێی وت:

ـ هەموو جارێ لە باوکم دەپرسم: بۆچی ئەو ڕۆژەی لە دایک بووم بۆتان نەبڕیم..؟ ئەو پێم دەڵێ: بۆئەوەی لە بیرکارییدا چاک سەرتدەربچێت.

لە داخا ئەوێی بەجێهێشت و چوو بۆ دووکانی ماڵی «عەمار».. کارتۆنێکی سپیی چای هێنا و بە قەڵەمی ڕەش وێنەی هەر دوو دەستی «باقر»ی کەمێ لە دووری یەکتر کێشا.. ئەوەندی هێنان و بردن، تا دڵی تێکهەڵات و خەریکبوو بڕشێتەوە.. «عەمار» کارتۆنەکەی لێوەرگرت و خستیە سەر مێزەکەی بەردەمی.. وەک سەرلەشکرێکی لێزان بێت و سەیری نەخشەی شەڕبکات، ئاوا لێی ڕادەما و بیری لێیدەکردەوە.. جارێ پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی و جارێ هی چەپی بە بۆشاییەکەی ناوەڕاستیاندا دەهێنا و سەری بادەدا.. بەبێ ئەوەی سەرهەڵبڕێت و سەیری ئەم بکات، ئاخی هەڵدەکێشا وەکوو کەسێکی گەورە و تەواو دەیوت:

ـ ئێمە لێرە...... لێرە..... ڕێک لێرە.. بەڵێ، بەڵێ، لێرە..........

تەواوی نەدەکرد و ئەوەندەی تر ئەمی تووشی مەراقی بژاردنی پەنجەکان دەکرد.. شەوان هەر ئەوەندە دەچووە سەر جێگا و سەری دەخستە سەر سەرین، پەنجەکانی «عەدەویە» و «باقر»ی دەهێنایە بەر چاوی و تێکەڵ بە یەکتری

دەکردن.. جیایدەکردنەوە و تێکەڵی دەکردنەوە.. خەوی دەزڕا و خەیاڵی سەیر سەیری بۆ دەهات.. بەڵام خۆ ئەو کچانە لەوانیش سەیرتربوون و لەجیاتی دەستیان قاچیان شەش پەنجەی پێوەبوو.. ئەوان شتێکی تریشیان هەبوو و ئەمە ئەوەندەی تر سەری لێ تێکدابوو، پەنجە گەورەکانیان بەوانەی تەنیشتیانەوە نووسابوون و نەیدەزانی بە یەکێ حیسابیان بکات، یان بە دووان.. شەو پێش خەوتن لەسەر جێگا شەڕەسەرینیان دەکرد و حریتوهووڕیان دەگەیشتە ئەوسەری کۆڵان، ئەم لەپڕ سەری دەبردە پێشێ و لێی دەپرسین:

ـ ئێوە چەند پەنجەتان هەیە..؟!

ئەوان ماتدەبوون و سەری خۆیان دادەخست.. ئەمیش بۆ خۆی ئەوەندەی تر حەیران و سەراسیمە دەبوو و ناو سەری وەکوو ئەو گۆمە مەنگەی بەهارێکیان لە قەراغی شار بینی، بینی و بە دیاریەوە وەستا، کاتێ گامێشی سپیی پیاوە ڕەشپۆشەکان لەپڕ خۆیان هەڵدایە ناوی و بە شڵپوهووڕ جووڵەیان تێخست، ئاوا جووڵەی تێدەکەوت و دەورووژا.. ئەو شەوە لەسەرپشت و ڕوو لەو ئەستێرانەی لە قەتماغەی سووری سەر ڕووی ئاسمان دەچوون و بەردەوام چاویان لە یەکتر دەنووقاند، پاڵکەوت و لە خەیاڵی خۆیدا تاوتوێی دەکردن.. چاوەڕێشی دەکرد ئەوان هەستنەوە و بەدەم خەوەوە ئەم سەربان و ئەو سەربان ببڕن.. ئەویش هەنگاو بە هەنگاو دوایان بکەوێت و ورد ورد سەرنجیان لێ بدات.. لە نینۆکە سوور سوورەکانیان بڕوانێت و بچێتە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە، کە لەبەر تریفەی مانگەکەدا جوان جوان دەدرەوشێنەوە و دڵگیر دڵگیر پڕشنگدەدەن.. بەڵام ئەوان کفتببوون و چووبوونە خەوی قورس قورسەوە، بەبێ ئەوەی بزانن ئەم وا دەستەکانی لەملا و لەولاوە شل شل خستۆتە ژێر سەری و بە دیاریانەوە زەق زەق ئێشکی گرتووە.. چاوەکانی بوون بە دوو تەڵەمشک و خەو وەکوو مشکی زارەترەک ناوێرێت لێیان نزیکبکەوێتەوە.. هەر جارێکیش بە ترسەوە هەڵدەستێتەوە و لێکدا لێکدا لە سەربانەکان دەڕوانێت، بە چەند دارەمەیتێکی زل زلی دێنە بەر چاو و نووستووەکان بە مردوو دەزانێت.. ئەوسا بیری بۆ ئەوە دەچێت سەربان سەربان بگەڕێت و دانە دانە پەنجەی هەر هەموویان بقرتێنێت.. بە دەستی ڕاستی

لەوێچ لەوێچ بیانخاتە مەکینەی قیمەی مووبەقەکەوە و بە دەستی چەپی بە هێز بە هێز دەسکەکەی بابدات.. بەڵام ئەم خۆیشی مردووێکە وەکوو ئەوان و کاری ئاوای لە دەست نایەت.. شەمشەمەکوێرەکانیش جار جار زل زل، وەکوو دەنکەتەرزەی ڕەش ڕەش، لە بەرزایی ئاسمانە سوور سوورەکەوە، تیژ تیژ دەهاتنە خوارێ و بۆ ساتێ خەیاڵەکانیان پەرت پەرت دەکردەوە.. هەر خێرا خێرا کۆیدەکردنەوە و ئازا ئازا دەیخستنەوە کار.. دەیخستنەوە کار و ئەنجامیش هەر ئەنجام بوو.. بەیانی کە لە ژووری میوان، لەسەر دۆشەگە سپیەکە و لە بەرامبەر پانکە ڕەشەکەدا، بەدەم ئازارەوە خەبەری بووەوە و چاوەکانی کردەوە، ئەوان کز کز لەسەر کورسیەکانی ئەولایەوە دانیشتبوون و خەمناک خەمناک سەیری ئەویان دەکرد.. «دیلهام» هاتە لای و بە ئەسپایی دەستی چەپی خستە سەر ناوچەوانی.. سووک سووک بۆی شێلا و بە لەفزێکی منالانە پێی وت:

ـ ئێستا لە شەو باشتریت نەوالەکەی ڕۆحم.. تاکە بەریداویت.

«ریهام» پەرداخێکی شووشەی ڕەشی پڕئاوی هێنا و بە خوشکەکەی وت هەڵیستێنێت.. ئەم دەستی چەپی خستە ژێر ملی و کەمێ بەرزیکردەوە، ئەو کردی بە دەمیەوە و بە جووتە سەریان خستەوە سەر سەرینەکەی.. «ریهام» بە دیار سەریەوە دانیشت و بە دەنگێ، کە قوڵپی گریانێکی بەکوڵ ئابلۆقەی دابوو و بە زەحمەت لە قوڕگی دەردەچوو، پێی وت:

ـ بە سائەقەی ئەو دڵە پاکەت بم، تۆ بۆچی ئاوا لە خۆت دەکەیت..؟! بۆ..؟! تووخوا بۆ خوشکە بچکۆلەکەم..؟!

ئەم ئەوەندەی تر ئەبڵەقبوو و نەیدەزانی چی پێ بڵێت.. هەستیشی دەکرد ئامۆژنی شتێکی بەسەرهاتووە و لەمی دەشارنەوە، ئەگینا بۆچی دیارنییە و نە لە حەوشە و نە لە ژوورەکان دەنگی نایەت..؟! ئاخر ئەو چۆن دەتوانێت ماڵەکە بەجێبهێڵێت و بۆ ئەملا و ئەولا بچێت، لە کاتێکدا تاقە کچەکەی وا لە جێگادا کەوتووە و بەدەم ئازارەوە دەتلێتەوە..!! چەند هەوڵی دا و ویستی بانگی بکات، کەچی دەنگی دەرنەدەچوو و گیانی زیاتر دەکەوتە لەرزین.. دوایی کاتێ زەنگی تەلەفۆنە ڕەشەکەی سەر مێزە سپیەکە زەنگزەزەنگ زەزەنگ.. زەنگزەزەنگ

زەزەنگ لێی دا و «ئەنوار» بە دەستی چەپی هەڵیگرت، زانی ئەوە و لە خەستەخانەوە هەواڵی ئەم دەپرسێت.. «ئەنوار» لە چاوەکانی ئەمی دەڕوانی و بە شێوەیەکی ئێجگار سەیر قسەی لەگەڵ «شازە»دا دەکرد:

ـ .......؟!

ـ خەونەکانی یەکە بە یەکە بۆ گێڕاینەوە و ئێمەش بەکوڵ بەکوڵ بۆی گریاین.

ـ ........؟!

ـ ئێستا لەسەر پشت پاڵکەوتووە و کز کز لە بنمیچەکە دەڕوانێت.

ـ ........؟!

ـ هەر دەڵێ چاوەڕێیە خەونی تر، هی خۆی بێت، یان هی کەسێکی تر، وەکوو دڵۆپەبارانی ورد ورد لێیەوە تنۆک تنۆک بێنە خوارێ.

ـ ........؟!

ـ بۆ سەر چاوی بتکێن و تێکەڵ بە فرمێسکەکانی ببن.

ـ .......؟!

ـ دەسا هەر واشە، چونکە ئەم زمانی لە گۆکەوتووە و تەنها دەتوانێت خەونی پێبگێڕێتەوە.

«نەوال» مێشکی خۆی دەگوشی و چەندی دەکرد و دەکۆشا بیری نەدەکەوتەوە، کەی خەونی بۆ گێڕاونەتەوە و ئەوان چۆن بۆی گریاون..!! بەڵام دوایی کاتێ ئەو تەلەفۆنەکەی داخستەوە و بە زمانی ئینگلیزی خوشکەکانی تێگەیاند، کەوا «شازە» پێی وتووە بە هیچ شێوەیەک لای باس نەکەن شەو هەستاوەتەوە و بەدەم خەوەوە قسەی کردووە، ئیتر لە هەموو شتێ تێگەیشت و لە داخا کەوتە کرۆشتنی پەنجەکانی.. «دیلهام» و «ریهام» لەملا و لەولاوە دەستیان گرت و هەرچۆنێ بوو لە ژێر دانەکانیان دەرهێنان.. کەچی هێشتا بۆیان دابین نەدەبوو و خۆی لە دەستیان ڕادەپسکاند.. ئەم خۆی ڕادەپسکاند و ئەوان توندتر دەیانگرت.. هەناسەی تەنگدەبوو و ناو سەری زیاتر گێژی دەخوارد.. بەر چاوی تاریکدەبوو و بنمیچەکەی دەبینی وەکوو دەستاڕ دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە..

دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. دەخولایەوە و دەخولایەوە.. د.. ە.. خ.. و.. ل.. ا.. ی.. ە.. و.. ە.. و.. د.. ە.. خ.. و.. ل.. ا.. ی.. ە.. و.. ە..... کاتێ بە ئاگاهاتەوە و چاوەکانی کردەوە، کراسێکی سپیی تەنکیان کردبووە بەری و لەسەر دۆشەگی ناوەڕاستی چیمەنەکە پاڵیانخستبوو.. ئامۆژنی بە دیار سەریەوە دانیشتبوو و کتێبی «ڕێگاکانی خۆپاراستن لە سکپڕی»ی دەخوێندەوە.. دەیخوێندەوە و بەردەوامیش سەری لەگەڵدا دەلەقاندەوە.. «نەوار» کراسە شەترەنجیەکەی تا سەر ئەژنۆی هەڵکردبوو و چووبووە سەر کەپری مێوەکەوە.. ئەو گەڵایانەی وشکبوون و هەتاوی گەرمی تەمووز سووتاندبوونی، لە ژێر قاچەکانیا هەڵدەوەرین و خاو خاو دەکەوتنە سەر خۆڵە شێدارەکەوە.. پەرسیرەترێی سپیی لێدەکردەوە و دەیکردنە قاپە ڕەشەکەی دەستیەوە.. خوشکەکانیشی لە خوارەوە وەستابوون و سەیریان دەکرد.. بە پەیژە سپیەکەدا هاتە خوارێ و قاپەکەی بردە بەر بەلووعەکەوە.. ئاوێکی پیاداکرد و هێنایەوە.. هەر چواریان لەناو چیمەنەکەدا دانیشتن و لە بەردەمی خۆیانیان دانا.. ئەم ناودەمی دەبوو بە ئاودڕکەی لیک و تەزوو بە سەرتاپای گیانیدا دەهات، کاتێ ئەوان پەیتا پەیتا دەستیان بۆ درێژ دەکرد و دەنک دەنک دەیانخستە خوێی ناو ئەو خوێدانە ڕەشەی، کە لە شێوەی «قەڵای هەولێر» دروستکرابوو و وێنەی شتەکانی دەکرد بە دووانی ناشیرینی وەکوو یەک.. کاتێکیش سووک سووک لە زمانیان نزیکدەکردەوە و چاوەکانیان توند توند لەگەڵدا دەنووقاند، ئەم لە تاوا بەلەز بەلەز لێوی خوارەوەی دەخستە بەر دانەکانی سەرەوەی و بە هێز بە هێز گازی لێدەگرت.. «هەنار»، ئەو کچەکوردە هاروهاجەی لە پێشی پێشەوە دادەنیشت و جارێکیان لە ژێر زەنگە ڕەشە زلەکەی قوتابخانەی نووسیبوو: «داوی جاڵجاڵۆکە»، هەرکە مامۆستا پشتی تێدەکردن و لەسەر تەختەڕەش شتی دەنووسی، دەنکێ لەیمۆندۆزیی بەقەدەر نینۆکی پەنجەتووتەی خۆی، لە گیرفانی کراسە ڕەشەکەی دەردەهێنا و پیشانی ئەمانی دەدا.. دەیخستە سەر زمانی و سووک سووک پیایدا دەهێنا.. ئیتر ئەمان دەمیان

ئاویدەکرد و لە حەژمەتا بەلەز بەلەز پەنجەی دۆشاومژەیان دەخستە دەمیانەوە.. مژیان لێ دەدا و ئاگایان لە وانەکە نەدەما.. هەرکە دەمیان دەکردەوە و قسەیان دەکرد، ئاو بە لالێویاندا دەهاتە خوارێ و دەنگەکان بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە دەمیان دەردەچوون.. «نەوال» وشەکانی دەبینی وەکوو کەناریی لەسەر زمانی هەڵدەفڕین و خۆیان ڕادەوەشاند.. خۆیان ڕادەوەشاند و ئەو دەوروبەرەیان ئاوپرژێندەکرد.. هەموو پیتێکی «ڕ»یشی بەبێ ویست و وەکوو دەنکەپەرسیرەی مزری باخەکەی خۆیان قووتدەدایەوە و هەرچەندی دەکرد بۆی دەرنەدەچوو.. جارێکیان لەجیاتی «کرسی»، وتی «کسی» و پۆلەکە تێکڕا دایانە قاقای پێکەنین،، ڕۆژێ دوای ئەوەی سیستەرەکان هاتن و قوتابییەکانیان کوتا، زۆربەیان لەبەر ئازاری سەر شانیان نەهاتبوون و قوتابخانەکە چۆڵبووبوو، ئەم «هەنار» و «ئەرواح»ی بینی بە دزییەوە چوونە ژووری کتێبەکانی ژێر قادرمەکە و لێیان کەوتە گومانەوە.. دوای تاوێ بە ئەسپایی دەرگاکەی کردەوە و لە قافا گرتینی.. «هەنار» کراسەکەی «ئەرواح»ی هەڵکردبوو و دەنکێ لەیمۆندۆزیی گەورەی بە شەنتووزەکەیدا دەهێنا.. سووک سووک پیایدا دەهێنا و وردە وردە دەموچاویان سوورهەڵدەگەڕا.. ئەم تەزووی پیادا هات و خەریکبوو ببووڕێتەوە.. هاوکات زەنگەکە لێی دا و چوونەوە پۆل، بەڵام ئەم ئاگای لە دنیا نەمابوو و سیمای شتەکان بە تەواوی لەبەر چاویدا گۆڕابوون.. تا وانەکە تەواوبوو و هاتیشنە دەرەوە، بیری لەو دیمەنە دەکردەوە و لەگەڵیا گیانی زیاتر خاودەبۆوە.. لەبەر دەرگای قوتابخانەدا، ڕێک لەو شوێنەی جارێکیان سەگکوژە سپیپۆشەکان دەڵەسەگێکی ڕەشیان کوشت و لە خوێنا گەوزاندیان، گەوزاندیان و گوانە شۆڕ و لەجووڵەکەوتووەکەی وێنەی فیشەکدانی سەربازەکان هاتە بەر چاوی؛ گەنمەشامییێکی کوڵاوی لە پیاوە دەموچاوئاوڵاویە ڕەشپۆشەکە کڕی و ئەمسەر و ئەوسەری گرت بە دەستیەوە.. سووک سووک گازی لە دەنکە زۆر سپی و ئێجگار نەرم و کەمێ لینجەکانی دەگرت و پەیتا پەیتا لێیدەکردنەوە.. ورد ورد سەرنجی لە شوێنەکانیان دەدا و لێکدا لێکدا لێیان وردەبووە.. جارێ شوێنەواری بنکی لاپچینی ڕەش ڕەشی یاریکەرانی سەر خۆڵە وردە وردەکەی گۆڕەپانی یاریی

بیـردەکـەوتەوە و تۆپەکـە تەپتـەتەپ تەتەپ.. تەپتـەتەپ تەتەپ، دیوارەکـانی مێشکیان دەلەراندەوە.. جارێکیش ئەو پەڵەهەورە سپیە شێدار و کڵاوڕەشانەی دەهاتەوە یاد و خەیاڵەکانی دەنکەتەرزەی لاسارئاسای ئاسمانە ئێجگار ڕەشەکە تەقـتـەتەق تەتەق.. تەقـتـەتەق تەتەق، کـەلاوەی سـەریان دەکـوتا.. ئەو پەڵەهەورانەی، کە زوو زوو لە خەونەکانیا دەیدین و هەرگیز هەرگیز نەیدەزانی لە چ لایەکـەوە هاتوون.. هاتوون و لە بنمـیـچی ژوورەکـەیدا چین چین لەنگەریان گرتووە.. هەرچەند سەیری دەکردن و دیقەتی لێ دەدان، وەکوو ڕاهیبەکان دەهاتنە بەر چاوی و بە سـستـی، ئا.. ئا.. زۆر بە سـستـی و کـەمێ ترسەوە، دەسـتی بۆ درێژدەکـردن.. جـێی پەنجـەکـانی لەسـەر دەنەخـشـاندن و بۆبەی سـوور سـووری نینۆکەکانی لەسەریان بەجێدەمان.. دەبوون بە گۆڵاوی بچووک بچووکی خوێناویی و حـەزی دەکرد یەک بە دوای یەک بەسـەر قژ و دەمـوچاوی، شـان و ملیـدا هێـدی هێدی بتکێن.. بتکێن و تەزووی خۆش خۆش بە سەرتاپای گیانیدا بهێنن.. بەڵام نەدەتکان و وێنەی زەردەخـەنەی سـەر لێـوی زۆر جـوان و چەند بڵـێی ئاڵی کـوڕە هەرزەکـارەکـانی ئەم سـووچ و ئەو سـووچی قـوتابخـانەکـەیان دەدرەوشـانەوە.. نەدەتکان و وەکوو ئاخی قـووڵ قووڵ، وەکوو هەناسەی سارد سارد، وەکوو ئازاری برینی سـەخت سـەخت، وەکـوو هەنسـکی گـریانی بەکـوڵ بەکـوڵ، وەکـوو ئاوازی گـۆرانیی بەسـۆز بەسـۆز، وەکـوو شـڵـپـەی مـاچی گـەرم گـەرم، وەکـوو مـوچوڕکـەی خـۆشـیی گـیـان، وەکـوو خـورپەی شـادیی دڵ، خۆیان دەنواند.. نەدەتکان و وەکـوو ئەمـووسـتـیلەی دروومـانەکـەی ئامـۆژنی دەهاتنە بەر چاوی و وردتر سـەرنجی لێـدەدان، کـە جـارێکیـان لەناو چیـمـەنەکـەدا بینی پڕی کـرد لە خـوێنی پەنجـەی ئەسپێکوژەی دەستی چەپی و لەبەر تیشکی کەمێ بەتینی هەتاوی نیوەڕۆ ئێجگار دڵگیـرەکـەدا بریق و باق.. باق و بریق.. بریق و باق.. باق و بریقی دەدا.. باق و بریقی دەدا و وردە وردە لەبەر چاوی ئەمـدا گـەورە دەبوو.. گـەورەتر و گـەورەتر دەبوو.. گەورەتر دەبوو و دەکشا.. بە هەمـوو لایەکدا دەکشا و شێوەی جۆراوجۆری بە خـۆیەوەدەگـرت.. بوو بە پیـاڵە.. بە کـووپ.. بە قـاپ.. بە مـەنجـەڵ.. بە ئینجانەی گوڵ.. بە حەوزی ماسی.. دواجار بوو بە گۆماو و سەرەمێکوتەکان، کە

نەیزانی لە کوێوە هاتن و چۆن پەیدابوون، تیایدا کەوتنە جووڵەجووڵ.. کاتێکیش لەبەر چاوی ئەمدا قڵپیکردەوە و ڕشتی، بەقەدەر جەستەی زەڕنەقووتەی چۆلەکەیەک بەسەر چیمەنەکەدا پەرشبووەوە و سووری کرد، کە زستانی سەختی ئەو ساڵە وشکی کردبوو و ڕەنگوڕووی بە بەرەوە نەهێشتبوو.. چەند ڕۆژێ دواتر لێزمەبارانەکە شتی و بە ناخی زەویە نەرم و شلەکەیدا بردە خوارەوە.. هەر ئەو شەوەش لە خەونیا چوار جەنەڕاڵی باڵابەرز، دووانی ڕەشپۆش و دووانی سپیپۆش، ئەمان بە قەمەی دەسکسپی و ئەوان بە هی دەسکڕەش، شوێنەکەیان هەڵکۆڵی و پەتێکی درێژی ڕەشوسپییان تیادا دەرهێنا.. بە نۆرە دووانیان ئەمسەر و ئەوسەریان دەگرت و دووانەکەی تریان بازبازێنیان لەسەر دەکرد.. قالۆنچە ڕەشەکانیش بەردەوام لە ژێر جەزمە ڕەشوسپیەکانیاندا قرچقرچ ققرچ.. قرچقرچ ققرچ دەفلیقانەوە و قێزی ئەمیان دەکردەوە.. دڵیان تێکهەڵدەهێنا و ناوهەناویان سەراوگێر دەکرد.. کاتێکی زانی بەدەم هێڵنجدان و ڕشانەوەوە خەبەری بووەوە و لێفە سپیەکەی ڕاگێرا.. ئامۆژنی ڕاکێش ڕاکێش بردیە بەر بەلووعەی ژێر کەپری مێوەکە و مست مست ئاوی کرد بە دەموچاویا.. لەوێ زەق زەق سەیری ناو چیمەنەکەی دەکرد و ورد ورد چاوی بۆ جەنەڕاڵەکان دەگێرا.. «شازە» کاتێ هێنایەوە و بە لێفەیەکی تازە دایپۆشی، دەستی ڕاستی خستە سەر ناوچەوانی و پێی وت:

ـ تۆ بەدەم خەوەوە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی منت مژیوە و لێت بووە بە پەرسیرەترێ، بۆیە ڕشاویتەوە ڕۆحەکەم.

ویستی پێی بڵێت بە هەڵەداچووە و خەونێکی تری بینیوە، کەچی ئەو وەک بڵێیت لێی تێبگات و جوان جوان ناخی بخوێنێتەوە، ئەنگوستی خستە دەمیەوە و ئەم مژی لێ دا.. هەستی کرد بە ڕاستی تامی پەرسیرەترێی مزر دەدات و تەواو سەراسیمەبوو....

بەبێ ئەوەی سەر لەسەر سەرینەکەی هەڵبڕێت و چاو لە «دیلهام» و خوشکەکانی بتروکێنێت، دەستی ڕاستی درێژکرد و پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی ئامۆژنی لەسەر کتێبەکە هەڵگرت.. خستیە دەمیەوە و مژێکی قووڵی

لێدا.. یەکێکی قوولّتر و هەستی کرد تامی پەڕەی ئەو گوڵە سپیە دەدات، کە نەیدەزانی ناوی چییە و ئەو جارە لە شەتڵگاکەدا بینی، بینی و بەبێ ویست خستیە دەمیەوە.. بۆیە بە قایم گازێکی لێگرت و پێی وت:

ـ ئەوە قەحپە هەمدیس چوویت بۆ لای فەرید ئەعسەر..؟!

ئامۆژنی قاقایەکی بەرزی لێ دا و کتێبەکەی هەر بە کراوەیی خستە بەردەمی، کە گەیشتبووە ئەو شوێنەی بە ڕەشێکی تۆخ تۆخ وێنەی ئەندامی زاوزێی ئافرەتی لەسەر کێشرابوو و لە هەموو لایەکەوە بە هێڵی باریک باریکی سەربەکڵاو هێمای بۆ کرابوو.. بە پیتی ورد وردی وەکوو مێرووڵەی بچووک بچووک ناوی پارچەکانی نووسرابوون و خرابوونە نێوان لاکێشەی نارێک نارێکەوە.. هەرچەند چاوەکانیشی خێڵدەکرد و جوانتر لێی دەڕوانی، وەکوو کونی لووتی ئەو ئەسپە سپیەی دەهاتە بەر چاو و خەیاڵی لەگەڵیا سمکۆڵیدەکرد، کە ئەو جارە لەبەر دەرگای ڕەشی گۆڕستانێکدا بەر چاوی کەوت و بە دیاریەوە وەستا.. لەگەڵ هەناسەدانا دەکرایەوە و لەگەڵ وەرگرتنا کرژدەبوو.. دەکرایەوە و کرژدەبوو.. کرژدەبوو و دەکرایەوە.. ئامۆژنی وەک لێی تێبگات و نەهێڵێت خەیاڵی درووژاوی وەکوو منالێکی لاسار جامی زۆر گەورە و ئێجگار تەڵخی پەنجەرەی ژووری ئەو ڕووداوانە بەردبارانبکات، کە هەر خۆی دەزانێت بە وردوخاشبوونی چۆن پۆخڵەواتەکانی ناوی دەردەکەون و وەکوو جلی شۆراوی سەر تەناف بەدەم کزەبای ئاخی قووڵ قووڵ و حەسرەتە سارد سارد و تەزیوەکانیەوە دەلەرێنەوە، هێدی هێدی لە تەنیشتی پاڵکەوتوو و توند توند نووساندی بە خۆیەوە.. خۆش خۆش پێدەکەنی و پێی دەوت:

ـ ئۆخەی بە سائەقەت بم، ئەوا زمانت کرایەوە..!!

ـ هەستە لە تەنیشتم بۆنی تۆم پێناخۆشە.. هەستە شازە قەحپە.. شازە گاندەر.

هەرچەند خۆبشی لێ گێلدەکرد و پێی دەوت:

ـ وڕێنەی هیچ کەسێ وەکوو هی تۆ خۆش نییە نەوالەکەم..!!

ئەم ئەوەندەی تر پەستدەبوو و قەستی دەکرد توند توند دەستی لە بینەقاقای

گیربکات.. به هێز به هێز بیگوشێت و فلّق فلّق گیانی بۆگەنی لە کونی لووتیەوە دەربکات.. هەستی دەکرد بە منالّێکی دەبەنگی دەزانێت و دەیەوێت بەو قسە ساکارانە چاوبەستی بکات.. ئەو جارەش، کە گەڕانەوە مالّ و بە مامی وت، کەوا بە چاوی خۆی بینیوبەتی «فەرید ئەعسەر»ی خاوەنی ئەو شەتلّگایە، دوای ئەوەی تێر تێر دەمی خستۆتە ناو قڕی و پەیتا پەیتا هەلّیمژیوە، ئینجا سووک سووک دەستی ڕاستی کردۆتە ملیەوە و لێکدا لێکدا ڕوومەتی چەپی ماچکردووە، ئەو قاقای لێ دەدا و دەیوت:

ـ وەی خوایە ئەم کچەم نەمرێت و لەو قسە خۆشانەیم بێ بەش نەکەیت..!! ئای کە وڕێنەکانیم پێخۆشە..!!

«سیامەند»یش لەجیاتی ئەوەی گوێی لێبگرێت و بیەوێت لە بنجوبنەوانی مەسەلەکە تێبگات، گالّتەی پێدەکرد و دەیوت:

ـ بەیانی دەچم بۆ لای باقر شەشپەنجەی بەڕێوەبەری نفووس و سەرژمێری و هەموو مەلەفی ئەم شارە دەگەڕێم، بزانم ئەم ناوەیان تیایە..!! لەوێشەوە بۆ تاپۆ و سەیری نەخشە گەورەکە دەکەم، بەشکوو شوێنی ئاوا هەبێت و ئێمە نەمانزانی بێت..!!

ئەم لە داخا پەنجەکانی خۆی دەکرۆژت و پێی دەوت:

ـ تۆ سەگبابی.. خۆشم ناوێیت.. گالّتەم پێدەکیت و گوێ لە قسەم ناگریت..؟!

دەشیزانی مامی لەبەرئەوە بەو جنێوانە تووڕەنابێت و دارکاریی ناکات، چونکە بزمارێکی زل چووە بە بنی پێیدا و کوناودەری کردووە.. شوێنەکەی ئاوساوە و بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت لەسەر زەویی دایبنێت.. ئاخر هەر لەبەر ئەو بزمارەش بوو ڕێیان کەوتە لای ئەو پیاوە ڕەزاگرانە و مردنی بە چاوی خۆی بینی.. ئەمان هەرکە لە ستۆدیۆکەی «سیامەند»ەوە دەرچوون و بەرەو سەرەوە کەوتنەڕێ، گوایە ئامۆژنی بە بۆنەی دەرچوونی لە پۆلی چوارەوە بۆ پێنج دەیبات بۆ دووکانی «حەماد ئەشوەل»ی باوکی «لوئەی» و پیانۆی بۆ دەکڕێت.. لەو کاتەدا تیپێ سەرباز، نیوەیان ڕەشپۆش و نیوەیان سپیپۆش، ئەمان بە تەپلّی سپی و ئەوان بە بووقی

ڕەشەوە لەسەری شەقامەکەی ئەوسەر دەرکەوتن و بەرەو ڕوویان هاتن.. ورده ورده لێیان نزیکدەکەوتنەوە و تەپتەتەپ تەپتاپ.. تەپتەتەپ تەپتاپ، قاچیان دادەنا.. لەسەر هەمان ئاوازیش دەیانژەنی و دەیانکوتا.. ئەمیش سەیری دەکردن و بەبێ ویست، قاچەکانی هاوکات و هاوئاهەنگ لەگەڵ قاچی ئەواندا دەجووڵاند.. هەر ئەوەندەی زانی لەو شوێنەی «جومانە شێت»ی لێ دادەنیشت و گۆشتی لە مەکینە دەدا، چەپەیانی کەوتە سەر بزمارێکی سپیەوە و ژانی خستە دڵیەوە، کە کرابوو بە ناوقەدی تەختەدارێکی ڕەشەوە و نەیدەزانی لە کوێوە هاتووە.. هاتووە و قاچی و پێڵاوە ڕەشە هاوینیەکەی پێکەوە سمیوە.. کاتێ بە حاڵەحاڵ و بە گیانی پڕ ئازار و ژان لەسەر شۆستەکە دانیشت و ئامۆژنی بە هەر دوو دەست ڕایکێشا، سەری خولایەوە و ورده ورده بەر چاوی تاریکداهات.. دەنگی قاچ و تەپڵ و بووقەکەش بە جارێ لە گوێچکەیا تەپتەتەپ تەپتاپ.. تەپتەتەپ تەپتاپ، دەزرنگانەوە و وەکوو مشکێکی بچکۆلە و زارەترەک لەودیوی هەستە بە ئاگاکانی نغرۆیاندەکرد.. ئەوەی باوەڕی نەدەکرد و هەرگیز بە ئەقڵیا نەدەچوو، ئەوەبوو لە پەنا حەوزی ماسیی ناو ئەو شەتڵگایە چاوبکاتەوە و شتەکانی ئەودیوی ئاوا ترسناک ببینێت.. تەنانەت دەنگی «فەرید»یشی بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەبیست و قێزی لە قسەکانی دەکردەوە:

ـ دەمم دەخەمە ناو قژی ڕەش و درێژتەوە و بە چپە باسی تەمەنی کورتی تۆقە سپیەکانی بۆ دەکەم.. چیرۆکی بێکۆتایی بەسەرچوونی عەترە ساختەکانی بۆ دەگێڕمەوە و تاڵەکانی بە ئاوازی جۆللانەی مناڵە پایزییەکان ڕادەهێنم.. تۆ حەز دەکەیت بە زمانی تەزوو، یان هی شیلە بتدوێنم..؟! من پارێز لە وشە شێدارەکان دەکەم، لەوەتەی زمان بە قامیش و حەسیر، لە قەراغی دەریا و دوور لە ئاوەدانی کووخێکی پەڕپووتی پێکەوەناوە.

لە حەژمەتا دەستەکانی بەملا و بەولادا دەکوتا و لەپڕ ڕاستەیانی کەوتە سەر لاسکی گوڵێکی سپی، کە لە ئینجانەیەکی ڕەشدا ڕوواندبوویان و لەمەوپێش تەنها لە خەونەکانیدا بەر چاوی کەوتبوو.. چنگی لێگیرکرد و خونچە تازەپشکووتووەکەی لێکردەوە.. لەناو لەپیدا ژاکاندی و دواتر لە لووتی خۆی

نزیککردەوە.. هەڵیمژی و خستیە نێوان دانەکانی.. ئەگەرچی تام و بۆنێکی ئێجگار خۆشی هەبوو و هی ئەوە بوو ئینجانەکە لەگەڵ خۆبدا بەرێتەوە.. لەجیاتی کتێبەکانی لەسەر مێزی ژوورەکەیدا دایبنێت و لای ئەم و ئەو پێوەی بنازێت، بەڵام هەرچەند ئامۆژنی لە باوەشی خاوەنەکەیدا دەبینی و گوێی لە قسە ئێجگار ناخۆش و بێتامەکانیان دەبوو، قێزی لە گوڵ و لە وان و لە خۆی دەکردەوە و پڕ بە دڵ حەزی دەکرد بڕشێتەوە.. بڕشێتەوە و ئەو جامی حەوزی ماسیە سواغبدات، کە لەودیویەوە ژەهری بۆ دەگرنەوە و دەیکەن بە دەمیەوە، بەڵام ئاخ..!! پڕزەی لێ بڕابوو و لە ئاست هێڵنجدان و ڕشانەوەشدا دەستەوستان ببوو.. کاتێ هاتن و بە جلە سپیەکانیانەوە، لەملا و لەولای حەوزەکەوە وەستان، وەستان و دەستەکانیان بۆ یەکتر درێژکرد، ڕاستیان خستە ناو چەپ و چەپیان خستە ناو ڕاستەوە، ئەم وەکوو دوو کێل هاتنە بەر چاوی و خەریکبوو فیزاح بکات.. فیزاحی چی و حاڵی چی..؟! ئەم کوا دەیتوانی زمانی بجووڵێنێت و قسەی پێبکات..؟! ماسیە ڕەشە پەڕەکەسپیەکان و سپیە پەڕەکەڕەشەکانیش، هەر دەتوت قەڵەمی بۆیەن و کراون بە کونی پرگاڵەوە، بەردەوام دەخولانەوە و هێڵی بازنەییان پێکدەهێنا.. بازنەکان وردە وردە گەورەدەبوون و سووک سووک سنوورەکانیان تێکەڵ بە یەکتردەبوون.. ئەوسا دەگۆڕان و شێوەی تریان بە خۆیانەوە دەگرت.. جارێکی تر دەبوونەوە بە بازنە و خێراتر دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. دەخولانەوە و دەخولانەوە.. د.. ە.. خ.. و.. ل.. ا.. ن.. ە.. و.. ە.. و.. د.. ە.. خ.. و.. ل.. ا.. ن.. ە.. و.. ە.. کاتێکی زانی لەسەر کوشینی سپیی دواوەی ئۆتۆمۆبیلەکەی «فەرید» چاوی کردەوە و خێرا سەری هەڵبڕی.. ئامۆژنی بینی لە پێشەوە دانیشتبوو و ئانیشکی ڕووتی دەستی ڕاستی لە جامەکەوە دەرهێنابوو.. هێشووە پەرسیرەترێ سپیە نایلۆنەکەی بە پەتێکی ڕەش کرابوو بە بنمیچی سپیی ئۆتۆمۆبێلەکەوە و تا ناوەڕاستی جامی پێشەوە شۆڕکرابووەوە، بەردەوام ئەملا و

ئەولای دەکرد و ناودەمی ئەمی دەکرد بە ئاودرکەی لیک.......

«دیلهام» قاپە بەتاڵەکەی بردە بەر بەلووعەی ژێر کەپری مێوەکە و ئاوێکی پیاداکرد.. بردی بۆ مووبەق و هاتەوە.. بە دیار سەریەوە دانیشت و چاوی بڕیە چاوەکانیەوە.. خوشکەکانیشی هەر لە شوێنی خۆیانەوە سەیریان دەکرد و بە ڕوویەوە پێدەکەنین.. «شازە» کتێبەکەی هەڵگرت و دایخستەوە.. بۆ ژوورەوەی برد و هەر خێرا گەڕایەوە.. هەرکە دانەویەوە و دۆشەگە ڕەشەکەی خۆی ڕێکخستەوە، بەتریقی ملوانکەکەی لە نێوان هەر دوو مەمکیەوە شۆڕبووەوە و لەسەر چیمەنەکە کەوتە لەنجەولار، کە وشەی «BABY بەیبی»ی بە ڕەشی لەسەر سکی سپیی نووسرابوو و ئەم یەکەمجاری بوو دەیبینی.. دەیبینی و ئەوەندەی تر قینی لێی هەڵدەستا.. لە ڕاستییدا کەس نەبوو ئەوەندەی «سیامەند» ڕقی لە بەتریق بێت و بە شوومی بزانێت.. تەنانەت حەزی لەو ڕۆنەش نەدەکرد و هەرگیز نەیدەکڕی، کە وێنەی دوو بەتریقیان لەسەر تەنەکە لووسەکەیدا کێشابوو و بە سوورێکی تۆخ تۆخ لە ژێریان نووسی بوو: «PENGUIN OIL».. «ئەمجەد»ی خاڵیشی لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا باسی بەتریقی کردووە و تەنانەت بەرگی «بەتریق تەریقدەبێتەوە»ی بە چوار بەتریقی زل نەخشاندووە، کە دەنووکیان بە کراوەیی لە یەکتر نزیککردۆتەوە و بەدەم پێکەنینەوە تریقاونەتەوە.. ئەم هەرچەند چاوی خێڵدەکرد و سەیری دەکردن، شێوەیانی لێ دەگۆڕا و وەکوو شتی سەیر سەیر دەکەوتنە بەر دیدەی.. جارێ دەبوون بە چوار ڕاهیبەی داماو و دەستیان لەبەر خوای ئاسمانی دوورەدەست پاندەکردەوە.. دووعایان دەخوێند و دەکڕووزانەوە.. جارێکی تر دەبوون بە چوار سیستەری حەشەری و مەمکی یەکتریان هەڵدەگلۆفی.. مەست و بێ هۆش دەبوون و لە شوێنی خۆیان کپدەبوون.. بەڵام دواجار، کە دەبوون بە چوار کچی سەماکەری ئەفسانەیی و دەکەوتنە هەلەکەسەما، ئەم بەبێ ویست جلەکانی دادەکەنی و بە سووکی بۆ ئەملا و ئەولای هەڵدەدان.. لەسەر نەغمەی ئەو مۆسیقایەی، کە نەیدەزانی لە کوێوە دێت و خۆی دەکات بە کونی گوێچکەکانیدا، سووڕی دەدا و ئاگای لە دەوروبەرەکەی نەدەما.. ئەو ئێوارەیەی پەلکەزێڕینە هەناریەکە ئاسمانی کردبوو بە دوو لەتەوە و لە شێوەی

نالێکی ئێجگار گەورەی تازەدەرهاتووی ناو کوورەی جۆشدراو دەهاتە بەر چاوی، ئەوەندە بە هەڵپە لەو ژوورەی خۆیا بەدەم چەقەنەلێدانەوە هەڵبەزیبووەوە و قژە درێژەکەی بەملا و بەولادا ڕاوەشاندبوو، جەستەی ببوو بە هێلکەشەیتانۆکەیەکی زل و لەسەر زەوی خلیسکی دەبرد.. ئاواتی دەخواست ڕەوتی جۆگەیەک، زێیەک، ڕووبارێک، دەریاک، تۆ بڵێی هی زەریایەک، لە هەر لایەکەوە بێت قەیناکات و پێی ڕازییە، هەڵیگرێت و بۆ کوێی دەبات با بیبات.. دوای هەزارەها هەزار ڕۆچوون و سەرئاوکەوتنەوەی بێهوودەدا، شەپۆلێکی ناکاوی تەلیسماوی، ئەو شەپۆلەی نەورەسە سپیەکان و حاجی لەقلەقە ڕەشەکان پێی سەرسامن و هەمیشە لەسەر ناونانی دەبێت بە شەڕیان، لە شەوێکی تاریکونووتەکدا هەڵیداتە سەر لیتەی قەراغێکی دوور دووردا و لەناو پەڕەکەی کەوانەیی کلک و بڕبڕەی شانەیی پشتی ئەو ماسیانە خۆی بگرێتەوە، کە ڕاوچیە سپیپۆشەکان لەسەر چیلکەداری ڕەش ڕەشی وشک وشکدا بەدەم چەنەبازیەوە دەیانبرژێنن و پەیتا پەیتا شەرابی سووری تۆخ تۆخی بە دیارەوە هەڵدەقووڕێنن.. لەوێ گەریدەی کێشوەرێکی نەدۆزراوەی ڕەنگاوڕەنگ لەناو ئەو هەموو هێلکەشەیتانۆکە لەیەکچووەدا جیایبکاتەوە و بۆی دانەوێتەوە.. وەکوو سەدەفێکی سەیر و سەمەرە، سەدەفێک، کە هەرچی نهێنیی ڕەنگ و دەنگ هەیە تیادا پەنگی خواردووە و کەس ناتوانێت لێی تێبگات، هەڵیگرێت و بیباتەوە.. لە ژێر تریفەی ئێجگار سوور و زۆر زۆر دڵگیری مانگەشەودا قاوغەکەی بشکێنێت و ناواخنەکەی لە شێوەی پەلکەزێڕینەی بیستوچوارڕەنگدا دەربخات.. وەکوو سەگی ئاویی لەناو لیتەی خەیاڵەکانیدا گەوزی دەدا و ڕۆدەچوو، کاتێ دەستێ، کە نەیزانی هی کێ بوو و ئاخۆ چەپ بوو، یان ڕاست، قژی گرت.. گرتی و جەستەی کوتراوی پێ هەڵبڕی.. بە هێز بە هێز هەڵیبڕی و توند توند کێشای بە زەویدا.. هەڵیبڕی و پیایدا کێشایەوە.. هەڵیبڕی و پیایدا کێشایەوە.. دەستێکی تر و دووانی تر، لە پێنج پەنجە زیاتریان پێوەبوو و نینۆکەکانیان تیژ تیژ وەکوو نووکی پرگاڵی لووس لووس، تێیکەوتتن و لە چاوترووکانێکدا خاچی سوور و پەلکەزێڕینەی سوورتر لەوەی ئاسمانە بێگەردەکەیان لەسەر کێشا.. ئەوسا بەتریقەکان چوار ژنی «تپە

الاكراد» بوون و سنگیان بۆ دەکوتا.. قژیان بۆ دەڕنیەوە و بە زمانەکەی خۆبان شین و واوەیلایان بۆ دەکرد....

«دیلهام» بە دەستی ڕاستی پەنجەکانی قاچی چەپی و بە هی چەپی ئەوانەی ڕاستی گرت، کە پاژنەپێی لەسەر دۆشەگەکە دانابوون و هەستی بە خاوبوونەوەیان دەکرد.. کەمێ شێلاینی و پێی وت:

ـ بە سائەقەی ئەو قاچانەت بم نەوالەکەی دڵم، کە لە دوو بەتریقی ڕۆحسووک دەچن..!!

ـ قاچی من لە بەت(ر)یق دەچن..؟!

ـ بۆچی لە بەتریق جوانتر هەیە گیانەکەم..؟!

ـ قاچی من لە بەت(ر)یق ناچن و حەزیش ناکەم وام پێ بڵێیت.

ڕووی کردە ئامۆژنی و بە نازێکی خۆشەوە، وەکوو ئەو نازەی منالان، هەندێ جار گەورەش لە کاتی نەخۆشییدا دەیکەن و کەمێ ئاسوودەیان دەکات، پێی وت:

ـ با وام پێ نەڵێت، ئەگینا لێی توورەدەبم.

ئامۆژنی دەستی ڕاستی گرت بە بەتریقی ملوانکەکەی ملیەوە و بەدەم خێسەیەکەوە پێی وت:

ـ خۆت زمانت نییە..؟! بۆچی بە من دەڵێیت..؟!

ئەم دەستی کرد بە گریان و وتی:

ـ کوا من لە بەت(ر)یق دەچم..؟!

«دیلهام» لەولاوە تەریقبووەوە و سەری داخست.. هەر خێرا هەڵیبڕیەوە و وتی:

ـ من دەڵێم ئەمەنەی قاچت لە بەتریق دەچێت، نەک خۆت.

ئەمەی وت و هەستایە سەر پێ.. چوو لە ژوورەوە فلچە و بۆیەی هێنا و هاتەوە.. بەبێ ئەوەی بزانێت ڕازییە، یان نا، نایلۆنێکی ڕەشی لە ژێر قاچەکانی داخست و کەوتە بۆیەکردنیان.. ئەم هەستی بە فێنکبوونەوەی ناخی ناخی ڕۆحی دەکرد و تەزووێکی سەیر سەیری تێکەڵ بە ختووکەی پیادا دەهات، کاتێ ئەو سووک سووک سەری فلچە تەڕەکەی لێ دەخشاند و جار جار بە ئەنقەست

دەیخستە کەلێنی پەنجەکانیەوە.. بەر و پشتی پێی تا قولاپەپێی ڕەش و سپی کرد و سەر و قردێلەی قوتابخانەی لە ناوەڕاستیان بەست.. ئاوێنەکەی لە بەرامبەریان دانا و پێی وت:

ـ نەموت قاچەکانت لە بەتریق دەچن..؟!

ئەم هەستی دەکرد بە ڕاستی بوون بە دوو بەتریق و لە جەستەی جیابوونەتەوە.. بە لەنجەولار ئەمسەر و ئەوسەری باخەکە و دواتر هی حەوشەکەیان تەیدەکرد و بە دەنووکە پانەکەیان گەڵای درەخت و لاسکی گوڵەکانیان هەڵدەلووشی، کە هەر لە پایەدری پایسکیل دەچوون و دەنگێکی وەکوو پرخەپرخی قورگی پیاوی پیری خەوخۆشیان لێ دەردەچوو.. لە بەردەرگای ئازووقەدا، ڕێک لەو شوێنەی جارێکیان دایکی و ئامۆژنی قازە سپیەکەیان ئاوەڕووتدەکرد و برەبڕی پرێمزە نەوتیەکە بە «حشرجە.. حشرجە.. حشرجە.. حشرجە»«١٢» لە گوێچکەیا دەزرنگایەوە، مێیەکەیان بە سووکی و زۆر لەپڕ خۆی لەگەڵ زەویەکەدا جووتکرد و نێرەکە پیایداتسی.. هاوکات دوو پشیلەی زل، ڕەشێکی کلکسپی و سپییێکی کلکڕەش لە قادرمەکەوە دابەزین و پەلاماریان دان.. بە گازی تیژ و چڕنووکی زۆر تیژتر تێیانکەوتن و خەڵتانی خوێنیان کردن.. هەرچەند ئەم هاواری دەکرد و دەیوت:

ـ قاچەکانم بوون بە دوو بەت(ر)یقی کێوی و پشیلەی ماڵیی خواردیانن.

ئەوان تێکڕا قاقایان لێ دەدا و توند توند دەستیان دەگرت بە سکی خۆیانەوە.. ئەوەندەی تر شپرزەیان دەکرد و ترس و بیمیان دەخستە دڵیەوە.. دواتریش کە نەیزانی کەی هێنابوویان بۆ حەمامەکە و چۆن ڕووتیانکردبووەوە، دوو جۆگەلەی ڕەش و دووانی سپیی دەبینی و ورد ورد سەرنجی لێ دەدان، لەم قاچ و لەو قاچییەوە سەرچاوەیان دەگرت و بەرەو کونەکەوە ڕێچکەیان دەبەست، کە شێوەیەکی بازنەیی هەبوو و بە پارچە هێڵەگێکی سوور گرتبوویان.. کاتێ جۆگەلەکان بە خوڕ لێیاندەدا و بە زەحمەت پیایدادەچوون، دەنگێکی سەیری لێ بەرز دەبووەوە و لە گوێچکەی ئەمدا بە: «شلیخ.. شلیخ.. شلیخ.. شلیخ»«١٣» دەزرنگایەوە.. ئەوسا بەبێ ویست دەستی بۆ سنگی ئەوان درێژدەکرد و پێی دەوتن:

ـ مەمكی ئێوە لە بەت(ر)یق دەچێت.
ئەوان دەتریقانەوە و دەیانوت:
ـ ئەوە چی لەم كاتەیا بەتریقی بیری تۆ خستەوە..؟!
لەمەوە كردیان بە یارییەكی خۆش و تا جلەكانیشیان لەبەركرد، ئەم پێی دەوتن و ئەوان پێیدەكەنین.. شەویش لە سەربان كردیان بە بەزمی خۆیان و هەر نەیانبڕیەوە.. «شازە» لێیان تووڕەبوو و پێی وتن:
ـ بەسە وازبێنن.. دەنگتان دەگاتە ئەوسەری گەڕەك.
ئینجا بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی «نەوال»ی گرت و ڕاكێشایە سەر دۆشەگە سپیەكەی تەنیشت خۆیەوە.. بە سووكی قژی ڕاكێشا و بە دەنگی نزم پێی وت:
ـ بێ دەنگ بە ئیتر..!!
بە توولە تەنكەكەش قاچە ڕووتەكانی تا سەر ئەژنۆی داپۆشی و بە گلەییەوە پێی وت:
ـ دەبێ هەر جارێ نەخۆشیی بتخات، ئاوا بە كۆمەڵێ قسەی قۆڕەوە بۆم هەستیتەوە..؟!
ئەم هەر خێرا دەستی ڕاستی خستە نێوان مەمكەكانی ئەوەوە و بە نازێكەوە پێی وت:
ـ كوا ملوانكە تازەكەت، كە بەت(ر)یقەكەی پێوەبوو..؟!
ـ ئەوە من ئێستا چییم پێ وتی نەوال..!! بنوو دەی.. ئیتر نامەوێت گوێم لەو قسە بێتامانەت بێت.
هەرچەند چاوەكانی لێكدەنا و خەو دەیبردەوە، كەنیسەیەكی سپیی گەورەی بەسەر كەشتیەكی ڕەشی گەورەترەوە دەبینی و دڵی دادەخورپا، كە وردە وردە لە كەناری دەریاكەوە نزیكدەبووەوە و قەشەكان خەمناك خەمناك لەبەر دەرگا ساجە بە پەڕەسێلكە نەخشاوەكەیدا وەستابوون.. هەر دوو دوویان لە یەكتر دەچوون و بە موو نەیدەتوانی جیایانبكاتەوە.. پەڵەهەورە ڕەشەكانی ئاسمانە بەرزەكەش سات نا سات سكیان دەدا و تا ئاستی قوبە و زەنگوڵەكەی شۆڕدەبوونەوە.. وەكوو

مانگای کێوی شالاویان دەهێنا و لەپڕ گۆپکە زۆر سپی و ئێجگار گەورەکانیان وێنەی دومەڵی گەییو دەتەقینەوە.. دەتەقینەوە و دڵۆپەئاوی سەیر سەیری وەک دەنکە پەرسیرەترێی ئاڵ و بۆڵیان لێ دەڕژا، کە هەرگیز هەرگیز لە باران نەدەچوون و بە شێوەی کەوانەیی دەهاتنە خوارێ.. کاتێکیش بەر دیوار و پایەکانی دەکەوتن و شاقووڵیانە هەڵدەبەزینەوە، دەنگێکی نامۆیان لێ بەرزدەبووەوە و لە گوێچکەی ئەمدا بە «قهقهە.. قهقهە.. قهقهە.. قهقهە»«١٤» دەزرنگانەوە.. ئەم و ئامۆژنی لە پەنا دیواری کووخە پەڕپووتەکانەوە وەستابوون و دۆشیان دابردبووەوە، ئەوانەی بە تەنەکەی ڕۆنی بەتریق درووستیان کردبوون و منالە کلاوڕەشەکان لە سەربانەکانیان بە دانی فیل مۆسیاقایێکی دڵفڕێنیان دەژەنی.. هەر کاتێکی دەزانی بەتریقەکان سەر ڕووی تەنەکەکانیان بەجێدەهێشت و لۆژ لۆژ بەناو کێڵگەی جۆکەدا ملیان دەنا.. لاسکە سپی سپیەکان لە ژێر قاچە ڕەش ڕەشەکانیاندا ڕەهێڵدەبوون و دەنکە ڕەشەکانیان بە دەنووکی سپییان هەڵدەلووشی.. بەرەو کەناری دەریاکە دەچوون و پێشیان لە قەشەکان دەگرتەوە، کە جووت جووت بە سستی دادەبەزین و بێزەوقانە قاچە داهێزراوەکانیان لەسەر وشکاییەکە دادەنا.. ئەو قاچانەی لە پێلاوی چەرمی وەک سپلی ئاژەلی خورافییان هەڵکێشابوون و پڕبووبوون لە ئاو.. لەگەڵ هەنگاوناندا دەیانکرد بە فلْقوهووڕ و ئەم بە «غطغطە..غطغطە.. غطغطە.. غطغطە»«١٥» دەهاتە گوێچکەیەوە.. تەمومژێکی چڕی سپی، ئێجگار ئێجگار سپی، لەوەدەچوو لە کلاوڕۆژنەی لاکێشەیی مووبەق و دووکەڵکێشی ستوونیی ژووری چیرۆکە ئەفسانە لەبیرکراوەکان هاتبێتە دەرێ و بۆنی لینجاوی ناو هێلکەشەیتانۆکە فلیقاوەکان و شوێنەواری گۆمە وشکبووەکانی بەر هەتاوی گەرم گەرمی تەمووزی «بەغا»ی لێدەهات، لەپڕ هەموو شتێکی دادەپۆشی و لە چاوی ئەمانی دەشاردەوە.. کاتێکیش دەڕەویەوە و نەدەما، زەوی لە شێوەی ئیشاعەیەکی زلی ڕەش دەردەکەوت و خانووەکان وێنەی پەراسووە بەیەکاچووەکان دەهاتنە بەر چاو.. تاوێ دواتر لەسەر ڕووی تەنەکەکان لەجیاتی بەتریق، جووتێ قەشەی لەیەکچووی دەبینی و لە ترسا گیانی دەکەوتە لەرزین، کە مات و مەلوول وەستابوون و بە

دەستی ڕاستیان قیبلەنومای شکاوی سپی و بە هی چەپیان دووپشکی بزێوی ڕەشیان گرتبوو.. هەرچەند چاوەکانیشی دوور و نزیک ڕەوانەدەکرد و بە هەر چوار لای خۆیدا دەیڕوانی، نە دەریای دەبینی و نە کەشتی.. بیابانێکی چۆڵ و هۆڵ و بێدەنگ و بێچرپە و کۆمەڵێ کوخی بەتاڵی وەک قەڵەمدادەری زلی لەیەکچوو.. خۆی دەخستە باوەشی ئامۆژنی و فیزاحی دەکرد.. هەرکە لەگەڵ دەنگی خۆی بە ئاگا دەهاتەوە و بە ترسەوە چاوەکانی دەکردەوە، کچانی دەبینی جووت جووت چووبوونە باوەشی یەکتر و لەبەر تیشکی ڕۆشەن ڕۆشەنی گڵۆپی شیریی ستوونی کارەبای کۆڵاندا قژی ڕەش ڕەشیان جوان جوان دەبریسکایەوە.. ئەوسا زەحمەت بوو بتوانێت «دیلهام» لە «ریهام» و «ئەنوار» لە «نەوار» و خۆبشی لە خەونە ڕۆحبەرەکەی جیابکاتەوە و ئەوەندەی تر ترسی لەیەکچوونی شتەکان زیفیان لێ دەسەند.. خەیاڵەکانی وەکوو پۆلە پەڕەسێلکەی سەر دارتەل و وردەماسیە ڕەنگاوڕەنگەکانی ناو حەوزە لاکێشەییەکەی شەتڵگای «فەرید» تێکدەقژقژان و بۆ ماوەیەک خەویان دەزڕاند.. بیری لە «جومانە شێت» دەکردەوە و سیمای دزێو و ترسناکی لە بەردەمی قوتدەبووەوە، کە بە دوو سک، هەر چواریانی بووە و لە کاتی سکپڕییدا بێزووی بە گۆشتی برژاوی شەمشەمەکوێرەوە کردووە.. دڵی تێکهەڵدەهات و هێڵنجی دەدا.. قێزی لە کچەکانی دەکردەوە و باوەڕی نەدەکرد تا ئەوان لەم ماڵەدا بن، بتوانێت دەم بۆ هیچ خواردنێ، خۆش و ناخۆش بەرێت و ناچارە بڕواتەوە لای دایکی.. بڕواتەوە و لە هەموو ژیانیا ڕووی تێنەکاتەوە، کەچی بەیانی کاتێ چاوەکانی کردەوە و خۆی لە نێوان «ئەنوار» و «نەوار»دا بینی، ئەمیان دەستی ڕاستی و ئەویان هی چەپی گرتبوو و لەسەر سنگی خۆبانیان دانابوون.. خوشکەکانیشیان دابەزیبوونە خوارەوە و کەمانجەیان دەژەنی.. دەیانژەنی و ئاوازێکی ئێجگار خەمناکیان پێ دەردەکرد، ئیتر بەزەیی پیاداهاتنەوە و دەستی کرد بە گریان.. هەر ئەو گریانەش بوو هەموو شتێکی لە دڵا شتەوە و وایلێکرد بە ڕاستیی هۆگریان ببێت.. پڕبەدڵ حەزی دەکرد مامی و «جیهاد» درەنگ بێنەوە و ئەوان ماوەیەکی زیاتر لایان بمێننەوە.. هەستی دەکرد ئیتر بەبێ ئەوان ناژی و بە ڕۆیشتنیان ماڵەکە ڕووناکیی تیادا نامێنێت.. هەرچەند دەچووە

لای ئامۆژنی و پێی دەوت:

ـ تووخوا ئامۆژنە ڕۆحەکەم، با ئیتر هەر لەگەڵ ئێمەدا بژین.

ئەو لێی تووڕەدەبوو و پێی دەوت:

ـ لەوە زیاتر چەنەبازیی نەکەیت..!!

کەچی دواتر هەر بە تەگبیری «شازە» خانووەکەی «ئیمداد شەکرچی»ی دراوسێیانیان کڕی و دەرگایەکی بچکۆلەی ڕەشوسپییان کردە دیوارەکەی نێوانیانەوە.. بوون بە یەک خێزان و زۆربەی کاتی ژیانیان بە یەکەوە بەسەردەبرد.. لەمەوە ئەوەندەی تر پشتی کردە دایکی و ئەوان و ئەگەر مامی و ئامۆژنی نەبوونایە هەر نەدەچووەوە.. کچان زوو زوو لەگەڵ خۆبانیان دەبرد بۆ «پەیمانگای هونەرە جوانەکان» و لای ئەم و ئەو خۆیان پێوە دەنواند.. «دیلهام» و «ریهام» حەزیان دەکرد لە دوارۆژدا وەکوو ئەوان بەشی مۆسیقا هەڵبژێرێت و «ئەنوار» و «نەوار»یش بۆ بەشی تەمسیل هانیان دەدا.. کاتێ «شازە» بە تەواوی ئەقڵی لە دەست دا و شێتبوو.. شێتبوو و کردیانە ژوورە تاریکەکەی ئازووقەوە، هەر جارێ دەکەوتە کرۆشتنی پەنجەی دۆشاومژە و بالابەرزەی دەستی چەپی و دەیکرد بە قریشکوهووڕ، «دیلهام» و «ریهام» لەبەر پەنجەرە چوارگۆشەکەی کەمانجەیان بۆ دەژەنی و کپیاندەکردەوە.. هەر ئەوساش «ئەنوار» و «نەوار» بەبێ ترس دەرگاکەیان دەکردەوە و خواردنیان بۆ دەبردە ژوورەوە.. هەرچی «نەوال» بوو قێزی لێیدەکردەوە و نەیدەتوانی بە هیچ شێوەیەک سەیری بکات.. تەنانەت بێزی نەدەهات ئەو قاپانەش دەست لێبدات و بیانشوات، کە بۆ ئەویان تەرخانکردبوون و وێنەی سەرەمێکوتەی ورد وردیان بە سەرەوەبوو.. ئەو جارەش، کە «دیلهام» تێکەڵ بە حاجەتەکانی تری کردن و خستینیە بەر بەلووعەکەوە، بۆئەوەی ئەم بیانشوات و دواتریش لەسەر کاوەنتەرە ڕەشەکەی مووبەقیان دابنێت، کردی بە شاتەشات و پێی وت:

ـ بۆچی تێکەڵ بەوانەی خۆمانیان دەکەیت، نازانی من قێزیان لێدەکەمەوە..؟!

ئەو چاوی چووە پشتی سەری و دەستی ڕاستی نایە قژیەوە.. لەولاشەوە «ریهام» هات و بە دەستی چەپی دەستی ڕاستی ڕاکێشا.. لە دەرگای حەوشەیان

ئاودیوکرد و بە جنێو شتیان:

ـ قەحپەی بۆگەن.. سپڵەی ناکەسبەچە.

ـ تف لە خۆت و لە دڵی.... بڵێم لە دڵی چییت..؟! تۆ کوا دڵت هەیە..!! ئاخر تۆ........

پشتی کردە دەرگاکە و هەر بە جلی ماڵەوە تێیقوچاند.. هەرکە گەیشتە سەری کۆڵان و پێچی کردەوە، گوێی لە دەنگی «سیامەند» بوو و بە تووڕەیی ئاوڕی دایەوە.. بە دەستێ بیجامەی ڕەش و جووتێ نەعلی سپییەوە دەهات و هانکەهانکی پێکەوتبوو:

ـ وەرە نەوال گیان بۆ کوێ دەچییت..؟!

ـ دەچم بۆ دۆزەخ.. تۆ هەقی منت نییە.

ـ بە قوربانی چاوەکانت بم، تۆ بۆچی ئاوا لە خۆت دەکەیت..؟!

ـ تۆ ئەگەر خەمی منت بووایە، ئەڵبەتە نەتدەهێشت ئاوا سووک و ڕیسوا بکرێم.

ـ وەرە گوڵم بگەڕێرەوە.. تا من مابم کەس حەددی نییە لە گوڵ کاڵترت پێ بڵێت.

ـ چەند جارم پێ وتووی، ئەو شێتە بەرە بۆ شێتخانە، من قێزی لێدەکەمەوە، کەچی هەر بە خەیاڵیشتا نایەت.

ـ دە تۆ ئەمجارە بە قسەی مامی خۆت بکە، بزانین چۆن دەبێت..!! تووخوا هەر ئەمجارە نەوالەکەی ڕۆحم....

خۆی بۆ نەگیرا و لەناو ئەو کۆڵانە دایە پرمەی گریان.. «نەوال» لەو بە کوڵتر دەستی پێکرد و خۆی خستە باوەشیەوە.. بە دەستی چەپی دەستی ڕاستی گرت و بەرەو ماڵەوەی بردەوە.. کە پێیان خستە حەوشەوە و بەرەو ژوورەکەوە ملیان نا، «جیهاد» و خوشکەکانی چاویان پڕیبوو لە فرمێسک و بەجێیان هێشتن.. کاتێ دەرگاکەی نێوانیانیان داخستەوە و چوونە ئەودیو، گوێی لە پرمەی گریانی «دیلهام» و «ریهام» بوو و ئەوەندەی تر ناخی هەڵقرچاوی ورووژا.. جێگاکەی بۆ داخست و خۆیشی لە تەنیشتی پاڵکەوت.. دەستی چەپی کردە ملیەوە و توند

توند گوشی بە خۆیەوە.. هەستی دەکرد منالێکە و بێ نازکەوتووە.. ئەوسا بیری لە «شاناز»ی خوشکی «شازە» دەکردەوە و دەیهێنایە بەر چاوی خۆی، کە کتومت لەو دەچێت و دەشێ جێگاکەی بگرێتەوە، بەڵام نەیدەوێرا بیدات بە گوێچکەیدا و قەناعەتی پێبکات.. چونکە لە لایەک ئامۆژنی هێشتا بەسەر دنیاوە ماوە و لە لایەکی تر زۆر ڕقیان لەیەکە.. دەیویست هەموو ئەقڵی خۆی بخاتەکار و پیلان بۆ بە یەکگەیشتیان دابنێت.. هەستی دەکرد مەحاڵە بەبێ خۆشەویستیی ئامۆژنی بژیت و زەحمەتە ئەو ڕۆژگارە لە بیر خۆی بەرێتەوە، کە لەگەڵیا بەسەری برد و لە هەموو کەسێ چاکتر لێی تێدەگەیشت.. حەزی دەکرد یان چاکبێتەوە و وەکوو جارانی لێبێتەوە، هەرچەند نازانێت دوای ئەوە قێزی لێدەکاتەوە و هەر بە پیسی دەزانێت، یان نا.. یاخوود چی زووترە بمرێت و بە تەواوی چاوی لەم دنیایە ئاوابێت.. هەندێ جار بیری لەوە دەکردەوە بچێتە ژوورەکەی و هەر دوو دەستی بخاتە سەر دەمیەوە، تا گیانی لە کونی لووتیەوە دەردەچێت و ملی لاردەبێتەوە، کەچی لەوە دەترسا دوای مردنی سیمای لاشەکەی لەبەر چاویا لانەچێت و بەردەوام قێزی لێبکاتەوە.. ئەوەشی لێبووبوو بە مەراق و حەزی دەکرد تێیبگات، ئاخۆ ئەو دوای ئەوەی ئەقڵی لە دەست داوە و لەو ژوورە تاریکەدا قۆڵی چەپیان بە زنجیری سپی بەستۆتەوە، ئەم دەناسێتەوە و هەر وەکوو جاران خۆشیدەوێت..؟! توند توند سەری دەنووسێنێت بە سنگی خۆیەوە و فرمێسکی ورد وردی بۆ دەڕێژێت..؟! دەستی چەپی، کە زنجیر شەتەکی داوە و بە زەحمەت دەتوانێت بیجووڵێنێت، دەیخاتە ناو قژی و بە پەنجەکانی تاڵەکانی لوولدەکات..؟! وەکوو جاران گۆرانیی بۆ دەڵێت و دەیهێنێتە گریانی بە کوڵ..؟! بەڵام ئاخ لەترسی قێزکردنەوە نەیدەتوانی پاڵێ بەو دەرگایەوە بنێت و بە جارێ هەموو ئەو نهێنیانە ئاشکرا بکات.. ئەوسا بە تەنیا لە کونجی ژوورەوە سەری دەخستە سەر ئەژنۆکانی و زۆر بە بێدەنگیی دەگریا.. نەیدەویست «دیلهام» و خوشکەکانی پێی بزانن و بە پرسیارەکانیان هەراسانی بکەن.. تەنانەت لەو کاتەدا حەزی نەدەکرد دڵنەوایی بدەنەوە و پێی بڵێن:

ـ خوشکە بچکۆلە ئازیزەکەمان، بەس ئاوا لە خۆت بکە.. هەر ڕۆژێکە و

ئامۆژنت چاکدەبێتەوە.

یان سەری بخەنە سەر سنگی خۆیان و بە قورگی پڕ لە گریانەوە پێی بڵێن:

ـ ئێمە پشت و پەناتین و جێگای ئامۆژنت بۆ دەگرینەوە.

ئەم لە «شاناز» بەولاوە باوەڕی بە هیچ کەسێکی تر نەبوو جێگای «شازە»ی بۆ بگرێتەوە و لە دڵیا بچەسپێنێت ڕۆژگاری ئەو بەسەرنەچووە.. بەردەوامە و درێژەی هەیە.. کاتێکیش هەستی کرد دایکی و «سیامەند» یەکتریان خۆشدەوێت و خەریکی پیلانی بە یەکگەیشتنن، بە هەموو شێوەیەک لێی هەڵدەوەشاندنەوە و دەبووە ڕێگر لە بەردەمیان.. هەر ئەوەندەش ئەو هاتە خوازبێنیی و دایکی ڕازیبیبوو، بە جارێ شێت و هاربوو و ئەمسەر و ئەوسەری دنیای لێهاتەوە یەک.. بۆ بەیانیەکەی خێرا خۆی گەیاندە ستۆدیۆکەی و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ دەست لە دایکم هەڵدەگریت باشە، ئەگینا بۆ شوێنێ سەر هەڵدەگرم، لە هەموو ژیانتانا نەمدۆزنەوە.

«سیامەند» سەری خستە سەر قۆڵی چەپی خۆیەوە و بە قورگی پڕ لە گریانەوە پێی وت:

ـ تەواو ڕۆحەکەم.. ئیتر جارێکی تر قسەی وا لە من نابیستیتەوە.

دڵی پڕبوو و نەیویست لەبەر چاوی ئەودا بگری.. پشتی تێکرد و تا ژوورەکەی خۆی نەوەستا.. لەوێ سەری خستە سەر پیانۆکەی و تەقیەوە.. کەچی لەپڕ و خۆیشی نەیزانی بۆچی بێ دەنگ بوو و وای هەستکرد، کە «سیامەند» دڵی چووە بە یەکێ لە خوشکەکانی «جیهاد» و بۆیە ئاوا بە ئاسانی لەو بڕیارەی پەشێمانبووەوە.. بیری لە «دیلهام» کردەوە و دڵی داخورپا، کە زیاد لە پێویست خۆی لێ نزیکدەکاتەوە و بە شێوەیەک هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات، ئەم هیچ حەزی لێناکات و بە دەستی بێت سەری لە ملی جیابکاتەوە.. خۆ ئەو گاڵتانەی «سیامەند»یش هەمیشە لەگەڵیدا دەکات و جاری وا هەیە دەگاتە ئاستی دەستبازییش، ئەم هەر لە سەرەتاوە بە دڵی نەبووە و چەند بڵێی پێی قارس دەبێت.. ئەو جارەش، کە لە حەمامەکە هاتە دەرەوە و بە خاولیە سپیەکە قژە ڕەشەکەی وشکدەکردەوە، کاتێ «دیلهام»ی بینی لە ژووری ئازووقەکەدا دەهاتە

دەرێ و لەگەنێکی ڕەشی پڕ برنجی بە دەستەوەبوو، ڕووی تێکرد و هەر لە خۆبەوە لێی پرسی:

ـ تۆ دەزانی زەڕافە چۆن ئاو لە ڕووبار دەخواتەوە..؟!

ئەو قاقایەکی بەرزی لێ دا و بە خۆتەسککردنەوەیەکەوە وتی:

ـ چووزانم سیامەند، خۆ لە دارستانا گەورە نەبووم..!!

ـ حەزدەکەیت من پێت بڵێم..؟!

ـ ئەی بۆ حەزناکەم..!!

ـ قاچەکانی پێشەوەی بڵاودەکاتەوە و ملیشی درێژدەکات.. دەمی تێدەخات و بە زمانە سوورەکەی دەیکات بە شڵپوهووڕ.

ئاوای دەوت و لەگەڵیا تەمسیلی جووڵەکانی زەرافەی دەکرد.. ئەویش لە پێکەنینا سووورهەڵگەڕابوو و ئارەقیکردبووەوە.. هەرچەند بەبێ ویست دادەنەویەوە و ئەوەندەی نەدەما لەگەنەکەی لە دەست بکەوێتە خوار، مەمکەکانی وەکوو دوو بەتریق لە یاخەی کراسە تەنکەکەیدا سەریان دەردەهێنا و لە هەوادا دەکەوتنە لەنجەولار.. هەستی دەکرد ئەو قسانە مانای ژێرەوەیان هەیە و بە خۆڕایی ناوترێن.. ئەم ئەگەرچی لە قۆناغی ناوەندییە و لە لای خەڵک بە زۆرزان ناسراوە، بەڵام لێیان تێناگات و سەر لە لوغزەکانیان دەرناکات، بۆیە ئەوەندەی تر پەست و نیگەران دەبوو و ڕقی لێیان هەڵدەستا.. هەر کەمێ پێشتریش، کاتێ جلەکانی ئەوی لە باوەڵە شەترەنجیەکە دەرهێنا و لەگەڵیا چوو بۆ حەمامەکە، تا پشتی بشوات و ئەو گۆرانییەی بۆ بڵێت، کە هەر لە منالییەوە بۆی وتووە و ئەو حەزی لێدەکات، «دیلهام» لە دەرگاکەی نێوانیاندا وەستابوو و لچی لێ هەڵقورتاند.. دواییش دەستی ڕاستی گرت بە دەسکەکەیەوە و لەبەر خۆبەوە وتی:

ـ وەکوو کەمتیاری سپی خانووەکەی لێ ڕووخاند و وەکوو سەگی ڕەشیش پاسی کونەپەپووی کەلاوەکەی دەکات.

سەری لەسەر ئەو پیانۆیە هەڵنەدەبڕی و وردە وردە بە هەموو قسە و باسەکانیاندا دەچووەوە.. هەڵسوکەوتەکانیانی دەهێنایە بەر چاوی خۆی و جوان جوان لێکیدەدانەوە.. دواجار بڕیاری دا شتومەکەکانی کۆکاتەوە و بچێت بە

ئێجگاری لەوێ بژیت.. وریا وریا چاوەکانی بکاتەوە و ورد ورد سەرنج لە هەموو جووڵە و ڕەفتارێکیان بدات.. ئەو دەرگایەی نێوانیشیان، کە لە هەموو شتێ زیاتر پێی پەستبووە و هەمیشە کاری ئەوان ئاسان دەکات، تەگبیرێکی لێبکات و بە هەر شێوەیەک بێت قەناعەت بە مامی بکات، تا زووە وەستا و کرێکار بێنێت و دایخات.. سووک سووک ئەو پەیوەندیەی نێوانیان کزبکات و دواجار بە تەواوی بیبرێت.. کەچی هەرچەند دەرفەتی دەهێنا و ئەو باسەی لەگەڵدا دەکردەوە، ئەو دەیکرد بە گاڵتە و خۆی لێ دەدزیەوە.. بەیانیانیش، کە دەیخستنە ناو ئۆتۆمۆبیلەکەی و ئەمی بۆ قوتابخانە و ئەوانی بۆ پەیمانگا دەبرد، ڕازیی نەدەبوو لە پێشدا ئەم بگەیەنێت و دوایی ئەوان، ئەگەرچی قوتابخانەکەی ئەم لەسەر ڕێگای خۆبان بوو و دەشیزانی فریاناکەوێت.. هەموو جارێ مامۆستاکانی لێی تووڕەدەبوون و زۆر جاریش نەیاندەکردە ژوورەوە.. دایکی لەبەر چاوی کچان تۆپەڵێ جنێوی سووکی پێ دەدا و تەریقیدەکردەوە.. ئەو جارەش دەمی بردە بن گوێچکەی ڕاستی و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ هەموو ئەو قەحپانەی وەکوو تۆ وان، کاتێ ئاوسدەبن، خەویان قورسدەبێت و درەنگ خەبەریان دەبێتەوە.

هەمیشە خەیاڵی دەڕۆیشت و ئاگای لە وانەکە نەدەما.. لەوە دەترسا بە دزیی ئەمەوە یەکتر ببینن و کۆتایی بە هەموو شتێ بێنن.. هەر کاتێ دەزانێت دەستی لە بنی هەمانەکە دەرچووە و ئەوەی بۆی ماوەتەوە هەر ئاخ و ئۆف و پەنجەکرۆشتنە.. زۆر جار قوتابخانەی بەجێدەهێشت و دەگەڕایەوە ماڵ.. بە سووکی کلیلە زیویە شێوە سەرەمێکوتەییەکەی دەکرد بە کونی کێلۆنە ڕەشە هێلکەشەیتانۆکەییەکەدا و سووکتر بایدەدا.. لەسەر نووکی پێی خۆی دەکرد بە ژوورا و دەیویست لە قافا بیانگرێت.. دوای ئەوەی جوان جوان ماڵەکەی دەپشکنی و نەیدەبینین، ئینجا گورج گورج دەچوو بۆ ستۆدیۆ و سەرشێتانە دەرگاکەی ناوەوەی دەکردەوە.. چاوی بە کون و کەلەبەری ئەو ژوورە کەمێ تاریکەدا دەگێڕا و هیچیشی نەدەوت.. مامی وەک بڵێیت ناخی بخوێنێتەوە و بزانێت بە چ مەبەستێ هاتووە بۆ لای، بزەیەکی دەخستە سەر لێوی و بە دەنگێکی کز پێی دەوت:

ـ باشبوو هاتیت نەوالەکەی ڕۆحم، چونکە لە بەیانییەوە کەسێکم نەدیوە، کەمێ دڵم پێی خۆشبێت.

ئەو جارە چاوی بڕیە چاوەکانییەوە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەری بۆ لەقاندەوە.. هەناسەیەکی هەڵکێشا و زۆڵانە و بە تەوسەوە پێی وت:

ـ وامەڵێ.. وامەڵێ، چونکە هەموو بەیانیەک چوار کەسی ڕۆحسووک دەبینیت و بۆ خۆت تێر تێر پێدەکەنیت.

هەستی کرد پێی ناخۆشبوو و لە تاوا لێوی خوارەوەی خستە ژێر دانەکانی سەرەوەی.. سەری خۆی لەبەر نا و کەوتە هەڵکێشانی ئاخی قووڵ قووڵ.. لەمەوە وازی هێنا گاڵتەوگەپیان لەگەڵدا بکات و بە ئارەزووی خۆی، بەبێ ئەوەی گوێ بە هیچ شتێ بدات لە قسە و باسەکانیان هەڵبداتێ.. بەیانیە باراناویەکە «دیلهام» لە دواوە بە دەستی چەپی سووک سووک لە شانی ڕاستی «سیامەند»ی دەدا و بە ناز بە ناز پێی دەوت:

ـ ئەوە چییە سیامەند..!! کوا قسە خۆشەکانت..؟!

«نەوال» لەپڕ و زۆر بە ڕقەوە ئاوڕی دایەوە و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ ئەو پارەیەی داوتە، هەر ئەوەندەی پێدێت، کە بیستت دادەکەم.

ئەو تەریقبووەوە و سەری داخست.. «سیامەند» پیایدا هەڵشاخا و پێی وت:

ـ تۆ چەنە مەیە خوێڕی.. ئەم دەمدرێژیەت لە چییە..؟!

هەرکە ئەوانیشی لەبەر دەرگای پەیمانگا دانا و لە فولکەکەی ئەولا پێچی کردەوە، سەیرێکی کرد و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ خەتای منە، هەموو شتێکت بە قسە دەکەم پیسی بۆگەن.

ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و ئەمەشی بۆ زیاد کرد:

ـ چ دڵێکی قرچۆک و کرمێت پێوەیە..!!

ئەم وەکوو منداڵ لچی هەڵهێنایەوە و لە پرمەی گریانی دا.. سەری خستە سەر دەشبۆلەکە و بەدەم هەنسکی بەسەریەکەوە دەلەقیەوە.. ئەویش لەجیاتی ئەوەی دڵنەوایی بکات و ژیری بکاتەوە، زیاتر دەنگی لێ هەڵدەبڕی و زۆر دڵڕەقانە پێی دەوت:

ـ دەگریت، ناگریت، چاوت دەرێ.. خۆ منت کوشت.. ڕۆحت دەرهێنام.

ئەوە یەکەمجاری بوو دوای مردنی «شازە» لێی تووڕەبێت و ئاوا بیگریەنێت.. بە هەموو شێوەیەک دڵی ڕادەگرت و چاوی لە هەڵەکانی دەپۆشی.. تەنانەت لابەردایی لەو ڕەفتارانەیشی دەکرد و گوێی پێنەدەدان، کە جاران لەسەریان سەرزەنشتی کردبوو و زۆر کەڕەت تەریقیشی کردبووەوە.. ئەمە زیاتر وایلێکرد هەست بکات شتێ لە ئارادایە و بە خۆڕایی نییە ئاوا لەسەر ئەو کچەتیوە عەیار و زۆرزانە هەڵدەداتێ.. تا ئەو کاتەی گەیاندیە بەر دەرگای قوتابخانە و ستۆپیشی کرد، ئەم هەر بەکوڵ بەکوڵ دەگریا و فرمێسکی ورد وردی هەڵدەڕشت.. «نێرگز» لە ڕاڕەوەکە بەرەو ڕووی هات و لێی پرسی:

ـ ئەوە چییتە نەوال..؟! بۆچی دەگری چاوەکەم..؟!

بە ڕقەوە سەیرێکی کرد و پیایدا هەڵشاخا:

ـ تۆ هەقت بەسەر منەوە چییە..؟!

ئەم حەزی دەکرد کوێر بێت و «نێرگز» نەبینێت، یان هیچ نەبێت ئەو دەنگە بلّحەی نەبیستێت و پێی هەراسان نەبێت، کە هەر لە دەنگی «دیلهام» دەچێت و قوتابخانە و ماڵی لێکردووە بە یەک.. بۆ نەگبەتییش زیرەکترین قوتابیی پۆلەکەیە و دەنگی بەسەر هەموو دەنگەکانی تردا زاڵە.. هەرچەند ئەم دەیەوێت خۆی لێ دوورخاتەوە و قسەی لەگەڵدا نەکات، ئەو ئەوەندە زیاتر خۆی لێ نزیکدەکاتەوە و وەکوو تووتکی ماڵیی دەوروخولی دەدات.. لە ماڵەوەش وازی لێناهێنێت و هەر زوو زوو دێت بە شوێنیا.. بە زۆر دەیبات بۆ ماڵی خۆیان و تا درەنگیش ناهێڵێت بێتەوە.. «سیامەند»یش هەمیشە هانی دەدات بچێت و لەگەڵیا سەعیی بکات.. هەرچەندیش لەوێ بمێنێتەوە و دەنگی ببڕێت، پێی ناخۆش نییە و ناچێت بە شوێنیا.. «بەڵام نا، نا، مەسەلەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە و گومان هەڵناگرێت.. دەیەوێت پاڵم پێوەبنێت و ماڵەکەی بۆ چۆڵ بێت.. ئەوا ئەم بەیانییە هەموو شتێکم بۆ دەرکەوت و پێویست ناکات چیتر خۆم بخەڵەتێنم».. سووک سووک بەرەو پۆلەکەی دەچوو و بیری دەکردەوە.. بیری دەکردەوە و ئاخی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا.. ئەو ڕۆژە خۆی لە کەس نەدەگەیاند و

وەڵامی پرسیارەکانیشی نەدەدانەوە.. نەشیدەویست دایکی ئاوا بە خەمناکی ببینێت و وەکوو هەموو جارێکی تر بە گوێچکەیا بچرپێنێت:

ـ ها..!! ژنی بەسەر هێنایت..؟!

«ست وەردە»ی «مێژووی عێراقی نوێ»یش، کە دوای ئەوەی «ست هالە»ی پووری لە جەژنی گۆڕهەڵکان لەبەر دەرگا سپی و زەبەلاحەکەی «نفووس و سەرژمێری»دا گڕی لە خۆی و لە منالە نۆ مانگیەکەی سکی بەردابوو و جەستەیان بووبوو بە قەرەبرووت، بۆ شوێنەکەی ئەویان هێنابوو و هەمیشە قژی لە شێوەی دارلاستیک دەکرد بە پرچ؛ لە هەموو کەسێ چاکتر هەستی بە گۆڕانەکانی ڕەنگوڕووی دەکرد و بە ئاشکرا بوایە، یان بە دزیی، پێی دەوت.. بە زمانە لووسەکەی ناچاری دەکرد هەموو نهێنیەکانی ناو دڵی بۆ باسکات و وردەچەوی ناخی ناخی بخاتە بەر چاوی.. ئەو ڕۆژە دوا وانە هی ئەو بوو و نەیوێرا بچێتە ژوورەوە.. جانتا ڕەشەکەی هەڵگرت و کردیە شانی چەپیەوە، کە «ریهام» بە بۆنەی بوونی بە پۆلی دوو، پێشکەشی کردبوو و بە زەنگیانەی شیریی لەسەری نووسیبوو: «نهێنیی ئاشکرا شاراوەکان و ئاشکرای نهێنییە دیارەکان».. دەیویست بچێت بۆ ستۆدیۆ و تەواوی مەسەلەکان لەگەڵ «سیامەند»دا ببڕێنێتەوە.. ناچاری بکات هەموو شتێکی بە ڕاشکاوی پێ بڵێت و لەو دڵەڕاوکێیە دەربازی بکات، کەوا خەریکە وەکوو نووکی پرگال لە دڵیا دەچەقێت و بازنەی خوێناویی بچووک و بچووکتر، گەورە و گەورەتری لەسەر دەکێشێت.. بەڵام کاتێ گەیشت و وێنەی بووک و زاوایەکی لەسەر مێزەکەی بەردەمی بینی، داچڵەکی و دەستی ڕاستی گرت بە سنگیەوە.. سەری خولایەوە و چاوی کەوتە ڕەشکەوپێشکە.. «سیامەند» هەستی پێکرد و باوەشی بۆ کردەوە.. هێنای لەسەر کورسیەکەی تەنیشتی داینا و بە هێمنیی پێی وت:

ـ چییتە نەوال..؟! بۆچی ئاوا شپرزە بوویت چاوەکەم..؟!

کە ئەم نەیتوانی دەم هەڵبێنێتەوە و وەڵامی بداتەوە، ئەو بە دەستی چەپی پەرداخێ ئاوی کرد بە دەمیەوە و پێی وت:

ـ خەفەت لەوە دەخۆیت، کە لێمان شاردبوویتەوە..؟!

هەر خۆبشی ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و پێی وت:

ـ دایکت ئاوای پێ باشبوو ڕۆحەکەم.. دایکت ئاوای پێ باشبوو.

بە سستی دەستی چەپی بۆ وێنەکە درێژکرد و لە چاوی خۆی نزیککردەوە، کە قۆڵی ڕاست و چەپیان لە یەکتر هەڵکێشاوە و بزەیەکی سەیریان خستۆتە سەر لێویانەوە.. لە پرمەی گریانی دا و فرمێسکی داباراندە سەری.. چاوەکانی لێ نەدەترووکاند و دەیوت:

ـ ئاخ..!! کاژی مارە ڕەشەکان لە کوێن..؟! لە کوێ..؟! بتانکەم بە کفنی خۆم.. ئێوە کەی دێن..؟! کەی..؟! شەیتانە سپیپۆشەکان، لە گۆڕی منالییما دەمنێژن..!!

ئەمە قسەی ئامۆژنی بوو و هەر لەسەر ئاوازی ئەویش دەیوتەوە.. کاتێ دەگەیشتە تینی و بەرگەی خەمەکانی نەدەگرت، کە وەکوو حاڵەتی بێنوێژبی لەپڕ یەخە و دامێنیان دەگرت و دەیانتلەواندەوە، دەستی چەپی بە سنگی و هی ڕاستی بە چاوەکانیەوە دەگرت و وای دەوت.. بەڵام ئەم ئێستا ڕاست و چەپی خۆی بۆ لە یەکتر جیاناکرێتەوە و شتەکان ناو و مانای خۆبان لە دەست داوە.. ڕەنگی ڕەش و سپی و سوور.. هی کاڵ و تۆخ.. هی سادە و تێکەڵاو... دەنگی بەرز و نزم.. هی ساز و ناساز... گریان و قاقالێدان.. بزە و فرمێسک، قێزکردنەوە و دڵتێکهەڵاتن، هێڵنجدان و ڕشانەوە، تەزوو و موچوڕک، بەزەیی و ڕق، شانازی و تەریقبوونەوە... شتی لووس و هی زبر... ژمارەی تاک و جووت.. هی سادە و ئاڵۆز... شێوەی چوارگۆشەیی و لاکێشەیی و بازنەیی و تەشیلەیی و لوولەیی.. هی خڕ و هی پان.. هی وەکوو سەرەمێکوتە و هێلکەشەیتانۆکە.. هەر هەموویان بەقەدەر یەک هیچوپووچن و بە موو جیاوازییان لە نێواندا نەماوە.. «فەرهەنگێکی تازە بۆ وشە سواوەکان»یش، کە بەتەمابوو بینووسێت و سەرلەبەر مانای هەر هەموو شتەکان بگۆڕێت، خەیاڵپڵاوبوو و تەواو بەسەرچوو.. ئەوەتا تاقە خوشکەکەی شووی کردووە و ئەم وا بە ڕێکەوت دەیزانێت.. «فوئاد»، کە هەمیشە سەرسامیی خۆی بەرامبەری نیشاندەدا و بە بینینی شاگەشکە دەبوو، دەنگی ئەوی لە دەنگی هەموو گۆرانیبێژانی تری دنیا بەلاوە خۆشتربوو و هەر زوو

زوو پێی دەوت:

ـ من چەند بەختەوەرم، کە تۆ دەبیت بە ژنخوشکم و لە شاییەکەمدا بەو دەنگە خۆشەت گۆرانییم بۆ دەڵێیت..!!

وا لە باوەشی خوشکەکەیدا پاڵکەوتووە و ئەمی هەر لە بیرنەماوە.. ئاخ..!! کەس حیسابی بۆ ناکات و بە بنیادەمی نازانێت.. هاکە «سیامەند»یش پشتی تێکرد و بەلاوەی نا.. هاکە ماڵەکەی خستە دەست ئەو کچەتیوە جانانەیە و ئەمی وەکوو شێت لەو ژووورە تاریکەی ئازووقەدا بەستەوە.. خۆ بەوەنابێت وا لەسەر ئەو کورسیە ڕەشە خەمناک خەمناک دانیشتووە و بەکوڵ بەکوڵ بۆی دەگریت.. فرمێسکی ورد وردی بۆ دەڕێژێت و تنۆک تنۆک دایاندەبارێنێتە ناولەپی دەستەکانی.. جا کێ دەڵێت ئەو شین و واوەیلایە بۆ ئەمە و بۆ کەسێکی تر نییە..؟! تەواو.. تەواو.. هەموو شتێ بەسەرچوو و وەکوو ئامۆژنی هەموو جارێ دەیوت:

ـ گۆمەکە لەبەر هەتاوی گەرم وشکی کرد و سەرەمێکوتەکان خنکان.

ئەوسا بیری دەکردەوە و دەیهێنایە بەر چاوی، کە چۆن ئەو لەشە ئێجگار لووسەیان، لە پێشا بە گوڕ لەسەر شوێنەواری گۆمەکە دەجووڵێنەوە و دوایی وردە وردە سست دەبن.. تا بە تەواوی خپدەبن و حاجی لەقلەقەکان دانە دانە هەڵیاندەلووشن.. بەڵام ئێستا بێجگە لە مردنی خۆی هیچی تر ناهێنێتە بەر چاوی و بە پێویستیشی نازانێت بیر لەم شت و لەو شت بکاتەوە.. ئەم بۆ ئەوە هەبوو و دەژیا، تا جیاوازیی نێوان شتەکان بدۆزێتەوە و ئەنجام بزانێت خۆی چیە..؟! لە چی دەچێت و لە چی جیایە..؟! کە شتەکان هەموویان لە یەکتربچن و بە موو جیاوازییان نەبێت، چاوەڕێی چییە و بۆچی دەژی..؟! ئا ئەوەتا یەکێ لە دەستەکانی، گرنگ نییە بزانێت کامیانە و کام پەنجەیانی بەکاربهێنێت، بۆ زنجیری گیرفانی جانتاکەی درێژدەکات و بە سووکی دەیکاتەوە.. پرگاڵە سپیەکە لە قوتووە ڕەشە لووسەکە دەردەهێنێت و بەرزیدەکاتەوە.. دەیکات بە سەرگۆی دڵیا و کۆتایی بە هەموو شتێ دەهێنێت.. ئا ئەوەتا خوێنێکی زۆر دزێو و چەند بڵێیت سارد فیچقە دەکات و بێزەوقانە بەسەر کراسە ڕەشەکەی قوتابخانەیدا ڕێچکە

دەبەستێت.. سووک سووک لەشی دادەهێزرێت و وردە وردە ئاگای لە دنیا دەبڕێت.. ئێستا لەو ئاوێنەیەی بەرامبەریدا خۆی وەکوو تارماییی کونەپەپوویەکی سووری زامدار و ژووری ستۆدیۆکە لە شێوەی کەلاوە دەبینێت و تامی گڵی شێداری ژێر نمەنمی بارانی ئێوارەی پایزی درەنگوەختی کەمێ لێڵی «بەغا» دەچێژێت، کە لە منالّیی ژنێکی سپیپۆشی «بابلشێخ» بۆ چارەسەرکردنی بالووکەی ورد وردی پەنجە باریک باریکەکانی دەستی چەپی لە قەراغی شار هێنابووی و تۆزقاڵ تۆزقاڵ خستبوویە سەر زمانی.. هەست دەکات بۆریی هەناسەی پڕیبووە لە گڵمتەخۆڵی ئەشکەوتە کەمێ تاریکەکانی ناو کتێبی «مێژووی عێراقی کۆن» و بۆ هەتاهەتایە لە جووڵەی دەخەن.... بەڵام کاتێ لەسەر دۆشەگی نەرمی سپیی سەر قەرەوێڵەی ڕەقی ڕەشی خەستەخانە چاوەکانی کردەوە و «دکتۆر سەلوا»ی خاڵۆژنی لەملای سەری و «سیستەر موفیدە»ی لەولای سەریەوە بینی، ئەمیان فایلێکی لاکێشەیی ڕەشی بە دەستی ڕاستی گرتبوو و ئەویان بە دەستی چەپی و بە کەوچکە سپیەکە دەرمانی ڕەشی ناو شووشە سوورە درێژکۆلەکەی دەکرد بە دەمیەوە، هەمان تامی خۆڵی ئەشکەوتەکانی دەچێشت و باوەڕی تەواوی دەهێنا، کە ئەم لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆی تەمووزی ساڵی دوای تۆفانی «نووح»دا، دڵۆپەئاوی سازگاری شیریی تەزیوی بۆنمێخەکی سووک سووک تکاوی ناو قاپی داری زۆر ڕەشی کەمێ قووڵی لە درەختی بەڕووی ئێجگار پیر درووستکراوی ژێر کووپەی سووری بە وێنەی قازنەخشاوی لادێیی جنۆکە بەنەفرەتکراوەکانی قەدپاڵی کێوی بەرزی لینگەوقووچی «مرئەز»ی باکووری خواردۆتەوە و تەنها لە بناری ئەو شاخەدا مردن زەفەری پێدەبات.. زۆر جاری تر بیری ئاوای کردبووەوە و هەر خێراش هەستی خۆی بە درۆ خستبووەوە.. کەچی ئەوەندەی دەزانی وا هەمان باوەڕ خۆی خزاندۆتەوە ناو سەری و وەکوو سەرەمێکوتەی بزێو ئەملا و ئەولای تیادا دەکات.. ئەوسا چاوقایمانە خەونی بە بناری ئەو شاخەوە دەبینی و پیلانی گەیشتنی بۆ دادەنا.. بیری لە «دیکارت» دەکردەوە و خۆی لەگەڵدا بەراورد دەکرد، کە زۆر جار کتێبەکانی لە کتێبخانەکەی «ئەمجەد»ی خاڵیدا بینیبوو و خوێندبووینیەوە.. خوێندبووینیەوە و ئەوەندەی تر

دڵیان لە ئاوی بیرەنگی گومان هەڵکێشابوو.. ئەو «فەرەنسا»ی پڕ لە ژاوەژاوی بەجێهێشت و روویکردە «هۆڵەندا»ی ئارام و کشومات.. تا لەوێ بتوانێت بە چاکی خەریکی کارەکانی بێت و چاوی بە هیچ کەسێ نەکەوێت.. تەنانەت لە بڵاوکردنەوەی نووسراوەکانیشیدا پارێزی دەکرد و نەیدەهێشت بکەونە بەر چاوی خەڵک، نەوەکا ناوبانگ پەیداکات و لەو ڕێگایەوە دۆست و ناسیاوی بۆ پەیدابێت.. لە وەخت و ناوەختا سەردانی بکەن و لە کارەکەی دووریخەنەوە.. بەڵام ئەم پشت لە شاری جەنجاڵ و ڕوو لە مەڵبەندی جەنجاڵتری پڕ لە شەڕ و ئاشووبی نەوەی جنۆکان دەکات و گەڕانەوە دەکاتە مەحاڵ.. ئەم گۆرانیبێژە و بە دوای ڕەنگ و مەرگ و ناوبانگدا دەگەڕێت.. ڕەنگ بۆ گۆرانی و بۆ شتنی ناخی، بۆ لابردنی ئەو بەڵخانەی دەکەونە سەر ژێیەکانی دەنگی و جوانکردنی وشە دزێوەکان.. مەرگ بۆ تەنگانە و ناوبانگیش بۆ دڵنیابوون لەوەی هەیە و حیسابی بۆ دەکەن.. جار جار بە نەفرەت و جار جار حەزی لێدەکەن.. گەشتەکەی ئەم تا ڕادەیەک لە گەشتی خەیاڵیی و ڕۆحییەکەی «گۆتە» دەچوو و بۆیەش ئەوەندە حەزی لە شیعرەکانی دەکرد، کە لە «دیوانێکی ڕۆژهەڵاتیی نووسەرێکی ڕۆژئاوایی»دا دەیخوێندنەوە و گیانی بەدەم مۆسیقایەکی هێمنی ناوەوەیان دەخرۆشا.. ئەو لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات کۆچی دەکرد و پێی وابوو باکوور و ڕۆژئاوا و باشوور، هەر هەموویان لەناودەچن و بە جارێ لە بیر دەچنەوە.. ژیانی ڕاستەقینە لە ڕۆژهەڵاتی پاک و بێگەردە و لەوێ خۆشەویستی و خواردنەوە و گۆرانی، گەنجێتی مرۆڤ دەگەڕێننەوە.. ئەم لە باشووری ناو ڕۆژهەڵاتەکەی ئەوەوە بەرەو باکوورەکەی کۆچی دەکرد و ڕەنگەکانی ئەوێی دەکرد بە کفن، بە گڵی سەر تەرمەکەی، بە کێلی گۆڕەکەی، بە... بە.. بە.. بە.. بە..... هەمووی چەند ڕۆژێ بوو «شازە»ی ئامۆژنی مردبوو و ژووری ئازووقەکەیان بۆیەکردبووەوە، بۆیەیانکردبووەوە و زۆربەی کەلوپەلەکانی ناویان فڕێدابوو؛ کە لە هەیوانەکەدا کتێبی «زیندەوەرزانی»یەکەی خستبووە سەر ئەژنۆکانی و «کۆچی حاجی لەقلەق»ی دەخوێند، لەپڕ و نەیزانی بۆچی خەیاڵی ڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە ئەو قسانەی کرد.. «سیامەند»، ئەوسا لەبەر هەتاوی ناوەڕاستی حەوشە، بە فلچە

دەسکسپیەکە پێلاوە ڕەشەکانی خۆی بۆبەدەکرد و بۆنە سەیرەکەی دەچوو بە قوولاییی کونی لووتی ئەمدا، ئەوەی تازە لەسەر زەوقی ئەم لە کۆگای «آثار»ی «خالید حالک»ی باوکی «سەرمەد»ی پالەوانی بۆکسێنی ولاتدا کڕیبووی و هەر خۆیشی قەیتانە درێژەکانی بۆ لە کونە چوارگۆشەییەکانی هەلکێشابوو؛ زۆر بە سستی سەری هەلبڕی و ئاخێکی ئێجگار ساردی هەلکێشا.. خەمناکانە چاوەکانی بڕیە چاوەکانیەوە و بە دەنگێ، وەکوو ئەو دەنگەی شەوانی دوای بەسەرچوونی «شازە»، مەستانە گۆرانیی «زالم هەی زالم ڕەحمێ بە حالم»ی پێ دەچڕی و ئەم لە ماناکەی نەدەگەیشت، پێی وت:

ـ من چی لە تۆ و لەو دلە هەلقرچاوەی خۆمکەم و لە کوێیان حەشاردەم لە کوێ تاقە نەوالی مالەکەم..؟!

چەرچەفە سپیە تەنکەکەی بە سووکی و بە جوولەی سستی قاچەکانی لەسەر خۆی لابرد و لە پانتایی خوارووی قەرەوێلەکە گرمۆلەی کرد، کە تازە خالۆژنی و «موفیدە» پێیان داپۆشی بوو و تا سەر چەناگەیان هێنابوو.. دەستی چەپی بەسەر مەمکەکانیدا درێژکرد و خستیە سەر دلی، تا بزانێت برینەکەی قوولە و بە چەند تەقەل دروویانەتەوە.. بەلام هەستی بە هیچ ڕووشان و درزێ نەکرد و داچلەکی.. زیاتر شلەژا و ئەوەندەی تر گیانی داهێزرا.. ئینجا زانی نووکی پڕگالەکەی کردووە بە دلی «سیامەند»دا و بە هەموو هێزی خۆی لێی خەتمکردووە.. هەرچەند بەحال سەری هەلدەبڕی و بە دەنگێ، وەک کزەبایەکی ناکاو لە قوولاییی خەونی زۆر خۆشی منالیی نیوەناچلی بەیانیی ئێجگار فێنکی سەرەتای پایزی بەر سێبەری ناو کوللەپەردەی سەربانەکەیاندا هێنابێتی و بەدەم لەرینەوەی بەردەوامدا خۆی بە گوێچکەکانیدا بکات، دەیوت:

ـ کوا مامە سیامەندم..؟! پێم بلێن کوا..؟! مردووە..؟!

خالۆژنی سەری دەخستەوە سەر سەینەکەی و بە کەمێ گلەییەوە پێی دەوت:

ـ نابێت ئاوا لە خۆت بکەیت نەوال.. تۆ گەورەیت چاوەکەم.

ئیتر ئەم باوەڕی تەواوی بە مردنەکەی دەهێنا و لە ناخی ناخەوە دادەڕووخا.. هەستی دەکرد منالیی وەکوو کەروێشکە خوێناوییەکەی لە ژێر قاچە سپییەکانی

چوار تانجیە ڕەشەکەدا ملی لارکردۆتەوە و چاوەکانی لێکناوە، ئاوا دەپلیشێتەوە و بۆ هەتاهەتایە بەسەردەچێت، کە هاوڕێیەکی نزیکی مامی وێنەکەی لەسەر کارتۆنێکی لاکێشەییدا کێشاوە و لەوەتەی چاوی کردۆتەوە بە دیواری ژووری میوانەکەیانەوە چەسپکراوە.. کەچی بەم حاڵەشەوە دەیتوانی ئەو ڕۆژە بە چاکی بیری خۆی بخاتەوە و بە جوانی بیهێنێتە بەر چاوی، کە بە ڕاستیی و زۆر لە نزیکەوە تانجیی بینی و شەیدای سەیرکردنی چاوی سۆزرەتی وەک گوڵەئەستێرەی بوو.. لەگەڵ «فەریال»ی خوشکی بە سەفەرتاسە زیویە چوارتاقەکەی وێنەی شتەکانی دەکرد بە دووانی وەکوو یەک و دزێو و ناشیرین دەریدەخستن، چێشتیان بۆ ماڵی باپیریان دەبرد و بەو کوڕە چووختیە پێدەکەنین، کە ئەو کاتەی لە ماڵەوە هاتنە دەرەوە و لە کۆڵانەکەی ئەولایان پێچیانکردەوە، بەرەو ڕوویان هات و دەستی چەپی خستە سەر زنجیری سپیی پانتۆڵە ڕەشەکەی.. خۆی زۆر داماو پیشان دا و وەکوو ئەکتەرێکی لێهاتوو وتی:

ـ سەربازێک لە شەڕ ڕایکردووە و خۆی لەم پەنایە شاردۆتەوە.. داماوە وا هەڵدەلەرزێت و سەری بە دیوارەکاندا دەکێشێت.. من لە ترسی باوکم ناوێرم بیبەمەوە، بەشکوو ئێوە بۆ ماڵەوەی بەرن و شەو لە نێوان خۆتانا بینوێنن..!!

ئەوەندەیان نەزانی دوو تانجیی ڕەشی دەمسپی خۆبان لە سوارە ڕەشپۆشەکەی سەر ئەسپە سپییەکە جیاکردەوە و بەرەو ڕوویان هاتن.. کاتێ گەیشتنە لایان و بە مشەمش لووتیان لە تەنوورە ڕەشەکانیان هەڵسووی، ئەم سەیری چاوەکانیانی کرد و لێیان وردبووەوە.. دەستی لە ملیان کرد و سەریانی نووساند بە سەری خۆبەوە.. توند توند دەیگوشین و حەزی دەکرد لەسەر ئەو شەقامە و لە نێوانیاندا شل شل پاڵکەوێت.. هەر لە خۆیەوە و نەیدەزانی بۆچی هەستی دەکرد چاوەکانی دەکەوتنە ڕەشکەوپێشکە و شتەکانی دەوروبەری لە شێوەی تارماییی کاڵ دەبینی.. سوارەکە تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، بە لایدا تێدەپەڕی و ئەم ڕێک وەکوو ئەو جەنگاوەرانەی دەبینی، کە وێنەکانیان لە کتێبی «مێژووی عەرەب و ئیسلام»دا کێشراوە و تیروکەوان و ڕمی درێژیان بە دەستەوەیە.. هەرکە بە دەنگێکی زۆر سەیر بانگی تانجیەکانی کرد و ئەوان خێرا خۆیان لە دەستی ئەمدا ڕاپسکاند..

لەشیان باریککردەوە و دوایکەوتن، ئینجا ئاوڕێکی بۆ دایەوە و پێی وت:
ـ عسىٰ البارقه لا تخلف.
ئەم ڕووی کردە خوشکەکەی و لێی پرسی:
ـ ئەمە یانی چی فەریال..؟!
ـ یانی ئەو هەورەی هەورەتریشقەی لەگەڵایە، زۆربەی کات بارانی پێوەیە و خێر و خۆشی دەهێنێت، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە کەوتەوە، ئەوا دڵی ئەوانە سارد دەکات، کە هیوایان پێیەتی و چاوەڕێی بارانن لێی.
ئەم گوێی نەدایە و پێی وت:
ـ دەزانی چاوی تانجی زۆر جوانە..؟! من زۆر حەز لە سەیرکردنی دەکەم..!!
ـ دە تووخوا ئەگەر بێ دەنگ نەبیت تۆش.. بە شتی وا دەڵێیت جوان، کە......!!

ئەو جارەی «فوئاد» بردینی بۆ سینەمای «حەمرا» و سەر و ئایسکرێمی بۆ کڕین، ئەم لێکدا لێکدا زمانی پیادادەهێنا و پەیتا پەیتا سەیری چاوەکانی ئەوی دەکرد.. لێیان وردەبووەوە و هەستی دەکرد زۆر لە چاوی تانجیەکان دەچن.. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد دەمی لە گوێچکەی چەپی نزیکبکاتەوە و بە نەغمەیەکی زۆر تایبەتی پیایدا بچرپێنێت: «بە سائەقەی ئەو دوو چاوە جوانەت بم، کە هەر لە چاوی تانجی دەچن، کوڕە قۆزەکەی قەڵای هەولێر» ، کەچی جورئەتی نەدەکرد و بە ناچاری و بۆ ساتێکی کورت ڕووی لێ وەردەگێڕا.. لە ماڵەوە خۆی بۆ نەگیرا و چووە لای خوشکەکەی، کە لە حەمامەکەدا جلە سەربازییەکانی دەسگیرانەکەی لە ناو تەشتە ڕەشەکەدا دەشت و چمکی کراسە سپیەکەی تا سەر ئەژنۆ لووسەکانی هەڵکردبوو.. دەستی چەپی خستە سەر شانی ڕاستی و پێی وت:
ـ تۆ سەرنجت نەداوە فەریال چاوەکانی فوئاد چەند لە چاوی تانجی دەچن..؟!
ئەو وەک بڵێیت چاوەڕێی قسەی ئاوای لێ نەکردبێت و وابزانێ سووکایەتی بە دەسگیرانەکەی دەکات، بە تووڕەیی ئاوڕێکی بۆ دایەوە و پێی وت:
ـ دە گوو بخۆ..!! هەر ئەو مابوو قسەی پێ بڵێیت..!!
خاڵۆژنی «ئەفکار»ی کردبووە باوەشی و لە ڕاڕەوەکەدا پیاسەی دەکرد، کاتێ

«نەوال» بە توورەیی بە لایدا تێپەڕی و وەکوو منداڵ لچی هەڵدەهێنایەوە.. دوای کەوت و پێی وت:

ـ گوێم لێبوو چیت پێ وت، بۆیە توورەبوو چاوەکەم.

ئینجا بۆئەوەی دڵی ئاشتبکاتەوە و شتەکەی لە بیربەرێتەوە، کوڕەکەی خستە باوەشیەوە و پێی وت:

ـ دەزانی نادیەی خوشکم و سارەی پوورزام هەر جارێ دەیبینن، دەڵێن لە نەوال دەچێت.. ؟!

دەسا هەر واش بوو و بە هەڵەدانەچووبوون.. قژی ئێجگار ڕەشی، لووتی کەمێ باریکی، دەمە بچکۆلەکەی، تەواو لە هی ئەم دەچوون و هەر دەتوت پەیکەرتاشێکی زۆر شارەزا لەسەر شێوەی ئەم دایڕشتوون.. بەڵام چاوی شتێکی تر بوو و ئەم هەر دەمێک بوو پێی سەرسام بووبوو.. ئەگەرچی بە ڕواڵەت هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ئەوانەی دایکیا نەبوو و هەمان ڕەنگ و ڕەونەقیان پێوەبوو، بەڵام ئەم دەیتوانی جیایان بکاتەوە و ئەوەندەی چاوی کەروێشکە خنکاوەکان لەزەت لە سەیرکردنیان ببینێت.... سەرنجی خستە سەر چاوەکانی خالۆژنی و هەر خێرا بۆ سەر ئەوانەی «موفیدە»ی گوێزایەوە.. پیایدا ڕوانی و چاوەکانی ئامۆژنی بیرکەوتەوە، کە هەر لە هی ئەو دەچوون و زۆر جاریش پێی وتبوون: بە جوانیەکانیان سەرسامە و گلێنەکانیان تەلیسماوین.. ئەوسا «موفیدە» قاقای لێ دەدا و لە خۆشیا سەمای دەکرد، کەچی ئەو جارە خۆی هەڵدایە سەر دۆشەگی بان قەرەوێڵەکەی تەنیشتی و وتی:

ـ سەیری ئەو نەگبەتیە شازە، لەو هەموو کوڕی قۆزی ئەم شارە نەوال عەشقی چاومان بووە..!!

«شازە» بە نازێکی منداڵانە و بە دەستی چەپی چەمۆڵەیەکی لێنا و وەکوو ئەکتەرێکی زۆر لێهاتوو پێی وت:

ـ ئێستاش لە بیرمە سیامەند لە نامەیەکیا بۆی نووسیبووم: چاوەکانت دوو دڵۆپ فرمێسکی ئەڵماسئاسای کچە کۆچەریە ساویلکەکانی کوێستانی سەر سنوور بوون و پەڕەسێلکەیەکی سپیی سادەی سەرسامی سەردەمی سەید سلێمان،

دوای سەرماوسۆڵی زستانی سەختی سەهۆڵبەندانی سرووشت، لە شەوێکی سایەقەی ساماڵی سفتوسۆڵدا، سابات سابات، سەربان سەربان، بەدەم بەستەی بەسۆز بەسۆزەوە بۆ ئەم شارەی هێنان.. هێنایانی و سووک سووک لەملا و لەولای دەلاقەی بەتاڵی لای سەرووی پەیکەری شازادەی سازکراو لە قوڕی چینیی خووساو و قۆزاغەی لۆکەی قەراغ رووباری دانان.

«موفیدە» خێسەیەکی لێکرد و پێی وت:

ـ پش پش خاتون و عوعو اغا.«١٦»

ڕووی کردە ئەولاوە و ئەمەشی دا بەدەمیەوە:

ـ غبر سیامند شهرین، ثم جاء بکلبین.«١٧»

بەبێ ئەوەی چاو لە چاوەکانی «موفیدە» بترووکێنێت و شتێ لە شێوەی سەرنجدانەکەی بگۆڕێت، سەری هەڵبڕیەوە و قایمتر هاواری کرد:

ـ کوا مامە سیامەندم..؟! پێم بڵێن چی لێهاتووە..؟! مردووە..؟!

ئینجا بە ڕاستیی لە پرمەی گریانی دا و کەوتە ڕنینەوەی قژی.. بە چڕنووک دەموچاوی خۆی داپلۆسی و کۆمەڵێ هێڵی سووری تۆخ و تۆختری لەسەر کێشا.. لەشی تەواو خاوبووەوە و وردە وردە ئاگای لە دەوروبەرەکەی نەدەما.. کاتێکیش هاتەوە خۆش خۆی و بە سستی چاوی کردەوە، خوشکەکەی و زاواکەی لەملا و لەولای سەریەوە دانیشتبوون و دۆشیان دابردبووەوە.. «فەریال»، وەک بڵێیت ئەو هەموو هێڵ و هێڵکاریەی سەر ڕوومەت و ناوچەوانی نەدیبن و سەرنجیان ڕانەکێشابێت، یان لە خۆشیی بە ئاگاهاتنەوەی گوێی نەدابنێ و لە بیر خۆی بردبنەوە، بە جارێ ڕەنگوڕووی گەشایەوە و دەستەکانی بە شلی لەملا و لەولاوە بەسەرداهێنا.. بە دەنگێ، کە پێوەی دیاربوو گریانی زۆر گۆڕیبووی و لەرەی بەسۆز بەسۆز و بێگەردی تێخستبوو، پێی وت:

ـ بە سائەقەت بم تاقە خوشکە ڕۆحەکەم، وا ئەم جارەش چاو و دڵمان بە بینینت ڕۆشەنبووەوە.

«فوئاد» دەستی چەپی خستە ناو دەستی ڕاستی و پەنجەکانی لەوانەی ئەم هەڵکێشان.. سووک سووک گوشینی و کەم کەم گیانی بە بەرداکردنەوە..

خستینیه سەر سنگە تووکنەکەی خۆی و چاوی بڕیە چاوەکانیەوە.. گلێنەکانی ببوون بە دوو خاڵخاڵۆکەی بزێو و وایدەزانی ئێستا نا ساتێکی تر هەڵدەفڕن.. هەڵدەفڕن و هەر خۆی دەزانێت لە کوێ دەنیشنەوە.. سەری بۆ لەقاندەوە و بە سووکی و بەدەم بزەیەکی ڕەونەقدارەوە گۆرانیی «ورده ليش ذبلانه يا ورده»ی بۆ چڕی، کە خۆی پێی خۆش بوو و هەمیشە داوای لێدەکرد بۆی بڵێت.. هەموو جارێکیش دەستی دەکرد بە گریان و کاتێ فرمێسکەکانی دەسڕی، بە شێوەیەکی زۆر سەیر چاوی دەبڕیە چاوەکانیەوە و پێی دەوت:

ـ خۆ من هیچ شتێ لە مۆسیقا نازانم، بەڵام دڵنیام گۆرانیی ڕەسەن ئەوەیە، ئەو کەسانە بهێنێتە گریان، کە هەرگیز حەز لە دیمەنی فرمێسک ناکەن.

کەچی شەوێکیان نەگریا و وتی:

ـ تۆ ڕاست دەکەیت نەوالەکەی ڕۆحم، ڕەنگە دزێوەکان بە دەنگە خۆشەکان پاکدەبنەوە.

ویستی ڕایکێشێت و ماچێکی کوڵمە سورهەڵگەڕاوەکەی بکات.. ماچێکی تر و بەوپەڕی جورئەتەوە پێی بڵێت:

ـ چاوەکانت لە چاوی تانجییەکان دەچن، بۆیە ئاوا جوانن و من ئەوەندە حەز لە سەیرکردنیان دەکەم.

بەڵام پەشیمانبووەوە و واینەکرد.. بەڵکوو پەنجەکانی خۆی بە هێز لە ناو پەنجەکانی هێنایە دەرەوە و وتی:

ـ کوا مامە سیامەندم..؟! چی لێهات..؟! مردووە..؟!

ئەوان سەیری یەکتریان کرد و سەریان داخست.. هەناسەی قووڵیان هەڵدەکێشا و هی قووڵتریان دەدایەوە.. دوایی «فەریال» بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە سەری هەڵبڕی و پێی وت:

ـ ئەوە بۆچی ئاوا دەڵێیت چاوەکەم..؟! ئەی ئەو تۆزێ لەمەوبەر لای تۆ نەبوو..؟!

ـ لای من بوو..؟! کەی..؟!

ـ پێش ئەوەی ئێمە بێین..!!

«فوئاد» سەرێکی بادا و وتی:

ـ ئێمە لە بەردەمی خەستەخانەدا تووشی بووین، وتی بەنجەکە بەریداویت و.......

ـ بەنج..؟! بەنجی چی..؟!

ئەوان هەستیان کرد ئەم نەیزانیوە چی بەسەرهاتووە و چۆن چۆنی هێناویانە بۆ خەستەخانە، بۆیە بە دەموچاوی یەکتریان هەڵڕوانی و متەقیان لە خۆیان بڕی.. لەم ئانوساتەشدا «دیلهام» و خوشکەکانی لە دەرگای قاوشەکەدا پەیدابوون و بەرەو ڕوویان هاتن.. «نەوال» پێش ئەوەی بگەنە ئاستی و چەپکە گوڵە سپیەکانی دەستیان لەسەر مێزە ڕەشەکەی تەنیشتی دابنێن، بە حەپەساویەوە سەیری کردن و پێی وتن:

ـ مامە سیامەندم لەگەڵ ئێوەبوو..؟! لەماڵەوە بوو..؟! لە.....؟!

«دیلهام» لە پێش ئەوانەوە گەیشتە لای و دەستی چەپی بە سووکی خستە سەر ناوچەوانی.. دوای ئەوەی کۆمەڵێ ماچی لە ڕوومەتەکانی کرد و چەند جارێ بە سائەقە و بە قوربانی بوو، ئینجا پەرچەمەکەی لەسەر چاوە شەڕانیەکانی لادا و پێی دەوت:

ـ مامت پێش ئەوەی ئێمە بێینە دەرەوە، هاتەوە و وا لە ژوورەکەی نووستووە..؟!

ئەم لەگەڵ بۆنی ئەو عەترەی قژی «دیلهام»، ڕاچەنی و بێجگە لە بەشی دوایی قسەکەی، هەموو شتێکی تری بەلاوە نا.. لە دڵی خۆیدا لەسەر نەغمەکەی ئەو دەیوت: «وا لە ژوورەکەی نووستووە» و وردی دەکردەوە.. ئەوە ئەو عەترەبوو، کە مامی حەزی لێدەکرد و هەمیشە بۆ ئەم و «شازە»ی دەکڕی.. زۆر چاکیش لە بیریەتی و وا دەزانێ دوێنێ بوو، کە «دالیا»ی پوورزایان نیشانکرابوو و ئەوان دەچوون بۆ ئاهەنگەکەی، ئەمیشیان لەگەڵ خۆیاندا برد و وەکوو گۆرانیبێژیش بە ئامادەبووانیان ناساند.. هەندێکیان هەر دەمێک بوو دەیانناسی و ناوبانگیان بیستبوو.. ئەوانەی تریش وا لە ئاستیا سەرسام ببوون و بە شێوەیەک حەپەسابوون، کە دەتوت لە هەموو ژیانیاندا دەنگی ئاوا خۆشیان نەبیستووە و

هیچ گۆرانیبێژێکی تری وەکوو ئەم ڕۆحسووکیان نەبینیوە.. خۆ ئەو کاتەی «ئەنوار» پیانۆکەی «دالیا»ی خستە بەر دەستی و چەند پارچە مۆسیقایەکی پێ ژەند، هەر هەموویان دەمیان داچەقاند و بە جارێ حەیران و سەراسیمە بوون.. لە ڕێگا پێش ئەوەی بگەن و لە مارسێدسەکەی «جیهاد» دابەزن، هەرسێ خوشکەکەی سەرسامیی خۆیان لە ئاستی بۆنی ئەو عەترەی قژی دەربڕی و ئەو بە تەنیا پێی خۆش نەبوو.. بە مەکرێکەوە چاوەکانی نووقاند و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێستی لووتی چرچکرد.. هاوکات سەری بادا و بە دەنگێ، وەک لەگەڵ هێڵنج دەربچێت و کتومت لە قیرەی بۆقی نێر دەچوو، وتی:

ـ هەست دەکەم کەمێ قورسە..!!

ئەم تەریقبووەوە و سەری لەبەر نا، بەڵام بۆ ئەوەی نەڵێن نازانێت عەتری چاک لە هی خراپ جیاکاتەوە و بە کەمزانی نەزانن، هەر خێرا فریای خۆی کەوت و وتی:

ـ من خۆشم هەستدەکەم بۆنی زۆر خۆش نییە، بەڵام چونکە مامم حەزی لێدەکات، لام شیرین بووە.

کاتێ هاتیشەوە هەر خێرا چووە حەمامەکە و بەو شەوە سەری خۆی خستە بەر ئاوی سارد.. «سیامەند» هەر ئەوەندە دەمی هەڵێنایەوە و بە کەمێ گلەییەوە پێی وت:

ـ ئەوە چییە نەوال..؟! خۆت دەنوێنیت..؟!

ئەم دانەکانی بە جیرەوەبرد و پێی وت:

ـ دەمەوێ ئەو عەترە بۆگەنەی تۆ لە قژم بکەمەوە.

ئەو بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی کرد و بە هێمنیی لێی پرسی:

ـ چییە..؟! کەس گاڵتەی پێکردوویت..؟!

ـ نەء، کەس گاڵتەی پێنەکردووم، بەڵام حەزم لە عەترێ نییە، تۆ بۆمی بکڕیت.

ـ دەزانی من هیچ لە تۆ تێناگەم..؟!

ـ ئەو چاتر.

هێشتا لێی تووڕەنەبوو و گوێی بەو قسە ڕەقانەی نەدا، بگرە چووە ژوورەوە و خاولیەکەی بۆ هێنا.. بەبێ ئەوەی ئەم پێی خۆش بێت و شتێکی لەو سیما مۆنەی گۆڕی بێت، سەری پێ وشککردەوە و چمکەکانی لە ملی گرێ دا.. هەرچۆنێ بوو دەستی چەپی کردە ملیەوە و بۆ ژووری نووستنەکەی برد.. وەکوو منالّەکەی جاران لەسەر جێگاکەی پالّیخست و بە لێفە تەنکەکە تا سەر سنگی داپۆشی.. دەمی خستە سەر ڕوومەتەکانی و چەند جارێ ماچی کردن.. ئیتر لەمەوە عەتری بۆ نەکرد و ئەو شووشەیەشی شکاند، کە خستبوویە ناو چەکمەجە ڕەشە فۆرمیکاکەی و هێشتا تەواوێکی تیامابوو.. «شکاندنی چی و حالّی چی..؟! ئەوەتا داویەتی بە دیلهامەکەی و ڕەنگە ئەمڕۆ هەر خۆیشی بۆی لێدابێت.. ئای لە منی.....»

ـ چییتە ئەوە نەوال..؟! ناتەوێ قسەمان لەگەلّ بکەیت..؟!

«ریهام» بوو ئاوای پێ وت و قنگی خستە سەر قەرەوێلّەکە.. خێرا ڕووی بۆ وەرچەرخاند و بەدەم بزەیەکی زۆر جوان و بە گالّتەیەکی ئێجگار خۆشەوە پێی وت:

ـ شتێ بلّێ مەیموونە عەیارەکە.. دەی با گوێمان لەو دەنگە ناسازەت بێت.

لە ڕوو داما و نەیزانی چی بلّێت.. کەمێ بیری کردەوە و هەر بۆ ڕازییکردنی دلّی ئەو لێی پرسی:

ـ ئەی بۆچی مامە جیهادم نەهاتووە..؟!

ـ ئیشی تەجنیدی هەیە و سەری زۆر قالّە.

ـ ئیشی تەجنید..؟!

ـ ئەی نەتزانیوە بە سەرباز گیراوە..؟!

هەر خۆیشی دەستی چەپی گرت بە دەمیەوە و وتی:

ـ ئا بە ڕاست تۆ نەتزانیوە..!! ئیتر لە بەیانیەوە جلی سەربازیی لەبەردەکات.

«نەوال» ئەوەندەی تر شپرزەبوو و تاقەتی سەیرکردنیانی نەما.. بیری دەکردەوە و دەیهێنایە بەر چاوی خۆی، کە چۆن ئیتر تا ئەم چاکدەبێتەوە و لە خەستەخانە دەردەچێت، «سیامەند» ئەو کچەتیوە دەباتە لای خۆی و هەر لەسەر جێگاکەی

ئەمیش پاڵی دەخات.. جارێ ماچی سەر کوڵمەکانی و جارێ هی ناودەمی.. جارێ گازی سووک و جارێ هی کەمێ تیژیان لێدەگرێت.. سەری دەخاتە سەر قۆڵی ڕاستی و بە پەنجەکانی دەستی چەپی ختووکەی گەردن و لاملی دەدات.....

ـ تۆ بۆچی ئاوا خەفەت دایگرتی نەوال گیان..؟! خۆ من بۆ ئەوە وام پێ نەوتی، بەم شێوەیە خۆت سەغڵەت بکەیت.

ماچێکی کوڵمی چەپی کرد و پێی وت:

ـ مەترسە چاوەکەم، مامە جیهادت یاریکەرە، نایبەن بۆ شەڕ.

«دیلهام» ئاخێکی هەڵکێشا و لە خوشکەکەی تووڕەبوو:

ـ ئێستا کوا کاتی ئەو قسەیە بوو تۆش..؟!

«نەوار» بە پیشەی هەمیشەی خۆی قاقایەکی لێ دا و وتی:

ـ ڕاست دەکات، کاتی ئەو قسەیە نەبوو.

ئینجا ڕووی کردە خۆی و پێی وت:

ـ دە کەواتە باسی ئەوەی خۆتی بۆ بکە.

ئەو بە شەرمێکەوە سەری لەبەر نا و پێکەنی، هەر خێرا و بە نازێکی منالانەوە سەیرێکی «نەوار»ی کرد و بەدەم بزەیەکی ناسکەوە چاوێکی لێی نووقاند، کە مەبەستی ئەوە بوو خۆی پێی بڵێت و لە کۆڵ ئەوی بکاتەوە.. تا «نەوار» قاقایەکی تری لێ دا و خۆی بۆ قسە ئامادەکرد، ئەم خەریکبوو بەر چاوی تاریکدادەهات و دەبووڕایەوە.. هەر ئەوەندەش ئەو دەمی هەڵهێنایەوە و وتی:

ـ دادەم خوازبێنیکەری هاتووە.

ئەم هەر بە جارێ ئاگای لە دنیا بڕا و تەواو بێ هۆش بوو.. بەحاڵ و وەکوو تارمایی دەیبینی و بە ئاستەم گوێی لە قسەکانی دواتری بوو:

ـ ئەی نابینی چەنێ دڵی خۆشە..!!

خۆبشی نەیزانی چۆن و بە چ شێوەیەک زمانی خستە کار و پرسی:

ـ کێ داوای کردووە..؟!

ـ کەسێکە تۆ زۆر زۆرت خۆشدەوێت..!!

ئەوە دەمی بوو کرایەوە، یان هێلکەشەیتانۆکە..؟! وشەبوو..؟! یان لینجاوی بۆگەن..؟! لێی دەهاتەدەرەوە و قێزی لێیدەکردەوە:

ـ کێیە..؟! من زۆر خۆشمدەوێت..؟!

ـ چۆن..؟! نازانی..؟!

ـ نا.. نا.. نایزانم.. کێیە..؟! بۆ پێم نالێیی..؟!

ـ ڕەبیعی پوورزام..!!

ـ ڕەبیع..؟! ڕەبیعی کەمانجەژەن..؟! ئای چەندم پێخۆشە..!!

ڕاستی دەکرد و لە دڵەوە پێی خۆشبوو.. ڕەنگوڕووی گەشایەوە و ئەوانیش هەستیان پێیکرد.. تەنانەت «فەریال»ی خوشکی، کە قۆڵی چەپی کردبوو بە قۆڵی ڕاستی مێردەکەیدا و سەری بە شلیی خستبووە سەر شانی، پێدەکەنی و پێی دەوتن:

ـ هەر من دەزانم ئەم خوشکەم چەند ئێوەی خۆشدەوێت و چۆن دڵی پێتان دەکرێتەوە..!!

ئەم هەستی کردبوو و چەند جارێکیش خۆی سووکە ئاماژەی پێدابوو، کە لەگەڵ «ڕەبیع»دا یەکتریان خۆشدەوێت و سەرنجەکانیشیان بۆ یەکتر هەر ئاوای دەگەیاند، بەڵام هەموو جارێ هەستی خۆی بە درۆ دەخستەوە و وایدەزانی ئەوە هەر بۆ چاوبەستکردنی ئەمە.. شەوێکیش لەسەر جێگا و پێش ئەوەی بنوون، ویستی قسە لە «سیامەند» دەربهێنێت و زۆڵانە و لەگەڵ دیقەتدانی ورد لە ڕووخساری، پێی وت:

ـ هەست دەکەم دیلهام و ڕەبیع یەکتریان خۆشدەوێت..!!

ئەو هیچ خۆی تێکنەدا و پرسی:

ـ بە چیا دەزانی جنۆکە..؟!

ـ لە هەڵسوکەوتەکانیانا دەیبینم.. چۆن تۆ هەستت پێنەکردووە..؟!

ـ من..؟!.... بڵێم چی..؟!.... نەء.

ـ من وامدەزانی تۆ ئاگات لە هەموو شتێکە، کەچی وادیارە.....

ئەوسا «سیامەند» کردی بە گاڵتە و پێی وت:

ـ تۆش بکەوەرە خۆت و کوڕێکی قۆز پەیاکە.
ـ تۆ مشوورێکی خۆت بخۆ چاوەکەم، من جارێ زۆرم ماوە.
ـ تۆ ماوتە، بەڵام من بەسەرم برد نەوال گیان.. تەواو پیربووم.
ـ پیر بوویت..؟! تازە سی ساڵت تەواوکردووە..!!
ئینجا کردی بە ڕاستی و بە سووکی بۆ سەر جێگاکەی ئەو خشکەیکرد.. دەستی چەپی خستە ژێر سەری خۆی و قاچەکانی بە ئاڕاستەی قاچەکانی ئەو درێژکرد.. بە دەستی ڕاستی بەشێکی لێفەکەی ڕاکێشایە سەر سمت و ڕانی و بە پەنجەکانی کەوتە یارییکردن بە قژە ڕەش و خاوەکەی ئەو.. چاوی بڕیە چاوەکانی و لێی پرسی:
ـ بە ڕاست بۆ ژنێ ناهێنیت..؟!
ـ حەز دەکەیت..؟!
ـ ئهە..!! ئەی چۆن..!!
ـ حەز دەکەیت کێ بێنم..؟!
ـ ئەوەی خۆت حەزی لێدەکەیت چاوەکەم.. تۆ بڵێی بیرت لە کەسێ نەکردبێتەوە..؟!
لە مەیان مەبەستی خۆی هەبوو و ئەویش هەستی پێیکرد:
ـ گەورە بوویت دەزانی..؟! ئێستا ئەگەر وەکوو ئەوسای منالّیی بە کۆلانە پێچاوپێچەکانی حەیدەرخانەدا بڕۆیت گوم نابیت..!!
نکووڵی لێکرد و وتی:
ـ دەزانم دەڵێی چی، بەڵام بە هەڵەدا چوویت.. لە دەستیشم ڕامەکە و خۆت لە پرسیارەکەم مەدزەرەوە.
ـ کامە پرسیار..؟!
ـ خۆت دەزانی کامە.
ـ تۆ لە پرسیاری من ڕادەکەیت.. پێم نەوتی کێ بێنم، وەڵامت نەدامەوە..؟!
هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا، جورئەتی نەدەکرد دەمی هەڵێنێتەوە و ڕێک و ڕەوان پێی بڵێت:

ـ شاناز بێنە.. لەو چاکترت دەست ناکەوێت.

ئاخر هەر خۆی «سیامەند»ی دەناسی و دەیزانی چەندی ڕق لەو کچەیە.. هەرگیز ئەو جارەی منالّیی لە بیر ناچێتەوە و وادەزانێت دوێنێ ڕوویداوە، کە لە هەیوانەکەدا لەگەلّ «شازە» شەترەنجیان دەکرد و «فەریال»ی خوشکی هەر لە خۆبەوە وتی:

ـ ئەی خوایە پوورە شازە و پوورە شاناز چەند لە یەکتر دەچن..!!

ئەو سەری هەلّبڕی و بە ڕقەوە سەیرێکی کرد.. بە ئانیشکی ڕاستی پالّێکی پێوەنا و دووری خستەوە.. ئەم لەسەر خوشکەکەی کردەوە و بە گلەییەوە پێی وت:

ـ تۆ بۆچی ئەوەندە ڕقت لە پوورە شانازە..؟! خۆ زۆر جوانە و قسەکانی زۆر خۆشن..!!

ئەو هەستا و بە دەستی چەپی زللەیەکی وای پیاکێشا، سەری خولایەوە و بە دەما کەوت.. شتەکان لەبەر چاویدا دەبوون بە دوانی ناشیرینی وەکوو یەک و موچووڕکی پیادادەهات.. «شازە» هەلّیگرتەوە و کردیە باوەشی.. ژیری کردەوە و بە چپە پێی وت:

ـ جارێکی تر باسی نەکەیت نەونەو..!!

بەلاّم چیتر ناتوانێت دان بە خۆیدا بگرێت و باسی نەکات.. ئەوا دلّنیابوو و تەواویش بۆی دەرکەوت، کە هیچ شتێکی لەگەلّ «دیلهام»دا نییە و ئەم هەر زۆر بە هەلّەداچووبوو.. ئەو نەخۆشیەی هەلێکی باشی بۆ ڕەخساندووە و لە دەست خۆی نەدات چاکە.. «نا نا لە دەست خۆمی نادەم و هەر ئەمڕۆ هەموو شتێکی لەگەلّدا دەبڕێنمەوە.. سەرم دەخەمە سەر ڕانی و دەست دەکەم بە گریان.. خۆم دەهێنمە حالّی جاو و پێی دەلّێم..... ئا پێی دەلّێم..... دەلّێم... چی پێ دەلّێم..؟! نا زەحمەتە... باشە بۆچی ئێجگار ئاواش بترسم..؟! بەشکوو هەر زۆری بەلاوە خۆش بێت و ئافەرینیشم لێ بکات..؟!» لەپڕ بیرێکی سەیری بە خەیالّدا هات و بە خۆی وت: «باشە من بە ڕاستیی ئامۆژنم لەو ژنەدا دەبینمەوە و سەبووریم پیایدا دێتەوە، یان مەراقێکە و هیچی تر..؟! مەراقی ئەوەی بزانم ئەگەر ژن و پیاوێ ڕقیان لە یەکتر بێت و لەبەر خاتری کەسێ، کە هەر دووکیان

خۆشیاندەوێت و ناتوانن دڵی بشکێنن، ببن بە هاوسەری یەکتر، چۆن دەژین و چی ڕوودەدات..؟! سەیرە.. من خۆشم نازانم چییم دەوێت و بۆچی وا دەکەم.. ئاخر بۆچی..؟! ها..؟!......» ئەوەندەی هێنا و برد، تا پێڵووی چاوەکانی قورس بوون و خەوی لێکەوت.. شەو درەنگانێ لەگەڵ دەنگی پێڵاوەکانی خاڵی بە ئاگاهاتەوە و سووک سووک چاوەکانی کردەوە.. کە تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، لەسەر کاشیەکان پێی دەڕۆیشت و لە دەرگاکەوە دەچووە دەرێ.. دایکیشی بینی بە پاڵتۆیەکی ڕەشی سادەوە خەمناک لەسەر کورسیە سپیەکەی بەرامبەری دانیشتبوو و قاچی چەپی خستبووە سەر هی ڕاستی.. پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشابوون و سەیری بنمیچەکەی دەکرد.. هەر خێرا چاوەکانی داخستەوە و درزی ئاسۆیی باریکی تێکردن.. لەو درزانەوە سەیری دەکرد و لە سیمای وردەبووەوە.. دەمێک بوو ئاوا بە دیقەت و بەبێ ترس لێی نەڕوانیبوو و سەرنجی قووڵی لە بەژن و باڵای نەدابوو.. هەستی دەکرد ڕەنگوڕووی هەر لە ڕۆژی مردنی باپیری دەچێت و وێنەی ئەو ڕۆژە قژی ژاکاوە.. وەکووتر هێشتا هەر گەنجە و سیما کچانەکەی نەگۆڕاوە.. چەندی پێناخۆشە و لە دڵەوە تووڕەدەبێت، کە هاوڕێکانی لە قوتابخانە زوو زوو سەرسامیی خۆیانی پیشاندەدەن و پێی دەڵێن:

ـ دایکت چەند گەنجە نەوال، ئەوەی نەزانێت دەڵێت خوشکتە..!!

ـ سەیرە هەر لە یەکتریش دەچن..!!

ـ ڕەنگە چەند ساڵێکی تر خەڵک وابزانن دوانەن..!!

ڕاستیش دەکەن و تەواو بۆی چوون.. ئەم هەرچەند هەڵدەدات و گەورە دەبێت، شێوەی لە هی دایکی نزیکدەبێتەوە و هەست دەکات تەواو لەو دەچێت.. ئیتر لەو کاتانەدا ڕقی هەڵدەستێت و بە دەستی بێت ملی لە جەستەی جیاکاتەوە.. هاوکات بیردەکاتەوە و بە دوای سەرچاوەی ئەو ڕقەدا دەگەڕێت.. دەگەڕێت و زۆریش مێشکی خۆی بۆ دەگوشێت، بەڵام بە هیچ ئەنجامێک ناگات و هەموو جارێکیش بە چەکەرەکردنی هەستی بەزەیی لە ناخی دڵیدا کۆتایی پێدێت.. چاوەکانی پڕ لە فرمێسک و دڵی لێواولێو لە خۆشەویستی و سۆز دەبێت و سەری دەخاتە سەر ئەژنۆکانی.. دەگریت و تا درەنگ ژیرنابێتەوە.. دەگریت و ناهێڵێت

ئەو بزانێت بۆ ئەوە.. چەند ڕۆژێ پێش ئەوەی ئەوان بەجێبهێڵێت و بە ئێجگاری بێتە لای مامی، لە ژوورەکەی خۆی دەگریا و دەنگی گەیشتە ڕاڕەوەکە.. ئەو لەپڕ دەرگای کردەوە و کردیە باوەشی.. بە دەستی چەپی پەرچەمە بە فرمێسک خووساوەکەی لەسەر چاوەکانی لابرد و بە دەنگێ، کە بۆ ئەوە دەشیا گۆرانیی «هالگلب قصته غريبه»ی «سەلیمە موراد»ی پێ بڵێیت و شین و واوەیلای لەگەڵدا بکەیت، لێی پرسی:

ـ بۆچی دەگریت قەزات لەو دڵە هەڵقرچاوەی سووعاد کەوێت.. ؟!

خۆی لە باوەشیا هێنایە دەرێ و چووە بەر بەلووعەی ناو باخەکەیانەوە.. چەند مشتێ ئاوی ساردی کرد بە دەموچاویا و بە پەنجەکانی قژی ڕێکخستەوە.. نەیدەویست دایکی وابزانێت بۆ ئەو دەگریت و حەزی نەدەکرد بە پرسیار هەراسانی بکات.. دواجاریش دڵنەرمیەکەی بە هەل بزانێت و داواکاریەکانی خۆی بەسەردا بسەپێنێت.... ئێستاش پڕ بە دڵ حەز دەکات و زۆریش ئاسوودە دەبێت، بۆی بگریت و فرمێسکەکانی دابارێنێتە سەر شان و ملیەوە، بەڵام هەر ئەوەندە ژیربووەوە و ئاشتبوونەوە، ئیتر مەسەلەی «عەمار»ی بۆ قوتدەکاتەوە و جارێکی تر سەرودڵی پێ دەگرێتەوە.. وەکوو ئەو ڕۆژەی قوتابخانە، کاتێ بانگی ناو حەوشە چۆڵەکەی کرد و پێی وت:

ـ تاکەی خۆت بە منالە بەنازەکەی جاران دەزانیت نەوال، کاتی ئەوە نەهاتووە بیرێ لە خۆت بکەیتەوە.. ؟!

ـ بیری وەکوو چی.. ؟!

ـ خۆتم لێ گێل مەکە.. ئەو کوڕە لە پێناوی تۆ پشتی کردە کەسوکاری و ئەوە سێ ساڵە ڕووی لە شار نەکردۆتەوە.

ـ ئینجا دەڵێی چی.. ؟! چی لێ بکەم.. ؟!

ـ ئەو هەموو نامەیەی بۆ ناردی و وەڵامی بدەرەوە.

ـ چی پێ بڵێم.. ؟! پێی بڵێم من خۆشمناوێیت.. ؟!

ـ نەء، ڕاستیەکەی پێ بڵێ.. پێی بڵێ خۆشیتدەوێت و چاوەڕێی دەکەیت.. پێی بڵێ....

ـ به ڕای تۆ ئەمە ڕاستیەکەیە..؟!

ـ ئا، نەوال، کچی خۆمی و چاکت دەناسم.. تۆ خۆشیتدەویت و ئەوەی دەیکەیت لە ترسایە.

ـ ترس..؟! ترس لە چی..؟!

ـ ترسی ئەوەی لە دەستت بچێت.

ـ دیارە تۆ لە من چاکتر.....

ـ ئا من لە تۆ چاکتر دەزانم، چونکە تۆ وا شپرزە بوویت، ناتوانیت..........

ـ وانییە.. وانییە.. من خۆم چاک دەزانم، کە......

ـ چەکبەردەم لەگەڵ مەکە، من دەزانم تۆ خۆشیتدەوێت و بۆی شێت بوویت.. هەر ئەوەندە ئەو ترسەی گیانت ڕەویەوە، دەزانی من بە هەڵەدانەچووم.

ـ دەی باشە، مادام من خۆشیمدەوێت و لە ترسا ئاوا دەکەم، وازم لێبێنە.. دە بەس سەربکەرە سەرم.

تووڕەبوو و پێی وت:

ـ ئەگەر بمزانیایە ئەوەت لێ دەردەچێت.....

تەواوی نەکرد و دەستی کرد بەو جنێوانەی، کە هەموو ژنێکی تری «بەغدادە» کاتێ تووڕەدەبن و دەگاتە تینیان، دێتە سەر زمانیان و لە ئاستی یەکتردا هەڵیدەڕێژن:

ـ أم الدرابين.. أم الشناتير.. أم الدگایگ..أم صحبه.. أم........«١٨»

کاتێ کەمێکیش لێی دوورکەوتەوە و پشتی تێکرد، خێرا ئاوڕی بۆ دایەوە و بەدەم ڕاوەشاندنی پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی پێی وت:

ـ ئیتر تەواو.. نابینیت جارێکی تر سەیریشت بکەم.

ئەم دەیزانی ڕاست ناکات و لە دڵیەوە نییە.. ئەگەر واز لە هەموو شتێ بێنێت و لە خەیاڵی خۆی دەربکات، ناتوانێت دەست لەو مەسەلەیە هەڵگرێت و قسەی تیانەکات... ئا ئەوەتا ئێستاش چاوەڕێیە چاوەکانی بکاتەوە و بە درۆ بێت، یان بە ڕاست وەکوو منداڵ لە باوەشی بگرێت.. سەری بنووسێنێت بە سنگیەوە و خوڕ خوڕ بۆی بگریت.. بە قسەی لووس لووس و بەڵێنی سەیر سەیر ڕازیبکات و

لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە.. جارێکی تر دەستی بە سەردا بگرێتەوە و بە ئارەزووی دڵی هەڵیسوورێنێت.. بەڵام ئەم ئێستا لە هەموو کاتێ چاکتر دەزانێت و تەواو دڵنیایە، کە هەموو ئەو کارانەی بۆ ئەوەیە، ڕێگا بۆ خۆی خۆشکات و لەولاوە «سیامەند» بکات بە داوەوە.. هەر لەبەرئەوەشە پەیوەندیی لەگەڵ تێکنەداوە و هەر وەکوو جاران خۆشیدەوێت.. تا ئێستا لێی توورەنەبووە و خۆبشی وا پیشاننەداوە، پێی ناخۆشە ئەوی داڵدە داوە و وا نەبێت بە ناچاری دەچێتە ژێر ڕکێفیەوە.. بەوە باشە ئەم «سیامەند»ی زامن کردووە و هیچ ترسێکی لێی نییە.. دە ئاخر هەر ئەمەشە زۆر جار بێ تاقەتی دەکات و وایلێدەکات هەست بە گوناه بکات.. هەرچەند بیری لێبکاتەوە و بیهێنێتە بەر چاوی، بەزەیی پیایدا دێتەوە و دڵی پڕ دەبێت، کە ئەم بووە هۆی ئەوەی خۆشەویسترین کەسی دەستی لێ هەڵگرێت و لە لەزەتی باوەشی پیاو بێ بەش بێت.. ئەو ڕۆژە هات بە سەریا بۆ «سیامەند»ی باسکات و پێی بڵێت، کەوا پەشیمانە و حەزدەکات جارێکی تر داوای بکاتەوە.. دوایی نەیزانی چی بوو وایلێکرد پاشگەزبێتەوە و لە خەیاڵی خۆی دەریبکات.. دەریکرد و تەواویش دووریخستەوە، بەڵام جارێکی تر وەکوو کۆتری نامەبەر شەقشەشەق شەشەق.. شەقشەشەق شەشەق، هاتەوە و لەسەر دیواری حەوشە چوارگۆشەییەکەی ناو سەریا نیشتەوە.. تەنانەت، کاتێ چاکەتە ڕەشەکەی کردە بەری و بۆینباغە هێڵدارەکەی بۆ لەسەر کراسە سپیەکەی بەست، خستیە سەر زمانی و خەریکبوو دەریپەڕێنێت.. ئەو هەستی بە پەشۆکاویەکەی کرد و بە حەپەساوی و کەمێ گلەییەوە لێی پرسی:

ـ چییە نەوال..؟! بیرتچۆتەوە بۆینباغ ببەستیت..؟!

ـ ها..؟! خەیاڵم ڕۆیشتبوو.

ـ بۆ کوێ..؟!

ـ هم..؟! بۆ لای... بۆ لای نەرجس.

ـ ماڵی نێرگز زۆر نزیکە چاوەکەم، ئەم داڵغە دوورەی بۆ چییە..!!

کەمێ توورەبوو و وتی:

ـ تۆ دەبێت هەموو شتێ بکەیت بە گاڵتە..؟!

ئەو بزەیەکی خستە سەر لێوی و پێی وت:
ـ کەواتە بیرت لە شتێکی گرنگ دەکردەوە..!!
کە ئەم وەڵامی نەدایەوە و زیاتر پەشۆکا.. وەک تاوانێکی گەورەشی کردبێت و نەتوانێت لە شەرما چاوهەڵبڕێت، سەری داخست و خۆی بە بەستنی بۆینباغەکە و ڕێکخستنەوەی یاخەی کراسەکەی خەریک کرد.. ئەو دەستەکانی خستە سەر ئەم شان و ئەو شانی و وتی:
ـ ئێستا زانیم بیرت لە نێرگز نەدەکردەوە، چونکە ئەو بەلای تۆوە گرنگ نییە..!!
بە پێکەنینێکی خۆش قەرەبووی تووڕەبوونەکەی دایەوە و وتی:
ـ مادام دەزانی بیرم لە چی دەکردەوە، پێویست ناکات من پێت بڵێم چاوەکەم.
ـ من نەموت دەزانم بیر لە چی دەکەیتەوە، بەڵکوو وتم ئەوەی بیری لێدەکەیتەوە نێرگز نییە.. تۆ ئەوەی لە خەیاڵتا نەبوو کچ بوو..!!
ـ بە چییا دەزانی..؟!
ـ بەم بۆینباغە.
ـ ئۆۆف..!! نەمانوت گاڵتە بەسە..؟!
ـ گاڵتە ناکەم.. تۆ ناتوانیت بیر لە ئافرەت بکەیتەوە، لە کاتێکا بۆینباغ بۆ پیاو ببەستیت.
گاڵتەکەی گەرمتر کرد و لێی پرسی:
ـ کێ بوو ئەو هەتیوە ڕەزاگرانەی ئاوا خەیاڵت لە کەمەری ئاڵاندبوو..؟!
ـ جنێوی پێ مەدە، چونکە زۆر خۆشمدەوێت.. ڕەزاشی گران نییە..!!
ـ ئەئاوا..!! کەواتە من بە هەڵەدا نەچووم..؟! کچمان گەورە بووە، کوڕی خەڵکی خۆشدەوێت..!! ئیتر ئێمە باومان نەما..!!
چەقەنەی لێ دەدا و بە گۆرانی دەیوت:
ـ ئیتر.. ئێمە.. باومان.. نەما... ئیتر.. ئێمە.. باومان.. نەما....
ئەم دەستەکانی لەملا و لەولاوە لە کەمەری ئاڵاند و ڕوومەتی ڕاستی خستە سەر بەشی لای چەپی سنگیەوە.. دڵی پڕبوو و خەریکبوو دەسکات بە گریان،

بەڵام دانی بە خۆبداگرت و پێی وت:
ـ بە سائەقەت بم مامە ڕۆحەکەم، تۆ باوت نامێنێت..؟!
ئەو کاتێ دەرگای ژوورەوەی کردەوە و قاچی بردە دەرەوە، ئاوڕێکی بۆ دایەوە و پێی وت:
ـ لەمەودوا هەر تۆ بۆینباغم بۆ دەبەستیت، هەتا ئاوا بەردەوام نهێنیەکانی ناو دڵی خۆتم پێ بڵێیت..!!
ـ بە گاڵتەم بوو ها..!! نەیکەیت بە ماڵ بەسەرمەوە..!!
«جیهاد» لەودیو بانگی کرد و وتی:
ـ چییت کرد سیامەند..؟! من چاوەڕێتم... فریاناکەوین... دادەخرێت.. خێراکە....
ـ ئەوا هاتم چاوەکەم.
ئینجا هەر لە ناوەڕاستی دەرگا، پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی بۆ ئەم ڕاوەشاند و پێی وت:
ـ خۆ لە بیرتە لەگەڵ ئامۆژنت ئەو جارە وتمان: بە مەرجێ دەتدەین بە شوو، ئەگەر زاوامان بەوە ڕازیبێت لەم ماڵە نەتباتە دەرێ.. لە بیرتە ها..؟!
ـ بە گاڵتەم بوو.. تۆ بۆچی دەیکەیت بە ڕاست..؟!
ـ دەستوبرد بکە سیامەند درەنگە.
ـ بوەستە.. ئەو پەلەپەلەت لە چییە جیهاد..؟!
ڕووی تێکردەوە و دەستی چەپی گرت بە دەسکی دەرگاکەوە.. هەر بەو بزەیەی لەوساوە لەسەر لێوی نەکوژابووەوە و ئەم حەزی دەکرد وەکوو باڵی تەنک و شەفافی پەپوولە، بە پەنجەی دۆشاومژە و ئەسپێکوژەی دەستی ڕاستی بیگرێت، پێی وت:
ـ ئەوا دەڕۆم کچە دڵدارەکەم، بە تەنیا بەجێتدەهێڵم، چونکە دەزانم ئێستا چەند پێویستیت بەوەیە تەنیا بیت.
ـ پێت دەڵێم گاڵتەمکرد، تۆ بۆچی لێمی نابڕیتەوە..؟! باشە باش..!! بزانە ئیتر قسەت بۆ دەکەم..!!

ـ ئەرێ تۆ چییت بەسەرهات..؟!

ـ تۆ بڕۆ جیهاد من نایەم.

ئەمەی وت و دەستی کرد بە گریان.. دەستەکانی گرت بە چاویەوە و وەکوو مناڵ هەنسکی دەدا:

ـ چییتە سیامەند..؟! بە ڕاستیی نایەیت..؟!

دوای کەمێ هات و دەرگاکەی کردەوە.. هەرکە بینینی وا دەستیان کردۆتە ملی یەکترەوە و بە جووتە دەگرین، واقیوڕما و بە «نەوال»ی وت:

ـ من دەزانم تۆ....

تەواوی نەکرد و بەدەم ئاخهەڵکێشانی قووڵ قووڵەوە لە کاتژمێرەکەی دەستی ڕاستی دەڕوانی.. لە چاوی خۆی نزیکدەکردەوە و دەیوت:

ـ تازە ئەمڕۆ هیچ.. بشچین بێفایدەیە..!!

قایشی کاتژمێرەکەی لە شێوەی کاژی ماری ڕەش درووستکرابوو و بە بزێمێکی سپیی زیویی دادەخرا.. «جومانە»ی دایکی لە بازاڕێکی ئەنتیکی «لەندەن» بەر چاوی کەوتبوو و بە پارەیەکی زۆر بۆی کڕیبوو.. ئەم هەرچەند دەیبینی و سەرنجی لێ دەدا، خەیاڵی بە پێچەوانەی میلە سپیە باریک و چکۆلەکەی بۆ دواوە دەگەڕایەوە و تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق لە دەرگا ڕەشە پان و گەورەکەی ماڵی «شاناز»ی دەدا، کە دەبوایە چوار پلەی قاڵدرمەی سپی ببڕێت و پێی بگات.. کاتێ لەبەر ئەو دەرگایە دەوەستا و لەملا و لەولای خۆی دەڕوانی، کە ڕێگایەکی کەمێ درێژی چەوڕێژبوو و بە بەردەم تاقە خانووەکەی ئەواندا تێدەپەڕی، هەستێکی زۆر سەیر، تۆ بڵێ زۆر خۆش و ئاسوودەبەخشی لە دڵدا دەخولقا و دەیتوانی زۆر شت بڵێت، بەڵام هەموویانی بەلاوە دەنا و تەنها دەیوت:

ـ ئەی خوایە شێوەی ئەم خانووە چەند لە کاتژمێری دەست و ئەو ڕێگا چەوڕێژە چەند لە قایشەکەی دەچێت..!!

ئەوسا حەزی دەکرد و تەواویش ئاسوودە دەبوو، ئەگەر بیزانیایە بۆچی ئەو پیرەمێرد و پیرەژنە خۆبان لە خەڵکی «تپە الاكراد» جیاکردۆتەوە و لەم قەراغە ئەو

کووخەیان پێکەوەناوە..؟! ئەو «شاناز»ەی ئەوەندە حەزی لە قسە و پێکەنینە، چۆن لەو تەنیاییە شێت نابێت و بەیانیان چۆن فریای دەوام دەکەوێت..؟!
هەندێکی تر بە پێ بۆ سەرەوە بچوویتایە و لە دارخورما بەرزەکان تێبپەڕیتایە، دەگەیشتیە ئۆردووگاکە و ئەو ڕێگایەش هەر بۆ هاتوچۆی سەربازەکان چەوڕێژ کرابوو.. زۆر جار لەگەڵ باوکی چووبوو بۆ ئەوێ و سەربازە ڕەشپۆشەکانی بینیبوو، مەشقیان دەکرد و چەکە سپیەکانیان تاقیدەکردەوە.. قەوانی ڕەشی فیشەکەکانی کۆدەکردەوە و بۆ گەڕەکی خۆیانی دەهێنانەوە.. لەگەڵ مناڵان یارییان پێدەکردن و لە سەری پەنجەکانی خۆبانیان هەڵدەکێشان.. بەدەم سەما و هەڵبەزینەوە، دەیاندا بە یەکا و زەنگزەزەنگ زەزەنگ.. زەنگزەزەنگ زەزەنگ، دەنگیان لێ بەرزدەکردنەوە.. ئەم لە «عەمار» فێربووبوو قەوان بە تەل لە تەختەداری سپی چەسپبکات و سلیفۆنی ناو سەنووقی چا بئاخنێتە بنکەکەیەوە.. پڕیبکات لە بارووتی شقارتە و بە بزمارێکی ڕەشی زل بیتەقێنێت، کە بە لاستیکێکی ڕەشتر بەسترابوو بە سەری تەختەدارەکەوە و هەرکە دەیکێشا بە دیواردا، بەر بارووتەکە دەکەوت و دەنگێکی زلی لێ هەڵدەستا.. مناڵان لە ترسا گوێچکەی خۆیان دەگرت و دەستیان دەکرد بە گریان.. «شازە» هەر پێی دەکرا دەرگا لە ژنان بکاتەوە و گوێ لە گلەیی و سەرزەنشتەکانیان بگرێت.. ژنە قەڵەوەکەی سەری کۆڵان، کە مێردەکەی خۆشنووس بوو و لە سووچی ئەوسەری بازاری مسگەرەکاندا دووکانێکی بچکۆلەی کردبووەوە؛ ئەو جارە دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی و وتی:
- زەندەقی کوڕەکەمت برد، ئەی گوللەی بە ڕاستیی چەتەی شاخە بەرزەکانت بەر سەرگۆی دڵ کەوێت خوایە.
دایکی هەرگیز ڕازیی نەدەبوو و زۆر جاریش قژی ڕاکێشابوو، کە قەوانی کۆدەکردەوە و بۆماڵەوەی دەهێنانەوە.. فڕەیدەدان و دەیوت:
- ئێمە چەک و فیشەکمان لێنایەت.. ماڵمان وێران مەکە.
هەموو جارێکیش، کە ماڵی «شاناز»یان بەجێدەهێشت و بەرەو ئێستگەی پاسەکان دەچوون، لە قەراغی ڕێگاکە دەستی دەکرد بە گیرفانەکانی ئەمدا و بەتاڵی دەکردن.. فڕەیدەدانە سەر ڕێگا چەوڕێژەکە و زرنگەیەکی وەکوو زرنگەی

پارەی قەڵبیان لێ هەڵدەستا.. تا دەگەیشتنە سەر شەقامە گشتییەکە و بەلای دەستی چەپیان پێچیان دەکردەوە، لەناو سەریا دەنگیان دەدایەوە و خەیاڵیان پەرش و بڵاودەکردەوە.. لەوێ، ڕێک لەناو کابینەی وێستگەی پاسەکەوە، شێوەی ڕێگاکە لەبەر چاوی ئەم تەواو دەگۆڕا و کتومت لە مارێکی سپیی درێژ دەچوو.. ئەوسا خانووەکەش شتێ نەبوو، بێجگە لە سەپەتەیەکی وەکوو ئەوانەی هیندیەکانی لای مەرقەدی «شێخ عەبدولقادری گەیلانی»، ماریان تێدەکردن و لەگەڵ ئاوازی شمشاڵ، لێیان دەهاتنە دەرەوە.. ئەوجارە «شاناز» هات بە شوێنیا و لەگەڵ خۆی هێنای بۆ ماڵەوە.. هەرکە لە پاسەکە دابەزین و قاچیان خستە سەر شۆستەکە، ئەم بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی ئەوی گرت و لێی پرسی:

ـ پوورە شاناز تۆ دەزانی ئەم ڕێگایە لە چی دەچێت..؟!

ئەو سەیرێکی کرد و پێی وت:

ـ ئەگەر چاوت خێلبکەیت و لێی بڕوانی، وادەزانی پۆلێ قاز سەریان لە دوای یەکترناوە و بە قوونەقوون دەڕۆن..!!

ئەم ئەوەی هەر زۆر بەلاوە سەیربوو و خێرا وایکرد.. بەڵام لەجیاتی پۆلێ قاز، جۆگەیەکی سپیی بینی و خانووەکەشی لێبوو بە ورچێکی ڕەشی زل.. هەستی دەکرد ئێستا نا ساتێکی تر خۆی هەڵداتە ناویەوە و دەیکات بە شڵپوهوڕ.. لەمەوە بۆی دەرکەوت و تەواو لە دڵیا چەسپی، ئەو خانووە خانووی ئاسایی نییە و هەر لەوانە دەچێت، کە لە چیرۆکەکانی ئەو و «شازە»ی ئامۆژنیدا ناویان دەهات و بۆ شتی سەیر سەیر دەگۆڕان.. هەر جارێ قاچەکانیشی دەبردە ئەودیو و سەری بە ناودادەگرت، بۆنێکی زۆر سەیر دەچوو بە قوولایی کونی لووتیا و بە جارێ ئەبڵەقدەبوو.. ئەوجارە «سیامەند» بێچووەکۆترەکانی لە کولانەکە هێنانە دەرێ و خستینیە باوەشیەوە، کە تازە گەنەپەڕیان لێدەهات و بە سیکەسیک خۆیان لە سنگی هەڵدەسووی.. کاتێ سەری بۆ دانەواندنەوە و ماچی کردن، هەستی کرد هەمان بۆنی خانووەکەی ئەوانی لێدێت و بەبێ ویست وتی:

ـ ئای..!! خۆ ئەم بێچووانە بۆنی ماڵی شانازیان لێدێت..!!

ئەو ڕۆژەی «هالە»ی پووری شەپقە سپیەکەی بۆ کڕی و لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ

مـالّی ئەوان، هەر ئەوەندە «شـاناز» دەرگـای کـردەوە و باوەشی پیـاداکـرد، ئەم هەناسەیەکی قوولّی هەلّمژی و وتی:

ـ دەزانی مالّی ئێوە بۆنی بێچووەکۆترەکانی مامە سیامەندمی لێدێت.. ؟!

ئەو حەپەسا و ویستی شتێ بلّێت، بەلّام نەیوت و کردی بە پێکەنین.. دوایی لە ناوەڕاستی هەیوانەکە، کاتێ پێلّاوەکانی لە پێی دادەکەند و بە خاولیە سپیەکە ئارەقی دەموچاوی بۆ دەسڕی، سەیرێکی چاوەکانی کرد و پێی وت:

ـ بە سائەقەی ئەو قسە خۆشانەت بم نەونەوی مالّەکەم، کە نازانم لە کوێیان دەهێنیت..!!

لە مووبەقەکەش، کە هەر خۆی و خۆی بوون و چای لێدەنا، لەپڕ دەمی بردە بن گوێچکەی ڕاستی و بە چپە لێی پرسی:

ـ ئەوە سیامەند فێری کردووی، بلّێی مالّی ئێمە بۆنی بێچووەکۆترەکانی ئەوی لێدێت.. ؟!

ـ نا، پوورە شاناز من خۆم دەزانم.. خۆ من دەزانم وەکوو ئێوە قسە بکەم، ئەی تۆ هەموو جارێ پێم نالّێیت: أم لسان غلابە النسوان..؟!«١٩»

ـ مەترسە گولّم، من پێمناخۆش نییە، ئەو فێری کردبێت، چونکە زۆر حەز لە قسەی ئاوا دەکەم.

ـ من خۆم.... خۆم زانیم ئاوا بلّێم.

ـ دەی باشە قەیناکات، بەلّام تۆ بە مامە سیامەندت بلّێ: پوورە شانازم وتی: مالّی ئێمە بۆنی لینجاوی ناو هێلکەشەیتانۆکەی لێدێت.

ـ جا کوا بۆنی.....؟!

ـ تۆ هەقت نەبێت، ئاوای پێ بلّێ و ئەه..!!

هەستی دەکرد ئەمە جنێوێکی ناشیرینە و ئەم لێی تێناگات.. ئەوە یەکەمجاربوو لە دلّەوە ڕقی لە «شاناز» هەستێت و حەز نەکات لە مالّەکەیان بمێنێتەوە.. چووە لای پووری و پێی وت:

ـ با بڕۆینەوە.

ـ ئەوە چییە نەونەو..؟! بڕۆینەوە بڕۆینەوەی چییتە..؟! تا گەیشتین

خەریکبوو شێت دەبوویت..!!

«نەنە سۆزرەت»ی ئامۆژنی «شاناز» سەرێکی بادا و بەدەم بزەیەکی زۆر جوانەوە وتی:

ـ وەکوو بۆق وایە، هەر ئەوەندە حەز لە هەتاو دەکات، تا پێستی داخنەکردووە..!!

ئەم دەستی ڕاستی لەسەر شانی چەپی پووری هەڵگرت و بە حەپەساویەوە لێی پرسی:

ـ ئینجا کە پێستی داخبوو، چی دەکات..؟!

ـ بە قەڵەمبازێ خۆی هەڵدەداتە ناو گۆمەکەوە.

ـ بۆچی..؟!

ـ جا من بۆ پێت بڵێم..؟! دەبێت خۆت بیزانی.. ئەی تۆ شاگردی شازە قەحپە نییت..؟!

ـ جنێو بە ئامۆژنم بدەن، جنێوتان پێدەدەمەوە ها..!!

پووری هەڵیدایە و پێی وت:

ـ ئەم دەمدرێژییەت لە چییە..؟! گاڵتەت لەگەڵ دەکات..!!

«شاناز»، کە لە پشت دەرگاکە دانیشتبوو و ژێرپیاڵە ڕەشەکانی لەسەر سینیە سپیەکە ڕیزدەکرد، پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی ڕاشەقاند و پێی وت:

ـ ئازای جنێو بە ئێمە بدەیت، بەڵام ئەگەر ئەو قسەمان پێ بڵێت، خۆت بێ دەنگ دەکەیت.. پیسی بۆگەن..!!

ـ ئامۆژنی من وەکوو تۆ نییە جنێو بدات.. ئەم باسی ئێوە قەت قەت ناکات.

ئینجا ڕووی کردە پووری و پێی وت:

ـ ئەوە من لە داخی پوورە شانازم دەڵێم با بڕۆینەوە، چونکە لە مووبەقەکە پێی وتم: بە مامە سیامەند بڵێ ماڵی ئێمە بۆنی لینجاوی ناو هێلکەشەیتانۆکەی لێدێت.

هەر سێکیان لە شوێنی خۆیان حەپەسان و سەیری یەکتریان کرد.. «شاناز»

دەستەکانی گرت بەملا و بەولای ڕوومەتەکانیەوە و پێی وت:
ـ من..؟! من نەونەو ئاوام پێ وتی..؟!
ـ ئەی تۆ کە بە دەسگرەکە قۆریە سپیەکەت لەسەر تەباخە ڕەشەکە داگرت، وات نەوت..؟! ها..؟! وات نەوت..؟!
«شاناز» نەیتوانی لەوە زیاتر بەرگری لە خۆی بکات و سەری لەبەر نا.. پووری، کە هەمیشە لەگەڵ ئەودا گاڵتەی دەکرد و هەرچی جنێوی سووک هەبوو بە یەکتریان دەدا؛ دەستەکانی بە چاویەوە گرتبوو و پێدەکەنی.. دوایی بە شێوەیەکی زۆر سەیر پەرچەمەکەی لەسەر چاوەکانی لادا و لێی پرسی:
ـ باشە ئەوە یانی چی شاناز..؟!
ـ بێ دەنگ بە تۆش قەحپە.. چەند زوو باوەڕتکرد..!!
«نەنە سۆزرەت» ، شەبقەکەی «نەونەو»ی بەم دەست و بەو دەستی گرت و سەیری ناوەکەی کرد، کە پووری هەر لەگەڵ گەیشتن بۆی داگرتبوو و ڕوو لە بنمیچەکە و لە بەردەمی خۆی دایتابوو.. ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و بەبێ سەرهەڵبڕین وتی:
ـ ئەو منالانەی بنی پێیان زیاتر لە تەوقی سەریان هەست پێدەکەن، هەمیشە شتی سەیر سەیر دەڵێن..!!
«نەونەو» تێیدەگەیشت و دەیزانی باسی چی دەکات.. ئەم لە نیوەڕۆیەکی تەمووز و لەبەر دەرگای ئەواندا بنی پێکانی خورووی تێکەوتبوو و هەر خێرا پێلاوە سپیە تازەکانی فڕێدابوو، کە دایکی چەند ڕۆژێ دوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی وڵات بۆی کڕیبوو و باوکی قەیتانە ڕەشەکانی بۆ لە کونە لاکێشەییەکانی هەڵکێشابوو.. بەسەر ئەو ڕێگا چەورێژە داخبووەدا ڕایدەکرد و هەر لە خۆیەوە دەیوت:
ـ ئاسمان کەوتووە بە دەما و زەوی بۆتە بەستەڵەک.. ئاسمان کەوتووە بە دەما و زەوی بۆتە بەستەڵەک.
هەرچەند قایمتر قاچەکانی لەسەر بەردە تیژ تیژەکان، زبر زبرەکان، لووس لووسەکان، چوارگۆشەییەکان، لاکێشەییەکان و بازنەییەکان، دادەنا و زیاتر دەنگی

لێ هەڵدەبڕی، ئەوەندە زیاتر هەستی بەو تەزووە دەکرد و گورجتر بە ناو دەمارەکانیا دادەگەڕا، کە نەیدەزانی بۆچی و لە کوێوە دێ.. دێ و دەیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.. دێ و چاوەکانی دەخاتە ڕەشکەوپێشکەوە.. دێ و سیمای شتەکانی لێ دەگۆڕێت.. دێ و هەموو ڕابردووی لە بیردەباتەوە.. دێ و لە دەوروبەرەکەی جیایدەکاتەوە.. دێ و پێی دەڵێت:

ـ ئاسمان کەوتووە بە دەما و زەوی بۆتە بەستەڵەک.. ئاسمان کەوتووە بە دەما و زەوی بۆتە بەستەڵەک.

کاتێکیش لەناو باوەشی «شاناز» و لەسەر چوارەم پلەی قادرمەکەی بەر دەرگادا بە ئاگاهاتەوە و چاوی کردەوە، قاچەکانی لە دوو کۆتری خوێناویی دەچوون و هەستیشی بە هیچ ئازارێکیان نەدەکرد.. «نەنە سۆزرەت» بۆی دەگریا و قژی سپیی بۆ دەڕنیەوە.. بە چرنووک دەموچاوی چرچی خۆی دادەڕنی و دەیوت:

ـ خوێنی نەونەو لەسەر بەردە گەرمەکانی بەر دەرگای تاقەماڵی چۆڵ و دوور لە ئاوەدانیمدا ڕژاوە و لەبەر تیشکی خۆری بە تینی ناوەڕاستی ئاسمانی پاک و بێگەرددا دەبریقێتەوە.

هەرچی «مام مارف» بوو، بە کزۆڵەیی، دەست بەرەو ئاسمان و سەر بەرەوژێر، قاچ لەرزۆک و شان داتەپیو، لە پەنا دیواری کەمێ نزمی حەوشەدا وەستابوو و بە دەنگێکی ماندوو دەیوت:

ـ کۆیانکەنەوە تا تۆزیان لێ نەنیشتووە.. کۆیانکەنەوە تا ساردنەبوونەتەوە.. کۆیانکەنەوە تا قەتماغەیان نەگرتووە.. کۆیانکەنەوە و بیاننووسێنن بە لای چەپی سنگما، تا لە ژێر قاچی ڕێبوارانداا کاڵنەبوونەتەوە و لە ڕەونەق نەکەوتوون.

«نەونەو» گوێی بەو قسانە نەدەدا و چاوی بۆ پێڵاوەکانی دەگێڕا.. هەستی دەکرد لە خەوێکی قووڵی درێژخایەندا بە ئاگاهاتۆتەوە و لەوێی بەجێهێشتوون.. ئەوسا سووک و ئاسان دەیتوانی دەنگ هەڵبڕێت و بڵێت:

ـ پێڵاوەکانم لەسەر تاقی ژووری چوارگۆشەیی خەونێکما بەجێماوە و خۆم بە پێپەتیی گەڕاومەتەوە.

بەڵام وای نەوت و سەری بە شلیی خستە سەر شانی چەپی گۆشتنی ڕووتی

«شاناز»ـەوە.. ئەو بە سووکی چەناگەی خۆی لەناو قژیا مەلاس دا و بە چپە پێی وت:

ـ ئێستا لە هەموو کاتێ چاکتر دەتوانیت لاسایی ئەو ورچە ڕەشە بکەیتەوە، کە قاچەکانی بە تەڵەی ڕاوچیە سپیپۆشەکانەوە دەبێت.

هەر جارێ «شاناز» لە باوەشیا پاڵیدەخست و ئەو هەقایەتەی بۆ دەکرد، ئەم جووڵەی لە خۆی دەبڕی و گوێچکەی بۆ شلدەکرد.. بەیانییش، کە بێداردەبووە و سەری لەسەر قۆڵی چەپی ئەو هەڵدەبڕی، لێفەکەی لە قاچەکانی دەئالاند و تەمسیلی پەلەقاژەی ورچەکەی بۆ دەکرد.. لەپڕ چاوەکانی دادەخست و درزی ئاسۆیی باریکی تێدەکردن.. هەناسەی لە خۆی دەبڕی و هەستت دەکرد بە ڕاستیی مردووە.. دەبووایە «شاناز» دەستەکانی بخاتە سەر سنگی و بۆی بگری.. بۆی بگریت و بڵێت:

ـ ئای..!! خۆ ورچەکە مرد و بێچووەکەشی وا لە ئەشکەوتێکا چاوەڕێی شیرە..!! مرد و بەفر لاشەکەی داپۆشی.

بەڵام لەو جارەوە بە ڕاستیی گریا و وتی:

ـ نەبینم.. نەبینم نەونەوەکەم مردبێت و من بۆی بگریم.

ئیتر چیتر بۆی نەکردەوە و بە تەواوی وازی لێهێنا.. هەرچەند بیری دەکەوتەوە و دەهاتە بەر چاوی، کە چۆن دەستەکانی گرتبوو بە چاویەوە و فرمێسکەکان لە کەلێنی پەنجەکانیەوە تکەیان دەکرد، هەر لە خۆبەوە ترس دایدەگرت و نەیدەوێرا شەو لەو خانووە چۆڵ و چەپەدا بنوێت.. ئەو چەند جارەش، کە «شاناز» بە پاڕانەوە ڕازییدەکرد و لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، خواخوای بوو ڕۆژبێتەوە و چیتر ئەو ژوورە وەکوو ئەشکەوتی تاریک نەبینێت.. کەچی دوای ئەوەی گوێزایانەوە و هاتنە ناوەڕاستی گەڕەکی «تپە الاكراد»، لە دڵەوە بیری ئەو شەوە ترسناکانەی ئەوێی دەکرد و پێی خۆشبوو هەمیشە لەگەڵ «شاناز»دا باسی بکات، بەڵام ئەو هەموو جارێ ئاخی هەڵدەکێشا و پێی دەوت:

ـ نە من و نە مامم و نە ئامۆژنیشم حەزناکەین تۆ باسی ئەو خانووەمان لەگەڵدا بکەیت.

ئەم توورەدەبوو و دەیوت:
ـ دە من ئێوەم خۆشناوێت.
«شاناز» هەر جارێ بە شتێ ئاشتیدەکردەوە و پێی دەوت:
ـ ئێمە وەکوو تۆ بیرمان تیژ نییە چاوەکەم، ئەوێمان لە بیرچۆتەوە.
ئەو جارە لە حەمامەکەدا بنی پێی ڕاستی خستە سەر ڕانی چەپی ڕووتی ئەو و بە گلەییەوە پێی وت:
ـ چۆن لە بیرتان چۆتەوە..؟! ئەی تۆ هەموو جارێ باسی منالّیی خۆتم بۆ ناکەیت..؟!
ـ جا من کوا بە منالّیی لەو خانووەدا ژیاوم..؟!
ـ مالّتان لە قەلاّی هەولێر بوو وانییە..؟!
ـ ئا.
ـ لەگەلّ ئامۆژنم..؟!
ـ نابێت ئەوەش بلّێیت.
ـ ئەی من هیچ نالّێم..؟!
ـ با، گۆرانیەکەی فێرم کردی.. ئەوم بۆ بلّێ، شاناز لە دەوری سەرت گەڕێ.
ـ ئەها بیرت ماوە..!! ئەی تۆ لە حەمامەکەی ئەوێ فێری ئەو گۆرانییەت نەکردم..؟!
ـ هەستە با جلەکانمان لەبەرکەین و بچینە دەرێ.. تۆ حەزناکەیت من خۆشمبوێیت..!!
هەرچەند ئەو خۆی لەو باسە دەدزیەوە و وەلاّمی پرسیارەکانی نەدەدایەوە، ئەم ئەوەندەی تر لێی دەبوو بە مەراق و زیاتر حەزی دەکرد ئەو نهێنییەی بۆ دەرکەوێت.. ئەو ئێوارەیەی لە هەیوانەکەی خۆیاندا قاچەکانی ڕاکێشابوو و چێشتی «کوچری» «٢٠»ی ناو قاپەکەی دەخوارد، خۆیشی نەیزانی بۆچی بیریکەوتەوە و خەیالّی ڕۆیشت.. ئامۆژنی لەولایەوە دانیشتبوو و مەزەی بۆ «سیامەند» ئامادە دەکرد.. سەیرێکی کرد و بە توورەیی پێی وت:
ـ بیخۆ نەونەو تا ساردنەبۆتەوە.

ـ بۆچی پووره شانازم حەزناکات باسی خانووه کۆنەکەیانم بۆ بکات..؟!
ئەو خێسەیەکی لێکرد و پێی وت:
ـ نالێم کاتی نانخواردن هیچ پرسیارێکم لێنەکەیت..؟!
قاپەکەی برد بۆ مووبەقەکە و خێرا هاتەوە.. لە بەرامبەری وەستا و پێی وت:
ـ دەی ئێستا پێم بلێ، خۆ نان ناخۆم.
بە دەستی چەپی زللەیەکی قایمی لە ڕوومەتی ڕاستی دا و سەری لەگەڵیا گێژی خوارد.. پشتی بەر دیوارەکە کەوت و چاوی ڕەشکەوپێشکەی کرد.. ئەوی وکوو سەماوەرە سپیەکەی مووبەق دەبینی و موچرکی پیادا دەهات، کە وێنەی شتەکانی دەکرد بە دووانی وەکوو یەک و دزێو و ناشیرین دەریدەخستن.. گوێچکەکانی کپبوون و بە حاڵ دەنگەکەی دەبیست:
ـ ئێستا دەزانی بۆچی باسی ناکات..!!
مامی، کە لە ناوەڕاستی دەرگای حەوشە وەستابوو و چاوەڕێی هاوڕێکانی دەکرد، خێرا بە فریایکەوت و کردیە باوەشیەوە.. لەسەر کورسیە ڕەشەکەی دانا و ژێریکردەوە، کە لە دارێکی تۆکمە درووستکرابوو و بە پێستی خۆشکراوی گامێش بەرگی تێگیرابوو.. ئینجا بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی گرت و پێی وت:
ـ ئەمشەو بە دڵی تۆ دەبێت ڕۆحەکەی مامە، دوو هاوڕێی زۆر قسەخۆشم دێن و بۆ خۆمان تێر پێدەکەنین.
ـ من دەیانناسم..؟!
ـ با بێن، ئینجا دەیانناسیت و خۆشتدەوێن.
کاتێ ئەوان گەیشتن و بەرەو ژووری میوان چوون، ئەم لەگەڵ ئامۆژنی ئاشتبووبووەوە و لە مووبەقەکەدا باسی ئەوەی بۆ دەکرد، چۆن ئەمڕۆ لە پۆل وەکوو گوڵ «نار» و «نور»ی خوێندۆتەوە و چەپڵەیان بۆ لێداوە.. سەیرێکی کردن و بە حەپەساویەوە وتی:
ـ من ئەو پیاوانە دەناسم..!!
ئامۆژنی پێکەنی و وتی:
ـ تۆ لە کوێیان دەناسی دڵە..؟! ئەمانە یەکەمجارە دێن بۆ ماڵی ئێمە و لە زۆر

دووریشەوە هاتوون..!!

نەیوێرا وەڵامی بداتەوە و پێی بڵێت:

ـ لەماڵی پوورە شانازم دیومن.

ئەوی بەجێهێشت و بەرەو ژوورەوە چوو.. کاتێ بە دیقەت سەیری کردن و جوان لێیان وردبووەوە، هەستی کرد بە هەڵەدا نەچووە و خۆیانن.. لە پشت کورسیەکەی مامی وەستا و دەستەکانی بە شلیی کردە ملیەوە.. چەناگەی خستە سەر شانی چەپی و لێی پرسین:

ـ ئێوە ماڵتان لە کوێیە..؟

ئەوان سەیری یەکتریان کرد و لە قاقای پێکەنینیان دا.. باڵابەرزەکەیان پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشان و پێی وت:

ـ ئێمە ماڵمان نییە.

ـ يعني مثل أم البزازين كل يوم ببيت..؟! (یانی وەکوو ئەو پشیلەیەی بێچووی هەیە، هەر ڕۆژێ لە ماڵێکان..؟!)

ـ تۆ ئەمە چۆن دەزانی عاجباتی..؟!

ـ لە ئامۆژنم فێربووم.

ـ بەڵام ئێمە پشیلە نین و بێچووشمان نییە، تا لێیان بترسین و هەر ڕۆژێ لە کون و کەلەبەری ماڵێکا بیانشارینەوە.

«نەونەو» هەستی دەکرد ئەو پیاوە وەکوو کەسێکی گەورە لەگەڵیدا دەدوێت و قسەکانی هیچ لە گاڵتە ناچن.. ئەو جارەش، کە لە ژوورەکەی دواوەی ماڵی «شاناز» بەرێککەوت بینی و لە دەموچاوی وردبووەوە، زۆر مۆن و ڕەزاگران هاتە بەر چاوی.. هیچ حەزیشی نەدەکرد و لە دڵەوە پێی ناخۆشبوو، کاتێ «شاناز» بە سینیەک چێشتەوە چوو بۆ لای و دەرگاکەی بە سەرخۆیاندا داخست.. ترسی لێ نیشت و دڵی داخورپا.. «مام مارف» و «نەنە سۆزرەت»یش لە ژوورەکەی تر نووستبوون و پرخەیان دەهات، بۆیە نەیدەزانی لە کێ بپرسێت و چۆن بۆی دەرکەوێت، ئەو پیاوە ئێسکقورسە کێیە و بۆچی «شاناز» دەوروخولی دەدات..؟! سەری بە دەرگاکەوە نا و گوێچکەکانی بۆ دەنگێک، چرپەیەک، هەناسەیەک،

خستە بۆسەوە.. بەڵام هیچی نەبیست و ئەوەندەی تر مەراقی زیادی کرد.. دوایی لەپڕ «شاناز» دەرگاکەی کردەوە و بە ئەسپایی هاتە دەرێ.. لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا وەستا و بە شانە سپیەکە قژی داهێنا.. ئەم لێی چووە پێشێ و پرسی:

ـ ئەوە تۆ شووت کردووە بەو پیاوە..؟!

ئەو قاقایەکی بەرزی لێ دا و پێی وت:

ـ کام پیاوە..؟!

تەریقبووەوە و سەری لەبەر نا.. ئەو دەستەکانی خستە سەر ئەم شان و ئەو شانی و لێی پرسی:

ـ تۆ وادەزانی ئێستا پیاوێ لە ماڵی ئێمەیە.. وانییە..؟!

ـ من ئەو پیاوە دەڵێم، کە تۆ چێشتت بۆی برد.

ـ تۆ بە چاوی خۆت بینیوتە..؟!

ـ ئا، بەڵام ئەو منی نەبینیوە.

ـ باشە قەیناکات، بەڵام نابێت بە کەسی بڵێیت.

ـ لەبەرچی..؟!

ـ پێت ناڵێم.

ـ بۆچی تووخوا بۆچی..؟!

ـ مەپرسە.. تووخوا مەپرسە.

نەیپرسی و وازیهێنا.. ئەوەی تریشی بینی وەکوو دز لە دەرگای حەوشەوە دەرکەوت و بە هەنگاوی کورت کورت بۆ ژوورەکەی ئەو چوو.. بەیانی پێش ئەوەی ئەم بێداربێتەوە و بەرچاییەکەی بخوات، ئەوان ڕۆیشتبوون و ئەویان بەجێهێشتبوو.. بەڵام ئەوەتا وا جارێکی تر لە ماڵی خۆیان پەیدابوونەوە و ناشوێرێت ئەو ڕاستیە بە مامی و ئامۆژنی بڵێت....

ـ زۆر حەزدەکەیت بزانیت ئێمە ماڵمان لەکوێیە..؟!

ـ ئەی چۆن حەزناکەم..!!

ـ دەستێکی خۆتم بەرێ.

چەپەی بۆ درێژ کرد و ئەو بە هی ڕاستی سەری پەنجەکانی گرت.. بە نینۆکی

پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی ئاماژەی بە ژمارە هەشتەکەی ناو لەپی دەکرد و وەکوو قەڵەم پیایدادەهێنا.. بەرزیدەکردەوە و نزمیدەکردەوە.. نزمیدەکردەوە و بەرزیدەکردەوە.. جار جار سەری هەڵدەبڕی و پێی دەوت:

ـ ئێمە لێرە دەژین.

ئەم ختووکەی دەهات و گیانی بە ژێر موچڕکدا دەکەوت.. پێدەکەنی و پێی دەوت:

ـ وای مامە چەند یاریەکی خۆشە..!!

کاتێ ئەو دەستی بەڕەڵلاکرد و وتی:

ـ دە بەسە تاقەتم چوو..!!

ئەم وازی لێ نەهێنا و پێی وت:

ـ نا، تووخوا بەس نییە، زۆر خۆشە..!!

ـ ماندووبووم..!! ئیتر ناتوانم..!!

ـ یەک جاری تر..!! بەس یەک جاری تر..!!

ـ دەڵێم ناتوانم.. وازم لێبێنە.

ـ ئەوە مامە ئەم یاریە خۆشە لەکوێ فێربوویت..؟!

هاوڕێکەی پێکەکەی بەردەمی هەڵقوڕاند و لێی پرسی:

ـ خۆشیەکەی لە چیایە..؟!

ـ ئەی چۆن ختووکە خۆش نییە..؟!

ـ باشە تۆ پێم بڵێ کامەیانت بەلاوە خۆشە..؟! بۆ سەرەوە، یان بەرەو خوار..؟!

ـ ئەوە تۆ دەڵێی چی..؟! خۆ من لێت تێناگەم..!!

ئەویش وەکوو هاوڕێکەی دەستی گرت و نینۆکی خستە سەر بنکی لای ڕاستی هەشتەکەوە.. بەرەو سەرەوە بزوواندی و لێی پرسی:

ـ ئێستا خۆشە، یان کاتێ بەرەو خوارەوەی دەهێنم..؟!

ئەم لە تاوی ختووکە و پێکەنین هەڵدەپەڕی و دەیوت:

ـ هەر دووکیان وەکوو یەک خۆشن مامە..!! هەر دووکیان وەکوو یەک

خۆشن..!!

لەمەوە خۆشیویستن و حەزی دەکرد هەر لایان بمێننەوە.. لە ترسی «شازە» نەبووایە، تا درەنگی شەو لایان دادەنیشت و یاریی لەگەڵدا دەکردن، بەڵام ئەو هات و پێی وت:

- هەستە دەی، با ئێمە بچین بنووین، زۆر درەنگە.

بەیانی پێش ئەوەی خۆی بگۆڕێت و بچێت بۆ قوتابخانە، خەبەریکردنەوە و پێی وتن:

- هەستن با یاریی «ماڵتان لەکوێیە» بکەین.

ئەوان زۆریان خواردبووەوە و تەواو مەستببوون، بۆیە چاویان بۆ نەدەکرایەوە و بەحاڵ زمانیان گۆیدەکرد.. باڵابەرزەکەیان بە سستی سەری هەڵبڕی و پچڕپچڕ پێی وت:

- ئێمە زۆر ماندووین، با تێرخەو ببین، ئینجا یاریی زۆر لەوە خۆشتریش دەکەین.

ئەو ڕۆژە لە پۆل، دەستی چەپی دەخستە سەر تەختەکەی بەردەمی و بە نینۆکی دۆشاومژەی ڕاستی بە هەشتەکەدا دەچووەوە.. جار جار قاقایەکی لێ دەدا و دەیوت:

- ئێمە لێرە دەژین.

منالانی هاوپۆلی سەیریان دەکرد و پێی پێدەکەنین.. مامۆستاکانی هەر زوو زوو بە ئاگایان دەهێنایەوە و لێی تووڕەدەبوون.. نیوەڕۆ، کاتێ «سیامەند» هات بە شوێنیا و بۆ ماڵەوەی بردەوە، ئەم خێرا پرسیاری ئەوانی لێ کرد و ئەو پێی وت:

- ڕۆیشتن، ئیتر نایەنەوە.

لە داخا دەستی کرد بە گریان و بە هیچ شێوەیەک ژیرنەدەبووەوە.. لەمەوە خووی بە یاریەکەیانەوە گرت و نەیدەتوانی دەستبەرداری بێت.. ناردیان بە شوێن دایکیا و ماوەیەک مۆڵەتیان دایە.. سەرەتا بە قسەی خۆش و دوایی هی ناخۆش، دواتر لێدان و ئەنجام پیشانی دکتۆرەکانیان دا.. هەر زوو لێیان نائومێد بوون و

پەنایان بۆ «خانزاد»ی مامان برد.. ئەو جووتێ دەسکێشی بۆ لەناو باوەڵێکی سپیی تۆزلێنیشتووی ژوورە تاریکەکەی هێنایە دەرێ و کردیاننە ئەم دەست و ئەو دەستیەوە، کە لە پێستی خۆشکراوی ورچی ڕەش درووستکرابوون و ناولەپیان بە وێنەی فیشەکدانی بەتاڵی سپی چنرابوون.. جارێ بۆنی لینجاوی ناو هێلکەشەیتانۆکە و جارێ بۆنی سیر، جار جار بۆنی نەوت و جار جار بۆنی ژووری کەمێ تاریکی کتێبە کۆنەکانی ژێر قادرمەی قوتابخانەیان لێدەهات و قێزی لێدەکردنەوە.. دڵی تێکهەڵدەهات و هێڵنجی دەدا.. دەرشایەوە و ڕۆحی دەردەچوو.. کاتێکیش چاکبووەوە و گەڕایەوە بۆ قوتابخانە، بیری لە پەیوەندیی نێوان ژمارە هەشتەکەی ناولەپی و ختووکە و قێزکردنەوەدا دەکردەوە و هەمیشە لە خەیاڵی خۆیدا تاوتوێی دەکرد، بەڵام زۆر زۆر زەحمەتبوو شتێکی بۆ ڕوونبێتەوە و ئەنجامەکەی بە دەستەوەبێت.. دواتر بۆی دەرکەوت و تەواویش دڵنیابوو، کە بەبێ ئەو پیاوانەی فێری ئەو خووەیانکرد و خۆیان لێی شاردەوە، مەحاڵە لێی تێبگات و هەموو هەوڵێ لەگەڵیا بێهوودەیە.. ئەو پیاوانەی هەر لە پاڵەوانی چیرۆکە ئەفسانەییەکان دەچوون و بە پێی لێکدانەوەی خۆی وا لە خانووە کۆنەکەی ماڵی «شاناز»دا دەژین.. بەڵام ئاخ کەس نییە لەگەڵی بچێت بۆ ئەوێ و بە تەنیاش نایدۆزێتەوە..!! کاتێکیش کەمێ گەورەبوو و دەیتوانی زیاتر تێبگات، خانووەکەیان تەختکردبوو و هەر شوێنەواریشی نەمابوو.. تەنانەت ئەو ڕێگا چەوڕێژەی هەر جارێ لە شتێ دەچوو و خوێنی قاچەکانی ئەمی لەسەر ڕژابوو، قیرتاویان کردبوو و تەواو سیمایان گۆڕیبوو.... ڕۆژی دوای شووکردنی «دیلهام»، «سیامەند» لەوێ فێری لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیلی دەکرد و هەموو ئەو شتانە و ئەوانی دواتری بیردەکەوتەوە.. بەڵام هەر ئەوەندە زمانی هەڵبهێنابووایەوە و شتێکی لە بارەیەوە بوتنایە، ئیتر ئەو تووڕەدەبوو و تەواو زەوقی تێکدەچوو.. ئەو هەر لە زووەوە ئاواتی بینینی ئەو ڕۆژەی دەخواست و خەونی پێوەدەبینی، کە ئەم ئاوا ئۆتۆمۆبیل لێبخوڕێت و خۆبشی لە تەنیشتیەوە دابنیشێت، بۆیە چەند بڵێیت ئاسوودەبوو و حەزی نەدەکرد سەرودڵی بگرێت.. لەگەڵ «شازە»شدا هەر لە زووەوە بەڵێنیان پێدابوو بیبەن بۆ پیشانگای «ألبيداء»«٢١» و شۆفەرلێتێکی

ڕەشی وەکوو ئەوەی «هیام»ی بۆ بکرێ، ئەگەر لە پۆلی سێ دەربچێت و لە پەیمانگای هونەرە جوانەکاندا وەربگیرێت.. ئەم ئەو جارە لەگەڵ «هیام»دا بوو و بە چاوی خۆی بینی، کاتێ سەربازە سپیپۆشە شێتەکەی کرد بە ژێرەوە و گیانی وەکوو تەباشیر هاڕی.. ئەمە ئەو سەربازەبوو، کە لە ترسی «کاکەسوور» ئەقڵی لە دەست دابوو و ڕەوانەی ناو شاریان کردبووەوە.. دەستی چەپی دەخستە سەر شانی ڕاستی و چەپی دەخستە سەر هی لای ڕاستی و لە بازاڕدا دەسووڕایەوە.. کڵاوێکی ڕەشی لە شێوەی ئەمووستیلەی دروومانی دەکردە سەری و هەمیشە دەیوت:

- ڕاکەن و شوێنی پێکانتان بخەنە سەر لەپی دەستتان، پیاوی ئازای ناو خەیاڵی بتە سەرمابردەڵەکانی ئەشکەوتە لەبیرکراوەکانی شاخی هەتاونەدیوی ئەودیوی دۆزەخی ژێر دەستی قەیسەرە وەجاخکوێرەکان هێرشیان هێناوە و ونجڕ ونجڕتان دەکەن.

لەمەوە خۆبشی نەیدەزانی بۆچی هەرچەند بەسەر ئەو شەقامەدا دەڕۆیشت و سەیری دەکرد، چاوی دەکەوتە ڕەشکەوپێشکە و وەکوو سفرەی نانخواردن دەهاتە بەر دیدەی.. کەچی حەزی دەکرد هەمیشە بە سەریدا بڕوات و ئەو ڕۆژەی بیربکەوێتەوە، کە گوێی لە کرتەکرتی تێکشکانی ئێسقانەکانی پشت و ئەژنۆکانی بوو و لە نزیکەوە دەیبینی خوێن لە هەموو لایەکەوە فوارەی دەکرد.. فوارەی دەکرد و چزززز لەسەر قیرە ئێجگار ڕەش و چەند بڵێیت داخبووەکەدا وەکوو ڕەنگی سووری سەر لاپەڕەی دەفتەری نیگارکێشاندا بڵاودەبووەوە.. دەستفرۆشەکان تێکڕا ڕایاندەکرد و لێیان کۆدەبوونەوە.. شێتانە هاواریاندەکرد و خنێویان پێ دەدان.. پیاوە چرووساوەکەی دیشداشەیەکی سپیی لەبەردابوو و سینیەک لوقمەقازیی خستبووە سەر سەریەوە، بە دەستی چەپی لە بۆنیتی ئۆتۆمۆبیلەکەی دەدا و بە دەنگە نووساوەکەی دەیوت:

- وەزیری بەرگری ڕۆژ نییە ژنە حیزەکەی نەباتە کۆشکی سەرۆک و بە دەستی خۆی قاچەکانی بۆ نەکاتەوە.. ئەوا کچەکەشی......

سمێتفرۆشەکە یەک یەک سمێتەکانی دەگرتە جامی پێشەوەی ئۆتۆمۆبیلەکە و

دەیوت:

ـ هەمووی بە قوزی ژنی وەزیر.

پیاوە دەموچاوئاولاویەکە سەبەتەی نانەکەی بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی و تا تینی تیابوو هاواری دەکرد:

ـ کورە کێرم نییە کێرم..؟! بە قوزی تاقە کچەکەی وەزیر.

هەندێکیان دەستەکانیان ڕەقدەکرد و بەرزیاندەکردنەوە.. ڕایاندەوەشاندن و تێکڕا دەیانوت:

ـ نازک بگێم.. نازک بگێم.. نازکی کۆشکی وەزیر بگێم.

تا پۆلیسە سپیپۆشەکانیش هاتن و بە خێرایی لە پیکابە ڕەشەکان دابەزین، ئەم جنێوی دەدا و ئەو بۆی دەسەندەوە.. ئەوان ئازایانە بلاوەیان پێکردن و بە قامچیە ڕەشەکانیان دووریانخستنەوە، کە جار جار بۆنی ماسیی سوورکراوە و جار جار بۆنی ئیسپرتۆبان لێدەهات و لەبەر تیشکی هەتاوی گەرمی ئەو نیوەڕۆیەدا دەبریسکانەوە.. «نەوال» سەری لەو خەڵکە سوورمابوو و بیری لێدەکردنەوە، ئاخۆ بۆچی ئاوا بە مردنی شێتێک وورووژان و ئەو کارەیان کرد..؟! ئەفسەرێکی گەورەی قۆشمەچی بۆ دڵنەواییکردن هاتە لایان و بۆ خۆشیی پێی وتن:

ـ هەرچی دەڵێن، با بیڵێن، لەگەڵ حکوومەتیانە و بە ئێوەچی..؟! هەر گوێشیان مەدەنێ.

ئینجا قاقایەکی بەرزی لێ دا و وتی:

ـ حکوومەت بە جنێوی هاوولاتیەکانی خۆی خۆشەویستدەبێت.. پشیلەی ماڵیی بەوەدا دەزانێت خاوەنەکەی خۆشیدەوێت، کە زوو زوو پەنجەگەورەی قاچی بکات بە قنگیا.

ئەم هەستی دەکرد وردە وردە سەری دەخولێتەوە و سووک سووک گیانی دادەهێزرێت.. قورگی دەگیرێت و هەناسەی تەنگدەبێت.. هەرچۆنێ بوو دەرگای پێشەوەی کردەوە و بە شلوشۆقی خۆی هەڵدایە سەر کوشینەکەوە.. دەستی چەپی گرت بە ناوچەوانییەوە و بە «هیام»ی وت:

ـ من بگەیەنەرە ماڵەوە.. خەریکە دەبوورێمەوە.

ـ ئەی نەچین بۆ سەیری پەیکەری خەلدوونی گۆرانیبێژ..؟!
ـ ناتوانم.. چاوەکەم.. بڕوابکە ناتوانم.. خێرا سەرکەوە و لێیخوڕە.. من تەواو......
ـ خۆ بە پێ ناچین شتەپیس، هەتا نەتوانیت..!!
ـ من هیلاکم چاوەکەم، تۆ بۆچی باوەڕم پێناکەیت..؟! بۆ..؟! بۆ..؟!
ـ بیانوویەکی چاکت دۆزیەوە، تا بچیتەوە لای سیامەند.
ئەمەی وت و بە بێزاریەوە ئۆتۆمۆبیلەکەی خستە گەڕ.. کاتێ لە فولکەکەی ئەوسەر پێچی کردەوە و لە دەموچاوی ئەمی ڕوانی، بەدەم پێکەنینێکی پڕمەغزاوە سەری بادا و وتی:
ـ خۆزگە بۆ شەوی بووکێنیەکەشت سیامەندت لەگەڵ خۆت دەبرد..!! خۆزگە دەمزانی تۆ....
ئەم ئەوەندەی تر پەستبوو و لە داخا دەستەکانی گرت بە چاویەوە.. ڕۆژی پێشووش، کاتێ لە ماڵی ئەوانەوە تەلەفۆنی بۆ مامی کرد و هەر لە خۆبەوە گریا، ئەو لەجیاتی ئەوەی دەستبکاتە ملیەوە و دڵنەوایی بداتەوە، گاڵتەی پێدەکرد و دەیوت:
ـ چەند گوناحە..!! ئەوە چوار ڕۆژە مامی خۆی نەدیوە..!!
بە دەستی ڕاستی جامەکەی زیاتر هێنایە خوارێ و خەمناکانە چاوێکی بەسەر شەقامەکەدا گێڕا.. ژنێکی باڵابەرزی بینی و دڵی داچڵەکی، کە بە تەنوورەی ڕەش و کراسێکی سپیەوە سووک سووک ڕێگای دەبڕی و ورد ورد سەیری دووکانەکانی دەکرد.. خێرا و بەبێ ویست دەستی چەپی خستە سەر ڕانی ڕاستی «هیام» و هاواری کرد:
ـ بوەستە.. بوەستە.. خێرا دەی.. پوورە هالەم......
زمانی لە گۆکەوت و قسەکەی بۆ تەواو نەکرا.. لە شپرزەییا خەریکبوو دەرگاکە بکاتەوە و خۆی هەڵداتە خوارەوە.. هەر ئەوەندە ئەو سووکی کردەوە و برێکی گرت، ئەم دابەزی و وەکوو شێت بە سەر ئەو شەقامەدا کەوتە ڕاکردن.. بەرەو لای دەچوو و هاواری دەکرد:

ـ پووره هاله.. پووره هاله.

پێش ئەوەی بگاتە بەردەمی و دەستـــبکاتە ملیـــەوە، لەترێکی دا و لەناو ئاپۆرەی ئەو خەڵکەدا کەوت.. کـاتێکی زانی «هیـام» گەیشـتـە سـەر سـەری و هەڵیگرتەوە.. بە پشـتـی دەسـتـەکـانی تۆزی سـەر جلە ڕەشـەکـانی تەکـاند و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ ئەرێ ئەوە تۆ خۆت دەنوێنیت، ئاوا بە سەر ئەم شەقامەدا ڕادەکەیت..؟! ئەوە چ پووره هالە پووره هالەتە بێئەقڵ..؟!

کاتێ بە شەرمەوە دەرگاکەی کردەوە و بێزەوقانە خۆی هەڵدایە سەر کوشینەکە، چاوەکـانی لەبەر نا و بە شـێـوەیەک تەریقـبـووەوە، کـە نەیدەویست جـارێکی تر هەڵیانبڕێتەوە و هیچ کەسێکیـان پێ ببینێت.. تەنانەت حەزی نەدەکرد بچـێتە ماڵەوە و ئەو «سیامـەند»ـەش ببـینێت، کە گـەرەکی بوو بە مـاچی فرمێـسکاوی قـەرەبووی ئەو چوار ڕۆژ دووریەی بداتەوە و شـەویش وەکـوو ڕۆژگـاری منـاڵـیی تا بەیانی لە باوەشـیـا بنـووێت.. کـاتێکیش بە دەسـتی ڕاسـتی دەرگـای کـردەوە و قـاچەکـانی بردە ژوورەوە، دایکی بینی بە کـراسـێکی ڕەشی کـورتەوە سـۆندە سپیەکەی گرتبوو بە دەستی چەپیەوە و حەوشەکەی دەشت.. لە داخا ئەوەندەی تر کەللەیی بوو و هاواری بە سەردا کرد:

ـ ئەوە تۆ چی دەکەیت لێرە پیرەژن..؟! بۆچی هاتوویت..؟!

ئەو لە پێشدا ئەفەرۆزی کرد و وەڵامی نەدایەوە، بەڵام کە ئەم بە قاچی ڕاستی لەقەیەکی لە سۆندەکە دا و لە دەستی خستە خوارەوە.. ئەو بە سووکی هەڵیگرتەوە و پێی وت:

ـ نەهاتووم بۆ لای بەڕەڵلایەکی وەکوو تۆ.. لەوەش زیاتر دەمدرێژیی نەکەیت چاکە.

«سیامەند» بە دەستێ بیجامەی سپیی هێڵدارەوە لە ژووری میوان هاتە دەرێ و پێی وت:

ـ ئەو چەنەبازیەت لە چییە نەوال..؟! وەرە ژوورەوە دەی..!!

ـ ژوورەوە بۆ ئێوە چاوەکەم.. من وا دەچمە دەرێ.

ئەمەی وت و ڕایکردە کۆڵان.. دایکی کەوتە شوێنی و پێی وت:

ـ وەرە مەڕۆ نەوال گیان.. تۆ بە هەڵە لەو هاتنەی من تێگەیشتوویت.. بڕوابکە بە هەڵە تێگەیشتوویت.

لەبەر ئەو دەرگایە چەقی و هەموو گیانی تەزووی پیاداهات.. گەڕایەوە و بەبێ ویست خۆی خستە باوەشیەوە.. ڕوومەتی چەپی خستە سەر شانی ڕاستی و بە جووتە دەستیانکرد بە گریان.. لەودیوی فرمێسکە ورد وردەکانیەوە پەنجەی قاچە ڕووتەکانی ئەوی لەناو ئاوەکەدا وەکوو وردەماسیی جوانیی دەبینی و کەوتبوونە جووڵەجووڵێکی سەیرەوە، کە نینۆکەکانیانی کەمێ درێژکردبووەوە و بە سوورێکی تۆخ تۆخ بۆیەی کردبوون.. خۆی بۆ نەگیرا و بە قوڕگی پڕ لە هەنسکی گریانەوە پێی وت:

ـ دیوتە دایکە پەنجەکانی قاچت چەنێ جوانن.. ؟!

ـ ئەوە بیری خواردنەکانی دەستم دەکەیت نەوال.. ؟!

حەپەسا و بیری لێیکردەوە.. هەستی دەکرد بە ڕاستیی هەناوی بەتاڵە و برسیەتی.. «سیامەند» بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی گرت و لە باوەشی دایکیا هێنایە دەرێ.. بۆ ژووری میوانی برد و لە ناوەڕاستی هەیوانەکەدا بە گاڵتە پێی وت:

ـ تۆ نەبوویتایە من لە کوێ دەمزانی ڕق بەبێ خۆشەویستی و خۆشەویستی بەبێ ڕق......

لە تاوی پێکەنین تەواوی نەکرد و قسەیەکی تری هێنا بە سەرا:

ـ ئەگەر کوردییت بزانیایە، ئێستا دەتتوانی لەگەڵ خوشک و برای تازەتا قسە بکەیت..!!

بە حەپەساویەوە سەیری کرد و لێی پرسی:

ـ ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت..؟! دەستت پێکردەوە..؟!

ـ دە تۆ سەرێ لەم ژوورە بکێشە، بزانە کێ دەبینی..!!

لە پەنجەرەکەوە کوڕ و کچێکی کەمێ لە خوار تەمەنی خۆی بینی و دڵی داچڵەکی، کە خەمناک و شەرمنانە لەسەر کورسیەکان دانیشتبوون و متەقیان لە

خۆیان بڕیبوو.. بە پەلەپرووزێ خۆی کرد بە ژوورا و حەیران و سەراسیمە لە بەرامبەریان وەستا.. لە سیمایان ڕاما و لە بەژن و بالآیان وردبووەوە:

ـ نابێت دەسکەیتە ملیانەوە و ماچیان کەیت..؟!

«سیامەند» ئاوای پێ وت و دەستی چەپی خستە سەر شانی ڕاستیەوە.. ئەم خۆی دوورخستەوە و لێی پرسی:

ـ ئەمانە کێن..؟!

ـ پێم نەوتی خوشک و براتن..؟!

لەوە زیاتر بەرگەی نەگرت و ڕایکردە دەرەوە.. «سیامەند» لە دەرگای حەوشە گرتی و لێی پرسی:

ـ بۆ کوێ ئاوا ملت پێوەناوە ڕۆحەکەم..؟!

ـ نازانم.. من خەریکە شێت دەبم.. لە هیچ شتێکی ئەم ماڵە تێناگەم.. بۆچی ئاوام لێدەکەن..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟!

دایکی، کە خۆی دانەواندبووەوە و بە گسکە سپیەکە ئاوی حەوشەی ڕادەماڵی، بە جووڵەیەکی دڵبزوێنی سەر، پەرچەمە ڕەشەکەی لەسەر چاوی لادا و پێی وت:

ـ بە سائەقەت بم نەوالەکەی ڕۆحم، هەرچەند ئاوا قسە دەکەیت، هالەم بیردەخەیتەوە و لەبەر چاوم شیرینتر دەبیت.

هەستی دەکرد بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت و مەبەستی بێت، لاسایی پووری دەکردەوە و تەنانەت دەنگی خۆبشی وەکوو دەنگی ئەو لێکردبوو.. ئینجا بیری لە چاوی کچەکە کردەوە و کسپە لە دڵیەوە هات، کە وەکوو چاوە ئێجگار ڕەشەکانی ئەو وابوون و لەسەر سپێنەی زۆر سپییدا ڕەونەقیاندەدا.. ئەو جارە «شاناز» خورمای گەییوی بۆ کردبووە ناو قاپێکی بچکۆلەی ڕەشی پڕ لە ئاردەوە و لەبەر دەرگا دەیخواردن.. دانەیەکی هێشتەوە و لە ناوەڕاستەکەی دانا.. بردی بۆ ژوورەوە و پێی وت:

ـ سەیرکە چەند لە چاوەکانی پوورە هالەم دەچێت..!!

ئەو کردیە باوەشیەوە و وتی:

ـ بە قوربانت بم، کچە ئاقڵ و هونەرمەندەکەم..!! هەر من دەزانم تۆ چەند زیرەکیت..!!

لەمەوە لەبەر چاوی میوانەکان بانگی دەکرد و لێی دەپرسی:

ـ چاوەکانی پوورە هالەت لە چی دەچن نەونەو..؟!

ـ قاپێکی بچکۆلە پڕبکەیت لە ئارد و دەنکێ خورمای زلی بخەیتە سەر.

«نەنە سۆزرەت» لە خۆشیا پێدەکەنی و دەیوت:

ـ ئەوەندە جوانی دەڵێت، بنیادەم برسیی دەبێت..!!

**ـ بچۆ لە ژوورەوە دانیشە نەوال گیان، با ماسییت بۆ بێنم.**

دایکی ئاوای پێ وت و بەلووعەکەی گرتەوە.. هەر خێرا سۆندەکەی کۆکردەوە و چوو بۆ مووبەق.. مامی بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیری «ست سوعاد»ی کرد و بەمی وت:

ـ لەسەر خەڵووز برژاندوومانە و بەشی تۆمان هەڵگرتووە.

ـ ئەوە چییتانە تۆ و دایکم ئەمڕۆ ئەوەندە باسی خواردن دەکەن..؟!

ئەو بە حەپەساویەوە سەیرێکی چاوەکانی کرد و ویستی شتێکی پێ بڵێت، کەچی نەیوت و بەدەم جووڵاندنی دەستەکانی، سەری خۆی لەبەر نا.. ئەم بە گیری هێنایەوە و لێی پرسی:

ـ تۆ زانیوتە ئەم نیوەڕۆیە، هیام سەربازە شێتەکەی کردووە بە ژێر ئۆتۆمۆبیلەوە..؟!

ـ نەء.

ـ کەچی وا هەستدەکەم زانیوتە..!!

ـ سەیرە..!!

ـ وا دەزانی من زۆر ترساوم وانییە..؟!

ـ لەوەناچێت ترسابیت، بەڵام ڕەنگە زۆر بیرت لەوە کردبێتەوە، کە ئەم زۆڵ بووە و لە هەتیوخانە گەورەبووە.

ـ من ئەوە ئەم شتە لە تۆ دەبیستم..!!

دایکی پارچە ماسی و لەتە نانەکەی خستبووە سەر سینیەکی نیکل و لە

مووبەقەکەوە هاتە دەرێ.. ڕووی تێکرد و پێی وت:

ـ دەی بە سائەقە دەستەکانت بشۆ و وەرە نانەکەت بخۆ.

ئەم هەر لە خۆبەوە لێی تووڕەبوو و پێی وت:

ـ بۆچی دەستم بە چییە، تا بیشۆم..؟!

مامی ڕووی لێ گرژکرد و بە تووڕەییەوە پێی وت:

ـ بە ژەهری ڕەشی ماری سپییە و.......

تووڕەبوو و ویستی بەرپەرچی بداتەوە، بەڵام پەلەی بوو چی زووترە لەو کوڕ و کچە تێبگات و بچێتە بنجوبنەوانیانەوە.. بۆیە خێرا خۆی هێمنکردەوە و پێی وتن:

ـ داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، من لەبەر ئەو سەربازە هۆشم لای خۆم نەمابوو.

«سیامەند» بە گاڵتە و بە قاچی چەپی شەقێکی سووکی لە لای ڕانی ڕاستی دا و وتی:

ـ داوەشێیت..!! وەکوو ورچ وایت، چەند خۆشمانبوێیت، ئەوەندە......

ـ ئەوەندە چی..؟!

ـ دە بڕۆ دەی..!! بەسە دەمدرێژیی..!!

دەستەکانی جوان جوان بە سابوون شت و چووە ژوورەوە.. لەوێ لە لووتی دایکی نزیکی کردنەوە و پێی وت:

ـ جارانت لە بیرە، کە تۆ چاوت دەنووقاند و من و فەریال ناولەپمان دەنا بە لووتتەوە..؟! ئینجا بۆنت دەکردن و جارێ دەتوت: ئەمە کچی خۆمەوە و جارێ دەتوت: ئەمە کچی خۆم نییە..؟!

ـ چەند بیرت تیژە..!! ڕەنگە ئێستا فەریال هەر........!!

دانیشت و بە دەستی ڕاستی سینیەکەی لە بەردەمی خۆی نزیککردەوە.. نەیدەوێرا بە هیچ شێوەیەک سەرهەڵبڕێت و سەیری ئەو کوڕ و کچە بکات، کە هیچ شتێکی لە بارەیانەوە نەدەزانی و وردە وردەش خۆشیدەویستن.. تا زیاتر دەچوونە دڵیەوە و هەستی بە نزیکییاندەکرد، ترسەکەی دڵی زیاتر جۆشی دەسەند و وەکوو سەرەمێکوتەی بزێو تیایدا دەکەوتە جووڵەجووڵ:

ـ حەزدەکەیت ئیتر هەر لەگەڵ ئێمە بژین.. ؟!

«سیامەند» بوو لە تەنیشتیەوە دانیشت و ئەمەی لێپرسی.. ئەم ڕاچڵەکی و نەیزانی چی بڵێت.. دایکی هەڵیدایە و وتی:

ـ خەیاڵ نەکەیت سیامەند من دەستبەرداریان ببم و بۆ تۆیان بەجێبهێڵم.

ـ بەڵام سوعاد تۆ ئەگەر بە ڕاستیی خۆشتبوێن، ئەوا بۆ منیان وازلێدەهێنیت.. هیچ نەبێت من لە زمانەکەیان تێدەگەم.

ـ زمان تەنگوچەڵەمەیکی ئاوا نییە.. هەر ماوەیەکی ترە و فێری عەرەبی دەبن.

ـ ئینجا بۆچی خۆیان بڕیار نەدەن، لای من بن، یان لای تۆ.. ؟!

ئەو تووڕەبوو و هەستایە سەر پێ:

ـ تازە مناڵ مناڵی خۆمن و هەر خۆشم خاوەنیانم.. بۆ ئەوەشم نەهێناون تۆ ئاوا چاویان تێببڕیت.

بە ئاماژەی دەست هەڵیستاندن و بە پێش خۆی دان.. لە هەیوانەکە کاتێ پێڵاوەکانی لە پێدەکرد و دەستی چەپی گرتبوو بە دیوارەکەوە، سەرێکی ڕاشەقاند و وتی:

ـ کوردێ هەر دەبێت تا عەرەبی فێردەبن یارمەتیم بدات.. بەو کچەی لای ئەمجەدی برام دەڵێم و کوڵێ پێشی خۆشە..!!

بەرەو دەرگای حەوشە هەنگاوی هەڵهێنا و وتی:

ـ با فوئاد بێتەوە.......!!

ئەو چووە دەرێ و «سیامەند» لە شوێنەکەی خۆی کز و خەمناک سەری داخست.. ئەمیش دەستی لەسەر ماسیەکە ڕەقبووبوو و حەیران و سەراسیمە لە وێنەکەی مناڵیی خۆی دەڕوانی، کە بە دیوارەکەی بەرامبەریەوە هەڵواسرابوو و بزەیەکی جوانی خستبووە سەر لێوی.. چاوی دەکەوتە ڕەشکەوپێشکە و هێڵی ڕەش ڕەش و باریک باریکی وەکوو ناڵی ئەسپی سپیی لەبەر دیدەیدا دەخولڤان.. ئەوە یەکەمجاربوو بە ڕاستیی لە «سیامەند» بترسێت و زیرەی لێبکات.. هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا، نەیدەتوانی ڕووی تێبکات و لێی بپرسێت: ئەو کوڕ و

کچە هی کێن و ئەو مشتومڕەیان لەسەر چی بوو..؟! تەنانەت، کاتێ هەستا و پێی وت:

ـ من وا دەڕۆم و نازانم کەی دێمەوە، تۆ دەرگاکان داخە و بچۆ بۆ ماڵی جیهاد.

ئەم نەیوێرا سەرهەڵبڕێت و لێی بپرسێت، ئاخۆ بۆ کوێ دەچێت و چ مەبەستێکی هەیە..؟! هیچ حەزی نەدەکرد و لە دڵیشەوە پێی ناخۆشبوو، بەم حاڵەوە بچێت بۆ ئەودیو و خۆی بخاتە بەر چاویان.. ئەو چاوانەی ڕێک وەکوو چاوی کونەپەپوو تیژن و شتە ورد وردەکانی قووڵایی نهێنیە لەبیرکراوەکانی ناخی ناخ دەبینن.. دەیانبینن و لێکدانەوەی ڕاست و درووستیان بۆ دەکەن.. تا ڕۆژئاوا لەو شوێنەی خۆی نەجووڵا و دیمەنی ئەو کوڕ و کچەی دەهێنایە بەر چاوی.. دەیهێنانە بەر چاوی و خەیاڵی وەکوو کەروێشکە خنکاوەکانی بیرەوەرییەکانی ناو سەری هەڵدەکۆڵی.. جار جار سووک سووک و هێمن، جار جاریش تیژ تیژ و هەڵەشە تیایاندا ڕۆدەچوو.. دواجار جورئەتی نایە بەر خۆی و هەستایەوە سەرپێ.. خێرا خێرا دەرگاکانی داخست و بە هەنگاوی گورج گورج بەرەو لای دایکی کەوتەڕێ.. کاتێ لە سەری کۆڵانی خۆیان پێچیکردەوە و گەیشتە بەر دەرگای ئەو ماڵە فەڵەستینیەی، کە پەنجەکانیان بالووکەی ورد وردی سووریان لێهاتبوو و ئەم قێزی لێدەکردنەوە، تووشی «ست عاتیفە»ی کیمیا و «هاجەر»ی دایکی بوو و بە ناچاری هەنگاوەکانی خاوکردەوە.. «عاتیفە» هەر لە دوورەوە باوەشی بۆ کردەوە و بە گەرمی ئەملا و ئەولای ماچکرد.. ئینجا ڕووی کردە دایکی و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ چییە دایکە..؟! تۆ نەوال ناناسیتەوە..؟!

ئەو بە حەپەساویەوە سەیری کرد و پێی وت:

ـ چی..؟! نەوالی کچی سوعاد..؟! بووە بەم کچە عازەبە..؟!

کردیە باوەشی و لێی پرسی:

ـ ئەو جارەت لە بیرە، کە لەگەڵ دایکت هاتی و دۆشاوی تەماتەمان دەکرد..؟!

هەر خۆیشی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ـ نا، باوەڕناکەم بیرت مابێت..!!

بەڵام لە بیری مابوو و دەیتوانی وەکوو خۆی بیهێنێتەوە بەر چاوی.. عەسرێکی گەرمی ناوەڕاستی تەمووزبوو و ڕۆژی ئاسمانە بێگەردەکە داخی دڵی خۆی بە دار و بەردی گەڕەکی «تپە الاکراد» دەڕشت.. ئەوان لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا دانیشتبوون و لەناو مەنجەڵە سپیە بنکڕەشەکاندا تەماتەیان دەگوشی.. دەیانگوشی و خلّتەکەیان دەکردە تەشتێکی سپیەوە.. ئەم بەم دەست و بەو دەست بڵاویدەکردنەوە و قاچە ڕووتەکانی دەخستنە سەری.. تا ئاستی قولاپەپێی دەیبردنە خوارێ و شوێنەکانیان لە شێوەی کەمانجەی بچکۆلەی خوێناوی دەردەچوون.. هاوکات سەری پەنجەکانی دەکزانەوە و ژانی دەخستە دڵیەوە، چونکە دایکی بەیانیەکەی نینۆکەکانی بۆ کردبوو و زیاد لە پێویست قرتاندبوونی.. کەچی چێژێکی زۆر سەیری لێدەبینی و تەزووێکی ئێجگار بەتین لە ناخەوە ڕایدەتەکاند.. کاتێکیش چاوەکانی خێلدەکردن و لێیانی دەڕوانی، وەکوو قازی بریندار دەکەوتنە بەر دیدەی و بە نۆرە بەرزی دەکردنەوە.. ڕیشاڵی باریک باریکی خلّتەی تەماتەیان پێوە شۆڕدەبووەوە و دیمەنێکی چەند بلّێیت دڵبزوێنیان هەبوو.. دواییش لەسەر کۆنکرێتە داخبووەکەی حەوشەی دادەنان و سووک سووک هەنگاوی دەنا.. ختووکەی دەهات و ئەو بەیانیانەی بیردەکەوتەوە، کە لە پێش دایکیەوە خەبەری دەبووەوە و بە زمان بنی پێکانی دەلستنەوە.. ئیتر ئەو لە خەوەکەیدا ڕادەپەڕی و هەڵدەستایەوە.. لە تەنیشت خۆی پاڵیدەخست و مەمکی چەپی بۆ دەردەهێنا.. دەیخستە دەمیەوە و پێی دەوت:

ـ مژی لێدە نەونەوەکەی ڕۆحم.. مژی قایمی لێدە.

ئەم لە پێشدا بە دەستی ڕاستی لە دەمی خۆی دووردەخستەوە و بە مەکرەوە پێی دەوت:

ـ بۆچی مژی لێدەم، خۆ من منالّی چکۆلە نییم..؟!

کەچی دوایی بە هەموو حەزێکەوە سەرگۆ وشکەکەی دەخستە نێوان لێوە تەڕەکانیەوە و دەیمژی.. دەیمژی و گازی سووکی لێدەگرت.. هەستی دەکرد بۆنی بوخوورد و تامێکی سەیری لێدێت، کە دواتر زانی تامی کەشکە و لە مالّێکی

«هەولێری»یدا خواردی.. ئەوەی پشتی خانووەکەیان بە پشتی خانووەکەی ماڵی «ست عاتیفە»ـەوە بوو و ئەم هەر هەر جارێ لەگەڵ ئامۆژنی دەچووە ماڵیان، بە سەربانەکەیاندا ئاودیو دەبوو و خۆی دەگەیاندە لایان.... ئەوان دوای ئەوەی دۆشاوەکەیان کردە چوار سینیی گەورە و بردیانە سەربان.. وردە وردە لەبەر هەتاوە بەتینەکەدا گەرمدادەهاتن و سووک سووک خەستدەبوونەوە.. ئەوسا لووتی لێیان نزیکدەکردەوە و هەستی دەکرد بۆنی فیشەکدانی سپیی سەربازە ڕەشپۆشەکانی لێدێت.. ئەوانەی لە چەرمی حوشتری پیر درووستدەکرێن و لە هاویندا ئارەقدەکەنەوە.. ئێوارە لەگەڵ دایکیا نەچووەوە و حەزی کرد لای ئەوان بمێنێتەوە.. شەو لە نێوان «عاتیفە» و ئەواندا پاڵکەوت و تا خەوی لێکەوت بۆنەکەیانی هەڵمژی.. ڕۆژی دواییش زیاتر خەستبووبوونەوە و بریقوباقیان ئاوی چاوەکانی دەبرد.. ویستی بە هەنگەشەلێ بە سەریاندا بڕوات و شوێنپێکانی لەسەریاندا بنەخشێنێت، بەڵام واینەکرد و بە قادرمەکەدا هاتە خوارێ.. لە کۆڵان گیرفان گیرفان بەردی ورد وردی ڕەش ڕەش و هی سپی سپیی بەقەدەر سیقەتۆرەی کۆتری کێویی هێنا و وێنەی ناڵی ئەسپی ئەفسانەیی لەسەر کێشان.. چەند ترسا و چۆن مووچوڕک بە سەرتاپای گیانیدا هات، کاتێ بۆی دەرکەوت ئەوانە بەردی خورافیی دامێنی شاخی زۆر بەرز و ئێجگار ساردی هەتاونەدیوی ناو هەقایەتی «شازە»ی ئامۆژنینی و وەکوو تەپەدۆر لە ئاودا نقووم نابن..!! کەچی دەستی لێ هەڵنەگرتن و چاوقایمانە سەیری دەکردن.. جار جار سینیەکان لەبەر دیدەیدا گەورە دەبوون و سنووریان تێکەڵ بە یەکتر دەبوو.. بەقەدەر دەشتێکی پان و پۆڕیان لێدەهات و بەردەکانی وەکوو ڕەوەپڵنگی نووستوو دەبینی.. جار جاریش بچووکدەبوونەوە و ئەوەندەی پوولی تاوڵەیان لێدەمایەوە.. کاتێکیش «هاجەر» سەرکەوتە سەربان و هاواری کرد:

ـ وەرە عاتیفە سەیرکە، بزانە ئەو سەربەگۆیەندە چی لەو دۆشاوی تەماتەیە کردووە..!!

ئەم وەکوو ورچێکی تووکنی سپیی تەڕی بەر لێزمەبارانی سەرەتای ئێوارەی پاییزی درەنگوەختی خەونی بەیانیانی سەربانی فێنکی خۆیانی دەبینی و حەزی

دەکرد خۆی هەڵداتە باوەشییەوە.. بە زمان لە بنی پێیەوە تا تەوقی سەری بیلێسێتەوە و بە دەنگێ، کە لە خوڕەی دڵفڕێنی ئاوی جۆگەی زۆر سازگار و ئێجگار بە خوڕی کۆتایی کەژی بەهاری نێوان گابەردی چەند بڵێیت ڕەقی لووسی بەتەمەنی قەدپاڵی شاخی شێوە هێلکەشەیتانۆکەیی بچێت و بێجگە لە گوێچکە، هەموو ئەندامە ورد ورد و درشت درشتەکانی تری جەستە سڕبکات، پێی بڵێت:

ـ ئاگات لە خۆت بێت دادە هاجەر گیان، نەبادا لەبەر هەتاو بتوێیتەوە..!!

بەڵام ئاخ..!! ئەو مۆڵەتی نەدا و بە لەقە سینییەکانی قڵپکردەوە.. بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی گرت و بە تووڕەیی هێنایە خوارێ.. «عاتیفە» سۆندە ڕەشوسپییەکەی هێنا و سەری خستە سەربان.. کە لە ڕەنگی پێستی کەری کێوی دەچوو و لە چەند شوێنێکدا کونی بچکۆلە بچکۆلەی تێبببوو.. ئاوێکی سووری تۆخ بە چۆڕاوگە ڕەشەکە و قادرمە سپییەکەدا دەهاتە خوارێ و بەناو حەوشەکەدا بڵاودەبووەوە.. ئەم و «نیهاد»ی تاقە کوڕیان بە پێی پەتیی بەناویدا دەڕۆیشتن و کردیان بە بەزمی خۆیان.. «هاجەر» لێیان تووڕەبوو و دەریکردنە کۆڵان.. دوو کرێکاری ڕەشپۆشی سەرژمێری تەختەی سپیی بچکۆلەی لاکێشەییان لەسەر دیوارە کەمێ نزمەکەدا دەکوتی و زرموهووڕی چەکوشە دەسکڕەشەکەیان «رمق.. رمق.. رمق.. رمق»«٢٢» لە گوێچکەی ئەمدا دەنگیدەدایەوە.. دوو فەرمانبەری سپیپۆش بە بۆیەی ڕەش ژمارەیان لەسەر دەنووسی و ئەمان حەقدەیان بەرکەوت.. باڵابەرزەکەیان سەیرێکی ئەمی کرد و لێی پرسی:

ـ نەونەو ئەوە تۆ چی دەکەیت لێرە..؟!

ئەم حەپەسا و پێی وت:

ـ تۆ چۆن من دەناسیت مامە..؟!

ـ من عیززەت پاچەچیی باوکی خیتامی هاوڕێتم.. ئەها ئەو جارە هاتم بۆ قوتابخانە، تۆ لە گۆڕەپانەکەدا سروودی ئاڵاکەمانت وت و من ماچم کردیت..!!

ـ ئەوە تۆ بوویت..؟!

ـ ئەی چۆن..!!

ـ دەزانی من هەرچەند گوێم لە ناوی تۆ دەبێت، برسییم دەبێت..؟!

ئەو تەریقبووەوە و سەری خۆی لەبەر نا، بەڵام هاورێکەی قاقایەکی بەرزی لێ دا و پرسی:

ـ بۆچی برسییت دەبێت شەیتانە بچکۆلەکە..؟!

ـ ئاخر سەروپێم بیردەکەوێتەوە و دەمم پری دەبێت لە ئاو..!!

هەرکە ڕۆیشتن و دەرگاکەی ئەوانیان بەجێهێشت، ئەم خێرا دەمی لە گوێچکەی ڕاستی «نیهاد» نزیککردەوە و فێریکرد، کە چەپڵەی بۆ لێدەن و بە جووتە پێی بڵێن:

ـ باچەچی یا باچەچی نريد باچه ومنريد حچی.

ئەو جارە لەگەڵ «ئەنوار»دا چوو بۆ بازاڕ و لە شەقامی «موتەنەبی» «نیهاد»ی بینی.. تا سەری فولکەکە بە یەکەوە ڕۆیشتن و لەوێ ئەو سەرو پیپسیی کۆلای بۆ کڕین.. دەستی چەپی گرت بە دیواری دووکانەکەوە و بەدەم بزەیەکی جوانەوە لەمی پرسی:

ـ ئەو ڕۆژەی منالییت لە بیرە نەوال چیمان لە پیاوەکانی سەرژمێریی کرد..؟!

ئەم پێکەنی و وتی:

ـ زۆر چاکم لەبیرە.

ـ ئێستاش وەکوو ئەوسا قسەی سەیر سەیر دەکەیت، یان گەورە بوویت و وازت هێناوە..؟!

ئەم تووڕەبوو و ڕووی گرژ کرد.. لە داخا بوتڵەکەی هەر بە پڕی دایەوە دەستی منالە چاوڕەشەکەی ناو دووکانەکە و سەری خۆی لەبەر نا.. ئەو تەریقبووەوە و بە دەموپلێکی تێکئاڵاوەوە پێی وت:

ـ بۆچی ئاوا نەوال..؟! بۆچی ئاوا..؟!

«ئەنوار» هەڵیدایە و بە گاڵتەیەکی خۆش، کە مەبەستی ئەوەبوو ئەو لەم حاڵەتە ناخۆشە دەربازبکات و دڵی ئاشتبکاتەوە، پێی وت:

ـ دەسا خەتای تۆیە.. ئەم برسیەتی و تۆ پیپسیی کۆلای بۆ دەکڕیت..!!

ئەو کەمێ ڕەنگوڕووی کرایەوە و بۆ خۆشیی وتی:

ـ چۆنە بیض اللگلگ ی بۆ بکڕم..؟!«٢٣»

ئینجا ڕووی کردە «نەوال» خۆی و لێی پرسی:
ـ ها..!! وتت چی بۆتی بکرێم..؟!
ـ بۆ خۆتی بکرە ڕەزاگران.. خۆ من مناڵ نییم.

ئەمەی بە گاڵتە وت و پێکەنینێکی خۆشی بۆ کرد.. لەگەڵیا سەرنجی لە چاوەکانی دا و تەزووێکی بەتین سەرتاپای گیانی ڕاتەکاند.. خۆبشی نەیدەزانی بۆچی هەرچەند سووک سووک و بە کەمێ شەرمەوە دەیکردنەوە و دایدەخستنەوە، ئەم ئەو باڵندە بچکۆلە ڕەش ڕەشەی بیردەکەوتەوە و جریوەجریوە سەیرەکەی لە گوێچکەیدا دەنگیدەدایەوە، کە بەیانیەکی زوو زووی بەهاری ڕابردوو لەسەر لاسکی تەڕی گوڵە سپیەکانی باخچەکەی ماڵی خۆیاندا هەڵدەبەزیەوە و لەگەڵیا دڵۆپ دڵۆپ شەونمی هەڵدەوەراند.. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد بیانگریەنێت و دڵۆپەفرمێسکی ورد وردیان لێ بێنێتە خوارێ.. بەسەر گۆنای لووس و سپییدا شۆڕببنەوە و لەسەر چەناگەیدا لەنگەر بگرن.. لەوێ نەهێڵێت بتکێن و وێنەی زەڕنەقووتەی پەڕەسێلکە بۆناو سنگی خۆیان هەڵدەن، بەڵکوو بە ماچ هەڵیانگرێتەوە و وەکوو شاتووی زۆر ڕەش و ئێجگار گەییو بیانخوات.. بەڵام ئاااخ..!! دەستەوستانبوو لە دۆزینەوەی ڕێگایەک وەکوو خۆی دەیەوێت و حەزی لێدەکات، بیگریەنێت و لەزەتی دنیا لەو چرکەساتە کورت و کەمخایەنە ببینێت..!! ڕووی لێ وەرگێڕا و بەرگەی بینینی ئەو تیشکە سیحریانەی نەگرت، کە لەم زیاتر هیچ کەسێکی تر هەستی پێنەدەکردن و لە ناخی ناخی نهێنیەکانیان نەدەگەیشت.. بەڵام نا، ئەم بە هەڵەداچووبوو و پەی بەوە نەدەبرد، کەوا لە چاوە شەڕانیەکانی «ئەنوار»دا دەبوون بە پەلکەزێڕینەی سوور و بە جوانترین شێوە لەسەریاندا دەردەکەوتن.. هەرگیز باوەڕی نەدەکرد و بە هیچ شێوەیەک نەدەچووە ئەقڵیەوە، ئەو خۆشەویستیەی نێوانیان لە چرکەیەکی تووڕەبوونی ئەمەوە سەرهەڵبدات و ئاوا لە ئاست لێکدانەوەیدا حەیران و سەراسیمە بێت.. هەر ئەوەندەی لە دەست دەهات زوو زوو بیریانبخاتەوە و بە گاڵتەیەکی زۆر خۆش پێیان بڵێت:
ـ خۆشەویستیی ئێوە لەسەر برسیەتیی من دامەزراوە.

جا هەر بە ڕاستییش ئەو ڕۆژە لە برسا نەیدەتوانی هەنگاو هەڵێنێت و ئەوەی هێز بێت لە جەستەیدا نەمابوو.. نیوەڕۆ لەسەر نانخواردن لەگەڵ «سیامەند»دا کردبووی بە شەڕ و بە تووڕەیی سفرەکەی بەجێهێشتبوو.... ئەو ئێوارەیەش ئەوەندەی مەبەستی بوو بگاتە لای دایکی و پارووێ نانی لا بخوات، ئەوەندە گەرەکی نەبوو لە نهێنیی ئەو کوڕ و کچە تێبگات و بزانێت چۆن و بە چ شێوەیەک خوشک و برای ئەمن.. کاتێکیش بە دەستی ڕاستی پاڵی بە دەرگای حەوشەوە نا و قاچی چەپی بردە ئەودیو، بینینی وا کز و خەمناک لە هەیوانەکەدا دانیشتوون و پشتیان داوەتە دیوارەکەوە.. دایکی و «فەریال»یش مێزە ڕەشە لاکێشە فۆڕمیکا لووسەکەی نانخواردنی ژێر نیۆنە سپیە ئاسۆییەکانی ناوەڕاستی باخەکەیان پاکدەکردەوە و پاشماوەی برنج و تەپسیی باینجانەکەیان دەبردەوە بۆ مووبەق.. بەبێ ئەوەی سەیری ئەم بکەن و وایدەرخەن، کە پێیان خۆشە کچەکەیان دوای ئەو هەموو کاتە گەڕاوەتەوە لایان و لە برسا ئەژنۆکانی دەلەرزن.. چاوقایمانە خۆی گەیاندە مووبەق و بە گوێچکەی «فەریال»یدا چرپاند:

ـ مەیموونە ڕەشەکە جۆللانەی لەناو سکما هەڵخستووە.

بە مناڵیی هەرچەند برسیەتی زۆری بۆ دەهێنا و لە پەلوپۆی دەخست، دەستی بە سکیەوە دەگرت و ئاوای پێ دەوت.. ئیتر ئەو دەتریقایەوە و لە تاوا چاوەکانی پڕدەبوون لە ئاوێکی سەیر.. ئینجا سەیری ئەمی دەکرد و پێی دەوت:

ـ ئادەی جارێکی تریش بۆم بڵێرەوە.

کەچی وا ئێستا خێسەی لێدەکات و ڕووی خۆی دەکات بەولاوە.. دەستی چەپی کردە ملیەوە و پێی وت:

ـ بۆچی ئاوا.. فەریالەکەی ڕۆحم..؟! بۆچی ئاوا..؟!

ئەو خۆی لێ دوورخستەوە و پێی وت:

ـ ئێستا پێم ناڵێیت چیت دەوێت..؟! برسیتە..؟! ئەوە نان و قوزەڵقورتیکە.

دایکی بەبێ ئەوەی سەرهەڵبڕێت و سەیری ئەم بکات، سەرێکی بادا و بە «فەریال»ی وت:

- برسی چی و حاڵی چی..!! قاپێکی قەڵا برنج و ماسیی خواردووە.
- دەزانی دایکە نەمخوارد..؟!
- بۆچی بە قوربان..؟! خۆشنەبوو..؟!
- نەمخستە دەممەوە، تا بزانم خۆشە، یان ناخۆش..!!
- خۆزگە دەتخوارد و ئینجا دەتزانی نەوال دایکی خۆت چۆن ماسی.......!!
- دەزانم دایکە گـیـــان.. تۆ بڵـێـــیت نەزانم..؟! من هەمـــوو جـــارێ لای دەستەخوشکەکانم باسی ماسیی دەستی تۆ دەکەم.
- بەڵام نەوال ئەوەی ئەمڕۆ وەکوو هیچ جارێ نەبوو..!!
ئەم چنگێ برنجی ناو مەنجەڵەکەی خستە دەمیەوە و پێی وت:
- بە ڕاست دایکە ئەوەماڵی خاڵە ئەمجەدم کوان..؟!
- بۆچی نەتزانیوە چوونەتەوە خانووەکەی خۆیان..؟!
کەوچکێ تەپسیی کرد بە سەرا و وتی:
- لە کوێ بیزانم، ئەگەر ئێوە پێمی نەڵێن..!!
- بڵێم چی..!! من هەر وامدەزانی زانیوتە.!!
هەرچی لەناو تاوە و مەنجەڵەکەدابوو هەڵیلووشی و پرسی:
- ئەرێ دایکە ئەوە بۆچی لیمۆی بەسرات نەکردبووە ئەم تەپسیەوە..؟!
- لەبەر فەرهاد و نەسرین ڕۆحەکەم.. وتم نەوەکا نەیخۆن.
- ناویان فەرهاد و نەسرینە..؟!
«فەریال» هەڵیدایە و وتی:
- چییە..؟! دەڵێی ناوەکانیانت بە دڵ نییە..؟!
- بە پێچەوانەوە.. زۆرم بەلاوە خۆشن.
دایکی حاجەتەکانی لە بەردەمی ئەم هەڵگرت و پێی وت:
- ئینجـا خـۆزگـە لە دەمی خـۆیانی دەبیـســتی، ئەوسـا ئەوەندەی تر حـەزیان لێدەکەیت..!!
لەسەر کورسیە سپییەکەدا دانیشت و ئەمەیشی بۆ زیاد کرد:
- بڕۆ ئێـسـتـا لێـیـان بپـرسە و بزانە چۆنی دەڵێن، چونکە لە بەیانیـەوە ناویان

دەکەم بە جابر و هالە.

ـ جا دەزانی دایکە چاوی کچەکە ڕێک لە چاوی پوورە هالەم دەچێت..؟!

ـ حەزناکەم ئاوا بڵێیت.

ـ بۆچی..؟!

ـ حەزناکەم و تەواو.

«فەریال»یش بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیری کرد و پێی وت:

ـ کچەکە کچەکەی چییتە..!! ئەمە خوشکتە..!!

ـ دەزانم فەریال گیان.. دەزانم خوشکمە، بەڵام ماوەیەکی دەوێت، تا زمانم ڕادێت بڵێم.....

ـ بڵێیت چی..؟!

ـ نازانم.. دەزانی نازانم..؟!

ـ ئەی چۆن نازانم..!!

دایکی لەپڕ لەسەر کورسیەکە هەستا و پێی وتن:

ـ ئەرێ ئێمە بۆچی ئاوا خۆمان لەم مووبەقە گەرمە ناوە..؟! وەرن با بچینە ناو باخەکەوە.

لەوێ بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیری «نەوال»ی کرد و بە نۆرە لە «فەرهاد» و «نەسرین»ی پرسی:

ـ تۆ چی ناوت..؟

هەستی کرد هەر بە ڕاستیی زۆر جوانی دەڵێن و دایکی ناهەقی نییە ئەوەندە پێیان سەرسامە.. خەریکبوو نارەزایی دەربڕێت و بە دایکی بڵێت، بێجگە لە ناوی خۆیان هیچ ناوێکی تریان لێ نایەت و ئەم ڕازیی نابێت بۆیان بگۆڕن، بەڵام «هالە»ی پووری بیرکەوتەوە و هەر خێرا پەشیمانبووەوە، کە ئەو جارەی «ئیبداع» نارەزایی خۆی لەو هەموو ناوە سەیر سەیرەی لەسەر لاپەڕەکانی کتێبی «مێژووی عێراقی نوێ»دا هەن دەربڕی و ئەو لەگەڵ ئاخێکی قووڵدا پێی وت:

ـ باشترین ڕێگا بۆ دەستبەسەرداگرتنی کەسەکان، ناولێنانیانە.

کاتێکیش «نێرگز» هەستایەوە و پرسی:

ـ ئەی دەبێت خەڵک ناوی نەبێت..؟!

ـ نازانم.. بەڵام ئەگەر بڵێیت: کەی ناو لە کەسەکان و شتەکان بنرێت..؟! ئەوا دەڵێم: کاتێ لێیان تێگەیشتین.

ـ جا کەی لێیان تێدەگەین..؟!

ـ مەحاڵە لێیان تێبگەین.

ـ کەواتە دەبێت هەموو شتێ بەبێ ناو بمێنێتەوە.

ئەو وەکوو پیشەی هەمیشەی خۆی کردی بە گاڵتە و پێی وت:

ـ ئەوە تۆ بۆچی ئاوا سەغڵەت بوویت شتەپیس..؟! خۆ دەبووایە پێت خۆش بووایە، چونکە ئێستا سەر شانت بەم کتێبە قورس نەدەبوو..!!

**ـ بزانە ڕەزاقورس وتت خوشکم حەزدەکەم سەیری ژووری نووستنەکەت بکەم..؟!**

«فەریال» بوو دەستی چەپی خستە سەر شانی ڕاستی و بە مەکرێکەوە ئاوای پێ وت.. ئەم ڕاچڵەکی و بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

ـ بۆچی ئێوە هەر لێرە دەژین..؟! ئەی خانووی خۆتان نییە..؟!

ـ فوئاد لە دوو مانگ چوار ڕۆژ مۆڵەتی هەیە، خۆ ناکرێت من......

ـ هەر ژوورەکەی ئەوسای خۆمانە..؟!

ـ ئا، بەڵام ئەگەر بیبینیت نایناسیتەوە..!!

ـ زۆر خۆشبووە..؟! ها..؟!

ـ جارانیش خۆشبوو..!!

ـ بەڵام ئێستا خۆشترە.. دەی وا بڵێ.

ـ حەزدەکەیت وا بڵێم وانییە..؟!

ـ دوورنییە حەزبکەم.

ـ سەیرە من ناتوانم ئاوات پێ بڵێم، هەرچەند دەشزانم تۆ زۆر ئاسوودە دەبیت، ئەگەر بە ڕاستیی و لە دڵەوە بیڵێم..!!

ـ ناتوانییت هەر تاقە جارێکیش بیڵێیت..؟!

ـ ناتوانم.. ناتوانم خوشکە ڕۆحەکەم.. باوەڕبکە ناتوانم.

ـ ناتوانییت بە دایکەشی بڵێیت..؟!
ـ بڵێم چی..؟!
ـ بڵێیت ئێستا ژوورەکەم لە جاران خۆشترە.
ـ جا ئەم کوا گوێ لە قسەی ئاوا دەگرێت..!!
ـ ئەگەر بزانییت بە ڕاستیی گوێدەگرێت، وای پێ دەڵێیت..؟!
ـ نازانم.. نازانم.. تووخوا با نەیڵێم.
ـ بیڵێ فەریالەکەی ڕۆحم.. تووخوا بیڵێ.
ـ ناتوانم.. وای تووخوا ناتوانم نەوال.
ـ جارێ، جارێ، هەر یەک جار و بەس.
ـ وی، نا، ئەوە چییتە..؟!
ـ بەڵام خۆ دەبێت ڕۆژێ هەر.....

دایکی کراسە ڕەشە تەنکەکەی نووستنی لەبەرکردبوو و لە ژووری میوان هاتە دەرێ.. چوو بۆ لای «فەرهاد» و «نەسرین» و بە ئاماژەی دەستەکانی تێیگەیاندن، کەوا بچنە ناو باخەکە و لەسەر کورسیە سپیەکاندا دانیشن.. ئینجا ڕوویکردە «فەریال» و پێی وت:

ـ بچۆ جێگای نەوال لای ئەوەی من داخە و با بۆ کاتی خەوتن فێنکبێتەوە.

«فەریال» دوای ئەوەی چووە سەربان و جێگاکەی بۆ داخست، هاتەوە و پێی وت:

ـ وەرە لەگەڵما، با کراسێکی خۆمت بدەمێ و.....

بەدەم خۆگۆڕینەوە سەیری تەختی نووستنەکەی دەکرد و لێی وردەبووەوە، کە لە ساجێکی سپیی لووس درووستکرابوو و دۆشەگێکی ڕەشی دوونەفەرییان لەسەر داخستبوو.. لەسەر کانتۆرە ڕەشە نزمەکەشدا قات قات لێفە و سەرینی سپییان هەڵچنیبوو و بە کوللەیەکی تەنکی ڕەش ڕەش دایانپۆشیبوون.. شەوانی مناڵیی کاتێ لەسەرپشت ڕادەکشا و سەری دەخستە سەر ڕانی چەپی ئامۆژنی، سەیری ئەستێرکی نوێنەکانی خۆیانی دەکرد و لێیدەبوو بە دەشتێکی پانوپۆڕ.. قافڵەی ئێسترە سپیەکانی پیادادەڕۆیشت و گوێی لە زەنگزەزەنگ زەزەنگ.. زەنگزەزەنگ

زەزەنگی زەنگوڵی ملیان و تەقتەتەق تەقتەق.. تەقتەتەق تەقتەقی قاچی ڕەشیان دەبوو.. لە دوایانەوە پیاو و ژن و منداڵی بەقەدەر خۆی و هی گەورەتر بە لایدا تێدەپەڕین و کز و خەمناک سەیریان دەکرد.. بەدەمیەوە پێدەکەنین و دەستیان بۆی هەڵدەشەقاند.. ئەوەندە بەسەر ئەو ڕێگایەدا هاتووچۆبان کردبوو و لێیان وردبووبووەوە، هەموویانی دەناسی و ناوەکانیانی لەبەرکردبوو.. هەندێ جار لێزمەباران تەڕی دەکردن و هەندێ جاریش لە ژێر تیشکی مانگەشەو و ئەستێرەکاندا گیانیان دەدرەوشایەوە.. گوێی لە گۆرانیە ئێجگار بەسۆزەکانیان دەبوو و بۆی دەسەندنەوە، کە بە چەند زمانێ دەیانچڕی و لەگەڵیا فرمێسکیان هەڵدەڕشت.. کاتێکیش لە کۆڵان و لە قوتابخانەدا لاسایی دەکردنەوە و وەکوو خۆیانی دەوتنەوە، هەموو سەریان سوڕدەما و لێیان دەپرسی:

ـ ئەم گۆرانیانەت لە کوێ هێناوە سەربەگۆبەند..؟! لە کێ فێریان بوویت جنۆکە..؟!

ـ لەو کۆچەرە ڕەشپۆشانەی شەوان بەسەر ڕێگای دەشتی چۆڵی سەر نوێنە سپیە هەڵچنراوکانی سەر کانتۆرە ڕەشەکەی ژووری نووستنی خۆماندا تێدەپەڕن.

دەسا ناهەقی نەبوو زۆر جار وابزانێت کچی ئەوانە و لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا لێیان بەجێماوە.. ئەو جارە «سیامەند» چەند خەفەتی خوارد و چەند بەکوڵیش بۆی گریا، کاتێ لە بەرامبەر مافووری سووری نەخشاو بە وێنەی حوشتری ڕەشی ژن و پیاوە سپیپۆشەکانی قەد دیواری هەیواندا وەزیفەی دەنووسیەوە و بۆی باسکرد.. بە دەسرە ڕەشەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی و پێی دەوت:

ـ ئاخ..!! نەونەوەکەی دڵم، نازانم تۆ بۆچی خەیاڵی ئاوا دەکەیت..!!

جا بۆ نەیکات و تەواویش باوەڕنەهێنێت، کە ئەم کەسێکی ئاسایی نییە و هەر لەبەر ئەوەشە ناتوانێت نە لە خۆی و نە لەوان و نە لە شتومەکی ناو ماڵەکەیان بگات..؟! ئا ئەوەتا لە ئاستی ئەو کوڕ و کچەدا تەواو سەراسیمە بووە و لە هەموو کاتێ زیاتر گومان لە بوونی خۆی دەکات.. ناهەقی نەبوو، کاتێ «فەریال» بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی و بە هی چەپی ڕاستەی گرت و پێی

وت:

ـ ئەرێ من زۆرم بەلاوە سەیرە، تۆ هیچ نەتپرسی: ئەمانە چۆن ڕێیان کەوتۆتە ئەمماڵەی ئێمە.!!

ئەم سەرێ بابدات و پێی بڵێت:

ـ بۆچی بیزانم..؟! خوشک و برامانن و تەواو..!!

زۆر ئاسایی گوێی گرتبوو و هیچ نەدەورووژا، کاتێ ئەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ـ لەگەڵ باوکیان لە هەولێرەوە هاتوون بۆ بەغدا و لەناو دارخورماکانی سەر ڕێگا تووشی چەتە سپیپۆشەکان بوون.. باوکیان بە برینداری کەوتۆتە بەر دەستیان و ئەمان هەرچۆنێ بووە خۆیان دەربازکردووە.. ئەوەندە بە پێ ڕایانکردووە و ئەوەندەش بەملا و بەولادا کەوتوون، هەموو گیانیان کوتراوە و بردوویانن بۆ خەستەخانە.. خاڵۆژنم چارەسەری کردوون و هەمیشە بە دیار سەریانەوە بووە.. کە زانیویەتی کەسیان نییە و هیچ شوێنێ نییە ڕووی تێبکەن، بۆ ئێمەی هێناون و ئیتر.....

لەوە زیاتر تاقەتی نەبوو گوێی لێبگرێت و چووە دەرێ.. چاوی لێبوو سەریان لەبن سەری یەکتر نابوو و قسەیان دەکرد.. لەپڕ دایکی لێیان تووڕەبوو و پێی وتن:

ـ ئشت..!! کوردی نا..!!

شەویش کاتێ سەرکەوتنە سەربان و ویستیان بنوون، ئەو جێگاکانیانی لە یەکتر دوورخستەوە و بە «فەریال»ی وت:

ـ پێم نەوتی بە تەنیشت یەکەوە بۆیان دامەخە..؟!

ـ ئاخر گوناحن دایکە، نابێت......؟!

ـ نەء، نابێت.

«فەرهاد» لە تەنیشت ئەمەوە پاڵکەوتبوو و بە شەرمەوە سەیری دەکرد.. ئەم بۆئەوەی ڕووی بکاتەوە و پیشانی بدات خوشکیەتی، دەستی چەپی بۆ درێژکرد و خستیە سەر سنگی.. ئینجا وردە وردە بۆ سەر چەناگە و ڕوومەتەکانی

دەیگوێزایەوە و نوقورچی سووک سووکی لێدەگرتن.. دواجار پەنجەکانی بردە ناو قژە خاوەکەی و زۆر بە ئاستەم تاڵە ئێجگار ڕەش و چەند بڵێیت باریکەکانی ڕادەکێشا.. لەگەڵیا چاوی دەبڕیە چاوەکانیەوە و بزەی بۆ دەخستە سەر لێویەوە.. دایکی هەستایەوە و پێی وت:

ـ قسەی لەگەڵدا بکە نەوال، با وردە وردە فێری عەرەبی بێت.

ئەم هەستی کرد ئەو زیاد لە پێویست مەسەلەی زمانی لێبووە بە خەم و پێی لەسەر دادەگرێت، بۆیە لە داخا دەستی کێشایەوە و ڕوویتێکرد.. پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی بۆ ڕاشەقاند و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ تۆ مامۆستای زمانی عەرەبییت، دەتوانیت فێریان بکەیت، نەک من.

«فەریال» لەولاوە پەنجە باریکەکانی «نەسرین»ی گرتبوو و فێری ژمارەی دەکرد.. جار جار ئاماژەی بە مانگ و ئەستێرە و ئاسمان دەکرد و ناوەکانیانی پێ دەوت.. ئەویش بە شێوەیەک دەیوتنەوە و دەنگەکانی دەردەکردن، کە ئەم پێی سەرسامبێت و وا هەست بکات لە ماوەیەکی ئێجگار کەمدا تەواو فێردەبێت.. ڕوویکردەوە لای «فەرهاد» و ویستی ئەمیش لەگەڵ ئەودا خەریکبێت، بەڵام ئەو پشتی تێکردبوو و هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا.. دەستی چەپی خستە سەر قەپرغەی و کەوتە ختووکەدانی.. ئەو پێدەکەنی و تۆز تۆز خۆی دووردەخستەوە.. ئەم بە ئەسپایی بۆ سەر جێگاکەی ئەو خشکەیکرد و لە دوایەوەی پاڵکەوت.. توند توند دەیگوشی بە خۆیەوە و خۆش خۆش پێی دەوت:

ـ ڕادەکەیت لە دەستم..؟! ناشیرین..!!

ئینجا خستیە ژێر خۆی و سووک سووک پیایدا دەکێشا.. هەستی دەکرد ئەو لە دڵەوە حەزی لە دەسبازییە و وا وردە وردە شەرمیشی دەشکێت.. دایکی و «فەریال» بە قەستیی پەلاماریان دا و گوایە کوڕەکەیانی لە ژێر دەست دەردەهێنن.. بانگی «نەسرین»یشیان کرد و بە هەموویان تێیکەوتن.. کردیان بە یارییەکی خۆش و لەبەر قریشکەقریشک و تریقانەوەی خۆیان تا درەنگ گوێیان لە زەنگی تەلەفۆنەکە نەبوو.. کاتێکیش ئەم و دایکی ڕایانکرد و چوونە خوارەوە، داخرایەوە و فریای نەکەوتن.. جارێکی تر لێیدایەوە و ئەم بە دەستی چەپی

هەڵیگرت.. «سیامەند» بوو و بە قوڕگی پڕ لە گریان و بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە پێی وت:

ـ ئەوە تۆ لەوێیت..؟! خۆ ئێمە لە ئێوارەوە وەکوو شێت ئەملا و ئەولات بۆ دەگەڕێین..!!

ـ زۆرت خواردۆتەوە.. وانییە..؟!

ـ سەرخۆش نییم نەوال.. باوەڕبکە سەرخۆش نییم.

ـ ئەی بۆ زوو تەلەفۆنت نەکرد بۆ ئێرە..؟!

ـ باوەڕم نەدەکرد لەوێ بیت..!!

ـ بۆچی ماڵی خۆمان نییە..؟!

ـ من ئاوا ناڵێم نەوال گیان، ئەوە تۆ چییتە چاوەکەم..؟!

دایکی بە دەستی چەپی تەلەفۆنەکەی لەم وەرگرت و بە لەفزێکی زۆر شیرین بەوی وت:

ـ دە وەرە تۆش سیامەند بە تەنیا چی دەکەیت..؟! نەوالیش حەزدەکات.... دێیت..؟! زۆر باشە..!!

جێگایان لە تەیشت ئەوەی «نەسرین»دا بۆ داخست و ئەوەندەی نەبرد گەیشت.. «نەوال» حەزی لە دەسبازیی بوو و بەوانیشی وتبوو، کە بە هەموویان تێیبکەون و ختووکەی لاقەپرغە و بنی پێکانی بدەن.. ئەم و «فەریال» سەریان لەسەر پەرژینی بانەکەدا شۆڕکردبووەوە و سەیری خوارەوەیان دەکرد، کاتێ دایکیان دەرگای لێکردەوە و ئەو هاتە حەوشەکەوە.. لەوێ سەیرێکی ئەمانی کرد و بە دەنگێ، کە ترس شێواندبووی و زۆر بە زەحمەت لە قوڕگی دەردەچوو، وتی:

ـ ئای..!! مەیموونە ڕۆحسووکەکانم، چەند دڵم پێتان خۆشە ..!!

ئەم قاقایەکی لێ دا و پێی وت:

ـ خێرا خۆت بگۆڕە و وەرە سەرەوە.

ـ من لە خوارەوە دەنووم.

ـ خوارەوەی چی..؟! ئێمە جێگامان لێرە بۆ داخستوویت.

ـ کەمێکی تر دایدەکاتە باران و دەبێ ئێوەش بێنە خوارەوە.

ئەم سەری هەڵبڕی و سەیرێکی هەورە سپییەکانی کرد، کە لە شێوەی تاجەگوڵینە بە ڕووی ئاسمانە ڕەشەکەدا دەرکەوتبوون و جووڵەیان نەدەکرد.. بە دەستی ڕاستی قژی ڕێکخستەوە و پێی وت:

ـ بارانی چی بەم ناوەڕاستی تەمووزە..!! وەرە دەی..!!

ـ وازم لێبێنە نەوال.. من بە بارانی هاوین زۆر نارەحەت دەبم و هەر تەواو تێکمدەدات..!!

قسەکەی ئەو ڕاست دەرچوو و باران لە شیرینخەودا ڕایپەڕاندن.. سەرەتا لێفەکانیان تا سەر چاویان هێنا و چاوەڕێبوون خۆشیبکاتەوە.. کەچی تاویسەند و لەوەدا نەما خۆیانی لەبەر ڕابگرن.. لەپڕ دایکیان هەستا و بە نارەزاییەوە پێی وتن:

ـ هەستن کوڕ و کچەکانم، لەوەناچێت.....

هەر کەسە و نوێنی خۆی پێچایەوە و بەرەو خوار ملیان نا.. لەسەر قالدرمەکاندا «نەوال» چووە پشت «نەسرین» و بە سەرینە سپیەکەی دەیکێشا بە سەریا، کە لە پەڕی قاز درووستکرا بوو و بە پەڕەسێلکەی ورد وردی ڕەش ڕەش ڕازابووەوە.. پییایدا دەکێشا و پێی دەوت:

ـ ئەوە من چی لە خۆم بکەم، ئاوا وەکوو تۆ جوان دەبم..؟!

ئەمە قسەی ئامۆژنی بوو و ڕێک لەسەر شێوەی ئەویش دەیوتەوە.. ئەم هەموو جارێ وەکوو سەرەژنێکی زۆرزان، بە خۆبادانێکی سەرنجڕاکێشەوە چاوەکانی دەبڕیە چاویەوە و پێی دەوت:

ـ دڵەکەم دەربێنە و بۆ خۆت لەسەر خەڵووزی ناو مەقەڵیی سپیی کەبابخانەی کەبابچییە ڕەشپۆشەکەی سەر سووچی بازاڕی کەمێ تەنگ و تاریکی مسگەرەکاندا بیبرژێنە.

بەڵام ئەو عەرەبیی نەدەزانی و تێنەدەگەیشت.. تێشبگەیشتایە لە ڕووی نەدەهات وەڵامی بداتەوە و ئاوا وەکوو خوشکی ناوەنجیی هەموو شتێ بڵێت.. بۆیە کز کز سەری خۆی لەبەر نابوو و شەرمن شەرمن و بە چاوی خەواڵووەوە پلە پلە دادەبەزی.. دەسا هەر لەبەرئەوەش بوو ئاوا لەپڕ قاچەکانی لە باریەکترچوون

و تلۆربووەوە.. لە بەردەمی ژووری میواندا لەنگەری گرت و نووزەی بۆ نەکرا.. تا ئەمان گەیشتنە سەری و هەڵیانگرتەوە، ئەو پێڵووەکانی بەسەر گلێنەیدا ڕەهێڵبوون و جەستەی ئاسەواری ڕۆحی تیادا نەمابوو.. دایکیان شانەکانی «سیامەند»ی بە توندی ڕاتەکاند و هاواری بە سەردا کرد:

ـ ئەوە تۆ دڵت پێوە نییە..؟! دە خێرا هەڵیگرە و بیگەیەنە خەستەخانە.. لەسەر چی وەستاویت..؟!

ئەو تازە بە چاوی خەواڵووەوە لە ژووری نووستن هاتبووە دەرێ و پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشابوون.. بەدەم ئاخهەڵکێشانەوە سەرێکی بادا و پێی وت:

ـ مردووە..!! مردوو..!!

کەچی لەبەر دڵی ئەویش باوەشی پیادا کرد و بۆ ناو ئۆتۆمۆبیلەکەی برد.. دایکیان لەگەڵی چوو و ئەمان لە ماڵ مانەوە.. «فەریال» قژی خۆی دەڕنییەوە و هاواری دەکرد:

ـ ئای..!! خوشکە یەکشەویەکەم، چەند زوو لە دەستمان چوویت..!!

براکەیان دەگریا و دەموچاوی خۆی دەڕنییەوە.. تێینەدەگەیشتن چی دەڵێت و ئەو هەموو قسەیە چیین بە سەریەکەوە دەیانلێتەوە.. ئەم پەنجەکانی لە چاوی نزیکدەکردەوە و دەیویست بۆی ڕوونکاتەوە، کە مردن و خەوزڕان لە یەکتر دەچن و پێویست بە شیوەن و گریان ناکات.. بەڵام ئاخ..!! ئەو تێنەدەگەیشت و ئەوەندەی تر دەنگی لێ هەڵدەبڕی.. دراوسێکان لەملا و لەولاوە لێیان کۆبوونەوە و باخ و حەوشە تەڕەکەیان جمەی دەهات.. «شاهین»ی فڕۆکەوان و «سەناء»ی خێزانی لە پێش هەموویانەوە گەیشتن و بە سەرسوڕمانەوە پرسیان:

ـ ئەوە چییتان لێقەوماوە..؟! ئەم هاوار و ڕۆڕۆیەتان لە چییە بەم نیوەشەوە..؟!

هەرچەندیش «فەریال» بەدەم لەخۆدانەوە ڕووی تێدەکردن و دەیوت:

ـ هالەی خوشکم مرد..!! هالەی خوشکم مرد..!!

ئەوان ئەوندەی تر دەحەپەسان و دەیانوت:

ـ هالەی خوشکت، یان پوورت..؟! جا تووخوا هالەی پوورت

ئەمرۆیە........؟!

ـ هالەی خوشکم.. هالەی خوشکم.. بۆ لێم تێناگەن بۆ..؟! بۆ..؟! تووخوا بۆ..؟! بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! دە پێم بڵێن بۆ..؟!

ـ ئەی ئەم کوڕە کێیە لەماڵتان..؟!

ـ جابری برامانە..!!

ـ قسەی ڕێک بکە و تێمانبگەیەنە فەریال، بۆچی تۆش وەکوو نەوال...........

تا دایکی و «سیامەند» لە خەستەخانەوە تەلەفۆنیان نەکرد و «شاهین» خۆی قسەی لەگەڵدا نەکردن، لە کرۆکی مەسەلەکە تێنەگەیشتن و لە مقۆمقۆی خۆبان نەکەوتن.. «ست سوعاد» لە تەلەفۆنەکەدا دڵنەوایی «نەوال»ی کرد و بە دەنگێکی ئێجگار ناسک پێی وت:

ـ بە سائەقەی دڵە پاکەکەت بم کچە ناوەنجییەکەم، هالەی خوشکت ساغ و سەلامەتە و کەمێ موورەغەی پشتی ئازاری پێگەیشتووە.

ـ بەڵام دایکە جابر تێناگات و خۆی لەتوکوت کردووە.

ـ بیهێنە سەر تەلەفۆنەکە و با سیامەند قسەی لەگەڵدا بکات.

ـ تێناگات و ناشتوانم بیهێنم.

ـ مادام تا مامت دەنێرم بیهێنێت، ئاگاتان لێی بێت و.....

ـ پێت دەڵێم، ئەم لە هیچ شتێ تێناگات.. ئەوە لە کەیەکەوە دەمەوێت بە پەنجەکانم بۆی ڕوونکەمەوە، کە مردن و خەوزڕان......

ـ بێ دەنگ بە قەحپە.. پەنجەکانت بکە بە ناوگەڵی خۆتا و.......

ـ باشە.. باش.. بە قسەی تۆ دەکەم.. ئەوە چاوەڕێیین.. بەڵام تووخوا خێراکەن، تا خۆی نەکوشتووە..!!

ـ ئێوەش وەرن لەگەڵیا بە سائەقەتان بم، بۆئەوەی دڵی پێتان بکرێتەوە و هەست بە تەنیایی نەکات.

ئەم لە پێش هەموویانەوە لە ئۆتۆمۆبیلەکەدا دابەزی و بۆ ناو خەستەخانەکە ڕایکرد.. لە دەرگای قاوشی ژمارە چواردا سیستەرێکی باڵابەرزی بینی و تەواو

سەرسامبوو.. هەر ئەوەندەی پێکرا بە سستی دەمی بکاتەوە و دوو جار بە دەنگێ، کە لە هەموو ژیانیدا قسەی پێنەکردبوو و لە جیبیڕەجیبیڕی جۆللانەی ساجی ڕەشی بە کوللەی تەنکی سپیی داپۆشراوی «ئەفکار»ی خاڵۆزای دەچوو، بڵێت:

ـ ئامۆژن..!! ئامۆژن..!!

کاتێکیش هاتەوە هۆش خۆی و چاوەکانی کردەوە، لەسەر قەرەوێڵەکەی تەنیشت «هالە»ی خوشکیدا پاڵیانخستبوو و دەستی چەپی لەناو دەستی ڕاستی ئامۆژنیدا ئارەقیان کردبووەوە.. بە زەحمەت سەری هەڵبڕی و جارێکی تریش بە هەمان شێوەی پێشوو هاواری کرد:

ـ ئامۆژن.. ئامۆژن.. ئەوە تۆ........؟!

لەبەر ئازاری مووسەڵانی بۆی تەواو نەکرا و سەری بە سستی کەوتەوە سەر سەرینەکەی.. ئەو دەستی چەپی خستە سەر ناوچەوانی و بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە پێی وت:

ـ ئاخ..!! من چەند خۆم بە گوناهبار دەزانم، کە دەبینم تۆ نامناسیتەوە..!!

ـ وام پێ مەڵێ.. وام پێ مەڵێ.. تووخوا وام پێ مەڵێ.

ـ وات پێ دەڵێم و لە دڵەوە حەزدەکەم ئازارت بدەم.

ـ ئازارم بدە ئامۆژنە ڕۆحەکەم.. ئازارم بدە.

ـ ناتوانم.. ناتوانم.. ئاخ..!! نەونەوەکەی ڕۆحم من دەستەوستانم لە ئازاردانی دڵی تۆ..!!

ـ بۆچی..؟! پێم بڵێ بۆچی..؟!

ـ چونکە تۆ ناتوانییت من بناسیتەوە.

ـ بۆچی ئاوام لێدەکەیت..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! من کوا بەرگەی......؟!

ـ ها ئەوە پەنجەکانم و جوان سەیریانکە، بۆئەوەی پێت بڵێم: ئەی بۆشاییەکەی نێوان بنی پێم و تەوقی سەرم بە چی پڕتکەمەوە، لێم جیادەبیتەوە و بە ئێجگاری وازم لێدەهێنیت..؟!

لەپڕ ڕاچڵەکی و ناو سەری غەڵبەغەڵبێکی سەیر و ناکاوی تێکەوت.. گوێی

لە دەنگی ڕووخانی پەیکەرەکان دەبوو و گیانی لەگەڵیا دەهەژایەوە، کە نەیدەزانی چ پەیکەرتاشێکی چاوقایم بەبێ ئاگایی ئەم، دەرفەتی هێناوە و لە ناخی دڵیا هەڵیچنیون.. بەردی زۆر ڕەق و کۆنکرێتی ئێجگار تۆکمە و شیشی لە ڕادەبەدەر بتەو و کەچی چەند بڵێیت لووس، «الأوجار.. الأوجار.. الأوجار.. الأوجار»«٢٤» لە باریەکتر هەڵدەوەشان و «الاغواء.. الاغواء.. الاغواء.. الاغواء»«٢٥» بەو ناوەدا بڵاودەبوونەوە.. هەستی قێز و تەریقبوونەوە و گوناه، ئاوێتە دەبوون و «یغرغر.. یغرغر.. یغرغر.. یغرغر»«٢٦» بەناو دەمارەکانیدا دەگەڕان.. کەچی هێشتا نەدەبوورایەوە و لە هەموو کاتێ چاکتر دەیتوانی «شاناز» و «شازەمان» لە یەکتر جیابکاتەوە.. خۆ ئەم جاران هەر بەوەدا دەیزانی و تەواو دڵنیا دەبوو، ئەوەی بەرامبەری «شانازە» و ئامۆژنی نییە، کە پەنجە باریک و درێژەکانی لە چاوەکانی نزیکبکردنایەتەوە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر و بە هەموو لایەکدا بیجوولاندنایە.. لەگەڵیا سەری بۆ بلەقەندایەتەوە و پێی بوتایە:

ـ ئەی بۆشاییەکەی نێوان بنی پێم و تەوقی سەرم، بە چی پڕتکەمەوە، لێم جیادەبیتەوە و بە ئێجگاری وازم لێدەهێنیت..؟!

ئیتر ئەم وردە وردە چاوەکانی دەکەوتنە ڕەشکەوپێشکە و سووک سووک دیمەنی شتەکانی لێ دەگۆڕا.. لەپڕ پێڵووەکانی قورس دەبوون و بە شل و خاویەوە دەستی چەپی بە دەسکی ڕەشی لووسی دەرگا سپیە بازنەییەکەی نێوان ماڵی لاکێشەیی دادە ئاگایی و هی چوارگۆشەیی مامە بێئاگاییدا دەگرت.. بە حاڵەحاڵ بۆ خوارەوەی دەهێنا و بە سستی پاڵی پێوەدەنا.. وڕ و گێژ قاچەکانی دەبردە حەوشە لاکێشەییەکەی ئەودیو و بە پەنجەکانی هەر دوو دەستی، قژی ڕەش ڕەش و درێژ درێژی پیت و دەنگەکانی دەگرت.. دەیگرتن و یەک لە دوای یەک لە بنکی هەوری چڕی تەزیوی خەونێکی بوخورداری سەر لووتکەی شاخی بەرزی بێناودا هەڵیدەکێشان.. دەریدەهێنان و نقوومیدەکردنەوە.. دەریدەهێنانەوە و دەیکردنە وەڵام:

ـ بە خەون..!! بە خەون پڕیکەرەوە..!!

بەڵام ئێستا نە خەوی لێدەکەوێت و نە دەشتوانێت چاوەکانی لێ

بترووکێنێت.. تازە مەحاڵە مەحاڵ دەستبەرداری بێت و بهێڵێت بە چرکە لێی دوورکەوێتەوە.. خۆ ئەم دوای مردنی ئامۆژنی دنیای بەدوادا گەڕا و نەیدۆزیەوە.. چوو بۆ «خەستەخانەی قادسیە» و لە بەڕێوەبەر و هەموو دکتۆر و برینپێچ و سیستەرەکانی پرسی.. ئەمان وەک بڵێیت پێشتر زانیبێتیان ئەم دێت و پرسیاری دەکات، قسەی خۆیان کردبوو بە یەک و پێیان دەوت:

ـ لەوەتەی ئەم خەستەخانەیە هەیە، سیستەری شاناز ناوی تیانەبووە..!!

چوو بۆ گەڕەکی «تپە الاکراد» و لە دەرگای ماڵەکەیانی دا.. هەناسەساردیان کرد و پێیان وت:

ـ شاناز ناناسین، بەڵام زوو زوو ماڵی مارف هەولێری لێرە بوون و ئێمە هاتووین بۆ شوێنی ئەوان..!!

ـ ئەی نازانن چوون بۆ کوێ.. ؟!

ـ کەس نازانێ بۆ کوێ سەری خۆیان هەڵگرتووە..!!

لە دراوسێکانیشیانی پرسی و هەمان وەڵامیان دایەوە.. هەستی کرد و تەواویش چووە ئەقڵیەوە، کە هەر دووکیان یەکێکن و «شاناز» تەنیا لە خەیاڵی ئەمدا هەیە.. بەڵام دوایی بۆی ڕوونبووەوە و گومانی لەوەدا نەما، کە «سیامەند» زووتر دەستی خۆی وەشاندووە و هەموو ڕێگاکانی لێگرتووە.. بەتایبەتی کاتێ زانی «فارووق خەمیس»ی بەڕێوەبەری خەستەخانەکە ناسیاویەتی و زۆر شەوان لەسەر مێزی ڕەشوسپیی «نادی الحمراء»دا بە یەکەوە دادەنیشن.. جێنشینی ماڵەکەی «مام مارف»یش «غەسان زنجی»ی شاعیر بوو و وەکو زۆربەی نووسەر و ڕۆشەنبیرانی تری «بەغا» هاتوچۆی گازینۆکەی «حەسەن عەجەمی»ی دەکرد.. ڕێی تێدەچێت لەوێ ناسیبێتی و لەگەڵی ڕێککەوتبێت.. ئەوا هەموو شتێ ڕوونبووەوە و تەواو ڕادەی ڕقی «سیامەند»ی لە ئاستی ئەو ژنەدا بۆ دەرکەوت....

«هالە» بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە پرسیاری لە «شاناز» کرد و ئەو بەدەم بزەیەکی جوانەوە وەڵامی دایەوە.. ئینجا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بەمی وت:

ـ خوشکەکەت پەلەیەتی تۆ چاکبیتەوە و بە جووتە بڕۆنەوە ماڵ..!!

که ئەم هیچی نەوت و لای بۆ نەکردەوە، ئەو پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشان و پێی وت:

ـ چەنێ تۆی خۆشدەوێت و چەنێکیش دڵی پێت خۆشە نەونەوەکەی ڕۆحم..!!

ئەم بە زمان لێوی تەڕکردەوە و وتی:

ـ دەزانم، بەڵام با چاوەڕێی من نەبێت لەگەڵی بچمەوە ماڵ.

ـ ئەوە چییە نەونەو..؟! چۆن دەبێت ئاقڵ گیان..!!

ـ من لەگەڵ تۆ دێم.

ـ بەیانی هەر سێکمان دەچینەوە بۆ ماڵی ئێوە.

ـ نەء، من و تۆ دەچین بۆ ماڵی ئێوە و بیری مام مارف و نەنە سۆزرەتیش دەکەم.

ـ منیش بیریان دەکەم، بەڵام ناشتوانم بچم بۆ لایان.

ـ بۆچی ئەوان لە کوێن..؟! لە هەولێرن..؟!

ـ نەء، بوون بە سەرەمێکوتە و لەناو هێلکەشەیتانۆکاندا سڕبوون.

ـ مردن..؟! کەی..؟! ئەی تۆ ئێستا بە تەنیا دەژییت..؟! لە کوێ..؟! شووتکردووە..؟! دەمێکە..؟! کێیە مێردەکەت..؟! ئەی من بۆ نەمزانیوە..؟!

ـ چۆن تۆ نازانی من ئێستا لە کوێم..؟! ئەی خاڵە ئەمجەدت و سەلوای خاڵۆژنت بۆیان باس نەکردوویت، من لەگەڵ ئەوان......؟!

ـ تۆ لەگەڵ ئەوان.....؟!

ـ سەیرە..!! من وامدەزانی زانیوتە و حەزناکەیت بێیت بۆ لام..!!

ـ یانی تۆ شووت نەکردووە..؟!

ـ هەرگیز ناشیکەم.

ئاوای دەوت و لەگەڵیا دانەکانی بە جیرەوەدەبرد.. وشەکانی دەبینی و قێزی لێدەکردنەوە، کە لە شێوەی ڕشانەوە دەردەچوون و تۆپەڵ تۆپەڵ دەکەوتنە خوارەوە.. ڕۆژی دواییش، کاتێ دایکی و «فەریال» هاتن بە شوێنیاندا و «سیامەند» و «جابر»ی برایشی لەبەر دەرگادا چاوەڕێیاندەکردن، ئەو دەستەکانی کردە ملیەوە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر بە گوێچکەی چەپیدا چپاند:

ـ حەزم دەکرد تا ماوم هەر بە نەونەو بانگت بکەم، بۆئەوەی هەر وابزانم خوشکە بچکۆلە و ڕۆحسووکەکەی خۆمیت و گەورە نەبوویت، بەلاَم.....

تەواوی نەکرد و دەمی لە گوێچکەی دوورخستەوە.. ئینجا بە دەستی چەپی دەستی ڕاستی توند گوشی و بەدەم ئاخێکی قووڵەوە پێی وت:

ـ مادام لای دایکتی زوو زوو یەکتر دەبینین.

بەلاَم لەوێ نەمایەوە و هەر ئەو ڕۆژە گەڕایەوە لای «سیامەند».. تەنانەت لە ئۆتۆمۆبیلەکە دانەبەزی و گوێی لەو هەموو تکا و پاڕانەوەی «فەریال»یش نەگرت.. «هالە» و «جابر» لە دەموچاویاندا دیاربوو و ئەم تەواو هەستی پێدەکردن، کە چەند حەزدەکەن لایان بمێنێتەوە و لە بینینی خۆی بێ بەشیان نەکات.. ئەو ئێوارەیەی ئەم و «ریهام» لە ماڵی «دیلهام» هاتنەوە و چوون بۆ کتێبخانەی «ئەزاهیر»، تا کتێبی «شێت»ی «جوبران خەلیل جوبران» بکڕن و شەو بە جووتە بیخوێننەوە، کاتێکی زانی «هالە»ی لێ پەیدابوو و وەکوو منالّ خۆی خستە باوەشیەوە.. سەری لەسەر شانی هەڵنەدەگرت و چاوەکانی پڕبووبوون لە فرمێسک.. ئەم ماچی قژە ڕەش و خاوەکەی کرد و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

ـ بە سائەقەت بم هالە گیان ئەوە تۆ لێرە چی دەکەیت..؟!

ئەو هەرچۆنێ بوو دەمی کردەوە و بە عەرەبیەکی شێوەکوردیانە، بەلاَم چەند بلێی خۆش و سەرنجڕاکێش، وتی:

ـ هیاتها ماما..!! (ئەمەتا دایکە).

دایکیان گەیشتە لایان و ئەم و «ریهام»ی ماچکرد.. ئینجا وەکوو کچێکی هەرزەکار جانتا سپییەکەی لە شانی چەپی ترازاند و وتی:

ـ نیازمان وایە تەختەڕەشێکی بچکۆلەی ناوماڵ بکڕین..!!

هەر خۆیشی سەیرێکی ناو کتێبخانە گەورەکەی بەرامبەری کرد و ئەمەشی خستە سەری:

ـ دەمەوێت وردە وردە فێری نووسینیشیان بکەم.. زۆر زیرەکن و لەوێش هەموو ساڵێ بە یەکەم دەرچوون.

هەستی کرد دایکی تووشی تەنگوچەڵەمەیەکی ئێجگار گەورەبووە و زۆر لێزانانەش لە خەڵکی دەشارێتەوە.. هەر کاتێ سووک سووک قسەی بکردایە و لەگەڵیا برژانگەکانی خێرا خێرا بجووڵاندایە، ئەم دەیزانی لە بنکی دڵیا، ڕێک لەو شوێنەی ئێواران ژنەکۆچەریە ڕەشپۆشەکانی سۆز و ڕق، پشووی لێ دەدەن و ئاوی سارد و تەزیو بە دەمی منداڵەکانی کۆڵیانەوە دەکەن، خەمێکی گەورە وەکوو ئەسپی ڕەشی ئێجگار ماندووی جەنگاوەرە سپیپۆشەکانی ناو کتێبی ڕەنگهەڵبزرکاوی مێژووە زۆر کۆنەکان کەوتۆتە سمکۆڵان و حیلەحیلی لە دوورەوە دەبیسترێت.. بەڵام گوێی نەدایە و نەیویست وەکوو جاران لێی بپرسێتەوە.. ئاخر نەیدەپەرژا لەو خوشکەی زیاتر بیر لە هیچ شتێکی تر بکاتەوە و نەدەکرا بە چرکە چاو لەو چاوانەی بترووکێنێت، کە هەر ساتەی بە شێوەیەک دەردەکەوتن و دەستەوستانبوو لەوەی هیچ ناوێکیان لێبنێت.. دوای دەرچوونیان لە خەستاخانە، ئەوە یەکەمجاربوو بیبینێت و بە ڕاستیی هەستبکات ماڵەکەیان گۆڕانی بەسەرداهاتووە.. خۆبشی نازانێت بۆچی ئەوەندە لە گۆڕانی ماڵ دەترسێت و هەست بە پیریی دەکات..!! هەرچەند دڵی خۆشبێت و لای ئەم و ئەو خۆی بنوێنێت، گوایە بێجگە لە «فەریال» خوشک و برایەکی تریشی هەن و بە سکێ لە دایک بوون، بەڵام کاتێ بیری بکەوێتەوە شتەکان وەکوو خۆیان نەماون و بە شێوەی تر دەردەکەون، ئەوا تەواو زەندەقی دەچێت و ڕقی لەو شتانە هەڵدەستێت، کە خۆشیدەوێن و ناتوانێت دەستبەرداریان بێت.. لە ڕێگای ماڵەوە هەر ئەوەندە «ریهام» دەمی هەڵهێنایەوە و پێی وت:

ـ نازانم تۆ، کە ئەوەندەت خۆشدەوێن و ئاوا دڵت پێیان خۆشە، بۆچی پشتیان تێدەکەیت..؟!

ئەم هەموو گیانی کەوتە لەرزین و خەریکبوو بە دەما بکەوێت.. هەرچۆنێ بوو خۆی دابینکرد و بە تووڕەیی و بێشەرمانە پێی وت:

ـ تۆ ڕێگا پیشانی من نادەیت.. تێگەیشتیت..؟! لای مامی خۆمم و نەچووم بۆ لای بێگانە.. ئەگەر لەمەودوا منت لە ماڵی خۆتان بینی بە تاکەنەعل و مێشکوژ دەرمکە ڕۆحی شیرینم.

ئەو حەپەسا و پێی وت:

ـ ئەوە تۆ چییت بەسەرهاتووە نەوالەکەی دڵم..؟! من..... ئاخر من...... تووخوا من.....

بۆی تەواو نەکرا و لەسەر ئەو شەقامە گشتییە لە پرمەی گریانی دا.. ئەم تەریقبووەوە و بە دەستی چەپی دەستی ڕاستی گرت.. توند توند گوشی و پێی وت:

ـ ئێستا دەتوانم بە ڕاستیی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە خوشکە ڕۆحەکەم.. من ناتوانم ئێوە بەجێبهێڵم.. من لە دووری ئێوە........

لەو بەکوڵتر دەستی پێکرد و هەر زوو زوو دەیوت:

ـ ئێوە بە خۆشەویستیی من دەکوژن..!! لەبەر خۆشەویستیی ئێوەیە من سەر لە خۆم و لە دایک باوک و خوشک و برام دەرناکەم..!! لە داخی خۆشەویستیی ئێوەیە من سەرهەڵدەگرم و دەڕۆم..!!

ـ وام پێمەڵێ.. وام پێمەڵێ.. تووخوا وام پێمەڵێ.

«ریهام» کاتێ دەگریا و فرمێسکی دەڕشت، وەکوو منداڵێکی زۆر بەناز دەدوا و تا دەرەنگیش ژیرنەدەبووەوە.. ئەم هەستی دەکرد هەموو قسەکانی منداڵیی خۆبن و ڕێک لەسەر هەمان ڕێتمیش دەیانڵێتەوە.. ئیتر ڕقی لێی هەڵدەستا و بۆی بلوایە سەری لە جەستەی جیادەکردەوە.. دەستی بەردا و بە نارەزاییەوە پێی وت:

ـ دەبەس بگری، ئابڕوومان چوو..!! هەرچی خەڵک هەن لەم ناوە، سەیری ئێمە دەکەن و پێمان پێدەکەنن..!!

ماوەیەک دوای ئەوە دەبووایە لەگەڵ تیپەکەیان بچن بۆ «بەسرا» و لە ئاهەنگەکانی «حەفتەی سەرکەوتن»دا بەشداریی بکەن.. ئەم کاتێ جلە ڕەشەکانی دەخستە ناو جانتا سپیەکەی و خۆی ئامادە دەکرد، لەپڕ پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی ڕاشەقاند و پێی وت:

ـ گوێبگرە ریهام..!! بە هیچ شێوەیەک نامەوێت لەم سەفەرە بە گریان سەرودڵم بگریت..!!

ئەو تەریقبووەوە و سەری خۆی لەبەر نا.. بەڵام ئەم هێشتا وازی لێنەهێنا و

پێی وت:

ـ جا خۆزگە گریانەکەشت........!!

کەچی خۆی هەرکە شەمەندەفەرەکە جوولا و کەوتنە ڕێ، دەستی پێکرد و بە هیچ کلۆجێ بۆیان ژێرنەدەبووەوە.. هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا، نەیدەتوانی ئۆقرە بگرێت و دیمەنی «جابر»ی برای لە بیر خۆی بەرێتەوە، کە لە جامەکەوە سەیری دەکرد و بۆی دەگریا.. دایکی لە دواوە کردبوویە باوەشییەوە و توند توند گرتبووی.. «فەریال» و «هالە»ش لەملا و لەولایەوە وەستابوون و دەستیان بە چاویانەوە گرتبوو.. هەر کەمێ پێشتر بەو عەرەبییە تێکشکاوەی خۆی ئەمان و هەموو خەڵکی ناو ئەو ئێستگەی شەمەندەفەرەی هێنابووە پێکەنین و بە هەڵسوکەوتە سەیر و سەمەرەکانی تەواو سەرسامی کردبوون.. بە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی مەلاشووی لای ڕاستی لەناوەوە ڕادەکێشا و ڕێک وەکوو خۆی لاسایی دەنگی مەکینە و گزۆزی شەمەندەفەرەکانی دەکردەوە.. چۆن بەڕێدەکەون و چۆن دەوەستن.. دایکی هەر زوو زوو بە خۆنواندنێکەوە لێی تووڕەدەبوو و پێی دەوت:

ـ کورە قوڕگت دێتەوە یەک و بۆم نەخۆشدەکەویت..!!

ئینجا ڕوویدەکردە ئەولاوە و بە درۆ ئاخی هەڵدەکێشا.. سەری بادەدا و لەبەر خۆیەوە دەیوت:

ـ ئەی خوایە گیان من چی لەم کوڕەم بکەم..!! کەی بۆم ئاقڵ دەبێت..!! کەی..!!

جار جار دەمی دەخستە سەر ڕوومەتەکانی «نەوال» و بە ماچ دەنگی کووکووختیی دەردەکرد.. ئەم بە مەکرێکەوە خۆی دووردەخستەوە و بە شێوەیەکی زۆر خۆش پێی دەوت:

ـ بەسە هەتیوە شێتە، وازم لێبێنە..!!

پەلەی بوو ئەو چەند ڕۆژە تێپەڕن و بگەڕێتەوە.. ئەو شەوە هەرچەند لەسەر دۆشەگی ڕەشی قەرەوێڵە سپییەکەی ئەو ئوتێلە پاڵدەکەوت و بیری لێدەکردەوە، ترسێکی ناکاو و سەیر، کە نەیدەزانی لە کوێوە دێت و بۆچی دێت، وەکوو

کەروێشکی سپیی کێوی، ئازا ئازا بنکی دڵی هەڵدەکۆڵی و پەیتا پەیتا بە قاچ وردەخۆڵی ڕەشی کەمێ شێدار و زۆر نەرمی فڕێدەدا.. جار جار گڵمت گڵمتی بچووک بچووک دەکەوتنە سەر زمانی و هەستی بە تاڵ و تفتییان دەکرد.. قوڕگی دەگیرا و هێڵنجی دەدا.. سەری هەڵدەبڕی و هەرچۆنێ بوو دەیوت:

ـ ریهامەکەی ڕۆحم فریامکەوە، بە خۆڵی هەڵکەنراوی ناو دڵم خنکام..!! لەگەڵ تۆمە ڕەهامە گیان زمانم بووە بە........

ئەو چووبووە خەوی قووڵەوە و زۆر زەحمەتبوو ئاوا بە ئەسانی بێداربێتەوە.. ناچار هەڵدەستایەوە و لەمسەری ژوورەکەوە بۆ ئەوسەری دەچوو.. دەچوو و دەهاتەوە.. دەچوو و دەهاتەوە.. دەستەکانی توند توند دەگرت بە سنگیەوە و بەدەم گریانەوە بەسۆز بەسۆز گۆرانیی دەوت:

حرگت الروح لما فارگتهم

بچيت ومن دموعي غرگتهم

هەرچەند پەردە سپییەکەشی لەسەر ڕووی پەنجەرەکە لادەدا و سەیری ئاسمانی ڕەشی دەکرد، مانگ وەکوو دەسکێشی سووری یاریی بۆکسێن و ئەستێرەکان لە شێوەی لووتەوانەی زیویی دەهاتنە بەر چاوی و خەیاڵیان پەرش و بڵاو دەکردەوە.. هاوکات دەنگی «جابر» و شەمەندەفەرەکان تێکەڵ بە یەکتر دەبوون لەناو سەریا «رغام.. رغام.. رغام.. رغام»«٢٧» دەزرینگانەوە.. پەردەکەی دادەدایەوە و دەیوت:

ـ ئەی تاقە برا ڕۆحەکەم، کەی دەتوانم خۆشمبوێیت..؟! ئەی کوڕە ئێسکسووکەکەی ناو ماڵی پڕ لە نهێنیی شاراوەم، من دەستەوستانم لە ئاستی خۆشەویستیی تۆ..!! کورە من وا لە دووری تۆ شێتدەبم و بە گڕی ناو دڵم دەسووتێم، کەچی ناشتوانم خۆشمبوێیت..!! ئاخ تاقە جابری شارە وێرانەکەم......

ئەو شەوە تا بەیانی هەر ئەمە حاڵی بوو و خەو نەچووە چاویەوە.. ئێوارە لەسەر چوارەم پلەی پێپلیکانەی شانۆ کەمێ بەرزەکەدا سەری خولایەوە و بە پشتا کەوت.. کاتێ لە نەخۆشخانەی «شۆڕشی سوور»دا بە ئاگاهاتەوە و بەملا و بەولای خۆیدا ڕوانی، «ریهام» لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو و بە دەنگێکی خەمناک

پێی وت:

- زۆر بە داخەوە دڵەکەم، تۆ نەتتوانی لە ئاهەنگی ئەمڕۆدا بەشداریی بکەیت..!!

بەڵام لە هی ڕۆژانی تریشدا هەر بۆی نەکرا و تا دەهات تەندروستیی خراپتر دەبوو.. «جەمال ڕەقیب»ی سەرۆکی تیپەکەیان زوو زوو سەری لێ دەدا و بە قورگی پڕ لە گریانەوە پێی دەوت:

- هێز بێنەرە بەر خۆت نەوال گیان، تۆ بۆ گۆرانیوتن هاتوویت، نەک بۆ ڕشانەوە چاوەکەم.

هەر ئەویش بەبێ ئاگایی ئەم ناردبووی بە شوێن دایکیا و پێی وتبوو لە گیانەڵایە.. کاتێکی زانی بە لەخۆدان و قژڕنینەوە لەسەر سەری وەستابوو و لە خەو ڕایپەڕاند.. «جابر» دەستەکانی بە چاویەوە گرتبوو و دەگریا.. سەرەتا وایزانی خەونە و باوەڕی نەدەکرد ئەوان بن، بەڵام کە دایکی دەستی چەپی خستە سەر ناوچەوانیەوە و لێی پرسی:

- ئەوە چییت بەسەرهاتووە نەوال..؟! کوێت ئازاری هەیە..؟! ڕۆحی سوعاد بە قوربانت بێت..!!

ئینجا هەستی کرد بە ڕاستیی خۆبانن و دڵی داچڵەکی.. هەرچۆنێ بوو زمانی خستەکار و بە ترسەوە پرسی:

- کوا مامە سیامەندم..؟! مردووە..؟! بە چی مرد..؟! نەخۆش بوو، یان کوشتیان..؟! کێ کوشتی..؟!

هەرکە ئەو سەری بادا و بە نارەزاییەوە پێی وت:

- تۆ هەقی ئەوت چییە..؟! بە قوربانت بم.. تۆ خۆت وا نەخۆشیت و ئێمە هەموو لە حەژمەتی........

ئیتر بۆی دەرکەوت مردووە و دەیانەوێت لەمی بشارنەوە.. ئەوسا لە هەموو کەسێ زیاتر ڕقی لە براکەی دەبووەوە و بە دەستی بووایە سەری هەڵدەکێشا.. چونکە لەبەر ئەو نەیتوانی پێش بەرێکەوتنی شەمەندەفەرەکە توند توند دەستەکانی لە ملی بئاڵێنێت و تێر تێر ماچی ناودەم و لامل و ڕوومەتەکانی

بکات.. تەنانەت نەیتوانی تا تەواو دووردەکەوێتەوە و لە چاو وندەبێت، دەستی چەپ و ڕاستی لە جامەکە دەربهێنێت و بایبای بۆ بکات.. هەرچەندیش دایکی سەیری چاوەکانی دەکرد و پێی دەوت:

ـ ئا ئەوە برای خۆتت لایە و هەموو پیاوی دنیا دەهێنێت.. بە سائەقەی بم تا گەیشتووین بۆت گریاوە..!!

ئەم ئەوەندەی تر گومانی لە مردنەکەی نەدەما و زیاتر دەشڵەژا.. ئێوارەش کاتێ لەگەڵ «ریهام»دا چەند جارێ تەلەفۆنیان بۆ ماڵ و بۆ ستۆدیۆکەی کرد و لە هیچیان وەڵام نەبوو، بە جارێ تەمای لێ دانا و کەروێشکەکە کەوتەوە هەڵکۆڵینی خۆڵی ناو دڵی.. خۆیشی نەیدەزانی بۆچی ئەو دوو ژنە ڕەشپۆشەی بیردەکەوتەوە و سیمایانی دەهاتە بەر چاو، کە دوانە بوون و کتومت لە یەکتر دەچوون.. لەسەر شەقامەکانی «بەغا»دا دەڕۆیشتن و دەستەکانیان پاندەکردەوە.. بەردەوام سەریان دەلەقاندەوە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر و سەرنجڕاکێش دەیانوت:

ـ کێ ڕۆحێکی زیادی پێیە..؟!

ئەم زۆر جار لە ماڵ و لە قوتابخانەدا لاساییدەکردنەوە و هەموویانی دەهێنایە پێکەنین.. ئەو جارە بۆ «شاسوار»ی کرد و ئەو تەواو سەری سوڕما.. کردیە باوەشیەوە و پێی وت:

ـ ئێمە هەموومان ڕۆحێکی زیادمان پێیە نەونەو، بەڵام ناوێرین بیبەخشین.

ـ یانی دوو ڕۆحمان هەیە..؟!

ـ نەء، هەر یەکێ.

ـ ئەی بۆچی ئاوا دەڵێیت..؟!

ـ ئاخر ئەمەیە زیادەکە.

ـ من ئیتر لە داخی تۆ لاساییان ناکەمەوە.

بەڵام ئەو ڕۆژە لەناو ئەو نەخۆشخانەیەدا خاو خاو دەڕۆیشت و بێزەوق بێزەوق لاسایی دەکردنەوە:

ـ کێ ڕۆحێکی زیادی پێیە..؟!

«ریهام» دەستی ڕاستی دەخستە سەر دەمی و پێی دەوت:

ـ کچێ هیچوپووچ ئابڕوومان چوو..!!

هەموو دکتۆر و سیستەر و برینپێچ و نەخۆشەکان ناسیان و پێی پێدەکەنین.. دایکی لێیان تووڕەدەبوو و جنێوی پێ دەدان.. هەر زوو زووش قژی خۆی دەڕنیەوە و بەمی دەوت:

ـ دەڕۆم و وەکوو شێت لەم شارە بەجێتدەهێڵم.

کە ئەم هەر وازی نەهێنا و زیاتر دەنگی لێ هەڵبڕی، ئەو بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیری چاوەکانی کرد و پێی وت:

ـ کاتێ چوویتەوە بۆ ئامۆژنتی باسکە، چۆن خۆتت شێتکردووە و لەو خەستەخانەیە.......!!

ئەم حەپەسا و بە دەموپلێکی تێکئالاوەوە لێی پرسی:

ـ ئامۆژنم..؟! بۆ ئامۆژنمی باسکەم..؟! ئەوە تۆ دەڵێی چی..؟!

ئەو سەرێکی بادا و پێکەنینێکی پڕمانای بۆکرد.. ئەم لە پێشا وایدەزانی دەیەوێت بیتاسێنێت و لەوە زیاتر ئابڕوویان نەبات، بۆیە زۆر گوێی نەدایە و خۆی دابینکردەوە، بەڵام کاتێ ئەو بە دەستی ڕاستی قژی ڕێکخستەوە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ بۆق چەند سەیرە، لە وشکایی و لەناو ئاودا دەژی، کەچی هەر لەناو ئاودا گەرا دادەنێت و.......!!

ئیتر هەستی کرد شتێ لە ئارادایە و ئەم لێی تێناگات.. هەرچەند سەری دەکردە سەری و پێی دەوت:

ـ ڕێک و ڕەوان پێم بڵێ مامە سیامەندم چی بەسەرهاتووە..؟!

ئەو خۆی لێ گێلدەکرد و ئاوا وەڵامی دەدایەوە:

ـ تا منیش لەوێ بووم هیچی بەسەرنەهاتبوو، ئینجا مەگەر دوای من........!!

ئەم دایکی خۆی زۆر چاک دەناسی و دەیزانی هەر کاتێ قسەکانی لە شێوەی مەتەڵ دەربڕێت، هەرگیز ئاشکرای ناکات و تەواو دیق بە بنیادەم دەکات.. بۆیە وازی لەو هێنا و چووە بنکڵێشەی «جابر»ـەوە.. زۆر لێی پاڕایەوە و بە سائەقە و

بەقوربانی بوو، بەشکوو تێیبگەیەنێت و لەو دڵەڕاوکێیە دەربازیکات، بەڵام ئەو سەرشێتانە لە ژێر گڵۆپی باریکی سپیی ئاسۆیی لای سەرووی ناو ئەو فارگۆنە ڕەشە لاکێشەییەی نووستندا دەستەکانی لە هەوادا دەجووڵاند و زۆر داماوانە پێی دەوت:

ـ سدگنی انی کلشی ما یعرف. (بڕوابکە ئەمن هیچ نازانی).

ـ انی مو أختک..؟! أنت متحبنی..؟! (من خوشکت نییم..؟! تۆ خۆشتناوێم..؟!)

ـ انی أعب انت.. بس سدگنی انی کلشی ما یعرف. (ئەمن دەمەوێ خۆش ئەتوو.. بەران بڕوابکە ئەمن هیچ نازانی.)

دواجار چەمۆڵەیەکی لێنا و بە بێزاریەوە پێی وت:

ـ أدری أنت تعبنی و تتعبنی همینه، بس انی ما احبک. (دەزانم دەتخۆشوێم و ماندووشم دەکەیت، بەڵام من خۆشمناوێیت.)

ـ لیش نوال..؟! لیش..؟! انی ختیه.. انی اخو انت. (لۆ نەوال..؟! لۆ..؟! ئەمن گوناعم.. ئەمن برای ئەتوو.)

ـ أنت بلوه.. بلوه..!! تعرف أنت شلون بلوه..؟! (تۆ بەڵایت.. بەڵا..!! دەزانی چۆن بەڵایەکیت..؟!)

ئەو دەمی لە گوێچکەی چەپی نزیککردەوە و پێی وت:

ـ ای انی أرید أبول، بس أستعی..!! (ئا، ئەمن دەمەوێ میزبکەم، بەران شەرمێدەکەم.)

ئەم قاقایەکی بەرزی لێ دا و لەگەڵیا دایکی لە خەو بێدارکردەوە.. ئەو خۆی خستە سەر لای چەپی و بە نارەزاییەوە وتی:

ـ ئۆف نەوال..!! کەس لێت تێناگات..!! دەمێ پێکەنین و دەمێ گریان..!!

بە دەستی چەپی دەستی ڕاستی براکەی گرت و وەکوو منداڵ بردی بۆ لای ئاودەستەکە.. دەرگا سپیەکەی بۆ کردەوە و پێی وت:

ـ دە بڕۆ ژوورەوە دەی..!! لەسەر چی وەستاویت..؟!

ـ ناوێرم..!! تۆش لەگەڵما وەرە.. وەکوو دایکە....

بە پێشی کەوت و بە پێکەنینەوە لێی پرسی:

ـ دەزانی بە کامەیان دەیکەیت.. ؟!

ئەو دەیزانی گاڵتەی پێدەکات و هیچ تووڕەش نەبوو.. قاچەکانی بەملا و بەولادا بڵاوکردەوە و بە دەستی ڕاستی زنجیری ڕەشی پانتۆڵە هێڵدارەکەی هێنایە خوارێ.. بە هی چەپی شەبزووزەکەی دەرهێنا و سەرەکەی پیشان دا.. سەیری چاوەکانی کرد و بە پێکەنینێکی زۆر خۆشەوە پێی وت:

ـ جار جار بەمە دەیکەم.

ئەم بە گاڵتە زللەیەکی لە پشتملی دا و لێی خوڕی:

ـ میزەکەت بکە قۆنەرە..!! تمەز بۆ ئەم بەزمەیەتی دەڵێ شەرم دەکەم..!! ئای..!! ئای..!! دڵیشم بەوە خۆشە برام هەیە..!!

ئینجا سەیرێکی چاوەکانی کرد و لێی پرسی:

ـ ئەم قسانە لەگەڵ دایکەشا دەکەیت.. ؟!

ـ نا، هەر لەگەڵ تۆ، چونکە دەزانم ئەو پێیناخۆشە، ئەگەر.......

ئەم کاتێ دەرگاکەی بۆ کردەوە و جارێکی تریش بە پێش خۆی دا، دەستی چەپی خستە سەر شانی ڕاستی و لێی پرسی:

ـ ئەی چۆن دەتزانی من پێم ناخۆش نییە.. ؟!

دوو کوڕی هەرزەکاری سیماشەڕانی لەبەر دەرگا بۆیان وەستابوون و بە جارێ پەلاماریان دان.. قژلوولەکەیان ئەم دەست و ئەو دەستی «نەوال»ی گرت و پێی وت:

ـ دەبێت لەگەڵ ئێمەش بێیت، ئەگینا ئێستا بە پۆلیسی........

ـ وەلبن لەبەر چاوم.. ئەمە برامە.

ئەو توندتر دەستەکانی گوشی و پێی وت:

ـ من ڕەعدی کوڕی جەعفەر میقلاعم و هەموو بەسرا ناوبانگی منیان بیستووە.. دایکە قەحپەکەم کاتێ سکی بە منەوە هەبووە، بێزووی بە لیکی سەگی ڕەشی بەردتاشێکی سپیپۆش کردووە.. ئەوەندە گەمژە نییم، باوەڕبکەم ئێوە خوشک و برابن.. ئەگەر براتە بۆچی نازانێت بە عەرەبی......؟!

لەولاشەوە دەمزلەکەی هاوڕێی، پشتی براکەی نووساندبوو بە دەرگای سپیی

ئاودەستەکەوە و بێبەزەییانە کەوتبووە وێزەی.. لەوە دڵنیابوو ئێستا نا ساتێکی تر گیانی لە ژێر پێلەقەی ئەودا وەکوو قالۆنچە دەپلیشێتەوە و دایکیشی خەتاکەی دەخاتە ئەستۆی ئەمەوە، کەچی کاتێکی زانی ئەو خۆی لە ژێر دەستیا هێنایە دەرێ و بە فێڵێکی زۆر سەیر خستی بە پشتدا.. کوڕە هاواری لێ بەرزبووەوە و وەکوو مەڕی سەربڕاو قاچەکانی دەکوتا.. خۆیشی زۆر بە هێز دەستی ڕاستی ڕاکێشایەوە و تا تینی تیابوو کێشای بە گونی ئەویتردا.. بەجێیانهێشتن و چوونەوە شوێنی خۆیان.. ئەم هەستی دەکرد دەستی ڕاستی هۆ هۆ دەلەرزێت و وردە وردە تینی تیادا نامێنێت.. لەگەڵیا بەزەیی بەو کوڕەدا دەهاتەوە و زرووکە کچانیەکەی لە گوێچکەیدا دەزرنگایەوە.. خۆیشی نەیزانی چۆن ئەو شوێنەی بە خەیاڵدا هات و ئاوا بێبەزەییانە تێیسرەواند.. سەیری «جابر»ی دەکرد و فرمێسک بە چاوەکانیدا دەهاتەخوارەوە، کە وەکوو پشیلەکێوی لەسەر جێگاکەی پاڵکەوتبوو و ڕووی کردبووە ئەولاوە.. دایکی سەری هەڵبڕی و بە دەنگی نووساوی پێی وت:

ـ چەرچەفەکە بدە بەسەر پشتی براکەتا با سەرمای نەبێت.

ئینجا سەری خستەوە سەر سەرینەکەی و وتی:

ـ هەوای بیابان بە شەو ساردە..!!

ئەمە ئەو ڕستەیە بوو، کە «ست سوعاد» هەمیشە لە کاتی وانەوتنەوەدا بە هەق و ناهەق دەیوتەوە و کچان لە ژێرەوە پێی پێدەکەنین.. «نەوال» هەموو جارێ تەریقدەبووەوە و سەری دادەخست.. دەشیزانی ئەو لەزەتێکی زۆر سەیر لە وتنەوەیدا دەبینێت و بێجگە لەم کەسی تر هەستی پێناکات.. هەموو جارێکیش نیوەشەوی زستانیساڵێکی زووی بیردەکەوتەوە و ئاگای لە تەختەڕەشەکە نەدەما.. ئەوسا لەگەڵ دەنگەکە بە ئاگاهاتەوە و چاوەکانی لە ناو تاریکایی ژووری نووستنەکەدا کردەوە.. ئیسپرینگی ڕەشی تەختە سپیەکەی نووستن لە ژێر جەستەی نادیار و جووتبووی ئەو و باوکیدا زەلالەتی بوو.. ئەم تەنها دەیتوانی گوێ لە دەنگەکە بگرێت و بە گازی تیژ و قایم بکەوێتە وێزەی چمکی لێفە ڕەشە گوڵگوڵیەکەی خۆیەوە:

ـ هەوای بیابان بەشەو ساردە..!!

کاتێکیش ئەو هەستا و دەرگاکەی کردەوە، گیانی ڕووتی لە ژێر ڕۆشنایی گڵۆپی کەمێ کزی ڕاڕەوەکەدا لە شێوەی سەماوەرێکی ئێجگار زلدا دەرکەوت و ئەم ژوورەکەی لێبوو بە ئەشکەوتی تاریکی ڕۆژپەرستەکان.. ئەو ئەشکەوتانەی هەر جارێ لە سەربانی ماڵی «شاناز»دا سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیایە و بە دوو قەوانی فیشەکی ڕەش پێڵووەکانی دابخستایە، دەیبینین و گوێی لە ناڵەناڵ و ئاخ و ئۆفی ناویان دەبوو.. دایخستەوە و چوو بۆ ئاودەستەکە.. دەڕۆیشت و دەیوت:

ـ هەوای بیابان بە شەو ساردە..!!

ئەم هەرچۆنێ بوو هەستا و خۆی هەڵدایە سەر تەختی نووستنەکەیانەوە.. باوکی دەستی چەپی خستە ژێر سەریەوە و خەمناکانە پێی وت:

ـ دایکت چووە میز بکات.. کاتێ هاتەوە و لێی پرسیت: کەی خەبەرت بۆتەوە..؟! پێی بڵێ لەگەڵ دەنگی دەرگاکە.

ـ بۆچی ئاوای پێ بڵێم..؟!

ـ بۆئەوەی تووڕەنەبێت.

ـ بۆچی تووڕەدەبێت..؟!

ـ چونکە حەزناکات لە من زیاتر کەسی تر گوێی لێبێت، کاتێ دەڵێت: هەوای بیابان.....!!

ـ جا ئەم قسەیە یانی چی..؟!

ـ نازانم.

ـ دەزانیت، بەڵام ناتەوێت بە منی بڵێیت.

ـ باوەڕبکە نازانم کچە ڕۆحەکەم.. باوەڕبکە نازانم.

هەستی دەکرد باوکی وەکوو کەسێکی گەورە قسەی لەگەڵدا دەکات و بەردەوامیش هەناسەی قووڵ هەڵدەکێشێت.. دایکی کاتێ هاتەوە و گڵۆپەکەی داگیرساند، بینی و پێی وت:

ـ تۆ لەمەودوا لای خوشکەکەت دەنوویت..!!

جلەکانی لەبەرکرد و هات لە پشتیەوە پاڵکەوت.. دەستی چەپی، کە تەزیبوو و دەمارەکانی لە جووڵەکەوتبوون، خستیە سەر ڕوومەتی چەپی ئەم و پێی وت:

ـ ئەم ژوورە شێی هەیە، بە کەڵکی خەو نایەت ڕۆحەکەی دایە.

ئەم تەزووی پیاداهات و ویستی پێی بڵێ لایبەرێت، بەڵام هەستی کرد بۆنی ئەو دارە درێژ و سپیانەی لێدێت و پەشیمان بووەوە، کە ڕۆژی لەسێدارەدانی بیستوچوار قەشەکە، شەمەندەفەرە ڕەشەکەی بار لە شوێنێکی ئێجگار دوورەوە هێنایەنی و ئەم و «ویجدان» و «نیران»ی دراوسێی ماڵی باپیری، لە قەراغی هێڵەکەوە بینیان.. بنکیان بە سوورێکی تۆخ تۆخ بۆیەکرابوون و لەبەر تیشکی ڕۆژی کەمێ بەهێزی نیوەڕۆی ئەو بەهارەدا دەبریسکانەوە:

ـ دەزانن ئەم دارانە بۆنی «کوپلی»یان لێدێت.. ؟!«٢٨»

ئەوان هیچیان نەوت و ڕوویان لە شەمەندەفەرەکە وەرنەگێرا، کە تەواو دوورکەوتبووەوە و ئەم وەکوو قەرەوێڵەی خەستەخانەی دەهاتە بەر چاو.. هەر خێرا هەستی کرد بە هەڵەداچووەوە و دووبارەی نەکردەوە.. چاکتر بۆنەکەی هەڵمژی و قوولتر بیریکردەوە.. دواجار دۆزیەوە و زانی هی ئەو دەرمانە ڕەشەیە، کە ژنە تورکمانە ئێجگار زلەکەی لووتی لە شەبزووزی سووری مراویی نێر دەچوو و بە شەنتووزی ژنانی دەوت چاوی زۆپا، لەناو سەتڵێکی سپیی کەمێ گەورەی ژوورە بچووکەکەی لای دواوەی حەمامی «شقائق»«٢٩»ی «بابلشێخ»دا دەیفرۆشت و ژنان بۆ لابردنی تووکی نەرمی جەستەی ڕووتیان بەکاریاندەهێنا.. ئامۆژنی هەمیشە بە تورکی قسەی لەگەڵدا دەکرد و بە جووتە لە قاقای پێکەنینیان دەدا.. ئەم هەموو جارێ تووڕەدەبوو و دەیپرسی:

ـ ئەوە ئامۆژن ئێوە باسی چی دەکەن.. ؟!

ـ قسەی خۆمانە و تۆ لێی تێناگەیت.

ـ پێم بڵێ، ئەگینا خۆم ناشۆم ها..!!

ـ ئەگەر بزانم مردوویت و پێی چاکدەبیتەوە، پێت ناڵێم.

ئەو ئێوارەیەی «ئەدیب» لەسەربانەکەی لای پێشەوەی خۆیاندا بە کراسێکی سپیی گوڵگوڵی هەڵەوگێڕاوەوە مشارێکی ڕەشی بچکۆلەی باریکی کردبوو بە سەری پەتێکی سپیەوە و بایدەدا.. بایدەدا و دەنگێکی سەیری وەکوو چزەچزی بەزی تکاوی سەر خەڵووزی گەشی ناو مەقەڵیی لێ بەرزدەبووەوە.. لێی

بەرزدەبووەوە و جار جاریش دەگۆڕا.. دەگۆڕا و لە گوێچکەی ئەمدا «تمريط.. تمريط.. تمريط.. تمريط»«٣٠» دەزرینگایەوە؛ ئەو ژنە قەڵەوەی بینی خۆی کرد بە ژوورا و لەگەڵ ئامۆژنی دەرگایان بە سەر خۆیاندا داخست.. ئەم سەرەتا زۆر گوێی نەدایە و چاوی لە «ئەدیب» نەترووکاند، کە بەردەوام بایەدا و لەگەڵیا دەیوت:

ـ ئەستێرەکان شوێنپێی بەجێماوی ئەو ڕاهیبە ڕووتانەن، کە پیاوە تووکنە ڕەشپۆشەکان مەمکیان لە شیشدان و کردیانن بە دەمی سوارە سپیپۆشە قەبزەکانەوە.

ئەوسا «بەدریە» لەودیو خەریکی سەروپێلێنان بوو و بۆنەکەی دەچوو بە قووڵایی لووتی ئەمدا، هاواری دەکرد و دەیوت:

ـ کورە جوانەمەرگ ئەم قسە بێسەروبەرانەت لە کوێ هێناوە..؟!

ئەم وردە وردە هەستی بە برسێتیی دەکرد و ناودەمی دەبوو بە ئاودڕکەی لیکێکی خەست.. لەپڕ ڕووی وەرگێڕا و بەرەو ژوورەوە چوو.. بە دەستی ڕاستی دەسکی دەرگاکەی گرت و بە هێز ڕایکێشا.. بە مست تێیکەوت و بە دەنگێکی قایم وتی:

ـ ئامۆژن بیکەرەوە.

نەیکردەوە و ئەم زیاتر تووڕەبوو:

ـ بیکەرەوە قەحپە، خەریکە لە برسا دەمرم.. لەگەڵ تۆمە شازە گاندەر بیکەرەوە.

هەرچەندیش گوێی هەڵدەخست و قسە تورکیەکانیانی دەبیست، شێت و هارتر دەبوو و زیاتر هەستی بە برسیەتیی دەکرد.. بەر چاوی تاریکدادەهات و سیمای شتەکانی بە جارێ لێدەگۆڕا.. هەر ئەوەندەش لە کونی کێلۆنەکەوە سەیری ناو ژوورەوەی کرد و بە ڕووتیی بینینی، قێزی لێکردنەوە و دڵی تێکهەڵات.. سەری گێژی خوارد و هێڵنجی هاتێ.. بە پێوە وەستابوون و باوەشیان کردبوو بە یەکا.. ئەو «شازە»ی فێردەکرد و ڕایدەهێنا، چۆن دەستەکانی لەملاو لەولاوە بە ژێر باڵەکانی «سیامەند»دا درێژبکات و لەپڕ و زۆر بە هێز قوڕگی بگرێت.. بەوەدا دەیزانی ئەو مەبەستەیان هەیە و دوورنییە ئەمشەویش جێبەجێی بکەن، کە هەر

جاریّ «شازه» بە پشتا دەکەوت و چاوەکانی لێکدەنا، ئەو دەستی ڕاستی بەرزدەکردەوە و دەیوت:

ـ سیامەند دوشتە........«٣١»

هەرچۆنێ بوو بە سستی دەمی هەڵهێنایەوە و وتی:

ـ دەزانم دەتەوێت مامە سیامەندم بکوژیت.

ئەوسا دەنگەکەی «بەدریە» بەحاڵ دەهاتە گوێی و دەیوت:

ـ کورە وازبێنە، ئەگینا دێم ڕووتتدەکەمەوە و هەموو گیانت داخدەکەم.

هەر ئەویش جارێکیان لە مووبەقەکەی خۆیاندا بە «شازە»ی وتبوو: پیاوان بە ڕووتیی لە ئاستی ژناندا هێزی کەرویشکێکی ماڵییان تیادا نامێنێت و ئەم لەسەر قادرمەکە گوێی لێبووبوو، بۆیە گومانی لەوەدا نەما و تەواو چووە ئەقڵیەوە، کە مامی ژیانی لە مەترسیدایە و تازە دەربازبوونی مەحاڵە.. کاتێکیش لە ژووری نووستنەکەدا بە ئاگاهاتەوە و ئامۆژنی بەدیار سەریەوە بینی، بە نینۆکەکانی هەر دوو دەستی کەوتە چڕنووکگرتن لە ڕانەکانی و پێی وت:

ـ کوا مامە سیامەندم..؟! کوشتت..؟!

مامی لە پەنجەرەکەوە خۆی پیشان دا و پێی وت:

ـ چییتە ئەوە ڕۆحەکەم..؟! ئێستاش هەر ئازارت هەیە..؟!

ـ نەکەی لەگەڵ ئەم قەحپەیە خۆت ڕووتکەیتەوە، چونکە بەتەمایە بتکوژێت..!!

ئەو قاقایەکی بەرزی لێ دا و پێی وت:

ـ قوربانی ئەم قسە خۆشانەت بم نەوالەکەی ڕۆحم..!! نەخۆشیی هەر لە خۆت دێت..!!

ـ پێمەکەنە سەگباب، ئەو ژنە قەڵەوەی لە حەمام دەرمانە بۆنناخۆشەکە دەفرۆشێت، فێریکردووە.........

ئەو هاتە ژوورەوە و لە لای چەپی سەریەوە دانیشت.. ڕوومەتە گەرمەکانی ماچکرد و پێی وت:

ـ من کاتێ دەمرم، تۆ بە خەیاڵتا نایەت و ڕەنگە ئاخێکیشم بۆ هەڵنەکێشیت

ڕۆحەکەی سیامەند..!!

ـ بۆچی من تۆم خۆشناوێت..؟!

ـ نا.. نا.. لەبەرئەوە نا..!!

ـ ئەی لەبەرچی..؟! بۆ ئاوام پێدەڵێیت..؟! بۆ..؟! بۆ..؟!

ئامۆژنی بە دەمیەوە پێکەنی و پێی وت:

ـ گاڵتەت لەگەڵ دەکات چاوەکەم، تۆ بۆچی......؟!

بەڵام گاڵتەی نەدەکرد و دواتریش هەر دەیوتەوە.... ئەو شەوە لەسەر تەختی نووستنی ناو ئەو شەمەندەفەرە لە دایکی و «جابر»ی برای ڕادەما و بیری لە هەموو ئەو جارانە دەکردەوە، کە ئاوای پێ وتبوو و لەگەڵیا زووخاوی دنیای کردبوو بە قوڕگیا.. هەستی دەکرد پێشبینیەکەی ئەو تا ڕادەیەک ڕاستە و ئەم ئەوەندەی شێوەی مردنەکەی لێبووە بە مەراق، ئەوەندە خەم لە خۆی ناخوات و سوێی لێنابێتەوە.. بەڵگەشی ئەوەبوو لەگەڵ براکەی لە ناخی دڵیا پێکەنی و بیری ئەوەی هەر نەمابوو نزیکترین کەسی لە دەست چووە.. کەچی بەرەبەیان کاتێ شەمەندەفەرەکە گەیشتە ئێستگەی «بەغا» و دابەزین، خەیاڵێکی تر هەڵیفڕیواند و بۆی دەرکەوت، ئەم تەنها بۆ بەشە گرنگەکەی منالیی خۆی دەگریت و هەر ئەوەشە ئاوا دڵی هەڵدەقرچێنێت.. ئەو بەشەی، کە ئەویش وەکوو ئەوانی تر زۆر لەپڕ و بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکرا و لەگەڵ خۆبدا بردیە ژێر گڵ و بۆ هەتاهەتایە تیایدا حەشار دا.. حەشاری دا و لە بیر دۆستە هەرە نزیکەکانیشی بردەوە.. ئەوسا دەیتوانی وەکوو شاعیرێکی دەستەپاچە و بێئەزموون، کۆمەڵێ وشەی سواو و لەکەڵکەوتوو بەدوای یەکتردا ڕیزبکات و بڵێت: «ئەی ئەوانەی خۆشمدەوێن و هەرگیز هەرگیز لێتان تێناگەم، هەر کامێکتان دەمرێت و ڕۆحی وەکوو نەخشی ڕەش ڕەش و سپی سپیی سەر مافووری سوور سووری قەد دیواری ماڵە تەلیسماویەکەم کاڵدەبێتەوە، بەشێکی یادگاریی ئەم تەمەنە پڕ لە مەتەڵەی من لەگەڵ خۆتان دەبەن و وردە وردە کۆتاییم پێدەهێنن.. ئێوە لەپڕ و بە جارێ چاوتان ئاوادەبێت و منیش بەش بەش دەمرم»، بەڵام وای نەوت و لەجیاتی ئەوە سەیرێکی چاوە گەورەکانی «جابر»ی برای کرد، کە گلێنەکانی وەکوو پۆپنەی

کەڵەشێری شەڕانی سوورهەڵگەڕابوون و بە شێوەیەکی زۆر سەیر ئەمسەر و ئەوسەریان دەکرد.. قۆڵی چەپی کرد بە قۆڵی ڕاستیا و لەسەر ڕێتمی هەنگاوەکانی ئەو کەوتەڕێ.. دەیویست لەگەڵیان بڕواتەوە و هەموو شتێ لە بیر خۆی بەرێتەوە.. بچێتەوە و هەرچۆنێ بێت خۆی لەگەڵ ترسی گۆڕانی ماڵ و تێکشێوانی سیمای شتەکان ڕابێنێت.. بەڵام دایکیان، کە لە پێشیانەوە سووک سووک دەڕۆیشت و بە دەستی ڕاستی جانتا ڕەشە سادە گەورەکەی هەڵگرتبوو، لەپڕ لای کردەوە و بە قوڕگی پڕ لە گریان و بە چاوی فرمێسک تیا قەتیسماویەوە خەمناک خەمناک پێی وتن:

ـ هەر وایە کچ و کوڕەکەی لای چەپ و ڕاستی ڕۆحی هەڵقرچاوم.. هەر وایە.. خۆشەویستەکانمان هەر دەتوانن بەڕێمان بکەن و فریای پێشوازییمان ناکەون.

ئەم نەیدەزانی ئەوە گیانی خۆی بوو، یان هی براکەی، ئاوا موچڕکی پیادادەهات و وردە وردە لە ناوەوە دادەڕووخا، بەڵام ئەوەندەی دەزانی وا چاوەکانی سووک سووک دەکەونە ڕەشکەوپێشکە و دەرگا سپییە زەبەلاحەکەی ئەو ئێستگەیەی لێدەبێتە مافووری قەد دیواری ژوورە کەمێ تاریک و شێدارەکەی ماڵی «شاناز».. ئەوسا دەیتوانی و زۆریشی بەلاوە ئاسان بوو، هەموو ئەو ڕۆژانە بیری خۆی بخاتەوە و ورد ورد و چۆنی دیبوون، ئاوا پیایاندا بچێتەوە، کە هەر جارێ کەمێ «چیچلاوە»«٣٢»ی سپیی ناو قوتووە ڕەشەکەی «نەنە سۆزرەت»ی بخستایەتە سەر چاوەکانی و بە هەنگەشەلێ لەمسەری ژوورەکەوە بۆ ئەوسەری بچووایە.. بچووایە و بهاتایەتەوە.. بچووایە و بهاتایەتەوە، سیمای مافوورەکەی لێدەگۆڕا و دەیتوانی شاخی بەرزی بە بەفرداپۆشراو و ژن و پیاو و منداڵی سپیپۆشی ناو خانووە چوارگۆشە ڕەشەکانی قەدپاڵیان ببینێت.. بیانبینێت و گوێ لە گۆرانییە زۆر بەسۆز و ئێجگار سەیر و سەمەرەکانیان بگرێت.. گوێیان لێ بگرێت و لەگەڵیان بڵێتەوە، بەڵام بە پێویستی نەدەزانی خەیاڵی داڕووخاوی خۆیانیان تێوە بئاڵێنێت و ئەفەرۆزی دەکردن، چونکە «شاناز» ئیتر ئەو کەسە نەبوو، ئەم بیری لێبکاتەوە و وەکوو قازێکی تەپۆی باڵشکاو، بە تەواوی تەرەی ئەودیوی سنووری بەرزی بە دڕکەزییتەنراوی هەستی بەئاگای ببوو.. خۆ هەر

ئەویش بۆئەوەی بە پرسیاری سەیر و سەمەرە هەراسانی نەکات و سەرودڵی نەگرێت، مافوورەکەی لە دیوار کردەوە و کردی بە سەرین.. دواییش هەڵیوەشاندەوە و لە مووبەقەکەدا دایخست.. نەخشەکانی سەری لە ژێر قاچەکاندا کاڵبوونەوە و وەکوو پارچەکفنێکی سپیی چڵکنی لێهات.... وا دەرگای ئەم ئێستگەیەش لەجیاتی کفن بووە بە ڕەوەیەک زەرافەی زل و قاچەکانی پێشەوەیان بڵاوکردۆتەوە.. ملیان درێژکردووە و دەمیان خستۆتە جۆگەلەکەی بەردەمیان.. ئاو دەخۆنەوە و دەیکەن بە شڵپوهوور.. لە گوێچکەی ئەمدا جارێ بە «أبهمان.. أبهمان.. أبهمان.. أبهمان»«٣٣» و جارێ بە «أربج.. أربج.. أربج.. أربج»«٣٤» و جارێکی تر بە «أجاج.. أجاج.. أجاج.. أجاج»«٣٥» دەنگدەداتەوە و حەزدەکات بچێتە لایانەوە.. دەستکاتە ملیانەوە و بە زمان بیانلسێتەوە.. هەر ئەوەندەش دەمی هەڵهێنایەوە و بە براکەی وت:

ـ جابرەکەی دڵم، لەگەڵم وەرە بۆ لای ئەو زەڕافانە و با کەمێ.......

دایکی هات بە توندی دەستی ڕاستی ڕاتەکاند و پێی وت:

ـ چییتە نەوال..؟! بۆچی ئاوا دەکەیت..؟! بۆچی دەتەوێت کوڕەکەشم وەکوو خۆت لێ شێت بکەیت..؟!

دایکی لە ماڵەوەش، کاتێ سەری «هالە»ی خستبووە سەر ڕانی چەپی و بە پەنجەی باڵابەرزە و دۆشاومژەی دەستی ڕاستی قژە خاوەکەی لوولدەکرد، بە شێوەیەکی زۆر سەیر سەیرێکی ئەمی کرد و پێی وت:

ـ بڕۆ لەودیو کەمێ بنوو، بۆ ئەوەی چییتر سیمای شتەکانت لەبەر چاو نەگۆڕێت و.......

«فەریال» قسەکەی پێ بڕی و وتی:

ـ خەوی چی..؟! ئەوانەی شوێنی خەوتنیان زەوت دەکرێت، دەبێ هەمیشە وای پیشاندەن، کە.....

دایکی هەر خێرا سەری کچەکەی لەسەر ڕانی لابرد و بە پرتاوی بۆی هەستایەوە.. دەستەکانی نایە قژیەوە و بە هێز ڕایکێشا.. سەری کێشا بە دیواری ژووری میواندا و بە «جابر»ی وت:

ـ ئەو ڕاستەیەم بەرێ.

ئەو بە دەستی ڕاستی ڕاستە سپیەکەی لەسەر مێزە ڕەشە لاکێشەییەکە هەڵگرت و خستیە ناو دەستی چەپییەوە، کە ساجێکی ئێجگار لووس و کەمێ پان بوو و ژمارەکانی بە سووری تۆخ تۆخ لەسەر نیشانکرابوون.. کێشای بە مووڕەغەی پشتیا و وەکوو مناڵ بە تاسا چوو.. «هالە» بە ترس و لەرزەوە لێی نزیککەوتەوە و بە هەر دوو دەستی، دەستی چەپی گرت.. خۆی پیادا شۆڕکردەوە و بە گریانەوە پێی وت:

ـ دایکە گیان قوربانی قۆنەرەکانت بم، ئەمجارەش مەیکوژە.

ئەو دەستی بە هێز ڕاکێشایەوە و تا تینی تیابوو ڕاستەیەکی سرەواندە سمتی ئەویشەوە.. هاواری لێ بەرزبووەوە و لەولاتر، ڕێک لە لای قاچەکانی «نەوال»دا بە دەما کەوت.. بەڵام ئەم وا بەو قسەیەی «فەریال» شپرزەبووبوو و دڵی بە شێوەیەک لێی دەدا، نەیدەتوانی بۆی دانەوێتەوە و دەستەکانی بکاتە ملیەوە.. هەستیشی دەکرد دایکی زۆر دڵڕەقانە کەوتۆتە وێزەی ئەو خوشکە گەورەی و لەوەناچێت ئاوا بە ئاسانی دەستی لێ هەڵگرێت.. بە مەبەستی کوشتن لێیدەدات و هاکە زانیت ڕۆحی لە کونی لووتیەوە دەرکرد.. هەرچۆنێ بوو خۆی گەیاندە لای و ڕاستەکەی لێ وەرگرت.. پاڵێکی پێوەنا و لێی دوورخستەوە:

ـ وازم لێبێنە نەوال با بیکوژم.. تۆ لێرەنیت و نازانیت ئەم قەحپەیە ڕۆژانە چیم لێدەکات.. تۆ ئاگات لێنییە و نازانی چۆن ناو جگەری دارزاندووم..!! ئاخر تۆ لێرەنیت و نازانیت....

ئەم گوێی بە دایکی نەدا و بە هەر دوو دەستی بنباڵی چەپی ئەوی گرت.. «هالە»ش هەر بەدەم گریان و زروکوهووڕەوە هەستایەوە و خۆی خستە ژێر باڵەکەی تری.. بردیان بۆ حەمامەکە و ئاوی ساردیان کرد بە دەموچاو و قژیا.. هەرچۆنێ بوو وزەیان هێنایەوە بەر و گەیاندیانە سەر تەختی نووستنەکەی خۆیەوە.. لەوێ «نەوال» ڕووی لە «هالە» کرد و پێی وت:

ـ هەستە بە سائەقە با ئێمە بچینە دەرەوە، بەشکوو بۆ خۆی سەرخەوێ بشکێنێت و ئازاری گیانی دەربچێت.

ئەو ئەوەندەی تر دەنگی گریانی لێ هەڵبڕی و وتی:

ـ من لە لای دادەنیشم و.....

ئەم ڕووی لێگرژکرد و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ هەستە دەی هەستە..!! ڕەزای خۆت گران مەکە..!!

«فەریال» کەمێ سەری بەرزکردەوە و زۆر داماوانە پێی وتن:

ـ نا، تووخوا بەجێممەهێڵن.

ئینجا چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی بڕیە چاوەکانی «نەوال» و زۆر داماوانە پێی وت:

ـ من لە داخی دایکم، یان خۆم دەستووێنم، یان بۆ لایەک سەرهەڵدەگرم.. ئاخر تۆ لێرەنیت و نازانیت چ دەردێکم دەداتێ.. تۆ ئاگات لێنییە و نازانی چ زووخاوێ دەکات بە قوڕگما.. لە هالە بپرسە چاوەکەم، لە هالە بپرسە چۆن بەردەوام بیانووم پێدەگرێت و شەڕم پێدەفرۆشێت.. ناو جگەری خواردووم لەسەر ئەوەی من جارێ نامەوێت منالم ببێت.. باشە من دەتوانم بە منالەوە خوێندن تەواوکەم..؟!

«نەوال» هەستی دەکرد بیرکردنەوە لەو شەڕ و ئاژاوەیەی وا لەم ماڵەدا ڕوودەدات و خەریکە کڵپەی ئاگرەکەی لە کلاوڕۆژنەکانیەوە بێتە دەرێ، چاکترین ڕێگایە بۆئەوەی ماڵەکەی ئەولای بیربچێتەوە و خۆی لە چارەنووسە ترسناکەکەی بدزێتەوە.. بەتایبەتی لەو قسەیەی، کە خوشکەکەی پێی وت و ئەوەندەی تر خوێنی وشککرد.. شێوەی هەموویانی بە داماوی دەهێنایە بەر چاوی و هەوڵی دەدا دەرگای بەزەیی ناو دڵیان لەسەر بخاتە سەرپشت.. بەزەیی پیایاندا بێتەوە و لە ناخی ناخیەوە خۆشیبوێن.. هاوکات شەڕیان پێ بفرۆشێت و ئازاریان بدات.. لە «فەریال»ـەوە دەستی پێکرد و پێی وت:

ـ نەمدەزانی تۆ ئەوەندە هیچوپووچیت و ئاوا لە دایکم هەڵدەگەڕییتەوە.. ئەم سەرەڕای ئەوەی لایەکی ماڵەکەی داویەتیێ و بەخێوت دەکات، قسەی ناشیرینیشی پێ دەڵێیت..؟! هەی گەڕ و گول بیت..!!

«فەریال» وەک بڵێیت باوەڕی نەکردبێت و نەچێتە ئەقڵیەوە، ئەم ئاوا لەپڕ

بگۆڕێت و ئەو جنێوە ناشیرینانەی پێ بدات، بۆیە هەستایەوە و زۆر زەلیلانە، بە شێوەیەک ئەم لە ناوەوە گڕی دەگرت و ئەگەر دانی بە خۆیدا نەگرتایە، فرمێسک لە چاوەکانیدا فوارەی دەکرد، پێی وت:

ـ ئەوە لەگەڵ منتە نەوال.. من........؟!

ـ تۆ شایانی زۆر لەوە خراپتریت قۆنەرەی بەدنمەک.

ـ ئێستا من قسەکەم لەگەڵ تۆ بوو، ئەم بۆچی......؟!

ـ دەمت هەڵنەهێنیتەوە و هیچ شتێکم پێ نەڵێیت.. قەحپەی بەرەڵلا.

دایکیان براکەیانی دەبرد بۆ حەمامەکە و دەستێ بیجامەی ڕەشی هێڵدار و خاولیەکی سپیی گوڵگوڵیی لەسەر ئەم قۆڵ و ئەو قۆڵی دانابوو، گوێی لە قسەکانی بوو و پێی وت:

ـ چییتە ئەوە نەوال..؟! ئەم جنێوانە بۆ دەدەیت..؟!

ئەم سەیرێکی کرد و لە سیمای وردبووەوە.. خەریکبوو وەکوو منداڵەکەی جاران خۆی هەڵداتە باوەشیەوە و قژە ڕەشەکەی بە فرمێسکەکانی ئاوپڕژێن بکات، کەچی واینەکرد و پێی وت:

ـ ئەوا من لەسەر تۆ ئەم کارەی پێدەکەم، بەڵام خۆ تۆش لەو چاکتر نییت.. ئێستا تۆ بۆچی ئەم هەتیوە زۆڵە دەشۆیت..؟! بۆچی خۆی دەستی شکاوە..؟! یان هەر حەزدەکەیت خۆت بنوێنیت..؟!

ئەو جلەکانی بەو ناوەدا بڵاوکردەوە و پەلاماری دا.. دەستی نایە قژیەوە و ملی کەچکرد.. سەری کێشا بە قەراغی مێزە سپیەکەی سووچی ئەوسەری ژوورەکەدا و بە لەقە تێیکەوت.. بەر چاوی لێڵبوو و هێڵی باریک باریکی ئاسۆبی سوور سووری ئارگۆنی دەکەوتنە بەر بینایی.. لە کەڵێنیانەوە تەختی نووستنەکەی «فەریال»ی لە شێوەی دارەمەیت و ئەوانی وەکوو ئامێری چەلۆ دەبینی و حەزی دەکرد دەستیان پێوەبگرێت.. دەستیان پێوەبگرێت یاریی بە ژێکانیان بکات.. لەگەڵیا نهێنییەکانی ناخی ناخییان بۆ بکات بە گۆرانی و بەو ئاوازانەی خۆی حەزیان لێدەکات، حەزیان لێدەکات و پڕاوپڕی ئەم حاڵەتەی ئێستاین، پێیان بچڕێت و حەیران و سەراسیمەیان بکات.. بەڵام ئاخ..!! زمانی

له گۆکەوتبوو و نەک گۆرانی، هاوارێکی کزیشی بۆ نەدەکرا.. سووک سووک هەناسەی تەنگدەبوو و وردە وردە ئاگای لە دەوروپشتی دەبڕا.. کاتێکیش لە ژێر گڵۆپی کەمێ کزی قەد دیوارە زۆر لووسەکە و لەسەر دۆشەگی ئێجگار نەرمی سەر تەختی نووستنەکەی «هالە»ی خوشکی بە ئاگاهاتەوە و چاوەکانی کردەوە، نیوەشەوێکی درەنگبوو و ماڵەکەیان خشپەی تیا نەدەهات.. «جابر»ی برای دەستی ڕاستی خستبووە ناو دەستی چەپی ئەمەوە و هەر بە دانیشتنەوە و لە تەنیشتیەوە خەوی لێکەوتبوو.. بە سووکی دەستی ڕاکێشایەوە و هەر لە خۆیەوە خستیە سەر مێزە ڕەشەکەی تەنیشتیەوە.. دیوانی «سروودەکان»ی «جیاکۆمۆ لیۆپاردی»ی بە دەستەوە هات و بە بێزارییەوە لە چاوە ماندووەکانی نزیکی کردەوە، کە خاڵی لە ئیتاڵیەوە کردبووی بە عەرەبی و پێشکەشی ئەمی کردبوو.. لاپەڕە چواری کردەوە و وەکوو هەموو جارێکی تر سەرنجی کەوتە سەر ئەو شوێنەی کە دەڵێت: «مرۆڤ لەم جیهانەدا تەنها کەمێ وەهمی بەختیاریی دەناسێت، ئەویش وەهمی گەنجێتیە.. بەڵێ، هیچ ئاسوودەییەک لەم جیهانەدا نییە، بێجگە لە یادکردنەوەی ئەو وەهمە».. «شاعیر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی واقیع هیچی لە دەست نایەت، گەڕاندنەوەی مناڵیی نەبێت.. بێگومان ئەویش بە یادکردنەوە».. بەڵام ئەم شاعیر نییە و گۆرانیبێژە.. گۆرانیبێژە و ئەوەی نایەوێت بیری لێبکاتەوە مناڵییە.. گۆرانیبێژە و ئەوەی حەزی لێناکات یادکردنەوەی ڕابردوویەتی.. هەر بۆیە تا تینی تیایە کتێبەکە تووڕهەڵدەدات و دەیدات بە دیوارەکەی بەرامبەریەوە.. هەرچۆنێ بێت هەڵدەستێتەوە و «جابر»ی برای لە شوێنی خۆی و هەر لەسەر ئەو بەرە سپیە ڕەقوتەقەی ژوور پاڵدەخات.. پاڵیدەخات و بە چەرچەفێکی ڕەش دایدەپۆشێت.. نایەوێت چیتر ئاوا ببینێت و خەیاڵی بەملا و بەولادا پەرشوبڵاو بکاتەوە، کە هەر دەڵێیت لەناو بەرمیلی پاڵخراودا دانیشتووە و سەری شل و خاو بەرەو ناو کۆشی شۆڕبۆتەوە.. وانەبێت ئێوارەی هاوینێکی زووی بیردەکەوێتەوە و خەیاڵەکان وەکوو دەزوولەی ئێجگار باریکی سپیی کەمێ شێداری زۆر نەرمی چەند بڵێیت لووسی جاڵجاڵۆکە ڕەشە قاچزبرەکان تێوەیدەئاڵێن.. تێوەیدەئاڵێن و وەکوو مناڵی ساوا و لە شێوەی

هێلکەشەیتانۆکەی زلدا دەیکەن بە قومات.. وانەبێت بیریدەکەوێتەوە چۆن ئەم لەناو بەرمیلەکەدا خۆی گرمۆڵە کردبوو و «ئەدیب»یش بە لەقە لەسەر ئەو شەقامەی بەردەمی ماڵی خۆباندا تلۆریدەکردەوە.. ئەو بەرمیلە سپیەی بە پیتی ڕەشی ئینگلیزی شتی سەیر سەیری لەسەر نووسرابوو و کرێکارە سپیپۆشەکان لە بەردەم بناغەی دایەرەی «پۆلیسی مبخرە» «٣٦» دا ئاویان تێدەکرد.. مناڵە هاروهاجەکانی گەڕەک قلٚپیان کردبووەوە و بەتاڵیانکردبوو.. ئەم مل و سنگی گەرمەژنەی ورد وردی لێهاتبوو و ئامۆژنی جوان جوان بە دەرمانی سووری ناو شووشە ڕەشە درێژکۆلەکەی سەر تاقە سپیەکە بۆی شتبوو.. بۆنە ئێجگار تیژەکەی چووبوو بە ناخی لووتیا و بۆ ماوەیەک چاوەکانی بە ژێر ئاوێکی زۆر لینجی وەکوو کەفی لالغاوی حوشتری تووڕە و شەڕانی کەوتبوون.. هەرچەند بەرمیلەکە تلۆردەبووەوە و ئەم لەگەڵیا دەخولایەوە، ئەو گۆڕەپانەی بەرماڵیانی لێدەبوو بە ڕووبارێکی فرەوان و بەردەکان لە شێوەی هێلکەی تیمساح و لەسەر لمەکەی قەراغیدا دەردەکەوتن.. وردە وردە هێلکەکان دەترووکان و بێچووەتیمساحی ڕەش ڕەش سووک سووک سەریان تیادا دەجووقا.. هاوکات مێروولەی سپی سپیی تەشیلەیی ئازا ئازا لە هەموو لایەکەوە پەلاماریاندەدان و بە گازی تیژ تیژ تێیاندەکەوتن.. هەندێکیان خۆیان لە دەستیان ڕادەپسکاندن و بە پەلەپرووزێ بۆ ناو ڕووبارەکە دەچوون.. لەوێ مێروولەکان سەرئاو دەکەوتن و لێیان جیادەبوونەوە.. کەمێ پەلەقاژەیاندەکرد و دەخنکان.. هەندێکیان بۆیان نەدەکرا و لە ژێر دەستیاندا خپدەبوون.. یەکەمجاربوو لە نزیکەوە بێچووی تیمساح ببینێت و ئاوا لە نهێنیی ژیانی سەیر و سەمەرەیان تێبگات.. بۆیە حەزی دەکرد بە وردی سەرنجیان لێ بدات و دواتر بۆ مناڵانی گەڕەکی بگێڕێتەوە، بەڵام «ئەدیب» لەپڕ پێچی بە بەرمیلەکە کردەوە و بە هەمان ڕێگادا گەڕاندیەوە.. ڕووی کەوتە لای ماڵەکەی خۆبانەوە و تیپێکی مۆسیقای ژنانی بە ڕووتیی لەسەر دیواری کەمێ بەرزی حەوشەکەیانەوە بینی.. قژیان لە دواوە وێنەی دارلاستیک کردبوو بە پرچ و ئاوازێکی خەمناکیان دەژەند.. عوود و کەمان، تەپڵ و چەلۆ، ئۆرگۆن و گیتار، ساز و فلووت، هەر هەموویان ڕەنگی سپی سپییان هەبوو و بە

وێنەی سەرەمێکوتەی ڕەش ڕەش نەخشابوون.. لەپڕ دەرگاکەیان کرایەوە و مامی و ئامۆژنی بە جووتە سەریان دەرهێنا.. ئەمیان قیبلەنومایەکی ڕەشی گەورەی شکاوی بە دەستی چەپییەوە گرتبوو و ئەویان سەبەتەیەکی سپیی پڕ لە بۆقی ڕەشی مردووی وشکهەڵاتووی کردبووە باوەشی.. گۆرانییان دەوت و لەگەڵیا فرمێسکیان دەڕشت.. ئەم گوێی لێدەگرتن و لە دوایانی دەوتەوە.. ئەو شەوە وڕکی گرت و داوای لێ دەکردن بۆی بڵێن.. هەرچەند هەوڵیان لەگەڵ دا و ویستیان بەم شت و بەو شت ژیریکەنەوە، سوودی نەبوو و ئەم زیاتر دەنگی لێ هەڵدەبڕی.. گۆرانیی دنیایان بۆ وت و ئەم بە هیچیان ڕازیی نەبوو.. دوایی خۆی بەدەم گریانەوە بۆی وتن و ئەوان سەریان سوڕما.. مامی دەگریا و فرمێسکی دەڕشت.. بە خۆبەوەی دەنووساند و بە دەنگێ، وەک بڵێیت بە تیغی تیژ لە ژێ باریکەکانی قوڕگی بکرێنن و بە زۆر جیاییکەنەوە، دەیوت:

ـ گۆرانی و گریان..!! گریان و گۆرانی..!! ئاخ نەونەوەکەی ڕۆحم تۆ ئەم گۆرانییەت لە کوێ هێناوە..؟! لە کوێ..؟!

ـ لە ئێوە فێری بووم..!! لە ئێوە..!!

ئەمە ئەو گۆرانییە بوو، کە دواتر هەر کاتێ دڵی پڕبووبووایە و دەستی بکردایە بە گریان، دەیچڕی و جار لە دوای جاریش خۆشتری دەوت.. هەرچەندیش لێیان دەپرسی شیعر و ئاوازی کێیە و ئەم لە کوێی بیستووە، ئەو ڕۆژەی وەکوو خۆی دەهێنایەوە بەر چاوی و دەیوت:

ـ هی مامم و ئامۆژنمە و بەدەم گریانەوە نەبێت ناوترێت..!!

ئەم ئەو سەما سەیر و سەمەرەیەی لەم زیاتر کەس نەیدەزانی و بە هیچ شێوەیەک نەیاندەتوانی لاسایی بکەنەوە، لە دایکی و «شاناز» فێربوو و خۆیشی هەندێ گۆڕانی تیادا کردبوو.. ئەمە ئەو جارە بوو، کە لە ماڵی «مام مارف»دا مایەوە و تووشی نەخۆشیی چاوئێشە بوو.. «نەنە سۆزرەت» «جویفە»«٣٧»ی ڕەشی ناو قوتووە سپییەکەی لەناو مەنجەڵێکی بچووکدا بۆ کوڵاند و بۆنە ئێجگار ناخۆشەکەی چوو بە قووڵایی لووتیا.. بوو بە هەڵمێکی سپی و لە شێوەی مەمکەمژەی مناڵ بەرزبووەوە.. دوو پارچە لۆکەی ڕەشی خستە سەر هەڵمەکە و

لەسەر چاوەکانی ئەمی دانان.. کاتێکیش لایبردن و ئەم ڕایکردە بەر دەرگای حەوشە، دیمەنی شتەکان لەبەر بیناییدا بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەردەکەوتن و دەشتەکەی بەر مالیانی وەکوو ڕووبارێکی ئێجگار دلگیر دەبینی.. هەر خێرا پێلاوەکانی داکەندن و کراسەکەی تا سەر ئەژنۆی هەلکرد.. بە هەنگاوی کورت کورت بەسەر لمەکەدا دەڕۆیشت و خۆش خۆش گۆرانیی دەوت.. کۆمەلێ سەگی ئاویی ڕەش ڕەشی بینی خۆیان خستبووە سەر تاوێرەبەردە سپی سپیەکان و قاچەکانیان بەملا و بەولایاندا شۆڕکردبووەوە.. تیشکی خۆرەکەش، کە بە لاری لێیدەدان و بریقوباقی بە لەشە زۆر لووس و چەند بلێیت نەرمۆلەکەیان دەخست، ئەوەندەی تر ناخی ئەمی دەورووژاند و لە خۆشیا پەنجەی قاچەکانی لە لمە کەمێ شێدار و ئێجگار نەرمەکەدا نقوومدەکرد.. نقوومیدەکردن و ختووکە بە سەرتاپای گیانیدا دەهات.. دوو کچی عازەبی قژدرێژ، کە کتومت لە یەکتر دەچوون و سەرو سەبەتەی ڕەشی پڕ لە ماسیی سپیی زیوییان پێبوو، لێی نزیکەوتنەوە و لەملا و لەلاوە دەستیان کردە ملیەوە.. ئەم بەم دەست و بەو دەست ماسیەکانی هەلدەگرت و دەرخواردی سەگەئاویەکانی دەدان.. هاوکات لە سەربانەکەی مالی «نەنە سۆزرەت»دا، کە تەواو شێوەی گۆڕابوو و هەر دەتوت بە چەرمی خۆشکراوی گامێش داپۆشراوە، دایکی و «شاناز» بە کراسی تەنکی ڕەشی بە وێنەی قاز نەخشاوەوە سەمایان دەکرد و ئەم بە وردی لە جوولە دلڕفێنەکانی جەستەیان وردەبووەوە.. لێیان وردەبووەوە و سووک سووک لاسایی‌دەکردنەوە.. دواجار لەگەل کچەکاندا چوو بۆ سەر تاوێرەبەردێکی ئێجگار گەورە و بەدەم گوێگرتن لە دەنگی شەپۆلە شیرییەکان دەستیان پێکرد.. ئەو شەپۆلانەی بەردەوام لە شێوەی ورچی ناو ئەشکەوتی شاخی هەتاونەدیوی ئەودیوی خەیالەکانی هەلدەچوون و بە بالای بەرزی بەردەکان هەلدەزنان.. قاچەکانی ئەمیان تا ئەژنۆ ئاوپرژێندەکرد و لە ناخی ناخەوە فێنکی دەبووەوە.. نەورەسە ڕەشە سەربالسپیەکانیش پۆل پۆل لەم ناوە دەنیشتنەوە و بە زاقوزیق.. زیقوزاق.. زاقوزیق.. زیقوزاق، پەردەی تەنکی گوێچکەیان دەلەراندەوە.. ڕێتمی سەماکەیان پێدەگۆڕی و بەبێ ویست لە نەزمی دایکی و ئەوان لایدەدا.. دواتر تەمێکی چڕی سپیی شێدار، لە هەلمی دەم و

لووتی ئەسپە ڕەشە ئەفسانەییەکان دەچوو و بۆنی هێللانەی پەڕەسێلکەی لێدەهات، سووک سووک هەموو شتێکی دادەپۆشی و ورده ورده لە چاوی ئەمی گومدەکردن.. لەسەر تاوێرەبەردەکە قاچەکانی لە باریەکتر چوون و بە دەما کەوتە سەر لمەکەوە.. هەر خێرا هەستایەوە و وەکوو کوێر ڕاست و چەپی خۆی لێتێکچوو.. دەستەکانی بەملا و بەولادا دەکوتا و بە ترسەوە هەنگاوی کورت کورتی دەنا.. بەر تاوێرەبەردەکان دەکەوت و بۆ دواوە دەگەڕایەوە.. ئەوەندە کەوت و هەستایەوە، کەوت و هەستایەوە، ناولەپ و سەرئەژنۆکانی برینداربوون و خوێنیان لێ دەچۆڕایەوە.. گیانی داهێزرا و سەری خولایەوە.. کاتێکیش لەناو باوەشی «نەنە سۆزرەت»دا بە ئاگاهاتەوە و چاوەکانی کردەوە، بنمیچی ژوورەکەیانی وەکوو بەرگی ئینجیلەکەی ماڵی «مەرجان»ی دەستەخوشکی دایکی دەبینی و موچوڕکی پیادادەهات.. سەیری دەکرد و بیری لە «مەرجان» دەکردەوە، کە لە سەمادا هیچ ئافرەتێ پێی ناگات و دایکی لە هەموو کەسێ زیاتر پێی سەرسامە.. ئەو جارەیش، کە لە ڕۆژی نیشانکردنی «هاڵە»ی پووریدا پەڕۆیەکی ڕەشی لە کەمەری بەستبوو و بە کراسێکی سپیی زۆر تەنکەوە سووڕی دەدا، دایکی دەستەکانی خستبووە سەر ئەم شان و ئەو شانی و لەسەر ڕێتمی ئەو سەمای دەکرد.. لەگەڵیا دەتریقایەوە و وەکوو مناڵ دەنگی سەیر سەیری لە قوڕگی هەڵدەستاند.. ئەو ڕۆژە «نەوال» لە پەنجەکانی قاچی وردبووەوە و هەستی کرد وەکوو ئەوانەی خۆی لە مێروولەی شێوەتەشیلەیی دەچن.. حەزی دەکرد بۆیان دانەوێتەوە و بە پەنجەکانی دەستی بیانگرێت، یان بیانخاتە دەمیەوە و تێر تێر بیانمژێت.. ئەو ئێوارەیەی ئۆتۆمۆبیلە ڕەشەکەی دووکەڵی مێشوولەکوژ، کە خەڵکی شار «أم الدخان»یان پێ دەوت و باوکی «ست ساهیرە»ی ماتماتیک لێیدەخوڕی، ناو کۆڵانەکەی ماڵی «حەسەن خودادا»ی لە دووکەڵێکی سپیدا نقووم کرد و ئەمیش کوێرانە و وەکوو مناڵانی تر بەدوایدا ڕایدەکرد.. ڕایدەکرد و پێڵاوە سپیەکانیشی لەبەر دەرگا ڕەشەکەی ماڵی ئەواندا داکەندبوو، کە تازە باوکی بۆی کڕیبوو و دایکی قەیتانە لووسەکانی بۆ لە کونە چوارگۆشەییەکانی هەڵکێشابوو.. کاتێکیش ئۆتۆمۆبیلەکە لەسەری کۆڵانەکەی ئەوسەر پێچی کردەوە

و ئەویی بەجێهێشت، وردە وردە دووکەڵەکە دەڕەویەوە و جارێکی تر و سووک سووک سیمای کۆڵان دەردەکەوتەوە.. ئەوسا پیاوێکی «هیندی»، دەستی ڕاستی لە ئانیشکیەوە قرتابوو و وێنەی پەڕەسێلکەیەکی لەسەر پشتی دەستی چەپی کوترابوو، لەبەر دەرگای ماڵێکی سەر سووچەکەدا بزنمژێکی زۆر ڕەشی ئێجگار سەیری لەناو توورەکەیەکی تابلێی سپیدا دەرهێنا و لە بەردەمی خۆی دانا، کە بە بۆیەی سووری تۆخ تۆخ لاکێشەی ورد وردی لەسەر پشتی کێشابوو و وەکوو گوارە دوو ناڵی زیوبی کردبووە ئەم گوێچکەی و ئەو گوێچکەیەوە.. ئەم و مناڵانی تر بازنەیەکیان بە دەوریدا پێکهێنا و بە ترسەوە سەیریان دەکرد.. لەپڕ و خۆیشی نەیزانی بۆچی قاچی چەپی بۆ درێژکرد و خستیە سەر پشتی.. ئەو زمانە سوورەکەی دەرهێنا و پەنجەکانی ئەمی لستەوە.. موچوڕکەی پیاداهات و هاوکات قێزی لێیکردەوە.. پیاوەکە سووک سووک بە سەری پەنجە زۆر زبرەکانی نینۆکە ئێجگار لووسەکانی ئەمی خوراند و بە دەنگێکی کز کز پێی وت:

ـ تۆ دەتوانییت فێری باشترین سەما بیت، چونکە پەنجەکانی قاچت لە مێروولەی باڵداری دوای لێزمەبارانی بەهاری وڵاتی جنۆکان دەچن.

شەویش لە سەربانی ماڵی «عەمار»دا لەسەر پشت و ڕوو لە ئاسمانی تەمومژاوی پاڵکەوت و قاچەکانی لێ ڕاکێشا.. دەستەکانی خستە ژێر سەری و کەمێ بەرزیکردەوە.. کەوتە سەرنجدانی پەنجەکانی و چاوەکانی کەوتنە ڕەشکەوپێشکە.. هەر دەیانی بینی ڕەش ڕەش هەڵگەڕابوون و سووک سووک لە قاچەکانی جیادەبوونەوە.. جیادەبوونەوە و وەکوو مێروولەی باڵدار هەڵدەفڕین.. شەمشەمەکوێرە سپیەکانیش جووت جووت و تیژ تیژ لە ناوەڕاستی ئاسمانەوە بۆیان دادەبەزین و ورشەی باڵیان تێکەڵ بە یەکتر دەبوون.. لە گوێچکەی ئەمدا جارێ بە «سمط.. سمط.. سمط.. سمط»«٣٨» و جارێ بە «شیاط.. شیاط.. شیاط.. شیاط»«٣٩» دەنگیدەدایەوە و ئەوەندەی تر دیمەنی شتەکانی لێ دەگۆڕا.. تێکدەقژقژان و فرکان فرکانیان پێدەکردن.. بە دەنووک هەڵیاندەگرتن و بەرزیاندەکردنەوە.. لەپڕ بەڕەڵڵایاندەکردن و لەسەر سەریدا دەکەوتنەوە باڵەفڕە.. ڕەنگیان بۆ سوورێکی تۆخ تۆخ دەگۆڕا و لەبەر تیشکی کەمێ کزی گڵۆپی سپیی

ستوونی بەر دەرگادا جوان جوان دەدرەوشانەوە.. لە ترسا خۆی خستە باوەشی «عەمار»ـەوە و پێی وت:

ـ دەستەکانت بگرە بە چاومەوە، با چیتر پەنجە خوێناویەکانی خۆم بە ئاسمانەوە نەبینم.

ئەو پەنجەکانی لە پەنجەکانی ئەم هەڵکێشا و پێی وت:

ـ ئەوە تۆ خەونت دیوە نەوال، ئەی ئەوە نییە پەنجەکانت......؟! خوێناویی چی..؟!

ـ ئەوانەی قاچم دەڵێم..!! ئەوانەی قاچم..!!

ئەو قاچەکانی ئەمی هەڵبڕی و پەنجەکانی خستە دەمیەوە.. زمانی پیادادەهێنان و دەیلستنەوە.. ئەم ختووکەی دەهات و جۆگەلەیەکی باریکی لەززەت وەکوو توولەمار بە ژێر پێستیا تێپەڕدەبوو.. هەستی دەکرد جەستەی بووە بە لیمۆیەکی زۆر ترشی ئێجگار گەورە و پێی خۆشبوو لە هەموو لایەکەوە دەرزیئاژەنی بکات.. یان بە مێخەکی ڕەش ڕەشی نووکتیژ وێنەی قازی کێویی بچووک بچووکی لەسەر بکێشێت و کۆترۆکەی سپیی سەرسووریان بۆ بکات بە چاو.. چی موچڕکەی ناو دەمارە ورد و درشتەکانی هەن، وەکوو ئاوێکی ڕوون لە گیانی دەرکات و لە شێوەی نەخشی ڕەشوسپیی سەر مافووری سووری قەد دیواری ئەشکەوتە شێدارە دوور دوورەکان بیخاتە بەر چاوی.. ناودەمی ببوو بە ئاودڕکەی لیکێکی زۆر سەیری وەکوو لینجاوی ناو هێلکەشەیتانۆکەی بەر هەتاوی چەند بڵێیت گەرمی تەمووزی «بەغا» و حەزی دەکرد بەردەوام بڵێت:

ـ تۆ لە نێوان بیرچوونەوەی سپیی من و بیرکەوتنەوەی ڕەشی خۆتا وریابە و سووک سووک هەنگاوبنێ، با شووشەی عەتری سووری شێوەتەشیلەیی بەجێماوی کۆچەریەکان لە ژێر قاچەکانتا وردوخاش نەبن و هێڵی باریک باریکی وەکوو هی ناولەپی سوارە سەرمابردەڵەکانی سەر ئەم خاکە نەرم و شێدارە کاڵنەبنەوە.

بەڵام نەیدەتوانی و زمانی وەکوو ئەو جارە لەگۆکەوتبوو، کە خاڵۆژنی بە چوار تەقەڵی ڕەشی ورد بۆی دروویبووەوە و نەدەبووایە لە قەراغەنانی ناو ئاوی کەمێ شلەتێنی گۆشتی زۆرکولاو زیاتر هیچی تر بخوات.. ئەوە ڕۆژی سووتانی

«کارگەی شیرینیی «أثیر»ی «خالق ئەفوەل»ی باوکی «ئیستقلال»ی هاوپۆلی بوو و «ئەدیب» وایلێکرد.. ئێـوارەی پایزێکی درەنگ بە دزیی دایکیـەوە پیـاڵەیەکی سپیی بچکۆلەی لە دۆڵابە ڕەشە کۆنەکەی نەنکی دەرهێنا و نوقڵێکی ڕەشی خڕی تێکرد.. لە پەنا تاقە دارخورمـا بەرزەکەی ناوەڕاستی حەوشەکەیان دانیشت و پشـتی پێ دا، کـە باپیـری نیـو سـەدە لەمـەوبەر لای جـوتیـارێکی ڕەشـپـۆشی «بوهرزی»ی هێنـابووی و لەوێی ڕوواندبوو.. ئەوەی کـوڕەقـەرەجـێکی قـژخـاوی سپیپۆش ڕۆژی بوومەلەرزەکە لەجیاتی پێڵاو دوو قـوتووی ڕەشی شیری نیدۆی لە قاچەکـانی هەڵکێشـابوو و بە گەلاکـانی وێنەی لەپی ورچی دەکێشـا.. ڕانەکانی جووتکرد و پیاڵەکەی خستە نێوانیان.. بە دەستی چەپی قژی ئەمی گرت و پێی وت:

ـ ئەگەر ئێسـتـا بتـوانیت بە زمـان ئەم نوقـڵـە لەناو ئەو پیـاڵە بچـووکـەدا دەربهـێنیت، کـە گـەورەبووتت دەتوانیت بە قـاچەکـانت سـەر کـێـوێکی زۆر بەرز بکەویت.

ئەم کـاتێ لە خـەسـتەخـانە چاوی کـردەوە و هەسـتی بە ئازاری زمـانی کـرد، نەیدەزانی چی بەسەرهاتووە و بۆچی هێناویانە، بەڵام بۆنی گۆشـتە سووتـاوەکەی بیردەکـەوتەوە و دەنگی «نەعـیـمە کـوێر» لە گـوێچکەیدا دەزرنگایەوە، کـە لەودیو کوت کوت گۆچانە سپیەکەی لە زەوی دەدا و قـایم قایم بەسەر «هەنا ء»ی بووکیدا دەیقیژاند:

ـ دایگرە.. قەحپە ئەو قازە لەسەر ئاگر داگرە، بوو بە قەرەبرووت..!!

«نەعـیـمە کوێر» ، کە ئەو جارە بە ڕووتیی لە حەمامی «بشارە»دا سووک سووک لە شێوەی بەتریق هەنگاوی کورت کورتی دەنا و دەستە شل شل و خاو خاوەکانی لە دوو مێشکوژی پلاستیک دەچوون، لەپڕ لای کونی بازنەیی زێرابەکەی ئەوسەر خۆی دا بە ئەرزا و لەسەر پشت، وێنەی کەمتیارێکی زل لێی پاڵکەوت.. ئەم هەر بە چاوە کەفاویەکانیەوە لە ژێر دەستی ئامۆژنی هاتە دەرێ و لێی نزیککەوتەوە.. کـاتێکیشی زانی «دیجلە» و «فوڕات» لەملا و لەولایەوە پەیدابوون و وەکوو ئەم کـەوتنە سـەرنجـدانی.. چڵکاوە سـپـیـەکـە پەیتـا پەیتـا لە هەمـوو لایەکـەوە

پەنگیدەخواردەوە و وردە وردە لە تەنیشت جەستەی داهێزراویدا دەبوو بە گۆمیلکە.. ئەو جەستەیەی، کە لەبەر چاوی ئەمدا ڕەشدەچووەوە و دەتوت لە تلّپەی چا دروستکراوە.. ناولەپی لەملا و لەولاوە بە هێز بە هێز لەسەر ڕووی چلّکاوەکە دەدا و دەیکرد بە شلّپوهوڕ.. لەگەڵیا سووک سووک سەری دەلەقاندەوە و قایم قایم «داستانی گلگامش»ی بە زمانی ئەکەدی دەخوێندەوە:

ـ شا ناقبا إيمورو لو ـ شه ـ إيد دى مائاتى.

شا كوللاتى إيدوو كلا ما لوشالمى شو.«٤٠»

.................................................

:::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::::

ئەم هەر جارێ دەستەکانی بخستایەتە سەر ئەژنۆ ڕەقەکانی ئەو و داوای لێبکردایە ئەو بەندانەی بۆ بلّێت، ئەو بەو مەرجە ڕازیی دەبوو و بۆی دەوت، کە ئەم لە پێشا گۆرانیی «وردە لیش ذبلانە یا وردە»ی «سەلیمە موراد»ی بۆ بچڕێت و لێشی نەپرسێت چۆن و کەی ئەو داستانە درێژەی لەبەرکردووە.. لەبەریکردووە و ئاوا بە خێرایی و بەبێ وەستان دەتوانێت بیلّێتەوە.. دەیلّێتەوە و بە جارێ هەموو گیانی ئەم لە لینجاوی مۆسیقایەکی سۆزرەتدا هەلّدەکێشێت.. تا دەچێتەوە مالّیش و دەرگاکەش دەکاتەوە، وشەکان بەردەوام «أ ـ نا بیتی شا ـ أـ شی ـ بو ـ شو زو ـ اوم ـ مو ـ اوو نو ـ اوو ـ را»«٤١» لەناو سەریا دەزرنگێنەوە و گوێی لە هیچ دەنگێ، نە بەرز و نە نزم نابێت.. ئەو نیوەڕۆیە مامی، کە ئانیشکی چەپی بە ملپێچێکی ڕەشی درێژ پێچابوو و بە دەستی ڕاستی ژەنگی بۆریی کەپری مێوەکەی بە سمارتەی سپی دەکڕاند، سێبەرە ئێجگار ڕەشەکەشی لەسەر مافوورە زۆر سوورە سادە هەلّخراوە ڕیشوەدارەکەی سەر دیوارە چەند بلّێیت سپیەکەی نێوان خۆیان و مالّی «بەدری»دا وەکوو نەخش دەرکەوتبوو و ئەم لە شێوەی ورچی زلی دەهاتە بەر چاو؛ سەری هەلّبڕی و بزەیەکی بۆ خستە سەر لێوی.. هاوکات دەستی چەپی کرد بە ناو یەخەی خۆیدا و سمۆرەیەکی ڕەشی ڕەقەلّەی کلکسپی تیادا دەرهێنا.. ئەم بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی لەگەلّدا بلّێت و وای پیشان دا حەزی لێدەکات.. حەزی لێدەکات و وەکوو ئەوەی پێشووی بەخێویدەکات، کە

سپیەکی گۆشتنی کلکرەش بوو و تەمووزی ساڵی پێشوو بە نەوت مردبوو، لێی وەرگرت و بۆ ژوورەوەی برد.. ئەوسا ئامۆژنی لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا وەستابوو و بەو شانە سپیە قژی دادەهێنا، کە لە شێوەی ماسی دروستکرابوو و ئەم هەر جارێ دانەکانی بە جامی پەنجەرەکە دابهێنایە دەنگی «ریان.. ریا.. ریان.. ریا»«٤٢»ی لێ بەرزدەبووەوە.. دوو تەڵەقژی بەملا و بەولای چاوی چەپیدا هێنابووە خوارێ و تا ئاستی ناوکی هاتبوون.. جار جار بە دەستی ڕاستی لوولیدەکردن لەپڕ بەڕەڵلایدەکردن.. بە شێوەیەکی زۆر سەیر خولیاندەخوارد و خاودەبوونەوە.. ئەم حەزیدەکرد وەکو «أزبری بوز»«٤٣» زمانیان پیادابهێنێت و بیانلسێتەوە.. بیانلسێتەوە و لەگەڵیا چاوی چەپی بنوقێنێت.. ئەو بنووقێنێت و بەوەی ڕاستی سەرنج لە چاوی چەپی ئەو بدات.. دڵنیاشە لە نێوان دوو تەڵەقژەکەیدا وەکوو شوێنپێی ئەو مناڵەکۆچەریە ڕەشپۆشانەی دەبینێت و گیانی بە ژێر موچرکێکی سەیر دەکەوێت، کە لەسەر خاکی نەرم و شێداری سەر ئەستێرکی نوێنەکانی خۆیاندا بەجێدەمان و بە ئاوی لێزمەبارانی لەناکاوی بەهار پڕدەبوونەوە.. پڕدەبوونەوە و دواتر لە ژێر تریفەی سووری مانگ و ئەستێرەکاندا دەدرەوشانەوە.. لێی چووە پێشێی و ویستی پێی بڵێت:

ـ مژدە..!! ئامۆژنە ڕۆحەکەم مژدە، لەمەودوا هەر شەوداهات ڕۆژێکی سووری بچکۆلە لەناو چاوی چەپی تۆدا هەڵدێت.

بەڵام لێی تێکچوو و پێی وت:

ـ إي ـ لو ـ ما إيت ـ تي ـ إيلو شاش دا ـ ري ـ ايش أو ش ـ شاب.

ا ـ مي ـ لو ـ توم ـ ما ما ـ نو ـ اوو ـ اومو ـ شا.«٤٤»

ئەو خێرا بە هەر دوو دەست قژی گرت و بۆ هەیوان و دواتر بۆ ناوەڕاستی حەوشەکەی ڕاکێشا.. بە نەعلێکی سپیی لاستیک تێیکەوت و بە مەبەستی کوشتن لێی دەدا.. بۆ نەگبەتییش نەیدەتوانی بە زمانەکەی خۆی هاوار بکات و لێی بپاڕێتەوە.. وشە و مەبەستەکان دەگۆڕان و لە شێوەی بەندەکانی «گەلگامش» لە دەمی دەردەچوون:

ـ ات ـ ما ان ـ نا ـ نو ـ اوم ـ ما ـ تا ـ دار مو ـ تام.«٤٥»

- ... إيب - ري  پی - إيز - نو - قيش - نی - إی - نو.«٤٦»
- اوو - شو - اوت - تا  شا  أ - مو - رو  كا - ليش  شا - شا - أت.«٤٧»
- مو - تا  أپ - لاخ - ما  أ - راپ - پو - اود - صيری.«٤٨»
- می - مو - تی - قات - كا - أ - أ  إيل - تا - پيت - تو.«٤٩»
- إيم - ما - تی - ما  نی - إيپ - پو - شابيتی:  ايم - ما - تی - ما  نی - كان - نا - اک.«٥٠»
- إيم - ما - تی - ما  أخی - إی - زو - اوز - زو.«٥١»
- إيم - ما - نی - ما  زی - ری - توم  إی - با - شی - إنا ناكری.«٥٢»

مامی زەق زەق سەیری دەکرد و قایم قایم سمارتەکەی لە بۆریەکە دەخشاند، بەبێ ئەوەی بێت بەلایا و لە ژێر دەستیا دەریبهێنێت.. سمۆرەکەش، کە نەیدەزانی کەی و چۆن لە دەستی بەڕەڵلابووەوە و چۆتە سەر لقی دارهەنجیرەکەوە، دەستەکانی لە یەکتر دەخشاند و لەمی دەڕوانی.. وردە وردە لەبەر چاویا گەورەدەبوو و شێوەی دەگۆڕا.. تک تک دەتوایەوە و چز چز دەکەوتە سەر کاشیە ڕەق ڕەق و داخبووەکەی نیوەڕۆی ئەو تەمووزە گەرم گەرمەوە.. بەبێ ویست دەستی چەپی درێژکرد و لەبەر چۆڕاوگەکەی گرتەوە.. هەستی بە فێنکبوونەوەی ناخی ناخی ڕۆحی دەکرد و پەیتا پەیتا پەنجەکانی و پشتی دەستی دادەپۆشی.. دایدەپۆشین و وەکوو ڕشتەی ئەڵماس پێوەیانەوە ڕەقدەبوو.. کاتێکی زانی وا لە شێوەی خوودەی ئەو سەربازە کوژراوە دەردەکەوێت و دەبریسکێتەوە، کە بەیانیەکی پایزی ساڵی پێشوو لەسەر ڕێگای قوتابخانە لەگەڵ «نێرگز»دا بینیان و ئەم قێزی لێیکردەوە.. قێزی لێیکردەوە و دڵی تێکهەڵات.. دڵی تێکهەڵات و ڕشایەوە.. ڕشایەوە و کاتێکی زانی وا هەر لەم شوێنە، لەسەر تەختی نووستنەکەی خۆی پاڵیانخستووە.. «شازە» و «نازە» لەملا و لەولای سەریەوە کز کز دانیشتوون و فرمێسکی ورد وردی بۆ دەڕێژن.. «نێرگز» هەر بە جلەکانی قوتابخانەوە لای پەیژەی سپیی کارەباچییە ڕەشپۆشەکەوە وەستابوو و سەیری دەستەکانی ئەوی دەکرد، کە خستبوونیە دوو دەسکێشی سپیی وەکوو چەرمی خۆشکراوی گامێشەوە و زەنگێکی سووری لە لای سەرەوەی دیواری هەیوانەکە دادەکوتا.. کاتێکیش

تەواوبوو و دایکەندن، دایکەندن و خستینیە بەر قایشە ڕەشەکەی پشتی، ئەوەی بزێمێکی زیوبی چوارگۆشەی گەورەی هەبوو و لە دەرگای بەندینخانەی «شرانیق»«٥٣» دەچوو؛ ئەم پەنجەکانی وەکوو کلیلی داری کەمێ درێژی زۆر باریکی دەرگای ساجی حەوشەی خانووی چەند بڵێیت گەورەی جوولەکەکان بینی و لە ناخی دڵیا هەستی بە ترسێکی سەیر کرد.. بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی ئامۆژنی گرت و خستیە سەر سنگی خۆیەوە.. ئەو سووک سووک لە پەیژەکە دابەزی و چووە بەر دەرگا.. پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی نا بە پلاکەکە و زەنگەکە کەوتە لێدان.. ئەم ڕووی وەرگێڕا و سەرنجی لەو بۆریە هەندێ درێژ و کەمێ باریکە دا، کە سەرێکی خڕی وەکوو خونچەی گوڵی نەپشکووتووی هەبوو و لەسەر پشتی قوتووە خڕەکە هەڵدەپەڕی.. هەڵدەپەڕی و دەنگێکی سەیری وەکوو خرینگەی خڕخاڵ و زرینگەی بازنی ژنەکۆچەریەکانی شەوانی بەر بارانی قەدپاڵی شاخ و پێدەشتی سەرەتای بەهاری خەیاڵەکانی پێش نووستنی لێ بەرزدەبووەوە.. لە گوێچکەی ئەمدا بە «رمضاء.. رمضاء.. رمضاء.. رمضاء»«٥٤» دەزرینگایەوە و موچوڕکە بە سەرتاپای گیانیدا دەهات.. ئەوسا خۆبشی نەیدەزانی بۆچی بیری لە جیاوازیی نێوان زەنگلێدان و مردووناشتنندا دەکردەوە و داوای لە ئامۆژنی دەکرد پێی بڵێت.. دواتریش، کە جووتێ پەڕەسێلکەی ڕەشی کلکسپی هێلانەیان لەسەر کرد و پووشەکان کەوتنە نێوان بۆریە باریکەکە و قوتووە خڕەکەوە، دەنگەکەی گۆڕا و وەکوو «الأوار.. الأوار.. الأوار.. الأوار»«٥٥» دەهاتە گوێچکەیەوە.. ئەو ڕۆژەی «مەرجان» چاوی چەپی عەمەلیاتکردبوو و لەگەڵ دایکی چوون بۆ سەرلێدانی، ئەم لە بەرامبەر ئەو تابلۆیەی دیواری ژووری میوانەکەیاندا وەستا و سەرنجی لەو دوو کرێکارە سپیپۆشە دەدا، کە بەفرماڵی گەورەی ڕەشیان گرتبوو بە دەستەوە و بەفری ئەستوور و تازەباریوی بەردەمی کەنیسە ڕەشەکەیان ڕادەماڵی؛ خەیاڵی ڕۆیشت و دواتر لەپڕ لە دایکی پرسی ئاخۆ مانای ئەو وشەیە چییە، کە هەر زوو زوو لە گوێچکەیدا دەزرینگێتەوە و هەستێکی سەیری ترسناک ترسناکی لە دڵدا دەخولقێنێت، بەڵام ئەو لەبەر قاقالێدان گوێی لێی نەبوو و بەردەوام بە ئەژنۆکانی خۆبدا دەکێشا.. پیایدا دەکێشان و بە «مەرجان»ی دەوت:

ـ سەرت بتاشن، چاو چۆن ژەنگ هەڵدەهێنێت.. ؟!

کەچی داویی خۆی وەکوو جنێو بەکاریدەهێنا و زۆر جار بەمی دەوت:

ـ چاوت ژەنگ هەڵێنێت..!!

ئەم ئەو جارە لێی تووڕەبوو و پێی وت:

ـ تۆ بۆچی ئەمە هەر بە من دەڵێیت و تا ئێستا گوێم لێنەبووە بە کەسێکی ترت وتبێت.. ؟!

بەڵام ئەو جارەی لە «ئاهەنگی سەرکەوتن» هاتبووەوە و لێدانی خواردبوو، بوورابووەوە و دواتر لەسەر تەختی نووستنەکەی «هالە»ی خوشکی چاویکردبووەوە، ئەو هاتە ژوورەوە و بە تووڕەیی چەرچەفە ڕەشەکەی لەسەر «جابر» لادا.. بە ئاگای هێنا و پێی وت:

ـ هەستە چاوەکانت ژەنگ هەڵێنێت، بۆچی جێگای خۆتت بەجێهێشتووە و لەسەر ئەم ئەرزە ڕەقوتەقە خەوتوویت.. ؟!

«جابر» چاوە خەواڵووەکانی هەڵبڕی و سەیرێکی ئەمی کرد.. بە سستی و وێنەی ئەو سمۆرەیەی لە تەمووزی ئەو ساڵەدا نەوتی خواردبووەوە و لەسەر کۆنکرێتە ڕەق و داخبووەکەی حەوشەدا پەلی دەکوتا.. پەلی دەکوتا و دواتر لە قەراغی باخەکە و لە تەنیشت ئینجانەی ڕەشی چوارگۆشەیی گوڵە سپییە شێوەتەشیلەییەکە گیانی دەرچوو؛ ئاوا خۆی گەیاندە لایەوە و دەستی چەپی خستە سەر ناوچەوانی.. ئەمە ئەوەندەی دیکە ترس و بیمی خستە دڵیەوە و خوێنی وشککرد.. لێوی دەلەرزی و ئامۆژنی دەکەوتەوە یاد، کاتێ بە دەستی ڕاستی گەلایەکی سپیی پانی لە لاولاوە هەڵچووەکە کردەوە و کلکە ڕەشەکەی پێگرت، تا بیباتە دەرەوە و بیخاتە ناو تەنەکەخۆڵەکەی بەر دەرگا، کە ڕۆژی پێشوو «نەعیمە کوێر» قاچی لێی هەڵنووتابوو و کەوتبوو بە سەریا.. دەست و قاچە فەوتاوەکانی لە هەوادا دەجووڵانەوە و سێبەرەکەی لەسەر کۆنکرێتی حەوشەکەدا وەکوو زەنگوڵی کەنیسە دەرکەوتبوو.. هەرکە ئامۆژنی فڕێی دا و گەڕایەوە، سەیرێکی ئەمی کرد و بزەیەکی بۆ خستە سەر لێوی.. بەڵام ئەم ئەوسا پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی تا ئاستی جومگەی دووەمی خستبووە نێوان دانەکانی و بیری لە قاچی باریکی

منالە کۆچەریەکانی شەوانی سەر خاکی قەد ئەستێرکی نوێنەکانی خۆیان دەکردەوە، کە جار جار لە کەوڵی سمۆرەیان هەڵدەکێشان و بە گورجی هەنگاویان پێ دەنان.. ئامۆژنی دەستی چەپی کردە ملیەوە و پێی وت:

ـ وەرە با بچینە بەر ئاوێنەکە ئەو عەترە بەم لە قژتا، کە خۆت حەزی لێدەکەیت، بۆئەوەی چیتر بیر لە مردنی سمۆرەکە نەکەیتەوە.

ئەمان چەند هەنگاوێکی کورتیان نابوو و هێشتا نەگەیشتبوونە ناوەڕاستی هەیوانەکە، کاتێ «جیراب»ی دەلاڵی خانوو وەکوو زۆر جاری تر بە پارچە ئاسنە چوارگۆشەییەکەی دەستی ڕاستی «تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەقتەق» لە دەرگاکەیانی دا، کە لە گوێچکەی ئەمدا بە «تعفتر.. تعفتر.. تعفتر.. تعفتر»«٥٦» دەنگیدەدایەوە و موچڕکە بە سەرتاپای گیانیدا دەهات.. دەشیزانی هەموو جارێ لەگەڵ هاتنی ئەو، ئەوان خەفەت دایاندەگرێت و ئەم هەر لە خۆبەوە ڕقی لێیان هەڵدەستێت.. ئەوەشی بەلاوە زۆر سەیرە و تەواو واقیوڕدەمێنێت، کە ئەوان ئەگەرچی بە زمانی عەرەبی قسەی لەگەڵدا دەکەن و لەمەوپێش هەموو وشەکانی بیستووە، کەچی نازانێت باسی چییە و هیچیان لێ حاڵیی نابێت.. ئیتر لە داخا بیانوویان پێدەگرێت و پێیان دەڵێت بیبەنەوە لای دایکی.. جارێکیان «سیامەند» بەناو قەیسەریی تەنەکەچیە ڕەشپۆشەکانیدا برد و ئەم وەکوو هەموو جارێ کەوتە سەرنجدانی جەمەلۆنەکانی سەری.. ئەو جەمەلۆنانەی کە هەر لە پەراسووی گوێرەکەی سووری هەڵواسراوی قەنارەی ڕەشی بەر دووکانی گۆشتفرۆشە سپیپۆشەکان دەچوون و ئەم بە بینینیان لیکێکی سەیر دەخزایە دەمیەوە.. هەر ئەوساش تەرزەیەکی ناکاو دایکرد و بێبەزەییانە کوتاینی.. لە گوێچکەی ئەمدا بە «تشتت.. تشتت.. تشتت»«٥٧» دەنگیدەدایەوە و حەزی دەکرد قسەیەکی بێسەروبەری وەکوو هی ئەو دوو ژنە شێتەی ئەمسەر و ئەوسەری قەیسەریەکە دابهێنێت، کە کتومت لە یەکتر دەچوون و جلی ڕەشی سادەیان پۆشیبوو.. ئەمیان دەستی ڕاستی گرتبوو بە چاوی چەپیدا و بەردەوام دەیوت:

ـ من لە حەژمەتی ئەوانە دەمرم، کە بیریان دەکەم و مەحاڵە چاوم پێیان بکەوێتەوە..!!

ئەویان دەستی چەپی گرتبوو بە چاوی ڕاستیدا و هەمیشە دەیوت:
ـ ئاخ..!! من چەند داماوم، کەسێ نییە بیری بکەم..!!
زۆر زۆر داوای لە مامی کرد و کۆڵێ لێی پاڕایەوە، تا بیکاتە قەڵاندۆشکانی و بە خێرایی ئەمسەر و ئەوسەری پێبکات.. ئەمسەر و ئەوسەری پێبکات و بۆ خۆی گوێ لە قسەکانیان بگرێت.. گوێیان لێبگرێت و لەگەڵیان بلێتەوە.. لەگەڵیان بلێتەوە و لە یەکتریان نزیکباتەوە.. لە یەکتریان نزیکبکاتەوە و بەراوردیان بکات.. بەراوردیان بکات و دواجار قسەیەکی زۆر جیا لە هی ئەوان بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو ڕازیی نەدەبوو و پێی دەوت:
ـ ئەوەندە بە بەردەمی ئەو تەنەکەچییانەدا بێیت و بڕۆیت، شەو خەون بە گەردەلوولەوە دەبینیت و بەیانی پەنجەکانی خۆتت لێ دەبێتە........
کاتێ گەیشتەوە ماڵ و پێڵاوەکانی داکەند، چوو بۆ مووبەق و لە بەرامبەر دەسگرەکە وەستا.. بیری لە پەیوەندیی نێوان ژنە شێتەکان و تەنەکەچییە ڕەشپۆشەکان و قەیسەریە تەنگەبەرەکە و جەمەلۆنە سوورەکانی سەریان و گەردەلوولە چڕەکان و پەنجە باریکەکانی دەکردەوە و لە خەیاڵی خۆیدا تاوتوێی دەکردن.. ئەم ماوەیەک وا چووبووە ئەقڵییەوە و زۆر جاریش وتبووی: ئەو دەسگرە لە مردن دەچێت و لەسەری دارکاریی دنیایان کردبوو.. هەر کاتێکیش بیویستایە وێنەکەی لەسەر دەفتەری نیگارکێشاندا بکێشێت و پیشانی هاوپۆلەکانی بدات، ئەوا پاکەتی بۆیەکەی لە جانتاکەی دەردەهێنا و لاکێشەیەک و چوارگۆشەیەکی کەمێ لە دووری یەکتری دەکێشا.. ئەمیان ڕەش و ئەویان سپی.. لەسەر ئەمیان وێنەی ورچێکی سپی و لەسەر ئەویان قازێکی ڕەشی دەکێشا و بە هێڵێکی سووری باریکی درێژی پێچاوپێچ بە یەکەوەی دەبەستان.. ئینجا بەرزیدەکردەوە و دەیوت:
ـ سەیرکەن من وێنەی مردنم کێشاوە..!!
دایدەنایەوە و بەدەم موچرکە و تەزووەوە دەیوت:
ـ من لە مردنەوە فێری نیگارکێشان بووم..!!
ئەو دەسگرە تاقە شتی مووبەقی ماڵەکەیان بوو ئەوەندە بمێنێتەوە و زوو

لەناونەچێت.. ئاخر یەکێ لەو جیاوازیانەی مووبەقی ئەم ماڵە و ئەوەی ئەولایان، کە ئەم هەستی پێدەکرد و لێی حاڵیی نەدەبوو، ئەوەبوو شتەکان لێرە بە پێچەوانەی ئەوانەی ئەولا زوو زوو دەگۆڕان و هی تر جێگای دەگرتنەوە.. بەڵام ئەو دەسگرە هەر دەما و هەر دەما.. مەرگی دەیان مەنجەڵ و تاوە و کتریی جۆراوجۆری بینی و هەر ما.. ڕیسوابوونی سەدان قاپی چینی و پیاڵەی نایاب و فنجانی ناسکی قاوە و پەرداخی بلووریی و سوراحیی دانسقە و دەسکەوانی گرانبەهای بینی و هەر ما.. بێشومار کەوگیر و پڵاوپاڵێو و شەکردان و خوێدان و کەوچکی ماستاو و هی چێشت و هی چا و هی دەرمانی بە زەلیلی بینی و هەر ما.. بێئەندازە گلۆپ و لامپا و چرا لە بەردەمیا سۆمای چاویان داهات و هەر ما.. بەدەرنانی کۆمەڵێ سەماوەری ڕووسیی و جامی قووڵی شووشەی نەخشینی عەجەمیی و قاڵبی جوانی کێک و کولیچەی بینی و هەر ما.. ڕاگوێزانی چەندین تەباخی بەنرخی چوارچاوە و پریمزی مسی بینی و هەر ما.. خۆڕنینەوە و سنگوتانی ئەو هەموو بۆفیە خانەدانەی بینی و هەر ما.. فرمێسکی زۆر جامی پەنجەرەی جگەرسووتاو و حەسرەتی گەلێ بۆیەی ڕەونەقداری دەرگا و دیواری بینی و هەر ما.... ئەو ڕۆژە دایکی ئەملا و ئەولای قاپە قووڵەکەی پێگرتبوو و هاتە ژوورەوە.. بە شێوەیەکی زۆر سەیر لێیان ڕاما و بە «جابر»دا هەڵشاخا:

- ئەوە تۆ هێشتا هەڵنەستاویت..؟! بڕۆ دەموچاوت بشۆ و وەرە نانەکەت بخۆ دەی..!!

چوو بۆ هەیوانەکە و هاواری لە «هالە» کرد:

- ئەوە تۆ چییت لێهات..؟! بانگی فەریال بکە و خێرا ئەو سینییە پیاڵەم بۆ بێنە.

«جابر» گوێی بە قسەی دایکی نەدا و دەستی لەسەر ناوچەوانی ئەم لانەبرد، کە بەردەوام پێی دەشێلا و لەگەڵیا ئاخی قووڵی هەڵدەکێشا.. چاوەکانی لە دوو هێلکەشەیتانۆکەی قەراغ زێی دیجلە دەچوون و ئەم حەزی دەکرد زۆر بە ئەسپایی، بەڵام چەند بڵێیت بە وریایی، بەبێ ئەوەی ئەو هەستی پێبکات و لەپڕ پێڵووەکانیان بەسەردا ڕایەڵبکات؛ دەستەکانیان بۆ درێژبکات و بە هەر دوو

پەنجەی گەورە و دۆشاومژەی دەریانبهێنێت.. دەریانبهێنێت و ڕاستەیان لەسەر ناولەپی چەپی و چەپەیان لەسەر هی ڕاستی دابنێت.. دایانبنێت و سووک سووک لە چاوەکانی خۆبانیان نزیکبکاتەوە.. جوان جوان لێیان وردبێتەوە و هەموو نهێنیی ئەم ماڵە و ئەوەی ئەولایان تیادا بدۆزێتەوە.. خۆ ئەم زۆر جار یاریی «خانووی بەتاڵ»ی لەگەڵ مامیدا کردبوو و کوڵێ پێی ئاسوودەبووبوو.. پەنجەی باڵابەرزە و دۆشاومژەی دەستی ڕاستی بۆ چاوەکانی ئەو درێژدەکرد و بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەیجوولاندن.. دەیجوولاندن و دەیوت:

ـ ئەمانە کرێچین و لە خانووی بەتاڵ دەگەڕێن.

سووک سووک لە پێڵووەکانی نزیکی دەکردنەوە و دەیوت:

ـ خانووی بەتاڵ.. خانووی بەتاڵ.

ئەو بە قەستیی دەینووقاندن و بە شێوەیەکی زۆر خۆش، کە ئەم هەر خۆی دەیزانی چەند حەزی لێدەکات و چۆن لەگەڵ موچوڕکەی زۆر بەتیندا وردەبەردەکانی بنکی ناخی وەکوو سەرەمێکوتەی بزێو بزێو دەکەونە جووڵە جووڵ، پێی دەوت:

ـ بچۆ بۆ لای جیرانی دەلاڵ.. جیرانی ناشیرین و بەدفەساڵ.

ئیتر ئەم دەپچڕا لە پێکەنینا و بەدەم قاقالێدانەوە دەیوت:

ـ چۆڵیکە.. چۆڵیکە خاوەنماڵ.

بەڵام جارێکیان زۆری پێ ناخۆشبوو و لە داخا دەستی کرد بە گریان، کە ئەو شێوەی یارییەکەی تێکدا و پێی وت:

ـ ئاخ..!! نەونەوەکەی ڕۆحم..!! من ئەوەندە لە چۆڵبوونی ماڵەکەم ناترسم، ئەوەندەی خەمی تۆمە، کە ناوێریت سەری بەسەردا بگریت.

ئەم ئەوسا تێنەگەیشت و لە داخا سەری خستە سەر ڕانی ئامۆژنی.. بەدەم هەنسکدانەوە کەوتە سەرنجدانی چاوەکانی و خەوی لێکەوت، بەڵام ئێستا تێدەگات و تازە مەحاڵە خەوی لێبکەوێت.. ئەوەندەی تر ئەژنۆکانی دەلەرزن و ئاخە قووڵ قووڵەکان گلـمتەخۆڵە تاڵ تاڵەکان بەرەو سەر زمانی دەهێنن، کە کەروێشکە بزێوەکان بە چڕنووکی تیژیان لە قووڵایی دڵیا هەڵیانکۆڵیون و لەو

قەراغەیان کەلەکەکردوون.. دەیانهێنن و هەموو ڕۆژگاری بەسەرچووی تەمەنی بیردەخەنەوە.. بیری دەخەنەوە و ناهێڵن لەوە زیاتر خۆی لە ترسەکان بشارێتەوە.. ترسی چۆڵبوونی ماڵ و گۆڕانی سیمای شتەکان.. تەواو.. تەواو.. ناتوانێت لەوە زیاتر لەناو جێگادا بمێنێتەوە و دەبێت بۆ دواجار منالیی خۆی وەکوو سمۆرە مردووەکەی بەر هەتاوی ئێجگار ئێجگار گەرمی تەمووزی سەر کاشیی زۆر زۆر داخبووی حەوشەکەیان بخاتە سەر دەستەکانی.. بیخاتە سەر دەستەکانی و گەڕەک بە گەڕەک، کۆڵان بە کۆڵان، ماڵ بە ماڵ، قوتابخانە بە قوتابخانە، تیاترۆخانە بە تیاترۆخانە، کارگە بە کارگە، حەمام بە حەمام، قەیسەری بە قەیسەری، گازینۆ بە گازینۆ، دووکان بە دووکانی «بەغا»ی پێ بکات.. بە پێپەتیی ڕابکات و بەردەوام بە تێکەڵەی ئاوازی هەموو گۆرانییە خەمناکەکانی خۆی و ئامۆژنی بلێت:

ـ ئاخ..!! من چەند گوناحم، کە هەم و گیانم لەبەرە..!!

ـ چۆن نەوال..؟! تۆ هەیت و گیانت لەبەرە، بۆیە گوناحیت..؟!

«هالە»ی خوشکی سینییە پیاڵەکەی بەم دەست و بەو دەستی گرتبوو و لە ناوەڕاستی دەرگاکەدا کز کز وەستابوو.. خەمناک خەمناک سەیری دەکرد و بە قورگی پڕ لە گریانەوە ئەو پرسیارەی لێدەکرد.. ئەم تەریقبووەوە و پەنجەکانی دەستی چەپی براکەی خستە سەر چاوەکانیەوە.. ئەوسا گوێی لە دەنگی قاپقاپەکانی «فەریال» بوو و زانی بە خۆڕایی لە پێینەکردووە، کە لەسەر کاشیەکانی ڕاڕەوەکەدا وەکوو مراوی پێی دەڕۆیشت و لە گوێچکەی ئەمدا جارێ بە «قوقعە.. قوقعە.. قوقعە.. قوقعە»«٥٨» و جارێ بە «قصاص.. قصاص.. قصاص.. قصاص» دەنگیدەدایەوە..«٥٩» دەشیزانی وا وەکوو هەموو جارێکی تر، کە خەفەتی هەیە و ناوێرێت دەریبڕێت، پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشاون و خستوونیەتە سەر سنگی.. سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیوە و چاوەکانی نووقاندووە.. ئاخی قووڵ قووڵ هەڵدەکێشێت و سووک سووک دەڵێت:

ـ ئەی کۆتاییە ئازیزەکەم، هەموویان دەتبینن و لە چاوی خۆم ونیت..!!

دایکی لە هەیوان خەریکی نانخواردنە و ئاگای لێنییە، ئەگینا هەر خۆی

دەزانێت چۆن بە تیتک ڕایدەکێشێت و بە جنێو ڕیسوای دەکات.. ئەو وا مەتەڵ بۆ «هالە» دەڵێت و ئەم گوێی لێیەتی:

ـ هو بگد الفندقه، الە میت عین مبحلقە.. شنهوه..؟

«هالە» شت نەماوە نەیڵێت و بە لای ئەموستیلەی درووماندا ناچێت.. لە کاتێکدا هەموو ئینجانەی گوڵەکانی قەراغی باخەکەیان لە شێوەی ئەموستیلەی درووماندا دروستکراون و هەرچۆنێ بڕوانێت دەکەونە بەر چاوی.. دوێنێ کە هاتەوە بینینی و بە دیاریانەوە وەستا.. سەرنجی لێ دەدان و ئەو شەرابە سوورەی بیردەکەوتەوە، کە کرابووە بوتڵێکی ڕەشی بنکسپیی وەکوو ئەموستیلەی درووماني زل و باوکی و «سیامەند» شەوێکی درەنگی سەرەتای زستانی ئەو ساڵە دەیانخواردەوە.. ئەم لە سووچی ئەوسەری ژوورەکەدا بە دەستێ بیجامەی ڕەشەوە لەسەر کورسیەکی سپیی لە حەسیردرووستکراوەوە چاوەکانی وەنەوزیان دەدا و بەحاڵ سێبەرەکانیان لەسەر ئەو مێزە لووسەدا دەبینی.. هی بوتڵەکە لە شێوەی تەڵەی مشک و هی پەرداخەکان وەکوو مشک دەردەکەوتن و ئەم موچرکەی پیادادەهات.. ژوورەکەی لێدەبووە کۆڵانێکی فرەوانی درێژی وڵاتی جنۆکە هەتاونەدیوەکان و دەستە دەستە سەربازی ڕەشپۆش ڕەشپۆش پیایدا تێدەپەڕین.. خوودەی سپیی سپیی وەکوو ئەموستیلەی درووماندا نیان کردبووە سەریان و بە پۆستاڵی سوور سوورەوە بەسەر ڕۆژژمێرەکاندا ڕایاندەکرد، کە ڕەنگی سپییان هەبوو و بە پیتی ڕەش ڕۆژ و مانگ و ساڵەکانیان لەسەر نووسرابوون.. ڕایاندەکرد و دەنگی پۆستاڵەکانیان «تأبد.. تأبد.. تأبد.. تأبد»«٦٠» لەناو کۆڵانەکەدا دەنگیدەدایەوە.. پیرەڕۆژژمێرێکی قژئالۆزکاویی چاوبەقووڵاچووی «بابل»ی لە دەرگایەکی ساجی ڕەشی بە قازنەخشاوەوە وەستابوو و جار جار بە دەنگە ماندوو و هێزلێبڕاوەکەیەوە هاواری دەکرد:

ـ خەیاڵتان خاوە.. خەیاڵتان خاوە خۆتان بدزنەوە.. ئێوە هەر دەبێت بە ئێمەدا تێپەڕن..!!

هەر لەو دەرگایە و دوای ونبوونی دوا دەستەی سوپاکە لە گەرووی کۆڵانەکە، مامی بە دەستێ جلی ڕەش و بە قیبلەنومایەکی شکاوەوە هاتە دەرێ و ئامۆژنیشی

لە دەرگـاکـەی بەرامـبـەریەوە.. ئەم ڕایدەکـرد و ئەو بە بەرد ڕاویدەنا.. سـەری لە هەموو لایەکەوە شکا و خوێنی پیادا هاتەخوارەوە.. چۆڕاوگەی خوێنێکی مەیلەو خـەست بەسـەر لاپەڕەی ڕۆژژمـێـرەکـاندا دەتکان و سـەرتاپای سـوورکـردن.. قیبلەنووماکەی گرتبوو بە سنگیەوە و تا تینی تیابوو هاواری دەکرد:

ـ شازەکەی ڕۆحم ئەوە بۆچی نەوالت نەهێناوە..؟!

«نەوال» دەسـتـەکـانی دەگـرت بەمـلا و بەولای دەمیـەوە و لـەو قـایمـتـر هاواری دەکرد:

ـ قـیبلەنووماکە فـڕێدە و دەسـتـەکانت بگرە بە سەرتـەوە با ئەو هەموو خوێنەیان لێنەیەت.

کەچی ئەو گوێی لێی نەدەبوو و بەردەوام دەیوت:

ـ شازەکەی ڕۆحم ئەوە بۆچی نەوالت نەهێناوە..؟!

ـ ئەوەتام.. ئەوەتا لێـرەم.. لەسـەر ڕۆژژمـێـرێکی خـوێناویی وەسـتـاوم و سەیرتدەکەم.. دەستەکانت بگرە بە سەرتەوە مامە ڕۆحەکەم با لەوە زیاتر.......

بەدوایاندا ڕایدەکـرد و شـوێنپـێـکانی لە شـێـوەی تەڵـەمـشک و قـوتابخـانە بەجێدەمان.. هەرچەند لایدەکردەوە و سەیریدەکردن، لە ترسا زیرەیدەکرد و دەیوت:

ـ فـریامکەون..!! من لەناو ڕۆژژمـێـرە خـوێناویەکـاندا گـوم دەبم.. تۆ مـامـە سیامەند قیبلەنووماکەت فـڕێدە و دەستەکانت بگرە بە برینەکانتەوە، با ئەو هەموو خوێنەت....

«شـازە» هەر زوو زوو بەدەم زروکـوهووڕەوە دادەنەویەوە و خـەمناک خـەمناک، گـوناه گـوناه، بەم دەست و بەو دەست لە درزی کـەمێ فـرەوانی نێـوان ڕۆژژمـێـرە لاکێشەییە ئێجگار ئەستوورەکاندا بەردی خڕ خڕی لووس لووسی ڕەش ڕەش و هی پان پانی زبر زبری سـپـی سـپـی دەردەهێنا.. دەریدەهێنان و دەیدان بە یەکـا.. دەیدان بە یـەکـا و دەنگێکی سـەیریان لێـبـەرزدەبووەوە.. لە گـوێـچکەی ئەمـدا بە «عطن عـقم.. عـقم عطن.. عطن عـقم.. عـقم عطن» «٦١» دەنگـیـدەدایەوە و بەبێ ویست دەیوت:

ـ ئامـۆژن گـیـان تۆ لێـمـەوە نـزیکـتـری و فـریامکەوە.. قـوربانـت بم ئامـۆژنە

ڕۆحەکەم بەردێ لەم بەردە سەیرانە بکێشە بە سەرما و لەسەر ڕۆژژمێرێکا کۆتاییم پێبێنە.

کەچی ئەو لەبەر زروکوهووڕی خۆی گوێی لەم نەدەبوو و تا هێزی تیابوو دەیگرتنە مێردەکەی.. تێیدەگرتن و نیشانی دەپێکا:

ـ شازەکەی ڕۆحم ئەوە بۆچی نەوالت نەهێناوە..؟!

ـ منیش هاتووم.. منیش هاتووم.. دەرگای ماڵێک بکەرەوە و خۆتی پیاکە، یا لەوە زیاتر....

بەڵام خۆ دەرگاکانیش سەرتاپایان بە ڕۆژژمێر گیرابوون و زۆر زەحمەتبوو بکرێنەوە.. گۆزەی ڕەش ڕەشی بچووک و بچووکتر، گەورە و گەورەتر لەسەر دیوارەکان ڕیزکرابوون و تک تک دڵۆپەئاوی سپی سپیی ورد و وردتر، درشت و درشتتریان لێ دەهاتە خوارێ.. دواتر تێکەڵ بە یەکتربوون و جۆگەیەکی گەورەی سووریان پێکهێنا.. سەرەمێکوتەی ڕەش ڕەش و هی سپی سپیی بزێو بزێو مەلەیان تیادا دەکرد و تیژ تیژ ڕێگایان دەبڕی.. «شاناز»، ئەم جەمسەر و ئەو جەمسەری قەیتانی ڕەشی باریکی پێڵاوە سپیەکانی توند توند لە یەکتر گرێدابوون و وەکوو ملوانکە لە ملیکردبوون، کە لە چەرمی خۆشکراوی سمۆرە دروستکرابوون و تک تک شلەیەکی خەستیان لێدەچۆڕایەوە.. بە دەستێ جلی ڕەشی چەرمینی، وەکوو ئەوانەی سوارچاکەکانی سەردەمە زووەکانی ئەورووپا لەبەریاندەکرد و ئەم زۆر جار لە سینەما دیبوونی؛ لەوسەری کۆڵانەکەوە دەهات و تا ئەژنۆی لەناو جۆگەکەدا نقوومبووبوو.. گورج گورج دەهات و شلێپ شلێپ دەستەکانی لەسەر ڕووی ئاوەکە دەکوتا.. دەهات و بەدەم گریانی ئێجگار بەکوڵەوە دەیوت:

ـ زۆر دەمێکە تەنیایی خۆمم لەناو ڕۆژژمێرەکاندا گومکردووە، وا ئێستا هاتووم و بۆی دەگەڕێم.

هەر ئەوەندەش لە «سیامەند» تێپەڕبوو و گەیشتە ئاستی «شازە»ی تاقە خوشکی، خێرا پەلاماری قژی دا و لە دەستەکانی خۆی ئاڵاند.. بە هێز بە هێز سەری لە ئاوەکەدا نقوومدەکرد و بە لەقەی قایم قایم لە پشتی دەدا.. «شازە»

ورده ورده ڕەنگی دەگۆڕا و سووک سووک هێزی تیادا نەدەما.. تا بە جارێ گیانی دەرچوو و نقوومبوو.. دەستەکانی نەبێت، لەملا و لەولاوە لە شێوەی دەسگرەکەی ماڵی خۆیان سەرئاوکەوتبوون و بەرەو خوار ڕێیاندەکرد.. ئاوەکەش بەردەوام زیادیدەکرد و بەرەو سەروو هەڵدەکشا.. ئەم ئەوسا خۆیشی نەیدەزانی چۆن ئەوێی بەجێهێشتبوو و گەیشتبووە سەر ئەو کۆشکە بەرزەی، کە لە شێوەی شووشەمەرەکەب دروستکرابوو و دەیڕوانییە ناو کۆڵان و سەربانەکان.. ئەو سەربانانەی، کە پیاوە ڕەشپۆشە لەیەکچووەکان بە ڕیز دەستیان خستبووە سەر پەرژینە سپیەکانیان و ناوچەوانیان شل و خاو خستبووە سەریان.. هەر دەتوت یاریی «ختیلە»«٦٢» دەکەن و سوێندیان بە هەموو کتێبە پیرۆزەکانی ئاسمان و زەوی خواردووە، ئیتر هەڵیاننەبڕن و تا ماون وەکوو پەیکەر جووڵە نەکەن.. خۆ ئەم زۆر دەستی گرت بەملا و بەولای دەمیەوەوە و تا تینی تیابوو هاواری کرد:

ـ وریای خۆتان بن مامەکانم..!! وریای خۆتان بن..!! لەگەڵ ئێوەمە، ئەوە بۆچی گوێم لێناگرن..؟! وا خەریکە لافاو ڕاپێچی ناو ڕۆژژمێرەکانتان دەکات..!! ئەوە ئێوە......

کەچی ئەمان نەجووڵان و نەجووڵان.. گۆزەکان بە ژێر ئاوی خۆیان کەوتن و سیمای کۆڵان گۆڕا.. ئەمان نەجووڵان و نەجووڵان.. ئاو گەیشتە سەربان و تا تەوقی سەریان هات.. ئەمان نەجووڵان و نەجووڵان.. ئەم لەگەڵ دەنگی ئامۆژنی بە ئاگاهاتەوە و چاوەکانی کردەوەوە.. ئەمان نەجووڵان و نەجووڵان.. ئەو پەنجەکانی دەستی چەپی خستبووە سەر سنگی ئەم و پێی دەوت:

ـ ئەوەندە سەیری ئەم ڕۆژژمێرە مەکە چاوەکەم، نەوەکا خەون بە مامۆستای ماتماتیکەوە ببینیت..!!

مەبەستی ئەو ڕۆژژمێرە ڕەشە چوارگۆشەییەی دیوارەکەی پشتی مێردەکەی بوو و بە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی ئاماژەی بۆ دەکرد، کە بە پەتێکی سوور هەڵواسرابوو و بە ڕەشی تۆخ (چوار)ی (دوو)ی لەسەر نووسرابوو.. ئەم هەر زوو زوو دەچووە سەر کورسیەکە و لاپەڕەیەکی لێدەکردەوە.. مامی هەموو جارێ سەری بادەدا و بە نارەزاییەوە بە ژنەکەی دەوت:

ـ ئەو ڕۆژژمێرە لەبەر ئەم کچەتیوە فڕی بەسەر دنیاوە نەماوە، هەمووی شێواندووە..!!

ئەویش قاقای لێ دەدا و دەیوت:

ـ مۆرانەیە.. مۆرانە.. مۆرانەی ڕۆژژمێرە..!!

ئەو شەوەی «ثورە»ی دایکی «ڕەندە»ی دراوسێیان نەشتەرگەریی مەمکی چەپی بۆ کرا و مرد، ئامۆژنی کاتێ دەستەکانی بە کرێمی سپیی ناو قوتووە ڕەشەکە چەوردەکرد و بۆنەکەی بە ژووردا بڵاوبووەوە، سەیرێکی ڕۆژژمێرەکەی کرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، کە گەیشتبووە سەر (حەڤدە)ی (حەوت) و لە ژێر تیشکی گڵۆپە سپییەکەدا دەبریسکایەوە.. ئینجا ڕوویکردە ئەم و پێی وت:

ـ چەند زوو تەمووزت هێنا ڕۆحەکەم، خۆ هێشتا بەهار نەهاتووە..!!

ئەم سەیری دەستەکانی ئەوی دەکرد و بیری لە نهێنیی ئەو کرێمە دەکردەوە، کە هەر جارێ کەسێ لەو خەستەخانەیە نەشتەرگەریی بۆ بکرێت و بمرێت، ئەو دەیهێنێت و دەستەکانی خۆی پێ چەور دەکات.. یەکسەریش ئەو قەیسەریە کەمێ تاریکەی بیردەکەوێتەوە و خەیاڵی تیایدا دەکەوێتە جرتوفرت، کە پیاوە ڕەشپۆشەکان پەنیری پێستەی تیادا دەفرۆشن و بۆنەکەی کتومت لە کفنی ڕزیوی مردوو دەچێت.. زۆر جاریش موچورکی پیادا هاتووە و لە خۆی پرسیوە:

ـ من لە کوێ کفنی ڕزیوی مردووم بینیوە، تا بزانم بۆنەکەی لە پەنیری پێستە دەچێت..؟!

ئەو جارە کە بە دەستی چەپدا پێچیان کردەوە و پێیان خستە کۆڵانی عەتارەکان، ئەم بووکێکی گۆشتنی ڕەشی زۆر جوانی لە دووکانی سەر سووچەکەی دەستی ڕاستدا بینی و وڕکی بۆ گرت.. «شازە» بۆی کڕی و بە دەنگێ، کە دەتوت لەوەتەی هەیە لەناو قەدی موچورک و تەزووەکانی ناخیدا بۆی هەڵگرتووە و وا ئێستا دەریدەخات، پێی وت:

ـ من هەر لە سەرەتاوە ڕازیی بووم بۆت بکڕم، بەڵام حەزمکرد بۆی بگریت..!!

ـ بۆچی..؟!

ـ بۆئەوەی فرمێسکەکانت ببینم..!!

ـ فرمێسکەکانی من ببینیت..؟! بۆچی..؟! تووخوا بۆچی..؟!

ـ چونکە تاقە شتێ لەم بازاڕەدا شایانی ئەوەبن فرمێسکیان بۆ بڕژێت و من دڵم پێی خۆشبێت، بووکەشووشەکانن.

ـ ئەوە تۆ دەڵێی چی ئامۆژنە ڕۆحەکەم..؟! خۆ من هیچ لە تۆ تێناگەم..!!

ـ دەڵێم بۆی بگری نەوالەکەی دڵم..!! بۆی بگری..!!

ـ بەڵام ناتوانم چیپتر بۆی بگریم..!! ناتوانم..!!

کەچی کاتێ چوونەوە ماڵ و لە پارچەیەک خامی سپیی پێچا.. تێوەی پێچا و خستیە ناو ئەو چاڵەی، کە بە دزیی ئامۆژنی لە شێوەی ئەموستیلەی دروومان و بە چەقۆیەکی دەسکسپی لە ژێر دارهەنجیرەکەدا هەڵیکەندبوو و خۆڵە وردەکەی بۆنی «یانسون»«٦٣»ی لێدەهات؛ دەستی کرد بە گریان و فرمێسکەکان دڵۆپ دڵۆپ، ورد ورد، تک تک، سووک سووک، کپ کپ بەسەر گۆنایدا هاتنە خوارێ.. بەم دەست و بەو دەست خۆڵەکەی دەکرد بەسەر تەرمی کفنکراوی بووکەکەیدا بەدەم گریانەوە گۆرانیی بۆ دەوت:

ألف روح مثل روحي أضحي لک

ألف عين مثل عيني أبچي لک

أنا ساکت وخلي الناس تحچي لک

يولفي اشصار بي و جرا لي

شلون تگضي بلفرگه ليالي

دموع العين تحچي لک يغالي

من دون الحبايب أنت عندي غايب

أنا ساکت وخلي الناس تحچي لک«٦٤»

ئەمە ئەو شوێنە بوو، کە هەموو جارێ کۆترە سپیە چاوجوانەکە لەسەری هەڵدەنیشت و نێرە ڕەشە دەنووککورتەکە بە سەریا دەتسی.. ئەم ئەوسا لە هەموو شتێ زیاتر بەو چاوە زۆر ڕەش و ئێجگار ئەفسووناویانەی مێیەکە سەرسامدەبوو و چەند بڵێیت بە دیقەت سەرنجی لێ دەدان، کە لە قۆزاخەی لۆکەی بەر هەتاوی گەرم دەچوون و بە شێوەیەکی گەلێ سەیر دەترووکان.. دەترووکان و هەڵدەهاتن..

دەترووکان و هەڵدەهاتن.. هەر جارێکیش بچووایە بۆ مووبەق و لە ڕووی چەقۆ نیکلە دەسکڕەشەکەدا سەیری چاوەکانی خۆی بکردایە، کە لە تیپێکی مۆسیقای گەڕۆکی قەرەجەکان کەوتبوو و ئەمان هەڵیانگرتبووەوە؛ چاوەکانی خۆی وەکوو هی ئەو دەبینی و موچورکی پیادا دەهات.. دەمولێوی دەلەرزی و دەیوت:

ـ چاوەکانم لە هی کۆترە مێیەکە دەچن و بەملا و بەولای چەقۆ تیژەکەوە دەدرەوشێنەوە..!!

ئەو جارە، کە لە کۆڵان هاتەوە و مامی بینی، هەر بەو چەقۆیە و لە هەمان شوێندا باڵەکانی خستبووە ژێر قاچی چەپی و بە دەستی ڕاستی سەری بڕی؛ ئەم لە زرووکەی گریانی دا و چوو بە دەستی ڕاستی سەرە خوێناویەکەی هەڵگرتەوە.. هەڵیگرتەوە و خستیە ناولەپی دەستی چەپیەوە.. وەکوو سەرەمێکوتە سست سست دەجووڵایەوە و بەحاڵ بەحاڵ دەنووک و چاوەکانی دەکردەوە.. «شازە» لە هەیوان شەکردانە سپیە چوارگۆشەییەکەی نووساندبوو بە سنگیەوە و بە پەنجەکانی پیایدا دەکێشا، کە سەرتاپای بە وێنەی ئەموستیلەی ڕەشی دروومان ڕازابووەوە بە ڕەنگی سپی و بە زمانی ئینگلیزی لەسەر سەرقاپە ڕەشەکەی نووسرابوو «Barren»«٦٥».. قژی کردبوو بە دوو پرچی درێژی بەقەدەر یەک و وەکوو شێت بەملا و بەولادا ڕایدەوەشاندن.. ڕایدەوەشاندن و دەیوت:

ـ بەیانی یەکی ئەیلوولە و ئەمڕۆ خەستەخانە پڕ دەبێت لە لاشەی مردوو و بریندارى ئەو سوارانەی لە شاخە هەتاونەدیوەکانەوە دێنە خوارێ و بەر گوللەی چەتە کلاوقووچەکانی ئەمبەر و ئەوبەر دەکەون..!!

دەنگی لێدانی پەنجەکانیشی لە شەکردانەکە جارێ بە «طرمساء.. طرمساء.. طرمساء.. طرمساء»«٦٦» و جارێ بە «درج.. درج.. درج.. درج»«٦٧» لە گوێچکەی ئەمدا دەزرینگایەوە و چاوەکانی دەکەوتنە ڕەشکەوپێشکە.. دەنووک و چاوەکانی سەری کۆترەکەی ناولەپی لەسەر هەمان ڕێتم دەکرانەوە و دادەخران.. دادەخران و دەکرانەوە.. دەکرانەوە و دادەخران.. جەستەکەیشی لەسەر خۆڵە شێدارەکە هەڵدەپەڕی و ئەم وەکوو جەزمەی ماسیفرۆشە ڕەشپۆشەکەی لای ستۆدیۆکەی مامی دەهاتە بەرچاوی.. مەراقی بوو بزانێت ئەو جەزمەیە لە چی درووستکراوە و ئەو

بۆنە سەیرە چییە لێوەی دێت، کەچی مەحاڵبوو لێی تێبگات و ئەو مەتەڵەی بۆ شیتەڵبێت.. هەر جارێکیش بۆ ماسیگرین بچوونایە بۆ لای و لە دایکی بپرسیایە، ئەو پێی دەوت هەر بۆنی ماسیەکانە و لە کۆڵ خۆی دەکردەوە، بەڵام ئەم وازی نەدەهێنا و دەیتوانی بۆنی ئەمان و هی ماسیەکان لە یەکتر جیابکاتەوە.. هەستی دەکرد هەمان بۆنی خۆڵی ژێر دارهەنجیرەکەیە و هەمیشە لە خەیاڵی خۆیدا بەراوردی دەکردن.. ئەو ڕۆژەی دایکی دوانە لەیەکچووەکەی لەبارچوو و شەو لە خەستەخانە مایەوە، کاتێ ئەم و «هالە»ی پووری لە پاسەکە دابەزین و گەیشتنە سەر سووچی خەستەخانەکە، ئەویان بینی و وەکوو خەڵکەکەی تر لەسەر شۆستەکە وەستان، کە لە پێشی پێشی پێشی ئەو ڕێپێوانەدا دەڕۆیشت و بەو گەرما پڕووکێنەرەی ئاب جەزمەکانی لە پێکردبوو، ئەوەی خۆشەویستانی سەرۆکی بەرگری بە بۆنەی زیادکردنی مانگانەی سەرباز ڕێکیانخستبوو.. پشتاوپشت دەڕۆیشت و دەستە ڕەق و تووکنەکانی ڕادەشەقاند، کە هەر لە پایدەری پایسکیل دەچوون و دەمارەکانیان وەکوو دڕکەزیی دەرکەوتبوون.. ڕایدەشەقاندن و تا تینی تیابوو هاواری دەکرد:

ـ أرله.. غرله.. قلفه.. غلفه.«٦٨»

ئەوانی دواوەی تێکڕا دەستەکانیان بەرزدەکردەوە و قایم و هاوئاهەنگ دەیانوت:

ـ سلێ.. أسلێ.. سلێ.. أسلێ.«٦٩»

ـ أرله.. غرله.. قلفه.. غلفه.

ـ سلێ.. أسلێ.. سلێ.. أسلێ.

کاتێ گەیشتنە ئاستی ئەمان و بۆنەکەی هەڵمژی، تەواو بۆی دەرکەوت بۆنێکی جیایە لە هی ماسی و ڕێک وەکوو بۆنی خۆڵی ژێر دارهەنجیرەکەی خۆیان وایە.. ئەوەندەی تر بیری لێکردەوە و مەراقەکەی زیادی کرد.. ئاخۆ لە چی دروستکراوە و ئەو چەرمە سەیرە چییە، کە لە چەرمی هیچ پێڵاوێکی تر ناچێت و هەرگیز کۆن نابێت.. بەڵام زۆر چاک دەیزانی و هەر لە زووەوەش بۆی دەرکەوتبوو، کە بۆنی خۆڵەکە هی خوێنی کۆتر و مریشک و کەڵەشێر و قەل و

بەرخەکانە و هەر بۆیەشە هەمیشە شێدارە، ئەگەرچی لەوە تێنەدەگەیشت و ئەونهێنییەی بۆ ئاشکرا نەدەبوو، ئاخۆ بۆچی هەر هەموویان لەوێ سەردەبڕان و بۆ شوێنێکی تریان نەدەبردن..!! ئەو جارەش لە کۆڵان، لە گەرمەی یاریی «هیلا یا رمانە»«٧٠»دا بووکەکەی بیرکەوتەوە و ڕایکردە ماڵەوە.. هەرچەند منالآن بانگیان کرد و پێیان وت:

ـ وەرە نەوال بۆ کوێ دەچیت..؟! خۆ تەواومان نەکردووە..!!

کەچی ئەم گوێی لێنەگرتن و نەگەڕایەوە.. کاتێ خۆڵەکەی هەڵکۆڵی و دەریهێنا.. دەریهێنا و لە لووتی خۆی نزیکیکردەوە.. بۆنیکرد و چاوەکانی لەگەڵ نووقاند؛ هەستی کرد نە بۆنی پەنیری پێستەیە و نە هی کفنی ڕزیوی مردوو، نە هی جەزمەی ماسیفرۆشەکە و نە هی خوێنی باڵندە و ئاژەڵەکانیش، بەڵکوو هی مەکینەی ئاوپرژێنە سپیەکەی ماڵی «هیام»ـە و زیاتر هەڵیمژی، کە شێوەیەکی قووچەکیی هەیە و بە کارەبا ئیشدەکات.. لە ناوەڕاستی چیمەنە چوارگۆشەییەکەی حەوشە لاکێشەییەکەی دواوەیان دەخولێتەوە و لە لوولە ڕەشە باریکەکانیەوە ئاوێکی سپیی تیژ دەردەچێت.. ئەم و «هیام» چمکی کراسیان تا سەر ئەژنۆیان هەڵدەکەن و بازیان بە سەردا هەڵدەدەن.. یارییەکی تا بڵێی خۆشە و ئەم زۆر حەزی لێدەکات.. هەر کامیان قاچی بکەوێتە سەر ئاوێ لە ئاوەکان و تەربێت، دۆڕاوە و دەبێت دانیشێت.. زۆربەی جارەکان «هیام» دەیباتەوە و ئەم پەسستدەبێت.. بەم دەست و بەو دەست دڵۆپەئاوە ورد و شێدارەکان لە قاچەکانی دەتەکێنێت و پێی دەڵێت:

ـ ئاخر تۆ گەورەتری و قاچەکانت درێژترن، بۆیە من دەدۆڕێم..!!

ئەویش دیقە دیقەی پێدەکات و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی دەڵێت:

ـ نا.. نا.. لەبەر ئەوە نییە..!! لەبەر ئەوە نییە..!!

ـ ئەی لەبەر ئەوەیە، هی خۆتانە، تۆ زۆر یارییت کردووە و.....؟!

ـ چک..!! چک..!! نەتزانی..!! لەلەلا..!! تۆ نایزانی..!!

ئەو جارە «فەریال» قاپقاپە ڕەشەکانی داکەند و چەپەی لە دەستی ڕاستی و ڕاستەی لە دەستی چەپییەوە هەڵکێشا، کە هی «عەفیفە»ی نەنکی «هیام» بوون

و به دزییەوە لە کانتۆرە ڕەشەکەی هێنابوونە دەرێ.. تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق، بنەکانیانی دەدا بە یەکا و بە سەر ئاوەکاندا بازی دەدا.. بازی دەدا و وەکوو شێت دەیوت:

ـ لە برسیەتیی خۆتانا تێرمانکەن.. تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق.. لە تینوێتیی خۆتانا ئاومان بدەنێ.. تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق.. لە ڕووتیی خۆتانا بمانپۆشن.. تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق.. لە نەزانیی خۆتانا ئاقڵمانکەن.. تەقتەتەق تەتەق.. تەقتەتەق تەتەق....

پاسەوانەکانی سەربان، کە دەستەکانیان خستبووە سەر پەرژینەکە و سەیریان دەکردن، لە قاقای پێکەنینیان دا و چاوجوانەکەیان وتی:

ـ ئینجا بە پێچەوانەوە بخولێرەوە و قسەکانیش هەڵگێڕەرەوە..!!

ئەو گوێی لێ نەبوو و نەوەستا.. تاوێ دواتر، دایکی لە دەرگای مووبەقەکەوە هاتە دەرێ و هاواری کرد:

ـ ئەو قاپقاپانە بکەرە پێت و واز لەم قسە ناشیرینانە بێنە، ئەگینا دێم بە قژ ڕاتدەکێشم..!!

ئەوسا ئەو سڵیکردەوە و بەرەو لای هەیوانەکە ڕایکرد.. لەوێ قاپقاپەکانی لە قاچی هەڵکێشا و کردی بە تەقەتەق، کە لە گوێچکەی ئەمدا جارێ بە «قتم.. قتم.. قتم.. قتم»«٧١» و جارێ بە «قرف.. قرف.. قرف.. قرف»«٧٢» دەنگیدەدایەوە و موچوڕکەی پیادا دەهات.. بۆ ژوورەوە دەچوو و بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەیوت:

ـ پارچەیەک خامی سپیمان تێوەپێچن و لەناو ڕۆژژمێرەکاندا بماننێژن.

**ـ دایکە ئەوە بۆچی فەریال ئەو قاپقاپانەی کردۆتە پێی و دەڵێت: ئەی کۆتاییە نازیزەکەم......؟!**

«هالە»ی خوشکی وەک بیەوێت خۆی لە وەڵامی مەتەڵەکە بدزێتەوە و دایکی لە یەخەی خۆی بکاتەوە، ئەمەی لێ پرسی و ئەو پێی وت:

ـ تۆ واز لەو بێنە و پێم بڵێ: چۆن دەتوانین دڵنیابین، کە ئەم ژیانەی ئێمە خەون نییە..؟!

ئەمە ئەو وتەیەیە، کە ئەم لە «دیکارت»ی وەرگرتووە و بە ڕەشێکی تۆخ تۆخ

لەسەر بەرگی ناوەوەی هەموو کتێبەکانی خۆی نووسیوە.. ئێستا لە هەموو کاتێکی تر زیاتر ئەم مەتەڵە سەربەگۆبەندە ناخ و مێشکی دەهەژەنێت و دەتوانێت بە چاکی ژنەقەرجە ڕەشپۆشەکە بیری خۆی بخاتەوە، ئەوەی لە کاتی خۆرئاوابوونی پایزێکی درەنگوەختدا لە پەنا گازینۆیەکی لە حەسیردرووستکراوی سەر زێی «دیجلە»دا منالێکی شەشپەنجەی بوو و هەر خۆی بە چەقۆیەکی ڕەشی دەسکسپی لە بنا بۆی قرتاند.. خۆیشی نازانێت بۆچی هەموو بیرکردنەوەیەک لەو وتەیە ئەمەی بیردەخاتەوە و هاوکاتیش هەست بە ئازاری ژێرمووسەڵانی دەکات، ئەوە نەبێت ئەو پەڕۆ سپییەی بە وێنەی قوفڵی ڕەشی بچووک بچووک نەخشابوو و ئەو ناوچەوانی خۆی پێ بەستبوو، لە بەرگی کتێبی مێژووی پۆلی چوار و ئەوەی منالەکەی تێوەپێچا لە دەسگرەکەی مووبەقی خۆیان دەچوو.. بەڵام ئەو گۆرانییەی بەدەم گریان و لەگەڵ ژانی پێش بوون و کاتی بوون و دوای بوونا بۆی دەوت و بە ئاسانی دەگەیشتە گوێچکەی پیاوە ڕەشپۆش و ماندووەکانی سەر کورسیە چەپوچیرە سپیەکانی ناو گازینۆ و بەردەمەکەی، دەگەیشت و لە جووڵەی دەخستن؛ ئەم نەیدەتوانی لاسایی بکاتەوە و دواتر نە لە دڵی خۆیدا و نە بۆ هیچ کەسێکی تری بڵێت.. جارێ بەر لە هەرچی ئەم لە زمانەکەی نەدەگەیشت و ئاوازەکەیشی زەحمەتبوو بە یەک جار لەبەر بکرێت.. سەرەڕای ئەمەش ئەم هەموو خەیاڵێکی لای ئەو پەنجە بچکۆلەیە بوو و لێی وردەبووەوە، کە هەڵیدایە قەراغی ئاوەکە و دواتر نەورەسێکی ڕەشی کلکسپی پری پیاکرد.. بۆ ئاسمان هەڵفڕی و پۆلێ نەورەسی سپیی کلکڕەشی تر دوای کەوتن.. هەرچەند دووردەکەوتنەوە و بچووکدەبوونەوە، دیمەنەکەیان دەگۆڕا و شێوەی سەیر سەیریان بە خۆیانەوە دەگرت.. جارێ وەکوو نەخشی سەر مافوورەکەی قەد دیواری ژوورەکەی «شاناز» و جارێ وەکوو ئینجانەی گوڵی باخەکەی خۆیان، جار جار وەکوو بەرگی ئینجیلەکەی ماڵی «مەرجان» و جار جاریش وەکوو ڕۆژژمێرەکەی ژووری میوان دەردەکەوتن و خەیاڵی ئەمیان پەرش و بڵاودەکردەوە.. لەو جارەوە هەرچەند پەنجەکانی خۆی بخستایەتە سەر چاوەکانی و پێڵووەکانی دابخستنایە، ئەو دیمەنەی بیردەکەوتەوە و دەنگی گریانی منالە ساواکە و گۆرانیی دایکەکەی لە گوێچکەیدا دەزرنگایەوە،

کەچی هەر نەیتوانی فێری بێت و بیلێتەوە.... بەڵام ئەو پەنجانەی ئێستا چاوەکانیان داخستووە و هەست بە کرتەکرتی دەمارە باریکەکانیان دەکات، هی «جابر»ـە و لە هەموو شتێ زیاتر گومانیان لێدەکات.. «مەهاباد»ی پاڵەوانی سەرەکیی چیرۆکی نیوەناچڵی «گۆڕی بەکۆمەڵی نێوان پەنجەکانم»، کە چەند ڕۆژێ پێش چوونی بۆ ئاهەنگی سەرکەوتن نووسی و بۆ «مەنار» و «مەسار»ی دراوسێیانی خوێندەوە، هەموو ژیانی خۆی بۆ بژاردنی پەنجەکانی تەرخاندەکات و هەر لێی تێناگات.. ئەویش سەربەگۆبەندێکە وەکوو خۆی و هەمیشە دەڵێت:

ـ ژیان نامەیەکە و لە خەودا و نازانین بۆ کێی دەنووسین، بەئاگاییش ئەو تێبینیە کورت و بێسەروبەرەیە، کە لەسەر مێزی پۆستخانە و زۆر بە پەلە و ناشزانین بۆچی، دەیخەینە سەر زەرفەکەی.

ئێستا لە هەموو کاتێکی تر زیاتر جیاکردنەوەی خەون و ڕاستیی لێدەبێتە خەم و ئەوەندەی تر لە ئاست ئەو تەلیسمە بەسامەدا خۆی بە بچووک و دەستەپاچە دەزانێت.. کەچی هاوکات مردنی «سیامەند»ی بە خەیاڵ دانایەت و هیچ پێویستی بەوە نییە چارەنووسەکەی بزانێت.. ئامۆژنی پێش ئەوەی بە تەواوی شێت بێت و بە جارێ ئەقڵی خۆی لە دەست بدات، شەوانە ئینجانەیەکی ڕەشی گەورەی بەتاڵی دەهێنا و تیر تیر بۆنەکەی ناوی هەڵدەمژی، کە زوو زوو لەگەڵ لەقلەقێکی شووشەی سپیی چاوڕەشدا لە هەڕاجی کەلوپەلەکانی دایەرەی «نفووس و سەرژمێری»یان کڕیبوو و گوڵێکی سپیی داماویان تیادا ڕوواندبوو.. بە چمکی کراسە سپیەکەی قەراغەکانی دەسڕی و دایدەنا.. هەندێ جار قاچەکانی و هەندێ جاریش دەستەکانی بە جووتکراوی تێدەخست و لەسەر دەم پاڵدەکەوت.. پاڵدەکەوت و بیری دەکردەوە.. بیری دەکردەوە و هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا.. هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و هی قووڵتری دەدایەوە.. ئەم بە دیاریەوە دادەنیشت و سەرنجی لێ دەدا.. هەستی دەکرد لە مناڵیی سێبەری شتێکی سەیری لەسەر دیواری هەیوانی ماڵی «عەمار»دا بینیوە و بە لایەوە ناشیرین بووە، بەڵام بیرینەدەکەوتەوە چییە و خەفەت دایدەگرت.. ئەوسا دەستەکانی گرتبوو بە چاویەوە و وتبووی:

ـ سێبەرەکان بە هەتاو بشۆن، با قێزیان لێنەکەمەوە..!!

ئەو جارە مامی پەتوویێکی ڕەشی هێڵداری لە ژوورە تاریکەکەی ئازووقە هێنا و ژنەکەی پێ داپۆشی، کە ئەم شەوی بوومەلەرزەکە لە ژێریا خەونی بە پۆلیسی هاتوچۆوە بینیبوو و بە پێپەتیی بەسەر هێڵە داخبووەکانی سەر شەقامی «تەمووز»دا ڕاکەڕاکی کردبوو.. ئینجا بە دەنگێ، کە هەر دەتوت بە شێلەی گۆرانی خووساوە و بە ژێی کەمانی «دیلهام» و «ریهام» سازاندوویانە، لێی پرسی:

ـ دەزانی بۆچی ئاوا دەکات..؟!

ئەم بەبێ ئەوەی نیگای چاوەکانی لەسەر ئامۆژنی بگوێزێتەوە و سەیری دەمی ئەو بکات، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

ـ من هیچ لە ئێوە تێناگەم..!!

ئەو دەستەکانی گرت بەملا و بەولای سەری خۆیەوە و وتی:

ـ حەز دەکات لەناو ئینجانەی ئەو گوڵەدا بمرێت، کە خۆشیدەویست و ناوەکەی نەدەزانی..!!

ئەم نەچووە ئەقڵیەوە و خێسەیەکی لێکرد.. چاکتر سەرنجی لێی دا و زیاتر بیری لێیکردەوە.. سەیری قاچە ڕووتەکانی کرد و لێیان وردبووەوە، کە لەگەڵ خوراندنی زۆردا سوورهەڵگەڕابوون و هێڵی باریک و باریکتر، ئەستوور و ئەستوورتری ستوونییان لەسەر نەخشابوون.. لەبەر تیشکی گڵۆپە سپییە ئاسۆییەکەی سەر سەریان و لەناو ئینجانە قووچەکیەکەدا دەدرەوشانەوە و چێشتی چلەفڕایان بیری ئەم دەخستەوە.. دوایی لەپڕ سەری هەڵبڕی و پێی وت:

ـ ئامۆژنم دەیەوێ بڵێت: جیاوازیی لە نێوان ژیان و مردن، خەون و ڕاستی، چاک و خراپ، خۆشەویستی و ڕقدا نییە، مادام ڕەنگەکان بەشی جوانکردنی گوڵێک ناکەن..!!

ئێستا «سیامەند» مابێت و نەمابێت، بۆ ئەم هیچ جیاوازیەکی نییە و بە خەیاڵیدانایەت.. دەشێ ئەو و «شازە» خەون بن و بێجگە لەم کەسی تر نەیدیبن.. بەڵێ، ڕێیتێدەچێت ئەوان خەون و «شاناز» خەونی ناو خەونەکانی

بێت و بە سووکە ڕاچەنینێک بتوێنەوە.. ڕاچەنینێک، کە ترسناکترین بێداربوونەوەی ئەمی پێوەیە و نازانێت لە چ ژووریێ، ماڵێ، کۆلانێ، گەڕەکێ، قەیسەریێ، بازاڕێ، شارێ، ولاتێ، کێشوەرێ، جیهانێ چاودەکاتەوە.. جیهانێک، کە لەسەر پشتی «ئەسپیدیلۆن» بنیاتنراوە و لەگەڵ خۆڕاوەشاندنێکی زۆر هێمنانەدا، ورد و درشت هەڵدەگێڕێتەوە و مانای هەموو شتەکان دەگۆڕێت.. لەوانەیشە هەر هەموویان لە «فەریال» و «هالە»ی خوشکی و «جابر»ی برایەوە تا دایکی و باوکی و ئەوانەی تر پاڵەوانی ڕۆمانێکی بن و نەزانێت کەی و لە کوێ و چۆن و بۆچی نووسیویەتی.. دوورنییە ئەوانیش وەکوو «مەهاباد» خۆی خولقاندبنی و گیانی بە بەرداکردبن.. خۆ «مەهاباد» خۆی لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا لە هیچی نەبووەوە کردی بە کچێکی جوانی ئەفسانەیی و هەر خێراش مێردێکی بۆ دۆزیەوە.. مێرد سکی پڕکرد و قێزکردنەوە پڕستی لێبڕی.. هەستەکانی شێوان و دیمەنی شتەکانی بە تەواوی لێ گۆڕا.. لێی یاخی بوو و لە ژێر دەستەڵاتی ئەم چووە دەرەوە.. چۆن حەزی بکردایە و چۆنی بوبستایە، ئاوا بیری دەکردەوە و هەڵدەسووڕا.. وەکوو کەروێشک خاکی زۆر نەرم و کەمێ شێداری کاتەکانی هەڵدەکۆڵی و هەر جارێ لە شوێنێ سەری دەردەهێنا.. سەری دەردەهێنا و جارێکی تر نقومی دەکردەوە.. نقومی دەکردەوە و دەریدەهێنایەوە.. دەریدەهێنایەوە و نقومی دەکردەوە.. ئەنجام ئەمی بە پاڵەوان و خۆی بە چیرۆکنووس زانی و کەوتە دژایەتیکردنی.. بە جارێ خستیە گومانەوە و وایلێکرد بە ڕاستیی بیری لێبکاتەوە.. خەوی زڕا و خەیاڵەکانی پەرش و بڵاوبوونەوە.. موچوڕکی پیادادەهات و گیانی دەلەرزی.. ئەوسا لە هەموو کاتێ زیاتر بوونی خۆی و هی ئەوانی لێدەبووە تەنگوچەڵەمە و هەستی دەکرد ئەم هەر لە بنەڕەتەوە زیندەوەرێکی زۆر زۆر بچووکە.. یاخوود وەکوو «گریگۆر سامزا»ی چیرۆکی «Metamorphosis»ی «کافکا»، کە زۆر جار لە ماڵی «کاترینا»دا خوێندوویەتیەوە و قێزی لێیکردۆتەوە، گۆڕاوە و بووە بە زیندەوەر.. زیندەوەرێکە و بە عەدەسەی کامێرای «سیامەند»ـەوە نووساوە.. بە فوویێ، یان بە لێخشاندنی ئێجگار سووکی سەری یەکێ لە پەنجەکانی ئەو، کە هیچ گرنگ نییە کامیان بێت

و هی کـــام دەســـــتـەیان بێت، لادەچێت و بۆ هەتاهەتایە چاوی وندەبێت.. هەر بۆبەشــە نـاتوانێت دنیـــا بە ڕەنگاوڕەنگی ببــینێت و ژیانی ســەرتاپا لە لمی گومانـەکان هەڵکێشراوە.. ئینجا بیری لە ڕەنگی سوور دەکردەوە و سەرەمێکوتەی سرِبووی ناو هێلکەشەیتانۆکەکانی بنکی مێشکی دەورووژان، کە لەودیو ئەو عەدەسەیەوە دەیبینێت و لە ژێر تروسکایی زۆر زۆر کزیشدا هەر دەدرەوشێتەوە.. کەچی لەسەر فیلمی کامێراکەدا دەبێت بە سپی و لەسەر کارتۆنە چوارگۆشەیی و لاکێشەییەکانیشدا بۆ ڕەش دەگۆڕێت.. هەر ئەمەشە جارێکی تر لەم دەبێتەوە مـەتەڵێکی ئاڵۆز و ناتوانێت وەکوو زیندەوەرەکانی تر بۆ خۆی ئاسوودە بژیت.. لێرەوە خەتاکان لەسەر کات لادەبات و هەموویان دەخاتە ئەستۆی شوێنەوە.. ئەو شەوە بە جارێ ئارامی لێبرِا و بە هیچ کلۆجێ خەو نەچووە چاویەوە.. هەستا و بە قادرمەکاندا هاتە خوارێ.. دەرگای ژووری میوانی کردەوە و چوو لەبەر ئاوێنەکەدا وەستا.. جلەکانی لەبەر خۆی داکەند و هەڵیدانە سەر کورسیەکانەوە.. هێواش هێواش یاریی بە سەرگۆی مەمکەکانی دەکرد و سووک سووک دەیوت:

ـ من هەم و دەتوانم بیربکەمەوە..!! من هەم و دەتوانم خوڵقێنەر بم..!!

هاوکات «مەهاباد»ی بیردەکەوتەوە و پەستدەبوو، کە باوەڕی وایە ئافرەت بە سەرگـۆی مەمکەکانیەوە دەزانێت زیندووە و دەتوانێت هەست بە ئاسـوودەیی و نائاسـوودەیی بکات.. کـاتێکی زانی مـامی بە چاوی خـەواڵووەوە دەرگــای ژوورەوەی کردەوە و بە حەپەساویەوە لێی پرسی:

ـ ئەوە چییتە..؟! بۆچی خۆت ڕووتکردۆتەوە..؟! ئەم قسانە چیین.....؟!

ئەم بەبێ ویست باوەشی پیاکرد و پێی وت:

ـ چاوەکەم ئێمە لەناو گێژەنی کاتەکاندا ونبووین و تازە مەحاڵە ڕۆژژمێرەکان بتوانن بماندۆزنەوە..!!

هەستی کرد ئەو گیانی وەکوو ئەو شەوە دەلەرزێت و دەمارەکانی لەوسا سەیرتر کەوتوونەتە کرتەکرت، کە لەبەر ئاوێنە باڵانوماکەی هەیواندا ڕیش و سمێڵی تاشی و بە مەبەستی خنکاندنی «شازە»ی ژنی چووە ژوورەکەی ئازووقەوە، بۆیە بەزەیی پیاداهاتەوە و خەریکبوو لە پرمەی گریانێکی زۆر بەکوڵ بدات.. ئەم

سەرەتا لە ترسی قێزکردنەوە نەیوێرا لەگەڵی بچێت و لە کونجی ژووری نووستندا بە دەرزیەکی سەرخڕی ڕەشوسپی خۆی بە تەقاندنەوەی بلۆقی سوورهەڵگەڕاوی سەر پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپیەوە خەریککرد، کە حەفتەیەک لەمەوبەر بە تەباخە سپیەکەی ڕۆژی لەدایکبوونی «مەسیح» لە «هاشم ئەعنەش»ی باوکی «ست سامیە»یان کڕیبوو و چوار چاوەکەی لە شێوەی ئەمووستیلەی دروومان دروستکرابوون؛ سووتابوو و چزەیەکی وەکوو دەنگی خاچی سپیی پۆلای دەستی سیحربازە ڕەشپۆشە زمانپسەکەی ناو دووکانی ئاسنگەرە سپیپۆشە چەنەبازەکەی سووچی ئەوسەری قەیسەریە زۆر درێژ و کەمێ تاریکەکەی لێ هەستا، کاتێ بە دەستی ڕووتی ڕاستی لەناو کوورە تەواو جۆشدراوە شێوەقووچەکیەکەدا دەریدەهێنا و دەیکرد بە پشتی ئەو قازە ڕەشەی، دەنووکی سووری خستبووە ناو لەگەنێکی سپیی چوارگۆشەی قووڵی بە سەرەمێکوتەنەخشاوی بریقەدار و «رمس.. رمس.. رمس.. رمس»«٧٣» شلە سەیرەکەی ناوی هەڵدەقووڕاند.. بەڵام دوایی، کاتێ مامی دەستەکانی بە کرێمی سپیی ناو قوتووە ڕەشە درێژکۆلەکەی سەر تاقە سپیە تەسکەکە چەورکرد و خستنیە جووتە دەسکێشە ڕەشەکەی قەدی نوێنەکانەوە، ئەوانەی لە چەرمی خۆشکراوی گامێش دروستکرابوون و ئەم هەر جارێ پێڵووەکانی پێ دابخستنایە، دایبخستنایە و لەگەڵیا بۆنەکەی هەڵمژیایە، کە لە هی لینجاوی ناو هێلکەشەیتانۆکە زلەکان دەچوو و سەرەمێکوتە بزێوەکانی ناو سەری دەورووژاند؛ چوار پیاوی ڕەشپۆشی کورتەبنەی تووکنی چاوبەقووڵاچووی وەکوو یەکی دەبینی و بەکامی دڵ لێیان ورددەبووەوە، کە لەو سەربانەیماڵی «مام مارف»دا بە بەفرماڵی ڕەشی درێژ بەفری ئەستووری تازەباریوبان هەڵدەدایە حەوشەکەوە و دەیانکرد بەسەر جەستەی ڕووتی «شاناز»دا.. ئەو بە پێوە وەستابوو و جووڵەی نەدەکرد.. تا بەفرەکە تەواو دایدەپۆشی و لە چاوەکانی ئەمی وندەکرد، بە سستی، بەڵێ، زۆر بە سستی دەمی دەکردەوە و بەردەوام، بە دەنگێ، کە بەر دەیان قوڵپی گریانی ئێجگار بەسۆز بەسۆز کەوتبوو و لەگەڵ لەرەی گوناه گوناه نەبووایە دەرنەدەچوو، دەیوت:

ـ چ گەمژەییەکە بچینە شەڕێکەوە، لە کاتێکدا نازانین دڵی دوژمنەکانمان

چەندی خۆشەویستی و دڵی دۆستەکانمان چەندی ڕق تیایە..!!
ئەوان لە کاری خۆیان نەدەوەستان و بێزەوق بێزەوق دەیانپرسی:
ـ خۆشەویستی و ڕقی چی و لە ئاستی کێ..؟!
ـ خۆشەویستیی دوژمنەکانمان لە ئاستی ئێمەدا، کە شەڕیان لە دژ دەکەین و ڕقی دۆستەکانمان، کە خۆمانیان بۆ بەکوشتدەدەین.

لەپڕ دەرزیەکەی کرد بە قەدی دۆشەگە ئەستوورەکەی تازە هەلاجێکی شەشپەنجە لۆکەکەی ناوی شیکردبووەوە و بەرگێکی سیرەی سپیی هێڵداری لووسیان تێگرتبوو.. هەستایە سەرپێ و چمکی کراسە ڕەشە تەنکە درێژە فشۆڵەکەی گرت بە دەستی ڕاستیەوە، کە ڕۆژی مانگرتنی گۆڕهەڵکەنە سپیپۆش و مامانە ڕەشپۆشەکان لەگەڵ «مەنار» و «مەسار»ی دراوسێیان لە کۆگای «إشبين و إشبينه»«٧٤»ی سوچی ئەوسەری بازاڕی «سلاله»«٧٥»دا کڕیبووی و وێنەی پووشکە بەقنگەی ورد وردی لەسەر قەراغی یاخە بازنەییەکەی کرابوو.. لای «نازە» ئۆبەی سپیی باریکی بریسکەداری بە قۆڵەکان و دامێنی داگرتبوو و شەوان بۆ نووستن لە بەریدەکرد.. سست سست و بە ترسەوە هەنگاوی کورت کورتی دەنا و لەبەر دەرگای ژوورەوە قاچی لە تەرمۆزە لووسەکە هەڵنووتا، ئەوەی لەسەر شێوەی بەتریق درووستکرابوو و وێنەی شتەکانی دەکرد بە دووانی ناشیرینی وەکوو یەک.. هاوڕێیەکی مامی، کە کتێبێکی لەسەر جۆرەکانی کۆتر نووسیبوو و ژنەکەی لە خەستەخانەی «یەرمووک»دا بەسەر دوانەیەکی لەیەکچووەوە چووبوو، بە دیاریی لە «شام»ـەوە بۆی هێنابوون و شەوان پێش نووستن پڕیاندەکرد لە ئاوی سارد.. خەریکبوو بە دەما بکەوێت و خۆی بە تاقی پەنجەرەکە گرتەوە.. دەنگی شکانی شووشە ناسک و شیریەکەی ناوی «زخمە.. زخمە.. زخمە.. زخمە»«٧٦» لە گوێچکەیدا دەزرنگایەوە و نیگای چاوەکانی لەسەر وێنەکەی «مەسیح» هەڵدەلەرزین، کە بە سمێڵێکی سووری تێکەڵ بە ریشێکی پڕی سوورتر و گۆچانێکی ڕەشی ئەستوورەوە بە دەرگاوە چەسپکراوە و لە تەنیشتی نووسراوە: «چاو چرای جەستەیە، ئەگەر جەستەت ساغبوو، ئەوا سەراپای جەستەت ڕووناکە، بەڵام ئەگەر چاوت کزبوو، ئەوا تەواوی جەستەت تاریکە» و ئەم هیچ حەزناکات

بیـخـوێنێتـەوە.. بۆ تەرمـۆزەکـە دانەویەوە و بە دەسـتی چەپی دەسکە باریکەکـەی گرت.. بەبێ ویست ڕایشـەقـاند و گـوێی بۆ خرەخڕی پارچەکـانی ناوی شلکرد، کە لەسـەر ئاوازی «رمق.. رمق.. رمق.. رمق»«٧٧» بەرزدەبووەوە و لەگـەڵ مـوچورکی سـەیر سەیرا ڕۆژی دەرچوونی بڕیاری گۆڕینی پارەی بیردەکەوتەوە.. ئەوسا ئامۆژنی لەبەر هەتاوە کـەمێ گـەرمـەکـەی ناوەڕاسـتی حـەوشـەدا بەدەم گـوێگرتن لە ڕادیۆ لاکـێشـەییـەکەی تەنیشـتـیـەوە بە چەقـۆیەکی نیـکلی ڕەشی باریک نـاوی سـپـیی کوولەکەی ڕەشی زلی دەردەهێنا و وەکوو شێت بۆ خۆی دەدوا:

ـ گڵی ڕەشی نـاو ئەو ئینجانە سپیەی گـوڵێکی جوانیان تیادا ڕواندووە و ئـەم نـە دەتوانێت نـاوەکــەی فــێــربێت و نـە بـۆنی بـکات، وردە وردە لـە نـاخـەوە دادەڕووخێت و توانای هەڵگرتنی ئەو و قەد و لاسک و گەڵاکانی نامێنێت.

«ریحاب»ی هاوپۆلی، کە لە هاروهاجیا بۆڕی هەمـوویانی دابووەوە و هەمیشە دەیوت:

ـ قـوتابخـانە لە تەڵەی مـشک دەچێت و تەختـەڕەش سـێبـەری پۆلیـسی هاتوچۆیە.

لە دەرگـا وەسـتـابوو و چاوەڕێی ئەمی دەکـرد، تا بە جووتە بچن بۆ لای مـاڵی کرێکارە زوگرتیە ڕەشپـۆش و سپـیپـۆشەکانی کـۆمپـانیـای هاوبەشی «ITIS» و وەکوو منالانی تر لەسەر تەنەکە چوارگۆشەییەکانی پەنا دیوارە نزمەکەوە سەیری ناو حەوشە لاکێشـەییەکە بکەن، کە تیـایدا قاچی بەرازێکی قەڵەوی سپییـان بە پەتێکی ڕەشی زبری ئەسـتوور لە بۆریی لووسی باریکی سـپیی کەپری مـێوەکەوە بەسـتـووەتەوە و بە شـێـوەیەکی ئێـجگار سـەیر گـەلا وشـک و وەریوەکـان لەسـەر کۆنکرێتە ڕەقەکە هەڵدەلووشێت؛ هاتە پێشێ و بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

ـ ئینجا پوورە شازە دوای ئەوەی گڵەکە دەمرێت، گوڵەکە چی بەسەردێت..؟!

ئامۆژنی لەبەر دەنگی خۆی و هی زلی «غەنیمە عەببوود»، کە لە کونە بچووک بچـووکـە بازنەیەکـانی ڕادیۆکـەوە بەرزدەبووەوە و بەردەوام و لەسـەر یەک ڕێتم دەیوت:

ـ هی کـۆن بێننەوە و هی تازە بەرن.. هی تازە بەرن و هی کـۆن بێننەوە.. هی

کـۆن بێننەوە و هی تازە بەرن.. هی تازە بەرن و هی کـۆن بێننەوە.. هی کـۆن بێننەوە و هی تازە بەرن.. هی تازە.......

گوێی لە دەنگی ئەو نەبوو و سەری هەڵنەبڕی.. لە ڕێگا، ڕێک لەبەر دەرگای ماڵی «فەریدە حەسەنێن»ی فەرمانبەری «نفووس و سەرژمێری»، کە بە شەش سک دوانزدە منداڵی نێرەمووکی شەشپەنجەی لەیەکچووی دوودەرکیی بووبوو و نەیاندەزانی بە کچ ناونووسیانکەن، یان بە کوڕ؛ «نەوال» قۆڵی ڕاستی لە قۆڵی چەپی «ڕیحاب» هەڵکێشا و لەگەڵ سەیرکردنی چاوە هەڵخلیسکاوەکانی، ئەو چاوانەی کتومت لە هی تاوسە سپییە کڕکەوتووەکەی ناو قەفەزی سووچی ئەوسەری پارکی ئاژەڵان دەچوون و ئاواتی دەخواست هی ئەم بوونایە، هی ئەم بوونایە و نهێنیی حەشەردراوی ناو چاوی خەڵکی پێ بدۆزیایەتەوە، پێی وت:

ـ ئامۆژنم ئەم ماوەیە قسەی زۆر هەلەقومەلەق دەکات ریحاب، چەند دەترسم وەکوو دایکتی لێبێت..!!

ئەو لچی هەڵهێنایەوە و بە دەنگێکی کز وتی:

ـ دایکی من لەپڕ ئاوای لێهات و خەتای ئەو پیاوانەش بوو، کە.......

بۆی تەواونەکرا و لە پرمەی گریانی دا، بەڵام ئەم سەروبەری چیرۆکەکەی دەزانی و لە هەموو کەسێکی تریش زیاتر پێی سەرسام ببوو.. ئەمان هەر لە زووەوە دەیانناسین و زۆریش بە گەرمی هامشۆیان دەکردن.. «فەرحان سیراج»ی باوکی بەناوبانگترین پارێزەری «بەغدا» بوو و ئێوارەی ڕۆژە باراناویەکەی مانگی ئاب، لەبەر دەرگای دادگا، بە تەورێکی سپیی دەسکڕەشی دەستی ژنە لادێییەکی کۆڵی سپیپۆش کوژرا.. «خەولە»ی دایکی زەویپێو بوو و لەگەڵ گرووپێ پیاو بە ئیش ناردیان بۆ سنووری شارێکی لای سەروو.. شەو لەناو خێمەدا کۆمەڵێ چەتەی سپیپۆش پەلاماری دەدەن و سکی پڕدەکەن.. ئەو ڕۆژە «نەوال» و «ریحاب» بە کراسی ڕەشی قوتابخانەوە لەسەر کورسیە سپییە نزمەکانی هەیوان دانیشتبوون و گوێیان لە هاوار هاواری بەرزی «خەولە» بوو، کە لەو ژوورەی دەرگا ساجە ڕەشەکەیان داخستبوو و پەردە گوڵگوڵیەکەیان بەسەر پەنجەرە چوارتاکیەکەدا دابووەوە؛ بەرزدەبووەوە و دەگەیشتە کۆڵان.. «ریحاب» دەگریا و لە

هیچ شتێ تێنەدەگەیشت، بەڵام ئەم دەیزانی وا ئامۆژنی قاچە ناسکەکانی ئەوی لە شێوەی پیتی «لا»یەکی زل کردۆتەوە و خستیونیەتە سەر ئەم شان و ئەو شانی خۆبەوە.. ئیتر بە دەستەکانی خەریکی شتێکە لە مۆمدانەکەی و ئەم سەری لێ دەرناکات.. ئەو جارە هەمان شتی لەگەڵ «ست ئامال»ی «جەبر و ئەندازە»دا دەکرد و ئەویش «خەولە»ئاسا دەیزرووکاند.. ئەوسا «نەوال» لە کونی بازنەیی کێلۆنی چوارگۆشەیی دەرگا لاکێشەییەکەدا پشتی پانی ئەم و قاچە درێژەکانی ئەوی دەبینی و بە حەپەساویەوە سەرنجی لێ دەدان، کە دیمەنێکی سەیریان هەبوو و ڕێک لە سێبەری داوەڵ دەچوون.. ئەو داوەڵانەی لە کاتی ڕۆژئاوابوونی پایزێکی درەنگوەختدا لە بێستانێکی قەراغی بەشی ڕۆژهەڵاتی شاردا بینیبووی و پۆلیسی هاتوچۆبان بیرخستبووەوە.. بەڵام دەرگای ئەوان کونی تیانەبوو و بە هیچ شێوەیەک نەیاندەتوانی ئەودیو ببینن.. ئەو قسانەی «خەولە»ش، کە بەدەم ئازار و زرووکوهووڕەوە دەیکردن و تا دەهات کزتر دەگەیشتنە گوێچکەی ئەمەوە، زۆر سەیربوون و هیچ لە هی بنیادەمی ئاسایی نەدەچوون:

ـ مەیپێوە.. مەیپێوە.. لە پێوانەدا گۆشەکان وندەبن.. مەیپێوە.. مەیپێوە.. لە پێوانەدا درێژبەکان و پانیەکان کاڵدەبنەوە.. مەیپێوە.. مەیپێوە.. لە پێوانەدا ڕووبەرەکان دەشێوێن.. مەیپێوە.. مەیپێوە.. لە پێوانەدا.......

دواتریش، کە بە جارێ شێتبوو و تەواو ئەقڵی لەدەست دا، ڕۆژانە بە سەری تاشراوی ئێجگار لووسیەوە لەبەر دەرگای «نفووس و سەرژمێری» دادەنیشت و پیادەڕەوەکانی یەک یەک دەبژارد.. دەیبژاردن و بە شێوەیەکی چەند بڵێیت سەیر، کە ئەم هەرگیز نەیدەتوانی لاسایی بکاتەوە و وەکوو ئەوی بڵێت، دەیوت:

ـ تاک زیندووە و جووتی لەیەکچوو مردوون.. تاک زیندووە و جووتی لەیەکچوو مردوون.. تاک زیندووە و......

ئیتر ئەم موچوڕکی پیادادەهات و چاوی دەکەوتە ڕەشکەوپێشکە.. شتەکانی بەحاڵ دەبینی و بیری لە هاوەڵەکانیان دەکردەوە، تا بزانێت چی زیندووە و چی مردوو.. بیری لە ئەندامەکانی لەشی خۆی دەکردەوە و زەندەقی دەچوو.. لە دەرەوە چاوەکانی، گوێچکەکانی، دەستەکانی، قاچەکانی، پەنجەکانی، نینۆکەکانی،

......، ......، ......، دواتر مــــەمکە بچـکـۆلەکـــــانی، لە نـاوەوەش گورچیلەکانی، سیەکانی، ......، ......، ......، ......، مردوون و بۆگەنیانکردووە.. ئینجـا بە کـەسـەکـاندا دەهات و لە خـەیاڵی خـۆیدا تـاوتوێی دەکـردن.. لە پێش هەموویانەوە «شازە» و «شاناز»، «دیجلە» و «فورات» و دواتر دراوسێ و کچانی هاوپۆل و قـوتابخانەکەی.. ئەگەرچی هەر یەکەیان لە «نفووس و سەرژمێری»یدا فـایلی جیـا و ژمـارەی جیـای خۆیان هەیە و پێوەی دەنازن، بەڵام زیندوونین و ئەم قێزیان لێدەکـاتەوە.. قـێزیان لێدەکـاتەوە و لە داخا دەیەوێت بۆ کونجی تـاریکی ئەشکەوتی کـۆنەهەواری ورچە چڵـێــــەکـانی کـێــوێکی دوور لە ئاوەدانی سەرهەڵگرێت.. خۆ ئیـشی ئەم هەر ئەوەنەبوو بیر لە تاک و جووت بـکاتەوە و لە خەیاڵی خۆیدا بکەوێتە ڕاوەڕاو بەدوای هاوەڵـی شتەکـان، بەڵکوو دەیویست چاک و خراپیشـیان لە یەکتر جیابکاتەوە و نـاوی تریان بۆ بدۆزێتەوە، بەڵام بۆی نەدەکرا و هەسـتی دەکـرد دەسـتی خـسـتـۆتە کـاری غـەیبـەوە.. هاوکـات دەیزانی خـودا چ کـارێکی قـورسی لە ئەستۆدایە و سەرژمێری و جیـاکردنەوەی شـتەکـان و ڕۆحەکـان چەند تۆقـێنەر و بەڵاهێنەرن.. بەمەش نەوەسـتـا و بیـرێکی ترسناکی تری کـردەوە.. وای بۆچوو هـەر یەکێ لەم گـەردوونەدا هاوەڵـێکی وەکـوو خـۆی هەیە و سـەرجـەمی خـەڵـک مـردوون.. مـردوون و لەم و لە «هالە»ی پووری زیاتر کـەسی تر ئەمـە نازانێت.. «خەولە شێت»یش بەشێکی ڕاسـتیـەکـە دەزانێت و لە بەشـەکـەی تری تەواو بێئاگایە.. ئەو هەر دەزانێت خەڵـک بژێرێت و بڵێت:

ـ تاک زیندووە و جووتی لەیەکچوو مردوون.

دواتر وازی لەمەش هێنا و چوار قازی سپیی قەڵەوی پەیداکرد.. بە پەڕۆیەکی سپیی سادە قاچە ڕەشـەکانی لە یەکـتر بەسـتبوون و سەرو شـاوڵـی سووری کردبووە ملیــانەوە.. ئەم هەر جـارێ لەگـەڵ دایکی، یان «شـازە»دا دەچوو بۆ بـازاڕ و بە لایاندا تێـدەپەڕی، سـەرنجی لێ دەدان و جـوان جـوان لێــیــان وردەبووەوە.. کاتێکیش دەهاتەوە ماڵ و دەفتەری نیگارکێشانەکەی دەهێنا، وێنەی دەکێشان و ورد ورد بیری لێدەکردنەوە، کە چۆن ئەوان لەبەر شاوڵە قـورس قورسەکـان ناتوانن بە ئاسـانی سەر هەڵبڕن و زۆربەی کـات دەنووکی پانیـان لەگـەڵ کۆنکرێتە ڕەق و

داخبووەکەی بەر ئەو دەرگا زەبەلاحەدا جووتبووە.. بە زەحمەت هەناسەدەدەن و لەگەڵیا لرخەلرخێکی ئێجگار سەیریان لە قورگ دەردەچێت.. چاوەکانیان بە کزی دەترووکێنن و کزتر دەیانکەنەوە.. هەر ئەوەندەش یەکێ لە ڕێبوارەکان دەگاتە ئاستیان و لەتێ پسکویت، یان قەراغەنانی بازاڕ، یاخوود چەند دەنکێ گەنمەشامیی ڕەشی وشکیان بۆ هەڵدەدا، ئەوان بەحاڵ خۆیان دەجووڵێنن و بە سستی ملی بۆ درێژدەکەن، کەچی ناشیخۆن و وەکوو بنیادەم سەریان بادەدەن.. بایدەدەن و شاوڵەکانی ملیان بەر یەکتر دەکەون.. بەر یەکتر دەکەون و لە گوێچکەی ئەمدا بە «census.. census.. census.. census»«٧٨» دەزرنگێنەوە.. هاوکات «خەولە شێت»ی خاوەنیان پەنجەکانی خۆی لە یەکتر هەڵدەکێشێت و بە دەنگە نووساوەکەی و بە شێوەیەکی ئێجگار خۆش، کە گەورە و بچووک حەزی لێدەکەن و بە دیاریەوە دەحەپەسێن، دەڵێت:

ـ ئەلهای خواردن و ئەلهای دوژمنایەتی هەمیشە بە یەکەوەن و تەنها لە کاتی نەخۆشییدا جیادەبنەوە، ئەمیان نامێنێت و ئەویان زیاددەکات.

ڕۆژێ پێش ئەوەی لەو شوێنەدا گیانی دەربچێت و کرێکارە ڕەشپۆش و سپیپۆشەکانی سەر بە شارەوانی لاشەکەی و قازەکانی بخەنە دواوەی ئەو لۆریە درێژەی، کە شێوەی وەکوو مەقەڵی وابوو و بە ڕەنگی سپی لەسەری نووسرابوو «هی کۆن بێننەوە و هی تازە بەرن»؛ «نەوال» بینی و لە دەموچاوە چرچەکەی وردبووەوە.. هەستی کرد لە سپڵی گامێشی پیری لەڕی نەخۆش دەچێت و ئێسقانەکانی لە ژێریا وێنەی ئەموستیلەی دروومان و هێلکەشەیتانۆکە دەرپۆقیون.. لەپڕ دڵی تێکهەڵات و خەریکبوو لەناو ئاپۆرەی ئەو خەڵکەدا بڕشێتەوە.. بیری لەو جارانە دەکردەوە و ڕۆحی دەردەچوو، کە ماچی دەکرد و بە گاڵتە پێی دەوت:

ـ ماچی قوتوو تینوێتی من ناشکێنێت، بێنە ماچی ڕەسەنی ئەو ڕوومەتانەی خۆتم بەرێ.

ئەوسا ئەم قاقای لێ دەدا و دەستەکانی دەگرت بە سکیەوە، کەچی جارێکیان لەبەر چاوی دایکی و ئامۆژنی لچێکی لێ هەڵقورتاند و وەکوو سەرەژنێکی عەیار

پێی وت:

ـ خۆ ماچ ماسی نییە بخرێتە قوتووەوە..!! ئەوە تۆ ئەم قسەیەت لە کوێ هێناوە..؟!

ئەو تەریقبووەوە و سەری داخست.. بە دەستی چەپی یاریی بە پوشکە بەقنگەی ڕەشی ملوانکەکەی ملی دەکرد و ئاخی هەڵدەکێشا، کە تا سەر سنگی شۆڕبووبووەوە و نقێمە سوورەکانی چاوی لە ژێر تیشکی ڕۆژی نیوەڕۆی ناو باخەکەی خۆیاندا بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەبریسکانەوە.. دوایی لەپڕ، بەبێ ئەوەی سەری هەڵیبڕێت و سەیری ئەمان بکات، وتی:

ـ هیچ دوورنییە ڕۆژێ بێت لەترسی بۆگەنکردن، ماچیش بخرێتە قوتووەوە نەونەوەکەی دڵم.

ئەم دواتریش هەرچەند نینۆکی پەنجەگەورەی قاچی چەپی «سیامەند»ی دەبینی و لێی وردەبووەوە، دەموچاوی ئەوی بیردەکەوتەوە و دڵی تێکهەڵدەهات، کە نەیدەزانی بە چی ئاوای لێهاتووە و هیچ لە نینۆکی پەنجەکانی تری ناچێت.. ڕەق ڕەق و گرنج گرنج، وەکوو بەردی پشتی کیسەڵی بەساڵاچوو وایە و لە نێوان لچ و لێوی ئێجگار تیژی نینۆککەرە ڕەشە دەسکسپییەکە، ئەوەی لە شێوەی پەڕەسێلکە دروستکراوە و چەقۆکەی ناو سکی کەمێ ژەنگی هەڵهێناوە، کرتەیەکی زۆر سەیری لێوەدەیت و ئەم لەگەڵیا بەدەم موچرکێ، کە سەرتاپای گیانی دەتەنێت و بە ترسێکی بێمانا کۆتایی پێدێت، چاوەکانی دەنووقێنێت و پێی دەڵێت:

ـ من حەزناکەم تۆ پێم بڵێیت بۆچی ئەم نینۆکەت ئاوای لێهاتووە.

ئەو جارەش، کە «لوئەی» خەتەنەکرابوو و چوون بۆ ماڵیان، «سیامەند» کردبوویە قەڵاندۆشکانیەوە و بە درێژایی ژوورەکە دەیگێڕا، ئەم هەر لە خۆیەوە بەم دەست و بەو دەست کێشای بەملا و بەولای ڕوومەتەکانی ئەودا و بەوانی وت:

ـ من مامە سیامەندمم زۆر زۆر خۆشدەوێت، بەڵام ڕقم لە نینۆکی پەنجە گەورەکەی قاچی چەپیەتی.

کە ئەوان پێکەنین و مامی تەریقبووەوە، ئەم ویستی قسەکەی بگۆڕێت و لە

ماڵەوە سەرزەنشتی نەکەن، بۆیە پەنجەکانی خستە قژە خاوەکەیەوە و وتی:

ـ ڕقم لێی نییە، بەڵام قێزی لێدەکەمەوە.

ئەوەندەی تر قوڕەکەی خەستکردەوە و هەر خۆی بەو سەرەوە دەیزانی «سیامەند» چۆن لە ناوەوە وەکوو بتی بە نەفرەتکراوی ژێر کوتەکی بتشکێنە داخلەدڵەکان دادەڕووخێت.. «حەماد ئەشوەل»ی باوکی «لوئەی» قاقایەکی بەرزی لێ دا و بە گاڵتەیەکی زۆر خۆش پێی وت:

ـ ئاخر شەیتانە بچکۆلەکە خەتای مامتە دەتکاتە قەڵاندۆشکان.. ئەگەر بتخاتە ژێر قاچی ئەوسا پێی دەڵێی قوربانی سەرت بم.

«خالیدە» پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشان و وتی:

ـ ئاشەوانەکە سێ مانگ ئیشی بە ئاشەکەی نەکرد و منداڵەکانی خۆی برسیی کرد، بۆئەوەی ئەو پەڕەسێلکەیە ناڕەحەت نەبێت، کە هێلانەی بە بنمیچەکەیدا شۆڕکردبووەوە، کەچی پەڕەسێلکە کاتێ کۆچی دەکرد، بە فیزێکەوە پێی وت......

«شازە» لەولاوە پەرچەمەکەی لەسەر چاوەکانی لادا و قسەکەی پێ بڕی:

ـ ڕازیی نابم ئاوا بە هەمووتان گەڕ لە کچم بئاڵێنن، ئەم بۆیە قێز لە پەنجەی سیامەند دەکاتەوە، چونکە......

تەواوی نەکرد و بە قاقای پێکەنینێکی ناکاوی بەرز کۆتایی پێهێنا.. «سیامەند» تا ئەو کاتە هیچی نەوتبوو و لە هاتوچۆکەی خۆی بەردەوام بوو، لەپڕ ئەم دەست و ئەو دەستی ئەمی گرت و توند توند گوشینی.. گوشینی و بە دەنگێ، کە شەماڵێک بوو و هاڕەی شووشە ناسکە وردوخاشبووەکانی ناخی ناخی هەڵگرتبوو، وتی:

ـ نەک نینۆکێکم، ئەگەر قێز لە دڵەکەشم بکاتەوە، دەریدەهێنم و......

تەرمۆزە شکاوەکەی خستە سەر تاقی کەمێ نزمی پەنجەرەکەوە و قاچەکانی لە جووتە نەعلە ئیسفنجە سپییە بنکڕەشەکانی هەیوان هەڵکێشا، کە سەرو هەنگی زلی قرمزییان بەسەرەوە بوو و لە کاتی هەنگاونانیدا وەکوو جووتە نەورەسە ڕەشە پلاستیکەکەی سەر ترۆپکی نافوورە سپیە شاوڵیەکەی ناو چیمەنی چوارگۆشەیی

باخی بازنەیی حەوشە لاکێشەییەکەی ماڵی «کاترینا»دا دەلەرینەوە.. شەوی مانگگیرانەکە چەناگەی خستبووە سەر هەر دوو ناولەپی جووتکراوی و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەکرد، وایدەزانی ئەسپێکە و لەسەر دوو قاچ وەستاوە.. وەستاوە و دەحیلێنێت.. خورەخوری ئاوەکەش بە «emigration.. emigration.. emigration.. emigration.. emigration»«٧٩» لە گوێچکەیدا دەزرینگایەوە و چاوەکانی بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەکەوتنە ڕەشکەوپێشکە.. بەردەکانی قەراغی گەورەدەبوون و دەبوون بە تاوێر.. دواتر بە کۆمەڵێ نوێژکەری نوورانی و سوژدەی ئەبەدییان بۆ ئاسمانی دوورەدەست و هێمن دەبرد.. کوڕ و کچە زنجیەکانی دەبینی و بە وردی سەرنجی لێ دەدان، کە بەدەم گۆرانیی ئەفسانەیی بێسەروبەر بەسەر ئەو ڕێگا لمەڵانەدا وەکوو پۆلێ قازی کێوی قەتارەیان بەستبوو و سووک سووک ڕێیاندەکرد.. بە پەڕۆی سپی سپی عەورەتی خۆیان داپۆشیبوو و تەبارەی گەورە گەورەی پووشی نەرم نەرمی درێژ درێژی سپیتریان خستبووە سەر سەریان.. «جۆن»ی مێردی «کاترینا» دەیتوانی لکەدارێکی کەمێ نووکتیژ بخاتە نێوان پەنجەکانی قاچی چەپیەوە و زۆر بە خێرایی لەسەر خۆڵی ئێجگار نەرمی بەشی لای خوارووی باخەکەدا، کە بەردەوام چۆلەکە سپیە بزێوەکان لەسەری هەڵدەنیشتن و بە ئاسوودەییەوە چینەیان تیایدا دەکرد، چینەیان تیایدا دەکرد و بە دەنووک هەڵیاندەکۆڵی؛ نیگاری «black bear»«٨٠» ێکی بۆ بکێشێت و لووتەوانەیەکی ئێجگار سەیری بکاتە لووتیەوە.. چاو ببڕێتە چاوەکانیەوە و بە ئینگلیزی بێت، یان بە عەرەبی پێی بڵێت:

ـ لێکدانەوەی خەون چەند زەحمەتە نەوال..!!

ئەم ئەگەرچی نەیدەزانی مەبەستی چییە و چ پەیوەندییەک لە نێوان ئەم قسەیە و ئەو وێنەیەدا هەیە، بەڵام هەر لە خۆبەوە ترسێک دایدەگرت و نەیدەوێرا هیچ شتێ بڵێت.. قاچەکانی لە نەعلەکەی دەهێنانە دەرێ و وێنەکەی پێ دەکوژاندنەوە.. بە ئەسپایی خۆڵەکەی لێدەتکاندن و تێیهەڵدەکێشانەوە......

**هەنگاوی** قورس قورس و کورت کورتی دەنا و نیگا ترساوەکانی چاوی لەسەر دەرگای ئازووقەدا هەنگەکانئاسا هەڵدەلەرزین.. هەڵدەلەرزین و نەیدەتوانی وەکوو

جاران بیر لەو ئێوارە تەمومژاویە بکاتەوە، کە ئەم و ئامۆژنی، «بەدریە» و «ئەدیب» و «شەلال»ی بچکۆلە لە هەیوان دانیشتبوون و بخوورديان دادەگیرساند، لەپڕ پیاوێکی ڕەشپۆشی شپرزە، هەر دەتوت لەسەر تاقی بەرزی خەونی ڕەشوسپیی درێژخایەنی فریشتە سپیپۆشە خانەدانەکان کەوتۆتە خوارێ و هیچ شوێنێکی ئەم سەرزەمینە شارەزا نییە، یان لە نێوان دێڕەکانی دووتوێی لاپەڕەی پەرپووتی کتێبی مێژووە کۆنەکاندا هاتۆتە دەرێ و بەم جیهانە نامۆیە؛ تەپتەتەپ تەتەپ.. تەپتەتەپ تەتەپ بە پایەکانی قادرمەکەدا هاتە خوارێ و پشتی ماندووی پێ دا.. بەحاڵ دەستەکانی بۆ ئەمان درێژکرد و تێیگەیاندن چۆڕێ ئاوی ساردی دەوێت.. کەچی تا ئامۆژنی چوو بۆ ژوورەوە و لە سەلاجە ڕەشەکەدا قوتووێ بەفراوی بۆ هێنا، ئەو هەر خێرا خۆی گەیاندە لای کولانەی مریشکەکان و قاپە ئاوەکەی ئەوانی نا بەسەر دەمیەوە، ئەوەی لە نیکلێکی سپیی لووس درووستکرابوو و وێنەی شتەکانی دەکرد بە دووانی ناشیرینی وەکوو یەک.. تنۆکە ورد وردەکانی بنک و قەراغەکانی بەسەر سنگی تووکنیدا پرژاند و گورج گورج بە قادرمەکەدا سەرکەوتەوە.. «شازە» بەفراوەکەی کردە قاپی مریشکەکانەوە و پرسی:

ـ ئەرێ بەدریە ئەو باڵندەیە ناوی چییە، کە شەوان بە ئاسمانەوە دەفڕێت و دەڵێت: تیھ تیھ.. تیھ تیھ..؟!«٨١»

ئەو «شەلال»ی توند توند گرتە باوەشیەوە و دەستی کرد بە گریان.. فرمێسکە ورد وردەکانی تنۆک تنۆک دادەباراندە سەر قژە خاوەکەی و بە دەنگێ، کە ماڵ بە ماڵی ئاخ و حەسرەتەکانی ناخی ناخی بەسەرکردبووەوە و بۆ ئەوە دەشیا جریوەی کەنارییە ڕەش ڕەش و سپی سپیە ڕاونەکراوەکانی سەر لق و پۆپی دەرەختی قەدی شاخی ئێجگار بەرزی هەتاونەدیوی ئەودیوی خەیاڵەکانی و ئەوانەی ناو قەفەزی سەر تاقی کەمێ بەرزی ژووری مەیلەوفێنکی سووچی ئەوسەری پارکی ئاژەڵانی پێ خۆشتربکرێت، وتی:

ـ ئێمە چەند گوناهین شازە، کە دراوسێی ئێوەین..!! ئێمە چەند داماوین، کە ئێوەمان خۆشدەوێت و ناتوانین بەجێتانبهێڵین..!!

«نەوال» دەمی لە گــوێچکەی چەپی «ئەدیب» نزیککردەوە و بە چپــە لێی پرسی:

ـ ئەگەر ئێوە لێرە بڕۆن، دەچن بۆ کوێ.. ؟!

ئەو ئەوسا پەڕێکی ڕەشی باڵی کۆتری گرتبوو بە دەستی ڕاستیەوە و سووک سووک لە دەمـوچاوی خـۆی دەخشـاند، بە سـەری پەنجەی دۆشاومـژەی دەستی چەپیشی یاریی بەو مێرووله سپیانه دەکرد، کە دەنکەجۆی ورد وردی ڕەشیان لە لای کولانەی مریشکەکانەوە دەهێنا و دەیانکرد بە کونی شارەکەی خۆیاندا؛ بەبێ ئەوەی سـەر هەڵبڕێت و سەیری بکات، وەکوو پیشـەی هەمـیشـەی خـۆی تۆپەڵێ قسەی بێسەروبەری دا بەسـەر یەکا و ئەم هیـچی لێ تێنەگەیشت.. دوای کەمێ لەسەر پشت پاڵکەوت و لەمی پرسی:

ـ دەزانی مێرووله باڵدارەکان نێرن و ئەوانی تریش مێن.. ؟!

ـ چۆن دەزانی.. ؟!

ـ لە قوتابخانە خوێندوومانە.

ـ وای ئەدیبۆ..!! مێیەکان چەند گوناحن، کە ناتوانن وەکوو نێرەکان بۆ ئاسمان بفڕن..!!

ـ نـا.. نا.. نێـرەکـان گـوناحن، چونکە لـە ئاسـمـان چۆلەکـە و پەڕەسـێلکە پەلاماریان دەدەن و دەیانخۆن.

ـ ئەی کەوایە بۆچی دەفڕن.. ؟!

ـ لە داخی مێیەکان، چونکە خۆشیان ناوێن.

ئەو ڕۆژەی «مـیـلاد» و «مـیـعـاد»ی جووتە کوڕی دوانەی «شـوکر شـەلشـەل»ی بەڕێوەبەری «حـەریق»ی دراوسـێـیـان لە زێی «دیجلە»دا خنکان و مـەلەوانەکـان لاشەکانیان بۆ نەدۆزرانەوە، ئەم و «نێرگز» لەناو باخەکەی خۆیاندا دانیشتبوون و کـتـێـبی «جـۆگـرافـیـای عـێـراق و ولاتانی دراوسێ»یان بە دەسـتـەوەبوو.. ئەم ڕووبەرەکـانی لەو و ئەو ژمارەی دانیشـتـوانیـانی لەم دەپرسی.. کراسیـان تا سەر ئەژنۆ هەڵکردبوو و قاچیـان خسـتبـووە ناو خۆڵە نەرمەکەوە، کـە لە ژێر تیـشـکی خۆری نیوەڕۆی کۆتایی ئەو بەهارەدا داخبووبوو و هەموو گیـانی خاودەکردنەوە..

بەردەوام باوێشکیـان دەدا و پێلـووی چاویان قـورسدەبوو.. دوایی «نێرگـز» بە تەمەڵیەوە هەستایەوە و وتی:

ـ من لە خەوا چاوم بۆ هەڵنایە، دەچم لە ماڵەوە کەمێ......

ئەم لەسەر پشت پاڵکەوت و سەیری ئەو مێروولانەی دەکرد، کە لە حەوشەکەی خۆیانەوە هەڵدەفڕین و تێکەڵ بە هێڵە ستوونیەکانی بەر چاوی دەبوون.. چۆلەکە و ڕیشـۆڵەکـان فـڕکـانفـڕکـانیـان پێدەکـردن و قـسـەکـەی ئەو جـارەی «ئەدیب»ی بیـردەکـەوتەوە.. بەزەیی بە نێـرە باڵدارەکـاندا دەهاتەوە و ڕقی لە مـێـیـەکـان هەڵدەسـتـا.. هەرچۆنێ بوو خـۆی گـەیاندە لای شـارەکـەیان و کەوتە باڵکردنیـان، بۆئەوەی فـریایان بکەوێت و لەوە زیاتر نەبنە خـۆراکی ئەو چۆلەکـە و ڕیشـۆڵانەی، کە وا بەردەوام لەسەر ماڵەکەیان تێکدەقژقژێن و ڕێک لە زەخرەفەی سەر دیواری شـوێنەوارەکـانی «بابل» و «ئاشوور»ی دەچن.. بە نینۆکی پەنجەی دۆشـاومژە و ئەسپـێکوژەی دەستی چەپی باڵی نێرەکانی لە بنا دەقرتاند و بە ناولەپی دەستی ڕاستیشی مێیەکانی دەپلیشاندەوە.. دوایی لەپڕ بۆی دەرکەوت ئەمە ڕێگایەکی چەوتە و لەپاڵ مێیـە نەگریسـەکاندا دەیان نێرینەی داماویشـی کوشـتـووە، چونکە ئەمانیش بەبێ باڵ وەکوو ئەوانیان لێدەهات و نەیدەتوانی جیایان بکاتەوە.. بیری لە بۆیەی نینـۆک کـردەوە و ڕایکردە ژوورەوە.. تا گـەیشـتـە بەر دەرگـا و بە لەقـە کـردیەوە، چەنـد جـارێ قـاچی لەم شت و لەو شت هەڵنووتا و بەمـلا و بەولادا کـەوت.. لە شـپـرزەییـا ئەوەی خـۆی بۆ نەدۆزرایەوە و هی ئامـۆژنی هێنا.. هەر نێرێکی دەگرت و باڵەکانی دەقرتاند، خێرا بۆیەی دەکرد و لەسەر زەویی دایدەنا، تا لە مێیەکان جیایانبکاتەوە و لەناویان نەبات.. بیرێکی لەمە چاکتری بۆ هات و کتێبەکەی هێنا، کە هەر بە کراوەیی لەناو چیمەنەکەدا بەجێیهێشتبوو و وشەکان وەکـوو چەند دەنکەجـۆبەکی زل دەهاتنە بەر چاوی.. شـووشـەی بۆیەکـەی بەمـلا و بەولایدا قلّپکردەوە و هەر بە فلّچە باریکەکەی خۆی بەسەریدا بلاوکردنەوە.. دانە دانە باڵی دەکـردن و خـێـرا خـێـرا دەیخـسـتـنە سـەری.. ئەوەندەی نەبرد هەر دوو لاپەڕەکەی بە مێروولەی نێر پڕکردەوە و کەوتە سەرنجدانیان، کە لەسەر پشت بە بۆیەکەوە نووسابوون و وێنەی ئەسپی لە شاخ هەڵدێراو قاچەکانیان سست سست

دەجوولانەوە.. ئیتر هەر خۆی دەیزانی چ دیمەنێکی جوانە و چەندێ لەزەت لە بینینیان دەبینێت.. دوایی لەپڕ موچوڕکێکی پیاداهات و لە دڵی خۆیدا وتی: «چارەنووسی دڵدارەکان لەسەر زەوی بێت، یان لە ئاسمان هەر مردنە و گوناهی کەسی تیانییە».. ئەوسا «ئەدیب» لەسەر دیوارەکەوە سەری هەڵکێشابوو و سەیری ئەمی دەکرد.. لە هەموو شتێ تێدەگەیشت و ئاخی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا.. دەستەکانی گرتبوو بە دڵیەوە و هەر زوو زوو پێی دەوت:

ـ تۆ قەت گەورە نابیت..!! ئەوە چییت کردووە نەونەو..؟! نەونەو.. نەونەو.. نەونەو........!!

ئەم لێی تێدەگەیشت و تەریقدەبووەوە.. ڕووی کەمێ وەردەگێڕا و سەیری ناوی خۆی دەکرد، کە مامی بە ڕەشێکی تۆخ لە قەدی دیوارەکەی نووسیبوو و بۆ خۆشیی پێی دەوت:

ـ هەر کاتێ سەرت بگاتە ئاستی ئەم ناوەی خۆت، ئیتر گەورەبوویت و دەتدەین بە شوو.

هەستی دەکرد چەند پەنجەیەک لەو بەرزترە و ئەقڵیشی هەر ئەقڵی جارانە.. کاتێکیش «شازە» لە کۆڵان هاتەوە و کتێبەکەی بینی، هەر خێرا هەڵیگرت و کێشای بە دەموچاویا.. بۆیەی نینۆک بە پێڵوو و برژانگەکانیەوە نووسا و چاوەکانی دەکزانەوە.. دەکزانەوە و ئارامیان لێدەبڕی.. وایدەزانی کوێربووە و ئیتر تا ماوە ناتوانێت هەڵیانبێنێت.. مێرووڵەکان ختووکەیاندەدا و قێزیدەکردەوە.. دڵی تێکهەڵدەهات و ڕۆحی دەردەچوو.. لە تەمێکی سووری چڕ بەولاوە هیچی تری نەدەبینی و قاچەکانی لەسەر لمێکی وشکدا ئارەقیاندەکردەوە.. دوایی لە دووری دوور دوورەوە کۆمەڵێ تارمایی سپی و ڕەشی دەبینی و وەکوو گوڵەگەنم و گوڵەجۆی بەردەم کزەبای بەهارێکی درەنگ دەشەکانەوە.. لەولاتر سیمای تەڵخی گۆمێ دەکەوتە بەر دیدەی و فڕەی باڵی تیتراوسکە بێڕەنگەکان «شطط.. شطط.. شطط.. شطط»«٨٢» خۆیاندەکرد بە کونی گوێچکەیا.. تێکەڵ بە دەنگی ئامۆژنی دەبوون و خوێنیان وشکدەکرد، کە بەردەوام بە خۆبدا دەکێشا و دەیوت:

ـ خۆم دەکوژم و نامەوێ کچم بە چاوی کوێرەوە ببینم.

ئەم بەرەو گۆمەکە ڕایدەکرد و پێی دەوت:

ـ دان بە خۆتا بگرە ئامۆژنە ڕۆحەکەم، دان بە خۆتا بگرە، من چاوەکانم لەو گۆمە دەشۆم و.......

ئەو گوێی نەدەدایە و وازی نەدەهێنا.. ئەمیش دەیویست زوو زوو خۆی بگەیەنێتە قەراغەکەی و مست مست ئاوەکەی بکات بە دەموچاویدا، یان لەسەر سک پاڵکەوێت و سەری تێخات.. قایم قایم ڕایوەشێنێت و شوێنەواری بۆیەی پێوەنەهێڵێت.. خێرا خێرا بێتەوە و فریای ئەویش بکەوێت، بەڵام ئەو ڕێگایە نەدەبڕایەوە و هەر نەدەگەیشت، کە وەکوو پەراسووی زل زلی گیانداری ئەفسووناوی وابوو و لە ژێر قاچەکانیا کرت کرت دەشکان.. دەشکان و وێنەی چەقۆی نووکباریک دەیانبڕین.. دەیانبڕین و وزەیان تیادا نەدەهێشت.. دڵی جار جار خاو و جار جار خێرا لێی دەدا و سەرەمێکوتەکانی ناوسەری دەورووژان.. قایم کەوت و بە سستی هەستایەوە.. سستتر هەستایەوە و قایمتر کەوتەوە.. کەوتەوە و هەڵنەستایەوە.. پێڵووەکانی قورسبوون و بەسەر چاوەکانیدا کەوتن.... کاتێکیش بە ئاگاهاتەوە و کردنیەوە، دنیا شەو بوو و لەسەر دۆشەگی سپیی ناو چیمەنەکە و ڕوو لە دەرگای داخراوی ژووری ئازووقەدا پاڵیانخستبوو.. «سیامەند» بە فانیلەیەکی عەللاگەی سپییەوە بە دیاریەوە دانیشتبوو و دەستی چەپی خستبووە سەر ناوچەوانە گەرمەکەیەوە.. هەرچۆنێ بوو دەمی هەڵهێنایەوە و بە دەنگێ، کە لەرە باریک و باریکترەکانی تێکشکابوون و وەکوو ورێنەی منالی تادار لە قوڕگیەوە هەڵدەستا، پرسی:

ـ کوا ئامۆژنم..؟! خۆی کوشت..؟!

ـ ئەوە چییتە دڵەکەی سیامەند..؟! ئەوەتانێ وا ئەو ژوورە ڕێکدەخات.

ئەمەی بە هێمنیی وت و بانگی ژنەکەی کرد.. بەڵام ئەو لەبەر تەقوهوڕی خۆی گوێی لێنەبوو و وەڵامی نەدایەوە.. کەچی دوایی لەپڕ سەری بەستراوی هێنایە دەرێ و بە شێوەیەکی زۆر سەیر وتی:

ـ سیامەکەی ڕۆحم، ئەوە هەموویم ڕێکخستەوە و شوێنێکی باشیشم بۆ.....

هاوکات نیگای چاوەکانی کەوتە سەر «نەوال» و قسەکەی بۆ تەواونەکرا،

بەڵکوو هەر خێرا هات و لە تەنیشتیا پاڵکەوت.. ماچی ڕوومەت و قژە خاوەکەی کرد و پێی وت:

ـ بە سائەقەت بم تاقە کچی ماڵە چۆڵەکەم، لە ماوەی نێوان هەموو بوورانەوە و بە ئاگاهاتنەوەیەیەکی تۆدا.........

تەواوی نەکرد و هەر خێرا ڕووی بۆ لای «سیامەند»دا وەرگێڕا.. بە دەستی چەپی پەڕۆ سپییەکەی لە ناوچەوانی کردەوە و لێی پرسی:

ـ پێت وت وەزیری پەروەردە و فێرکردن گۆڕاوە و ئەمساڵ قوتابخانە داخراوە..؟!

ئەم بواری مامی نەدا و بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

ـ یانی من دەبێت جارێکی تریش پۆلی پێنج بخوێنم..؟!

ـ ئا، بەڵام کتێبەکان دەگۆڕێن.

لەولاوە «سیامەند» کردی بە گاڵتە و پێی وت:

ـ ئەمساڵ ڕووم نەدەهات بە هاوڕێکانم بڵێم پۆلی پێنجی، ئینجا دادە ساڵێکی تر.........

«شازێ» لێی تووڕەبوو و پێی وت:

ـ دە باشە دەی..!! تۆش..!!

ئەمەی وت و بە ئەسپایی هەستایەوە.. نەعلە سپیەکانی لە پێکرد و بۆ ژووری ئازووقە گەڕایەوە.. کاتێ قاچەکانی خستە ئەودیو و دەرگاکەی داخست، لە پەنجەرەکەوە سەیری کردن و بە «سیامەند»ی وت:

ـ نازانم تۆ کەی بە قسەی من دەکەی، چەند جارم پێ وتووی کیلۆنی ئەم دەرگایە بگۆڕە و.....

ـ بەسم بیانوو پێبگرە شازێ، هەر ڕۆژێکە لە داخی تۆ.......

دەیان جار لەسەر ئەم شتە هیچوپووچە کردبوویان بە شەڕ و پەلاماری یەکتریان دابوو.. ئەنجام ئامۆژنی لە بەردەمی کولانەی مریشکەکاندا قاچەکانی لێ ڕادەکێشا و قاپە ئاوەکەی بەسەر خۆیدا قلێپدەکردەوە.. ئینجا قایم قایم دەموچاوی دەڕنییەوە و چەپک چەپک قژی دەردەهێنا.. مامیشی پەنجەکانی دەستی چەپی

لەسەر شانی ڕاستی و ئەوانەی ڕاستی لەسەر هی چەپی دادەنا و بە درێژایی ژووری میوان هاتوچۆی دەکرد.. جار جار ئاخی هەڵدەکێشا و جار جاریش سەری خۆی بە دیوارەکاندا دەکێشا.. «نەوال» لە ئاستیاندا دەحەپەسا و نەیدەزانی چییان پێ بڵێت.. هەموو جارێ دەستەکانی دەگرت بە چاویەوە و بیری لە جنێوە ناشیرینەکانیان دەکردەوە، کە دەگەیشتنە گوێچکەی دراوسێکان و ئەم پێیان تەریقدەبووەوە:

ـ ئاخر ناپیاو چ پێویست دەکات دەرگای ئازووقە لە دیوی ژوورەوەڕا دابخرێت..!!

ـ چەنەبازیی نەکەیت قەحبەی کچی قەحبە.. دەبێ بەم داخەوە سەربنێیتەوە..!!

بەڵام کاتێ ماڵی «جیهاد» هاتنە خانووەکەی ئەمدیوبانەوە و دەرگاکەیان کردە نێوانیانەوە، ئاسەنگەرە سپیپۆشەکە لەسەر داوای «سیامەند» کێلۆنەکەی بە یەکێکی تر گۆڕی و لەمەوە دەرگاکە هەر لە دیوی دەرەوەڕا دادەخرا.. ئامۆژنی هەر زوو زوو قژی خۆی دەکرد بە چوار پرچی کەمێ ئەستوور و بە لەچکێکی سپی سەری دادەپۆشی.. دەستەکانی بە کرێمی ناو قوتووە ڕەشەکە چەوردەکرد و دەچووە ژوورەوە.. لە پێشدا بەرامبەر ئەو دوو قاپە چینییە دەوەستا و لێیان وردەبووەوە، کە ڕۆژی دوای گۆڕینی کێلۆنەکە لە قەیسەریە کەمێ تاریکەکەی کڕیبوون و بە دیواریەوە چەسپکردبوون.. ئەمیان سپییەکی لاکێشەیی بوو بە پیتی ڕەش لەسەری نووسرابوو: «قالت یا ویلتی أألد وأنا عجوز وهذا بعلی شیخا، إن هذا لشئ عجیب، قالوا أتعجبین من أمر الله رحمه الله وبرکاته علیکم أهل البیت، إنه حمید مجید ـ ألقران ألکریم»«٨٣» ئەوەی تریان ڕەشێکی چوارگۆشەیی بوو و بە پیتی سپی لەسەری نووسرابوو: «ولکم فی القصاص حیاە یا أولیٖ الألباب لعلکم تتقون ـ ألقرآن ألکریم»«٨٤» ئینجا پشتی بە دیوارەکەی بەرامبەر دەرگاکە دەدا و بە شێوەیەکی چەند بڵێیت سەیر، کە ئەم زۆر هەوڵی دا لاسایی بکاتەوە و نەیتوانی، دەیوت:

ـ من لەناو کاتەکانا ونبووم و مردن لە شوێنەکانا بۆم دەگەڕێت.. ئێوەش لە منارەی مزگەوتەکانا جارم بۆ دەدەن و هاوار دەکەن: هەر کەسێ ژنێکی ناو شازەی

دۆزیوەتەوە، بیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە و بیداتە دەست خاوەنەکەی..!!

ئەو ڕۆژەی «خانزاد»ی مامان بە تەنافەکە خۆی خنکاند و لەسەر وەسیەتەکەی سەرجەمی کەلوپەلی ژوورەکەیان سووتاند، ئەم «مەنار» و «مەسار»ی بانگکردبووە ماڵی خۆیان و ئەو حەوزی ماسیەی پیشاندەدان، کە ڕۆژی پێشوو مامی لە بازاڕی «دریئە»«٨٥» بۆی کریبوو و شێوەیەکی لاکێشەیی هەبوو، ئامۆژنی خۆی خزاندبووە ئەو ژوورە و ئاوای دەوت، ئەمیش تەریقدەبووەوە و خواخوای بوو کەمێ زووتر بڕۆن.. بەڵام ئەوان نەدەڕۆیشتن و بەردەوام زلوونگەیان لەسەر ماسیە ڕەشە وردەکان دەدا، کە لەناو ئەو حەوزە سپیەدا تێکدەقژقژان و وەکوو شووشەی باریکی عەتر دەردەکەوتن.. «دیلهام» قژی خۆی لە ناوەڕاستی سەریا کۆکردبووەوە و لە شێوەی هێلکەشەیتانۆکە بەستبووی، لە دەرگاکەی ناوەڕاستەوە دەرکەوت و هات بۆ لایان.. پەنجەکانی هەر دوو دەستی خستە سەر حەوزەکە و بە قورگی پڕ لە گریانەوە پرسی:

ـ دەزانن بۆچی ئەو ماسیانە سرەوتنیان نییە..؟!

ئەوان بە حەپەساویەوە سەیریان کرد و هیچیان نەوت.. بەڵام ئەم هەر لە خۆیەوە ڕقی لێی هەستا و بە خێسەیەکەوە پێی وت:

ـ ئەمانە ماسیی جوانیین و هەموو جوانییەکەشیان لەو ڕاکەڕاکەیاندایە.

ئەو سەرێکی بادا و بە دەنگێکی شێواوتر لەوەی پێشووی وتی:

ـ وانییە نەوالەکەی ڕۆحم، وانییە، لەودیو دیمەنی ئێمە زۆر بە ناشیرینی دەبینن و زەندەقیان لێمانچووە.

ئەم ئەوەندەی تر لە ئاستی هاوڕێکانی تەریقبووەوە و زیاتر قێزی لە خۆی و لە ماڵەکەی کردەوە.. بنکی دڵی وەکوو هی حەوزی ماسیەکە دەرکەوتبوو و چەوە ڕەشەکەی سەری بۆنی میوەی ڕزیوی ناو بەرمیلی بازاڕی سەوزەفرۆشەکانی لێدەهات.. بەڵام لەجیاتی ماسیی جوانیی، پۆلێ باڵندەی سپیی گۆشتنی ملڕووتی قاچکورتی ناشیرینی لەسەر هەڵنیشتبوو و تێکڕا «خطل.. خطل.. خطل.. خطل»«٨٦» دەیانخوێند.. حەزی دەکرد بەسەر ئەو حەوزەدا بڕشێتەوە و بە تەواوی دیمەنەکەی بگۆڕێت، کە بووە هۆی ڕیسوابوونی لە ئاست میوانەکانی و مەحاڵە

ئیتر بتوانێت سەیریان بکات.. هەمووی مانگێکە هاتوونەتە ئەم گەڕەکە و هەر چەند جارێکە دەیانبینێت.. هێشتا بە تەواوی ڕووی لەگەڵیاندا نەکراوەتەوە و بە پارێزەوە دەیاندوێنێت.. بە لایەنی کەم پێنج ساڵ لەم گەورەترن و ئەم تاکە کچی لە خۆیان منداڵترە هاوڕێییەتی بکەن.. بۆ نەگبەتییش ئەو جارەی لەگەڵ «دیجلە» و «فوڕات»دا چوون و بۆ ماڵیان و لەسەر جۆڵلانەی ناوەڕاستی باخەکەیان دانیشتن، ئەم خۆی بەو هەڵدەکێشا و باسی بلیمەتیی و قسە نەستەقەکانی بۆ دەکردن.. «مەنار» ، کاتێ قاپە کاستەرەکەی دایە دەستی و سەیری چاوەکانی کرد، پێکەنی و وتی:

ـ کەچی من هەرچەند لە تەلەفزیۆن بەو کەمانەوە دەیبینم، وا دەزانم لە ژیانیا قسە ناکات..!!

ـ ڕاست دەکەیت، بەڵام ئەگەر بە ڕاستیی دەیبینی..!!

ئەوا بینی و خۆزگە هەر دەمی نەکردایەتەوە.. باشبوو لەودیو دەنگی «جیهاد» لەناو باخەکەدا بەرزبووەوە و وتی:

ـ ئەوە دەلها تۆ چییت لێهات..؟! من دەستم لە قوڕایە، وەرە دەرگا لە خوشکەکانت بکەرەوە و ئەو ڕادیۆیەش بکوژێنەرەوە.

ئەگینا بەتەمابوو قسەی زۆر ناشیرینتریش دەرپەڕێنێت و لەوە خراپتر ڕۆحی ئەتکبکات.. ئەم هەر خێرا بە فێڵی سەیرکردنی جلەکانی بەرەو ژوورەوەی بردن و لە دەنگی ئامۆژنی دوورخستنەوە.. لەوێ دەرفەتی هێنا و خۆی گەیاندە بەردەم ژووری ئازووقە.. بە دەستی چەپی پاڵێکی پێوەنا و لێی چووە ژوورەوە.. هەستی دەکرد سیمای تەواو گۆڕاوە و هیچ لە هی مرۆڤی ئاسایی ناچێت.. بەزەیی پیاداهاتەوە و خەریکبوو خۆی بخاتە باوەشیەوە.. تێر تێر بۆی بگریت و فرمێسکەکانی دابارێنێتە سەر ئەم شان و ئەو شانیەوە، کە زۆر بێهێز دەهاتنە بەر چاوی و لە ژێر پرچە ئەستوورەکانیدا هەڵدەلەرزین، بەڵام لە کاتێکی ئاوادا ئەمەی بۆ نەدەکرا و ناچار هەر دوو دەستی بە کراوەیی لە چاوە تەپیوەکانی نزیککردەوە.. خێرا ڕایکێشانەوە و بە نینۆکە سوورەکانی ئەملا و ئەولای ڕوومەتی خۆی پێ ڕنینەوە.. لەگەڵیا دانی بە جیڕەوە برد و بە دەنگی نزمی پڕ لە گلەییەوە پێی وت:

ـ بزانە تۆ چۆن من دەکەیت بە گاڵتەجاڕی هاوڕێکانم..!! بزانە چۆن بە هۆی تۆوە هەرچی خەڵک هەیە بە من پێدەکەنن..!!

پشتی تێکرد و بۆ لای کچان گەڕایەوە، کە لە بەرامبەر کانتۆرەکەدا وەستابوون و لە جلەکانیان دەڕوانی.. خۆی هێمنکردەوە و پێی وتن:

ـ لە ماڵی باوکیشم دوو ئەوەندەی ترم هەیە..!!

ئەوان سەیری یەکتریان کرد و بە جووتە دایانە قاقای پێکەنین.. ئەمیش ڕۆحی وەکوو تەختەشەختەی بەیانیانی چلەی زستانی بەر سێبەری دیواری قوتابخانە کرت کرت تێکدەشکا و پەنجەکانی قاچی لەسەر کاشیە ساردەکان تەزوویان پیادادەهات.. «مەسار» پشتی دا بە قەراغی پەنجەرەکە و هەر بە قاقالێدانەوە پێی وت:

ـ بە شێوەیەک دەڵێی ماڵی باوکم، وەک بڵێی شووتکردبێت و.......

«مەنار» دەستەکانی گرت بەملا و بەولای ڕوومەتەکانی خۆیەوە و وتی:

ـ خۆزگە ئێستا دیجلە و فوڕات لێرە دەبوون و گوێیان لێدەبوو..!!

ئەم ڕووی گرژکرد و خەریکبوو لێی تووڕەبێت، بەڵام ئەو مۆڵەتی نەدا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر لێی پرسی:

ـ وایە ئامۆژنت بەتەمایە دیجلە و فوڕات بێنێتە لای خۆیەوە..؟!

ئەم ڕاچڵەکی و وتی:

ـ تۆ لە کوێت زانیوە..؟

ـ ژنان وادەڵێن.

ـ نا، وانییە.

بەڵێ، وابوو و زۆریش لێیان پاڕایەوە، بەڵام ئەوان ڕازیی نەبوون و ماڵەکەی خۆیان بەجێنەهێشت، کە دوای مردنی دایکیان ڕێکیانخستبووەوە و کێلۆنی گشت دەرگاکانیان گۆڕیبوو.. لە هەموو کەسێکیش زیاتر دڵیان بە «ست سوعاد» دەکرایەوە و زۆربەی کات دەچوون بۆ لای ئەو.. جاری وا هەبوو بە حەفتە لای خۆی گلیدەدانەوە و یەکێ لە ژوورەکانی نهۆمی سەرەوەی کردبوو بە هی ئەوان.. ئەو ژوورەی جاران کەلایانخستبوو و کردبوویانە شوێنی کەلوپەلی شکاو و

بێکەڵک.. جارێکیش پشیلەیەکی ڕەش تیایدا زاوزێی کردبوو و بێچووە سپییە چاونەپشکووتووەکانی لە گۆرەویی لوولکراوی ژنانە دەچوون.. تەواو گۆڕیبوویان و دڵت نەدەهات سەیری بکەیت.. پاککرابووەوە و هەموو شتێ بە ڕێکی و لە شوێنی شیاوی خۆیدا دانرابوو.. «نەوال» بە جوانترین شوێنی ماڵەکەی دەزانی و ئاواتی دەخواست هی خۆی بووایە.. لە وەخت و ناوەختا خۆی پیادەکرد و دیقەتی لە شتەکانیان دەدا.. تا درەنگی شەو لە لایان دادەنیشت و هەندێ جار لەسەر جێگاکانیان خەوی لێدەکەوت.. نیوەشەوێکیان لەگەڵ دەنگی گریانی «دیجلە» بێداربووەوە و چاوەکانی کردەوە.. ئەو وێنەیەکی «شاسوار»ی بە ئاوێنەکەوە چەسپکردبوو و مەست و بێهۆش لێی ڕادەما.. فرمێسکی ورد وردی هەڵدەڕشت و سووک سووک بۆ ناو سنگی دەتکان.. ئەم درزی ئاسۆیی کردە چاوەکانیەوە و دیقەتی لێی دەدا، کە لە ژێر گڵۆپە ستوونیە کەمێ ڕووناکەکەی باوکی بۆی هێنابوون و کاتی خەوتن دایاندەگیرساند، جوان دیاربوو و دەیتوانی کەم و زۆر لە نهێنییەکانی ناخی بگات.. بۆ بەیانیەکەشی لە مووبەقەکەدا دەرفەتی هێنا و بە «فوڕات»ی وت:

- دەزانی مامە شاسوارم وێنەی خۆی داوە بە دیجلەی خوشکت..؟!

ئەو بە حەپەساویەوە سەیری کرد و پێی وت:

- نەیداوەتێ، دۆزیویەتیەوە.

ئەم تووڕەبوو و بە ڕووی گرژەوە پێی وت:

- دۆزینەوەی چی..؟! خۆ من مناڵ نییم.. دەزانم یەکتریان خۆشدەوێت..!!

ئەو ڕۆژەی «وادی»ی فڕۆکەوانی تاقە کوڕی «نەجم»ی گۆڕهەڵکەن فڕۆکەکەی سووتا و تیایدا بوو بە قەرەبرووت، ئامۆژنی لە بەردەم مووبەقەکەدا ماسیی پاکدەکرد و ئەوانیش یارمەتییان دەدا، «شاسوار» تازە لە حەمامەکە هاتبووە دەرێ و لەسەر کورسیی هەیوانەکەدا دانیشتبوو، بە خاولیەکی سپی قژە خاو و تەڕەکەی وشکدەکردەوە و باسی مناڵیی خۆی بۆ دەکردن، ئەم بە سەری پەنجەی دۆشاومژە و ئەسپێکوژەی دەستی چەپی پوولەکە ڕەشەکانی لە چەقۆ سپییە نووکباریکەکە داماڵی و پێی وت:

ـ ئەوە مامە شاسوار بۆچی هەر جارێ ئێمە ماسیمان هەبێت، تۆ باسی منالّیی خۆتمان بۆ دەکەیت..؟!

«دیجلە» هەر خێرا بە پشتی دەستی ڕاستی پەرچەمەکەی لەسەر چاوەکانی لادا و زۆر مەکربازانە پێی وت:

ـ ئەی خۆ باسی پیریی خۆبشیمان بۆ ناکات..!!

ئەم تووڕەبوو و پێی وت:

ـ تۆ هەقی ئێمەت نییە و لەوەش زیاتر چەنەبازیی نەکەیت.

ئەو دلّی پڕبوو و وەکوو منالّ لچی هەلّهێنایەوە.. لەپڕ ماسیەکەی دەستی هەلّدایە ناو تەشتەکە و دایە گریانێکی بەکولّ.. هەستایەوە و بە هەنگاوی گورج گورج بەرەو لای دەرگاکە چوو.. «شازە» هەناسەیەکی قوولّی هەلّکێشا و پێی وت:

ـ وەرە دیجلەکەی ڕۆحم بگەڕێرەوە، ئەو ماسیانە بەسەر ئێمەدا بەجێمەهێلّە چاوەکەم.

هەر بە دەستە چەورەکانی دەرگاکەی کردەوە و بەرەو مالّی خۆیان چوو.. «شاسوار» دوایکەوت و بەردەوام پێی دەوت:

ـ وەرە دیجلە بۆ کوێ ئاوا ملت پێوە ناوە..؟!

ئامۆژنی سەرزەنشتی ئەمی کرد و پێی وت:

ـ تۆ کەی واز لەم زماندرێژیەت دەهێنی..؟! بڕۆ داوای لێبووردنی لێبکە و ئاشتی کەرەوە.

«فوڕات» هەر خێرا هەلّیدایە و وتی:

ـ با نەچێت، چونکە دەجلی هەر کاتێ یەکێ تووڕەی بکات و دلّی بشکێنێت، وەکوو منالّ لەسەر تاقی پەنجەرەکە دادەنیشێت و قاچەکانی شۆڕدەکاتەوە، دەستەکانی دەگرێت بە چاوەکانیەوە و دەگریت.. دەگریت و بەردەوام دەلّێت: «ئای ئەو مالّەی خۆمان دروستمان کردووی و هیچ باوکێ ڕێی تێتناکەوێت، لە کەلێنی پەنجە فرمێسکاویەکانما چەندێ بە چۆلّیی دەتبینم..!!» ئیتر تا خەوی لێنەکەوێت و بە ئاگانەیەتەوە، نابێت هیچ کەسێ بچێت بەلایەوە، چونکە لەو

کاتانەیا هەر دەنگێ ببیستێت، دەکەوێتە ڕنینەوەی قژی خۆی و چەپک چەپک دەریدەهێنێت.

ئەم سەیرێکی کرد و بە شەرمێکەوە لێی پرسی:

ـ ئەی بۆچی بە مامە شاسوارت نەوت بگەڕێتەوە..؟!

ـ جا خۆ ئەو........!!

تەواوی نەکرد و هەر خێرا و بە شێوەیەکی سەیر لە «شازە»ی ڕوانی.. بە جووتە سەریان داخست و خۆیان بە پاککردنی ماسیەکەوە خەریککرد.. ئەم خۆی نەگرت و چووە کۆڵان.. لە قاپیەکەی ئەوانی ڕوانی و کەسی لەوێ نەبینی.. «شەمرووخ» بە قاتە ڕەشەکەیەوە لە دەرگای ماڵی «نازە»وە هاتە دەرێ و بە هەنگاوی گورج گورج بەرەو ڕووی هات.. گەیشتە لای و وەکوو زۆر جاری دیکە پێی وت:

ـ هەر ڕۆژێکە ئەو شازەیە هەڵدەگرم، تۆ بێ ئامۆژن و سیامەند بێ ژن دەهێڵمەوە.

«نەوال» دەیان جار لەسەر ئەم قسەیە لەگەڵیا کردبووی بە شەڕ و هەرچی جنێوی سووک هەبوو پێی دابوو، ئەویش حەزی لەو بەزمەبوو و زیاتری دەدا بە دەمەوە.. هەندێ جار لەو ژوورەی خۆیان دەستی دەکردە ملی «شازە» و وەکوو پیاو ماچی سەر کولمەکانی دەکرد، یان پاڵیدەخست و دەیخستە ژێر خۆیەوە.. ئیتر ئەم گڕی دەگرت و بە چەپۆک تێیدەکەوت، بەڵام لە کاتێکی ئاوادا نایپەرژێتە سەری و گوێی خۆی لێ کەڕدەکات، ئەگەرچی ئەو وازناهێنێت و پێی دەڵێت:

ـ ئەو چەند ساڵەی لای سیامەندە، لای من بوایە، ئێستا کۆشێ منالم لێی هەبوو..!!

«شازە» سەری لە دەرگا هێنایە دەرێ و وتی:

ـ وەرە ژوورەوە شەمە، لە ژیانما وەکوو ئەمڕۆ ئێشم پێت نەبووە..!!

ئەو بە دەستی چەپی تەربووشەکەی لەسەری کردەوە و بەدەم سەیرکردنی چاوەکانی ئەمەوە قاچی خستە ئەودیوەوە.. لێرە دەرگایەک و لەوێ یەکێکی تر، ئەم سەراسیمە و ئەبڵەق لێی دەڕوانین و نەیدەزانی خۆی بکات بە کامیاندا..

گیانی ببوو بە گۆزەیەکی ئەنتیکی سەردەمە زۆر زووەکانی مێژوو و موچوڕکەکان دڵۆپ دڵۆپ و لەسەر ئاوازی تیم.. تیم.. تیم.. تیم دەتکانە ناویەوە.. سووک سووک ئاگای لە دەوروبەری خۆی دەبڕا و ناو کۆڵانەکەی وەکوو ئەشکەوتێکی تەسک و درێژی شاخی بەرزی هەتاونەدیوی ڕۆژپەرستەکان دەهاتە بەر چاو.. لەپڕ لەگەڵ تەقەی پێڵاوی بنقاڵتاغی کەمێ بەرزی پیاوی کارەباکە بە ئاگاهاتەوە و بە ترسەوە ئاوڕی بۆ دایەوە، ئەوەی ژنە ئێجگار قەڵەوەکەی فەرمانبەری هەتیوخانە بوو و جارێکیان لە خەونیدا قژی ئەمی کردبوو بە چوار پرچی باریکی درێژ.. دەفتەری وەسڵە ڕەشەکانی بە دەستی ڕاستی گرتبوو و قەڵەمە سپیەکەی خستبووە سەر گوێچکەی چەپیەوە.. دوای چەند ماڵێک لە دەرگاکەی ئەمانی دا و وتی:

ـ شەستوهەشت.

ئەمە عادەتی ئەو بوو و هەموو جارێ هەر ئاوای دەکرد.. ژمارەی سەر دەرگاکانی دەخوێندەوە و بە ئەسپایی دەچووە ژوورەوە.. مانگی جارێ دەهات و ماڵ بە ماڵ دەگەڕا، کەچی لە ژمارە زیاتر هیچی تری لە دەم دەرنەدەچوو و لای خەڵکی گەڕەک ببوو بە مەتەڵێکی سەیر.. ئێوارەیەکان «جەمووڵ ئەجهەر»ی مێژوونووس دەرگای لێکردەوە و لە سیمای وردبووەوە.. ئەم شان و ئەو شانی گرت و توند ڕایتەکاندن.. ڕایتەکاندن و پێی وت:

ـ تا پێم نەڵێی تۆ بۆچی قسە ناکەیت، ناهێڵم دوو پێت بخەیتە ماڵەکەمەوە.

بەڵام ئەو سەری بادەدا و بەردەوام دەیوت:

ـ حەفتاوپێنج.. حەفتاوپێنج.. حەفتاوپێنج.. حەفتاوپێنج......

بەیانییەکی مانگی پێشوو کوڕە کوردە چوارشانەکەی، بە شەقاوەی گەڕەک ناسرابوو و کەس نەیدەوێرا قسە لە قسەیدا بکات، پشتی نووساند بە دیوارەکەی خۆباندا و بە بۆکس تێیکەوت، ئەو دەفتەری وەسڵەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە و بەدەم گریان و لە شێوەی پاڕانەوە دەیوت:

ـ سیبیویەک.. سیبیویەک.. سیبیویەک.. سیبیویەک......

ـ سیبیویەک سیبیویەکی چییتە خوشکحیز، تۆ بۆ حیسابی کارەبا هاتووی، یان یاریی دۆمبەڵەمان بۆ دەکەیت..؟!

ـ سیبویەک.. سیبویەک.. سیبویەک.. سیبویەک.....

«شاسوار» لە ژێر دەستیا دەریهێنا و دەفتەری وەسڵەکەی خستەوە بن هەنگڵی.. بە دەمولووتی شکاوەوە ڕایکرد و کۆڵانەکەی بەجێهێشت.. کەچی وا جارێکی تر ساغڵەم هاتۆتەوە و ئێستا لە ماڵی ئەماندا خەریکی خوێندنەوەی ژمارەی ژێر جامی سپیی چوارگۆشەیی سەعاتە ڕەشە لاکێشەییەکەی قەد دیواری ژووری ئازووقەکەیانە، کە جووتێ کوکووختیی گۆشتن هێلانەیان لەسەر کردووە و شەوان لەناو تاریکاییدا وەکوو دوو قۆریی چا دەردەکەون.. پووشە سپیە درێژەکان، کە لە قژی «ست ئەنفال» دەچن و بەملا و بەولایدا شۆڕبوونەتەوە، دیمەنێکی زۆر سەیریان پێ بەخشیوە و هەر بە ڕاستیی وەکوو دەموچاوی بنیادەم دەردەکەوێت.. ئەو جارەش پاڵتۆ ڕەشە درێژەکەی ئامۆژنی لە دارێکی درێژی سپی هەڵکێشا و خستیە ژێریەوە.. چوو بانگی «نێرگز»ی کرد و پێی وت:

ـ چاوت خێلکە و سەیری بکە، بزانە هەر بە ڕاستیی لە ست ئەنفال ناچێت..!!

ئەو قاقای لێ دەدا و پێی دەوت:

ـ ئیتر من ناتوانم بێم بۆ قوتابخانە، چونکە هەر چاوم پێی بکەوێت ئەمەم بیردەکەوێتەوە و.......

«جیهاد» سەری لە دەرگاکەی ناوەڕاستەوە هێنایە دەرێ و سەرنجی لێ دا.. پەنجەکانی خۆی لە یەکتر هەڵکێشان و وتی:

ـ خۆزگە ئێستا پیاوی کارەباکە دەهات و سەیری دەکرد..!!

ئەم چاوەڕێیبوو مامی بێتەوە و بیبینێت، چونکە دەیزانی ئەو زۆری پێخۆشە و کۆمەڵێ قسەی سەیربشی بۆ دەکات، بەڵام دنیا تەواو تاریکداهات و ئەو هەر نەهاتەوە.. کووکووختیەکانیش نەیاندەوێرا بێنەوە سەر هێلانەکەیان و بەردەوام لەسەر ئەم دیوارەوە بۆ سەر ئەو دیواری ماڵەکە هەڵدەفڕین.. ئامۆژنی پاڵتۆکەی لابرد و پێی وت:

ـ با بێنەوە شوێنی خۆیان و داسەکنێن، چونکە من بە شەو گوێم لە فڕەفڕی باڵندە بێت، دڵم دەگوشرێت..!!

تاوێ دواتر «سیامەند» بە سەرخۆشیی لە دەرگا پەیدابوو و وەکوو پیاوی کارەباکە وتی:

ـ شەستوهەشت.

«شازە» قاقایەکی بەرزی لێ دا و پێی وت:

ـ وەی بە قوربانت بم سیامەکەی ڕۆحم، خۆ ڕێک وەکوو ئەوی دەڵێی..!!

ـ وانییە شازێ، وانییە، هیچ کەسێ نازانێت وەکوو ئەوی بڵێت.. ئینجا بۆ زانینیشت ئەمڕۆ ئەنجامی یانسیبە گەورەکە بڵاوکرایەوە و بۆ ئەو دەرچوو..!!

ـ گاڵتە دەکەی..!!

ـ بە گیانی تۆ.

ـ کەوابێ ئیتر واز لە ئیشەکەی دەهێنێت و دوورنییە قسەش بکات..!!

ـ خەیاڵت خاوە.. بە چاوی خۆم بینیم، کاتێ ئەنجامەکەی بیست، لەجیاتی هەموو شتێ هەڵدەپەڕی و دەیوت: پێنجهەزار.. پێنجهەزار.. پێنجهەزار.. پێنجهەزار.....

چاکەتەکەی داکەند و وتی:

ـ شتێکی تریش هەیە تۆ نەتزانیوە، برایەکی هەیە لەگەڵ خۆی بە سکێ لەدایکبووە و کتومتیش لەو دەچێت، سەعاتی کارەبای گەڕەکەکانی ئەوبەر دەخوێنێتەوە و وەکوو خۆی لە ژمارە زیاتر هیچی تر ناڵێت.. دوای دەوام بە جووتە لە پەنا دیواری مزگەوتی حاجی ئیبراهیم دادەنیشن و لەسەر گووپ شێروخەت دەکەن.

«شازە» دەستەکانی گرتبوو بە سکی خۆیەوە و قاقای لێ دەدا.. لە تاوا خۆی بۆ دابین نەدەکرا و بەملا و بەولادا دەکەوت.. جار جار بە حاڵ سەری هەڵدەبڕی و دەیوت:

ـ جا من سەری مانگ چۆن دەتوانم وەسڵەکەی لێ وەرگرم و پێنەکەنم..!!

ئەو ڕۆژە دەنگی قاقالێدانی ئەو و «شەمرووخ» تێکەڵ بە یەکتر دەبوون و دەگەیشتنە کۆڵانە کشوماتەکە.. ئیتر ئەم ئەوەندەی تر سەراسیمە دەبوو و گومانەکانی ناو سەری وەکوو سەرمێکوتەی بزێو کەوتبوونە جووڵەجووڵ..

کاتێکیشی زانی کابرا لە دەرگای ماڵی «جیهاد»ـەوە هاتە دەرێ و بە شێوەیەکی زۆر سەیر بەمی وت:

ـ مردنەکان کۆی چەند پیرۆزبایییەکی جەژنی لەدایکبوونن..!!

ئەم ترسێکی سەیر دایگرت و ڕایکردە ماڵەوە.. خۆی خستە باوەشی «شەمرووخ»ـەوە و دەستەکانی توند توند لە ناوقەدی ئاڵاند، کە لەسەر سەری «شازە» وەستابوو و قژی بۆ دەهۆنیەوە.. وردە وردە ئاگای لە خۆی دەبڕا و تا دەهات سیمای شتەکانی تەڵختر دەبینی.. کاتێکیش هاتەوە هۆش خۆی و لەسەر دۆشەگی ناو چیمەنەکە چاوەکانی کردەوە، دنیا تاریکبوو و «دیجلە» و «فوڕات» بە کراسی خاڵخاڵی وەک زاری تاوڵە خەمناک لەملا و لەولایەوە دانیشتبوون.. هەر جارێ ئەوان ئەو ماکسیانەیان لەبەربکردایە و بە تۆقەی لەقلەق قژیان لە دواوە ببەستایە، ئەم دەیزانی تووشی بەڵایەک بوون و لە خەڵکی دەشارنەوە.. ئێوارەی پێش کوژرانی «شاسوار»یش، کاتێ ئەم قاڵبی کێکی بۆ «لەیلا»ی دایکی «ئیبداع» و «ئەرواح» دەبردەوە و بە لای ماڵەکەیاندا تێپەڕی، ئاوای بینین و دڵی داچڵەکی.. ویستی هەر لە دەرگا بیانداتە دەست و خێرا بگەڕێتەوە، بچێت بۆ لایان و بزانێت چییان بەسەرهاتووە، بەڵام لەوێ کچان نەیانهێشت بێتەوە و بردیانە ژوورەکەی خۆیانەوە.. وەکوو زۆر جاری تر ئەتڵەسەکەیان هێنا و دەستیان کرد بە یاریی دۆزینەوەی ئەو لادێ و شارۆچکانەی بە ڕەشی ئێجگار ئێجگار ورد لەسەر نەخشەکان نووسراون.. ئەوان هەر ناوێکیان دەوت و ئەتڵەسەکەیان دەخستە بەردەمی، ئەم هەر خێرا دەیدۆزیەوە و پەنجەی تووتەی دەستی چەپی دەخستە سەر.. کەچی ئەوان وانەبوون و هەمیشە دەیاندۆڕاند.. دوایی تاقەتیان لێیچوو و گۆڕیان بە مەتەڵی ماڵماڵانێ.. لەمەیاندا ئەم کۆڵ بوو و لێی نەدەبردنەوە.. ئەوان ژمارەی خێزانێ لە خێزانەکانی گەڕەکیان دەوت و ئەم دەبوایە هەڵیبهێنایە.. یان ئەم بیوتایە و ئەوان بەدوایدا بگەڕانایە.. کاتێکیش دوو پەنجەی دەستی ڕاستی قوچاند و وتی:

ـ ژن و پیاوێک کچێکیان هەیە.

ئەوان زۆر بیریانکردەوە و نەیاندۆزیەوە.. دوایی پێکەنی و وتی:

ـ ماڵی خۆمان.

بۆیان حیساب نەکرد و تەریقیشیان کردەوە.. «ئەرواح»، کە هەموو گەڕەک لە زمانە هارەکەی دەترسان و خۆیان لێی دەپاراست، لچێکی لێ هەڵقورتاند و بە گاڵتەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ ئەگەر دەتەوێ بیبەیتەوە، بچۆرەوە ماڵی خۆتان و لەگەڵ خەڵکی گەڕەکی خۆت یاری بکە..!!

«ئیبداع» سەرێکی بادا و بە قاقالێدانەوە وتی:

ـ لەوێ هەر نایباتەوە..!!

ئەم تووڕەبوو و پێی وتن:

ـ بۆ من ئێرە و ئەوێ یەکە و ئێوە......

«لەیلا»ی دایکیان، کە لە «نفووس و سەرژمێری»یدا ژمێریار بوو و لەبەر دزیی دەریانکردبوو، بە تووڕەیی لێیان هاتە ژوورەوە و بەم دەست و بەو دەست قژی هەر دووکیانی گرت.. ڕایدەکێشان و پێی دەوتن:

ـ چەند جارم پێ وتوون واز لەم یارییە هیچوپووچە بێنن..؟! کەی باوی یاریی ئاوا کۆن.........

ئەم نەعلەکانی لە پێکرد و ماڵەکەیانی بەجێهێشت.. ویستی بچێت بۆ لای «دیجلە» و «فوڕات» و بە چەند هەنگاوێ خۆی گەیاندە بەر دەرگاکەیان.. لەوێ پەشیمانبووەوە و ڕێی ماڵی خۆیانی گرتە بەر.. «شاسوار» جلە سەربازیەکانی لەبەرکردبوو و لەسەر کورسیەکە قەیتانی جەزمەکانی دەبەست.. لەپڕ هەستایە سەرپێ و جانتا ڕەشەکەی هەڵگرت، کە زنجیرە سپییەکەی ئەسپێکی ڕەشی پلاستیکی پێوەبوو و کلکە سپیەکەی لە قژی دوا بووکەشووشەی کاتی منداڵیی ئەم دەچوو، ئەوەی خۆی بۆی کڕیبوو و زۆر جار لەناو بێشکە هەڵواسراوەکەی قەد دیواری هەیوانەدا نواندبووی.. بە هەنگاوی گورج گورج بەرەو دەرگاکە چوو و لەوێ، ڕێک لەو شوێنەی بەیانییەکی زووی بەهارێکی درەنگوەخت سەگێکی سپیی ئێجگار زلی چاوزەقی خورافی سەری خستبووە ناو سەتڵێکی ڕەشی قووڵی بە سەرەمێکوتە نەخشاو و «صلصال.. صلصال.. صلصال.. صلصال»«٨٧» ئاوی

دەخواردەوە؛ ئاوڕێکی بۆ دایەوە و لە سیمای ڕوانی.. دەستی ڕاستی خستە سەر دەمانچەکەی بەر پشتی و بە دەنگێکی شێواو، کە ئەم پێشتر تەنها لە خەودا گوێی لێبووبوو و هەموو جارێکیش لەگەڵ ڕاچەنیندا بە ئاگاهاتبووەوە، وتی:

ـ ئەگەرچی هیچ شوێنێ نییە بۆ وەستان، کەچی من خۆشمدەوێیت نەوال..!!

ویستی وەکوو سەردەمی منالّیی، خۆی بخاتە باوەشیەوە و بە سەری پەنجەکانی سووک سووک ئەم شان و ئەو شانی بشێلێت.. بە ماچی یەک لە دوای یەک لامل و ناوەدەمی بتارزێنێت و بۆ ساتێ وا هەست بکات لە لمێکی نەرمی بەر هەتاوی گەرمی کەنار دەریای پاشماوەی خەونی بەرەبەیانێکی فێنکی پاییزی سەربانی خۆیاندا نقووم دەبێت، بەڵام خۆیشی نەیزانی بۆچی پەشیمانبووەوە و واینەکرد.. واینەکرد و ڕووی لێ وەرگێڕا.. تەنانەت ئەو کاتەش ئاوڕی بۆ نەدایەوە و نەیویست لەوە زیاتر سیمای تێکشکاوی ببینێت، کە ئەو ئاخێکی قووڵی بەرزی هەڵکێشا و بە دەنگێکی شێواوتر لەوەی پێشووی پێی وت:

ـ کلیلی ماڵەکەی خۆمم لەناو کانتۆری جلەکانی تۆ داناوە و بیدە بەو پیاوەی ڕۆژانی پێنجشەممە لە یەکە بە یەکەی دەرگاکان دەدات و دەڵێت: خانوویەکی بەتاڵ پێنازانن بۆ خۆم تیایدا بمرم.؟!

هەستیشی دەکرد چووە بۆ لای «دیجلە» و شەو لەوێ دەمێنێتەوە.. تا درەنگ بیری لێکردەوە و بە درێژایی ژووری میوان هاتوچۆی کرد.. ئاخی هەڵکێشا و پیشی خواردەوە.. بەیانی زوو پێش مامی و ئامۆژنی لە خەو هەستا و بە فێڵی نانکرین لەو نانەواخانەیەی ئەوبەر ڕێی ماڵەکەیانی گرتە بەر.. پێویستی بەوە نەبوو بیربکاتەوە و درۆ هەڵبەستێت، چونکە پێی دەوت خەونی دیوە و هەر خێرا هاتووە بۆ لای.. ئەو حەزیدەکرد و زۆر جاریشی پێ وتبوو، کە بۆ لێکدانەوەی خەون پێی ناخۆش نییە لە خەو هەڵیستێنن و لەزەتیشی لێدەبینێت.. دەرگاکەی بە کراوەیی بینی و سەرسام بوو.. چووە حەوشە و چەند جارێ بانگی کرد:

ـ دیجلە، فوڕات..!! دیجلە، فوڕات..!!

وەڵام نەبوو و ترسا.. هەر بەو ترسەوە پاڵی بە دەرگای ژوورەکانەوە نا و نەیبینین.. گەڕایەوە و بە پڕتاو خۆی کردەوە بە ماڵی خۆیاندا.. چووە ژوورەکەی

«سیامەند» و «شازە» و بە هاوار هاوار لە باوەشی یەکتری دەرهێنان:

ـ چییتە بەم بەیانییە زووە..؟!

ـ دیجلە و فورات نەماون و دەرگای حەوشەکەشیان.....

لە کۆڵان بڵاوبووەوە و ئەملا و ئەولایان بۆ گەڕان.. سەرەتا وایانزانی چوون بۆ لای «ست سوعاد» و شەو لەوێ ماونەتەوە، بەڵام ئەم دەیزانی ئەوان لە ڕۆژی بڵاوبوونەوەی هەواڵی پەیدابوونی «کاکەسوور»ـەوە نەدەهاتن بۆماڵیان و هەرگیز لەو نهێنییەش تێنەدەگەیشت.. تا دنیا تاریکدانەهات و تەرمی شێواوی «شاسوار» نەگەیشتەوە گەڕەک، هەر هەمووی سەرسام و ئەبڵەق لە خۆیان و لە یەکتریان دەپرسی و وەڵامیشیان دەستنەدەکەوت.. «مەنار» و «مەسار» لەوەدەچوو شتێکیان زانیبێت و نەیانەوێت بە کەسی بڵێن.. ئەم هەستی پێکردبوون و ڕۆژ نەبوو بە گیریان نەهێنێ، بەڵام ئەوان نکوڵیان لێدەکرد و زۆر جاریش لێی تووڕەدەبوون.. ئەو ڕۆژە «مەنار» لە ڕێگەی بازاڕی «سلالە»دا شیعری «بە هاژەوە لەسەر خاکی هەتاونەدیوی خەیاڵ هەڵقولاَن و بە بێدەنگیی لەناو دێڕەکانی سەر لاپەڕە داخبووەکانی جۆگرافیادا وشکتانکرد»ی لە گیرفانی جانتا ڕەشەکەی شانی چەپی دەرهێنا و بە نەغمەیەکی زۆر دڵگیر بۆی خوێندەوە، کە تازە نووسیبووی و پێشکەشی ئەوانی کردبوو.. ئەم دەستی کرد بە گریانێکی بەکوڵ و بە هیچ کلۆجێ بۆیان ژیرنەدەبووەوە، ئەو شیعرەی دواتر «نیهال فەهد»ی سەرۆکی تیپەکەیان ئاوازی بۆ دانا و ئەم بە دەنگە خورافییەکەی چڕی.. چڕی و هەر خێرا بە هەموو وڵاتدا بڵاوبووەوە.. ئەو کراسە فشۆڵەی ئەو ڕۆژەش لەسەر زەوقی ئەو و «مەسار»ی خوشکی لە کۆگای «أشبین و أشبینە» کڕی و شەوان بۆ نووستن لەبەریدەکرد، دەیتوانی وشە بە وشەی شیعرەکەی بیربخاتەوە و وەکوو پۆلێ کەناریی ڕاونەکراوی سەر درەختی قەدپاڵی شاخە دوورەدەستە مرۆڤنەدیوەکان لەناو سەریا بخوێنن، بەڵام ئەو شەوەی دوای «سیامەند» کەوت و بەرەو ژووری ئازووقە چوو، تا بە دیاریەوە بوەستێت و سەیری بکات، کاتێ ئەو دەست دەنێتە قوڕگی «شازە» و دەیخنکێنێت؛ لە لقێکی ئەو گوڵە سپیە دڕکاویەی سەر ڕێگا گیربوو و دڕا، کە ئەم و «شاسوار» خۆشیاندەویست و ناوەکەیان نەدەزانی.. لە

ژوورەوە لەبەر ڕۆشنایی چرا هەڵواسراوەکەی قەد دیواری پشت ئامۆژنی کەمێ بۆ سەرەوە هەڵیکرد و سەرنجی لێ دا.. کسپە لە دڵیەوە هات و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.. ئەو چرایەش، کە لەوێ هەڵواسرابوو و کەمێ گڕەکەی کزکرابوو، شتێکی باشبوو و ئەم زۆر زۆری بە دڵبوو، چونکە دەیتوانی سێبەرەکانیان بخاتە سەر کاشیەکان و ئیتر ئەم ڕەنگە بوێرێت سەیریان بکات.. سەرنجی ورد و بە دیقەتیان لێ بدات و قێزنەکاتەوە.. کەچی نەیزانی خەتای تیشکەکانی ئەو بوون، یان چاوەکانی خۆی، هەر جارێ دیمەنەکەیان بۆ شتێ دەگۆڕا و ئەم لە ترسا زیرەی دەکرد.. دواجار وەکوو دوو ورچی زل هاتنە بەر بینایی و هەر بە جارێ خوێنی وشکبوو، کە لەسەر دوو قاچ وەستابوون و بە زمان یەکتریان دەلستەوە.. کاتێکیش لە ژووری نووستن، لەناو باوەشی «سیامەند»دا بە ئاگاهاتەوە و چاوەکانی کردەوە، کات بەیانییەکی درەنگ بوو و ژوورەکە بۆنی مێخەکی لێدەهات.. تیشکە سوورەکانی ڕۆژ جامی پەنجەرە و پەردە تەنکەکەی سەر ڕوویان سمیبوو و ختووکەی سەر پەنجەی قاچەکانیان دەدا.. ئەگەرچی ناولەپ و سەرئەژنۆکانی ئازاریان هەبوو و بەردەوام دەیانتریواند، بەڵام هەرچۆنێ بوو لەناو جێگا هاتە دەرەوە و بەبێ چەندوچوون بەرەو ژووری ئازووقە چوو.. «نازە» و «نێرگز»ی بینی و دڵی داچڵەکی، کە خەمناک خەمناک پشتیان دابووە دیوارەکە و بێدەنگ بێدەنگ دانیشتبوون.. لەوبەریش کچان لە دەرگاکەی نێوانیان وەستابوون و سەریان هەڵنەدەبڕی.. خۆبشی نەیزانی چۆن دەمی هەڵهێنایەوە و بە دەنگێ، کە کەروێشکەکان بە چڕنووکی تیژ لە ناخی ناخی دڵیان دەرهێنابوو و لەگەڵ گڵمتەخۆڵی نەرمی نەرم ورد وردی شێدار شێدار دەردەچوو، دەیوت:

ـ ئامۆژنم مرد..؟! خۆ من نەمبینی..!! ئاخ چاوە بێکەڵکەکانم کوێربن..!!

لەپڕ وەکوو شێت ڕایکردەوە لای «سیامەند» و توند توند ئەم شان ئەو شانی گرت، کە ئەوسا هەر لەسەر تەختی نووستنەکەدا خۆی خستبووە سەر ئەژنۆ و وێنەی بتپەرست دەستەکانی گرتبوو بە سنگیەوە.. بە هێز بە هێز ڕایدەتەکاند و پێی دەوت:

ـ من لە هیچ شتێکی ئەم ماڵە تێناگەم..!!

ئەویش بەحاڵ دەمی دەکردەوە و بە دەنگێکی زۆر کز دەیوت:

ـ منیش وەکوو تۆ نەوالەکەی ڕۆحم، منیش وەکوو تۆ..!!

دواییش، کە هەستایەوە و لە بەرامبەر ڕۆژژمێرەکە وەستا، لاپەرە (پانزدە)ی لێکردەوە و بە قورگی پڕ لە گریانەوە وتی:

ـ ئەمڕۆ (شانزدە)ی (مارت)ـە، جەژنی گۆڕهەڵکەنەکانە، دەبێت هەر خۆمان بیشۆین و بینێژین.. تۆ دەتوانی سەیری بکەیت، کاتێ ژنان.......

ـ جا من بۆچی سەیری بکەم..؟!

ـ هیچ.. هەروا.. دەڵێم ئەگەر حەزبکەیت..!!

ـ حەزناکەم..!!

ـ ئارەزووی خۆتە..!! خۆ من زۆرت لێناکەم..!! ئەگەر خۆت نەتەوێت، من ناتوانم ناچارتبکەم.......!!

ـ تۆ قەت دیوتە مردوویان شتبێت..؟!

ـ یەک جار بە منالیی، ئەویش پێکەنین گرتمی و پیاوان بە زللە کردمیانە دەرێ.

ـ جا بۆچی پێکەنییت..؟!

ـ چونکە ئەو پیاوەی دەیانشت، زۆر لە پیاوی ناو گلۆپی ترافیکەکە دەچوو.

ـ کامە..؟! ڕەشەکە، یان سپیەکە..؟!

ـ سپیەکە..!! دیوتە چۆن وەستاوە و جووڵەی لە خۆی بڕیوە..؟! ڕێک ئاوابوو، بەڵام لەسەر پشت..!!

ـ بۆیە کاتێ ئامۆژنم لەچکی دەکردە سەر و لەسەر دەم ڕادەکشا پێت دەوت: لە پیاوی ترافیکەکە دەچییت..؟!

ـ تۆ واز لەمە بێنە، من دوو برای زۆر ناشیرینی لەیەکچوو دەناسم و بە سکێ لە دایکبوون، چەند بڵێی ڕقیان لە یەکترە و هیچیان نایەوێت ئەویتریان ببینێت.. باوکت بە ماوەیەکی کەم پێش مردنی پرسی: لە چی دەچن..؟! من پێیم وت: لە.......!!

ـ جا کامیان ئەوەیە، کە دەڵێت بوەستن و کامیشیان ئەوەی دەڵێت بڕۆن..؟!

ـ باوکیشت هەمان پرسیاری کرد و من پێیم وت: بۆ ئەوان ئەوەی گرنگە ئەوەیە بە یەکەوە دەرنەکەون..!!

ـ بەڵام هەق بەوانە، چونکە ئەگەر هەر دووکیان بە جارێ دەربکەون، پیادە و لێخوڕەکان سەریان لێدەشێوێت و.......!!

ـ ڕاستدەکەیت من بیرم لەمەیان نەکردبووەوە..!!

ـ وایە کاکەسوور لە ترافیک دەترسێت..؟!

ـ ناترسێت، قێزی لێدەکاتەوە..!!

ـ قێز لە ترافیک دەکاتەوە..؟!

ـ بە بینینی ڕۆحی دەردەچێت..!!

ـ جا خۆ ئەو نایەتە ناو شار، هەتا..........!!

ـ بەڵام بەتەمان شەقامی قیرتاو بەناو هەموو ئەو دەشتانەدا بەرن و ترافیکی.........!!

ـ ئەی تۆ دەزانی ماوەیەکە خەڵک فێری جنێوی سەیربوون و بە یەکتر دەڵێن: کوڕی، یان کچی پیاوی ترافیکەکە.. هی پیاوی ترافیکەکە بە..............؟!

ـ ئا، ئەو ڕۆژە گوێم لێبوو تۆ بە نێرگزت وت: بڕۆ هەی..........!!

ـ ئەو لە پێشا بە منی.........!!

ـ تۆ کردبووت بە نەغمەیەکی ئەوەندە خۆش، پیاو هەر حەزی دەکرد گوێی لێبگرێت..!!

ئەم لچێکی لێ هەڵقورتاند و پشتی تێکرد.. چووە حەوشە و لە تەنیشت «نێرگز»ـەوە وەستا، کە ناوچەوانی خستبووە سەر تاقی دەرەوەی پەنجەرەی ژووری ئازووقەوە و وەکوو مناڵ هەنسکی دەدا.. قژە ڕەشە درێژەکەی لە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی دەئاڵاند و لەپڕ بەرەڵلایدەکرد.. بە شێوەیەکی زۆر سەیر خاودەبووەوە و لەبەر تیشکی ڕۆژەکەدا وەکوو قوماشی قەیفە و پەڕی مل و سەری مراویی نێر دەبریسکایەوە.. کاتێکیش «دەنانیر»ی ژنی پۆستەچیە ڕووخۆشەکەی کۆڵانی ئەودیو بەبێ لە دەرگادان هات و هەواڵی خۆسووتاندنی «ست هالە»ی هێنا، ئەوەی لەگەڵ پەیدابوونی «کاکەسوور» زمانی تێکشکابوو و دوای هەر

ڕستەیەک بە هەق و ناهەق «جا تووخوا ئەو شتە پیسە چییە..!!»یکی دەوت؛ ئەو بە سستی سەری لەسەر تاقەکە هەڵبڕی و ئەم چاوە فرمێسکاویەکانی وەکوو دوو گۆڵاوی شەوانی زستانی بەر تریفەی مانگی چواردەی قەد ئەستێرکی نوێنەکانی جارانی ژووری نووستنەکەیان بینی، کە لەگەڵ هەر ترووکانێکدا ڕوونتر دەردەکەوتن و گلێنە ڕەشەکان لە ژێریا وەکوو دوو نقێمی زۆر عەنتیکە دەکەوتنە جوڵەجووڵ.. دەتوت ها ئێستا نا ساتێکی تر سەرئاودەکەون و سووک سووک دێنە خوارێ.. دێنە خوارێ و بەملا و بەولای ڕوومەتەکانیەوە دەنووسێن.. ئەوسا ڕێک لە تابلۆیەکی سوریالی دەچێت و هەر خۆی دەزانێت چ لەزەتێک لە سەیرکردنی دەبینێت، بەڵام خۆی نەگرت و نەیتوانی چاوەڕێی ئەوە بکات.. بەبێ ویست ئەم ڕوومەت و ئەو ڕوومەتی گرت و کەوتە ماچکردنیان.. ماچیدەکردن و بەدەم گریانێکی زۆر بەکوڵەوە پێی دەوت:

ـ بە سائەقەیان بم، زۆر خۆشمدەوێن.. زۆر.. زۆر.. زۆر.......!!

ـ وازم لێبێنە نەوال، من دەمەوێت بگریم..!!

ـ بگری نەرجسەکەی دڵم، بگری، خۆ من تا ئێستا نەمزانیبوو تۆ ئەوەندە جوانی..!!

ـ دە ئاخر لەبەر تۆ ناتوانم..!!

ـ بگری نەرجس بگری.. بگری، با فرمێسکەکانت ببینم..!!

ـ تۆ ناهێڵی تۆ..!!

«دەنانیر» لەولاوە هات و باوەشی پیاکرد.. بۆ ژوورەوە پاڵی پێوەدەنا و پێی دەوت:

ـ واز لەو کچە بێنە چاوەکەم.. جا تووخوا ئەو شتە پیسە چییە..!! با بۆ خۆی بگریت.. جا تووخوا ئەو شتە پیسە چییە..!! بڕۆ لە ژوورەوە پشوێ بدە کچی خۆم.. جا تووخوا ئەو شتە پیسە چییە..!!

لە هەیوانەکە دەستی لێ بەردا و بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە بانگی «سیامەند»ی کرد، کە ئەوسا ناولەپەکانی نووساندبوو بە جامی پەنجەرەکەوە و خەمناک خەمناک سەیری ناو حەوشەکەی دەکرد:

ـ وەرە بیبەرە لای خۆت.. جا تووخوا ئەو شتە پیسە چییە..!!
ئەو هات و کردیە باوەشیەوە.. دەیگوشی و پێی دەوت:
ـ ئاخ تاقە نەوالەکەی ڕۆحی هەڵقرچاو و ماڵی چۆڵم، بە گریانەوە چەنێ چوانییت و چەنێکم خۆشدەوێیت..؟!
ـ وام پێمەڵێ، وام پێمەڵێ..!! تووخو وام پێمەڵێ، تۆ زۆر گوناهیت.. زۆر.. زۆر.. زۆر.......!!
ـ من وتم ژێریکەرەوە.. جا تووخوا ئەو شتە پیسە چییە..!! یان زیاتر بیهێنە گریان..؟! جا تووخوا ئەو شتە پیسە چییە..!!
مامی بردیە ژوورەوە و لەسەر تەختی نووستنەکە پاڵیخست.. دەستی چەپی خستە ژێر سەریەوە و بە هی ڕاستی سووک سووک ناوچەوانی دەشێلا.. ئەم وردە وردە گیانی خاودەبووەوە و پێڵووی چاوەکانی قورس دەبوون.. هێڵە ئاسۆیی و ستوونیەکان، لار و چەماوەکان لە کەلێنی پەنجەکانی ئەو و لەبەر بینایی خۆیدا تێکدەقژقژان و هەر ساتێ نا ساتێ دیمەنێکیان دەخولقاند.. دواجار، پێش ئەوەی خەوی لێبکەیت و بە تەواوی ئاگای لە دەوروبەرەکەی ببڕێت، ئەو باڵندە کێویەی بینی و لەناو خەیاڵەکانیدا باڵە هێزلێبڕاوەکانی بە سستی دەجووڵاند، کە ناوەکەی نەدەزانی و ئێوارەیەکی پایزی چەند ساڵ لەمەوبەر خۆی لە تەلی ستوونی کارەبای بەردەم ماڵی «ئیدراک»ی هاوپۆلی دابوو.. لەسەر کۆنکرێتە ڕەقەکەی بەر دەرگا کەوتبوو و وردە وردە چاوەکانی دەتەپین.. بۆ بەیانیەکەشی نەورەسە سپیەکان بە دەنووکی ئێجگار تیژیان کونێکی خڕیان کردبووە پشتی و ناوهەناویان تیادا دەرهێنابوو.. سیمای تەواو گۆڕابوو و ئەم وەکوو قوتووی ماکیاجی ئامۆژنی دەهاتە بەر چاو، کە باغەیەکی لووسی لاکێشەیی سوور بوو و بۆنی پاشماوەی ماسیی برژاوی سەر چیلکەداری بەر هەتاوی کەناری زێی لێدەهات.. نیوەڕۆش، کاتێ ڕەشپۆشەکان بە چەپڵەڕێزان و هەلهەلەکێشانەوە لە ئۆتۆمۆبیلە سپییە ڕازاوەکاندا دابەزین و «تەهانی»ی خوشکی «ئیدراک»یان بە بووک برد، لە ژێر قاچەکاندا پلیشایەوە و پەڕە ڕەشوسپیەکانی بەو ناوەدا بڵاوبوونەوە.. خۆیشی نەیدەزانی بۆچی هەر کاتێ مایۆی خوێناوی ژنانەی بینیایە و کەمێ سەرنجی

لێبدابووایە، یان دەستێکی نێر ناوچەوانی بشێلایە و پەنجەکان بکەوتنایەتە بەر چاوی، لاشەی ئەو باڵندەیە وەکوو خۆی لە بەردەم ڕوانینیدا دەردەکەوتەوە و تەنگی پێ هەڵدەچنی.. لە یەکەمیاندا قیز و ڕشانەوە و لە دووەمیاندا موچوڕک و تەزووەکان پەرێشانیان دەکرد.... ئەو ڕۆژە پەنجەکانی «جابر»ی برای، دوای ئەوەی لەسەر چاویدا گەرمداهاتن و ئارەقیانکردەوە، هەمان هەستیان پێ بەخشی و هێزێکی خورافیان خستە دڵیەوە.. هێزێک، کە توانی ترسی لە هەستانەوە و هەنگاوناندا بشکێنێت و زۆر بە جورئەتەوە گۆڕانی ماڵ و تێکشێوانی سیمای شتەکان بەلاوەبنێت.. بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ ژمارەی ئەندامانی خێزانەکەیان ببژێرێت و باوەڕبکات خوشک و برایەکی تازەی هەیە.. هەیەتی و لەگەڵیا دەژین.. جار جار حەزی لێیانە و جار جاریش ڕق.. ئەوەتا لەسەر ئەو شەقامەی، کە ڕۆژانی منالیی بە پێی پەتیی بەسەریدا ڕایدەکرد و گوێی بە سەرزەنشت و لێدان و کوتان نەدەدا، قۆڵی کردووە بە قۆڵی برای خۆیدا و ئەوەی بیری لێناکاتەوە ڕابردووە.. هەستدەکات لە نەخۆشییەکی کوشندەی درێژخایەن هەستاوەتەوە و پێیخۆشە «دایەلۆگ»ی «نیتشە» بکات بە گۆرانی، کە «مەنار» بە نەغمەیەکی سەیر بۆی خوێندۆتەوە و ئەم لەبەریکردووە:

ئەلف: ئەرێ من نەخۆشبووم..؟! ئایا چاکبوومەتەوە..؟!
کێ بوو دکتۆرەکەم..؟!
ئەرێ من هەموو شتێکم بیرچۆتەوە..؟!
بێ: ئێستا باوەڕم وایە تۆ چاکبوویتەوە:
چونکە ئەوە هەر ساغە
توانای بیرچوونەوەی هەیە.

لەوسەری شەقامەکە، ڕێک لەو شوێنەی شەوێکیان بە دەستێ بیجامەی سپیی هێڵدارەوە خۆی فێری لێخوڕینی پایسکیل دەکرد و بەر ستوونی کارەباکە کەوت، بەری کەوت و زیینە ڕەقەکە ئازاری ناوگەڵی دا؛ «رامح» و ژنێکی بالابەرزی قژ تا سەرشان وەستابوون و بە ڕووی ئەمەوە پێدەکەنین.. هەستی دەکرد لەمەوپێش ئەو ئافرەتەی دیوە و ئێستا نایناسێتەوە، بەڵام دەیزانی و تەواویش لەوە دڵنیابوو،

که ئەمە ژنێکی تازەی ئەو پیاوە خورافیەیە و ڕەنگە ماوەیەکی تر وەکوو ئەوانی دیکە ببێتە چیرۆکێکی بە لەزەتی سەر زمانی خەڵک.. ئەو هەر ژنێکی هێنابوو و لەگەڵیا چووبووە ناو پەردەوە، یان لە ژێریا گیانی دەرچووبوو و لاشەکەیان بۆ ماڵی باوکی بردبووەوە، یانیش ڕایکردبوو و بە هیچ شێوەیەک نەگەڕابووەوە لای.. ئیتر لە هەموو شاردا ناسرا و هیچ کچێ نەیدەوێرا سەرچڵیی ئاوا بکات.. ژنە دەمشڕەکانی «حەیدەرخانە» لە کاتی شەڕەکاندا پەنجەکانی دەستی چەپیان لە ئانیشکی ڕاستیان دەئاڵاند و باسکی خۆبان ڕادەوەشاند.. ڕایاندەوەشاند و بە یەکتریان دەوت:

ـ خۆزگە جارێ، یەک جار، ڕامح دەیگایت و دادەمرکایتەوە.

ـ کچێ تۆ بە چواری وەکوو ڕامحیش دڵت ئاو ناخواتەوە، هەی قەحبەی لە قەحبە کەوتوو..!!

ئەو خۆی لە ڕاستیدا ناوی «رابح» بوو و لە بازاڕی «شۆریجە»دا بازرگانیی دەکرد، بەڵام «جابر»ی باوکی «نەوال» بۆی گۆڕیبوو و هەر زوو زووش نارەزایی دەردەبڕی:

ـ چییت لێکردم، هەرچی خەڵک هەیە بە رامح بانگم دەکەن..!!

ـ تۆ لە بازاڕ ڕابحیت، چونکە هەمیشە قازانج دەکەیت، بەڵام لە دەرەوەی بازاڕ دەبیت بە ڕامح، ئاخر مەلعوون تۆ ڕم دەوەشێنیت.. ڕم..!!

ئەو جارەش ئەو و «سیامەند» «شەمرووخ»یان بە گیرهێنابوو و پێیان دەوت:

ـ بۆ نایەیت شووی پێبکەیت، مەگەر هەر تۆ بەرگەی بگریت..!!

ـ ژنەکانی خۆتانی بۆ بەرن..!!

که «سیامەند» وازی لێنەهێنا و پێی وت:

ـ من بزانم تۆ حەزت لێیەتی و بۆ ڕۆژێکت مابێت.......!!

ئەو تووڕەبوو و کردی بە شاتەشات:

ـ ماوەیەک لەجیاتی خۆت لەگەڵ شازەیا بینوێنە، بەشکوو ئەوە دنیایە، وەجاخت ڕۆشەنکاتەوە.

ـ دەمدرێژیی نەکەیت لەوە زیاتر قۆندەرە، ئەگینا.......

«جابر» کەوتە نێوانیانەوە و بە گلەییەوە بە «سیامەند»ی وت:

ـ باشە دەبێت هەموو گاڵتە و پێکەنینێکمان، هەر ئاوا بە ناخۆشیی تەواوبێت..؟!

ـ بەو بلێ..!!

ـ ئاخر ئەوەی دواییانت قورس بوو، گاڵتە ئاوا نابێت چاوەکەم..!!

ـ جا من بە گاڵتەم نییە..!! بە داخەوە ئەو ڕۆژەی ئەم پێشبینییەم دێتە دی، ئێمە نەماوین، دەنا......

ـ دەزانی تۆ خەڵەفاوی..؟! ئا، خەڵەفاوی..!!

کاتێ گەیشتنە لایان و ئەم جوان لێی وردبووەوە، زانی «شەمرووخ»ـە و ئاوا سیمای ژنانەی بە خۆیەوە گرتووە؛ واقیوڕما و بەبێ ویست قوڵی لە قوڵی براکەی هێنایە دەرێ:

ـ شەمرووخ ئەوە تۆی..؟! شووتکردووە بە رامح..؟!

ئەو بە دەستی چەپی پەرچەمەکەی لەسەر چاوی لادا و بە مەکرێک، کە هیچ ئافرەتێکی تر نەیدەتوانی لاسایی بکاتەوە و نێری دەویست بەرگەی بیستنی بگرێت، وتی:

ـ خۆت شەمرووخی مەیموون..!! ئیتر من بە زارا و مێردم بە رابح بانگبکە..!!

هەر بەو ناز و مەکرەوە دەستی ڕاستی خستە ناو دەستی چەپی پیاوەکەیەوە و وتی:

ـ تۆش وەکوو سیامەند و شاناز......

ئەم ڕاچڵەکی و پۆلێ باڵندەی کێوی لەناو سەریا «قرح.. قرح.. قرح.. قرح»«٨٨» کەوتنە قاووقیژ.. ئەوە یەکەمجار بوو ئەو دوو ناوە بە یەکەوە ببیستێت و ئەوەندەش هەست بە تەباییان بکات.. ئەوانی بەجێهێشت و وەکوو منداڵەکەی جاران لەسەر ئەو شەقامە کەوتە ڕاکردن.. ڕایدەکرد و بەحاڵ دەنگی «جابر»ی دەبیست:

ـ شنو هازا نوال..؟! شنو هازا..؟!

پێیگەیشت و بە دەستی ڕاستی توند دەستی چەپی گرت.. هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵیا ڕێگای دەبڕی و لێی جیانەدەبووەوە.. لەسەری فولکەکە تاکسیەکیان وەستاند و لەم دەرگا و لەو دەرگای دواوە سەرکەوتن.. ئەم شتێکی خستە ناو دەستی شوفێرەکە و هەرچۆنێ بوو بە هانکەهانک و شپرزەییەوە پێی وت:

ـ بۆ نزیک دایەرەی پۆلیسی مبخره..!!

ئەم لە پێشدا دابەزی و بە چەند هەنگاوێ خۆی گەیاندە بەر دەرگا.. لێی دا و وەڵام نەبوو.. توندتر کوتای و کەس نەیکردەوە.. ئەوێی بەجێهێشت و کەوتە وێزەی دەرگاکەی ماڵی «جیهاد»، بەڵام ئەویش نەکرایەوە و زیاتر دڵی کەوتە خورپە.. «ئەدیب» لە دەرگاکەی خۆیاندا سەری هێنایە دەرێ و بە حەپەساویەوە سەیری کردن.. کەمێ لێیان هاتە پێشەوە و بەمی وت:

ـ ئەوە چییتە نەوال..؟! بۆچی ئاوا......؟!

هاوکات «بەدریە» بە کراسێکی نیوقۆڵی ڕەشەوە دەرپەڕی و بە ڕاکردن بەرەو ڕووی هات.. کردیە باوەشیەوە و لە پرمەی گریانی دا.. دەگریا و پێی دەوت:

ـ وای نەوالی کۆڵانە چۆڵەکەم، ئاخۆ ئێمە بۆ ئەوە خولقاوین، تا یەک لە دوای یەک بە مەرگی خۆمان لەناوتبەرین، یان تۆ بۆ ئەوە هەیت.........!!

تەواوی نەدەکرد و بە زرووکەیەکی مناڵانە کۆتایی پێدەهێنا.. «ئەدیب» لێی تووڕەبوو و بە گلەییەوە پێی وت:

ـ ئەوە چییە دایکە..؟! تۆ لەجیاتی هێمنیکەیتەوە، ئەوەندەی تر دڵی پڕدەکەیت..!!

ئیتر دەستیان گرتن و بۆ ماڵی خۆیانیان بردن.. لەسەر تەختی دانیشتنەکەی هەیوانیان دانان و «بەدریە» بە خاولیەکی تەڕ دەموچاوی سڕین.. ئەم تا ئەو کاتەش بە تەواوی لای ڕوون نەبوو و نەیدەزانی چی ڕوویداوە، بەڵام جورئەتیشی نەدەکرد بپرسێت و چاوەڕێ بوو خۆیان بیدرکێنن.. ئەوەشی لا ببوو بە مەراق و دەیویست لە پێش هەموو شتێکەوە لێی تێبگات، کە ئەوان لێیان نەدەپرسی ئەو کوڕە کێیە لەگەڵیا و وەکوو کەسێکی زۆر ئاشناش سەیریان دەکرد.. کاتێکیش «شەلال» لە کۆڵان هاتەوە و ڕایکردە ناو باوەشی، بێشەرمانە دەستی کردە ملیەوە

و پێی وت:

ـ دەی جابر وەکو گریانی منالّی ساوام بۆ بکە..!!

«ئەدیب»ی برای خێرا هەڵیدایە و پێی وت:

ـ وازی لێبێنە، دایکی پێیناخۆشە، ئەها ئەو جارە لێی تووڕەبوو و وتی قوڕگی دێتەوە یەک..!!

ـ جا خۆ ئێستا دایکی لێرە نییە..!!

«بەدریە» سەری ئەمی نووساند بە سنگی خۆبەوە و وتی:

ـ دایکی لێرە نییە، خوشکی لێرەیە..!!

ئینجا ماچی قژە ژاکاوەکەی کرد و پێی وت:

ـ قوربانی بم، کەس خوشکی ئاوا دڵپاک و ڕۆحسووکی نییە..!!

ئیتر ئەم ئەوەندەی تر داڕووخا و زیاتر سەر و کلکی مەسەلەکان لەناو مێشکیدا تێکئالاّن.. هاوکاتیش «بەدری»ی باوکیان وەکوو هەموو ئێوارەیەکی تر بە ئەسپایی هاتەوە و بەر لە هەرچی و بە پیشەی هەمیشەی خۆی، بەبێ ئەوەی سەیری کەس بکات و بزانێت چی ڕوویداوە، چووە ژوورەکەی خۆی و گوێچکەی بە ڕادیۆکەوە نا.. جاری وا ڕێککەوتووە دیوەخانەکە جمەی هاتووە لە میوان و ئەو هەموویانی ئەفەرۆزکردووە.. سات نا ساتیش دەستی چەپی هەڵبڕیوە و وتوویەتی:

ـ وس..!!

«نەوال» کردبووی بە یاریەکی خۆش و پێی وتبوون، کە هەر کەسێ قسە بکات و ئەو ئاوای پێ بڵێت، ئەوەی تەنیشتی دەکێشێت بە ناوی دەمیا و ناشبێت تووڕەبێت.. ئینجا چونکە خۆی لە هەموویان زیاتر قسەی دەکرد و ئەویش ئەوەندە حەزی لە چارەی نەبوو، بۆیە بە زۆری «وس»ەکە بەم دەوترا و زللەی خۆی دەخوارد.. «بەدریە» هەموو جارێ لای «شازە» گلەیی دەکرد و ئاخ و ئۆفی هەڵدەکێشا، کە مێردەکەی لەبەر ڕادیۆ لەو شوێنەی خۆی نابزوێت و ئەمی بە خەیاڵدا نایەت.. ئەو جارە «نەوال» جۆللانەکەی «شەلال»ی ڕادەهەژاند و چاوی لێبوو، کاتێ «بەدریە» قاچەکانی ئەوی خستبووە سەر کۆشی خۆی و بە نینۆککەرە ڕەشەکە نینۆکەکانی بۆ دەکرد، ئەوەی لە شێرەکوللە دەچوو و وێنەی شتەکان لەسەر

ڕووی چەقۆ لووسەکەی ناوی دەبوون بە دووانی ناشیرینی وەکوو یەک؛ لە کاتێکدا ئەو ڕادیۆکەی نابوو بە گوێچکەی ڕاستیەوە و مێش میوانی نەبوو، ئیتر «بەدریە» لەپڕ پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی خستە سەر هێڵ و ژمارەی شەپۆلە کورت و درێژەکانی سەر شاشەکەی و بە گلەییەوە وتی:

ـ خۆزگەم بە خۆتان..!!

ئەوسا «بەدری» سەری هەڵبڕی و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ تۆ خۆشەویستترین ئێستگەی منیت بەدریەکەی ڕۆحم، بەڵام قەدەغەیت و کاتی دیاریکراوت نییە، بە ڕۆژ تەشویشت لەسەرە و دەبێت شەوان بە دزییەوە بۆت بگەڕێم..!!

«بەدری» کەم دەدوا و بە دەگمەن لە دانیشتنەکاندا بەشداردەبوو، بەڵام قسەکانی لە شوێنی خۆیدا دەکردن و هیچیانی دووبارەنەدەکردەوە.. لە گێڕانەوەی ڕووداودا هونەرمەندێکی چەند بلیمەت و لێهاتوو بوو و ئەم زۆر حەزیدەکرد گوێی لێ بگرێت.. لای ئەم ناخۆشترین و دڵتەزێنترین بەسەرهات لەسەر زمانی ئەودا دەبووە شتێکی بە لەزەت و هیچ ئاخ و ئۆفێکی بۆ هەڵنەدەکێشان.. ئەو جارەش هەر لە خۆیەوە دەستەکانی کردە ملی مامی و ئامۆژنی و پێی وتن:

ـ ئەگەر ویستتان هەواڵی ناخۆشم پێبگەیەنن و لەگەڵیا گیانم دەرنەچێت، بە مامە بەدریم بڵێن، با ئەو..........

ئەو ڕۆژە هەستی کرد قسەکەی ڕاستە و بە هەڵەدانەچووە، کاتێ ئەو دوای کەمێ لە ژوورەکە هاتە دەرێ و هەواڵی کوژرانی «جیهاد»ی پێ ڕاگەیاند، بەڵام هەر ئەوەندە ئەم دەمی هەڵهێنایەوە و پرسی:

ـ ئەی مامە سیامەندم..؟!

ئەو دەستەکانی گرت بەملا و بەولای کەمەری خۆیەوە و وتی:

ـ چەند ڕۆژێکە لەگەڵ شانازی ئامۆژنت چوون بە شوێن تەرمەکەیا و ئەمڕۆ بیستم دۆزیویانەتەوە..!!

ئیتر ڕاچڵەکی و دڵی بە شێوەیەکی سەیر، کە نەیدەزانی خاو یان خێرا لێدەدات و لەگەڵیا وردە وردە چاوەکانی دەتەپیین.. قاچەکانی هێزیان تیا نەما و

وەکوو هی بووکەپەڕۆینەکان دەنووشتانەوە.. دەنووشتانەوە و نەیدەتوانی چیتر خۆیان لەسەر ڕابگرێت.. «بەدریە» باوەشی تێوەئالاند و لەسەر تەختەکەی دانایەوە، ئەگینا بە پشتا، یان بە دەما دەکەوت و لەسەر ئەو کۆنکرێتە ڕەقە گیانی دەردەچوو.. خۆزگە وابوایە و دەمودەست بیانناشتایە، نەک ئاوا دایکی وەکوو پۆلیس دەرگای حەوشەی ئەو ماڵە بکاتەوە و لە بەرچاوی ئەوان بە جنێو ڕیسوای بکات:

ـ ئاخر هەی قەحپە، خۆت دەڕۆیت و ڕەدوودەکەویت، بەڵام ئەم کوڕەت بۆ بە گەڵ خۆتداوە..؟! ئەوا من لە نیوەڕۆوە وەکوو شێت ئەملا و ئەولای بەدوادا دەگەڕێم و........

ئینجا بە زللە کەوتە گیانی «جابر» و بردیەوە.. لە ناوەڕاستی حەوشە ئاوڕی بۆ ئەم دایەوە و پێی وت:

ـ خەیاڵ نەکەیت، جارێکی تر بێیتەوە بەر دەرگای ماڵی من و بتکەمە ژوورەوە.. با ئەم ژن و پیاوە بە شایەت بن، کە ئیتر کچم نییت و لە تۆ قەحپەتربم، ئەگەر خۆم بە دایکت بزانم و..........

«بەدریە» دەستی چەپی کردە ملیەوە و کەوتە دڵنەوایییکردنی:

ـ هیچ گوێی مەدەرێ و پێویست بە خەفەتخواردن ناکات ڕۆحەکەی من، کام ژوورەت دەوێ تیایدا بژی، تا هەر ئێستا چۆڵیکەم و بەیانی لەسەر ئارەزووی خۆت بۆتی بڕازێنمەوە.. ماڵ ماڵی خۆتە و هەر خۆشت خاوەنی هەموو شتێکی.

شەویش، کاتێ لە تەنیشت «شەلال»دا جێگای بۆ داخست و وەکوو مناڵ دەستی ڕاستی خستە ژێر سەریەوە، دەمی لە گوێچکەی چەپی نزیککردەوە و بە چپە پێی وت:

ـ لای من بمێنیتەوە قازانج دەکەیت چاوەکەم، ئەدیب بەقەدەر یەک دنیا خۆشیدەوێیت و خۆ ئەوە شەلال هەر باسی مەکە.. دوایی خۆت دەزانی شاناز و سیامەند تازە بووک و زاوان و پێویستییان بەوەیە لە ماڵەوە........

«ئەدیب» چەند جارێ بە فێڵی ئەم شت و ئەو شت هاتە ژوورەوە و گڵۆپەکەی سەر سەریانی داگیرساند.. وەک بڵێیت یەکەمجار بێت بیبینێت و بیەوێت

ئاشنای بێت، بە کەمێ شەرمەوە سەیری دەکرد و لە سیمای ورددەبووەوە.. هەر ئەوەندەش دایکی کەمێ سەری هەڵبڕی و بە سووکی پێی وت:

ـ باشبوو بیرمکەوتەوە دایکت لە دەوری سەرت گەڕێ، ئەو قەترەیە بێنە، با بیکەینە گوێچکەی شەلالەوە، بەشکوو.......

ئیتر ئەو لەمەوە بە دیار سەریانەوە دانیشت و زوو زوو چاوە شەڕانیەکانی دەبڕیە چاویەوە.. دایکی کاتێ ماچی ناوچەوانی ئەمی کرد و هەستایەوە، سەیرێکی ئەوی کرد و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ـ هەستە ڕۆڵە با بڕۆین و بەجێیبهێڵین، چونکە ماندووە و پێویستە بۆ خۆی بنوێت، تازە بوو بە کچی ئێمە و ئیتر هەر لە ماڵی خۆماندا.......

ـ بە ڕاستیتە دایکە..؟! ڕازیی بوو..؟!

ئینجا قووڵتر لە چاوەکانی ئەمی ڕوانی و نەیتوانی هەڵچوون و ڕۆچوونی دڵی بشارێتەوە.. دەستەکانی دا بە یەکا و وتی:

ـ ئەهههە..!! چەند خۆشمدەوێ..!!

«بەدریە» دەستی چەپی کردە ملی کوڕەکەیەوە و بە پێکەنینێکی زۆر جوانەوە، کە ئەم هەر لە خۆبەوە حەزی لێکرد و دڵی لەگەڵیا بە شێوەیەکی سەیر ڕاچڵەکی، پێی وت:

ـ ئیتر تۆ شوێنەکەت گیرا و دەبێت شوێنێکی تر بۆ خۆت بدۆزیتەوە، ئەگەر منیش ڕازیی بم، باوکت ڕازیی نابێت، بێیتە لای ئێمەوە..!!

ـ قەیناکات دایکە من لە ژووری ئازووقەکە دەنووم..!!

بەڵام لە هیچ شوێنێکدا نەنووست و تا بەرەبەیان لەو ڕاڕەوەدا ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد.. ئەم چەند جارێ ویستی هەستێتەوە و پێی بڵێت، کە داسەکنێت و دەنگی هەنگاوەکانی تەواو هەراسانیانکردووە، بەڵام لە توانایدا نەبوو و لەبەر دایکی و باوکی و «شەلال»ی خوشکیشی نەیدەتوانی لەوێوە هاواربکات، کە بێخەم لێی نووستبوون و نەیاندەزانی ئەمان خەویان زڕاوە.. تا ئەو کاتەی باوکی لە ژوورەکەی خۆبان ڕادیۆکەی داگیرساند و سروودی «لەگەڵ بەیانا هەنگاوهەڵێنن» بەرزبووەوە، کە شیعری «سادن دەیسەق»ی ناتری حەمام

بوو و «جەروەل دوغەیمان» ئاوازی بۆ دانابوو، ئەو لە جرتوفرتی خۆی نەکەوت و بۆ دەقەیەک نەسرەوت.. ئەم نیوەڕۆ کاتێ چاوەکانی کردەوە و هەستایەوە سەر ئەژنۆ، ئەو و دایکی بینی بە دیار سەریەوە دانیشتبوون و متەقیان لە خۆیان بڕیبوو.. هێشتا هەر لەسەر پێخەفەکەی بوو و بە پەنجەکانی قژی ڕێکدەخستەوە، کە «ریهام» بە زرووکوهووڕەوە لە حەوشەکە دەرکەوت و شێتانە بۆ ژوورەوە دەهات.. ئەو تازە لەگەڵ تیپەکەیان لە «بەسرا» هاتبووەوە و لە کۆڵان هەواڵی مەرگی براکەیان پێراگەیاندبوو.. کاتێکیش «بەدریە» پێی وت «ئەنوار» و «نەوار» چەند ڕۆژێکە چوونەتە ماڵی «دیلهام»ی خوشکیان و لەوێ چاوەڕێی تەرمەکەن، ئەو لە «نەوال»ی ڕوانی و بەدەم گریانەوە وتی:

ـ با بڕۆین ئێمەش.

ئەم ڕووی کرد بەملادا و بەدەم شانهەڵتەکاندنەوە وتی:

ـ من ناتوانم.

ئەو پشتی تێکردن و ڕۆیشت.. «بەدریە» بە دەستی چەپ دەستی ڕاستی «شەلال»ی گرت و دوایکەوت:

ـ بوەستە خۆم دێم لەگەڵتا.

ئەم هەر لە شوێنەکەی خۆی و لەسەر پشت پاڵکەوتەوە و دەستەکانی خستە ژێر سەریەوە.. «ئەدیب» لە بەرامبەری وەستابوو و وەکوو مناڵ یاریی بە نینۆکەکانی خۆی دەکرد.. جار جاریش لەپڕ سەری هەڵدەبڕی و لەوەدەچوو شتێکی پێ بڵێت، کەچی نەیدەوت و وردە وردەش ڕەنگوڕووی دەگۆڕا.. کاتێکیان زانی «جابر» بە ئەسپایی دەرگاکەی کردەوە و لە بەردەمیان قوتبووەوە.. ئەم واقیوڕما و سەرەتا نەیتوانی هیچ شتێ بڵێت.. دوایی سەری بەرزکردەوە و دەستی چەپی بۆ درێژکرد.. بەبێ ویست ڕایکێشا و وەکوو مناڵ لە تەنیشت خۆیەوە پاڵیخست.. ماچی ڕوومەتەکانی کرد و پێی وت:

ـ قوربانت بم، ئەوە تۆ چۆن هاتی..؟! دایکە ئاگای لێیە..؟!

ـ ئەو چوو بۆ ماڵی دیلهام، من هاتم بۆ لای تۆ.

ـ نەدەبوایە بێیت جابرەکەی دڵم، نەدەبوایە بێیت.

ترسا دایکیان لەناکاو دەرکەوێت و بەزمێکی تریان پێبگێڕێت، بۆیە هەرچۆنێ بوو هەستا و خۆی گۆڕی.. «ئەدیب»ی بەجێهێشت و ویستی براکەی تا نزیک ماڵەوە بگەیەنێت، بەڵام لەسەری کۆڵانەکەی خۆیان، ڕێک لە بەردەم ساڵۆنی «غەرام»، کە زۆر جار دایکی قژی لێ دەبڕی و شەوێکیان پۆلیسێکی ڕەشپۆشی کەچەڵیان لەبەر دەرگاکەی کوشتبوو؛ ئەو ڕازیی نەبوو بڕواتەوە و پێی وت:

ـ من بەجێناهێڵم تۆ.

ـ نابێت، هەر دەبێت بڕۆیتەوە، چونکە دایکە......

ـ من دەمەوێ بڕۆم هەولێر، تۆ وەرە لەگەڵ من.

ـ چی..؟! لەگەڵ تۆ بێم..؟!

ـ ئا، مەترسە، من شارەزام ڕێگا.

ـ هەر ئێستا دەچیتە ماڵەوە، ئەگینا......

ـ ناڕۆم، من لەگەڵ تۆ......

لەو ئان و ساتەدا «شاهیب جیمناستیک» و دوو شەقاوەی تر بەدەم چەنەبازییەوە لەناو دووکانی سەر سووچەکە هاتنە دەرێ و بەرەو ڕووی ئەمان هاتن.. هەموو خەڵکی شار ناوبانگی ئەو هەتیوەیان بیستبوو و لابەردایییان لە گێچەڵەکانی دەکرد.. توانایەکی سەیری لە دەستوەشاندندا هەبوو و چوار و پێنجی بە جارێ خپدەکرد.. دواییش وەکوو باڵندە لەم سەربانەوە بۆ ئەو سەربان هەڵدەفڕی و خۆی لە دەست تیپی پۆلیسەکان دەربازدەکرد.. ئەگەر دەستگیریشیان بکردایە و بیانخستایەتە بەندیخانەوە، لەوێش کاری خۆی دەکرد و دەیان جار قوفڵی ئاسنی دەرگا زەبەلاحەکانی شکاندبوو.. ساڵی پێشوو کوڕی یەکێ لە خانەدانەکانی گەڕەکی ئەمانی وەکوو کچ هەڵگرتبوو و بردبووی بۆ ناو چاڵی سەر گردە بەرزەکەی دووری شار، کە شوێنێکی ئەسەری بوو و ورچئاسا تیایدا دەژیا.. دوای دوو شەو و دوو ڕۆژ کوڕەیان دۆزیەوە و هەرچۆنێ بوو ڕزگاریانکرد، بەڵام کۆمی داڕزاندبوو و ماوەیەک لە نەخۆشخانە خستیان.. ئەویشیان قۆڵبەستکرد و بۆ بەندیخانەیان برد، کەچی وا هاتۆتەوە و دەیەوێت شەڕ بەمانیش بفرۆشێت.. لە سیمای «جابر» وردبووەوە و بە سەرسوڕمانەوە بە هاوڕێکانی وت:

ـ گبه بيضه مفتاحها بيد شيخ حديد.«٨٩»

براکەی تێنەگەیشت و نەورووژا، بەڵام ئەم بە هۆی «سامال»ی هاوپۆلی، کە بەر دەرگای ماڵەکەیان شوێنی کۆبوونەوەی شەقاوەکان بوو و کاکیشی یەکێک بوو لەوان، فێری هەموو جنێو و زاراوە تایبەتییەکانیان ببوو و زۆر جاریش بۆ خۆشیی بەم و بەوی دەوتن.. ویستی فێڵێکیان لێ بکات و فریای براکەی بکەوێت، چونکە دەیزانی ئەمان وەکوو ئەو دووانەی پێرێی ناو شەمەندەفەرەکە نیین و بێبەزەییانە دایدەپڵۆسن.. هاوکات «مەروان سەحمان»ی باوکی «بولدان»ی هاوپۆلی سەری لە ئووتووخانەکەی دەرهێنا و پێی وتن:

ـ الجريدي لو يسكر يمشي علىٰ شوارب البزون.«٩٠»

ئینجا کەمێ هاتە پێشێ و ئەمەیشی بۆ زیادکرد:

ـ لێیان گەڕێن با بە ڕێگای خۆباندا بڕۆن، ئەم کچە دەسگیرانی عەقید عەمارە و ئەمەش برایەتی لەگەڵیا.

«نەوال» خێسەیەکی لەو کرد و بە «شاهیب»ی وت:

ـ درۆ دەکات، من دەسگیرانی هیچ کەسێ نیيم.

«جابر» سنگی دەرپەڕاند و بە عەرەبییە نارێکەکەی خۆی وتی:

ـ دەسگیرانی ئەو نییە، بەڵام من.......

هیچی تری بۆ نەهات و ئەوان لە قاقای پێکەنینیان دا.. «شاهیب» خۆی هێمنکردەوە و وتی:

ـ ئێمە دەبێ بڕۆین و لەوە زیاتر نەوەستین.

دوای چەند هەنگاوێ ئاوڕێکی ناکاوی دایەوە و بە «نەوال»ی وت:

ـ ئەم کوڕە لووسکەیە، کە کچان بەخیلیی بە جوانییەکەی دەبەن، دەنگێکی ترسناکی پێوەیە..!!

ئەم هەر لە خۆبەوە پەستبوو و بە تووڕەیی بە براکەی وت:

ـ بڕۆ دەی بەس تووشی......

ـ ناڕۆم، من لەگەڵ تۆ.....

تووڕەتربوو و بە سەریدا قیژاند:

ـ وازم لێبێنه جابر، با له داخا......

ئەمــەی وت و پشــتی تێکرد.. ئەو دوایکەوت و بە دەســتی چەپی دەســتی ڕاستی ئەمی گـرت.. ئەم بە توندی خـۆی ڕاپسکاند و قـایم کـێـشـای بە ناوی دەمــیــا.. بە لاداهات و خــەریکبــوو بکەوێت.. خــۆی بە ئەژنۆ گـرتەوە و گــوڕی بەسـتـایەوە.. ئەم هەنگاوەکـانی گـورجـتـرکـرد و ئەو دوایکەوتەوە.. لەولاتر، لە بەردەمی دووکانی پایسکیلچیە سپیپۆشەکەی دەستەکانی لە پایدەر دەچوون و ئەم قـێزی لێدەکردنەوە، بۆ پارچە ئاسنێکی لووسی بەقـەدەر تەختـەسڕی پۆلەکـەیان دانەویـەوە و خـێـرا هەڵیگرتەوە.. تێـیگرت و ناوەڕاسـتی سـەری پێکا.. خـوێن فیـچقەی کرد و بەسەر گوێچکە و لاملیدا جۆگەلەی بەست.. کەچی بەم حاڵەشەوە تا بـەر دەرگــای دواناوەنـدیی «صـلاح الدين الأيوبی»ی کــوڕان بەدوایدا هـات و لەوێ پشـتی دایە دیوارەکەوە.. ئەم دوورکەوتبووەوە و جار جار ئاوڕی بۆ دەدایەوە.. بەر چاوی لێڵبووبوو و وەکوو ورچێکی پێکراوی دەبینی.. دوای تاوێ کەوتە سەر ئەو کۆنکرێتە ڕەقە و دەست و قـاچی بەملا و بەولادا لێ ڕاکێشا.. ئیتر گومانی نەما مـردووە و کـسـپـە لە دڵـیـەوە هات.. ناو سـەری زیاتر ورووژا و چـیـتـر قـاچەکـانی نەیاندەتوانی ڕاگیـریکەن.. کاتێکیش لەسەر تەختی نووستنەکە بە ئاگاهاتەوە و چاوەکـانی کـردەوە، ئێـوارەیەکی درەنگبـوو و ژوورەکە لە گۆڕێکی شـێـدار دەچوو.. «شـانە» و «سیـامـەند» لەملا و لەولایەوە دانیشـتـبوون و هەناسەی قـووڵ قووڵـیـان هەڵدەکێشا.. ئەم ئەوانی بەلاوەنا و وتی:

ـ کوا جابری برام..؟! مرد..؟! ئاخ من کوشتم..!!

ئامــۆژنی بە ســووکی دەســتی چەپی خــســتــە ســەر ناوچەوانی و ســەیرێکی چاوەکانی کرد.. بزەیەکی بۆ خستە سەر لێوی و پێی وت:

ـ شـازەی خوشکم زۆر چاکی بۆچووە، کـە وتوویەتـی لە نێـوان هەر بوورانەوە و یەکێکی ترتدا تەمەنێ هەیە، مناڵیەکەتمان خۆشدەوێت و ڕقمان لە هەرزەکاریی و گەنجیی و پیریەکەتە.

هەستی کـرد ئەمە تەواو ڕاسـتـە و ئەم دەسـتی هەیە لە حاڵەتی بوورانەوەکـانی خۆیدا.. دەیەوێت وەکـوو مناڵێـک، نەک گەورەیەک ڕووداوە ترسناکەکـان ببینێت و

بە تەواوی ناخی وێران نەکەن.. زووش لە بیری بچنەوە و هاوکات خۆی لە هەموو سەرزەنشت و بە گیرهێنانێک دووربخاتەوە.. دڵی بە شێوەیەکی سەیر کەوتە خورپە و بیری لەو شەوانە کردەوە، کە لەناو باوەشی «شانە»دا دەنووست و لە بنمیچی ژووره خورافیەکەی دەڕوانی.. چاوەکانی هەر وەک دوو نقێمی بەر تریفەی مانگی چواردەبن و لە کچەکۆچەریەکانی شەوانی سەر خاکی تەڕی قەد ئەستێرکی کەمێ بەرزی نوێنەکانی خۆیان بەجێمابن، دەدرەوشانەوە و پڕشنگیاندەدا.. پڕشنگیاندەدا و سێرتکەی ڕووناکیی تێکەڵ بە دڵۆپەئاوی بچکۆلە بچکۆلەیان بەملا و بەولادا دەپڕژاند.. دواتر وردە وردە ماندوودەبوون و دەریایەکی سازگاریان بەسەر ئەو بنمیچەوە دەبینی.. لەوێدا گیانداری سەیر سەیر دەژیان و ئەم ناوی بۆ یەکە بە یەکەیان دۆزیبووەوە.. لە هەموویان زیاتر بە «گۆدیلیا»کان سەرسامبوو و هەمیشە بیری لە نهێنیی ئەو ژیانە سۆزرەتەیان دەکردەوە، کە لەشێکی کەمێ لووس و زۆر نەرمۆڵەی وەک پلێتەی زۆپایان هەبوو و لە ژێر ئاودا وێنەی سەری ئەسپ دەردەکەوتن.. ئەوان تەمەنیان زۆر کورت بوو و کەمیان ساڵێکی تەواو دەکرد.. خۆ ئەگەر نەهاتنایەتە سەر ڕووی ئاوەکە و بەر تیشکی ڕووناکیی نەکەوتنایە، زۆر لەوە زیاتر دەژیان و لەو خوارە مەرگ زەفەری پێنەدەبردن، بەڵام خۆیان نەدەگرت و جووت جووت سەردەکەوتن، چونکە تەنها لەوێدا هەموو نێر و مێیەک ئارەزووی جووتبوونی لەلا دەخولقا و لەزەتیان لە جەستەی یەکتر دەبینی.. لەمەوە هەر «گۆدیلیا»یەک دەیزانی چەندی لە ژیاندا ماوە و مێیەکان بەحاڵ فریای گەرادانان دەکەوتن، بەڵام ڕێگایەکی سەیریان هەبوو لەوەی ڕەنگی تۆخی مەرگ کاڵبکەنەوە و سام و هەیبەتی نەهێڵن.. ئەویش بەوەی کە پەلاماری «بادیلیا»کان بدەن و بە دانی تیژیان لەشە کرکراگەدارەکانیان تێکبشکێنن.. ئەوان دۆستی هەرە نزیکیان بوون و بێئەندازە خۆشیاندەویستن.. «بادیلیا»کان شێوەیان لە مەمکی ئافرەت دەچوو و لەسەر بەرماوەی «گۆدیلیا»کان دەژیان، کە جۆرە گیانداریکی ڕەقەڵەی تووکن بوون و ئەم دوای مێشکگوشینێکی ئێجگار زۆر ناوی نابوون «لەڤیلیا».. سەریان لە گورچیلەی مانگا دەچوو و قێزی لێدەکردنەوە.. لە بنکی دەریادا دەژیان و ئەوان ڕاویاندەکردن، واتا ئەو شوێنە

قوولّەی «بادیلیا»کان بە خەویش پێی نەدەگەیشتن و سیەکانیان بەرگەی هەوای خەستی ئەوێی نەدەگرت.. ناوهەناویان دەخواردن و سەرە تەشیلەیی و قاچە گرنج گرنجەکانیان دەهێشتنەوە.. ئەوان فڕکانفڕکانیان پێدەکردن و لە چاوترووکانێکدا هەڵیاندەلووشین.. «بادیلیا»کان پێستێکی ڕەشی سەیریان هەبوو و مادەیەکی کەمێ لینجی وەکوو دووکەڵی بوخوردیان درووستدەکرد.. ئەو مادەیە ڕێگربوو لەوەی تیشکی ڕۆژ، تەنانەت لە نیوەڕۆی ناوەڕاستی تەممووزیشدا، ڕۆبچێتە ناو دەریا و «گۆدیلیا»کانی لە مەرگ دەپاراست.. ئەو «گۆدیلیا»یەی چڕنووکی تیژی لە گیانی «بادیلیا»یەک گیردەکات و دەیکوژێت، دڵنیاشە لەوەی چ ئازارێکی گەورە دەچێژێت و تا بەسەر دنیاوەیە پێوەی دەتلێتەوە، بەڵام هەر ئەو ئازارەشە ترسی لە مردنی خۆی دەشکێنێت و گیانەڵایەکی ئارامی بۆ مسۆگەر دەکات.. ئەم بەبێ ئەوەی بە خۆی زانیبێت و مەبەستی بووبێت، لاسایی «گۆدیلیا»کانی کردۆتەوە و براکەی وەکوو «بادیلیا»یەک لەناوبردووە، بەڵام مەرگ لەبەر چاویا هەر مەرگە و بە هەمان سیمای جارانی دەردەکەوێت.. هاوکات بە یەکگەیشتنی «سیامەند» و «شانە»ی بەلاوە ئاساییە و هەست ناکات ماڵەکە گۆڕانی بەسەرداهاتووە.. ئەگەرچی گیانی داهێزرابوو و دڵی تێکهەڵدەهات، بەڵام جورئەتی نایە بەر خۆی و سەری لەسەر سەرینە کەمێ بەرزەکەی هەڵبڕی، کە بە وێنەی بێچووەکۆتری ڕەش نەخشابوو و بۆنی خورمای ئەشرەسیی ئێجگار گەییوی بەر هەتاوی نیوەڕۆی ناوەڕاستی تەممووزی «بەغا»ی لێدەهات.. دەستی چەپی خستە سەر ڕانی ڕاستی «شانە» و پێی وت:

ـ بمگەیەنە ناو باخەکە ئامۆژن، من لە ژوورەوە......

لەبەر هێڵنج بۆی تەواونەکرا و بەسەر ئەو دۆشەگ و چەرچەفەدا ڕشایەوە.. ئەوان هەر خێرا ئەم قۆڵ و ئەو قۆڵیان گرت و گەیاندیانە بەر بەلووعەی ژێر کەپری مێوەکەوە.. نە لە ماڵی «بەدری» و نە لە ماڵی «کچان» هیچ دەنگێ نەدەهات و هەستی بە ترسێکی بێئەندازە دەکرد.. کاتێکیش دەرگای حەوشە ترازا و «هالە»ی خوشکی و «جابر»ی برای دەرکەوتن، هەر خەریکبوو فیزاح بکات و ڕۆحی

دەربچێت.. وێنەی داوەڵ تێکەڵ بە هێڵەکانی بەر بینایی دەبوون و ماڵەکەی لێدەبووە خەڵوەتگای تاریکی ڕۆژپەرستەکان.. «جابر» لە شێوەی هێلکەشەیتانۆکەی سپی سەری پێچرابوو و یەک دوو هەنگاو لە دووری ئەم خەمبارانە دۆشیدابردبووەوە، بەڵام خوشکەکەی هەر لە ناوەڕاستی دەرگای حەوشەدا وەستابوو و بە بێدەنگیی دەگریا.. «شانە» بە دەستی چەپی بەلووعەکەی گرتەوە و پێی وت:

ـ ئادەی هالە، بڕۆ هەرچی دۆشەگ و چەرچەف و لێفە هەیە لەو ژوورە، هەر هەمووی بەرە بۆ حەمامەکە و جوان جوان بیانشۆ، خوشکەکەت بە ڕشانەوە......

ئینجا بە خاولیە ڕەشەکە دەموچاوی ئەمی وشککردەوە و بە مێردەکەی وت:

ـ بچۆ لە دیوەخانەکە جێگای تری بۆ داخە سیامۆ.

هەر خێراش ڕووی بەلای «جابر»دا وەرگێڕا و پێی وت:

ـ ئادەی تۆش..!! بڕۆ لە شوێنێ دانیشە، چونکە ئەوەندە بە پێوە بوەستیت سەرت......

ئەم هەرچۆنێ بوو هەستا و بە لاپەلاپ بەرەو سەرەوە هەنگاوی هەڵێنا.. کاتێ بەلای ڕاستدا ئاوڕی دایەوە و لە ژووری ئازووقەی ڕوانی، ژنێکی بینی پشتی دابووە دیوارەکە و متەقی لە خۆی بڕیبوو.. دڵی داخورپا و جوانتر لێی وردبووەوە، هەستی کرد لە ژنی سەر مافووری قەد دیواری ژوورەکەی جارانی «شانە» دەچێت و تا تینی تیابوو قریشکاندی:

ـ وای ئەم ژنە کێیە لەو ژوورە..؟!

ئامۆژنی بە توندی ڕایکێشا و پیایدا هەڵشاخا:

ـ ئەوا لە ئێستاوە پێت دەڵێم، واز لەم خەیاڵە بێتامانەت نەهێنیت و هەر ڕۆژێ بەزمێکم بۆ بنێیتەوە، من دەڕۆم و نە تۆ و نە سیامەندیش نامبیننەوە.. بەسە تەواو، ئیتر گەورەبوویت و.....

هاوکات «سیامەند» لە ژوورەوە سەری دەرهێنا و وتی:

ـ چییته شانێ..؟! ئەم شاتەشاتەت لە چییە..؟!
ـ بەیانی زوو زوو دەچییت کرێکار دەهێنیت و ئەم ژوورەم بۆ تەختدەکەیت..!!
وایزانی هەر بۆ ترساندنی ئەمیەتی و تاوێکی تر بیریدەچێتەوە، بەڵام کردی بە ڕاست و بەیانی لەگەڵ دەنگی کوتەکی کرێکاران بە ئاگاهاتەوە.. ژووری ئازووقە تێکدرا و یەکێکی گەورەتریان درووستکرد.. دواییش کولانەی مریشک و کۆتران هەڵگیرا و تۆوی باڵدار لەوماڵە بڕایەوە.. شوێنەکەیان تێکەڵ بە باخەکە کرایەوە و دار و درەختی تریان لێ ڕواند.. پیاوە کۆتربازە شەشپەنجەکەی شێوەی کتومت لە «مارکس» دەچوو و خاوەنی دووکانێکی بچکۆلە بوو لە سووچی مەیانەکە، کاتێ دەستی ڕاستی دەکرد بە کولانەکاندا و تاک تاک کۆترەکانی دەردەهێنا، هەر خێرا لە لووتی خۆی نزیکدەکردنەوە و بۆنەکەی هەڵدەمژین.. لە ژێر سمێڵە زلەکەی سەر دەمیەوە بزەی دەهاتێ و زوو زوو دەیوت:
ـ بۆنی خۆڵی پایزێکی درەنگی ژێر یەکەمین نمەنمی بارانیساڵیان لێدێت.
«شانە» تازە لە حەمامەکە هاتبووە دەرێ و لە پەنا دیواری ماڵی کچان بە قژی تەڕەوە قۆڵی ڕاستی کردبوو بە هی چەپی مێردەکەیدا.. وەکوو کچی هەرزەکار سەری دەخستە سەر شانی و قاقای لێ دەدا.. ئەم لە هەیوانەکەدا پێڵاوی لە پێدەکرد و گوێی پێنەدەدان.. ماڵەکەی بۆ بەجێدەهێشتن و دەچوو بۆ لای «ریحاب»ی دەستەخوشکی، کە لە ژوورێکی نهۆمی دووەمی ماڵی نەنکی دەژیا و شەوان لە پەنجەرە چوارگۆشەکەیەوە بەردی قەراغ نافوورەی گۆڕەپانەکەی ئەوبەر، لە ژێر سێبەری کەمێ کاڵی گەڵای پانی دارخورما بەرزەکاندا وەکوو پۆلێک قازی سپیی گۆشتن دەردەکەوتن.. شەوێکیان بەدەم گوێگرتن لە گۆرانی و مۆسیقایەکی خەمناک سەیری کردن و توانی کانتۆری جلەکانی «دیجلە» و «فوڕات» بیری خۆی بێنێتەوە، چونکە هەمان دیمەن، بە کەمێ جیاوازیەوە، لەسەر دەرگای ڕاستی هەبوو و ئەمیش بە ماجیکی سووری تۆخ وێنەی مانگێکی چواردەی جوانی لە لای سەرووی کێشابوو.. «تیمساحێکی زلی ڕەش لەسەر پووشی وشکی سپیی قەراغ

دەریادا بە خــــەوتوویی کلکی هێنابووە لای دەمی و بازنەیەکی نارێکی پێکهێنابوو.. لەناو بازنەکەدا چوار بێچووەتیمساح لە چوار هێلکە و جووچکێ لە پێنجەمدا سەری جووقابوو.. جووچکەکە خۆی لەوان جیاکردبووەوە و حەیران و سەراسیمە لە تیمساحە خەوتووەکەی دەڕوانی»«٩١».. ئەمە تابلۆیەک بوو و ئەم بە ماجیکەکانی «نێرگز» لەسەر دەرگای چەپدا کێشابووی.. ڕۆژی پشکنینی گشتیی، پێش ئەوەی سەربازە سپیپۆشەکانی هێزی ناوخۆ و فەرمانبەرە ڕەشپۆشەکانی «سەرژمێریی» بێنە ژوورەوە و کون و کەلەبەری ماڵەکە بپشکنن، «فوڕات» بە ڕووتیی بە دیاریەوە وەستابوو و سەرنجی لێ دەدا.. پەنجەکانی لە یەکتر هەڵکێشابوون و لە دواوە بە شلیی خستبوونیە ملیەوە.. لەپڕ و بە شێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش ڕووی بۆ «نەوال» وەرگێڕا و لە چاوەکانی وردبووەوە، کە ئەم هەر خۆی دەیزانی بۆچی حەزی لەو جووڵەیەی کرد و لەگەڵیا لێشاوی تەزوو بەناو چۆڕاوگەی دڵیدا کەوتە هاژە.. دەستەکانی لەسەر ئەم شان و ئەو شانی دانا و پێی وت:

ـ هەر دەڵێی تازە دەیبینم نەوالەکەی دڵم، هەر دەڵێی تازە دەیبینم.. من دەزانم تۆ ڕێگای شوێنێکی ئێجگار سەیر و ترسناک پێدەزانی..!!

دەتوت نووستووە و ئەو قسانە بەدەم خەوەوە دەکات.. «هالە»ی خوشکیشی، کە شەوان هەڵدەستایەوە و سەری دەنووساند بە دیوارەکەوە، ئاوا لەبەر خۆیەوە دەدوا و لەرەی دەنگی بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەگۆڕا.. ئەم بە دیاریەوە دادەنیشت و لەزەتی دنیای لە گوێگرتنی دەبینی.. جارێکیان هەر بەدەم خەوەوە هەستابووەوە و پاڵی بە دەرگای ژوورەکەی «سیامەند» و «شانە»وە نابوو.. خەبەریکردبوونەوە و پێی وتبوون:

ـ وا زەڕافەیەک هاتۆتە مووبەقەکە و سەری خستۆتە ناو تەنەکەی ڕۆنەکەوە..!!

ئەم هەموو جارێ تووڕەیدەکرد و بە نەغمەی مناڵانە پێی دەوت:

ـ کووبانی سەری زەڕافەکەی بم..!!

ئیتر ئەو بە مەکرەوە تێیدەکەوت و خۆی تەسکدەکردەوە:

ـ ئاخر چونکە قەحپەی، من ناتوانم هیچت لەگەڵ بڵێم.. هیچ.. هیچ.. هیچ.....

لەگەڵ وتنی هەر «هیچ»ێکدا زللەیەکی کەمێ توندی دەکێشا بە سمتیا و ئەم چێژی لێدەبینی.. بەڵام جارێکیان تاکێکی رێکتی ریشە رەشەکەی بۆ هەڵگرت و قەراغەکەی بە مووروەغەی پشتیدا ماڵی، کە لە پلاستیکێکی رەقی لووس دروستکرابوو و چەرمی خۆشکراوی گامێشیان لە دەسکەکەی پێچابوو.. ژانی خستە دڵیەوە و بەر چاوی لێڵبوو.. «شانە» بە ماکسیەکی رەشی تەنکەوە پەنجەکانی دەستی چەپی گرتبوو بە شیشە سپیە ئەستوورەکانی دیوی دەرەوەی پەنجەرەی ژووری ئازووقە و خەمبارانە سەری خستبووە سەر باسکی رووتی.. ئەم بەحاڵ دەیبینی و سووک سووک لەناو تەمێکی سپیدا گومدەبوو.. کەمێ لەمەوبەر، کاتێ ئەم لە «پەیمانگا» هاتەوە و چوو بۆ ژوورەکەی خۆی، ئەو بە رووی خۆشەوە لە مووبەقەکە هاتە دەرێ و بە خێرایی بەرەو لای چوو.. بە دەستی راست دەستی چەپی ئەمی گرت و خستیە سەر سکی خۆیەوە.. «نەوال» بە دیقەت سەیری چاوەکانی کرد و لێی پرسی:

ـ ئەوە چییە..؟!

ئەو قژی بەملا و بەولادا رادەوەشاند و وەکوو منالێکی بەناز پێی دەوت:

ـ بەبەی تیایە بەبە..!!

ـ وانەڵێی..!! وی بە سائەقەی بم..!! کچێ بە سائەقەی تۆش بم ئامۆژنە رۆحەکەم..!!

ئەمەی وت و باوەشی پیاکرد.. دەمی خستە قژە چرەکەیەوە و بۆنەکەی هەڵمژی.. کەچی ئەو لەپڕ دەستی بە گریانێکی بەکوڵ کرد و فرمێسکی چاوەکانی دادەباراندە سەر شان و ملی «نەوال»ەوە.. ئەم سەرەتا وایزانی لە خۆشیا دەگری و

بە لایەوە ئاسایی بوو، بەڵام کە خۆی لە باوەشیدا هێنایە دەرێ و چوو لە هەیوانەکە سەری خستە سەر ئەژنۆکانی، ئیتر لێی چووە پێشێ و بەکەمێ گلەییەوە پێی وت:

ـ من هیچ لە تۆ تێناگەم.. ئێستا نابێ بزانم بۆچی ئەو شین و واوەیلایە دەکەیت..؟!

ـ دەترسم نەوال گیان دەترسم.

ـ لە چی..؟!

ـ وای چەند دەترسم دوانە بێت..!!

ـ ئەو چاتر.. ئەمە ترسی بۆ چییە..؟!

ـ وای تووخوا تۆ نازانی من چ ئازارێ دەچێژم..!!

ـ باشە خۆ تۆ بە خۆشیی و پێکەنینەوە مژدەکەت پێگەیاندم، ئەی چی بوو ئاوا لەپڕ......؟!

ـ ڕاسدەکەیت، ئاخ تۆ ڕاستدەکەیت، بەڵام من خۆشم نازانم بۆچی لەناکاو ئەو ترسەم بۆ هات..!! دەزانی نازانم..؟! وای چەند سەیرە، کە من ئەوە نازانم..!!

ـ نا، نا دەیزانی، بەڵام ناتەوێ پێمی بڵێی.

ئەمەی بە گاڵتە پێ وت و لەگەڵیا بزەیەکی بۆ خستە سەر لێوی.. ئینجا لە تەنیشتی دانیشت و دەستی چەپی کردە ملیەوە.. چەناگەی خستە سەر قۆڵی ڕاستی و سەرنجی لە فرمێسکەکانی دەدا، کە خوڕ خوڕ لە چاوەکانی دەهاتنە خوارێ و خێرا خێرا بۆ سەر چەناگە و ناو سنگی دەتکان.. ئاخی هەڵدەکێشا و بیری لە «هالە»ی پووری دەکردەوە.. کاتی سکیپڕییەکەی هێنایە بەر چاوی و لە سیمای شێواوی وردبووەوە.. هەڵسوکەوتی تەواو گۆڕابوو و قسەی هەلەقومەلەقی دەکرد:

ـ من دەمرم، بەڵام ئەوە نارەحەتم ناکات.. جاڵجاڵۆکەیەک بە دەزوولەی خۆی دەخنکێت، ئەو دەزوولەیەی دەتوانێت بۆ ڕاوکردنی نێچیر بەکاریبهێنێت.

«شاناز» وانییە و زۆر هێمنە.. ئەو بە نهێنییەوە خەفەت دەخوات و ڕەنگە بە دزییەوە لە پەنا و پەساری ماڵەکەدا زۆریش بگریت.. هەر ئەو جارە بە ئاشکرا گریا و ئیتر دووبارەی نەکردەوە.. هەمیشەش وا خۆی پیشاندەدات دڵخۆشە و دەبێت بە دایکی مناڵێ، یان دووان.. لای ئەم و ئەو خۆی دەنوێنێت و ناز بەسەر مێردەکەیدا دەکات.. جار جار بانگی «نەوال» دەکات و پێی دەڵێت:

ـ ڕاکە، ڕاکە، دەستت بێنە، دەی خێرا بیخەرە سەر سکم، ئەها دەجووڵێت..!! وانییە..؟! هەستی پێناکەیت..؟! چۆن..؟! ئاخر تا تۆ دێیت، ئەو دەوەستێت.. من خۆم دەزانم چۆنە خۆم..!!

بەڵام هەرگیز ناتوانێت ئەو لەرەیەی دەنگی لەم بشارێتەوە و هەستی بە لارێدا بەرێت، کە ترسێک شێواندوویەتی و لەگەڵ تەزوویێکی تۆقێنەردا لە قوڕگی دەردەچێت.. «سیامەند»یش هەستی پێکردووە و ئەو جارە لە ستۆدیۆکەی بەمی وت:

ـ دەزانی شانێ لەگەڵ ئەو سکەی زۆر گۆڕاوە، هەر دەڵێی ئەوەی جاران نییە..؟!

ئینجا بە پیشەی هەمیشەی خۆی کردی بە گاڵتە و وتی:

ـ بەڵام دەترسم منداڵ نەبێت، بارووت بێت تیایدا و ڕۆژێ لە ژێرماندا بتەقێتەوە..!!

ـ ئەگەر وابێت خەتای تۆیە، تۆ کردووتە بە نارنجۆک.

ـ ڕاستدەکەیت، من دەبوایە..........

ـ بێ دەنگ بە، بێ دەنگ بە، دەزانم دەڵێی چی.. تا بەیانی قسەی حیز بکەیت، تێرنابییت.. من برسیمە، وا ئەژنۆم دەلەرزێ، با دایخەین و زوو بڕۆینەوە.. ماسیمان هەیە ماسی..!!

لە ڕێگا «فەریال»یان بینی و بۆی وەستان.. هەڵیانگرت و لەگەڵ خۆیان بردەوە.. ئەو لەسەر ئاستی هەموو «عێراق»دا بە یەکەم دەرچووبوو و خستبوویانە

«کۆلیژی پزیشکی»یەوە.. هەمیشە گلەیی لە دایکی دەکرد و جنێوی بۆ دەنارد، کە تووشی ئەو سکەی کـرد و بەم حـاڵەوە ناتوانێت خـوێندنەکـەی بە ڕێکوپێکی بکات.. بە قسەی «هالە»یش ئەو ماڵەکەی تەواو ناخۆشکردووە و کەس ناوێرێت تیایدا بجووڵێتەوە.. تا درەنگی شەو سەری بەسەر ئەو کتێبە قەبە قەبانەیدا ژەندۆتەوە و ئەوی کردووە بە کارەکەری خۆی.. ئەگەرچی ئەویش و «جابر»یش خەریکی کۆششن و ئەمساڵ دەچنە تاقیکردنەوەیەکی قورسەوە، بۆئەوەی ماوەی خوێندنی ئەولایان و هی تایبەتیی ماڵەوەیان بۆ حیساب بکەن و ساڵی داهاتوو بیانخەنە ئامادەییەوە.. «فوئاد»یش هەر جارێ مۆڵەت وەرگرێت و بێتەوە، دەیکات بە شەڕ لەگەڵیا و پێی دەڵێت:

ـ ئاوا بکەیت چاوەکانت کوێر دەبن، خۆ تۆ هیچ حیسابێکیش بۆ ئەو سکەت ناکەیت.

هەر دوو ڕۆژ دوای کوژرانی «فوئاد»یش هەمدیس خۆی خزاندە ژوورەوە و تێکەڵ بە کتێب و دەفتەرەکانی بووەوە.. ئەوسا سکی هەشت مانگ بوو و زۆر بە زەحمەت دەیتوانی بجووڵێت.. «جابر» هەموو جارێ لاسایی دەکردەوە و ئەم لە پێکەنینا دەپچڕا:

ـ خۆزگە دەیبینی، کاتێ بە تەمەڵییەوە لە ژوورەکەی دێتە دەرەوە و بە لاپەلاپ بە ناو ئەو ڕاڕەو و حەوشەیەدا دەڕوات، بەتریق چۆن هەنگاو دەنێ، ئەویش ئاوا..!! ئینجا بەحاڵ دەنگێ لە قوڕگی دەردەکات و دەڵێ: «کورە جابر، وەرە دەستم بگرە، دەی خێرا.. چییت کرد، هەر نەهاتی.. مەیگوشە.. هەموو گیانم دەتریوێنێت.. دەڵێی ئاگری تیایە.. وی خەریکە دەکەوم.. سووک.. سووک.. دە سووک.. دڵڕەق، بۆچی ئاوا ڕامدەکێشی..؟! بۆ..؟! بۆ..؟! ئاخر بۆ..؟! تووخوا بۆچی ئاوا ڕامدەکێشی..؟! وی خەریکە دەستم لە بنا بێتە دەرێ..!! نەمدەزانی ئاوا زوو لێم بێزار دەبیت.. نە بە خوا نەمدەزانی.. ئای چەند شتێکی پیسی..!!» تا بەر دەرگای حەوشەی دەبەم و چاوێ بەملا و بەولادا دەگێڕێت..

سەرێ بادەدا و پێم دەڵێت: «کەی جاران ئەم کۆڵانە ئاوابوو..!! ئەوە بۆچی ئاوای لێهاتووە..؟! خۆ خەریکە نەیناسمەوە..!! ئاوابوو ئەم کۆڵانە..؟! لەگەڵ تۆمە ئاوابوو..؟! دە وەڵامم بدەرەوە دەی، خۆ من تاقەتم نییە ئەوەندە قسە بکەم.. هیچ کاتێ ئاوا نەبووە، بەڵام تۆ ئەوە نازانی و منیش هێزم تا نییە تێتبگەیەنم.. بمبەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆم.. نا، نا بۆ لای بەلووعەی ئاوەکە.. ناتوانم دانەومەوە، چۆڕێ ئاو بکە بە دەموچاو و قژما، با کەمێ گیانم فێنکبێتەوە.. خۆ دەبوایە تۆ خۆت ئەمەت بزانیایە، نەک من پێتی بڵێم.. کەی فێر دەبی..؟! کەی..؟! ئەی ڕەزاومرێ.. هیچ خۆشم ناوێی».. دایکیشم لەولاوە پەنجەکانی گرتووە بە دەمیەوە و لە ژێرەوە پێی پێدەکەنێت.

ئەو جارە «شانە» جلە ڕەشەکانی لەسەر تەنافە سپیەکە هەڵدەخست و بینی، بزەیەکی خستە سەر لێوی و پێی وت:

ـ بێقیمەت، وا لەبەر چاومە لە ماڵی خۆشتان چۆن لاسایی من دەکەیتەوە..!!

ـ دەسا پوورە شانە تۆ هیچ پێتەوە دیارنییە سکت هەیە..!!

«نەوال» سەیرێکی ئامۆژنی کرد و بە براکەی وت:

ـ پەلەت نەبێت، با ئەویش وەکوو فەریال بچێتە مانگی خۆیەوە، ئینجا دەیبینی چۆن......!!

«فەریال» سەرەتای زستانەکەی سکی پڕبوو و وەرزێ لە هی ئەو گەورەتربوو.. ئەمیان لە کۆتایی هاوین دوو کچی بوو و بە سەلامەت هەستایەوە، ئەویان دەسپێکی زستان دوو کوڕی هێنا و خۆی دەستبەجێ مرد.. ئەمان ناونران «سازگار» و «ساکار» و ئەوان بوون بە «دۆستی» و «دانا».. ئەگەرچی «سیامەند» «دۆستی»ی بە «شێرۆ» ناودەبرد و «دانا»یش بە دیدەم.. «ست سوعاد»، کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کردبوونی بە هی خۆی و لەگەڵ دوانەکەی «فەریال»دا بەخێوی دەکردن، ئەمەی پێناخۆشبوو و هەموو جارێ پێی دەوت:

ـ نازانم ئەوە چ دڵێکە تۆ هەتە، ئاخر بووە باوک بە ناوی کەڵەشێرێک، کە بە

دەستی خۆی سەری بڕیوە و خوێنەکەی ڕشتووە، منداڵی خۆی بانگ بکات..؟!

«نەوال» باوەڕی وابوو ئەو گرنگیدانە زۆرەی دایکی بەو منداڵانە، شتێکی ئێجگار ناماقووڵە و بێگومان مەبەستێکی هەیە.. مەبەستێک، کاتێ دەردەکەوێت و ئەمان دەیبیستن، بێجگە لە سەرسامبوون هیچی تریان لە دەست نایەت و دەبێت بێ دەنگ بن.. هەر لەگەڵ مردنی «شانە»ی ئامۆژنیدا تەواو هێزی پیلانە ئاڵۆزەکانی ئەوی بۆ دەرکەوت و لە ئاستیاندا بە جارێ حەیران و سەراسیمە بوو.. بزانە چەند بە ئاسانی بوو بە دوا ژنی «سیامەند» و دەردی «جابر» دەڵێ: لە لێکدانی هەر دوو ماڵەکەدا ئیمپراتۆریەتێکی بچکۆلەی دامەزراند.. سەرەتا لە ژێر قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆردا گۆڕانەکان ئێجگار بە خێرایی ڕوویاندەدا و ئەم فریانەدەکەوت هیچیان دەربارە بڵێ.. تەنها بە حەپەساویەوە لە سیمای شتە تازەکان ڕادەما و لە ناوەوە خۆی دەخواردەوە.. لەگەڵ ڕەوینەوەی هەموو حەپەسانێکیشدا، کۆمەڵێک سیمای نامۆ دەبوون بە ئاسایی و بگرە تا ڕادەیەک لەزەتیشی لێدەبینین.. دەچووە ئەو ژوورەی دایکی و «سیامەند» و پاکیدەکردەوە.. سەرینەکانی دەتەکاند و چەرچەف و لێفە لوولکراوەکانی ڕێکدەخستەوە.. جلە هەڵەوگێڕاوەکانی نووستنی دەهێنانەوە باری خۆیان و دەیکردن بە عەللاگەوە.. بەڵام هەرگیز نەیدەتوانی لە خۆی بپرسێ: چۆن ئاوا بە ئاسانی هەموو شتێک بڕایەوە و لە دەست ئەم دەرچوون..؟! کاتێکیش هێزی هاتەوە بەر و دەیتوانی شتێکی کاریگەر بڵێ، سەری لە گۆڕانی گەورەی ماڵ و تێکشێوانی سەیری سیمای شتەکان دەردەنەدەکرد و هەموو هەوڵەکانی بە هەدەر دەچوون.. ئەوسا دایکی «فەرهاد» و «نەسرین»ێکی بە سکێ ببوو و ژمارەی خێزانەکەیان بە پێی فایلی تازەی «نفووس و سەرژمێری» گەیشتبووە دوانزدە کەس.. «جابر» هەمیشە بە شەرمەوە دەچووە دەرێ و زوو زوو لەگەڵ هاوڕێکانی دەیکرد بە شەڕ، لەسەر ئەوەی توانجیان تێدەگرت و تەریقیاندەکردەوە.. «نەوال» ئەو جارە لە بەرامبەر پەنجەرەکەی ژووری «ریحاب»ـەوە وەستابوو و سەیری ئەو

گۆڕەپانەی ئەوبەری دەکرد، کاتێ براکەی و کۆمەڵێ لە هاوڕێکانی لەسەر کورسیە درێژەکان دانیشتبوون و گاڵتەیان دەکرد.. لەپڕ «جابر» هەڵیکوتایە سەر «ویسام»ی «سامی سەماوی» و بە بۆکس تێیکەوت.. کاتێکیش ناوبژیانکردن و ئەویان دوورخستەوە، «ویسام» خوێنی دەم و لووتی دەسڕی و بەردەوام جنێوی دەدا:

ـ تۆ ئەگەر هەموو شاریش بکوژی، هێشتا هەر کەس پێت نالێ ئازا، چونکە کەس نەماوە دایک و خوشکتی نەگابێ.

ـ بەرمدەن، بۆئەوەی دایکی لە ناوگەڵیا بکەم بە دوو لەتی وەکوو یەک.

ـ وات لە دایکە قەحپەکەی خۆت بکردایە، بۆئەوەی ڕەحەت بوایە، نەوەکا بە دیارتەوە پیاوێک.......

ـ لەگەڵ ئێوەمە بەرمدەن، تا بۆ ئەو باوکەی ئاقڵکەم، کە لە هەموو ژیانیدا ناوگەڵی ژنەکەی خۆی نەبینیوە و......

ـ بڕۆ خوشکە هونەرمەندەکەت ئاقڵ بکە، کە بە پێی خۆی دەچێت بۆ ماڵان.

ـ خوشکی من بە پێی خۆی چووە بۆ ماڵان هەی دوودەرکی..؟!

ـ نەء، بردوویانە.. کاربەدەستانی ئێستگە و تەلەفزیۆن دەیبەن.. وایلێهاتووە هیچ کوڕێ بۆ دەسپەڕ دانامێنێ، هەموو کاتێ بە سنگ و ڕان و قوڵی ڕووتەوە لەسەر شاشەکە ئامادەیە.

«نەوال» لە شوێنی خۆبەوە هەڵدەلەرزی و نەیدەوێرا بچێت بۆ ماڵەوە، چونکە هەر خۆی دەیزانی ئەو برایەی لە کاتی تووڕەبووندا چ شێتێکی هەڵەشەیە و چۆن دوای هەموو شەڕێکی دەرەوە، یەکێکی گەورەتر لە ماڵەوە بەرپا دەکات و بە شەق و زللە تێیاندەکەوێت.. «سیامەند»یش ناوێرێت لە ئاستیدا دەم هەڵێنێتەوە و ناچار ماڵەکەی بۆ بەجێدەهێڵێت.. دەیان جار قژی دایکی ڕاکێشاوە و هاواری بە سەرداکردووە:

ـ بەسیەتی قەحپەیی، واملێهاتووە لە ڕووم نەیەت بچمە دەرەوە.

دایکیشی نارەزایی دەرنابڕێت و بەرپەرچی ناداتەوە، نەوەکا ماڵەکە بەجێبهێڵێت و بۆ لایەک بڕوات.. ئەو دوای هەموو شەڕێکیش دەچێتە هەیوانەکە و ڕێک لە خوار تابلۆی «مەتەڵی بێکۆتایی»ی «سەلڤادۆر دالی»دا بە توندی سەری خۆی دەکێشێت بە دیواردا، کە ئەم لە «رەندە»ی قوتابیی بەشی نیگارکێشانی وەرگرتووە و لەوێی هەڵواسیوە.. وەکوو شێتێکی بە ڕاستی هاوار دەکات و بەردەوام دەڵێت:

ـ من دەڕۆم و سەری خۆم هەڵدەگرم.. شتێک هەیە چاوەڕێیم بیێت، تا بە ئێجگاری بەجێتانبهێڵم و تا ماون نەمبیننەوە، بەڵام ئەو شتە نابێ.. نابێ.. نابێ........

لەگەڵ هەر «نابێ»یەکدا سەری خۆی توندتر بە دیواردا دەکێشا و تابلۆکەش زیاتر دەلەریەوە.. دەتوت ها ئێستا نا ساتێکی تر پەڵەهەوری چڕی ئاسمانی تەڵخ و تاوێری رەق و وردەبەردی لووسی قەدپاڵی شاخی تەمومژاوی و گەڵای داری زڕی قەراغ ڕێگای چۆڵ و پارچەی سەوڵی شکاوی بەلەمی لەکەڵککەوتوو و ماسیی رەشی وشکهەڵاتوو و دەیان شتی تری سەیر سەیری ناو تابلۆکە دێنە خوارێ و دایدەپۆشن.. ئەوسا هەر لەوێ جەستەی بێگیانی تێکەڵ بەو دیمەنە سوریالیە دەبوو و ئەم لەزەتی دنیای لە سەیرکردنی دەبینی.. دایکی وەکوو ئەم نەبوو و هەستی بە جوانیی ئەو ساتە فەنتازییە نەدەکرد.. دەهات و دەستەکانی لە دواوە دەکردە ملیەوە.. توند توند دەینووساند بە خۆیەوە و ماچی دەکرد.. دەگریا و فرمێسکەکانی دادەبارانده سەر قژە خاوەکەیەوە.. ئەو دوای مردنی «سیامەند» زیاتر دڵنەوایی دەکرد و زۆر شەو وەکوو منداڵەکان لە ژوورەکەی خۆیدا دەینواند.. هەر ئەمەش وایلێکردبوو ئاوا هۆگریان بیێت و لەو زیاتر نازیان بکێشێت.. هەرکە یەکێکیان خەبەریدەبووەوە و دەستی دەکرد بە گریان، ئەو لە پێش دایکیەوە فریای دەکەوت و مەمکەمژەی دەخستە دەمیەوە.. زۆر جار بە چاوی خەواڵووەوە دەیکردنە باوەش و لە ڕاڕاوەکەدا دەیگێڕان.. «ست سوعاد» بەیانیان ئەو شتانەی

بۆ ئەمان باسدەکرد و بەوی دەوت:

ـ بە سائەقەت بم کوڕە گەورەکەم، نەمردمایە، ئاوا منالەکانتم لە باوشبگرتایە..!!

هاوکات بە دەستی چەپی ماچێکی بۆ هەڵدەدا و پێی دەوت:

ـ بە خوا باوکی دە منالیش بیت، هەر خۆم دەتشۆم و جلەکانت لەبەردەکەم.

هەرکە بەرچایی دەخوارد و دەیویست بچێت بۆ ستۆدیۆ، کە لە دوای «سیامەند»ـەوە ئیشی تیادەکرد و شارەزاییەکی زۆری لە هونەری وێنەگرتندا پەیداکردبوو؛ منالەکان تێکرا دەستیان دەکرد بە گریان و بۆیان ژێرنەدەکرانەوە.. کەچی شێتاتیەکەی هەر مابوو و مەحالبوو ئاوا بە ئاسانی بگۆڕێت.. وازی لەو دڵپیسیەی نەدەهێنا و زوو زوو دەکەوتە وێزەیان.. ئەگەرچی لە کاتی هێمنییدا دەبوو بە کەسێکی تر و لە گاڵتە و قسە خۆشەکانی تێرنەدەبوون.. هیچ شەوێ مالەکەیان بێ میوان نەبوو و تا درەنگ نەدەچوونەوە.. «ریهام» و خوشکەکانی بۆ خۆشیی پەلاماریان دەدا و دەکەوتنە ماچی ڕوومەت و لاملیەوە.. دایکی بەم دەست و بەو دەست لێی دووردەخستنەوە و بە گاڵتە پێی دەوتن:

ـ وازی لێبێنن بێقیمەتینە، دەزانم حەزتان لێیەتی، بەڵام کوڕی من بە کەستان ڕازیی نابێت.

«نێرگز» لە هەر کەسێکی تر زیاتر پێی سەرسام بوو و هیچ کاتێ لای «نەوال» نەیدەشاردەوە، کە خۆشیدەوێت و ڕۆژێ هەر پێی دەڵێت، بەڵام «ریحاب» لەویش و لە «ئیبداع»یش بۆی بە پەرۆشتربوو و زوو دەستی بەسەرداگرت.. «نێرگز» گڕیگرت و بە هەر شێوەیەک بوو هەڵیگێڕایەوە.. دوای ئەوەی ئەو لە ڕۆژی جەژنی نیشتیمانییدا گوللەی خۆشیی بەر دڵی کەوت و لە خەستەخانەی «قادسیە»دا گیانی سپارد، «بولدان»ی دراوسێیان دڵی خۆی دایە و جێگای ئەوی بۆ گرتەوە.. «جابر» هیچ شتێکی لە «نەوال» نەدەشاردەوە و شەوان پێش نووستن لەسەر جێگاکەی ورد ورد سەرچڵیەکانی بۆ دەگێڕایەوە.. خووی دابووە خوێندنەوەی شیعر

و چیرۆک و ڕۆمانی ڕۆمانسی و لایەکی کتێبخانەکەی خاڵی گوێزابووەوە ماڵی خۆیان.. کەچی هێشتا هەندێ لە وەسواسیەکەی تیا مابوو و جار جار لێی دەردەکەوت.. ئەو نیوەڕۆیە چووبووە ژوورەکەی «هالە» و وێنە و نامەیەکی «ویسام»ی «سامی سەماوی»ی لەناو کتێبەکانیدا دۆزیبووەوە.. ئێوارە لەسەر دەم پاڵیخست و تا هێزی تیابوو بە پاژنەی ڕەقی پێڵاوە چەرمەکەی لە مووروغەی پشتی دەدا.. ئەم و «فەریال» بە فریای کەوتن و لە ژێر دەستیان دەرهێنا.. لەوانیش تووڕەبوو و دەستی کرد بە جنێودان.. ئەو جارەش «سوهاد»ی «هادی سوهادی»ی دراوسێیانی دایە بەر شەق و بەر چاوی چەپی بەقەدەر هەڵووژەیەکی گەورە خڕکرد، چونکە لە کاتی سواربوونی پاس خۆی بە دواوەی «فریال»ەوە نووساندبوو و ئەو چاوی لێبببوو.. وەکوو ئەوساش دوای هەموو شەڕ و فەرتەنەیەک دەچووە هەیوانەکە و سەری بە دیواردا دەکێشا.. بەڵام تابلۆکە دەمێک بوو لابرابوو و دایکیان خستبوویە ژێر دۆشەگی ناو بێشکەی «فەرهاد»ەوە.. ئەمە تاقە شتێک بوو دەیتوانی ماڵەکەی ئەولا بیری «نەوال» بخاتەوە و بۆ ساتێکی کورت وا هەست بکات هێشتا گۆڕانەکان بەرپانەبوون.. ئەو پیاوە تەنیا و دوورەپەرێزەی شێوەی کتومت لە «سەلڤادۆر دالی» دەچوو و ئارەزووی کۆکردنەوەی ڕێکت و تۆپی ڕیشەی هەبوو، خانووەکەی لێ کرِیبوون و ڕێگای بە هیچ کەسێ نەدەدا بچێتە ناویەوە.. ئەم سەرەتا نەیزانی ئەوی تیایە و ڕۆژێکیان چوو بۆ بینینی.. لە دەرگای دا و کەس نەیکردەوە.. چەند جارێکی تر لێ دایەوە و هیچ دەنگێ نەبوو.. پاڵێکی پێوەنا و ئاودیو بوو.. سووک سووک دەچووە لای سەروو و بە ترسەوە دەیوت:

ـ ماڵەکە لە ماڵن..؟!

ژوورەکان، مووبەقەکە، هەیوانەکە، هەر هەموویان پڕبوون لە ڕێکتی سپیی ڕیشە و تۆپە ڕەشە تەشیلەییەکان بە بنمیچەکانەوە شۆڕکرابوونەوە.. هەرگیز نەیدەزانی ڕۆژێک ئاوا سیمای ماڵەکەیان دەگۆڕێت و وەکوو خەونێکی ئێجگار

ترسناک دەردەکەوێت.. بەڵام لە منالّیی وا چووبووە ئەقڵییەوە و تەواو باوەڕیشی کردبوو، کە هەموو ئەو سەرابانەی لە چاوەکانی ئەم و خەڵکی تر وندەبن و خۆیان بە دەستەوەنادەن، ڕۆژێک لەپڕ و بە جارێ لە ماڵەکەی ئەماندا دەردەکەون و بۆ ماوەیەک هەموو شتەکان لە ئاوێکی سەیردا نقوومدەکەن.. بەسەر ئەو ڕێگا باریکەی لە نێوان ڕێکتە کەڵەکەکراوەکانی هەیواندا کرابووەوە و بە هەزار حاڵ دەگەیشتە ژووری میوان، بە ترسەوە هەنگاوی سست سستی دەنا و دڵی لەگەڵیا هەڵدەلەرزی.. کاتێکیش گەیشت و پیاوەکەی بینی، کە لە شێوەی ئەشکەوتێکی کەمێ تاریکی ناو خەونەکانی جارانی و هەقایەتی ئامۆژنەکانی شوێنێکی بۆ خۆی لەناو ڕێکتەکاندا کردبووەوە و وەکوو ورچ تیایدا قاچەکانی لێ ڕاکێشابوو؛ هەر بە جارێ خوێنی وشکبوو و نەیتوانی دەمهەڵێنێتەوە.. ئەو بۆی هەستایەوە و هەر بە تیتک لە دەرگای حەوشەی ئاودیوکرد.. نەیدەزانی کەی و چۆن گەیشتبووە ماڵەوە و کێ لەسەر ئەو تەختی نووستنەی خۆی پاڵیخستبوو، بەڵام دەیزانی ئیتر سیمای کۆنی شتەکان ناگەڕێنەوە و ئەم دەبێت پشتیان تێبکات.. پشت لەوان و ڕوو لەو شوێنە بکات، کە ئەگەر هیوایەک هەبێ بۆ دووبارەبوونەوەی ڕابردوو و شتە بەسەرچووەکان، ئەوێیە و تیایدا سەردەمەکان هەموویان لە یەکتر دەچن.. بەڵام تا هەلی بۆ ڕەخسا و گەیشت، زۆری پێچوو و ئەوێش گۆڕابوو.. هەر کاتێکیش هێمندەبووەوە و بە شێنەیی ڕابردووی خۆی دەهێنایە بەر چاوی، نەیدەزانی ئەم لەگەڵ گۆڕانی سیمای شتەکاندا بووە، یان دژیان و ئەوەندەی تر هەستی بە کەمبەهرەیی خۆی دەکرد.. هەموو خەونەکانی لەپڕ بەتاڵبوونەوە و هیچ شتێ نەمایەوە دڵی پێی خۆشبێت.. سووک سووک هەموو تواناکانی لە دەست دەدا و ڕۆژ بە ڕۆژ ژیانی ئەمیش لە هی خەڵکی تر دەچوو.. دەنگە خۆشەکەی، قسە نەستەقەکانی، سەما سەرنجڕاکێشەکانی، گاڵتەوگەپە جوانەکانی، هیچ تامێکیان تیا نەما و وردە وردە سوانەوە.. وشەی «گۆرانیبێژ»یش تەنها نازناوێک بوو و زۆر جار پێی پەستدەبوو.. قێزکردنەوە و تەریقبوونەوە، ئەو دوو هەستەبوون

دەیانتوانی کەمێ وزەی پێ ببەخشن و لە ڕێگایانەوە بزانێت هێشتا ماوە.. ماوە و هیوایەکی کز هەیە بۆ ژیانێکی جیاوازتر.. ئەوانیش لەگەڵ تەواوبوونی ماوەی سکپڕییەکەی کۆتاییان هات و کەوتە بەردەم بڕیارێکی قورسەوە.. هەرچۆنێ بوو هێزی نایە بەر خۆی و نەیویست ملکەچی ئەو یاسایە بێت، کە هەموو دایکی دوانەیەکی لەیەکچووی دیکە بەبێ ترس و دوودڵییەوە خۆبانی بە دەستەوە دەدەن و دواتریش شانازیی پێوە دەکەن.. حەفتەیەک هەر بە دزیی لە ژووری ئازووقەی ماڵی «نەخشە خان»دا مایەوە و نەیهێشت کەس پێی بزانێت.. بەیانیی زووی ڕۆژی هەشتەم هەستایەوە و هەر دوو مەلۆتکەکەی خستە ناو سەبەتەیەکی کەمێ گەورەوە، ئەوەی «مەهاباد»یان بە منالیی تێکردبوو و بۆنی بێچووەکۆتری ناو کولانەی شوێنێکی هەتاونەدیوی لێدەهات.. دوای تاوێ دوو پیاوە چوارپەنجەکە بە خشکەیی هاتنە ژوورەوە و بەبێ دەنگیی لەبەردەمیدا وەستان، کە «نەخشە خان» بە سەرجەمی ئاڵتوونەکانی خۆی ڕازییکردبوون و تووڵەڕێگای پەڕینەوەیان پێدەزانی.. ئەویی بەجێهێشت و ڕێی گەڕانەوەی گرتە بەر.. بەرەو ئەو ماڵەی ئەم هەرگیز بە هی خۆی نەزانیوە و چوار دوانەی تری تیا دەژین.. شەو گەیشتە سەر سنوور و لەوێ بەپێ ملی لەو تاریکاییە نا، کە دەبوایە نزیکەی سەعاتێ بە تەنیا بیبڕێت و لەوبەر خۆی بە دەستەوە بدات.. وەکوو ژنەکۆچەریەکانی قەدی نوێنی سەر ئەستێرکی جارانی ماڵی خۆیان توند توند سەبەتەکەی کردبووە باوەش و بەسەر بەردە ڕەق ڕەقەکاندا هەنگاوی سووک سووکی دەنا.. هاتنەکەشی هەر بەم ڕێگایەدابوو و دەیتوانی زۆر بە چاکی بیری خۆی بخاتەوە، کاتێ لە دواوەی «کاکەسوور» و لەسەر ئەو ئەسپە بەرزەی سواربوو و شل شل دەستەکانی گرتبوو بە پشتێنە ئەستوورەکەیەوە.. بەڵام ئەم ئێستا دایکی دوانەیەکی لەیەکچووە و توانای بەراوردکردنی شتەکانی نەماوە.. پەلەیەتی بە هەر شێوەیەک بێت ئەو سنوورە ببڕێت و دڵی دایکیانی پێ ڕۆشنکاتەوە.. بیری لەو و لە خوشک و برا و خوشکەزاکانی کردەوە و سیمای ئەوسایانی دەهێنانە بەر چاوی، ئەگەرچی دەیزانی

هەنووکە زۆر گۆڕاون و ڕەنگە منداڵەکان هەر نەناسێتەوە.. ئێستا «فەریال» بووە بە دکتۆرێکی شارەزا و بەناوبانگی شار و دوورنییە شووشیکردبێتەوە.. «هالە» لە زانکۆ وەرگیراوە و لە جاران زیاتر دەست بە خۆیدا دێنێت.. لەوانەیە لەگەڵ «ویسام»ی «سامی سەماوی»دا هەموو شتێکیان براندبێتەوە و ئەڵقەیان کردبێتە پەنجەی یەکتر.. «جابر» تا ئێستاش ستۆدیۆکە بەڕێوە دەبات و ئێواران بە باوەشێ کتێبەوە خۆی دەکات بە ماڵدا.. «فەرهاد» و «نەسرین» بە پیریەوە دەچن و نوقڵ و بستەی گیرفانەکانی بەتاڵدەکەن.. «دۆستی» و «دانا» و «سازگار» و «ساکار» دەچن بۆ قوتابخانە و ئێواران لەناو چیمەنەکە، یان لە ژووری دانیشتندا وەزیفەکانیان دەنووسنەوە.. دایکی وازی لە دەوامی قوتابخانە هێناوە و هەموو کاتی خۆی بۆ بەڕێوەبردنی ماڵەکە تەرخانکردووە.. چەند شتێکی سەیرە و لە خەیاڵی هیچ کامێکیاندا نییە، ئەم دوای ئەو چەند ساڵە بە دوو منداڵی زۆر جوانەوە، لەپڕ لە حەوشەکەدا پەیدادەبێت و بە دەنگی پڕ لە گریانەوە بانگیان دەکات.. بۆ ماوەیەک دەچێتە ژوورەکەی جارانی و دەرگاکەی بە کلیل دادەخات.. دەگریت و هەموو ناخۆشی و مەینەتیەکان لە بیر خۆی دەباتەوە.. تاقە شتێک لە خەیاڵیدا بهێڵێتەوە و هەرگیز لە یادی نەکات، «مەهاباد»ـە و وێنەکەی بە گەورەیی دەکێشێت.. لە چوارچێوەی دەگرێت و لە دیواری ژوورەکەی خۆی دەدات.. ئەمە تاقە کاری هونەرییە ئەم بە لایدا بچێت و بە حەزەوە لەگەڵیدا خەریکبێت.. بێگومان «مەهاباد» دەستی نیگارکێشانی نییە و ناتوانێ وێنەی ئەم بکێشێت، بەڵام گۆرانیبێژێکی بەهرەمەندە و تێکەڵ بە هەموو وشە و ئاوازی گۆرانیەکانی دەکات.. هەر جارێکیش بچێتە گۆڕەپانە فرەوانەکەی ئەوبەری ماڵیان و سەرنج لە خاکوخۆڵەکەی بدات، کە جارێکیان لەوێدا دوو پیاوی سپیپۆش ورچێکی ڕەشی سەماکەریان بە پارە پیشانی خەڵکدەدا و ئێوارانیش قازە گۆشتنەکانی گۆمەکەی ئەولا خۆیان لێ وشکدەکەنەوە؛ نیوەڕۆ کەمێ گەرمەکەی ئەو بەهارەی بیردەکەوێتەوە و دەچێتە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە، کاتێ

تەرمی «ئەم» و هی «نەخشە»ی دایکی و دوو پیاوە ناپاکەکەیان لێ فڕێدابوو و تا شەویش هەر لەوێیان هێشتنەوە.. چیرۆکێکە و هەموو کەسێ دەیزانێت: «نەوال»ی گۆرانیبێژ، دایکی دوانەیەکی لەیەکچوو، سەرپێچیی لە یاسای ژمارە «یەک»ی ساڵی «چوار»ی «کوردی» کرد و دەستەی ژمارە (هەزارونۆسەدونەوەدونۆ)ی هێزی «کاکەسوور» لەسەر سنوور گرتیان.. ئەمیان بردە بەردەم «کاکەسوور» و منداڵەکانیان بە خێرایی گەیاندەوە شار.. یەکێکیان بۆ «بەشی بەخشین» لە «بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی گشتی» و هیچ ناوێکی بە نەسیب نەبوو.. ئەویتریان «نازەنین خان» و «مامۆستا هاوار» کردیان بە کچی خۆیان و ناویان نا «دیجلە».. چونکە ئەو جارەی «نەوال» چوو بۆ لای «نازەنین خان» و ویستی ئاشتی بکاتەوە، ئەو بەو مەرجە رازیی بوو و هێشتی ئەملا و ئەولای ماچبکات، کە ئەم بە رەشێکی تۆخ لەسەر قاقەزێکی سپی بنووسێت: «ئەو تاقە شتەی لە دوای بەجێدەمێنێت بدرێت بەو».. ئەمە هەمووی چەند ڕۆژێ دوای کوژرانی سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکانی باکوور «عەمار»ی کوڕی «حەسەن خوداداد» بوو

و.............................................

...............................................

...............................................

...............................................

...............................................

...............................................

...............................................

...............................................

...............................................

...............................................

..............................................................
..........

دانمارک (١٩٩٧ـ ١٩٩٩)

پەراوێزەکان

١ـ خۆزگە کۆرپەکە لە دایک نەبووایە، کە لە دایکیشبوو، شیری دایکە زەیستانەکەی نەخواردایە.

٢ـ پەندێکە، خەڵکی «بەغداد» بەکاریدەهێنن.. مەبەستی ئەو کەسانەیە، کە دوای بەهێزیی بێ هێزدەبن، یان دوای دارایی تووشی نەداریی دەبن و دوژمنیان بۆ زۆر دەبێت.

٣ـ پەندێکی ترە و ماناکەی ئاوایە: مەلەکردنی زۆر تینوویەتیی تینوو ناشکێنێت و بۆنکردنی تەنوورەکانیش برسی تێرناکەن.

٤ـ پەندێکە و بەو کەسانە دەوترێت، کە هەڵسوکەتی چەوت دەکەن.

٥ـ دەستەواژەیەکە ژنان لە کاتی شیوەن و لە خۆداندا دەیڵێن و کۆڕی گریانی پێ گەرمدەکەن.

٦ـ یەکێکە لەو گۆرانییانەی دایکانی «بەغداد» کچیساڵەوەخت و کەمێ گەورەتریان پێ دەلاوێننەوە و باس لە بەشوودانی دەکات.. دەکرێت مانا گشتیەکەی ئاوا وەربگێڕین: هەزار لیرە پێشەکییەکەی و سەد جەهادی «پارەیەکی کۆنە» بۆ مارەیی.. دیاریەکی بەنرخیش بدرێت بە موختار.. نوقڵ بەسەر دراوسێکاندا ببەخشرێتەوە.. سەرەڕای هەموو ئەمانەش هێشتا برای قایل نییە.

٧ـ گۆرانییەکی فۆلکلۆریە، دایکان لە کاتی هەڵپەڕاندن و لاواندنەوەی کچی ساڵەوەخت و کەمێ گەورەتردا بۆیان دەڵێن. واتە خۆشحاڵم، کە هاتیتەوە و لە دەرگای حەوشەوە بەرەو ژوور

هاتیت.. دنیا لای من شەوەزەنگبوو، تۆ مانگ بوویت و ڕووناکتکردەوە.

٨ـ وتەیەکی گۆستاف فلۆبێرە.

٩ـ گۆرانییەکی فۆلکلۆریە و ماناکەی ئاوایە: من پیربووم و هاوەڵەکانم هێشتا گەنجن. لەبەر ئەو هەموو خەمەی هەڵیاندەگرم پیربووم و ئەو خەمانەیش، کە لە دوای خۆمدا بەجێیاندەهێڵم..... وەکوو کەسێک سەگی هار گازی لێگرتبێت، ئاوا شەوانم بەسەربرد، ئینجا زەمانەش بە کەڵبەکانی هەناوی هەڵدڕیم. داخی لەوانە گرانتریش ئەوەیە شانازییم بە هاوڕێم دەکرد و دڵم پێی خۆشبوو، کەچی وا دەرنەچوو، پشتی تێکردم و دوژمنی پێ خۆشکردم.

١٠ـ پەندێکی ترە و بەم شێوەیە لێکدەدرێتەوە: خراپەکان بە یەکەوە کۆدەبنەوە و پەیوەندیی خزمایەتییان لە نێواندا هەیە. هەتا ئەگەر شەڕیشبکەن، هەر ئازاری یەکتر نادەن.

١١ـ یاریەکی فۆلکلۆریی کچانەیە. پێویستە تەواوی وشەکانی یاریەکە بزانرێت، کە بەم شێوەیەیە: سەرداری یاریەکە دەڵێت: یالیلێ علویش تبچین..؟ علویش تبچین..؟ علویش تبچین..؟ ئەوانی تر تێکڕا دەڵێن: ابچی واربد إبنیه.. إبنیه.. إبنیه. سەرداری یاریەکە: شسمها..؟ شسمها..؟ شسمها..؟ ئەوان ناوی یەکێ لە بەشداربووانی یاریەکە دەڵێن.

١٢ـ حشرجه: حشرجە الموت: پەلەقاژە، پەلەقاژەی مەرگ.. گیانەڵا.

١٣ـ شتی بێتام و بێلەزەت.

١٤ـ تریقانەوە، قاقالێدان.

١٥ـ مێرووولەکردن و ختووکە.

١٦ـ پەندێکی بەغداییە، واتە جووتێکی خراپ و بەدفەساڵ بە یەکەوە ڕێککەوتوون و بوون بە ژن و مێرد.

١٧ـ پەندێکی عەرەبیی کۆنە و ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە ماوەیەکی زۆر خەریکی کارێک دەبن و بەرهەمێکی ئێجگار کەمی لێ بەدەستدەهێنن.

١٨ـ کۆمەڵێ جنێوی ناشیرینن و ئافرەتی بەغدایی لە کاتی تووڕەیی و شەڕدا بەیەکتریدەدەن: بەڕەڵلای کۆلانان، سووک و چرووک، ساختەچی، قەحبە....

١٩ـ بە ژنێک دەوترێت، کە زمانێکی درێژی هەبێت و لە قسەکردنا ژنانی تر لە هەقی نەیەن.

٢٠ـ کوچری: لە بنەڕەتدا چێشتێکی هیندییە، بە برنج و نیسک لێدەنرێت و خەڵکی «بەغداد» لەوانەوە فێریبوون.

٢١ـ بیابان، چۆڵەوانی.

٢٢ـ دوا هەناسەی ژین، گیانەلا، پەلەقاژە، پەلەقاژەی مەرگ.

٢٣ـ جۆرێکە لە شیرینی و منالان حەزی لێدەکەن. تامی وەکو هی پەشمەک وایە و وەکو ئەویش زوو لەناو دەمدا دەتوێتەوە.

٢٤ـ کۆی «الوجر»ـە و ئەو چاڵەیە، کە بۆ گیانداری کێویی هەڵدەکەنرێت، بۆئەوەی بکەوێتە ناویەوە و دەستی بەسەردابگرن.

٢٥ـ بەهەڵەداچوون، بەلاڕێداچوون.

٢٦ـ یوغەڕغەڕ: چەند مانایەکی هەیە، ئێمە پەلەقاژەکردنمان مەبەستە.

٢٧ـ خۆڵ.

٢٨ـ کۆمەڵێ دەرمانی جۆراوجۆرە، تێکەڵ بەیەکتر دەکرێن و لەناو دەسکەواندا دەکوترێن. بۆ چارەسەرکردنی چاوئێشە بەکاریانهێناوە.

٢٩ـ گوڵاڵەسوورە.

٣٠ـ لابردنی تووک و ئاوەڕووتکردنی باڵندە.

٣١ـ وشەیەکی تورکمانیە، واتە: دەکەوێت.

٣٢ـ تۆوی ڕووەکە و ڕەنگێکی زەردی هەیە (لێرەدا ڕەنگی جیاوازە) و بۆ دەرهێنانی تووک لە ناوچاودا بەکارهێندراوە.

٣٣ـ هەرەسهێنان و داڕووخان.

٣٤ـ بۆنی زۆر خۆش.

٣٥ـ تاڵاو، شتی زۆر زۆر تفت و تاڵ.

٣٦ـ بوخردان. هەروەها خۆڵەمێشی بوخور «مجمره البخور».

٣٧ـ مادەیەکی لینجە و بۆنێکی زۆر ناخۆشی هەیە. بە ئاگر گەرمدەکرێت و دەبێت بە هەڵم. لۆکە، یان پارچەیەک قوماش دەخرێتە سەر هەڵمەکە و دوای کەمێ ساردبوونەوە دەخرێتە سەر چاوی ئەو کەسانەی تووشی چاوئێشە بوون.

٣٨ـ سوتان و گڕتێبەردان.

٣٩ـ بۆسۆ، بۆنسۆ، بۆنی سووتانی قوماشی لۆکە و خوری.

٤٠ـ سەرەتای داستانی گلگامش بە زمانی ئەکەدی.

٤١ـ بەندی سیوشەش لە ستوونی چوارەمی پارچەی حەوتەمی «داستانی گلگامش». ماناکەی ئاوایە: بۆ ئەو ماڵەی، کە تیانشینەکانی لە ڕووناکی بێبەشن».

٤٢ـ ڕەییان و ڕەییا: زیاتر لە مانایەکیان هەیە، بەڵام لێرەدا یەکەمیان بە مانای بۆنی خۆشە و دووەمیان بە مانای نەرم و ناسک و ئاودار هاتووە.

٤٣ـ لە بنەڕەتدا وشەیەکی ئینگلیزیە «rose berry» و لە تورکیدا گۆڕاوە، هەر بە هەڵە پەڕیوەتە ناو زمانی عەرەبی و بە مانای دۆندرمە بەکاریانهێناوە. لە کوردی تەنها وشەی ئەزبەری و کەوکەو دەوترێت.

٤٤ـ بەندی شەش و حەوت لە ستوونی چوارەمی پارچەی سێیەم: ماناکەی ئاوایە: تەنها خواوەندە بۆ هەتاهەتایە دەمینێت وەکوو خواوەندی شەماس، بەڵام مرۆڤ تەمەنی کورتە».

٤٥ـ :ب٩ س٤پ٣: «تۆ ئێستا لە مردن دەترسیت».

٤٦ـ ب٢٧ س٦ پ٤: «ئەی هاوڕێکەم ئێمە گیانێکی بێهێزمان هەیە».

٤٧ـ ب١٤ س٤ پ٥: «هەموو ئەو خەونانەی بینیمن ترسناکبوون».

٤٨ـ ب٥س١ پ٩: «من لە مردن دەترسم، بۆیە دەدەمە دەشت و هەرد».

٤٩ـ ب٣ س٤ پ؟: «دەست لە ئاوی مردن وەرمەدە».

٥٠ـ ب٢٦ س٦ پ؟: «ئایا ماڵێک پێکەوەدەنێین، بۆئەوەی تا ئەبەد بمێنێت. ئایا بەڵگەنامەیەک مۆردەکەین، بۆئەوەی تا ئەبەد بمێنێت..؟»

٥١ـ ب٢٧ س٦ پ؟: «ئایا براکان میراتی خۆیان بەشدەکەن، بۆئەوەی تا ئەبەد بمێنێت..؟»

٥٢ـ ب٢٩ س٦ پ؟: «ئایا ڕق تا ئەبەد لای دوژمن دەمێنێت..؟».

٥٣ـ کاژی مار.

٥٤ـ ئەو زەویەی لە ژێر تیشکی زۆر بەتینی ڕۆژدا داخبوبێت.

٥٥ـ سەربەست، ئازاد.

٥٦ـ وشەیەکی زۆر کۆنی عەرەبیە و ئێستا باوی نەماوە. بە مانای دەستەبەسەرداگرتنی ماڵی کەسانی تر بەکاریانهێناوە.

٥٧ـ پەرش و بڵاوبوونەوە.

٥٨ـ هێلکەشەیتانۆکە. ئەو قاوغەی، کە کرم تیایدا خۆی دەشارێتەوە و گیانی لە مردن دەپارێزێت.

٥٩ـ زیاتر لە مانایەکی هەیە.. لێرەدا مانای سزادان و تۆڵەسەندنەوەی هەیە.

٦٠ـ بوون بە ئەبەدی، بوون بە ئێجگاری.

٦١ـ عطن: بۆگەن.. عقم: نەزۆکی.

٦٢ـ ختیلە، یاخود ختیبە، هەندێکیش «ختێلان»ی پێ دەڵێن، یارییەکی فۆلکلۆرییە و کوڕان دەیکەن. شێوەیەکە لە شێوەکانی چاوشارکێ.. دۆڕاو ڕوودەکاتە دیوار و دەستەکانی پێوەدەگرێت. چاوەکانی دەخاتە سەریان و دەیاننوقێنێت. سەرۆکی یاریەکە لێی دەپرسێت: لە مزگەوتدا چەند قورئان هەیە..؟ ئەم بە ئارەزووی خۆی ژمارەیەک دەڵێت، بۆ نموونە دەڵێت دە، سەرۆکی یاری پێی دەڵێت: ئەو دە قورئانە کوێرتکەن ئەگەر چاوبکەیتەوە.. ئیتر ئەوان خۆیان لە کون و کەلەبەرەکاندا دەشارنەوە و ئەم دواتر چاوەکانی دەکاتەوە. دەبێت بۆیان بگەڕێت و بیاندۆزێتەوە. لە گەڕەکێکەوە بۆ گەڕەکێکی تر جیاوازە. هەمان یاری لە «هەولێر»یشدا هەبووە.

٦٣ـ جۆرێکە لە بەهارات.. دەنکی بچکۆلە بچکۆلەیە، لە ڕاستیدا و لە دەرەوەی ئەم جیهانەدا ڕەنگەکەی خۆڵەمێشییە، بۆنێکی خۆشی هەیە و بۆ چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشیی بەکارهێندراوە.

٦٤ـ گۆرانییەکی فۆلکلۆریە و گۆرانیبێژ و هونەرمەندی عێراقی «عەفیفە ئەسکەندەر»، وەکوو نقێم لە ڕۆحی گرتووە: هەزار گیانی وەکوو هی خۆمت دەکەم بە قوربان.. هەزار چاوی وەکوو هی خۆمت بۆ دەگریەنم. ئەی خۆشەویستم چیم لێبەسەرهاتووە، شەوان بە تەنیایی چۆن دەچنەسەر. ئەی مەزن فرمێسکەکانی چاوم بۆت دەدوێن. لەناو هەموو ئازیزانا، هەر تۆ دیارنیت. من بێدەنگم و با خەڵک قسەت بۆ بکەن.

٦٥ـ دوو مانای هەیە: نەزۆک و چۆڵەوانی.. هەر دووکیانمان مەبەستە.

٦٦ـ شەوەزەنگ، تاریکاییەکی زۆر زۆر.

٦٧ـ زیاتر لە مانایەکی هەیە، بەڵام لێرەدا مانای ئەوەیە، کەسێ بمرێت و کەس لە دوای خۆیدا بەجێنەهێڵێت.. کەسێک بە وەجاغکوێریی سەر بنێتەوە.

٦٨ـ هەر چواریان یەک مانایان هەیە.. واتە ئەو چەرمە زیاد و بێکەڵکەی بە سەری چووکەوەیە، لە کاتی پرۆسەی خەتەنەکردندا دەبرێت و فڕێدەدرێت.

٦٩ـ هەر دووکیان یەک مانایان هەیە.. واتە ئەو پەردە تەنکەی لەناو منداڵدانی دایکدا لە گیانی کۆرپەلەوە پێچراوە. بە کوردی «پزدان»ی پێ دەوترێت.

٧٠ـ يارييەكى كچانەى فۆلكلۆريە. هيلا يا رمانە.. هلا يمە.. من هى زعلانە..؟ هيلا يمە.. «نوال ـ بۆ نموونە» زعلانە.. هيلا يمە.. منهو ايراضيها..؟ هيلا يمە.. آبوها يراضيها.. هيلا يمە.. صايغ تراچيها.. هيلا يمە.

٧١ـ ڕەشداهەڵگەڕان.

٧٢ـ قێزكردنەوە.

٧٣ـ لەگۆڕنان. ناشتن.

٧٤ـ زاوا و بووك. «لە زمانی عەرەبیدا بە پێچەوانەی زمانی كوردی بە زۆری ناوی نێر دەخرێتە پێشەوە».

٧٥ـ ڕەگەز، بنەماڵە.

٧٦ـ زەخمە: بۆنی زۆر ناخۆش. پێچەوانەی «ئەریج».

٧٧ـ دوا هەناسەی ژین.. سەیری پەراوێزی ژمارە «٢٢» بكە.

٧٨ـ سەرژمێری دانیشتوان بە زمانی ئینگلیزی.

٧٩ـ كۆچ.. ڕەو. بە زمانی ئینگلیزی.

٨٠ـ black bear یاخوود American bear واتە ورچی ڕەش.

٨١ـ باڵندەیەكی شەوگەڕ و تیژفڕە.. لە سلێمانی بە «تیتراوسك» و لە «هەولێر» بە «تیتروانسك» ناسراوە.. بە باوەڕی «هەولێری»یەكان ئەو باڵندەیە چاوەكانی زۆر تیژن و دەتوانێت هەموو شتێ ببینێت.. ئەو كاتەی چاكە دەبینێت، بێ دەنگ دەبێت، بەڵام چاوی بە هەر شتێكی خراپ بكەوێت، دەجریوێنێت و دەڵێت: «دیتیتم» واتە «بینیومە».. لادێییەكان دەڵێن: چونكە لە شاردا خراپە زیاتر دەكرێت، بۆیە تیتروانسك لە ئاسمانی ئەوێدا بە چركە بێ دەنگ نابێت، لە كاتێكدا لە لادێدا وانییە و زۆر كپە.. بێگومان ئەو وشەیە لەگەڵ هارمۆنی دەنگەكەی زۆر گونجاوە (دی/ تی/ تم). بەڵام وشەی «تیه» لە زمانی عەرەبییدا چەند مانایەكی هەیە وەكو [قفر: چۆڵەوانی] و [ضلال: گومڕابوون، ونبوون] و [متاهە: ڕێگومكە] و [تكبر، غرور: فیز و لووتبەرزی].. بێجگە لەوەی دواییان، هەموو ئەوانی ترمان مەبەستن.

٨٢ـ شطط: تجاوز: لادان لە سنووری ئاسایی.

٨٣ـ حەزرەتی «سارە»ی ژنی «ئیبراهیم خەلیل»ی پێغەمبەر، ئافرەتێكی نەزۆك بووە، كەچی دوایی زۆر بە پیری خودا هیدایەتی دەدا و «ئیسحاق»ی پێدەبەخشێت.. ئینجا دەڵێت: «ئەیەڕۆ

من منالّم دەبێت، لە کاتێکدا پیرم و ئەوەتا مێردەکەشم پیاوێکی پیرە، ئەمە شتێکی سەیرە، وتیان، واتە فریشتەکان وتیان، ئایا لە کار و ڕەحمەت و بەرەکەتی خودادا
سەرت سوڕدەمێنێت بۆ سەر ئێوە.. ئێوە لە ئەهلی بەیتن، کە پیرۆز و بەشکۆیە».. «قورئانی پیرۆز، سورەتی هوود، ئایەی ٧٢ـ ٧٣».

٨٤ـ ئەی هۆشمەندان لە تۆڵەسەندنەوەدا (مەبەست لە کوشتنی بکوژەکانە لەلایەن کەسوکاری کوژراوەوە) ژیانتان دەسگیردەبێت....... «قورئانی پیرۆز، سوورەتی ئەلبەقەرە. ئایەی ١٧٩».

٨٥ـ دوو مانای هەیە: یەکەمیان ئامانج و دووەمیان: ئەو خواردنەی ڕاوکەر بۆ هەڵخەڵەتاندنی نێچیر بەکاریدەهێنێت.

٨٦ـ قسەی هیچ و بێمانا.

٨٧ـ گڵ.

٨٨ـ بریندار.

٨٩ـ مەتەڵێکە و مەبەست لە شووتیە. واتا قوبەیەکی سپییە و کلیلەکەی لای شێخ ئاسنە، مەبەستیش لە چەقۆیە.. لە دەرەوەی ئەم جیهانەدا لە جیاتی سپیی «بیضه» دەڵێن سەوز «خضره».

٩٠ـ واتە مشک ئەگەر سەرخۆشبێت بەسەر سمێڵی پشیلەدا هەڵدەگەڕێ. (ماناکەی دیارە).

٩١ـ نەوال بیرۆکەی ئەم تابلۆیەی بە دەسکاریەوە لە وێنەیەکی فۆتۆگرافیەوە وەرگرتووە و مانایەکی تایبەتیی پێ بەخشیوە. ئەمە سەرچاوەکەیەتی:
PHOTOGRAPHY YEARBOOK 19_ _ , EDITOR Chris Hinterobermair, CONTRIBUTING EDITOR Joseph Meehan, DISINGER Grant Bradford.

* * * *

## لێکدانەوەی هەندێ لە ناوەکان

ئەبرەق: ڕەشوسپی.

ئەبوەر: زۆرخۆر، چڵێس، نەوسن.

ئەدهەم: ڕەش. هەروەها کۆت و پەیوەند.

ئەجهەر: ڕۆژکوێر، پێچەوانەی شەوکوێر.

ئەرقەم: ڕەش، ماری ڕەش.

ئەشوەل: پێچەوانەی ئەیمەن: واتە چەپلەر، کەسێ دەستی چەپی زیاتر لە هی ڕاستی بەکاربهێنێت.

ئەعسەر: چەپلەر.

ئەعنەس، ئەعنەش: شەشپەنجە، ئەوانەی دەستیان شەش پەنجەی پێوەبێت.

ئەفوەل: ئاوابوو، بەسەرچوو، لەناوچوو.

ئەقهەب: ڕەشێک، کە لە ڕەشیا مەیلەوسەوز خۆی بنوێنێت. (لێرەدا هەر ڕەشە و بە هیچ شێوەیەکی تر خۆی نانوێنێت).

ئەنوار: کۆی ڕووناکییە. هەروەها بەخشین.

باقر: زانا.

بدری: لە مانگەوە وەرگیراوە، هەروەها مانای بارانێکە، کە لە پێش هاتنی زستانەوە دەبارێت.

بدریە: مانگ، هەروەها ئافرەتێک، کە تەواو و ڕێکوپێک بێت.

بدران: لە مانگ وەرگیراوە و بە کەسێکیش دەوترێت، کە پەلە بکات لە کۆتاییهێنانی کاروباردا.

جابر: چاکەخواز، کەسێک جەبەرووتی هەبێت، هەروەها جەڕڕاح «مجبر العظام أو الأعضاء».

جیراب: مانای هەمانە «هەمبانە» و فیشەکدان و کالآنی شمشێری هەیە.

جەروەل: زەویی بەردەردەڵان.

جومانە: گەوهەر، دوڕ.

حالک: شەوەزەنگ.

حیسام: شمشێر

خەمیس: پێنجشەممە، هەرەوەها لەشکر، سوپا.

خەولە: ئاسک.

دوغەیمان: ڕەش.

دەیسەق: سپییەکی بریقەدار.

دیلهام: لەرەی دەنگی ئەو دڵدارانەی بەدەم گریانەوە گۆرانی دەڵێن.

رامح: کەسێک لە ڕمهاویشتنا شارەزابێت.

ڕەندە: گیایەکی بۆنخۆشە، هەروەها ناوی درەختێکی بیابانییشە.

ریحاب: کەسێ دڵی فرەوان بێت و بە ڕووی خۆشەوە پێشوازیی و بەخێرهاتنی میوان بکات.

ریهام: کۆی «رهمە»یە، مانای وردە بارانێکی بەردەوام.

زوبێر، یان زەبیر: پیاوی بەهێز، زانا و لێهاتوو، کەسێک زۆر ڕقەبەرایەتی شت بکات.

سادن: خزمەتکاری کەعبە.

سامیە: بەرز، هەروەها خاوەنی شەرەف و کەرامەت.

سەحمان: ڕەشێکی تۆخ.

سەلوا: دۆست، هاوڕێ.. هەروەها هەنگوین.

سەوسەن: شلێر «ناوی گوڵە».

سوهاد: خەوزڕاو، هەمیشە بێدار.

سۆزەت: وشەیەکی کوردیە، واتا شتی سەیر و سەمەرە.

شاهیب: ڕەش و سپیی تێکەڵاو.. بە کەسێکیش دەوترێت سەری ماشوبرنج بێت.

شەلشەل: دڵۆپەی ئاو.

شەمرووخ، شومروخ: نەمام، لووتکەی شاخ، هێشووی ترێ، هێشووی خورما «العثکال علیه التمر» «هەر هەموویانمان مەبەستن».

شەهاب، یان «شیهاب»: بڵێسەی ئاگرێکی گەش، ئەستێرەی ڕەونەقدار، «نەیزەک»، ئەو فیشەکەی لە ئاسمان دەتەقێتەوە و ڕووناکی بەملا و بەولادا پەرشدەکاتەوە.

عەدنان: کەسێک لە شوێنێ جێگیربێت و هەرگیز بەجێینەهێڵێت.

عەفیفە: پاک و بێگەرد. ئافرەتێک واز لە شەهوەت بێنێت.

عەمار، عەممار: بیناکەر، کەسێک نوێژ زۆر بکات، تۆبەکار.

غادە: ناسک، شۆخوشەنگ.

فەریال: بە کچێک دەوترێت، کە مل و چەناگەی جوان بێت. ناوێکە عەرەب لە کوردەوە وەریانگرتووە.

فوئاد: دڵ، ناوەرۆکی شت.

لوئەی: بەهێز، کەسێک بەرگەی ناخۆشیی بگرێت.

مەروان: بەردێکی سپیی ڕەونەقدارە و ئاگری پێ هەڵدەکرێت «بەردەئەستێ».

مەرجان: شیلان، ئەڵماسی ورد، هەروەها ناوی گیایەکی سوورە و شێوەی وەکوو پەنجەکانی دەستی مرۆڤ وایە، لە قەراغی دەریادا دەڕوێت.

مەسار: ڕەوت، ڕێگا، ڕێباز.

مەنار: ڕووناک، هەروەها ئاڵا، یان ئەو نیشانانانەی بۆ جیاکردنەوەی سنوورەکان دادەنرێن.

میقداد: قۆز، کەسێک باڵای ڕێک بێت.

میقلاع: دارلاستیک، قۆچەقانی.

نەجوا: نهێنی، موناجات.

نەوال «نوال»: [ العطاء، إعطاء: پێدان: GIVING, GRANTING].. [ فضل: چاکە: FA-VOR, GRACE, KINDNESS].. [صواب: ڕاست: RIGHT, CORRECT, PROPER] کوردیش وشەی «نەوال»ی بۆ ئەو بەفرەی شاخ بەکارهێناوە، کە دەتوێتەوە و جۆگەلەی ئاو پێکدەهێنێت.

نەوار: ڕووناکییەکی زۆر.

نیهاد: بە عەرەبی واتای شوێنی بەرزە و بە کوردییش نیاز و ئامانج.

نیهال: ئەو قومە ئاوەیە، کە بۆ یەکەمجار دەکەوێتە ناو دەمی تینوو.

هاجەر: کۆچەر.. چ لە کوردی و چ لە عەرەبیشدا هەندێ جار دەکرێت بە ئاجەر، واتا پاداشت.

هالە: خەرمانەی مانگ.. هەروەها ترس، دەوترێت: هال فلان ای خاف و رعب.

هیام: حەز و ئارەزوو. عاشقێکی شێتانە و قاڵبووی ناو خۆشەویستیی.

هیشام: بەخشندە، پێچەوانەی بەخیل و ڕژد.

ویسام: نیشانە، ئەو دیارییەی کەسێک لە ئەنجامی ئازایەتی، یان لێهاتوویی لە کارێکدا،

وەریدەگرێت.

(سەلیمە موراد، کە وەکو کارەکتەرێک ڕۆڵی بینیوە و ئاماژە بە ناوی هەندێ لە گۆرانیەکانی کراون، گۆرانیبێژێکی دەنگخۆشی عێراقیە و ژنی «نازم غەزالی»ی هونەرمەند بوو. ئافرەتێکی یاخیبوو، ڕۆڵی یەکەمی بینی لە تازەکردنەوەی هونەری گۆرانیی عێراقی و لە خولقاندنی چێژ و زەوقێکی تازە، کە لەمەوپێش نەبوو.. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سەلیمەی ئێمە ئەو نییە و لە سەردەمێکی جیاشدا ژیاوە).

* * * *

## مانای هەندێ لە وشەکان

ئەستێرک: بێجگە لە بەنداو «سد»، بە نوێنی هەڵچنراوی سەر کانتۆریش دەوترێت.

بەغغادە: خەڵکی بەغداد، بەغدادی.

ئەفەرۆز: بەلاوەنان، فەرامۆشکردن.

پەلەواژبوونەوە: مردنێکی ناکاو و کتوپڕ.

پەنیری پێستە: ژاژی.

تارزاندن: ختووکەدان و لەزەتبەخشین.

چەراویە: جۆرێکە لە جامانە، پیاوانی بەغدا لەسەریدەکەن.

زلوونکە: ڕادەربرین لەسەر مەسەلەیەک «تعلیق». زلوونگەر: ئەو کەسەی لەمەڕ مەسەلەیەک ڕای تایبەتیی دەربڕێت «معلق».

سێرتکە: شتی باریک و ورد.

سایە «صایە»: کەوا، جلێکی تایبەتە بە پیاوانی بەغداد.

شەبزووز: ئەندامی نێرینە.

شەنتووز: ئەندامی زاوزێی مێیینە. ئەم دوو وشەیە ژنانی هەولێر زیاتر بۆ مناڵ بەکاریانهێناوە.

بۆ ئافرەت مۆمدانیش لە دەقەکەدا وتراوە.

کەزی: پرچ، پەلکە. (قژی کرد بە کەزی: قژی کرد بە پرچ).

لابەردایی: خۆدوورخستنەوە لە کارێکی ترسناک. خۆپاراستن لە مەترسی.

لاپەلاپ: ڕۆیشتن بەسستی و نارێکی. هەنگاونانی منالێک تازە پێ بگرێت، یان هی کەسی نەخۆش و پەککەوتە.

* * * *

هەموو باوەڕ و نەریت و بۆچوونەکان تایبەتن بەم جیهانەی خۆمان و لە هیچ شوێنێکی تردا نیین، بێجگە لە هەندێکیان، وەکوو:

* مەتەڵی بژاردنی پەنجەکان و هی مەنجەڵ و ئەمووستیلەی دروومان. گۆڕانیان تیادا کراوە و بە مەبەستی جیاش بەکارهاتوون.

* هەقایەتە فۆلکلۆرییەکان: ئەوەی ورچ بنی پێی بنیادەم دەلسێتەوە و هەڵگرتنەوە و گەرمکردنەوەی ماری سڕبوو و تێکەڵبوونی کەڵەکێویەکان لەگەڵ مەڕی شواندا، ئەوانیشیش بە دەسکاریەوە سوودیان لێ وەرگیراوە.

* پەند و گۆرانیە فۆلکلۆری و ئەو یارییانەی بە زمانی عەرەبی تۆمارکراون، لەگەڵ پەندی «ماسی و میوان....».

* وتەی ناو کتێبە پیرۆزەکان و هی نووسەرەکان، لە شوێنی خۆشیاندا ئاماژەیان پێکراوە.

* وشککردنەوەی توێکڵی مۆز، بە مەبەستی گرتنەوەی بەخت و پێشبینیکردنی ڕووداو. «خانزاد»، ئەو ژنە کوردەی لە گەڕەکی «.......»ی شاری «بەغداد» دەژیا، شارەزاییەکی سەیری تیادا هەبوو.

* بەسەرهاتی «شاهین جیمناستیک». سوودی لێوەرگیراوە.

«دەنگێ لەجیاتی تێکڕای کارەکتەرەکان»

## سوپاس و پێزانین

ـ بۆ هەموو هاوڕێیانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، بەتایبەتی کاک «شێرکۆ

بێکەس»ی شاعیر، کە لە بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمەدا یارمەتییان دام.
ـ بۆ برای نووسەر: کاک «هەڵکەوت عەبدوڵڵا»، کە مۆنتاژ و پرێنتی ئەم بەرهەمەی بۆ کردم.
ـ بۆ هاوڕێی ڕۆحسووکم: «هیوا قادر»ی شاعیر و کاک «عەبدوڵڵا قادر دانساز»، کە بە پێی توانای خۆیان لە چاپکردنی ئەم بەرهەمەدا یارمەتیان دام.
ـ بۆ برای خۆشەویستم: «سەعد خەلیل ئیبراهیم» و بۆ برازا ئازیزەکانم: «مەنار»ی نووسەر و «ڕەندە»ی نیگارکێش و «ئاسار» و «مەسار»ی هونەرمەند، کە هەمیشە ئەرکی سەر شانیان سووککردووم، تا کاتی زیاتر بۆ نووسین تەرخانکەم.
ـ بۆ برایانی دڵسۆزم: کاک «دەرسیم دیبەگەیی» و کاک «ئاشتی ئیسماعیل شاوێس»، کە ڕۆڵێکی ئێجگار گەورەیان بینی لە گەیشتنی ئەم بەرهەمە بۆ بەر دەستی خوێنەر و زەحمەتێکی زۆریان لەگەڵدا کێشا.

Karwan Omar Kakasur

